ناوی کتێب: ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ خستنە ڕووی ڕووداوەکان و شیکردنەوەی بەسەر هاتەکان

نوسینی: دکتۆر علی محمد محمد الصّلابی

وەرگێڕانی: إحسان برهان الدین

نەخشەسازی ناوەوە: شنۆ حمدامین

نۆبەی چاپ: یەکەم ـ ٢٠٠٩.

ژمارەی سپاردن: (١٥٥٨)ی ساڵی (٢٠٠٩)ی پێ دراوە.

کتێبخانەی نارین

هەولێر ـ چوارڕیانی شێخ مەحمودی حەفید

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی

E- mail: nareen_1@yahoo.com

تەلەفۆن: 2511982 66 (00964)

# ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ

## خستنە ڕووی ڕووداوەکان و شیکردنەوەی بەسەرهاتەکان

نوسینی

علي محمّد محمّد الصّلابي

وەرگێڕانی

إحسان برهان الدين

بەرگی دووەم

ناریـن

# باسی پێنجەم: ناکۆکی لەسەر دەستکەوتەکان و دیلەکان

## یەکەم: ناکۆکی لەسەر دەستکەوتەکان.

عوبادەی کوڕی صامیتﷺ دەفەرموێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەرچووین و ئامادەی جەنگی بەدر بووم لەگەڵی، هەردوو هێزەکە ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە و،خوای گەورە دوژمنانی بەزاند، کۆمەڵێك بە دوایان کەوتن،دەیانشکاندن و دەیانکوشتن، کۆمەڵێکیش کەوتنە سەر سەربازەکاندا هەڵیان دەگرت و کۆیان دەکردەوە، کۆمەڵێك دەورەی پێغەمبەر(ﷺ)یان دا نەوەك دوژمن هەل بقۆزێتەوە لێی، کاتێك شەو هات، خەڵکەکەیش هەمووی گەڕانەوە لای یەکتر، ئەوانەی دەرچووبوون بە دوای دوژمن وتیان: ئێوە لە ئێمە مافدارتر نین، ئێمە دوژمنمان ڕاونا و بەزاندمان، ئەوانەش پاسەوانێتی پێغەمبەر(ﷺ)یان دەکرد و وتیان: ئێوەیش لە ئێمە مافدارتر نین بەو دەستکەوتەتان، ئێمە پاسەوانێتی پێغەمبەرمان دەکرد(ﷺ)، چونکە ترساین زیانێکی پێ بگەیەنێت، ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ ۖ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ ۖ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ۝١﴾(الانفال: ١).

ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) بە یەکسانی دابەشی کرد لە نێو موسڵمانانندا.[1]

لە ڕاستیدا خوای گەورە یادی غەزای بەدری کرد بە یادێکی هەمیشەیی بەوەی کە لە سورەتی(الانفال)دا باسی کردووە، بەشیکراوەیی باس لە ڕووداوەکان و هۆکارەکان و ئەنجامەکان کراوە، هەروەها ئایەتە پیرۆزەکانی چارەسەری دەرونی مرۆڤەکانیان کرد و، پەروەردەیان کرد لەسەر بیروباوەڕی قووڵ و پێکهاتنی ورد، سورەتەکە بە ئاشکراکردنی حوکمی دەستکەوتەکان دەستی پێکرد و ڕوونی کردەوە کە ئەو دەستکەوتانە بۆ خوا و پێغەمبەرە، چونکە خوای گەورە خاوەنی

---

١ حسنه الامام احمد (٥/٣٢٤)، واللفظ له ورقمه (٢٢٧٦٢) وقال محققوا ط/ الرسالة: حسن لغيره، تفسير ابن كثير (٢/٢٨٣).

هەموو شتێکە، پێغەمبەرەکەشی جێنشینیەتی، ئینجا خوای گەورە سێ فەرمانی بە ئیمانداران کرد:فەرمانی پێکردن بە لەخوا ترسان و چاککردنەوەی پەیوەندییەکان و گوێڕایەڵی بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، بێگومان ئەوانەش فەرمانگەلێکی هەرە گرنگن لە بواری جیهاددا، چونکە ئەگەر جیهاد هەڵقوڵاوی ترسی خوای گەورە نەبێت ئەوا جیهاد نیە، ئینجا جیهاد پێویستی هەیە بە یەك ڕیزی و ئا لێرەشەوە چاککردنەوەی پەیوەندییەکان گرنگیەکی زۆری هەیە و، ڕێك و پێك بوون بنچینەی جیهادە، ئینجا خوای گەورە ئاشکرای کرد کە گوێڕایەڵی بۆ خوا و پێغەمبەر(ﷺ) نیشانەی ئیمانە.

ئینجا خوای گەورە سیفەتی ئیماندارە ڕاستەقینەکانی دەست نیشان کرد، لە ڕاستیدا وەسفکردنی ئیمانداران بەوەی کە ئەگەر یادی خوا بکرێت دڵەکانیان دەترسێت و دەلەرزێت، هەروەها قورئانیان بۆ بخوێنرێتەوە بیروباوەڕیان بەهێزتر دەبێت، وەسفی سێیەمیش: پشت بەستنە بە خوای گەورە، کە ئومێدیان بە کەسی تر نیە جگە لە خوای گەورە و، پەناش ناگرنە کەسی تر جگە لە ئەو، داوای هیچ پێویستیەکیش ناکەن جگە لە پەروەردگاریان ئەوەیش دەزانن: هەرچی بیەوێت دەبێت و، هەرچی خوا نەیەوێت نابێت، سیفەتی چوارەمیش: بەرپاکردنی نوێژە وپارێزگاریکردن لە کاتەکانی(واتا بە جێهێنانی لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا) و دەست نوێژ و کارەکانی تری، لەوانە چاك دەست نوێژگرتن و بە تەواوی‌و چەمانەوەو کڕنوش بردن‌و قورئان خوێندن تیایداو شایەتمان و درووود و سڵاو ناردن بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، سیفەتی پێنجەمیش: بەخشین لە ڕێگای خوا و ئەویش زەکات و مافەکانی دیکە دەگرێتەوە، دروستکراوەکانیش هەموویان بەندەی خوای گەورەن، خۆشەویسترینیان لای خوا بە کەڵکترینیانە بۆ بەندەکانی تر، ئینجا ئاشکراشی کرد کە هەر کەس ئەم سیفەتانەی تیابێت ئەوا ئیمانداری ڕاستەقینەیە و بەم شێوەیە پێشەکی سورەتەکە تەواو دەبێت[1] دوای ئەوەی هیمەت بەرزدەکاتەوە بۆ جیهادونکۆڵی لە هۆکارەکانی سەرشۆڕی وەکو ململانێ لە سەر غەنیمەت‌و جیاوازی

---

[1] بڕوانە: الاساس في التفسير (٤/٢١١٣-٢١١٤).

تر،هەروەها بەرزبوونەوە بۆ پلە بەرزەکانی ئیمان, خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ ۖ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ ۖ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ۝١ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَـٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ۝٢ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ يُنفِقُونَ ۝٣ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ۚ لَّهُمْ دَرَجَـٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾(الانفال: ١-٤).

مامۆستا(محمد ایمن المصری) دەڵێت: ئایەتەکان باسی کرداری ئیماندارانیان نەکرد لە بەدردا، بەڵکو گلەییەکی ئازار بەخشیان کرد لە موسڵمانان، بۆ ئەوەی ھاندەرێك بێت بۆ شەرمکردن لە خوای گەورە، ھەندێك مەسەلەیش بوو ئایەتەکان بە جوانی ڕوونیان کردەوە و، ئەوەی لەناو دەروونەکاندا ھەبوو ئایەتەکان بە شێوەیەك باسیان کرد چاو جوڵەکانی تیادا دەبینی، ھەموو ئەوەش ناخی ئیمانداری ئاگادار دەکردەوە بۆ ئەوەی بزانێت چەند ماوە ھەیە لە نێوان خۆی و پلەکانی ئیماندا کە ھەوڵ دەدات پێی بگات، ئایەتەکان پەروەردەکردنی پەروەردگاری دانابوو، خاوەنی چەشتنی تەواویش بۆی دەردەکەوێت بە چی شێوازێکی ناوازە گلەییەکە خراوەتە ڕوو، بەبێ ئەوەی گلەیی تیابکرێت، بەڵکو باسی ئەوەی کرد کە لە دەروونەکاندا بوو، بە شێوەیەك ئەگەر ئیماندارێکی ئاسایی گوێی لێ بێت دڵنیا دەبێت کە ھیچ خاوەن باوەڕێك نابێت ئەو سیفەتانەی تیادا بێت. بۆیە ئایەتەکان خرانە ڕوویان پێشەکییەك بوو دەربارەی تایبەتمەندییەکانی ئیمان، کە وێنەی ئەو کەلێنە دەکێشێت لە نێوان ئیماندار و سیفەتی ناشایستەدا:

﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَـٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ۝٢ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ يُنفِقُونَ ۝٣ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ۚ لَّهُمْ دَرَجَـٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾(الانفال: ٢-٤).

ئایەتەکان باسی گلەییان نەکرد، بەڵکو باسی ڕووداویان کرد، باسی ڕووداویش کاریگەرتر بوو لە هەموو گلەییەك.

هاوەڵە بەڕێزەکان گوێڕایەڵ بوون بۆ ئەم ئاراستەقورئانیە، ئینجا ئایەتەکان دابەزینە سەر پێغەمبەردا(ﷺ) چۆن دەستکەوتەکان بەشبکات.

پاش ئەوەی دەستکەوتەکان بوونە موڵکی خواوپێغەمبەر(ﷺ)، پەروەردگار ئاشکرای کرد، دابەشکردنیان چۆن دەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ إِن كُنتُمْ آمَنتُم بِاللَّهِ وَمَا أَنزَلْنَا عَلَى عَبْدِنَا يَوْمَ الْفُرْقَانِ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾(الانفال: ٤١).

ئەمە لە پاش ئەوەی دڵەکانیان پاکبوونەوە لە تێکەڵکردن و دڵسۆزیان دەرکەوت بۆ خوای باڵادەست و نهێنیزان، حوکمەکەیش ڕاشکاو بوولەوەی چوار لە پێنجی دەستکەوتەکان لە نێو خۆیاندا دابەش دەبێت و پێنج یەکی بۆ خوا و پێغەمبەرە(ﷺ)، کە خودی ئەو پێنج یەکەیش هەر دەگەڕێتەوە بۆ خۆیان و دابەش دەکرێتە سەر ئەو لایەنانەی لە سوننەتدا باسیان هاتووە.

ئاراستەکردنی پەروەردەیی لە دواخستنی دابەزاندنی پرسیارکردن دەربارەی دەستکەوتەکان، بۆ ئەوە ئاماژە دەکات کە حوکمە شەرعیەکان پێویستە کەش و هەوای دەروونی گونجاوی بۆ ئامادە بکرێت، بۆ ئەوەی جێگای شایستەی خۆی بگرێتەوە لە هۆش و دڵدا و، جێگیر ببێت و ئامانجەکانی بەدی بهێنێت، بەم شێوەیش پەروەردگاری مەزن بەندە موسڵمانەکانی دوورخستەوە لە پەیوەست بوون بە کەسی تر و، هەروەها بە دەستکەوتەکانەوە، بۆ ئەوەی ئەو دڵسۆزیەیان تیا دروست بێت کە شایستەی سەرکەوتنی خوا و، تەواوکردنی نیعمەتەکانی بن، بۆیە کاتێك یەکلابوونەوە بۆ خوای گەورە و بە دڵسۆزی جیهادیان کرد سەرکەوتن فەزڵ و چاکەی خۆی لەوە زیاتر کە چاوەڕوان بوون[1] پێی بەخشین، لە عەبدوڵای

---

١ بڕوانە: صور وعبر من الجهاد النبوي في المدينة (ص ٦٢٥٦١).

کوڕی عەمرەوە هاتووە کە فەرموویەتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی بەدردا بە سێ سەد و یانزە کەس لە هاوەڵانیەوە دەرچوو، کاتێك گەیشتینە ئەوێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(اللهم انهم حفاة فحملهم، اللهم انهم عراة فاكسهم اللهم انهم جياع فأطعمهم) واتە : خوایە ئەوانە پێ پەتین هەڵیان بگرە، خوایە ئەوانە ڕووتن پۆشتەیان بکە، خوایە ئەوانە برسین تێریان بکە، ئیتر خوای گەورە سەرکەوتنی پێ بەخشین، کاتێکیش گەڕانەوە، هەریەکە و بە وشترێك یان دوو وشتر گەڕایەوە ، پۆشتە بوون و تێریش بوون.[1]

لە دادگەری پێغەمبەر(ﷺ)یش ئەوەبوو، لە دابەشکردندا بەشی ئەو کەسانەی دەستنیشان کرد کە بە فەرمانی خۆی دواکەوتن، بەبۆنەی هەندێ فەرمان و کار کە پێی سپاردن، بۆیە پشکی بۆ دانان و پاداشتی کەسێکیان دەست دەکەوێت کە ئامادەی بەدر بووبێت،[2] پێغەمبەر(ﷺ) چاودێری بارودۆخی سەربازەکانی دەکرد کە ڕێی لێ دەگرتن بەشداری بکەن لە جەنگدا، چونکە خوای گەورە داوای شتێك ناکات لە هیچ کەسێك لە سەرووی توانای خۆیەوە بێت وەکو دەفەرموێت: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾(البقرة: ٢٨٦).

بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) داوای هیچی لە کەس نەدەکرد لە توانای خۆیدا نەبێت، چی لە کاتی شەڕ و چی لە کاتی ئاشتی، لە غەزای بەدریشدا پێغەمبەر(ﷺ) لە هەندێ لە هاوەڵانی خۆش بوو لەوەی ئامادەی جەنگەکە بن، چونکە بارودۆخی خێزانیشیان وای دەخواست، لە عوسمانی کوڕی عەففانی(ﷺ) خۆش بوو لەوەی لە ڕۆژی بەدردا لە ماڵ دەربچێت، چونکە ڕوقەییەی خێزانی نەخۆش بوو، پێویستیشی هەبوو بە کەسێك چاودێری بکات، بوخاری لە صەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردووە کە عەبدوڵای کوڕی عومەر(ﷺ) باسی دواکەوتنی عوسمانی کردووە لەو شەڕە و فەرموویەتی: سەبارەت بە دواکەتنی لە ڕۆژی بەدر، بەهۆی نەخۆشکەوتنی خێزانی بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((ان لك اجر رجل ممن شهد بدراً وسهمه))[3] واتە:

---

١ مسند ابي داود (٥/٥٢٥)، حسنه الالباني، صحيح ابي داود ورقمه (٢٧٤٧).

٢ بڕوانە: من معنى السيرة (٢١٤).

٣ البخاري: كتاب الفضائل، باب ((مناقب عثمان)) رقم (٣٦٩٩).

پاداشت و پشکی کەسێکت هەیە بەشداری شەڕی بەدری کردبێت.

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کردووە بە ئەبو ئومامە لە لای دایکی بمێنێتەوە چونکە نەخۆش بووە و پێویستی پێی بوو، لە ئەبو ئوسامەی کوڕی سەعلەبەوە(ﷺ) هاتووە: کە پێغەمبەر(ﷺ) ئاگاداری کردنەوە بە دەرچوون بۆ بەدر وە ئەویش بڕیاری دەرچوونی دا لەگەڵیان، ئەبو بوردەی کوڕی نەیاری خاڵۆی پێی وت: لە لای دایکت بمێنەوە ئەی خوشکەزام. ئەبو ئوسامە پێی وت: بەڵکو تۆ لە لای خوشکەکەت بمێنەوە، ئەوەیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) گێڕایەوە و، ئەویش فەرمانی بە ئەبو ئوسامە کرد لەگەڵ دایکی بمێنێتەوەو ئەبو بوردەی لەگەڵ خۆی برد، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە ئافرەتەکە مردبوو پێغەمبەر(ﷺ)یش نوێژی لەسەر کرد.[١]

ئەم ڕەوشتە بەرزە و چاودێری کردنە بۆ هەستی سەربازەکان و بارودۆخی خێزانیان هزر و وزەیەکی دروست دەکرد لە نێوان سەرکردایەتی و سەربازەکاندا و، دەچێتە ژێر چەمکی(فقه التمکین)ەوە، پێغەمبەر(ﷺ)یش لە بەرزترین پلە و شێوازەکانی پێی هەڵساوە.

لەو هاوەڵانەیش کە فەرمان و ئەرکی تایبەتیان هەبوو، یان تووشی کۆسپێك بوون لە ڕێگا و پێغەمبەر(ﷺ) گەڕاندنیەوە:

١- ئەبو لوبابە: پێغەمبەر(ﷺ)بە جێنشینی خۆی لەسەر مەدینە بەجێی هێشت.

٢- عاصمی کوڕی عەدی: پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بۆ کارێکی گرنگی خەڵکی عالیە لە مەدینە.

٣- حاریسی کوڕی حاتیب: پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بە کارێکی گرنگ بەرەو لای بەنی عەمری کوڕی عەوف.

---

١ بڕوانە: الطبراني في الكبير ورجاله ثقات، بڕوانە: مجمع الزوائد (٣١/٣).

٤- حاریسی کوڕی صیممە: لە کاتی ڕێکردندا بەرەو بەدر کەوت و شوێنێکی شکا و پێغەمبەر(ﷺ) گێڕایەوە.

٥- خەواتی کوڕی جوبەیر: لە ڕێگا بەردێك بەر پێی کەوت لە ناوچەی سەفرائەوە گەڕایەوە بە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ).

هەروەها پشکی شەهیدانی دایە میراتگرەکانیان، بەم شێوەیەش ئاینی ئیسلام دەست پێشخەر بوو بۆ ڕێزگرتن لە شەهیدان و چاودێری کردنی منداڵ و خێزانەکانیان پێش نزیکەی چوارده سەده.[1]

## دووەم: دیلەکان

ئیبنو عەباس دەفەرمووێت: کاتێك دیلەکان گیران، پێغەمبەر(ﷺ) بە ئەبو بەکرو عومەری فەرموو: بۆچوونتان چیە دەربارەی دیلەکان؟ ئەبو بەکر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە ئامۆزا و عەشیرەتی خۆمانن، پێم وایە ڕزگارانەیان(فدیە) لێ وەرگریت و توانامان دەشکێتە سەر بێباوەڕاندا، بەڵکو خوای گەورە ڕێنموونیان بکات بۆ ئیسلام. بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: تۆ بۆچوونت چیە ئەی کوڕی خەتتاب؟ وتم: نە سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا، من بۆچوونەکەی ئەبو بەکرم نییە، بەڵکو من پێم وایە ئەگەر بوویتە خاوەن دەسەڵات لە گەردنیان بدەین، عەقیل بدەی بە دەستی عەلیەوە بۆ ئەوەی لە گەردنی بدات و زاواکەم بدەیتە دەستمەوە لە گەردنی بدەم، چونکە ئەوانە سەرانی کوفرن، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) بۆچوونەکەی ئەبو بەکری لا پەسەند بوو و حەزی نەکرد لە بۆچوونەکەی من، ڕۆژێك دوای ئەوە هاتم و تەمەشام کرد پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبو بەکر دانیشتوونە دەگرین، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاگادارم بکە بۆچی دەگرین؟ بۆ ئەوەیمنیش بگریم، یان بە زۆرخۆم بە گریان بهێنم لەبەر گریانەکەی ئێوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((لەبەر ئەوەی دەگریم کە هاوەڵانت پێشنیاری

---

[1] بڕوانە: السيرة النبوية لأبي شهبة (٢/١٧٦).

ڕزگارانەیان بۆکردم و من پێشنیاری سزادانیان کرایە سەرم لە خوار ئەو دارەوە))
– واتە دارێك بوو نزیك پێغەمبەر(ﷺ) – خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾ لَّوْلَا كِتَـٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٦٨﴾ فَكُلُوا۟ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَـٰلًا طَيِّبًاۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾(الانفال:٦٧-٦٩).ئیتر خوای گەورە دەستکەوتەکانی بۆ حەڵاڵ کردن.[١]

لە ڕیوایەتێکی ئیبنو مەسعوددا(ﷺ) هاتووە کە فەرموویەتی: لە ڕۆژی بەدردا،پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: چی دەڵێن دەربارەی دیلەکان، ئەبو بەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا قەوم و کەس و کاری خۆتن، بیانهێڵە و پەلەیان لێ مەکە، بەڵکو خوای گەورە لێیان خۆش بێت، عومەر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا، دەریان کردی و بە درۆیان خستیتەوە، لە گەردنیان بدە، عەبدوڵای کوڕی ڕەواحەیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، دۆڵێك بدۆزەرەوە دار و درەختی زۆر بێت، هەموویان بخەرە ناوی و بیانسووتێنە، ئیتر هەندێ کەس وتیان بۆچوونەکەی ئەبو بەکر وەردەگرێت و هەندێ کەس وتیان بۆچوونەکەی عومەر وەردەگرێت و، کەسانێك وتیان بۆچوونەکەی عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە وەردەگرێت، پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوو و فەرمووی: خوای گەورە دڵی کەسانێك نەرم دەکاتەوە تاکو لە شیر نەرمتر دەبێت، خوای گەورە دڵی کەسانێکیش ڕەق دەکاتەوە تاکو لە بەرد ڕەقتر دەبێت، نموونەی تۆ ئەی ئەبو بەکر وەك نموونەی ئیبراهیمە(سەلامی خوای لێ بێت)، فەرمووی: ﴿فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُۥ مِنِّيۖ وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾(ابراهیم: ٣٦). نموونەی تۆ ئەی ئەبو بەکر وەك عیسایە، کە فەرمووی: ﴿إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾(المائدة: ١١٨). نموونەی تۆش ئەی عومەر وەکو نموونەی نوحە، کاتێك فەرمووی: ﴿رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ

---

١ مسلم، کتاب الجهاد والسیر، باب الامداد بالملائکة في غزوة بدر واباحة الغنائم (٣/١٧٦٣).

دَيَّارًا ﴾(نوح: ٢٦). نموونەی تۆ ئـەی عومـەر وەکـو موسـایە، کـە فـەرمووی: ﴿رَبَّنَا اَطْمِسْ عَلَىٰٓ أَمْوَٰلِهِمْ وَاَشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُواْ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴾(یـــونس: ٨٨).((انتم عالة فلا ينفلتن احد منهم احدا الا بفداء، او ضربة عنق)) واتـە: ئێـوە نەدار و هەژارن، با کەسیان لە ژێر دەستتان دەرنەچێت بەبێ ڕزگارانـە یـان لێدانی گەردنی. عەبدوڵای کوڕی مەسعود دەڵێت: وتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) تـەنها سوهەیلی کوڕی بەیزا نەبێت، چونکە گوێم لێ بوو باسی ئیسلامی دەکرد، دەڵێـت: هـیچ ڕۆژێـك نـەبوو بترسـم بـەردم بەسـەردا بباریـت ئەوەنـدەی ئـەو ڕۆژە، تـاکو فەرمووی: "الا سهيل بن بيضاء" واتە: بەڵێ سوهەیلی کـوڕی بـەیزا نـەبێت. خـوای گەورەیش ئەم ئایەتەی دابەزانـد: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾(الانفال: ٦٧).[1]

ئەم ئایەتـە بنەمایـەکی گـرنگ دادەنێـت لـە دروسـتکردنی دەوڵەتـدا، کاتێـك لـە قۆناغی پێکهێنان و ئامادەکردندا بێت، بۆ ئـەوەی بـە لاوازی نەیەتـە پـێش چـاو و، دوژمنان بترسێنێت، بۆیە لە پێناو ئەم مەسەلە سـەرەکییەدا بایەخـدان دەخاتـەڕوو بە شتە لاوەکییەکان با پێویستیش بەو شتانە زۆر بێت.[2]

سەعدی کوڕی موعاز ناڕەحەت بوو لەوەی هاوەڵان دەستیان کرد بە دیل گرتنی بتپەرستان، پێغەمبەر(ﷺ)یش هەستی بـەوە کـرد و پێـی فـەرموو:((والله لكأنـك يا سعد تكره ما يصنع القوم)) واتە: سوێند بـە خـوا دەڵێـی کـرداری خەڵکەکـەت پـێ ناخۆشە، وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمە یەکەم گورز بوو لە بتپەرستان درا، کوشتنیانم پێ باشترە تاکو هێشتنەوەیان.[3]

مامەڵـەکردنی پێغەمبـەر(ﷺ) بـۆ دیلـەکان میهرەبانانـە و دادگەرانـە و تونـد و تـۆڵێش بـوو لـە پێنـاو ئامانجـەکانی بانگـەوازدا، بۆیـە شـێوازەکانی جیـاواز بـوو،

---

١ حسنه الامام احمد (٣٨٣/١-٣٨٤) رقم (٣٦٣٢) هەروەها بڕوانە وتەکانی شێخ ئەحمەد شاکر لەو بارەوە، تفسير ابن كثير (٣٢٥/٢)، (مرويات غزوة بدر) (٢٨٩-٢٩١)، بڕوانە قسەکانی ئەویش لە پەراوێزەوە.

٢ من معين السيرة (٢٠٩).

٣ بڕوانە: التربية الجهادية للغضبان (١٤١/١).

هەندێکیانی کوشت و هەندێکیانی بە ڕزگارانە ئازادکرد و، هەندێکی تریشیانی بەبێ هیچ بەرانبەرێك ئازادکرد و، هەندێکیان مەرجی لەگەڵ کردن دە کەس لە موسڵمانان فێری نووسین بکەن لە بەرامبەر ئازاد کردنیان.

**أ- پێغەمبەر(ﷺ) پەنادانی زوبەیری کوڕی موتعیمی لەبەرچاو بوو:**

پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی دیلەکانی بەدر فەرمووی:((لو كان مطعم بن عدي حياً، ثم كلمني في هؤلاء النتنى لأطلقتهم لـه))[1] واتـە: ئەگـەر موتعیمی کـوڕی عـەدی لـە ژیاندا بوایە و دەربارەی ئـەو بۆگەنانـە قـسەی لەگـەڵم بکردایـە لەبـەر ئـەو ئـازادم دەکردن.

ئەم فەرموودەیە ئەمەکێك چاکە لەبەرچاو بوونێـك بـوو بـۆ ئـەو پیـاوە، چـونکە موتعیم هەڵوێستی جوانی هەبوو لە پەنادانی پێغەمبەر(ﷺ) لـەو کاتـەی لـە تـائیف گەڕایەوە، ئینجا ئەو یەکێکیش بوو لەو کەسانەی لاپەڕەکەیان لابرد لە نـاو کەعبـە، کاتێك بەنو هاشم گەمارۆیان خرابوویە سەر،[2] ئەمەیش چڵەپۆپەی بە ئەمـەك بوونـە بۆ هەڵوێستی پیاوان سەرەڕای ئەوەی بتپەرستیش بن.[3]

**ب- کوژرانی عوقبەی کوڕی ئەبی موعەیت و نەزری کوڕی حاریس:**

ئەگەرچی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ئەمەکەی دەربڕی بەرامبەر کەسێك وەکـو مـوتعیم بەڵام پێویست بوو توند و تـۆڵیش بێـت بەرامبـەر هەنـدێك لـە تاوانبـارانی جـەنگ و سەرانی بێباوەڕی، وەکو: عوقبەی کوڕی ئـەبی موعـەیت و نـەزری کـوڕی حـاریس، چـونکە ئـەوان هەمیـشە بانگەشـەی شـەڕیان دەکـرد لـە دژی موسـڵمانان، بۆیـە مانـەوەیان مایـەی ترسـناکییە لـە دژی موسـڵمانان، بـە تایبـەتی لـەو قۆناغـەی بانگـەوازدا، چـونکە ئەگـەر ئـازاد بکـرێن دەسـت ناپـارێزن لـە پـیلان گێـڕان بـۆ موسڵمانان، بۆیە کوژرانیان پێویستە لە پێناو بەرژەوەندی بانگـەوازی ئیـسلامیدا،[4]

---

[1] ابو داود في الجهاد، باب ((المن على الاسير))، رقم (٢٦٨٩).
[2] من معين السيرة (٢٠٨).
[3] بروانە: التربية القيادية (٣/٥٤).
[4] بروانە: غزوة بدر الكبرى، محمد احمد باشميل (١٦٢) بتصرف.

بۆیە کاتێك گەیشتنە لای دۆڵی صەفرا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە کوشتنیان لەو کاتەی بەرەو مەدینە دەگەڕانەوە، کاتێك عوتبە بیستی دەکوژرێت وتی قوڕم بەسەر، بۆچی لە نێوان هەمووانـدا — ئەی کۆمەڵانی قورەیش — من بکوژرێم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: لەبەر دژایەتیت بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی، وتی: ئەی موحەممەد چاکە کردنت بە نەکوشتنم چاکترە، منیش وەکو یەکێکی تر دابنێ، ئەگەر ئەوانت کوشت منیش بکوژە، ئەگەریش ئازادت کردن ئازادم بکە، ئەگەر ڕزگارانەت لێ وەرگرتن لە منیشی وەرگرە، ئەی موحەممەد کێ لای منداڵەکانم بمێنێتەوە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئاگر، پێشی بخە ئەی عاسیم و لە گەردنی بدە.[١] ئیتر عاسیم پێشی خستن و لە گەردنی دا.[٢]

نەزری کوڕی حاریسیش یەکێك بوو لە شەیتانەکانی قورەیش، لەوانەی ئازاری پێغەمبەر(ﷺ)یان دەدا و دژایەتیان دەکرد، ئەو ڕۆیشتبوو بۆ حیرە و فێری بەسەرهاتی پادشاکانی فارس و ڕۆستەم و ئەسفەندیار بووبوو، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لە جێگایەك دادەنیشت و باسی خوای دەکرد، ئەو لەپاش پێغەمبەر(ﷺ) دەیوت: من لە ئەو چاکتر قسە دەزانم، وەرن با قسەتان بۆ بکە، ئیتر باسی پادشاکانی فارس و ڕۆستەم و ئەسفەندیاری بۆ دەکردن و دەیوت: بە چی موحەممەد قسەی لە من خۆشترە؟[٣] ئەم پیاوە سەرکەشە کە دەیوت من شتێك چاکتر باس دەکەم لە قسەی خوا و پێغەمبەر، پێویستە تۆڵەی لێ بکرێتەوە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوی نەخستە بازنەی ڕاوێژکردنەوە و[٤] فەرمانی کرد بە کوشتنی، ئیتر عەلی کوڕی ئەبو تالیب(رضي الله عنه) کوشتی.[٥]

---

١ بڕوانە: مجمع الزوائد (٨٩/٦) قال فيه: رواه الطبراني في الكبير والاوسط ورجاله رجال صحيح، ونصه في مجمع الزوائد عن ابن عباس..... وقتل عقبة بن ابي معيط قبل الفداء، قام اليه علي ابن ابي طالب فقتله صبرا، قال: من للصبية يارسول الله؟ قال: "النار".

٢ بڕوانە: التربية القيادية (٦٠/٣).

٣ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٤٣٩/١-٤٤٠).

٤ بڕوانە: التربية القيادية (٥٧/٣).

٥ بڕوانە: سيرة النبوية لابن هشام (٢٥٥/٢).

بە کوشتنی ئەم دوو تاوانبارە، موسڵمانان فێربوون کەهەندێ ستەمکار و سەرکەش هەن نابێت نەرمیان لەگەڵدا بنوێنرێت، چونکە ئەوانە سنووری ئەوەیان تێپەڕاندووە کە لێخۆشبوونیان بەرانبەربکرێت،[١] بەهۆی کردەوەناشرینەکانیان، ئەم دوو پیاوەیش خراپترین بەندەکانی خوا بوون و، لە هەموویان بێباوەڕتر و سەرکەشتر و ستەمکارتر بوون بۆ ئیسلام و موسڵمانان.[٢]

**ج- ڕاسپاردن بە ڕێزگرتن لە دیلەکان بەشێکە لە ڕێبازی پێغەمبەرایەتی:**

کاتێک گەڕانەوە مەدینە، پێغەمبەر(ﷺ) دیلەکانی دابەش کرد بەسەر هاوەڵانیداو، پێی فەرموون: چاکەیان لەگەڵ بکەن،[٣] بەم ڕاسپاردانەیش جێبەجێکردنی ئەم ئایەتە هاتەدی: ﴿وَيُطۡعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسۡكِينٗا وَيَتِيمٗا وَأَسِيرًا﴾(الانسان: ٨). ئەوە ئەبو عەزیزی کوڕی عومەیر، برای موسعەبی کوڕی عومەیر، باسی ئەوە دەکات کە بینی و، دەڵێت: من یەکێك بووم لە دیلەکانی جەنگی بەدر، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ڕاسپاردەی چاك بکەن لەگەڵ دیلەکاندا، منیش لە لای چەند کەسێك بووم لە ئەنصارەکان، کە کاتی نانخواردن دەهات، خۆیان خورمایان دەخوارد و دانەگەنمەکەیان بەمن دەدا لەسەر ڕاسپاردەی پێغەمبەر(ﷺ).[٤]

ئەبولعاسی کوڕی ڕەبیعیش بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت: من لە ناو کۆمەڵێك لە ئەنصاریەکاندا بووم خوا پاداشتی چاکەیان بداتەوە، کاتێك نیوەڕۆژە یان شێویان دەکرد، خۆیان خورمایان دەخوارد و نانەکەیان بە من دەدا، کە ئەوان نانیان کەم بوو، توێشوویان هەر خورما بوو، تەنانەت کەسی وایان بوو پارچە نانێکی دەست دەکەوت دەیدا بە من، وەلیدی کوڕی موغیرەیش ئەمە و لەمە زیاتری دەگێڕایەوە، ئەوان هەڵیان دەگرتین کاتێك ڕێیان دەکرد.[٥]

---

١ بڕوانە: التربية القيادية (٣/٦٠).
٢ بڕوانە: البداية والنهاية (٣/٣٠٦).
٣ هەمان سەرچاوە (٣/٣٠٧).
٤ مجمع الزوائد (٦/٨٦) وقال: رواه الطبراني في الصغير والكبير واسناده حسن.
٥ بڕوانە: المغازي للواقدي (١/١١٩).

ئەم ڕەوشتە جوانە، کە قورئان بنەماکەی دارشت، موسڵمانان کردیان بە ئاکارێك لە خۆیاندا و، بوو بە مایەی موسڵمان بوونی کۆمەڵێك لە ناودارانی قورەیش، ئەبو عەزیز لە پاش جەنگەکە موسڵمان بوو، پاش ئەوەی گەیشتنە مەدینە، هەروەها سائیبی کوڕی عەبدیش موسڵمان بوو پاش ئەوەی ڕزگارانەکەی دا، بانگەوازی ئیسلام ڕێگەی خۆی دۆزیەوە بۆ دڵەکانیان و دەروونیانی پاك کردەوە دیلەکانیش کە گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیانوبۆلای کەسوکارەکانیان ،باسی ڕەوشتە جوانەکانی محمد(ﷺ) دەکرد لە هەموو ڕووەکانەوەئەو مامەڵە جوانەی کە لەگەڵ دیلەکان ئەنجامدرا شایەتە لە سەر بەرزی ئیسلام لە بواری ڕەوشتدا چونکە دوژمنانی ئیسلام جوانترین هەڵسوکەوتیان لە گەڵ کرا لە لایەن هاوەڵانەوە کە خۆی لەوە دەبینیەوە ئەوانیان هەڵبژاردە سەر خۆیان لە خزمەتکردندا.[1]

### د- ڕزگارانەی عەباسی مامی پێغەمبەر(ﷺ):

قورەیش ناردیانە لای پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەسەلەی ڕزگارکردنی دیلەکانیان هەر کەسانێك و ڕزگارانەی دیلی خۆیانیاندا، عەباسیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا موسڵمان بوومە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: خوای گەورە زاناترە بە موسڵمانێتی تۆ، ئەگەر وابێت ئەوا خۆی پاداشتت دەداتەوە، بەڵام ئێمە تەماشای ڕواڵەتت دەکەین، بۆیە ڕزگارانەی خۆت و هەردوو برازاکەت نەوفەل و عەقیل و هەروەها ڕزگارانەی عوتبەی کوڕی عەمر بدە، وتی: ئەوەم نییە ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی:((ئەی ئەو ماڵە کوا کە تۆ و دایکی فەزڵ شاردتانەوە؟ پێتیش وت: ئەگەر لەم سەفەرەم تیاچووم ئەم ماڵە بۆ نەوەی فەزڵ و عەبدوڵا و قەسەمە. وتی: بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا من دەزانم کە تۆ پێغەمبەری، ئەم مەسەلەیە لە من و دایکی فەزڵ زیاتر کەسی تر نەیزانیووە، بەڵام ئەی پێغەمبەری خوا ئەو ماڵانەی پێم گیرا بۆم بژمێرە لە جیاتی ڕزگارانەکەم. پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ئەوە ماڵێکە خوای گەورە پێمانی بەخشیووە لەماڵی تۆ،ئینجا عەبباس ڕزگارانەی خۆی و هەردوو برازاکەی و هاوپەیمانەکەی دا خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دەربارەیان دابەزاند: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ إِن يَعۡلَمِ ٱللَّهُ فِي قُلُوبِكُمۡ خَيۡرًا

---

[1] بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٤/١٧٥-١٧٦).

يُؤْتِكُمْ خَيْرًا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٧٠﴾ وَإِن يُرِيدُوا۟ خِيَانَتَكَ فَقَدْ خَانُوا۟ ٱللَّهَ مِن قَبْلُ فَأَمْكَنَ مِنْهُمْ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ﴾(الانفال: ٧٠-٧١).

عەبباس وتی: بەرامبەر ئەو بیست ئۆقییەی کە لە بەدر لێم سەنرا، خوای گەورە بیست کۆیلەی پێ بەخشیم هەر یەکە و ماڵی لە ژێر دەستدایە کاری پێ دەکات، جگە لەوەی چاوەڕوانی دەکەم لە لێخۆش بوونی خوای گەورە.[1]

ئەم ئایەتەیش گەرچی بە تایبەت لە عەبباسدا دابەزیووە، بەڵام گشتیە لە هەموو دیلێکدا.[2]

هەندێك لە ئەنصارەکان داوای مۆڵەتیان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) و وتیان: ڕێگەمان بدە واز لە عەبباسی خوشکەزامان بهێنین و ڕزگارانەی لێ وەرنەگرین، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: سوێند بە خوا ناهێڵم واز لە یەك درهەمی بهێنن[3] لێرەشدا ڕەوشت جوانی ئەنصارەکان دەردەکەوێت چونکە بەرامبەر پێغەمبەر(ﷺ) بە عەبباسیان وت: خوشکەزامان،[4] بۆ ئەوەی منەت بکەوێتە سەر خۆیان، بە پێچەوانەی ئەوەی بیانوتبا عەبباسی مامت، چونکە ئەو کاتە منەتەکە لەسەر پێغەمبەر بوو(ﷺ)، ئەمەیش ژیریی و ڕەوشت جوانیە لە گوتاردا لەبەر ئەوەیش پێغەمبەر(ﷺ) ڕازی نەبوو، نەوەك جۆرێك لە لایەن گرتن بنوێنێت.[5]

لێرەشدا دیلەکان و موسڵمانانیش فێری وانەیەکی کاریگەر دەبن لە لایەن نەگرتنی خزماندا، بەڵکو بە پێچەوانەشەوە پێغەمبەر(ﷺ) ڕزگارانەی لەسەر عەبباسی مامی زیاد کرد.[6]

---

١ بڕوانە: اخرج الامام احمد قريبا من هذا الالفاظ برقم (٣٣١٠) – ج/ ٣٥٣. وقال محققوه ط/الرسالة: حسن،....... وارادوا رواية اخرى اخرجها الحاكم (٣/٣٢٤)، وعن البيهقي في السنن (٦/٣٢٢) وهي اقرب الالفاظ لهذه الرواية، وقالوا: وهذا اسناد حسن.

٢ بڕوانە: حديث القران الكريم عن غزوات الرسول (ﷺ) (١/١٣٢).

٣ فتح الباري (٧/٣٢١)، نقلا عن المستفاد من قصص القران (٢/١٣٥).

٤ چونکە نەنکی عەبباس دایکی عەبدولموتەلیب لە بەنی نەججارە لە یەسریب.

٥ بڕوانە: سبيل الرشاد للصالحي (٤/١٣٥).

٦ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة(٢\١٧٦)

عەبباس گەڕایەوە بۆ مەککە، پاش ئەوەی ڕزگارانەی خۆی و هەردوو برازاکەی جێبەجێکرد، موسڵمانەتی خۆیشی شاردەوە و لە مەککە دەستی کرد بە بەڕێوەبردنی دەزگای هەواڵداری ئیسلامی بە ئەوپەڕی لێهاتووییەوە، تا ئەو کاتەی ڕۆڵی تەواو بوو لە مەککە، پێش ئەوە بە چەند ساتێك موسڵمانێتی خۆی ڕاگەیاند.[١]

**ە- ئەبولعاصی کوڕی ڕەبیعی مێردی زەینەبی کچی پێغەمبەر(ﷺ) و ڕەزای خوا لە زەینەبیش بێت:**

عائیشە ؓ دەفەرمووێت کاتێك خەڵکی ناردیان بۆ ڕزگارکردنی دیلەکانیان، زەینەبی کچی پێغەمبەریش(ﷺ) ڕزگارانەی نارد بۆ ڕزگارکردنی ئەبولعاصی کوڕی ڕەبیع، ملوانکەیەکی خۆیشی نارد، کاتی خۆی خەدیجە بە دیاری پێی دابوو بە بۆنەی شووکردنی بە ئەبولعاص، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ)چاوی پێکەوت سۆزی بە جۆش هات و فەرمووی: ئەگەر پێتان باشە دیلەکەی زەینەب ئازاد بکەن وماڵەکەشی بۆ بگێڕنەوە، وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەوانیش ئازادیان کرد و ڕزگارانەکەیان بۆ گێڕایەوە.[٢]

پێغەمبەری خوا(ﷺ) پەیمانی لێ وەرگرتبوو کە گەڕایەوە مەککە زەینەبی بۆ بنێرێتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) زەیدی کوڕی حاریسە و پیاوێکی نارد و پێی فەرموون: ئێوە لە یەئجەج[٣]بن تاکو زەینەب بە لاتاندا تێپەڕ دەبێت، لەگەڵی بن تاکو دەیهێنن بۆ مەدینە.[٤]

ئەبولعاصی کوڕی ڕەبیع کە مێردی زەینەبی کچی پێغەمبەر بوو(ﷺ) هەرگیز نەزانراوە کە هەڵوێستێکی هەبێت لە دژی بانگەوازی ئیسلامی بە هەر شێوەیەك لە شێوەکان، دەست و زمانیشی پاراستبوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)، ماڵ و

١ بڕوانە: التربية القيادية (٣/٦٨)، بە دەستکاریەوە.

٢ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية، (٢٦١)، واخرجه احمد رقمه (٦/٢٧٦ – ٢٦٤٧٢) ط/قرطبة، والحاكم في المستدرك (٣/٢٣) وقال صحيح على شرط مسلم ولم يتعقبه الذهبي، وانظر (المسند: ط/ الرسالة في موضع الحديث رقم (٢٦٣٦٢).

٣ ناوی جێگایەکە هەشت میل لە مەککەوە دوورە.

٤ ابو داود في الجهاد، باب، في فداء الاسير بالمال رقم (٢٦٩٢)، صحيح السنن ابي داود للالباني، وحسن.

بازرگانی و شەڕکردن لە پێغەمبەر(ﷺ) سەرقاڵی کردبوو، لەوەی کە بەشداری دڕندەیەتی قورەیش بکات لە دژایەتی بانگەوازدا، لە جەنگی بەدریش ئەبولعاص یەکێك بوو لەو دیلانەی کە دەنگیان نەبیسترا لە کاتی شەڕەکەدا، نەشبینرا لە هیچ هەڵوێستێکدا وەکو دەربڕینی بیروڕا یان شەڕێکی تایبەت، پاش ئەوەیش، کە قورەیش ڕزگارانەی دیلەکانی نارد، خاتوو زەینەبی کچی پێغەمبەر(ﷺ) کە خێزانی ئەبولعاص بوو ئەویش ڕزگارانەی نارد بۆ مێردەکەی، لەگەڵ ئەو ماڵە و ملوانکەیەی خۆیشی نارد کە دیاری خاتوو خەیجەی دایکی بوو بۆی، جا کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ملوانکەیەی بینی سۆز و بەزەیی خرۆشا چونکە هەندێ یادگاری کۆنی بەیاد هێنایەوە، چونکە ئەم پێغەمبەرە باوکیشە و سۆزی باوکایەتی هەیە لەبەرزترین شێوازەکانیدا، بۆیە سۆز و عاتیفە باوکایەتی بە جارێك دڵی پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ)ی داگرت و ڕووی کردە هاوەڵان(ﷺ) تکای مەزنی و بەخشندەیی لێ کردن بۆ ئەوەی واز لەو مافەی خۆیان بهێنن.

ئەو شێوازەیش لە داواکردندا کاریگەرترین و جوانترین شێواز بوو کە لە دڵ و دەروونەکاندا شوێنەوار بەجێ بهێڵێت و، ببێتە مایەی بە دەنگ هاتنەوەی،[١] ئەم هەڵوێستەی پێغەمبەر(ﷺ) جگە لە ئەو سۆز و بەزەییەی تیایدا بوو سەبارەت بە کچەکەی، مەبەستێکی تریشی لەخۆ دەگرت ئەویش بریتی بوو لە ڕاکێشانی زاواکەی بۆ لای ئیسلام، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ستایشی کرد بەوەی ڕەوشتی جوانە، لە کاتێکدا هێشتا بتپەرست بوو.[٢]

**و- ئەبو عەززەعەمری کوڕی عوبدولای کوڕی جومەحی لە نێوان سۆز و غیرەتی پێغەمبەرایەتی:**

پیاوێکی هەژار و خاوەن کچ بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خۆت دەزانی هیچم نیە و منداڵدارم، چاکەم لەگەڵ بکە و ئازادم بکە، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) ئازادی کرد پاش ئەوەی پەیمانی لێ وەرگرت جارێکی تر دژایەتی پێغەمبەر(ﷺ) نەکات، ئینجا

---

١ بڕوانە: محمد رسول الله، محمد الصادق عرجون (٤٨٠\٣-٤٨٧).

٢ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (١٨٣/٤).

ئەبو عەززە هەڵبەستێكی وت لە ستایشی پێغەمبەر(ﷺ).(ابن كثير) دەڵێت: ئەبو عەززە پەیمانەكەی شكاند م بتپەرستەكان هەڵیانخەڵەتاند و، لە ڕۆژی ئوحودا جارێكی تر بە دیل گیرایەوە و، دیسان داوای كرد لە پێغەمبەر(ﷺ) چاكەی لەگەڵدا بكات و ئازادی بكات پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((لا ادع لك تمسح عارضيك وتقول خدعت محمداً مرتين))، واتە: بەرەلات ناكەم دوایی هەردوو كوڵمی خۆت بسڕیت و بلێی دووجار موحەممەدم هەڵخەڵەتاند، ئینجا فەرمانی كرد و لە گەردنیاندا.[١]

## ز- بە دیل گیرانی سوهەیلی كوڕی عەمرو، سەودە، ﷺ چی وت:

عەبدوڕڕەحمانی كوڕی ئەسعەدی كوڕی زورارە — ﷺ — فەرمووی:(( كاتێك دیلەكان هێنرانە مەدینە، سەودەی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) لە لای خاوخێزانی عەفرا بوو، بە بۆنەی شینیان لەسەر عەوف و موعەویزی كوڕانی عەفرا — پێش ئەوەی فەرمان بێتە خوار بە داپۆشینی ڕوومەت — سەودە دەڵێت سوێند بە خوا من لەوێ بووم كاتێك كەسێك هاتە لامان و وتی: ئەوە دیلەكان هێنران، منیش گەڕامەوە بۆ ماڵەكەی خۆم و پێغەمبەر(ﷺ)یشی تیابوو، سوهەیلی كوڕی عەمریش لە سوچێكی ژوورەكەمدا، هەردوو دەستی بەسترابوو لە ملیدا بە پەتێك، سوێند بە خوا خۆم پێ نەگیرا كاتێك ئەوەم بە حاڵە بینی وتم ئەی ئەبو زەید بە دەستی خۆتان ئەمەتان بەسەردا هات، بەسەر بەرزی بمردایەن باشتر نەبوو؟ ئاگادار نەبوومەوە بە قسەی پێغەمبەر(ﷺ) نەبێت كاتێك فەرمووی: "يا سودة اعلى الله ورسوله تحرضين" ئەی سەودە ئایا لە دژی خوا و پێغەمبەر هان دەدەی؟ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بەو كەسەی تۆی بە هەق و ڕاستی ڕەوانە كردووە خۆمم پێ نەگیرا كاتێك ئەبو زەیدم بینی دەستی بە پەت بەستراوەتەوە ملی و ئاوەهام وت.[٢]

مەكرەزەی كوڕی حەفصی ئەخیەف هات بۆ ڕزگاركردنی سوهەیلی كوڕی عەمر، كاتێك دانوستانی كرد لەگەڵ موسڵمانان و پێكهات لەگەڵیان، وتیان: باشە ڕزگارانەكەی بهێنە، مەكرەزە وتی: من بخەنە جێگای و ئەو ئازاد بكەن تاكو

١ بڕوانە: البداية والنهاية (٣/٣١٣).
٢ بڕوانە: السيرة النبوية محمد الصوياني (٢/٢٠٠) وسنده صحيح، مرويات غزوة بدر، وقد غزاه للحاكم (٣/٢٢)، وذكر تصحيحه له وموافقه الذهبي، كما صححه سند ابن اسحاق في رواية للقصة (٢٩٩-٣٠٠).

ڕزگارانەکەتان بۆ دەنێرێت، ئەوانیش وایان کرد، لە فەرمودەیەکی مورسەلیشدا هاتووە کە عومەری کوڕی خەتتاب – ﷺ – بە پێغەمبەر(ﷺ)ی وت: ڕێگەم بدە دگانە بڕندەکەی سوهەیلی کوڕی عەمر هەڵبکێشم بۆ ئەوەی جارێکی تر لە هیچ شوێنێکدا وتار نەدا لە دژت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((ئەتکی ناکەم، نەوەکو خوای گەورە خۆم ئەتك بکات، من پێغەمبەرم))[١] ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بە عومەری فەرموو:(انه عسى ان يقوم مقاماً لا تذمه)[٢] واتە: بەڵکو لە جێگایەکدا وتار بدات مایەی زەم کردنت نەبێت.

(ابن کثیر) دەڵێت: ئەو جێگایەش ئەوەبوو کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لە دونیا دەرچوو و عەرەب لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە و، نیفاق لە مەدینە و دەروبەری سەری هەڵدا، سوهەیل لە مەککە هەڵسا و وتاری بۆ خەڵکی دەدا و جێگیری دەکردن لەسەر ئیسلام،[٣] دەیفەرموو: ئەی کۆمەڵی قورەیش مەبنە کۆتایی خەڵکی لە موسڵمان بوون و سەرەتای هەڵگەڕانەوە، گومانمان لە هەر کێ بێت لە گەردنی دەدەین.

پێغەمبەر(ﷺ) ڕازی نەبوو دانی سوهەیل هەڵکێشێت، چونکە ئەوەی بە ئەتك زانی، ئەمەیش نموونەیەکە لە پەیام و ڕێبازی پیرۆزی موحەممەد(ﷺ).[٤]

**ح- فێرکردن بەرامبەر ڕزگار بوون:**

ئیبنو عەبباس دەفەرموێت: کەسانێك بوون لە دیلەکانی بەدر توانای ڕزگارانەیان نەبوو، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) ڕزگارانەیانی کردە ئەوەی لاوانی ئەنصار فێری نووسین بکەن.[٥] دیلەکانیش دەستیان کرد بە فێرکردنی خوێندنەوە و نووسین بۆ ئەو لاوانە، هەر کەس دە لەوانە فێر بکات خۆی ڕزگار دەکات،[٦] ڕازی بوونی پێغەمبەر(ﷺ) بەو بەرامبەرە لە جیاتی ڕزگارانە بەڵگەیە لەسەر ڕێزی ئیسلام بۆ

١ بڕوانە: البداية والنهاية (٣/٣١١)، وقال ابن كثير مرسل بل معضل.
٢ بڕوانە: البداية والنهاية (٣/٣١١).
٣ هەمان سەرچاوە (٣/٣١١).
٤ بڕوانە: محمد رسول الله، عرجون (٣/٤٧٤).
٥ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (ص٢٦١).
٦ بڕوانە: التربية القيادية (٣/٧٤).

زانست و نەهێشتنی نەخوێندەواری، ئەویش کارێکی سەیر نیە بۆ ئاینێك یەکەمین ئایەت لە قورئانەکەیدا:

﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ﴿٣﴾ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ﴾(العلق: ١-٤) بێت، دەقی زۆریش لە قورئان و سوننەتەوە هاتووە کە هاندانی تیایە لەسەر فێربوونی زانست و بەرزی پلەی زانایان، بەم کارە مەزنەیش پێغەمبەر(ﷺ) یەکەم کەس کە بەردی بناغەی نەهێشتنی نەخوێندەواری و بڵاوکردنەوەی خوێندنەوە و نووسینی بڵاو کردووەتەوە، دەست پێشخەریش لەم بوارەدا بۆ ئیسلامە.[1]

**ط- حوکمی دیلەکان:**

حوکمی دیلەکان لە ئیسلامدا دەگەڕێتەوە بۆ پێشەوا یەکێك لە چوار بڕیار بەسەریاندا بدات، بە پێی بەرژەوەندی موسڵمانان:

١- کوشتن: پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بە کوشتنی عوقبەی کوڕی ئەبی موعەیت و نەزری کوڕی حاریس.

٢- ئازادکردن بێ بەرامبەر: وەکو ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەنجامی دا لەگەڵ ئەبو عەززەی جومەحی.

٣- ڕزگارانە: مەبەست لە ئازادکردنی دیلەکەیە بەرامبەر بڕێك ماڵ وەکو ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەنجامیدا لەگەڵ عەبباسی مامی و نەوفەلی کوڕی حاریس و عەقیلی کوڕی ئەبو تالیب و کەسانی تر.

٤- بە کۆیلەکردن: سەعدی کوڕی موعاز(ﷺ) بڕیاری دا لە بەنی قورەیزە کە جەنگاوەرەکانیان بکوژرێن و ماڵەکانیان بەش بکرێت و ژن و منداڵەکانیان بە کۆیلە دەستگیر بکرێن.[2]

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٢/١٦٤-١٦٥).

٢ بڕوانە: غزوة بدر الكبرى (١٠١).

## باسی شەشـەم :دەرەنجامـەکانی غـەزای بـەدر و هەوڵـدانی کوشـتنی پێغەمبەر( ﷺ )

### یەکەم: دەرەنجامەکانی غەزای بەدر

١- یەکێك لەو دەرەنجامانە ئەوەبوو موسڵمانان بەهێز بوونـەوە، شکۆدار بـوون لە مەدینە و دەوربەری، بوو بە پێویـستیش لەسـەر هـەر کەسـێك دەیـەوێت هێـرش بکاتەسەر مەدینە یان زیان بە موسڵمانان بکەیەنێت، چەندین جار بیر بکاتەوە پێش ئەوەی ئەو کارە بکات، پلە و پایەی پێغەمبەر(ﷺ)یش لە مەدینە بەهێز بوویـەوە و ئەستێرەی ئیسلام بەرزبوویەوە، ڕاڕایان و بتپەرستانیش ئیتر ئـەو توانایـەیان نـەما بـە ئاشـکرا دژایـەتی ئیـسلام بکـەن، بۆیـە نیفـاق و دووڕوویـی پەیـدا بـوو، هەنـدێك ئیسلامەتی خۆیان بە ڕواڵەت ئاشکرا کرد لە لای پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانیدا، ئـیتر ئەوان هاتنە ڕیزی موسڵمانانەوە، کوفریشیان لە دڵا هـەر مایـەوە، بۆیـە لـە هـەمان کاتدا لە ڕیزی بێباوەڕانیشدا بـوون، ئـیتر نـە ئەوەیـە موسـڵمانێکی دڵسۆز بن، نـە ئەوەیشە بێباوەڕێکی ئاشکرا بن، خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلًا﴾(النـساء:١٤٣). بە بۆنەی ئەم هەڵوێستە ڕاڕایە، خوای گەورە ناوی زڕاندن لە زۆرێك لە ئایەتەکاندا و بە چەندین جـۆر هەڕەشـەی لێـداون، وەکـو دەفـەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا﴾(النساء:١٤٥).

یەکێك لە دەرەنجامەکانی غەزای بەدریش پتەوبوونی متمانەی موسڵمانان بوو بە خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) و، بەهێزبوونیان و موسڵمان بـوونی زۆرێـك لـە بتپەرسـتانی قـورەیش، ئـەوەیش بـووە مایـەی بەرزبوونـەوەی ورەی موسـڵمانە چەوساوەکان کە لە مەککە مابوونەوە، دڵەکانیان شاد بوو بـە سەرخـستنی خـوا و، دڵنیابوون لەوەی ڕۆژی ڕزگـاربوون دوور نییـە و ئیمانـداران بـەهێزتر بـوون. لەگـەڵ ئەوانەشدا، موسڵمانان شارەزایی سەربازیان پەیداکرد و، شێوازی تازە فێربـوون لـە

جەنگدا، ناوبانگێکی فراوانیان پەیدا کرد لە ناو دوورگەی عەرەب و دەرەوەیدا، چونکە بوون بە هێزێك قورسایی خۆیان هەبوو لە نێو وڵاتانی عەرەبدا، ئەوان تەنها جێگای مەترسی نەبوون بۆ سەرۆکایەتی قورەیش، بەڵکو بوون بە سەرچاوەیەکی مەترسیدار بۆ سەرۆکایەتی هەموو هۆزە عەرەبەکان لە هەموو لایەك، هەروەها سەرچاوەیەکی دەرامەت پەیدابوو بۆ دەوڵەتی نوێ لە دەستکەوتەکانی جیهادەوە، بەم شێوەیش بارودۆخی موسڵمانان لە ڕووی دەرامەت و ئابوورییەوە بوژایەوە بە هۆی ئەو دەستکەوتانەوە، لە پاش هەژارییەکی سەخت کە نۆزدە مانگ درێژەی کێشا.[1]

٢- سەبارەت بە قورەیش زیانەکەی بێ شومار بوو، چونکە سەرەڕای کوژرانی ئەبو جەهلی کوڕی هیشام و ئومەییەی کوڕی خەلەف و عوتبەی کوڕی ڕەبیعە و هەندێکی تر لە سەرانی بێباوەڕی کە ئەوان لە ئازایانی قورەیش بوون، ئەوە تەنها زیانێکی جەنگی نەبوو بۆ قورەیش، بەڵکو زیانێکی واتایی و ورەیش بوو بۆیان، چونکە مەدینە لەوە بەدوا تەنها بریتی نیە لە مەترسیەك بۆ سەر بازرگانییەکانیان و تەواو، بەڵکو بوو بە مەترسییەك بۆ سەروەری و دەسەڵاتیان لە هەموو حیجازدا،[2] هەواڵی ئەم تێکشانە لەسەر خەڵکی مەککە وەکو تریشقە بوو، سەرەتا باوەڕیشیان نەکرد. ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: یەکەمین کەس هەواڵی بەزانی قورەیشی هێنا بۆ مەککە حەیسومانی کوڕی عەبدوڵای خوزاعی بوو، پێیان وت: هەواڵی چیت پێیە؟

وتی: عوتبە و شەیبەی کوڕانی ڕەبیعە و، ئەبولحەکەمی کوڕی هیشام و، ئومەییەی کوڕی خەلەف و زەمعەی کوڕی ئەسوەد و، نوبەیهومونەببەهی کوڕانی حەججاج، ئەبولبوختوری کوڕی هیشام کوژران. جا کاتێك دەستی کردە ژماردنی سەرانی قورەیش، سەفوانی کوڕی ئومەییە وتی: ئەگەر ئەم کابرا هۆشی بە خۆی هەیە، پرسیاری منی لێ بکەن.

ئەوانیش وتیان: ئەی دەنگ و باسی سەفوانی کوڕی ئومەییە چی بوو؟

---

١ بڕوانە: التاريخ السياسي والعسكري، د. علي معطى، (٢٧٤-٢٧٥).

٢ هەمان سەرچاوە (٢٧٥-٢٧٦).

وتی: ئەوە سەفوانە لە حیجردا دانیشتووە، سوێند بە خوا باوك و براكەیم بە كوژراوی بینی.[١]

ئەبو ڕافیعی مەولای پێغەمبەر(ﷺ) كاریگەری هەواڵی تێكشكانی قورەیشمان بۆ دەگێڕێتەوە – نەفرینی خوای لێ بێت – لەسەر ئەبو لەهەب و دەفەرمووێت:

من خولامی عەبباسی كوڕی عەبدولموتتەلیب بووم، ئیسلام هاتبووە ناو ئەو ماڵەوە كە من تیایدا بووم و، دایكی فەزڵ موسڵمان بووبوو، عەبباسیش لە عەشیرەتەكەی دەترسا و، توانای ناكۆكی كردنیانی نەبوو، بۆیە موسڵمانێتی خۆی دەشاردەوە، ئەو خاوەن ماڵێكی زۆر بوو پەرتەوازە بوو بە ناو خزم و كەس و كارەكانیدا، ئەبو لەهەبی دوژمنی خوایش دواكەوتبوو لە بەدر، عاصی كوڕی هیشامی كوڕی موغەیرەی لە جێگای خۆی ناردبوو، كاتێك هەواڵی تێكشكان گەیشتە مەككە، خوای گەورە ئەبو لەهەبی كزكردەوە و ڕووی ڕەش كرد، ئێمەیش هەستما بە هێز و سەربەرزی كرد.

دەڵێت: من پیاوێكی لاواز بووم، خەریكی دروستكردنی پەرداخ و هەڵكۆڵینی بووم، خەریكی ئیشەكەی خۆم بووم و، دایكی فەزڵیش(خێزانی عەبباسی كوڕی عەبدولموتەلیب) لە لام دانیشتبوو، ئێمە پێ خۆشحاڵ بووین بەو هەواڵە و، لە ناكاو ئەبو لەهەبی بەدڕەوشت هەستا و پشتی لێ كردم و لە ژوورەكە دانیشت، لەو كاتە خەڵكی وتیان وا ئەبو سوفیانی كوڕی حاریس هاتەوە ئەبو لەهەب وتی: وەرە لام تۆ هەواڵت پێیە، ئەویش هاتە لای و خەڵكەكەش بەسەریانەوە ڕاوەستابوون، وتی: هەواڵ چیە برازا؟

وتی: سوێند بە خوا لەگەڵ بەیەك گەیشتین بە ئارەزووی خۆیان بەسەرماندا كەوتن و دیلیان كردین، سوێند بە خوا سەرەڕای ئەوەیش لۆمەی خەڵكم نەدەكرد: پیاوانێكی پۆشاك سپی مان دەبینی لەسەر ئەسپی بەڵەك لە نێوان ئاسمان و زەویدا، سوێند بە خوا هیچ بەرگەی نەدەگرتن، ئەبو ڕافیع وتی: ئەوانە بە خوا فریشتە بوونە،دەڵێت ئەبو لەهەب دەستی بەرزكردەوە و بەتوندی لەڕوومەتی دام و

---

١ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٢٥٧).

منیش تورە بووم، ئینجا ئەو هەڵی گرتم و بە زەوی دا خستم، ئینجا دەستی کردە لێدانم - منیش پیاوێکی لاواز بووم - بۆیە دایکی فەزڵ کردی بە پایەکی ژوورەکە و کێشای بەسەری ئەبو لەهەب و برینداری کرد، وتی: بە لاوازت زانی چونکە سەرگەورەکەی لێرە نییە، ئەویش هەڵسا و ڕۆیشت، لە پاش حەوت شەو بە نەخۆشی عەدەسە[1] مرد.[2]

دایکی فەزڵ کچی حاریسە و خێزانی کوڕی عەبدولمتەلیبە و خوشکی مەیموونەی دایکی ئیماندارانە و پوری خالیدی کوڕی وەلیدە و، یەکەکین ئافرەتە لە دوای خەدیجە[3] موسڵمان بووە، ڕەزای خوا لە هەموویان نێت .

لەڕاستیدا جەنگی بەدر خەموو پەژارەیەکی زۆری لە دڵ و دەروونی خەڵکی مەککەدا بەجێ هێشت، چونکە زۆریان لێ کوژرا و بەدیل گیراو و هەموو ماڵێك شینێکی تێ کەوت، بۆیە سەیر نەبوو کە ئەوان بڕیار بدەن تۆڵەی خۆیان بکەنەوە، تەنانەت هەندێکیان خۆشوردنیان لەسەر خۆیان قەدەغەکرد،[4] تاکو تۆڵە نەکەنەوە لەوانەی ئەوەیان بە سەریاندا هێنا. هەر چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەیش بوون تاکو جەنگی ئوحود دروست بوو.[5]

٣- سەبارەت بە جوولەکەکانیش، سەرکەوتنی موسڵمانان بە لایانەوە قورس و گران بوو، بۆیە بڕیاریان دا پەیمانەکەیان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بشکێنن، دژایەتیانیش ئاشکرا کرد و دەستیان کردە پیلان گێڕان بۆ موسڵمانان و، کاریان دەکرد بە هەموو ڕێگەیەك بۆ لەناوبردنی موسڵمانان و،[6] دەستیان کردە شەڕفرۆشتنیان، ئەو پیلانانەیش شاراوە نەبوو لە پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە بە وریاییەوە چاودێری دەکردن، تا ئەو کاتە سنوورەکانی ڕەوشتیان بەزاند و

---

١ برینێکی کوشندەیە وەکو تاعون.

٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٢/٢٥٨).

٣ بڕوانە: المرأة في العهد النبوي، د. عصمةالدين كركر، (١٦٢).

٤ وەکو ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب نەزری کرد ئاو لەسەری نەدا بە هۆی لەشگرانیەوە تاکو غەزای موسڵمانان نەکات.

٥ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٢/١٧١).

٦ بڕوانە: التاريخ السياسي والعسكري، (٢٧٤).

دەستدرێژیان کردە سەر قەدەغەکراوەکانی موسڵمانان و دژایەتیان ئاشکرا کرد، بۆیە هیچ ڕێگە چارەیەك نەبوو جگە لە لێدان و دەرکردنیان لە مەدینە.[١]

دووەم: هەوڵدانی ڕەشەکوژکردنی پێغەمبەر(ﷺ)و موسڵمان بوونی عومەیری کوڕی وەهب(شەیتانی قورەیش):

عوروەی کوڕی زوبەیر دەفەرمووێت: عومەیری کوڕی وەهەبی جومەحی لەگەڵ سەفوانی کوڕی ئومەییە پاش جەنگی بەدر بە ماوەیەکی کەم لە حیجردا پێکەوە دانیشتن عومەیر شەیتانێك بوو لە شەیتانەکانی عەرەب و یەکێك بوو لەوانەی ئازاری پێغەمبەر(ﷺ)و هاوەڵانی دەدا لە مەککە، جا وەهبی کوڕی یەکێك بوو لە دیلەکانی بەدر، ئیتر باسی کوژراوانی بەدریان کرد و سەفوان وتی: سوێند بە خوا لە پاش ئەوان دونیا خۆشی تیا نەما.

عومەیر پێی وتی بە خوا ڕاست دەکەیت، سوێند بە خوا ئەو قەرزەم لەسەر نەبووایە کە ناتوانم بیدەمەوە و، ئەو منداڵانەی کە دەترسم لە پاش خۆم پەرتەوازە بن، سوار دەبووم بۆ لای موحەممەد و دەمکوشت، چونکە من هۆیەکم هەیە بۆ ڕۆیشتن، کوڕەکەم لە لایان دیلە.

سەفوان ئەم هەلەی قۆستەوە و وتی: قەرزەکەت لەسەر من، منداڵەکانیشت وەکو منداڵەکانی خۆم دەبم لە بەخێوکردنیاندا، هەرگیز جیایان ناکەمەوە لە خۆم و منداڵەکانم، عومەیر پێی وت: کەواتە ئەم مەسەلە باس مەکە.

وتی: بەڵێ.

ئینجا عومەیر شمشێرەکەی تیژ کرد و ژەهراوی کرد و بەرەو مەدینە بەڕێکەوت، لە کاتێکدا عومەری کوڕی خەتاب لەگەڵ کۆمەڵێك لە موسڵمانان باسی جەنگی بەدریان دەکرد،لەو کاتە عومەر چاوی بە عومەیر کەوت، وشترەکەی لە دەرگای مزگەوتەکە بەچۆکا هێناو شمشێرەکەی بەقەد خۆیدا کردبوو، عومەر وتی: ئەو سەگە عومەیری کوڕی وەهبی دوژمنی خوایە، سوێند بەخوا بەنیازێکی خراپەوە هاتووە، هەر ئەویش بوو شەڕی هەڵگیرسان و ژمارەی ئێمە بە بتپەرستاندا لە ڕۆژی بەدردا.

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٢/١٧١).

عومەر چووە لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە عومەیری کوڕی وەهبی دوژمنی خوایە بە شمشێرەکەیەوە هاتووە. فەرمووی: با بێتە ژوورەوە و، عومەریش ڕۆیشت و پەتی شمشێرەکەی گرت بە دەوری گەردنی پێچی دا، بە چەند پیاوێکی ئەنصاریشی وت: بچنە ژوورەوە لای پێغەمبەر(ﷺ) دانیشن، ئاگاداری ئەو پیسەش بن، چونکە کەسێکی ناپاکە.

ئینجا بردیە لای پێغەمبەر(ﷺ) ، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) عومەری بینی پەتی شمشێرەکەی بە دەستی گرتووە، پێی فەرموو: ئازادی بکە ئەی عومەر، نزیک بەرەوە ئەی عومەیر،عومەیر نزیک بوویەوە و وتی: بەیانیتان باش، ئەوە سڵاوی بتپەرستان بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خوای گەورە ڕێزی لێ گرتین و ئەو سڵاوەی بە سڵاوێکی چاکتر بۆ گۆڕینەوە، بە سڵاوی خەڵکی بەهەشت وتی: بە خوا ئەی موحەممەد من ئاشنا نیم بەو قسانە.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بۆچی هاتووی ئەوەی عومەیر؟ وتی: هاتووم بۆ ئەو دیلەی کە لاتانە، چاکەی لەگەڵ بکەن.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەو شمشێرە چیە لە گەردنتدا؟ وتی: خوا شمشێرەکان قێزەون بکات، چ سوودێکی پێ گەیاندین؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ڕاستگۆ بە عومەیر بۆچی هاتووی؟

وتی: هەر بۆ ئەوە هاتووم کە پێم وتی.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵکو تۆ و سەفوانی کوڕی ئومەییە لە حیجردا دانیشتن و باسی کوژراوانی ناو بیرە کۆنەکەتان کرد و،تۆیش وتت: لەبەر قەرزاری و منداڵ نەبووایە موحەممەدم دەکوشت، سەفوانیش دەستەبەری ئەوانەی بۆ کردی، بەرامبەر ئەوەی من بکوژیت، خوای گەورەیش نایەڵێ ئەو کارە ئەنجام بدەیت، عومەیر وتی: شایەتی دەدەم تۆ پێغەمبەری خوای، ئێمە ئەی پێغەمبەری خوا تۆمان بە درۆ دەخستەوە لەوەی بۆت دەهێنایین لە هەواڵی ئاسمان و ئەو قورئانەی بەسەرتدا دادەبەزێت، ئەم مەسەلەیەیش کەس پێی نەزانی من و سەفوان نەبێت، بەو خوایە تەنها خوا نەبێت کەس تۆی ئاگادار نەکردۆتەوە، بۆیە سوپاسی خوای گەورە دەکەم کە ڕێگای ئیسلامی پێ نیشان دام و ئینجا شایەتمانی هێنا.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: براکەتان فێری ئیسلام بکەن و قورئانی پێ بخوێنن و دیلەکەی ئازاد بکەن.

دوای ئەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من کۆششم دەکرد ڕووناکی خوا بکوژێنمەوە، زۆر ئازاردەر بووم بۆ ئەوانەی لەسەر ئاینی خوا بوون، بۆیە پێم خۆشە ڕێگەم بدەیت بچمە مەککەوە، بانگیان بکەم بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی و ئاینی ئیسلام، بەڵکو خوای گەورە ڕێنوێنیان بکات، ئەگەرنا ئازاریان بدەم لە ئاینەکەیان وەکو چۆن ئازاری هاوەڵەکانی تۆم دەدا ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەی پێدا و ئەویش ڕۆیشت بۆ مەککە، سەفوانیش بە خەڵکی مەککەی وتبوو پاش دەرچوونی عومەیری کوڕی وەهب: چاوەڕوانی مژدەیەك بن لە چەند ڕۆژێکدا، بەدرتان لەبیر بباتەوە، سەفوان پرسیاری لە کاروانەکان دەکرد، تاکو سوارێك هات و هەواڵی موسڵمان بوونی هێنا، ئەویش سوێندی خوارد تا ماوە قسەی لەگەڵ نەکات و هیچ سوودێکی پێ نەگەیەنێت.[1]

ئەم بەسەرهاتە چەند وانە و پەندێکی تێدایە:

١- سووربوونی بتپەرستان لەسەر لەناودانی بانگخوازان، ئەوە سەفوانی کوڕی ئومەییە و، عومەیری کوڕی وەهبە، ڕێك دەکەون لەسەر کوشتنی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە دوژمنانی بانگەواز جاری وا هەیە بەوە ڕازی نابن کە دژایەتی بانگەواز بکەن، بەڵکو هەوڵ دەدەن بانگخوازانیش بکوژن و پیلانیان بۆ بگێڕن، بەڵکو ئامادەیشن تاوانباران بە کرێ بگرن بۆ جێبەجێکردنی ئەو نیازە چەپەڵە،[2] دەوڵەمەندە خۆشگوزەرەکانیش لە دوژمنانی بانگەواز، دەست کورتی و نەداری هەژاران بقۆزنەوە و ئاراستەیان بکەن بۆ خزمەتی مەبەستە نەگریسەکانیان بەرانبەر بڕێك پارە، وەکو ئەوەی سەفوان کردی لەگەڵ عومەیردا.[3]

٢- دەرکەوتنی هەستی هێمن لە لای هاوەڵان، چونکە عومەری کوڕی خەتتاب وریا بوویەوە بۆ هاتنی عومەیری کوڕی وەهب و ڕوونی کردەوە کە ئەو شەیتانێکە

---

١ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (ص٢٦٠).
٢ بڕوانە: المستفاد من قصص القران (١٥٩/٢).
٣ بڕوانە: غزوة بدر الكبرى لأبي فارس (٨٢).

بە نیازێکی خراپەوە هاتووە، چونکە مێژووی لە لایەن عومەرەوە زانراو بوو، کە چۆن ئازاری موسڵمانانی دەدا لە مەککە، وەکو پەتی شمشێرەکەی بە توندی گرت، بە شێوەیەك عومەیر نەیتوانی بە کاری بهێنێت بۆ دەست درێژی بەسەر پێغەمبەر(ﷺ).

٣- شانازی کردن بە ڕێنماییەکانی ئەم ئایینە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی ڕەت کردەوە سڵاوی نەفامی قبووڵ بکات، چونکە خوای گەورە ڕیزی لێ گرتوون بە سڵاوێکی تر.

٤- ڕەوشت بەرزی پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە چاکەی کرد لەگەڵ عومەیر و لێی خۆش بوو، سەرەڕای ئەوەی کە ئەو بۆ کوشتنی هاتبوو.[١]

بەڵکو کوڕە دیلەکەشی ئازاد کرد و، داوای کرد لە هاوەڵانی کە فێری ئیسلامی بکەن.[٢]

٥- پتەوی ئیمانی عومەیر، چونکە بڕیاری دا ڕووبەڕووی مەککە ببێتەوە بە ئیسلام، پێغەمبەر(ﷺ)یش ڕێگەی پێدا، ئەویش وای کرد و پاشان گەڕایەوە بۆ مەدینە، زۆر کەسیش لەسەر دەستی موسڵمان بوون، کاتێکیش باسی پیاوان بکرایە، عومەیر بە لای عومەرەوە ئەوەندەی هەزار پیاو بوو، خودی عومەیریش یەکێك بوو لەو چوار کەسە کە عومەر ناردنی بۆ یارمەتی دانی عەمری کوڕی عاص(ﷺ). کە هەر یەکێك لەو چوارە بەرامبەر هەزار پیاو بوو.[٣]

---

١ بڕوانە: غزوة بدر الكبرى لأبي فارس (٨٣).

٢ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٢٦٠)

٣ بڕوانە: التربية القيادية (٧٣/٣).

## باسی حەوتەم: هەندێ پەند و ئامۆژگاری لە غەزای بەدر

### یەکەم: سەرکەوتن لە لای خوای گەورەیە.

سەرکەوتنی ڕاستی لە بەدردا لە لای خواوە بوو، وەکو خوای گەورە خۆی ڕوونی کردووەتەوە و فەرموویەتی: ﴿وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ﴾(ال عمران: ١٢٦). هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِۦ قُلُوبُكُمْ ۚ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾(الانفال: ١٠).

لەم دوو ئایەتە جەختکردنەوە هاتووە کە سەرکەوتن تەنها لە لای خواوە دەبێت، واتە: سەرکەوتن لە لای کەسەوە جگە لە خوای پەروەردگار نایەت.

(العزیز) واتە: خاوەنی شکۆ و سەربەرزی کە کەس ناتوانێت نزیکی ببێتەوە.[1]

(الحکیم) واتە: دانایە لە دانانی شەریعەتی شەڕکردن لەگەڵ بێباوەڕاندا و لەناوبردنیان بە هێز توانای خۆیەوە.[2]

هەروەها ئەم دوو ئایەتە بڕواداران فێری پشت بەستن بە خوای گەورە دەکات‌و دڵنیابوونیان لەسەر ئەوەی سەرکەوتن تەنها لە لای خوای گەورەیە، نەك لە لای فریشتە و کەسی تر، چونکە پیویستە موسڵمانان هۆکارەکان وەربگرن بەڵام نابێت پێیان هەڵخەڵەتێن و، پێویستە پشت بەستنیان تەنها لەسەر دروستکەری هۆکان بێت، بۆ ئەوەی یارمەتییان بدات، لە پاش ئەوەیش خوای گەورە ئاشکرای کرد کە سەرکەوتن و دوژمن لەناوبردن و خۆڵ فڕەدانە ناو چاوی بتپەرستان هەمووی فەزڵی خوای گەورە بوو لەسەریان، وەکو فەرموویەتی: ﴿فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمْ ۚ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ۚ وَلِيُبْلِىَ ٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَآءً حَسَنًا ۚ إِنَّ

---

١ بڕوانە: تفسیر ابن کثیر (٤١١/١).

٢ بڕوانە: تفسیر ابن کثیر (٣٠٣/٢)، لە: حدیث القران الکریم عن غزوات الرسول (ﷺ) (١٠٥-٧٩/١)..

ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٧﴾﴾(الانفال: ١٧). هەروەها فەرموویەتی: ﴿لِيَقْطَعَ طَرَفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوْ يَكْبِتَهُمْ فَيَنقَلِبُواْ خَآئِبِينَ ﴿١٢٧﴾ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ﴾(ال عمران: ١٢٧-١٢٨). هەروەها خوای گەورە فەرمانی پێ کردن کە ئەو نیعمەتە گەورانەی خوای گەورە بەبیری خۆیان بهێننەوە و حاڵیان چۆن بوو پێش سەرکەوتن: ﴿وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ أَنتُمْ قَلِيلٌ مُّسْتَضْعَفُونَ فِى ٱلْأَرْضِ تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ ٱلنَّاسُ فَـَٔاوَىٰكُمْ وَأَيَّدَكُم بِنَصْرِهِۦ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾(الانفال: ٢٦).

### دووەم: ڕۆژی فورقان.

ڕۆژی بەدر بە ڕۆژی فورقان ناونرا، ئەم ناونانەیش بایەخێکی زۆر ی هەیە لە ژیانی موسڵماناندا، مامۆستا(سید قطب)یش دەربارەی ئەم فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَىْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا يَوْمَ ٱلْفُرْقَانِ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾(الانفال: ٤١). دەفەرموێت: غەزای بەدر، کە دەست پێکردن و کۆتایی پێهێنانی بە سازاندنی خوای گەورە بوو، جیاکەرەوە بوو لە نێوان هەق و ناهەقدا، وەکو هەموو لێکدەرەوانی قورئان فەرموویانە، بە ڕاستی جیاکەرەوە بوو لە نێوان ڕاستی و بەتاڵدا، بەڵام ئەو ڕاستیەی کە ئاسمانەکان و زەوی و فیترەتی هەموو شتێکی لەسەر ڕاگیراوە، ئەو ڕاستیەی کە خۆی لە تاك و تەنهایی خوای گەورە دەبینێتەوە لە خوایەتی و دەسەڵات و ڕێکخستندا، هەروەها لە بەندایەتی هەموو بوونەوەر بۆ زاتی خۆی و، لە نێوان ئەو ناهەق و ناڕەوایەی سەر زەوی داگرتبوویەوە، ڕۆژی فورقان ئەو ڕۆژە بوو کە سنوورێکی دەست نیشان کرد لە نێوان ئەو ڕاستیە گەورەیە و، ئەو زۆرداریە نالەبارە و بەیەکجاری لە یەکتر جیای کردنەوە، جیاکەرەوە بوو لە نێوان ڕاستی و

ناڕەواییدا لە ناخی مرۆڤ و ڕەوشت و هەڵسوکەوت و هەموو شتێکی جیاکەرەوەیەك بوو لە نێوان بەندایەتی بۆ کەس و هەوا و ئارەزووەکان و، بەها و شەریعەت و یاساکان و، لە نێوان گەڕانەوە لە هەموو شتێکدا بۆ لای خوای تاك و تەنیا، نەك بۆ لای هیچ خاوەن دەسەلآت و سەرۆك و یاسادانەرێك، بۆیە سەرەکان بەرز بوونەوە و جارێکی تر بۆ کەس نەهاتنە خوارەوە، هەروەها جیاکەرەوە بوو لە نێوان سەردەمێکی مێژووی بزووتنەوەی ئیسلامی کە سەردەمی دان بەخۆگرتن و کۆبوونەوە و چاوەڕوان کردن بوو، لەگەڵ سەردەمی هێز و جووڵە و پەلاماردان و بەرەوپێش چوون و خستنەڕووی ئیسلام وەکو ئەوەی ڕێبازێکی تازەیە بۆ هەموو بوونەوەر و، سیستەمێکی تازەیە بۆ ئازادکردنی مرۆڤ...[1]

## سێیەم: خۆشەویستی و ڕق لێبوون لە تێگەیشتنی ئیمانەوەیە.

غەزای بەدر لەم بارەوە هەندێ وێنەی پڕشنگداری بە نەوەکانی بەخشی، وەکو هێڵێکی جیاکەرەوە لە نێوان هەق و ناهەقدا، بۆیە بەدر بووە جیاکەرەوەیەکی تەواو لە نێوان ئیسلام و بێباوەڕیدا، ئەم هەموو واتایانەشی تیا بەرجەستە بوون و، هاوەڵان تیایدا ژیان و، بەها جاهیلیەتەکان هەموویان داڕووخان و، کوڕ و باوك و براو برا لەو شەڕە بە یەکتر گەیشتن.

١- ئەبو حوزەیفەی کوڕی ڕەبیعە لەڕیزی موسڵماناندا بوو، عوتبەی باوکی و وەلیدی برای و شەیبەی مامی لە ڕیزی بتپەرستاندا بوون،هەموشیان لە یەکەمین پێکداداندا کوژران.

٢- ئەبو بەکری صددیق لەڕیزی موسڵماندا بوو، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی لە ڕیزی بتپەرستاندا بوو.

٣- موسعەبی کوڕی عومەیر هەڵگری ئاڵای موسڵمانان بوو، ئەبو عەزیزی برای لەڕیزی موشریکاندا بوو، دواییش بە دیلی کەوتە دەستی یەکێك لە ئەنصارەکان، موسعەب بەئەنصارییەکی وت: باش دەستت پێوە ببەستە، دایکی خاوەن ماڵە،

١ بروانە: في ظلال القرآن (٣/١٥٢١-١٥٢٢).

ئەویش وتی : ئەی براکەم ئەوە ڕاسپاردەی تۆیە بە من ؟ موسعەب وتی: ئەو برامە نەك تۆ، ئەمانە ڕاستی بوون. نەك وشەی بێ واتا،[١] ئەمە ئەو بەهاپێشنیارکراوانەیە کە پێویستە مرۆڤایەتی لە سەر بنچینەی دابمەزرێت، بیرو باوەڕ بووە پەیوەندی خزمایەتی و جێگای گرتەوە.[٢]

لەم ڕوانگەوە بوو شێوازەکانی بیرو باوەڕ جیاواز بوو، بەلاّم یەك ناوەڕۆکی هەیە،[٣] بیروباوەڕ فیقهێکی گەورەی هەیە ، بۆ نموونە پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك کۆچی کرد بۆ مەدینە، هەرکەسێ توانای کۆچی بوو لە مەککە کۆچی کرد، هەرکەسێکیش چەوساوە بوو لەوێ گیری خوارد، لەڕۆژی بەدریشدا هەندێ لەو کەسانە لەڕیزی بتپەرستەکاندا بوون، لەوانە : عەبدولاّی کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمر و، حاریسی کوڕی زەمعەی کوڕی ئەسوەد و، ئەبو قەیسی کوڕی فاکیە و، ئەبو قەیسی کوڕی وەلیدی کوڕی موغەیرە، عەلی کوڕی ئومەییەی کوڕی خەلەف و، عاصی کوڕی مونەببەه.

بەلاّم عەبدولاّی کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمر لە ڕیزی بتپەرستان دەرچوو، هاتە نێو ڕیزی موسلّمانانەوە و، بەشداری شەڕەکەی کرد و، یەکێك بوو لەو هاوەلاّنەی کە شەرەفی بەشداربوونی ئەو جەنگەی بەدەست هێنا.[٤]

بەلاّم ئەوانەی تر وایان نەکرد و، ئامادەی جەنگەکە بوون لە ڕیزی بتپەرستاندا، هەمووشیان لە ژێر ئالاّی کوفردا کوژران،[٥] خوای گەورەیش دەربارەیان فەرمووی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ قَالُوا۟ فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُوا۟ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ قَالُوٓا۟ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُوا۟ فِيهَا ۚ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا﴾(النساء: ٩٧).

---

١ بڕوانە: البداية والنهاية (٣/٣٠٧).
٢ بڕوانە: من معين السيرة (٢١٣).
٣ هەمان سەرچاوە (٢١٣).
٤ هەمان سەرچاوە (٢١٧).
٥ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٢/٢٥٣).

ئیبنو عەبباس دەفەرمووێت: کەسانێك لە موسڵمانان لە مەککە بوون و موسڵمانێتی خۆیان دەشاردەوە، ئیتر بتپەرستان ئەوانیان لەگەڵ خۆیان دەرکرد لە ڕۆژی بەدردا و هەندێکیان کوژران، موسڵمانان وتیان: ئەوانە هاوەڵی ئێمە بوون و بەزۆر دەرکران، ئیتر خوای گەورەیش ئایەتی دابەزاند: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ﴾، ئەوان بیانوویان نەبوو، چونکە دەیانتوانی خۆیان بدەنە پاڵ ڕیزی موسڵمانانەوە، ئەگەر بیان ویستبا وەکو عەبدوڵای کوڕی سوهەیل دەهاتنە ڕیزی موسڵمانانەوە.[1]

ئیمان هەندێك پێداویستی هەیە هێزو ڕاستێتی دەردەخات، یەکێك لەوانەیش بەرزبوونەوەیەتی بەسەر هەموو بەهاکانی تر، ئەگەر وابێت کاریگەری زۆری هەیە بۆ خاوەنەکەی، ئەبێتە هێزێکی کاریگەریش بۆ بوونیاتنانی چاکە و ڕاستی کە خوای گەورە دەیەوێت، بیروباوەڕ ڕەفتار ڕەنگ دەکات و، شوێنەواری دەردەکەوێت لە جموجۆڵ و هەوڵدانەدا، هەروەها دەردەکەوێت لە وشە و زەردەخەنە و، هەڵسوکەوتەکاندا، بۆیە ئەوانەی کە لە ڕیزی بتپەرستان مانەوە هیچ پاساوێکیان نەبوو، چونکە ئەو ئیمانەی بانگەشەیان بۆ دەکرد هیچ شوێنەوارێکی دەرنەکەوت.[2]

هاوەڵان لە جەنگی بەدر نموونەی بەرزیان نیشاندا بۆ ڕاستێتی بیروباوەڕ، کە ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی ئەوان ڕەزامەندی خوا و پێغەمبەری خوایان هەڵبژاردە سەر خۆشەویستی باوك و کوڕ کەس و کار و عەشیرەت، بۆیە موسڵمان ستایشی خوای گەورەی بە لاوە سەیر نییە لەسەر ئەو هەڵوێستانە، وەکو دەفەرمووێت: ﴿ لَّا تَجِدُ قَوۡمٗا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ يُوَآدُّونَ مَنۡ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوۡ كَانُوٓاْ ءَابَآءَهُمۡ أَوۡ أَبۡنَآءَهُمۡ أَوۡ إِخۡوَٰنَهُمۡ أَوۡ عَشِيرَتَهُمۡۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٖ مِّنۡهُۖ وَيُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ أُوْلَٰٓئِكَ حِزۡبُ ٱللَّهِۚ أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴾(المجادلة: ٢٢).

---

١ بڕوانە: من معين السيرة (٢١٧).

٢ هەمان سەرچاوە (٢١٨).

## چوارەم: ئەو موعجیزانەی لە بەدر و دەوروبەریدا دەرکەوتن.

لەوانە، هەواڵدانی پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی هەندێ شتی شاراوە، بێگومان زانینی غەیب تایبەتە بە خوای گەورە وەکو دەفەرمووێت: ﴿قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ﴾(النمل: ٦٥).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ ۚ وَيَعْلَمُ مَا فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾(الانعام: ٥٩).

ئاشکرایشە کە پێغەمبەران(درووود و سڵاوی خوایان لەسەر بێت)، ئاگاداری غەیب نین وەکو خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمْ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ إِنِّي مَلَكٌ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ ۚ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ ۚ أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ﴾(الانعام: ٥٠).

هەروەها بەڵگەکان ئاماژە دەکەن بۆ ئەوەی خوای گەورە زانینی غەیبی تایبەت کردووە بە خۆیەوە، بەڵام هەندێ بەڵگە هاتوون کە خوای گەورە هەندێ لە پێغەمبەرانی ئاگادار کردووەتەوە لەوەی کە ویستوویەتی لە هەواڵە نەزانراوەکان و کردوویەتی بە موعجیزە بۆیان، وەکو بەڵگەیەك لەسەر پێغەمبەرایەتیان، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى ٱلْغَيْبِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجْتَبِي مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُ ۖ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ۚ وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَلَكُمْ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾(ال عمران: ١٧٩).

هەروەها فەرموویەتی: ﴿عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُۥ يَسْلُكُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ رَصَدًا﴾(الجن: ٢٦-٢٧).

کەواتە هەرچی مەسەلەیەکی غەیبی کە لەسەر زاری پێغەمبەرێکەوە باسکراوە

لە ڕێگەی وەحییەوە بووە، وەکو بەڵگەیەك لەسەر جێگیربوونی پێغەمبەرایەتی ئەوان.

ڕووداوەکانی جەنگی بەدریش پشکێکی بەرکەوت لەو موعجیزانە،[١] لەوانە:

**١- کوژرانی ئومەییەی کوڕی خەلەف:**

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە(ﷺ) فەرموویەتی: سەعدی کوڕی موعاز دەرچوو بۆ عومرە، لەوێ چووە ماڵی ئومەییەی کوڕی خەلەفی ئەبی سەفوان، ئومەییە خۆیشی کاتێك دەچوو بۆ شام لە لای سەعد لای دەدا، ئومەییە بە سەعدی وت: بۆ چاوەڕوان نابیت تاکو نیوەڕۆ، خەڵکی کپ دەبنەوە، لەو کاتە تەواف بکە، لە کاتێکدا سەعد خەریکی تەواف بوو، ئەبو جەهل وتی: ئەوە کێیە کە تەواف دەکات؟ سەعد وتی: من سەعدم، ئەبو جەهل وتی: ئاوەها بەبێ ترس بە دەوری کەعبە دەسوڕێیتەوە و دالدەی موحەممەدیشتان داوە لەگەڵ هاوەڵەکانی؟ وتی: بەڵێ، ئیتر هەندێ قسە و سەرکۆنەکردنی یەکتریان کرد، ئومەییە بە سەعدی وت: دەنگت لەسەر ئەبولحەکەم بەرز مەکەرەوە، ئەو سەرگەورەی دانیشتوانی ئەم دۆڵەیە. ئینجا سەعد وتی: سوێند بە خوا ئەگەر تەواف کردنم لەسەر قەدەغە بکەیت ڕێگەی بازرگانیت دەبڕم لەگەڵ شام، ئومەییەیش هەر بە سەعدی دەوت: دەنگت بەرز مەکەرەوە و، سەعدی دەگرت، ئینجا سەعد تووڕە بوو وتی: گوێم لە موحەممەد بووە(ﷺ) دەیوت دەتکوژێت, وتی: من دەکوژێت؟ وتی: بەڵێ، وتی: موحەممەد کە قسە بکات درۆ ناکات. ئەویش گەڕایەوە لای ژنەکەی و وتی: ئایا نازانی هاوڕێ یەسریبیەکەم چی پێ وتم: دەڵێ: موحەممەد دەمکوژێت، ئەویش وتی: سوێند بە خوا موحەممەد درۆ ناکات. جا کاتێك دەرچوون بۆ بەدر و هاوارکەر هات، ژنەکەی پێی وت: لەبیرت چوو هاوڕێکەت چی پێ وتی؟ ئیتر ئەویش ویستی دەرنەچێت، ئەبو جەهل پێی وت: تۆ یەکێکی لە ناودار و پیاوماقوڵانی مەککە، ماوەی ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ لەگەڵیان دەرچۆ و، ئەویش لەگەڵیان دەرچوو تاکو خوای گەورە کوشتی.[٢]

---

١ بڕوانە: موسوعة نضرة النعيم (١/٤٥٣).

٢ البخاري: كتاب المناقب، باب ((علامات النبوة في الاسلام)) رقم (٣٦٣٢).

**٢- کوژرانی ستەمکاران:**

لە ئەنەسەوە(ﷺ) فەرموویەتی: لەگەڵ عومەر بووین لەنێوان مەککەو مەدینە و تەماشای مانگمان دەکرد، منیش چاوم تیژ بوو، من بینیم و کەسی تر نەیوت بینیومە جگە لە من، منیش هەر بە عومەرم دەوت: ئایا نایبینی؟ ئەویش نەیدەبینی، عومەر وتی: ئەو کاتە ئەیبینم کە لەسەر پشت لەسەر جێگاکەی خۆم ڕاکشێم، ئینجا دەستی کردە باسکردنی بەشداربووانی بەدر بۆمان و فەرمووی: پێغەمبەر(ﷺ) کوشتنگەی زۆردارانی پێ نیشان دەداین، ئەیفەرموو: فلانەکەس سبەی لەو جێگایە دەکوژرێت، بە ویستی خوای گەورە، عومەر فەرمووی: سوێند بەو کەسەی ئەوی بە هەق و ڕەوا ناردووە، لە هەمان ئەو شوێنانە کوژران کە فەرمووی.[1]

**٣- ئاگاداربوونی پێغەمبەر(ﷺ) لە شاردنەوەی عەبباس بۆ ماڵەکەی و، ئەو گفتوگۆیەی ڕوویدا لە نێوان عومەیر و سەفوان:**

جگە لەم دوو ڕووداوەی کە پێماندا تێپەڕبوو لە چەند لاپەڕەی پێشوو، بە هەمان شێوە ئیبنولقەییم لە(زاد المعاد)دا دەگێڕێتەوە کە:

شمشێرەکەی عوککاشەی کوڕی موحصەن لەو ڕۆژگارەدا شکا، پێغەمبەر(ﷺ) پارچە دارێکی دا بە دەستیەوە و فەرمووی: ئەوە بگرە، کاتێك عوکاشە گرتیە دەستەوە و ڕایوەشاند، دووبارە بوو بە شمشێرێکی درێژی سپی، هەر لە لایشی مایەوە تاکو ڕۆژانی شەڕی پاشگەزبوونەوە لەسەردەمی ئەبو بەکردا.[2]

ڕیفاعەی کوڕی ڕافیعیش دەفەرمووێت: لە ڕۆژی بەدردا بە تیرێك پێکرام و چاوی دەرهێنام، پێغەمبەر(ﷺ) تفی لە چاوم کرد و دوعای بۆ کردم، ئیتر هەستم بە هیچ ئازارێك نەکرد.[3]

---

١ مسلم: رقم (٢٨٧٣).

٢ بڕوانە: زاد المعاد (٣/١٨٦) لێکۆڵەرەوەکە باسی ئەوەی کردووە کە ئیبنو ئیسحاق بەبێ سەنەد باسی کردووە.

٣ بڕوانە: زاد المعاد (٣/١٨٦) ئەم هەواڵەیش ناکۆکی لەسەرە ئایا ڕاستە یان لاواز.

دکتۆر ئەبو شەهبە دەڵێت: کەس بۆی نییە کە بانگەشەی ئەوە بکات کە موعجیزە هەست پێکراوەکان پێویست نییە لە پاش دابەزینی قورئان، ئەوەتا شوێنەوارەکانیان ئاشکرایە سەبارەت بە موسڵمان بوونی هەندێك و ئیمان پتەوکردنی هەندێکی تر، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) باسی هەندێ زانیاری شاراوەی باسکرد کە هیچ ئەگەرێکی تر نییە بۆ زانینی جگە لەوەی کە ئەوە هەواڵی ئاسمانە، شاراوەیش نییە کە گۆڕانی چڵەدارێك بۆ شمشێرێکی بڕندە چەندە بیروباوەڕ بەتین دەکاتەوە و، ئەو کەسەیش کە بە ئەوتۆ شمشێرێك جەنگ بکات چەند پەرۆش دەبێت و دەبێتە نموونە بۆ نەوەکانی دوای خۆیشی.[1]

## پێنجەم: حوکمی پەنابردنە بەر موشریکان.

لەو ڕووداوانەی پێش غەزای بەدر، بتپەرستێك ویستی بێتە ناو سوپای موسڵمانانەوە، داواشی کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) ڕازی بێت لەسەر بەشداری کردنی بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((ارجع فلن استعین بمشرك))[2] واتە: بگەڕێوە چونکە من پەنا ناگرمە موشریك. فەرموودەکە ڕوونی دەکاتەوە کە بنچینە ئەوەیە پەنا نەبردرێت بۆ کەسێك جگە لە موسڵمان لە کاروبارە گشتیەکاندا و، ئەم بنچینەیە کە لاخستنی هەیە، ئەویش بریتیە لە ڕەوابوونی پەنا بردنە بەر کەسی ناموسڵمان بە هەندێ مەرجی دیاریکراو، لەوانە: بەدیهاتنی بەرژەوەندی یان پەسەندی بەدیهاتنی بەو پەنا پێبردنە، هەروەها ئەوە لەسەر حیسابی بانگەواز نەبێت و، متمانەی تەواو دروست بێت بەو کەسە کە پەنای بۆ دەبرێت و، شوێنکەوتووی سەرکردایەتی ئیسلام بێت، نەك بە پێچەوانەوە، ئینجا ئەو پەنا پێ بردنە جێگای گومان نەبێت بۆ موسڵمانان، پێویستیەکی زۆریش هەبێت بەو پەنا پێ بردنە و ئەو کەسەی پەنای پێ دەبرێت، ئەگەر ئەم مەرجانە بەدیهات لەو حاڵەتە ڕەوا دەبێت وەکو دەرهاوێشتن لە بنچینەکە، ئەگەرنا ڕەوا نییە، لەسەر ئەم بنچینەیەیش

---

[1] بڕوانە: السیرة النبویة لأبي شهبة (٢/١٧٨).
[2] بڕوانە: السیرة النبویة الصحیحة للعمري (١/٣٥٥).

پێغەمبەر(ﷺ) ڕازی نەبوو بتپەرست لەو غەزایە بەشداری بکات، چونکە هیچ پێویستیەك نەبوو هەر لە بناغەوە، ئینجا لەسەر هەمان ئەو بنچینانە پێغەمبەر(ﷺ) پەنای برد بۆ عەبدوڵای کوڕی ئورەیقیت کە بتپەرست بوو، لەو کاتەی لەگەڵ ئەبوبەکر هیجرەتیان کرد بەرەو مەدینە، هەروەها قبووڵکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ پارێزگاری کردنی ئەبو تالیبی مامی و، ئینجا لە پاش مامی چووە ژێر پەنای موتعیمی کوڕی عەدییەوە لە کاتی گەڕانەوەی لە تائیف، هەروەها قبووڵکردنی هاوەڵە بەڕێزەکان بۆ داڵدەدانی بتپەرستەکان،[١] بەڵام تەواو گەیشتن لەم بنچینەیە لەگەڵ مەرجەکانی دەرهاوێشتن لە ژیاندا کە پێویستی بە تێگەیشتنێکی وورد و ئیمانێکی پتەو هەیە.

### شەشەم: حوزەیفەی کوڕی یەمان و، ئوسەیدی کوڕی حوزەیر(ﷺ).

#### ١- حوزەیفەی کوڕی یەمان و باوکی:

حوزەیفە دەڵێت: ئەوەی ڕێگای لێ گرتین بەشداری بکەین لە بەدردا، ئەوەبوو خۆم و باوکم ڕۆیشتین بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئیتر بێباوەڕانی قورەیش ئێمەیان دەستگیر کرد و وتیان: دەتانەوێت بچنە لای موحەممەد؟ وتمان: بەڵکو دەمانەوێت بچین بۆ مەدینە، ئەوانیش پەیمانی خوایان لەسەر گرتین کە ئەگەر گەیشتینە مەدینە شەڕ نەکەین لەگەڵ موحەممەد(ﷺ)، کاتێك ئەوانمان بەجێهێشت هاتینە لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەو ڕووداوەمان بۆی باسکرد و، پێمان وت چیت پێ باشە؟ فەرمووی:((نستعين الله عليهم ونفي بعهدهم)) واتە: پەنا دەگرینە خوا و بە ئەمەك دەبین بۆ پەیمانەکەیان.

ئەوەبوو هۆی ئامادە نەبوونمان لە بەدر.[٢]

ئەمە وێنەیەکی پرشنگدارە لە پاراستنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ پەیمان و، پەروەردەکردنی هاوەڵان لەسەر خۆڕازاندنەوە بە ڕەوشتی جوان، ئەگەر جۆرێك لە زیانیشی تیابێت بۆیان.

---

١ بروانە: المستفاد من قصص القران (٢/١٤٤-١٤٥).

٢ بروانە: المستدرك للحاكم (٣/٢٠١-٢٠٢)، هذا حديث صحيح الاسناد واقره الذهبي.

### ٢- ئوسەیدی کوڕی حوزەیر:

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لە بەدرەوە گەڕایەوە بۆ مەدینە لە ناوچەی(روحاء) سەرانی خەڵکی لەوێ پیرۆزبایی ئەو سەرکەوتنەیان لێ دەکرد، ئوسەیدی کوڕی حوزەیر فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی سەری خستنی و چاوی ڕۆشن کردیتەوە، سوێند بە پەروەردگار ئەی پێغەمبەری خوا دواکەوتنم لە بەدر لەبەر ئەوەبوو وامزانی ڕووبەڕوو نابیتەوە لەگەڵ دوژمندا، بەڵکو هەر وامزانی کاروانێکە، خۆ ئەگەر بمزانیبا دوژمنە دوانەدەکەوتم، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((صدقت))[1] واتە: ڕاست دەکەیت.

## حەوتەم: شەڕی ڕاگەیاندن لە بەدر.

پێغەمبەر(ﷺ) هانی شاعیرە موسڵمانەکانی دەدا بۆ ئەوەی هەڵسن بە ئەرکەکانی خۆیان لە بەرگریکردن لە موسڵمانان و ترساندنی دوژمنان بە هەڵبەستەکانیان چونکە هەڵبەست لەو سەردەمە هەڵمەتێکی ڕاگەیاندنی کاریگەری پێك دەهێنا لە دونیای عەرەب، خەڵکانێکی بەرز دەکردەوە و، خەڵکانێکی دادەگرت و، شەڕی هەڵدەگیرساند و دەشی کوژاندەوە،[2] سەرەتاکانی شەڕی ڕاگەیاندن هەر لە کاتی کۆچکردنەوە دەستی پێکردبوو، بەڵام دەست پێکردنی بە ئاشکرایی لەگەڵ دەرچوونی پۆلە سەربازییەکان بوو لە پێش بەدر، بەڵام بە شێوەیەکی بەرچاو و سەرنج ڕاکێش لە پاش بەدر تەشەنەی کرد، واش دەردەکەوێت هەڵبەستەکان لە ڕێگای کاروانەکانی نێوان مەککە و مەدینە بە زوویی بڵاو دەبوویەوە، لە کاتی سەرکەوتن، هۆنراوەی لایەنی سەرکەوتوو زیادی دەکرد و هۆنراوەی شیوەن و گریان لە ئەو لایەنەکەی تر زۆرتر دەبوو، ڕیزی موسڵمانانیش شاعیری چاکی تێدابوو وەکو کەعبی کوڕی مالیك و عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە، لە هەمووشیان کاریگەرتر لەسەر دوژمنان حەسان بوو.[3]

---

١ بڕوانە: البداية والنهاية (٣/٣٠٥).
٢ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٤/١٩٩).
٣ بڕوانە: المنهج الحركي للسيرة النبوية (١/٥١٢).

## باسی هەشتەم:گرنگترین ئەو ڕووداوانەی لە پێش غەزای بەدر و ئوحود ڕوویاندا.

دوابەدوای غەزای بەدر شکۆداری سەربازی موسڵمانان گەیشتە ئاستێکی بەرز لە بازنەیەکی فراواندا لە دوورگەی عەرەب، لاوازانی بتپەرستانیش هەستیان بە مەترسی کرد و، بەهێزەکانیشیان هەستیان بە تێکشکان دەکرد، بۆیە دڵ و دەروونەکان ئامادەییان تیا دروست بوو بۆ موسڵمانان و بازنەی موسڵمان بوونیش فراوانتر بوویەوە، زۆرێك بڕیاری ئەوەیان دا بچنە ناو ئیسلامەوە وەکو نیفاق و تەڵەکە، بەم شێوەیەیش دەوڵەتی ئیسلامی ڕووبەڕووی جۆرێك لە بارودۆخێکی تازە بوویەوە لە پلانگێڕان و هاوپەیمانێتی لە دژی، بەڵام پشتیوانی خوای گەورە و، دەزگای پاراستنی دەوڵەتی وریا، نەخشەی دوژمنانی پوچەڵ کردەوە.[١]

### یەکەم: ئەو غەزایانەی پێغەمبەر(ﷺ) خۆی سەرکردایەتی کرد لە دوای بەدر و پێش ئوحود.

**١-(ماء الكدر) لە بەنی سولەیم:**

لە پاش گەڕانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە بەدر بە حەوت شەو، غەزایەکی تری کرد و گەیشتە(ماء الكدر) لە ناوچەی بەنی سولەیم، کە مەبەستی غەزاکە ئەوەبوو، بەڵام تووشی شەڕ نەبوون و، سێ ڕۆژ لەسەر ئەو ئاوە مانەوە و، گەڕانەوە بۆ مەدینە،[٢] هۆی ئەو غەزایە ئەوەبوو هەندێك لە بەنی سولەیم کۆبوونەوە بۆ شەڕی موسڵمانان و دەست درێژی کردنە سەریاندا لە پاش شەڕی بەدر بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) هێرشێکی لە ناکاو و چاوەڕوان نەکراوی کردە سەریاندا، بۆیە بەنو سولەیم هەڵاتن و دابەش بوونە سەر چیاکاندا، وشترەکانیشان بەجێهێشت لەگەڵ وشترەوانێکدا ناوی یەسار بوو، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) وشترەکان و

---

١ بڕوانە: الاساس في السنة وفقهها السيرة النبوية (١/٥١٢).

٢ بڕوانە: موسوعة نضرة النعيم (١/٢٩٦).

شوانەکەشی دەسگیر کرد، لە ناوچەی(صرار) کە سێ میل لە مەدینەوە دوور بوو پێغەمبەر(ﷺ) وشترەکانی دابەش کرد بەسەر هاوەڵانی کە پێنج سەد وشتر دەبوون، هەر یەکە و دوو وشتری بەرکەوت، پێنج یەکیشی بەر پێغەمبەر(ﷺ) خۆی کەوت، یەساریش لە پشکی خۆیدابوو، بەڵام دوای ئەوە ئازادی کرد.[1]

٢- غەزای(السويق):

ئەبو سوفیان بە دووسەد سوارەوە لە مەککەوە هات و ڕێگای نەجدی گرتە بەر، بە شەو گەیشتنە(بني النضير) سەلامی کوڕی موشکەمی سەرگەورەی ئەو هۆزە جوولەکە پێشوازی لێ کردن و خواردنی بۆ دروست کردن و نهێنی موسڵمانانی بۆ ئاشکرا کردن، شێوازێکی لە زیان گەیاندن بە موسڵمانانیش لەگەڵیان تاوتوێ کرد، ئینجا ئەبو سوفیان هەڵسا بە هێرشکردنە سەر ناوچەی(العُريض) لە مەدینە – دۆڵێك بوو لە لای حەڕڕەی واقیمەوە– لەوێش دوو پیاوی کوشت و هەندێ دارخورمای سوتاند و هەڵاتەوە بەرەو مەککە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بە دووسەد سوارەوە شوێنیان کەوت لە موهاجیر و ئەنصارەکان، بەڵام نەیاتنوانی فریایان بکەون، چونکە زۆر بەخێرایی هەڵاتن و قورساییەکانی خۆیانیان لە ڕێگا فڕێ دەدا وەکو ئەو سەوەیقانەی[2] کە پێیان بوو بۆ خۆراکی خۆیان موسڵمانانیش ئەو کیسانەیان لە ڕێگا هەڵدەگرت و تاکو بە بڕێکی زۆر لەو خۆراکە گەڕانەوە بۆ مەدینە، پێغەمبەر(ﷺ) پاش دیار نەبوونی پێنج ڕۆژ لە مەدینە، لەگەڵ هاوەڵانی گەڕانەوە بێ ئەوەی تووشی شەڕ بووبێتن.[3]

٣- غەزای(ذي أمر):

هەواڵەکان لە لایەن دەزگای هەواڵگری ئیسلامیەوە ئەوەیان دەگەیاند کە پیاوانی هەردوو سەعلەبە و موحاریب کۆبوونەتەوە لە ناوچەی(ذي أمر) بە سەرکردایەتی دوعسوری کوڕی حاریسی موحاریبی، بە مەبەستی جەنگ کردن لە دژی

---

١ بڕوانە: التاريخ السياسي والعسكري، (٢٧٧).
٢ سوەیق بریتیە لە گەنم و جۆی برژاو، ئینجا دەهاڕدرێت لەگەڵ شیر و هەنگوین و ڕۆن.
٣ بڕوانە: السيرة لابن هشام (٥١/٣)، التاريخ السياسي والعسكري، (٢٧٨-٢٧٩).

پێغەمبەر(ﷺ) و هێرش کردنە سەر مەدینە، پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بە دانانی عوسمانی کوڕی عەففان لە جێگای خۆی لە مەدینە و بە چوارسەد و پەنجا کەسەوە لە موسڵمانان دەرچوو بە پیادە و بە سواری، لە ناوچەی(ذي القصة) پیاوێکیان تووش بوو جەبباری پێ دەوترا لە بەنی سەعلەبە، هەندێ هەواڵی پێ بوو دەربارەی عەشیرەتەکەی گەیاندیە پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانیش بوو، ئینجا چووە لای بیلال بۆ ئەوەی فێری ئیسلامی بکات، سەبارەت بە موشکریکەکان سەعلەبە و بەنی موحاریب زۆری نەبرد هەڵاتن بەرەو بەرزایی شاخەکان کاتێك هەواڵی بەڕێکەوتنی موسڵمانانیان پێگەیشت، پێغەمبەر(ﷺ) نزیکەی مانگێك لە نەجد مایەوە بێ ئەوەی تووشی هیچ جەنگێك بێت و دوای ئەوە گەڕایەوە بۆ مەدینە.[1] لەم غەزایەدا دوعسوری کوڕی حاریس موسڵمان بوو، کە سەرگەورەی هۆزەکەی خۆی بوو، دوای ئەوەی موعجیزەیەکی بینی لە پێغەمبەر(ﷺ)، موسڵمانان لەم غەزایە بارانێکی زۆریان بەسەردا باری، جلوبەرگەکانی پێغەمبەر(ﷺ) تەڕبوو، ئەویش لەژێر دارێکدا جلەکانی هەڵخستبوو بۆ ئەوەی وشك بێتەوە دوعسور توانی تاك ببێتەوە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) و شمشێرەکەی بە دەستەوە بوو، وتی: ئەی موحەممەد، کێ دەتپارێزێت لە من ئەمڕۆ، فەرمووی: خوا. ئینجا جبریل پاڵی بە سنگیەوە نا و شمشێرەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە و، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەڵی گرت، ئینجا فەرمووی:(من يمنعك مني) واتە: کێ لە من دەتپارێزێت، هیچ کەسێك و منیش شایەتی دەدەم کە تەنها یەك خوا هەیە و موحەممەدیش پێغەمبەرە لە لایەن خواوە، سوێند بە خوا هەرگیز جارێکی تر خەڵکت لەسەر کۆ ناکەمەوە. ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) شمشێرەکەی بۆ گەڕاندەوە، کاتێك گەڕایەوە لای هاوڕێکانی، وتیان: بەڵات لێکەوێت، چیتە؟ وتی: تەماشای پیاوێکی درێژم کرد و پاڵی بە سنگمەوە نا و لەسەر پشت کەوتم، ئیتر زانیم کە ئەوە فریشتەیە و شایەتمانم هێنا و من هەرگیز کەس لە دژی کۆ ناکەمەوە، ئینجا دەستی کردە بانگەوازکردنی قەومەکەی بۆ ئیسلام،[2] لەو بارەشەوە ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ

---

١ بڕوانە: التاريخ السياسي والعسكري، (٢٧٩).

٢ بڕوانە: البداية والنهاية (٣/٤).

نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ هَمَّ قَوۡمٌ أَن يَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ فَكَفَّ أَيۡدِيَهُمۡ عَنكُمۡۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾(المائدة: ١١).

**٤- غەزای بوحران:**[١]

ئەم غەزایە لە مانگی جومادی یەکەم لە ساڵی سێیەمی کۆچی روویدا، پێغەمبەر(ﷺ) بە سێ سەد کەس لە موسڵمانانەوە دەرچوو تاکو گەیشتە ناوچەی بوحران لە نێوان مەککە و مەدینە، بە مەبەستی شەڕکردن لە دژی بەنو سولەیم، بەڵام دەرکەوت کە ئەوان هەڵاتوون و بڵاوەیان کردووە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە بۆ مەدینە پاش مانەوەی دە ڕۆژ لە دەرەوەی شار.[٢]

لەم جۆرە غەزایانە تێبینی ئەوە دەکرێت کە سەرکردایەتی ئیسلامی توانای چاکی بوو بۆ تێبینی کردنی جموجۆڵی دوژمن و، ژمارەی هێز و پلانەکانی، بە مەبەستی تێکشکاندنی ئەو کۆمەڵە نەیارانەی دژی دەوڵەتی تازە پێگەیشتووی ئیسلام دەوەستن و مەترسی پێك دەهێنن لە دژی مەدینە.

ئەم غەزایانە لەو بیابانە پان و بەرینە جۆرە خولێکی ڕاهێنان و پەروەردەیی بوو بۆ هاوەڵە بەڕێزەکان، پۆلە سەربازییەکانی هاوەڵانیش بەختەوەر بوون بە سەرکردایەتی پێغەمبەر(ﷺ) بۆیان، ئەو خولانەیشە لە ڕاستیدا بەردەوام بوون، جاری وابوو لە پێنج ڕۆژ تاکو مانگێکی دەخایاند، تیایدا سەربازەکان پەروەردە دەبوون لەسەر گوێڕایەڵی و ڕاهێنان و چاك و شارەزایی باشیان بەدەست دەهێنا.

لە ڕاستیدا ڕێبازی پێغەمبەر(ﷺ) گرنگی دەدا بە پەروەردەکردنی هاوەڵان لە گۆڕەپانی ڕووبەڕووبوونەوەدا، هەرگیز ڕۆڵی مزگەوتیش پشتگوێ ناخات لە تۆکمەکردنی دڵەکان و ڕووناك کردنەوەی بیروهۆشەکان و، جوانکردنەوەی ڕەوشتەکان، لە ڕێگەی بوونی پەروەرشیاری مەزن موحەممەد(ﷺ) کە ڕێنماییەکانی لە نێو ئەو کۆمەڵگایە دەدرەوشایەوە لە ڕێگەی پێشەنگ و خواپەرستنی بۆ خوای گەورە، ڕێبازی پێغەمبەر(ﷺ) کۆی دەکردەوە لە نێوان

---

١ هەندێك بە بەحران و هەندێك بە بوحران نووسیویانە.

٢ بڕوانە: المجمع المدني للعمري، (٦١)، التاريخ السياسي والعسكري، (٢٨٠).

خولە مزگەوتیەکان لە ڕووی پەروەردەوە و، خولە سەربازیە پەروەردەییەکانەوە بە شێوەیەکی چڕ، بۆ بەهێزکردنی کۆمەڵگای تازە و، ڕێکوپێک کردنی ڕیزەکانی، بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام.

**٥- پۆلی سەربازی زەیدی کوڕی حاریسە بۆ ناوچەی قەردە:**

لە پاش تێکشکانی بتپەرستەکان لە جەنگی بەدر، دەستیان کردە گەڕان بە دوای ڕێگەیەکی ئاسایش بۆ بازرگانیان بەرەو شام، هەندێکیان ئاماژەیان کرد بۆ ڕێگەی نەجدی عێراق، بە ڕاستی ئەو ڕێگەشیان گرتەبەر و، هەندێك بازرگانیان بەوێدا ڕۆیشتن لەوانە، ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب و سەفوانی کوڕی ئومەییە و حوەیتیبی کوڕی عەبدولعوززا، بارەکەشیان بایی سەدهەزار دینار زیو و شتی تر بوو، ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕێگەی یەکێك لە ئەندامانی دەزگای ئاسایشی ئیسلامی ناوی سولەیتی کوڕی نوعمان بوو(ڕەزای خوای لێ بێ)،[1] بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بە ناردنی زەیدی کوڕی حاریسە لەگەڵ سەد سواردا بۆ ڕێگەگرتن لە کاروانەکە، زەید بە کاروانەکە گەیشت لای ئاوێك قەردەی پێ دەوترێت، کە ئاوێکە لە ئاوەکانی نەجد، لە ڕێ هەرچی پیاوانی کاروانەکە هەیە هەڵاتن لە ترساندا و، موسڵمانان دەستیان گرتە سەر هەموو کاروانەکە و چاوساغەکەشیان بە دیل گرت کە ناوی ئیبنو حەییان بوو، دواتر لەبەر دەستی پێغەمبەر(ﷺ)دا موسڵمان بوو، ئینجا گەڕانەوە بۆ مەدینە و، پێغەمبەر(ﷺ) پێنجیەکی لادا و، ئەوەی مایەوە لەسەر پیاوانی پۆلە سەربازیەکە دابەشی کرد.[2]

## دووەم: غەزای بەنی قەینوقاع.

زوهری دەگێڕێتەوە ئەم غەزایە لەساڵی دووەمی کۆچی ڕوویداوە،بەڵام واقیدی و ئیبنو سەعد دەگێڕنەوە کە لە ڕۆژی شەممە لە ناوەڕاستی مانگی شەوالی ساڵی دووەمی کۆچی دابووە،[3] زۆربەی نووسەرانی ژیاننامەی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر ئەوە

---

١ بڕوانە: التربية القيادية (١٣٢/٣).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٥٨/٣).

٣ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٢٩٩/١).

یەك دەنگن کە ئەم غەزایە لە پاش جەنگی بەدر بووە، چونکە جولەکەی بەنی قەینوقاع پابەند نەبوون بەو ڕێککەوتننامەیەی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵیان ئەنجامیدا، بە ئەمەکیش نەبوون بەرامبەر پەیمانەکانیان، هەڵوێستێکی دوژمنانەشیان وەرگرت لە پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان، بە ئاشکرا تورەیی و حەسوودیان دەردەبڕی لە کاتی سەرکەوتنی موسڵمانان لە بەدر، دوژمنایەتی خۆشیان نەدەشاردەوە لە موسڵمانان.[1]

پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانی لە بازاڕەکەیاندا کۆکردەوە و ئامۆژگاری کردن و، بانگی کردن بۆ ئیسلام و، وریای کردنەوە خۆیان تووشی ئەوە نەکەن کە قورەیش تووشی هات لە بەدردا،[2] بەڵام ئەوان بەرەنگاری پێغەمبەر(ﷺ)یان کرد لە جیاتی ئەوەی گوێڕایەڵ بن بۆ برگەکانی ئەو ڕێککەوتننامەی ئەوانی خستە ژێر سەرۆکایەتی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەوان ڕووبەڕووی پێغەمبەر(ﷺ) بوونەوە و وتیان: ئەی موحەممەد بەوە هەڵنەخەڵەتێنیٚ چەند کەسێکی بیٚ ئەزموونت لە قورەیش کوشت کە شارەزای شەڕ کردنیان نەبوو، ئەگەر شەڕ لەگەڵ ئێمە بکەیت ئەو کاتە دەزانی کیٚ پیاوە، ئینجا تۆ تووشی کەسانی وەکو ئێمە نەبوویتە جاریٚ،[3] بەم شێوەیەیش قەیرانەکە گەورەوە بوو، چونکە لە وەڵامی ئەواندا هیچ شتێك بەدی نەکرا ئاماژە بکات بۆ پابەند بوون و ڕێزگرتن، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئەوان دوژمنایەتیان نیشان دەدا و، ئامادەیی شەڕکردنیان دەردەبڕی، ئیتر خوای گەورەیش دەربارەیان ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٢﴾ قَدْ كَانَ لَكُمْ ءَايَةٌ فِى فِئَتَيْنِ ٱلْتَقَتَا ۖ فِئَةٌ تُقَٰتِلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْىَ ٱلْعَيْنِ ۚ وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِۦ مَن يَشَآءُ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُو۟لِى ٱلْأَبْصَٰرِ﴾(ال عمران: ١٢-١٣).

---

١ بڕوانە: موسوعة نضرة النعيم (٢٦٩/١).

٢ بڕوانە: اليهود في السنة المطهرة (٢٧٦/١).

٣ هەمان سەرچاوە (٢٧٦/١).

**١- هۆکارە ڕاستەوخۆکان بۆ هێرشکردنە سەریان:**

کاتێك موسڵمانان لە جەنگی بەدر سەرکەوتن پێغەمبەر(ﷺ) ئەو قسانەی لەگەڵ جوولەکە کرد، بەنو قەینوقاع لە لای خۆیانەوە بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکەیاندا لەگەڵ موسڵمانان بۆ هەلێکیش دەگەڕان بیقۆزنەوە لە دژی موسڵمانان، تا ئەو ڕۆژەی ئەو هەلە سووك و ڕیسوایەیان قۆستەوە، کاتێك ژنە عەرەبێك هەندێك کاڵای پێبوو، لە بازاڕی بەنی قەینوقاع فرۆشتی، لەوێ لەلای ئاڵتوونچییەك دانیشت، ئەوانیش هەوڵیان دەدا ڕوومەتی ئاشکرا بکەن، ئەویش ڕازی نەدەبوو، ئاڵتوونچییەکە کردی بەچمکی پۆشاکەکەی و گرێی دا بە پشتێ یەوە، جا کاتێك هەڵسا عەورەتی کەوتە دەر، ئەوانیش پێکەنین و ئافرەتەکە هاواری کرد، لەو کاتە پیاوێکی موسڵمان هەڵی کوتایە سەر ئاڵتوون چیەکە و کوشتی، کە کابرایەکی جوولەکە بوو، جوولەکەکانیش هێرشیان کردە سەر موسڵمانەکە و کوشتیان، بۆیە کەسوکاری موسڵمانەکە هاواریان بردە لای موسڵمانان لە دژی جوولەکەکان، ئەوانیش تووڕەبوون و دوژمنایەتی کەوتە نێوان هەردوو لایانەوە.[١]

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لەو مەسەلەیە ئاگادار بوویەوە، لەسەر سوپایەکی موهاجیر و ئەنصارەکانەوە بەڕێکەوت بەرەو لایان، لە ڕۆژی شەممە لە نیوەی شەوال لە ساڵی دووەمی کۆچی،[٢] هەڵگری ئاڵای موسڵمانان لەو ڕۆژەدا حەمزەی کوڕی عەبدولموتتەلیب بوو(ﷺ)، جێنشینی پێغەمبەریش لە مەدینە ئەبو لوبابەی عەبدولمونزیری عومەری بوو،[٣] کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بەڕێکەوت بەرەو لایان، پەیمانەکەی بۆ گەڕاندنەوە بەپێی فەرمانی خوای گەورە:

﴿ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً فَانۢبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَىٰ سَوَآءٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْخَآئِنِينَ ﴾(الانفال: ٥٨).[٤]

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٥٤).

٢ بڕوانە: المغازي للواقدي (١/١٧٦)، الطبقات لابن سعد (٢/٢٨-٢٩).

٣ بڕوانە: تاريخ الطبري (٢/٤٨١).

٤ بڕوانە: اليهود في السنة المطهرة (١/٢٧٩).

**٢- گەمارۆدانیان:**

کە جوولەکەکان بە هاتنی پێغەمبەریان(ﷺ) زانی پەنایان بردە سەر قەڵاکانیان، پێغەمبەر(ﷺ) پانزە ڕۆژ گەمارۆی دان - وەکو ئیبنو هیشام دەگێڕێتەوە[1] - گەمارۆدانەکە هەر بەردەوام بوو، تاکو خوای گەورە ترس و بیمی خستە دڵەکانیانەوە و، ناچاربوون دابەزن لەسەر حوکمی پێغەمبەر(ﷺ) چونکە پێغەمبەر(ﷺ) سەرسامی کردن بەو گەمارۆیە و، تووشی شڵەژان و سەرلێشێوان بوون، دوایی هەموو فریاکەوتنێکیان لێ بڕا، ئیتر وەکو ئەوە بوو لە زیندان بن و لە کۆتاییدا تووشی بێ هیوایی بوون لە بەرگری و خۆڕاگرتن، ئەوان دوای ئەوەی هەڕەشەیان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد کە لە قورەیش بەهێزترن، ناچاربوون دابەزنە سەر حوکمی پێغەمبەر(ﷺ)،[2] فەرمانی کرد ببەسترێنەوە، بۆ ئەو مەبەستەیش مونزیری کوڕی قودامەی سولەمی ئەوسی بەکارهێنا.[3]

**٣- چارەنووسی جوولەکەکانی بەنی قەینوقاع:**

ئیبنو سەلول سەرکردەی مونافیقەکان هەوڵی دا کۆتی هاوپەیمانەکانی بکاتەوە، جا کاتێك بە لایاندا تێپەڕبوون وتی: بیانکەنەوە، مونزیر وتی: ئایا کۆتی کەسانێك دەکەنەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کۆتیانی کردووە؟ سوێند بە خوا هەر کەسێك بیانکاتەوە لە گەردنی دەدەم،[4] بۆیە عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول ناچار بوو داوای دەرکردنی ئەو فەرمانە لە پێغەمبەر(ﷺ) بکات، کە ئازادیان بکات،[5] هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەی موحەممەد، چاك بە لەگەڵ هاوپەیمانەکانم - ئەوان هاوپەیمانی خەزرەج بوون - پێغەمبەر(ﷺ) دواکەوت لە وەڵامدانەوەیدا، ئەویش دووبارە وتی: ئەی موحەممەد چاك بە لەگەڵ هاوپەیمانەکانم، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ڕووی لێ وەرگێڕا، ئیبنو ئوبەی دەستی کردە

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٥٥).
٢ بڕوانە: الصراع مع اليهود لأبي فارس (١/١٤٤).
٣ بڕوانە: اليهود في السنة المطهرة (١/٢٨٠).
٤ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٥/٣٢).
٥ هەمان سەرچاوە (٥/٣٣).

گیرفانی قەلغانەکەی پێغەمبەر(ﷺ)و پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی فەرموو: بەرمدە و تورەبوو و ڕوخساری تێکچوو، ئینجا فەرمووی: بەڵات لێکەوێت بەرمدە، وتی: نە بەخوا، بەرتنادەم تاکو چاکە نەکەی لەگەڵ هاوپەیمانەکانم.

تۆ دەتەوێت لە یەك ڕۆژدا لە ناویان ببەیت؟ سوێند بە خوا پیاوێکم لە بەڵا و کارەسات دەترسم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: با بۆ تۆ بن.[1]

پێغەمبەر(ﷺ) ئازادی کردن، بەڵام فەرمانی کرد بەدەرکردنیان، پێغەمبەر(ﷺ)و هاوەڵان ماڵەکانیان وەکو غەنیمەت بۆ خۆیان برد، ئەو کەسەیش هەڵسا بە کۆکردنەوە و ژماردنی ماڵەکانیان موحەممەدی کوڕی مەسلەمە بوو(ﷺ) ئیبنو ئوبەی هەوڵیدا لەگەڵ پێغەمبەر قسە بکات بۆ ئەوەی لە جێگەکانی خۆیان جێگیریان بکات و دەریان نەکات، بینی عومەیری کوڕی ساعیدەی ئەنصاڕی لە دەرگاکەی ڕاوەستاوە و ڕێگەی لێ گرت بچێتە لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێی وت: نابێت بچیتە ژوورەوە تاکو پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەت پێ نەدات، بەڵام ئیبنو ئوبەی پاڵی بە عویمەوە نا و ئەویش زۆر توندی نواند بەرامبەری و تاکو ڕوومەتی بەر دیوارەکە کەوت و خوێنی لێ هاتە خوارەوە.[2]

ئەم هەواڵە تێگەیشتنی سیاسی پێغەمبەر(ﷺ)مان پیشان دەدات، لە مامەڵەکردنی لەگەڵ ئیبنو سولول کە داواکارییەکەی بەجێهێنا، بەڵکو بە ئەم هەڵوێستە ببێتە مایەی پاك کردنەوەی دڵی و هیدایەت وەربگرێت، یان بەڵکو ئەوانەی شوێنکەوتووی ئەون چاك ببنەوە بە چاکبوونی ئەو و ڕیزەکان یەك بگرنەوە و دوژمنانی ئیسلام جارێکی تر کاریگەرییان نەبێت لەسەری.[3]

لە لایەکی تریشەوە پێغەمبەر(ﷺ) پەرۆش بوو بۆ ئەوەی هیچ ئاژاوەیەك دروست نەبێت لە کۆمەڵگەی خاوەن باوەڕاندا، چونکە هەندێك لە ئەنصاڕەکان، تازە موسڵمان بووبوون، مەترسی هەبوو کە سەری مونافیقان بەو ناوبانگەی کە هەیبوو کاریان تێ بکات،[4] بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) شێوازی بە تەنگەوەهاتنی لەگەڵیان

---

١ بڕوانە: اليهود في السنة المطهرة (٢٨١/١).

٢ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٢٣٠/٥).

٣ بڕوانە: المنهج الحركي للسيرة النبوية للغضبان (٢٤٧).

٤ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٣٢/٥).

ڕەچاوکرد، هەروەها ئارامگرتن لەسەر خەراپەکارییەکانی، بە مەبەستی دروست نەبوونی ئاژاوەو دەرخستنی ڕاستی ئەو پیاوە، بۆ ئەوەی دەوروبەرەکەی لێی برەوێنەوە و سۆزیان نەبێت بۆی، ئەم مامەڵەیەیش سەرکەوتنێکی بەرچاوی بەدەست هێنا، چونکە ڕاستی ئیبنو سولول بۆ هەموو کەسێك دەرکەوت تەنانەت بۆ نزیکترین کەسەکانی خۆی، وەکو عەبدوڵای کوڕی، جا لە پاش ئەوەی کە بیویستایە قسە بکات بێ دەنگیان دەکرد و، لە قسەکانی قەڵس دەبوون،[1] بەڵکو ویستیان بیکوژن.

### ٤- نکۆڵی کردنی عوبادەی کوڕی صامیت لە ئەوان:

کاتێك بەنو قەینوقاع پەیمانەکەیان شکاندو عوبادەی کوڕی صامیتیش یەکێك بوو لە بەنی زوهرە – کە وەکو عەبدوڵای کوڕی ئوبەی ئەوانیش هاوپەیمانێتیان هەبوو لەگەڵیان – بەڕێکەوت بەرەو لای پێغەمبەر(ﷺ) نکۆڵی کرد لە هاوپەیمانیان لە لای خوا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا، من هاوپەیمانی خوا و پێغەمبەر و ئیماندارانم، نکۆڵی دەکەم لە هاوپەیمانێتی ئەو بێباوەڕانە یان خۆشەویستیان.[2]

کاتێکیش بڕیاری دەرکردنی بەنی قەینوقاع درا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی بە عوبادە کرد دەریان بکات، ئەوانیش وتیان: ئەی باوکی موحەممەد لە نێو هەموو ئەوس و خەزرەجدا وامان بەسەر دەهێنن و، هاوپەیمانی تۆین؟ عوبادە پێیانی وت: کاتێك شەڕیان ڕاگەیاند هاتمە لای پێغەمبەر(ﷺ) و نکۆڵیم کرد لە هاوپەیمانێتی ئێوە و هەر کەسێکیش هاوپەیمانی ئێوە بێت، ئەوان تەماشای ئیبنو ئوبەی و عوبادەیان وەکو یەك دەکرد، عەبدوڵای کوڕی ئوبەی وتی: چۆن نکۆڵیت کرد لە هاوپەیمانێتی ئەوان؟ ئەمە ناگونجێت لەگەڵ چاکەکانی ئەوان لەگەڵ تۆ، ئینجا هەندێ شتی وەبیر خستەوە و، عوبادە وتی: ئەی باوکی حوباب، دڵەکان گۆڕان و، ئیسلام پەیمانەکانی سڕیەوە، سوێند بە خوا تۆ بە مەسەلەیەکەوە بەسراویتەوە

---

١ بڕوانە: الصراع مع اليهود لأبي فارس (١٤٨/١).
٢ بڕوانە: اليهود في السنة المطهرة (٢٨٢/١–٢٨٣).

سبەی گومڕاییەکەیت بۆ دەردەکەوێت، قەینوقاع وتیان: ئەی موحەممەد، ئێمە قەرزمان هەیە لە لای خەڵکی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: پەلە بکەن لە ئەنجامدانی کارەکانتان، عوبادە داوای لێکردن کۆچ بکەن و دەربچن، ئەوانیش داوای مۆڵەتیان کرد، ئەویش پێی وتن: بۆ یەك ساتیش بوارتان پێ نادەم، سێ ڕۆژتان بە دەستەوەیە و هیچی تر، ئەوە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەگەر بە دەستی خۆیشم بوایە هەر بوارم پێ نەدەدان، پاش تێپەڕبوونی سێ ڕۆژەکە، بە دوایاندا دەرچوو تاکو گەیشتنە ڕێگای شام و پێی وتن: بەرزاییە دوورەکەی دوورتر و دوورتر، تا ماوەیەکیش هەر لە دوایان ڕۆیشت و ئەوان خۆیان گەیاندە(اذرعات).[1]

بەم شێوە بەنو قەینوقاع بەسەرشۆڕی لە مەدینە دەرچوون، چەکەکانیان فڕێدا و ماڵەکانیان بە غەنیمەت بەجێهێشت بۆ موسڵمانان، ئەوان ئازاترین ئەو جوولەکانە بوون کە لە مەدینە بوون، لە ڕووی ژمارە و کەرەستەوە، بۆیە هۆزەکانی تری جوولەکە کپ و بێ دەنگ بوون بۆ ماوەیەك پاش ئەم زەبرە گورچك بڕە، ترس و بیمیش زاڵ بووە سەر دڵەکانیاندا.[2]

**٥- ئەو ئایەتانەی دابەزین دەربارەی هاوپەیمانێتی ئیبنو سلول بۆ جوولەکە و نکۆڵی کردنی عوبادەی کوڕی صامیت لە ئەوان:**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمۡ يَقُولُونَ نَخۡشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٞۚ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَ بِٱلۡفَتۡحِ أَوۡ أَمۡرٖ مِّنۡ عِندِهِۦ فَيُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ نَٰدِمِينَ ﴿٥٢﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ إِنَّهُمۡ لَمَعَكُمۡۚ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فَأَصۡبَحُواْ خَٰسِرِينَ ﴿٥٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ

---

١ بڕوانە: اليهود في السنة المطهرة (١/٢٨٤-٢٨٥).

٢ بڕوانە: الصراع مع اليهود لأبي فارس (١/١٤٩).

أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ ۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٤﴾ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ ﴿٥٥﴾ وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴾(المائدة: ٥١-٥٦).

ئیبنو عەتییە دەربارەی ئەم ئایەتانە دەفەرمووێت: لە پاش تەواوبوونی بەدر و، ئەوەی ڕوویدا لە بەنی قەینوقاع، پێغەمبەر(ﷺ) ویستی بیانکوژێت، ئیتر عەبدوڵای کوڕی ئوبەی هەڵسا بۆ بەرگریکردن لێیان کە هاوپەیمانیان بوو، عوبادەی کوڕی صامیتیش وەکو عەبدوڵا هاوپەیمانی ئەوان بوو، بەڵام کاتێك عوبادەی ئاگاداری بڕیاری پێغەمبەر(ﷺ) بوو لە ئەواندا، چووە لای و نکوڵی خۆی لە ئەوان دەربڕی، بەڵام عەبدوڵای کوڕی ئوبەی وتی: بەڵام من نکوڵی ناکەم لە هاوپەیمانێتی ئەوان، چونکە من نامکرێت بەبێ ئەوان، من کابرایەکم لە بەڵا و کارەسات دەترسم.[١]

جیاوازی ئاشکرایە لە نێوان ئیبنو سەلول کە نگرۆی نیفاق بوو، لەگەڵ عوبادەی کوڕی صامیت(ﷺ)، کە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر(ﷺ) پەروەردە بوو بوو، دڵ و دەروونی خاوێن بوویەوە و ئیمانی پتەو بوو، ڕزگاریشی بووبوو لە دەمارگیری و نەفامی و ئارەزوو.......[٢]

## سێ یەم: کۆتایی پێهێنانی هاندەران لە دژی دەوڵەتی ئیسلامی و، کوژرانی کەعبی کوڕی ئەشرەف.

مەترسی ئەوانەی هانی ئاژاوەیان دەدا کەمتر نەبوو لە مەترسی ئەوانەی بە شمشێرەکانیان موسڵمانانیان دەکوشت، چونکە ئەوانە نەبوایەن ئاژاوە هەڵنەدەگیرسا، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) بەدوای ئەو هاندەرانەدا دەڕۆیشت و دەیکوشتن بەمەبەستی لەناو بردنی ئاژاوە و، سەرخستنی هەق، کەسانێکی لێ کوشتن لە پاش

---

١ بڕوانە: المحرر الوجيز لابن عطية (١/٤٧٧-٤٧٨).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (١/٣٠٢).

جەنگی بەدر، وەکو:

**أ ـ عەسمائی کچی مەروان:**

هانی خەڵکی دەدا لە دژی پێغەمبەر(ﷺ) و قسەی ناشرینی بە ئیسلام دەکرد، عومەیری کوڕی عەدی خوتەمی ڕەزای خوای لێبێت ئەو ئافرەتەی کوشت و، کاتێك پرسیاری کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی ئەو کارەی ئەنجامی داوە، پێی فەرموو:((نصرت الله ورسوله يا عمير))[1] واتە: تۆهەڵسای بەسەرخستنی خوا و پێغەمبەر، سەرئەنجامیش چەند کەسێك لە بەنی خەتەمە موسڵمان بوون، ئەوەشیان موسڵمانێتی خۆیان دەشاردەوە ئاشکرایان کرد.[2]

**ب ـ کوژرانی ئەبو عەفەکی جوولەکە:**

ئەبو عەفەك پیاوێکی پیربوو لە بەنی عەمری کوڕی عەوف، جولەکەیەك بوو هانی خەڵکی دەدا دژایەتی پێغەمبەر(ﷺ) بکەن و هۆنراوەی هەڵدەبەست، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کێ توانای لە ناوبردنی ئەو پیاوە پیسەی هەیە؟ ئیتر هاوەڵێك هەڵسا بەکوشتنی ناوی سالیمی کوڕی عومەیر بوو.[3]

**ج- کوژرانی کەعبی کوڕی ئەشرەف:**

کەعبی کوڕی ئەشرەف لە بەنی نەبهان بوو لە هۆزی تەی، باوکی کەسێکی کوشتبوو لە سەردەمی جاهیلی و، هاتبوویە مەدینە و هاوپەیمانێتی کردبوو لەگەڵ(بني النضير) و عەقیلەی کچی ئەبی حەقیقی مارەکردبوو کە کەعبی کوڕی لەو ئافرەتە بوو،[4] کەعب شاعیرێك بوو دوژمنی ئیسلام بوو، بە سەرکەوتنی موسڵمانانیش لە جەنگی بەدر زۆر ناڕەحەت بوو، بۆیە سەفەری کرد بۆ مەککە و لەوێ دەستی کردە جنێوفرۆشتن بە پێغەمبەر(ﷺ) و هانی قورەیشی دەدا بۆ تۆڵەسەندنەوەی کوژراوەکانیان کە بۆیان دەگریا لە هۆنراوەکانیدا و، بانگەشەی

---

١ مجمع الزوائد، كتاب المناقب، رقم (١٤٥٥٧).

٢ بڕوانە: نضرة النعيم في مكارم اخلاق الرسول الكريم (١/٢٩٥).

٣ بڕوانە: نضرة النعيم في مكارم اخلاق الرسول الكريم (١/٢٩٦).

٤ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٥٨).

دەکرد بۆ لەناوبردنی پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان هەر بەردەوامیش بوو لەسەر ئەو کارانەی، ئەبو سوفیان پێی وت: سوێندت دەدەم بە خوا، ئایینی ئێمە لە لای خوا پەسەندە، یان موحەممەد و هاوەڵەکانی؟ وتی: ئێوە ڕێگاتان ڕاستترە،[1] ئینجا دەرچوو و ڕای بتپەرستانی کۆکردەوە لەسەر شەڕکردن لەدژی پێغەمبەر(ﷺ) و بە ئاشکرا دژایەتی و قسەی ناشرینی پێ دەکرد.[2]

کاتێك هاتە مەدینەیش بە ئاشکرا دژایەتی پێغەمبەر(ﷺ)ی دەکرد و جنێوی پێ دەدا، بەڵکو بێ ئابڕوویی گەیشتە ئەوەیش کە زمانی درێژکاتەوە سەر ئافرەتە موسڵمانەکان، وەکو ئەوەی هۆنراوەیەکی دڵداریانەی وت لەسەر(ام الفضل)ی کچی حاریس کە خێزانی عەبباسی مامی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، تیایدا دەیوت:

| | |
|---|---|
| اذاهب انت لم تحلل بمنقبة | وتارك انت ام الفضل بالحرم |
| صفراء رادعة لو تعصر انعصرت | من ذي القوارير والحناء والكتم |
| احدى بني عامر هام الفؤاد بها | ولو تشاء شفت كعباً من السقم |
| لم ار شمساً بليل قبلها طلعت | حتى تبدّت لنا ليلة الظلم |

**١- حەسانی کوڕی سابیت کەعبی کوڕی ئەشرەفی دەمکوت دەکردەوە:**

پێغەمبەر(ﷺ) هانی حەسسانی دەدا بەرەنگاری کەعب ببێتەوە. هەروەها ئاگاداری دەکردەوە کەعب لە کوێ دابەزیووە لە مەککە، بۆ نموونە کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) حەسانی ئاگادار کردەوە لە دابەزینی کەعب لە ماڵی ئەبو وەداعەی کوڕی زوهەیری سەهمی، حەسان هۆنراوەی بەسەریاندا هەڵبەست و بۆیە عاتیکەی کچی ئوسەیدی خێزانی ئەبو وەداعە هەڵسا بە دەرکردنی کەعبی کوڕی ئەشرەف و بە مێردەکەی وت: چیمان داوە لەم جوولەکەیە؟ ئایا نابینی حەسان چیمان پێدەکات؟[3]

---

١ بڕوانە: التاريخ الاسلام للذهبي، (١٥٨).
٢ بڕوانە: التاريخ الاسلام للذهبي، (١٥٨).
٣ بڕوانە: الصراع مع اليهود لأبي فارس (١/١١١).

دوای ئـەوە حەسـان چـووە مـاڵێکی تـر، بـە هـەر لایەکیـشدا بڕۆیـشتایە پێغەمبەر(ﷺ) حەسانی ئاگادار دەکردەوە لە جێگاکەی و ئەویش هۆنراوەی لەسـەر دەوتن و دەبووە مایەی دەرکردنی کەعب لەو ماڵە، بۆیە ناچار بـوو بگەڕێتـەوە بـۆ مەدینە بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی چارەنووسی خۆی ببێتەوە.[١]

**٢- سزای ئیبنولئەشرەف:**

ئیبنولئەشـرەفی جوولەکـە تاوانگـەلێکی زۆری ئەنجامـدا، هـەروەها ناپـاکی و خراپەیشی زۆر بوو لە دژی پێغەمبەر(ﷺ) و موسـڵمانان بـە گشتی، هـەر یـەك لـەو تاوانانەیش بـە هەڵوەشاندنەوەی دەژمێردرێـت بـۆ پـەیمان و شایستەی کوشـتنە، نەخوازەڵا ئەو هەموو تاوانە لە کەسێکی خراپەکاردا کۆببێتەوە.[٢]

ئیبنولئەشرەف بـە جنێـوانی بـە پێغەمبـەر(ﷺ) و سـۆز دەربـڕین بـۆ دوژمنـانی موسڵمانان و، لاواندنەوەی کوژراوەکانیان، پەیمانەکـەی هەڵوەشـاندەوە و، خـوێنی ڕەوابوو، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە کوشـتنی،[٣] ئیمـامی بوخـاری هـەواڵی کوشـتنەکەی شـیکردۆتەوە و، بـە ئیـسنادی خـۆی لـە جـابیری کـوڕی عەبـدوڵا دەگێڕێتەوە کە فـەرموویەتی: پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمووی:(من لكعب بن الاشرف؟ فانـه اذى الله ورسـوله) واتـە: کـێ دەتوانێـت کـەعبی کـوڕی ئەشـرەف بکوژێـت چـونکە خەراپەی کردووە بەرامبـەر خـوا و پێغەمبەرەکـەی، موحەممـەدی کـوڕی مەسـلەمە هەڵسا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، حەز دەکەی بیکوژم؟ فەرمووی: بەڵێ.

وتی: کەواتە ڕێگەم بدە هەندێ قسە بکەم فەرمووی: بیکە.

موحەممـەدی کـوڕی مەسـلەمە چـووە لای کـەعب و وتـی:[٤] موحەممـەد داوای زەکاتمـان لێـدەکات و بـاری قـورس کـردووین، منـیش هاتوومەتـە لات قـەرزم پـێ بدەیت، وتی: سوێند بە خوا بێزاریش دەبن لێی، موحەممەد وتی: ئێمە تازە شوێنی کەوتووین و حەز ناکەین وازی لێ بهێنین، تاکو بۆمان دەرکەوێت مەسەلەکەی بەرەو

---

١ هەمان سەرچاوە (١/١١١).

٢ بڕوانە: الصراع مع اليهود لأبي فارس (١/١١٢).

٣ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (١/٣٠٤).

٤ ئەوەی لە کتێبی (السيرة النبوية)ی ئیبنوهیشامدا هاتووە ئەبو نائیلە چۆتە لای کەعب.

کوێ دەچێت، ئێمەیش هاتووین داوای بارێك یان دوو بارت لێ دەکەین. وتی: باشە، بەڵام شتێکم لا دابنە وەکو بارمتە.

وتیان: چیت دەوێت؟

وتی: ژنەکانتان.

وتیان: چۆن ژنەکانمان بخەینە لات کە تۆ جوانترینی ناو عەرەبی؟

وتی: باشە کوڕەکانتان بخەنە لام.

وتیان: چۆن کوڕەکانمان بخەینە لات و دوایی پێیان بوترێت: لە بری کۆڵێك یان دوو کۆڵ خورما بارمتە کراون، ئەوە سەرشۆڕیە بۆ ئێمە، بەڵکو ئێمە چەکەکانمان لە لات دادەنێین.

بەڵێنی پێدا بە شەو چەکەکانی بۆ ببات لەگەڵ ئەبو نائیلەی برای شیری کەعب، ئەویش بانگی کردن بۆ قەڵاکەی و دابەزی بۆ لایان، ژنەکەی پێی وت: لەم کاتە بۆ کوێ دەردەچیت؟

وتی: موحەممەدی کوڕی مەسلەمە و ئەبو نائیلەی برامە.

وتی: گوێم لە دەنگێکە دەڵێی خوڕەی خوێنە.

وتی: موحەممەدی کوڕی موسلەمە و ئەبو نائیلەی شیربرامە، پیاوی بەخشندە ئەگەر بۆ کوشتنیش بانگ بکرێت بە شەو دەڕوات، موحەممەدی کوڕی مەسلەمە دوو پیاوی لەگەڵ خۆی هێنایە ژوورەوە و،[1] وتی: کاتێك هات من بۆنی سەری دەکەم، ئەگەر منتان بینی باوەشم پیاکرد ئێوە لێی بدەن، کەعب دابەزی بۆ لایان بۆنی گوڵاوی لێدەهات، موحەممەد وتی: بۆنی وا خۆشم هەرگیز نەکردووە پێشتر، ڕێگەم ئەدەی بۆنی سەرت بکەم؟

کەعب وتی: بەڵێ بۆنی بکە.

ئینجا وتی: ئایا ڕێگەم دەدەیت؟

---

١ لە کتێبەکانی ژیاننامەدا هاتووە، ئەوانەی هەڵسان بە کوشتنی ئەمانە بوون موحەممەدی کوڕی مەسلەمەو، سیلکانی کوڕی سەلامەی کوڕی وەقش کە ئەبو نائیلەیە و لە بەنی عەبدولئەشهەل بوو، برای شیری کەعبی کوڕی ئەشرەفیش بوو، هەروەها عەببادی کوڕی بیشری کوڕی وەقش، ئەویش یەکێك بوو لە بەنی عەبدولئەشهەل و، ئەبو عەبسی کوڕی جەبر یەکێك بوو لە بەنی حاریسە.

وتی: بەڵێ، کاتێك باوەشی پیاکرد وتی: بیکوژن، ئەوانیش کوشتیان و گەڕانەوە لای پێغەمبەر(ﷺ)و ڕووداوەکەیان بۆباسکرد.[١]

لە((السيرة النبوية)) یئیبنوهیشامدا هاتووە، کەموحەمەدی کوڕی مەسلەمە سێ ڕۆژ مایەوە پاش ئەوەی ئامادەیی دەربڕی بۆکوشتنی کەعب، نان و ئاوی نەدەخوارد ئەوەندە نەبێت کە پێی بژی، پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بە دوایدا و وتی: بۆچی وازت لە نانو ئاو هێناوە؟

وتی: ئەی پێغەمبەری خوا قسەیەکم کردووە لە لات نازانم ئەتوانم بەسەری ببەم یان ناتوانم؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: تۆ هەوڵت لەسەرە.

وتی: پێویستە هەندێ قسە بکەین. فەرمووی: هەرچی قسەیەك ئەکەن بیکەن.[٢]

هەروەها لە سیرەی ئیبنو ئیسحاقدا هاتووە بەئیسنادێکی حەسەنەوە لە ئیبنو عەبباسەوە(ڕەزای خوایان لێ بێت) کە پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵیان ڕێی کرد تاکو گەیشتە بەقیعی غەرقەد و بەڕێی خستن و فەرمووی: بەڕێکەون لەسەر ناوی خوا، خوایە یارمەتی دەریان بە.[٣]

**پەند و ئامۆژگاری:**

هەندێ پەند و ئامۆژگاری لە تێگەیشتنی پێغەمبەر(ﷺ) وەردەگرێت سەبارەت بە مامەڵەکردنی لەگەڵ ناحەزانی ئیسلام و دەوڵەتی ئیسلامی، بۆ نموونە بۆ مان دەردەکەوێت کە سزای پەیمان شکێن کوشتنە، هەروەها سزای ئەو خاوەن پەیمانەی کە جنێو بە پێغەمبەر(ﷺ) دەدا و ئازاری دەدا کوشتنە، بەڵکو ئەوە وەردەگیرێت هەر کەسێك خاوەن پەیمان بێت یان کەسی تر، ئەگەر جنێو بە پێغەمبەر(ﷺ) بدات دەکوژرێت، وەکو ئیبنو تەیمیە ئەم مەسەلەیەی بە جوانی شی کردۆتەوە لە کتێبی(الصارم المسلول على شاتم رسول الله).

---

١ البخاري في المغازي، باب (قتل كعب بن الاشرف) رقم ٤٣٧).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٦١/٣).

٣ هەمان سەرچاوە (٦٢/٣).

*لە شێوازی جێبەجێکردنی سزاکە ئەوە وەردەگیرێت کە حوکم دەکرێت بە نهێنی جێبەجێ بکرێت، بە تایبەت ئەگەر بە ئاشکرا جێبەجێ کردنی ببێتە مایەی ئاژاوە و، یان زیانبەخش بێت بۆ موسڵمانان،[1] هەروەها ئەوەمان بۆ ڕوون بوویەوە کە ڕووبەڕووبوونەوەی، دوژمنی ئیسلام تەنها لە گۆڕەپانی جەنگدا نیە، بەڵکو هەر کارێکی تریش دەبێت کە زیان بە دوژمن بگەیەنێت بە مەرجێك تاوان نەبێت، لەوانەش لەناوبردنی کەسێك کە ڕۆڵی گەورە بگێڕێت لە دوژمنایەتی ئیسلام، زیانێکی زۆر لە موسڵمانان بگێڕێتەوە.

ئەمەیش لە حاڵەتێکدا دەبێت مەترسی دروست بوونی ئاژاوە نەبێت و، موسڵمانان بەهێز بن و، ئەو جۆرە کارە نەبنە مایەی زیان گەیاندن بە موسڵمان و، بنبڕکردنی بانگخوازەکان لە وڵاتەکانیان و تێکدانی کۆمەڵگاکانیان،[2] هەندێ موسڵمانانیش تووشی هەڵەبوون لە جیهانی ئیسلامی و پەلەیان کرد لە ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازی و، ئەم ڕووداوەیان کردە بەڵگە، هیچ بەڵگەیەکیشی تیا نیە بۆیان، چونکە ئەوە لە مەدینە بوو، لە کاتێکدا موسڵمانان خاوەن دەسەڵات بوون لەوێ و دەوڵەتیان هەبوو، بەڵام ئەوان نە دەسەڵات و نە دەوڵەتیان هەیە، ئینجا ئەو کارەیان سەرخستنی ئایین و تۆقاندنی بێباوەڕانی تیابوو، هەموویشی بەرژەوەندی بوو و خەراپەی تیا نەبوو، بەڵام ئەو جۆرە کارانە کە لە سەردەمانی لاوازیدا ئەنجام دەدرێت خراپە و خوێن ڕێشتنی موسڵمانانی بە دوادا دێت، هەروەها زیان دەکەوێتە بەر ماڵ و ئابڕوویان بە شێوەیەك کە لە هەموو هۆشمەندێکەوە دیارە.[3]

پێغەمبەر(ﷺ) هەوڵی لەناو بردنی هیچ کەسێکی نەدا لە مەککە، سەرەڕای ئەوەی کە توانایشی هەبوو سەرانی بتپەرستان بکوژێت وەکو ئەبو جەهل و، ئومەییەی کوڕی خەلەف و، عوتبە و، ئەگەر ئاماژەیەکیشی بکردایە بۆ حەمزە یان عومەر، یان هەر کەسێك لە هاوەڵان بەو کارە هەڵدەسان، بەڵام تێگەیشتنی

---

١ بڕوانە: الصراع مع اليهود لأبي فارس (١/١١٥).
٢ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٥/٥٤).
٣ بڕوانە: وقفات تربوية مع السيرة النبوية (٢٠٥).

پێغەمبەرایەتی وامان فێر ناکات، ئەو جۆرە کارەیش پێویستی هەیە بە فەتوای ڕاست لە خاوەن زانست و کەسی تێگەیشتوو لە فیقهی بەرژەوەندی و خراپییەکان، لە سەردەمێکی وەکو ئەم سەردەمەی خۆمان کە بەرژەوەندییەکان بە یەکدا تێکەڵ بوونە و ڕای گشتی ڕۆڵی گەورەی هەیە لە بڕیاری دەوڵەتەکاندا و، ئەگەری فراوانبوونەوەی زیانەکان زۆرترە، هەرگیز کاری لەو جۆرە ئاسان نییە ڕێگە بدرێت.[1]

*ئینجا تێبینی گرنگی وشە دەکەین لە لای هاوەڵان، وەکو دەردەکەوێت لە هەڵوێستی موحەممەدی کوڕی مەسلەمە – ﷺ – پاش ئەوەی بەڵێنیدا بەپێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە کوشتنی کەعبی کوڕی ئەشرەف و دواکەوتنی بەجێهێنانی بەڵێنەکە، دەبینین ئەو نان و ئاوی لە خۆی قەدەغە کرد و خەم و پەژارە دایگرتەوە چونکە ترسا بەڵێنەکەی بەسەر نەبات، بەڵام لە کۆمەڵگاکانی خۆمان دەبینین خەڵکی بەڵێن دەدەن و لێی پەشیمان دەبنەوە، چونکە خاوەن هەڵوێستی بەهێز نین لە پێناو خوای گەورە، بەڵکو خاوەن بەرژەوەندی خۆیانن.

خاوەن بانگەوازەکان پێیان خۆشە گەردنیان ببڕدرێتەوە، بەڵام بەڵێن و پەیمانەکانی خۆیان نەشکێنن.[2]

* فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ)..(انما علیك الجهد)[3] واتە: تۆ هەوڵت لەسەرە، ئاراستەیەکی بەڕێزی پێغەمبەرانەیە کە سەرکەوتن بە دەست نایەت پاش هەوڵ و کۆشش نەبێت، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿تِلْكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهَا إِلَيْكَ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَا أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَٰذَا فَاصْبِرْ إِنَّ الْعَاقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ﴾(هود: ٤٩).

موسڵمان پێویستە لەسەری هەموو هەوڵەکانی بخاتە گەڕ بۆ جێبەجێکردنی بەڵێنەکانی، لە پاش ئەوەیش پشت بە خوای گەورە ببەستێت.[4]

---

١ بڕوانە: الاساس في السنة وفقهها السيرة النبوية (٢\٥٣٧).

٢ بڕوانە: الصراع مع اليهود (١/١١٩).

٣ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٦١).

٤ بڕوانە: الصراع مع اليهود (١/١٢٠).

*هەروەها فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ):((قولوا مابدا لكم))[١] واتە: ئەوەی پێتان باشە بیڵێن، زانستێکی پێغەمبەرانەی تیایە، چونکە ئەو قسانە لە کاتی ئاساییدا کوفرە، لێرەشەوە بۆمان دەردەکەوێت لە پێناوی بەدیهێنانی ئەرکە سەربازییەکان سنوورێك دانراوە بۆ ئەو قسانەی کە دەکرێن، بەڵام مەسەلەیەکی تر هەیە، ئەویش ئەوەیە سەبارەت بە کردەوە، چ جۆرە کردەوەیەك ڕەوایە لە پێناو ئەو مەبەستە ئەنجام بدرێت، وەکو وازهێنان لە فەرزەکان، لەم بارەشەوە وتوویانە: کار نییە لە کوفر و شیرك خراپتر، جا ئەگەر ئەوە ڕەوا بێت، شتی تر ڕەواترە لە پێناو ئەو مەبەستانە، بە مەرجێك ئەو ڕێگایە دڵنیایی لەسەر دروست بووبێت کە ڕێگایەکی گەیەنەرە بە ئەنجام، بە مەرجێکی تریش ئەوەندەی لێ بکرێت کە بەبێ ئەوە کارەکە ئەنجام نەدرێت.

ئیتر ئایا ئەو هۆکارە دواخستنی فەرزێك بێت یان ئەنجامدانی قەدەغەیەك بێت، بەڵام ئەمە و ئەوەیش سنووردارن، بۆ نموونە هەندێ قەدەغەکراو هەیە بە هیچ شێوەیەك ڕەوا نییە ئەنجامدانی وەکو داوێن پیسی.[٢]

هەندێ کێشە و مەسەلەی گەورەیش هەیە تەنها زانا گەورەکان دەتوانن فەتوای تیا بدەن، بە تایبەتی لە حاڵەتە جیاوازەکاندا، حوکمە بنچینەییەکان شاراوە نین، بەڵام ئەو حوکمانەی کە جیاوازن پێویستە هەندێ زانای زۆر شارەزا قسەی تیا بکەن کە توانای تێگەیشتنی شەریعەتیان هەبێت و ئەو ڕووداوانەیش کە تیایدا دەژین.[٣]

* فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ):((قولوا مابدا لكم)) واتە: هەرچیتان پێ باشە بیڵێن، فیقهێکی مەزنە ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) ڕوونی دەکاتەوە کە دەفەرمووێت:((الحرب خدعة))[٤] واتە: جەنگ تەڵەکەیە.

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٦١).

٢ بڕوانە: الاساس في السنة وفقهها السيرة النبوية (٢/٥٣٧-٥٣٨).

٣ بڕوانە: الاساس في السنة وفقهها.

٤ صحيح مسلم رقم (١٧٤٠).

*فـەرموودەی پێغەمبـەر(ﷺ):((انطلقـوا علـى اسـم الله، اللـهم اعـنهم))[1] واتـە: بەڕێکەون بە ناوی خوا، خوایە یارمەتیان بدە، ئەم وشەیە هاندەرێك بـوو بۆیـان بـۆ خۆڕاگری و ورەبەرزکردنـەوە، بۆیـە گرنگیـان نـەدا بـەهێزی ئیبنوئەشرەف و ئـەو خەڵکانەی دەوروبەری، چونکە هەستیان دەکرد خوای گـەورەیان لەگەڵدایـە، ئینجـا تێبینـی دەکـەین پێغەمبـەر(ﷺ) هـەموو هۆیـە مادییـەکانی وەرگـرت و پـیلان و نەخشەی چاکی کێشا، پاڕانەوەشی لەبیر نەکرد، چونکە موسڵمان فەرمانی پێکراوە کۆبکاتەوە لـە نێـوان نەخشەکێـشان و دوعـاکردن و پـشت بـە خـوا بەسـتن،[2] بۆیـە پیلانەکـەی موحەممـەدی کـوڕی مەسـلەمە لەگـەڵ هـاوەڵانی زۆر تۆکمـە بـوو، ئـەو هۆیانەیش کە یارمەتیدا بۆ سەرکەوتنی کارەکەیان بەم شێوە بوو:

* ئەبو نائیلە برای شیری کەعب بوو، بۆیە ئەو هیچ ترسێکی لێ نەبوو.

* لە هەندێك ڕیوایەتدا هاتووە کە ئەبو نائیلە دڵی کەعبی خۆشکردووە و هەندێ هۆنراوەی بۆ وتووە پێش ئەوەی باسی پێویستیەکەی بکات.

* ئینجا باسی پێویستیەکەشی نەکرد تـاکو کەسـەکانی دەوروبـەری دەرنـەکرد، چونکە ئەگەر بمایەنەوە پێدەچێت کەعبیان وریـا بکردایەتـەوە، واتـە قـسەکردنیان لەگەڵی بە تەنها لە ئەوپەڕی سەرکەوتووییدا بوو.

* خۆیان وا دەرخست کە قسە بـە پێغەمبـەر(ﷺ) دەکـەن و بێـزارن لێـی، بۆیـە کەعب بە تەواوی دڵنیا بوو لێیان.

* بیرۆکەی بارمتەکردنی چـەك بیرۆکەیـەکی زۆر سـەرکەوتووبوو، چـونکە دواتـر چەکەکانیان نەبووە جێگای گومان، چـونکە هێناویانـە بـۆ دانـانی وەکـو بارمتـە و، بەکاریشی دەهێنن لە مەبەستەکەی خۆیان.

* وەرگرتنی کاتی دیاریکراو لـە کـەعبی کـوڕی ئەشـرەف تونـد و تـۆڵی بـوو لـە پلانەکە بۆ ئەوەی بتوانن لە هـەر کـاتێکی شـەودا بـێن و لـە دەرگـای بـدەن، بـەبێ

---

١ بڕوانە: السیرة النبویة لابن هشام (٦١/٣).
٢ بڕوانە: التاریخ الاسلامی للحمیدی (٦٥/٥).

ئەوەی گومانیان لێ بکات.

* دڵنیابوونی ئیبنولئەشرەف لە نائیلە و موحەممەدی کوڕی مەسلەمە، وای کرد کە بەو شەوە دەربچێت، کە مەترسی تیایە بۆ کەسێکی وەکو کەعب.[1]

* نەخشەی دوورخستنەوەی کەعب لە ماڵی خۆی بەبێ هیچ پشتیوانێك زۆر سەرکەوتوو بوو.

* هەڵسانی ئەبو نائیلە بە قایلکردنی کەعب بە بۆنکردنی سەری و گرتنی قژەسەری بۆ ئەوەی بۆنی بکات، کارێکی سەرکەوتوو بوو، چونکە بەتوندی گرتی و فەرمانی خوا لەو جوولەکە نەفرین لێکراوە ئەنجام درا.[2]

* توانای چاکی هاوەڵان دەردەکەوێت لە پاراستنی نهێنیدا، سەرەڕای زۆری مونافیقەکان لە مەدینە و دواکەوتنی جێبەجێکردنی و باسکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەو مەسەلە لە پێش چاوی هاوەڵاندا و، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بەهێزی ئیمانی ئەو هاوەڵانە و دڵسۆزییان بۆ ئایینەکەیان.[3]

**٣- کاریگەری کوژرانی ئیبنولئەشرەف لەسەر جوولەکەکان:**

هەواڵی کوژرانی کەعب لە مەدینە بڵاوبوویەوە، بۆیە قەشەکانی جوولەکە بە پەلە ڕۆیشتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، سکالایان دەکرد و ناڕەزاییان لە کاری هاوەڵانی دەردەبڕی، پێغەمبەر(ﷺ)یش هیچ بایەخی پێ نەدان،بەڵکو جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە کوژرانی دەرەنجامێکی سروشتییە بۆ هەڵوێستە ناحەزانەکەی، ئەم ڕووداوە ترس و بیمی خستە دڵی جوولەکەوە، بۆیە ئیتر هیچ لە سەرانیان نەیدەتوانی لە قەڵاکەی خۆی دەربچێت، جوولەکەکانیش هەموویان ترسیان پەیدا کرد لە موسڵمانان لە مەدینە،[4] ناچاریش بوون ڕێککەوتننامەکەیان دووبارە بکەنەوە، بەڵام هەر بەردەوام بوون لە پیلان گێڕان بۆ ئیسلام وەکو ڕوونی دەکەینەوە، جێگای ئاماژە پێکردنیشە کە پێغەمبەر(ﷺ)(بني النضير)ی سزا نەدا

---

١ بڕوانە: الصراع مع اليهود (١٢٢/١).
٢ هەمان سەرچاوە (١٢٢/١).
٣ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٥٦/٥).
٤ بڕوانە: التاريخ السياسي والعسكري (١٨٨).

لەسەر تاوانی کەعبی کوڕی ئەشرەف، بەڵکو تەنها کەعبی سزادا بەهۆی ناپاکییەکەی و، ڕێککەوتننامەی لەگەڵیان نوێ کردەوە،[١] لە فیقهی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە تێدەگەین کە چارەسەری گونجاو بۆ جوولەکە تێخوڕین و تۆقاندنە و کوشتنی ئاژاوەگێڕانیانە.[٢]

## چوارەم: هەندێ بۆنەی کۆمەڵایەتی.

### ١- هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ حەفصەی کچی عومەر:

عومەر – رضي الله عنه – دەفەرمووێت:((کاتێك حەفصەی کچم بێوەژن کەوت لە پاش مردنی خونەیسی کوڕی حوزافەی سەهمی مێردی، کە ئەو یەکێك بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) و لە مەدینە لە دونیا دەرچوو، عومەر دەفەرمووێت: چوومە لای عوسمانی کوڕی عەففان و حەفصەم بۆ پێشنیار کرد، وتی: تەماشای بارودۆخی خۆم دەکەم، پاش چەند شەوێك یەکترمان بینییەوە و وتی: بۆم دەرکەوت کە ئێستا ژن نەهێنم.

عومەر دەفەرمووێت: ئینجا ئەبوبەکری صدیقم بینی و پێم وت: ئەگەر پێت باشە حەفصەی کچی عومەرت لێ مارە دەکەم، ئەبوبەکر – رضي الله عنه – بێ دەنگ بوو، وەڵامی نەدامەوە، گلەییم لە ئەو زۆرتر بوو تاکو عوسمان.

پاش چەند شەوێك، پێغەمبەر(ﷺ) خوازبێنی کرد و منیش لێم مارە کرد، ئەبو بەکر بینیمی و وتی: لەوانەیە گلەییەکت هەبێت لێم ئەو کاتەی حەفصەت پێشنیار کرد بۆم و وەڵامم نەدایتەوە؟

عومەر وتی: بەڵێ، وتی: هیچ ڕێگر نەبوو لە وەڵام دانەوەم ئەوە نەبێت پێغەمبەر(ﷺ) باسی کردبوو، منیش بە هیچ شێوەیەك نهێنی پێغەمبەر(ﷺ)م ئاشکرا نەکرد و ئەگەر ئەو نەیویستایە من قبووڵم دەکرد.[٣]

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (١/٣٠٤).
٢ بڕوانە: الصراع مع اليهود (١/١٢٦).
٣ البخاري: كتاب النكاح، رقم (٥١٢٢).

**٢- هاوسەرگیری عەلی لەگەڵ فاتیمە(ڕەزای خوایان لێ بێت):**

عەلی — ﷺ — دەفەرمووێت: خوازبێنی فاتیمەیان کرد لە لای پێغەمبەر(ﷺ) منیش کەنیزەکێکم بوو وتی: ئایا دەزانیت فاتیمە خوازبێنی کراوە، وتم: نەخێر، وتی: چی ڕێگەت لێ دەگرێت خوازبێنی بکەیت لە لای پێغەمبەر(ﷺ)، وتم: ئایا هیچم هەیە ژنی پێ بهێنم؟

وتی: ئەگەر بچیتە لای پێغەمبەر(ﷺ) لێت مارە دەکات.

دەفەرمووێت: سوێند بە خوا هەر هیواداری کردم تاکو چوومە لای پێغەمبەر(ﷺ)، کاتێك لەبەردەستیدا دانیشتم، سوێند بە خوا هیچ قسەیەکم پێ نەکرا. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بۆچی هاتووی، پێویستیەکت هەیە؟ منیش بێدەنگ بووم، فەرمووی: لەوانەیە بۆ خوازبێنی فاتیمە هاتبێتی؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: شتێکت هەیە فاتیمەی پێ حەڵاڵ بکەی بۆ خۆت؟ وتم: نە بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

فەرمووی: ئەو قەڵغانەت کوا کە پێم دای؟ سوێند بە خوا قەڵغانێکی حوتەمی بوو بایی چوار درهەم بوو.

وتم: بەڵێ، فەرمووی: وا لێم مارە کردی، ئەو قەڵغانەی بۆ بنێرە و بیکە بە خێزانی خۆت، ئەوەبوو مارەیی فاتیمەی کچی پێغەمبەر(ﷺ).[١]

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فاتیمەی کچی بەشوودا و ئامادەی کرد بە قەدیفەیەك و کوننە و سەرینێك کە ناوەخنەکەی ڕووەکێکی بۆن خۆش بوو.[٢]

ژیانیان لەوپەڕی ئاسانی دابوو، دوور بوو لە ئاڵۆزی، ژیانێکی زبریان هەبوو زیاتر،[٣] ئەم بەسەرهاتەیش کە لە موسنەدی ئیمام ئەحمەد هاتووە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە:

((عەلی ڕۆژێك بە فاتیمەی وت: سوێند بە خوا ئەوەندە ڕشامەوە سنگم بەئێش هات، خوای گەورەیش کۆیلەیەکی زۆری بۆ باوکت ناردووە و، تۆیش برۆ داوای

---

١ بڕوانە: دلائل النبوية للبيهقي (٣/١٦٠) اسناده حسن.

٢ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٢٦٧).

٣ بڕوانە: معين السيرة (٢٥٥).

خزمەتکارێکی لێ بکە، وتی: سوێند بە خوا ئەوەندە خەریکی هاڕین بووم تاکو پێستی دەستم ئەستوور بوویەوە.

فاتیمە چووە لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێی فەرموو: کچەکەم چی هێناتی بۆ ئێرە؟ وتم: هاتووم سڵاوت لێ بکەم، لە ڕووی نەهات داواکارییەکەی بکات و گەڕایەوە. عەلی پێی وت: چیت کرد؟ وتی: لە ڕووم نەهات داوای بکەم. ئینجا پێکەوە هاتین. عەلی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوەندە ڕشامەوە تا سنگم هاتە ئێش، فاتیمەیش وتی: ئەوەندە خەریکی هاڕین بومە پێستی دەستم ئەستوور بووەتەوە، خوای گەورەش ئەوەندە کۆیلەی پێداوی یەکێکمان بدەرێ بۆ خزمەت. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: سوێند بە خوا پێتان نادەم و ئەهلی صوففە پشتگوێ بخەم سکیان بپێچنەوە لە برساندا، هیچ نییە لەسەریان خەرجی بکەم، بۆیە ئەم کۆیلانە دەفرۆشم و نرخەکانیان لەسەر ئەوان خەرج دەکەم، ئەوانیش گەڕانەوە و پێغەمبەر(ﷺ) هاتە لایان چووبوونە ژێر قەدیفەکەیانەوە، ئەگەر سەریان داپۆشیبا پێیان دەردەکەوت یان پێیان داپۆشیبا سەریان دەردەکەوت، کە هاتن هەڵسن، فەرمووی مەجووڵێنەوە، ئینجا فەرمووی: ئایا شتێکتان پێ بڵێم لەوە چاکتر بێت کە داواتان کرد؟ وتیان: بەڵێ. فەرمووی: چەند وشەیەکە جبریل فێری کردم(عليه السلام)، وتی: لە دوای هەموو نوێژێك دە جار(سبحان الله) و دە جار(الحمد لله) و دە جار(الله اكبر) بکەن، کاتێکیش دەچنە سەر جێگای خەوتان سی و سێ جار(سبحان الله) و سی و سێ جار(الحمد لله) و سی و سێ جار(الله اكبر) بکەن.

بەم شێوە بوو ڕێنموونی پێغەمبەر(ﷺ) لە پەروەردەکردنی کەسوکارە نزیکەکانی، ئەهلی سوفەی هەڵبژاردە سەر کەس و کارە نزیکەکانی خۆی، ئەم شێوە پەروەردەیش کاری کرد لە عەلی(ڕەزای خوای لێ بێت) و ڕۆژان دێت و دەڕوا عەلی دەبێتە خەلیفەی موسڵمانان و ئەو کاتەش دەیفەرموو: سوێند بە خوا وازم لەو وشانە نەهێنا لەو ڕۆژەوە پێغەمبەر(ﷺ) فێری کردم، یەکێك لە هاوەڵانی پرسیاری کرد شەوی صففین یش؟ فەرمووی: ئەو شەویش هەر لە یادم بوو،[1] عەلی(ڕەزای

---

[1] بروانە: التربية القيادية (٣/١٠٠)، الاصابة في تمييز الصحابة (٨/١٥٩).

خوای لێ بێت) بەو شێوە بوو کە زیراری کوڕی زەمورە لە کۆڕێکی موعاویەدا باسی دەکرد:((...... بە دونیا و ڕابواردنەکانی دڵتەنگ دەبوو، بە تاریکی شەویش خۆشحاڵ دەبوو، سوێند بە خوا ئەو فرمێسکی بە خوڕ دەڕشت و، زۆر بیری دەکردەوە و، دەستی لەسەر دەست دەدا و، لەگەڵ خۆی گفت و گۆی دەکرد و، جلوبەرگی کورتی پێ باش بوو، خواردنی زبریشی بە لاوە باش بوو......)).[١]

١ بڕوانە: صفة الصفوة لابن الجوزي (١/٨٤).

# بەشی نۆیەم

# غەزای ئوحود

## باسی یەکەم: ڕووداوەکانی پێش جەنگەکە

### یەکەم: هۆکارەکانی ئەو جەنگە.

هۆکارەکانی ئەو غەزایە جیاواز بوون، لەوانە: هۆکاری ئایینی و، کۆمەڵایەتی و، ئابووری و، سیاسی.

**١- هۆکاری ئایینی:**

خوای پەروەردگار بۆی گێڕاوینەتەوە کە بتپەرستان ماڵەکانیان خەرج دەکەن بۆ قەدەغەکردنی ڕێگای خوا و، تەگەرە دانان لە پێش بانگەوازی ئیسلامی و، ڕێگرتن لە خەڵکی لەوەی بچنە ناو ئایینی ئیسلامەوە و، هەوڵ دەدەن ئایینی ئیسلام لەنێو ببەن، وەکو فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ﴾(الانفال: ٣٦).

تەبەری دەفەرموێت: ماڵەکانیان خەرج دەکەن بۆ ئەوەی ڕێگە لە خەڵکی بگرن نەچنە ئیسلامەوە.[١]

(ابن كثير)یش دەفەرموێت: خوای گەورە ئاگادارمان دەکاتەوە کە بێباوەڕان ماڵەکانیان خەرج دەکەن بۆ ئەوەی ڕێگە بگرن لە شوێنکەوتنی حەق.[٢]

---

١ بڕوانە: غزوة احد دراسة دعوية، محمد بامذحج (٧١).

٢ بڕوانە: تفسير ابن كثير (٢/٣٤١)، ط/ دار السلام.

شەوکانی دەفەرمووێت: واتە مەبەستی بێباوەڕان لە ماڵ خەرجکردنیاندا تەگەرە دروستکردنە لەسەر ڕێگای خـوا و دژایـەتی کردنـی پێغەمبـەر(ﷺ) و کۆکردنـەوەی سوپا بۆ ئەو مەبەستە.[١]

بەم شێوەیش دەردەکـەوێت کـە گـرنگترین هۆکارەکـانی جـەنگی بـەدر هۆکـارە ئاینیەکەیە کە یەکێك بوو لە ئامانجەکانی قورەیش بۆ کۆسپ دروست کردن لـەپێش خەڵکیدا بۆ ئەوەی نەچنە نێو ئیسلامەوە.[٢]

**٢- هۆکاری کۆمەڵایەتی:**

ئەو تێکشکانە گەورەی تووشیان بوو لە بەدر، کە تیایدا سەرانیان کـوژران، بـوو بە مایەی شوورەییەکی گەورە بۆیان، لە ئەنجامیدا هەستیان بە سەرشۆڕی دەکرد، بۆیە هەموو هەوڵێکیان خستە گەڕ بۆ لابردنی ئەو ئابڕوو چوونە و، دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی ماڵ بۆ جەنگی پێغەمبـەر(ﷺ) هـەر لـەو ساتەی لـە بـەدر گەڕانـەوە، ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: پاش ئەوەی بێباوەڕانی قورەیش ئەوەیان بەسەردا هـات لـە بەدر و، ئەبو سوفیانیش کاروانەکەی گەڕانـدەوە مەککـە لـە(دار النـدوة) ڕای گـرت، چونکە خۆیان هەر وایان دەکرد، ئەو کاروانەی لەو جێگایە نەجوڵانـەوە و دابەشـی نـەکرد، سـەرانی قـورەیش ڕازی بـوون بـەو کاروانـە سـوپایەك ئامـادە بکـەن بـۆ شەڕکردن لە دژی پێغەمبەر(ﷺ)، هەندێك لە سەران و لەو کەسانەی بـاوك و برایـان تیاچووبوو لە بەدر، چوونە لای ئەبو سـوفیان و ئـەو کەسـانەی بازرگانیـان هـەبوو، وتیان: موحەممەد کەس و کاری ئێوەی کوشـت و ئێـوەیش یارمـەتیمان بـدەن بـەم ماڵە بۆ شەڕکردن لە دژی، بەڵکو تۆڵەی خۆمانی لێ بکەینەوە، ئەبو سـوفیان وتـی: من یەکەم کەسم قایل دەبم.[٣]

جوبەیری کـوڕی مـوتعیمیش خـولامێکی حەبەشـی بـوو نـاوی وەحـشی بـوو، ڕم هاوێژ بوو، دەستی زۆر ڕاست بوو، پێی وت: تۆیش لەگەڵ خەڵکی دەربـچۆ، ئەگـەر

---

١ بڕوانە: فتح القدير (٣٠٩).

٢ بڕوانە: غزوة احد دراسة دعوية، (٧١).

٣ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٨٦/٣).

حەمزەت کوشت لە تۆڵەی توعەیمەی کوڕی عەدی مامم تۆ ئازادی.[١]

٣- هۆکاری ئابووری:

بزوتنەوەی پۆلە سەربازییەکان کە دەوڵەتی ئیسلامی پێی هەڵدەسا، کاریگەری کردبووە سەر ئابوری قورەیش و گەمارۆیەکی ئابوری بەهێزی لە دەوریان دروستکردبوو، ئابوری مەکە لەسەر گەشتەکانی زستان و هاوین ڕاوەستابوو، گەشتی زستان بۆ یەمەن بوو کە تیایدا کاڵا و بەروبومەکانی شامیان دەبرد و، گەشتی هاوینیش بۆ شام بوو کەتیایدا بەروبوم و کاڵای یەمەنیان دەبرد نەهێشتنی یەکێك لەم دوو گەشتەیش زیانی لە ئەو گەشتەکەی تریش دەدا، چونکە بازرگانیان بۆ شام لە سەر کاڵای شام ڕاوەستاوە،[٢] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لِإِيلَٰفِ قُرَيۡشٍ ۝١ إِۦلَٰفِهِمۡ رِحۡلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيۡفِ ۝٢ فَلۡيَعۡبُدُواْ رَبَّ هَٰذَا ٱلۡبَيۡتِ ۝٣ ٱلَّذِيٓ أَطۡعَمَهُم مِّن جُوعٖ وَءَامَنَهُم مِّنۡ خَوۡفِۭ﴾(قريش:١ـ٤ ).

وتەیەکی سەفوانیش هەیە ئاماژە دەکات بۆ ئەم مەسەلە کە دەڵێت :((موحەمەد و هاوەڵانی بازرگانیکەیان تێکداوین، ئێمەیش نازانین چی بکەین لە هاوەڵانی، ئەوان قەراغی دەریا بەرنادەن و، زۆربەی خەڵکیش ڕێککەوتننامەیان لەگەڵدا کردوون، ئەگەریش ئێمە لێرە بمێنینەوە سەرمایەکانی خۆمان دەخۆین و، بەڵکو ئێمە پێویستە بازرگانی بکەین بۆ شام لە هاویندا و بۆ حەبەشە لە زستان)).[٣]

٤- هۆکاری سیاسی:

پێشەوایی قورەیش لە داڕوخاندا بوو لە پاش بەدر و پلە و پایەی لە نێو هۆزەکاندا وەکو جاران نەما، بۆیە بە لایانەوە پێویست بوو ئابڕووی خۆیان بگێڕنەوە و پێشەوایی دەستەبەر بکەن بە هەر نرخێك بووە.

---

١ هەمان سەرچاوە (٣/٧٩).
٢ بڕوانە: غزوة احد دراسة دعوية، (٧٤).
٣ بڕوانە: المغازي للواقدي (١/٦٩٥–٦٩٦).

ئەمە گرنگترین ئەو هۆکارانە بوون کە هانی قورەیشی دا ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازی ئەنجام بدات لە دژی دەوڵەتی ئیسلامی لە مەدینە.[١]

## دووەم: دەرچوونی قورەیش لە مەککەوە بۆ مەدینە.

لە ڕۆژی شەممە لە حەوتی شەوالی سالّی سێیەمی کۆچی،[٢] قورەیش کۆکردنەوەی هێزەکانی تەواوکرد و سوپاکەی ئامادەبوو، کە پێکهاتبوو لە سێ هەزار کەس، ئافرەت و کۆیلەکانیشیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، لەگەڵ ئەو هۆزانەیش کە دوایان کەوتن و، ئەو کەسانەی کە خۆیان داوەتە پاڵیان لە ئەحابیش(ئەوانەی هاتنە لای عەرەبەکان وخۆیان دایە پاڵیان)و کینانەو خەڵکی تیهامەو ئافرەتەکانیشیان بۆ ئەوە هێنابەڵکو کەس هەڵنەیەت، ئەبو سوفیان کە سەرکردەی خەڵکی بوو، هیندی کچی عوتبەی کچی ڕەبیعەی لەگەڵ خۆی هێنا و،[٣] سەفوانی کوڕی ئومەییەیش بەرەزەی کچی حاریسی کوڕی هیشامی لەگەڵ خۆی هێنا و، عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل ئوممولحەکیمی کچی حاریسی کوڕی هیشامی کوڕی موغیرەی لەگەڵ خۆی هێنا و، حاریسی کوڕی هیشامی کوڕی موغیرەیش فاتیمەی کچی وەلیدی کوڕی موغیرەی لەگەڵ خۆی هێنا،[٤] بەو هێزەوە ڕۆیشتن تاکو گەیشتنە(بطن السبخة) لە نزیك دۆڵێك لە لای مەدینە و لەوێ دابەزین.[٥]

قورەیش پێش ئامادەکردنی سوپاکەی هەڵمەتێکی گەورەی ڕاگەیاندنیان کردبوو کە ئەبو عەززە عەمری کوڕی عەبدولای جومەحی پێی هەڵسابوو، لەگەڵ عەمری کوڕی عاص و، هوبەیری کوڕی مەخزومی و، ئیبنولزیعبەری‌و هەندێ دەرەنجامی گەورەیان بەدەست هێنابوو،[٦] خەرجیەکانی ئەو سوپایە گەیشتبووە نزیکەی پەنجا هەزار دیناری ئاڵتوون.[٧]

---

١ بڕوانە: غزوة احد دراسة دعوية، (٧٥).
٢ البداية والنهاية (١١/٤)، الواقدي: المغازي، (١٩٩/١).
٣ بڕوانە: الاصابة (٣٤٦/٨)، رقم رقم (١١٨٦٠).
٤ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٧٠/٣).
٥ بڕوانە: غزوة احد دراسة دعوية، (٦٨).
٦ بڕوانە: غزوة احد لأبي فارس (١٧).
٧ هەمان سەرچاوە (١٦).

## سێ یەم: دەزگای هەواڵگری پێغەمبەر(ﷺ) بە دوای جموجوڵی دوژمندا دەڕوات.

عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب چاودێری جموجوڵی قورەیش و ئامادەکارییەکانی دەکرد بۆ جەنگ، کە سوپاکە دەرچوو عەبباس نامەیەکی پەلەی نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و هەموو وردەکارییەکانی سوپاکەی تیا باس کرد، نێردراوی عەبباس نامەکەی بە پەلە گەیاند و، ئەو ڕێگە دوورە کە پێنج سەد کیلۆمەتر دەبێت بە سێ ڕۆژ بڕی و نامەکەی لە مزگەوتی قوبا دایە دەستی پێغەمبەرەوە(ﷺ)،[1] پێغەمبەر(ﷺ) بە وردی ئاگای لە هەواڵەکانی قورەیش بوو لە ڕێگەی عەبباسی مامیەوە، ئیبنوعەبدولبەڕ دەڵێت: عەباس(ڕەزای خوای لێ بێت). هەواڵەکانی قورەیشی دەنووسی بۆ پێغەمبەر(ﷺ). موسڵمانانیش خۆیان بەهێز دەکرد بەهۆی عەباسەوە، خۆی حەزی دەکرد بچێتە لای پێغەمبەر(ﷺ)، بەلام پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو مانەوەت لەوێ چاکترە ))[2]

ئەو زانیارییانەی عەباس ناردبووی ورد بوون، لە نامەکەیدا هاتبوو(( قورەیش بڕیاری دەچوونیان داوە بۆ لای ئێوە، ئیتر چیت پێ دەکرێت بۆ بەرەنگارییان بیکە، ئەوان بەسێ هەزار کەسەوە دەرچوون و دووسەد سوار و حەوت سەد قەڵغانلەبەرو سێ هەزار وشترەوە، هەرچی چەکیشیان هەیە هێناویانە))[3]

نامەکە هەندێ زانیاری گرنگی تیادا بوو لەوانە:

١- دەرچوونی هێزی بتپەرستان بەرەو مەدینە.

٢- قەبارەی سوپاکە و توانا جەنگییەکانی، ئەوەیش یارمەتی دەرە بۆ دانانی پلانێك بۆ ڕوویەڕووبوونەوەی ئەو هێزانە کە هێرش دەکەن، پێغەمبەر(ﷺ) بەو زانیارییانەی مەککە کۆڵی نەدا، بەڵکو سوور بوو لەسەر دەرخستنی زانیارییەکان دەربارەی دوژمن سات بە سات، ئەوەیش ئامۆژگارییەکە بۆ سەرکردە موسڵمانەکان کە گرنگی بدەن بە دواداچوونی ئەو هەواڵانەی کە لە ڕووناکیدا پلان و

---

١ بڕوانە: الرحيق المختوم، للمبار كفوري (٢٥٠).

٢ بڕوانە: الاستيعاب في معرفة الاصحاب (٢/٨١٢).

٣ بڕوانە: المغازي للواقدي (١/٢٠٤).

ئیستراتیژییەت دادەنرێت، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بە ناردنی حوبابی کوڕی مونزیری کوڕی جەموح بۆ لای قورەیش بە مەبەستی زانینی هەواڵەکانو توانی بچێتە نێو سوپای مەککەوە ومەزەندەی ژمارە و کەرەستەکانیان بکات و بگەڕێتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) لێی پرسی، چیت بینی؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ژمارەیەکم لە ئەوان بینی بە دەوروبەری سێ هەزار مەزەندەم کرد، ئەسپەکانیش بە دووسەد و، قەلغانی دیاریشم بە حەوت سەد مەزەندە کرد، فەرمووی: ئایا ئافرەتت بینی؟ وتی: بەڵێ ئافرەتم بینی تەپڵ و دەفیان پێ بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بۆ ئەوە هێنراون هانی پیاوان بدەن و کوژراوانی بەدریان وەبیر بهێننەوە، بەم شێوە هەواڵیانم پێگەیشتووە،پیتێك باس مەکە لەم بارەوە،خوای گەورەمان بەسەو چاکترین پشتوپەنایە، خوایە بە پشتیوانی گەشت تۆ دەکەم و پەلامار دەدەم.[١]

هەروەها پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەڵسا بە ناردنی ئەنەس و موئنیس ی کوڕانی فەزاڵە بۆ گوێ هەڵخستن بۆ هەواڵی قوڕەیش، بینیان نزیکبوونەتەوە لە مەدینە و، ئەسپ و وشترەکانیان ناردووە بلەوەڕێت لە دەوروبەری مەدینە، گەڕانەوە و ئەم هەواڵەیان هێنایەوە.[٢]

لە پاش دڵنیابوونی لە زانیارییەکان، پێغەمبەر(ﷺ) مەبەستی بوو کە ئەو زانیاریانە لەسەر ئاستی سەرکردایەتی بمێنێتەوە، لە ترسی ئەوەی ئەم هەواڵانە کاریگەرییان هەبێت لەسەر ورەی موسڵمانان پێش خۆسازدان، بۆیە ئوبەی کوڕی کەعب نامەکەی عەبباسی خوێندەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکرد ئەو باسە بشارێتەوە و، بە پەلە گەڕایەوە بۆ مەدینە و، بیروبۆچوونی لەگەڵ سەرانی موهاجیرو ئەنصارەکاندا ئاڵوگۆڕکرد سەبارەت بە چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو هەلوێستە، پێغەمبەر(ﷺ) سەرگەورەی ئەنصارەکان سەعدی کوڕی موعازی ئاگادارکردبوویەوە لە نامەکەی عەبباس و فەرمووی: سوێند بە خوا ئومێدم وایە خێر و چاکە بێت، داواشی لێکرد ئەو مەسەلە بشارێتەوە، کاتێك پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە لای سەعد دەرچوو، خێزانەکەی بە سەعدی وت: پێغەمبەری خوا چی

---

١ بڕوانە: المغازي للواقدي (١/٢٠٧-٢٠٨).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٢/١٨٧).

وت؟ بەڵام سەعد تێی خوڕی و هیچی پێی نەوت، خێزانی وتی: من گوێم لێ بوو چی پێت وت و قسەکەی پێغەمبەر(ﷺ)ی بۆ گێڕایەوە و سەعد وتی:((إنا لله وإنا اليه راجعون)) ئینجا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ترسام ئەم هەواڵە بڵاوبێتەوە وابزانم من بڵاوم کردووەتەوە لە کاتێکدا داوات لە من کرد کە بیپارێزم، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: وازی لێ بهێنە.[1]

ئەم ڕووداوە وانەیەکی کاریگەرە بۆ پیاوانی سەربازی و ئاگادارکردنەوەیان لەوەی زانیاری سەربازی و پلانەکانیان نەخەنە بەردەست خێزانەکانیان، چونکە بڵاوبوونەوەی ئەو جۆرە زانیاریانە هەڕەشە دەکەن لە ئوممەت و دواڕۆژی موسڵمانان مێژووی گەلان لە ڕابوردوو و نوێدا باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە زۆرێك لە ئەو تێکشکان و نەهامەتیانەی دێنە سەر خەڵکیدا لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی نهێنی سوپاکانە لە لای دوژمنەکانیان لە ڕێگەی خێزانی ناپاکەوە، یان ناپاکێك لە پۆشاکی هاورێدا، یان بە ڕواڵەت خزم و لە ڕاستیدا دوژمن.[2]

## چوارەم: ڕاوێژکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵانی.

لە پاش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) زانیاری تەواوی کۆکردەوە دەربارەی سوپای بێباوەڕان، هاوەڵانی خۆی کۆکردەوە و ڕاوێژی پێکردن لە مانەوە لە مەدینە و خۆ قایم کردن، یان دەربچن بۆ ڕووبەڕووبوونەی بتپەرستان لە دەرەوەی مەدینە، بۆچوونی پێغەمبەر خۆی ئەوەبوو لە مەدینە بمێننەوە و فەرمووی:((إنّا في جُنة حصينة))[3] واتە: ئێمە لە پەناگەیەکی قایمداین، ئەگەر پێتان باشە لە جێگای خۆتان بمێننەوە و بانگی ئەوان بکەن لەو جێگای لێی دادەبەزن، جا ئەگەر مانەوە لە خراپترین حاڵدا دەمێننەوە، ئەگەریش هاتنە ناو مەدینەوە شەڕیان لە دژ دەکەین، ڕاوبۆچوونی ئیبنو سەلولیش وەکو ڕاوبۆچوونی پێغەمبەر(ﷺ) بوو،[4] بەڵام هەندێك

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٢/١٨٧).

٢ بڕوانە: غزوة احد لأبي فارس (٢٢).

٣ بڕوانە: تاريخ الطبري (٢/٦٠).

٤ بڕوانە: غزوة احد دراسة دعوية، (٨٢).

لەوانەی نەیانتوانیبوو ئامادەی جەنگی بەدر بن وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، دەرمان بکە بۆ شەڕکردن لەگەڵ دوژمنەکانمان.

(ابن کثیر) دەفەرموێت:(زۆرێك قایل نەدەبوون بەوە نەبێت کە دەربچن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن و لەسەر ئەو بۆچوونەی پێغەمبەر(ﷺ) نەبوون، ئەگەر قایل بکرایەن ئەوە ڕووی دەدا کە فەرمانی پێکرد، بەڵام قەزا و قەدەر زاڵ بوو، زۆربەی ئەوانەیش کە دەرچوونیان پێ باش بوو ئەوانە بوون کە لە بەدر دواکەوتبوون و، فەزڵ و چاکەی بەدریان زانیبوو).[1]

(ابن اسحاق) دەفەرموێت: خەڵکی هەر هەوڵیان دەدا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) تاکو چووە ماڵەکەی خۆی و کەرەستەکانی شەڕی لەبەر کرد، خەڵکی دەستیان کردە سەرزەنشت کردنی یەکتر و وتیان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانێکی کرد و ئێوە پێی قایل نەبوون، ئەی حەمزە بڕۆ بۆ لای پێغەمبەری خوا و پێی بڵێ: کاروباری ئێمە لەسەر فەرمانی ئەوە، حەمزە چووە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا خەڵکی سەرکۆنەی یەکتر دەکەن و دەڵێن ئێمە گوێڕایەڵی فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ)ین، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((هەر پێغەمبەرێك ئەگەر کەرەستەکانی شەڕی لەبەرکرد بۆی نیە فڕێیان بدات تاکو شەڕ نەکات)).[2]

ئەوانەی کە دەرچوونیان پێ باش بوو بۆ دەرەوەی مەدینە، بۆچوونەکەیان بنیات نرابوو لەسەر چەند مەسەلەیەك، لەوانە:

١- ئەنصارەکان لە عەقەبەی دووەم پەیمانیان دابوو لەسەر پشتگیری کردنی پێغەمبەر(ﷺ)، جا زۆربەیان پێیان وابوو مانەوەیان لە ناو مەدینە، جۆرێکە لە سستی لە هەڵسان و بە ئەنجامدانی ئەم پەیمانە.

٢- کەمینەی موهاجیرەکان خۆیان بە مافدارتر دەزانی لە بەرگری کردن لە مەدینە و پەلاماردانی قورەیش و دوورخستنەوەیان لە کشتوکاڵەکانی ئەنصار.

---

١ بڕوانە: البداية والنهاية (١٤/٤).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٧١/٣).

٣- ئەوانەی، کە نەیانتوانی بەشداری جەنگی بەدر بکەن، لە ئەوپەڕی پەرۆشیدا بوون بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بێباوەڕان، بەتەماحی شەهیدبوون لە پێناو خوای گەورە.

٤- زۆرینە پێیان وابوو گەمارۆدانی مەدینە لە لایەن قورەیشەوە مەسەلەیەکە نابێت دوژمن خەونی پێوە ببینێت، چونکە پێشبینیان دەکرد گەمارۆکە درێژخایەن بێتو موسڵمانان تووشی مەترسی ئازووخە لێبڕان ببنەوە.[1]

بەڵام بۆچوونی ئەوانە، کە مانەوەیان پێ باش بوو لە مەدینە بنیات نرابوو لەسەر ئەم پیلانە سەربازییە:

١- سوپای مەککە سوپایەکی یەکگرتوو نەبوو، بۆیە مەحاڵە بۆ ماوەیەکی زۆر بتوانن خۆیان ڕابگرن و، ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیان زوو یان درەنگ.

٢- پەلاماردانی ئەو شارانەی کە دروست کراون بە شێوەیەك بتوانرێت بەرگری تیا بکرێت لە شار و سنوور و قەڵاکانی مەسەلەیەکی گران و ئەستەمە، بە تایبەتی ئەگەر چەکەکان لە هەردوو سوپاکەدا وەکو یەك بن، لە ڕۆژی ئوحودیشدا وابوو.

٣- بەرگری کەران ئەگەر لە ناو کەس و کاری خۆیاندا بن زیاتر نەبەردی و ئازایی دەردەبڕن لە بەرگری کردن لە ڕۆڵەکانیان و پاراستنی ژنەکانیان و ئابڕوویان.

٤- بەشداری کردنی ژنان و منداڵان لە شەڕدا و بەو شێوە ژمارەی جەنگاوەران دوو بەرامبەر دەبێتەوە.

٥- بەکارهێنانی بەرگری کەران بۆ بەرد و دەشتی تر کاریگەری دەبێت لەسەر دوژمنان و تووشکردنی هێرشکەران ئاسان دەبێت.[2]

ئاشکرایە کە پێغەمبەر(ﷺ) هاوەڵانی لەسەر ئەوە پەروەردە کردبوو کە بەڕاشکاوی بیروبۆچوونەکانی خۆیان بخەنەڕوو لەکاتی ڕاوێژ پێکردنیاندا، با ناکۆکیش بێت لەگەڵ بیروبۆچوونی خۆیدا، چونکە ئەو لە بابەتێکدا ڕاوێژیان پێدەکات کە دەقی لەسەر نەبێت، بۆ ئەوەی ڕابێن لە بیرکردنەوە لە مەسەلە

---

١ بڕوانە: غزوة احد لأحمد عزالدين (٥١-٥٢).

٢ بڕوانە: القيادة العسكرية للرّشيد (٣٧٤).

گشتیەکاندا و، چارەسەرکردنی کێشەکانی ئوممەت، ڕاوێژکردنیش بێ سوودە بەبێ بیروڕا دەربڕین، هیچ کاتێکیش پێغەمبەر(ﷺ) لۆمەی کەسێکی نەکردووە هەڵەی کردبێت لە بیروبۆچوونێکدا و سەرکەوتوو نەبووبێت، هەروەها ڕاوێژکردن ناچارکەرە بۆ پێشەوا، بۆیە پێویستە پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسێت بە جێبەجێکردنی ئاراستەی قورئان کاتێک دەفەرموێت: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ ﴾(ال عمران: ١٥٩).

بۆ ئەوەی ئوممەت ڕابێن لەسەر ڕاوێژکردن، لێرەشدا هۆشیاری سیاسی لە لایەنی هاوەڵان(ڕەزای خوایان لێ بێت) دەردەکەوێت چونکە سەرەڕای ئەوەی بە ئازادی بیروڕای خۆیان دەردەبڕن بەڵام بۆیان نییە بیسەپێننە سەر سەرکردەدا، بەڵکو تەنها دەیخەنە ڕوو و هەڵبژاردن بە دەست سەرکردەوەیە، کاتێک تەماشایان کرد موکوڕیان کرد لەسەر دەرچوون و پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاری دەرچوونی دا بە بۆنەی موکوڕبوونی ئەوان، گەڕانەوە و داوای لێبوردنیان کرد، بەڵام لێرەدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) وانەیەکی تری فێرکردن ئەویش یەکێکە لە خەسڵەتەکانی سەرکردایەتی سەرکەوتوو، کە بریتیە لە دوورکەوتنەوە لە دوودڵی و گیرخواردن، لە پاش بڕیاردان و دەستپێکردنی جێبەجێکردن، چونکە ئەوە متمانە جێلەق دەکات و ئاژاوە دروست دەکات لە نێو شوێنکەوتواندا.[١]

پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاری دەرچوونی دابوو و حاڵەتی نائاسایی گشتی ڕاگەیەنرابوو، هەموانیش ئامادەبوون بۆ جەنگ و، شەویان بە وریایی بەسەر برد، هەموو کەسێك چەکەکەی بە تەنیشتیەوە بوو، تەنانەت لە کاتی خەویشدا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە پاسەوانی کردنی مەدینە و، پەنجا کەسی لە جەنگاوەرە ئازاکان هەڵبژارد بە سەرکردایەتی موحەممەدی کوڕی مەسلەمەوە و، هاوەڵانیش گرنگیان دا بە پاسەوانێتی پێغەمبەر(ﷺ) بۆیە سەعدی کوڕی موعاز و ئوسەیدی کوڕی حوزەیر و،

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٢/٣٨٠).

سەعدی کوڕی عوبادە و کۆمەڵێك لە هاوەڵان ڕەزای خوایان لێ بێت، شەوی هەینی بە چەکەوە لە دەرگای مزگەوتەکە پاسەوانێتی پێغەمبەریان دەکرد(ﷺ).[١]

## پێنجەم: دەرچوونی سوپای موسڵمانان بەرەو ئوحود.

أ- یەکێك لە هۆکارە گرنگەکان کە پێغەمبەر(ﷺ) کاری پێکرد بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنەکانی، هەڵبژاردنی کاتی دەرچوون و ڕێگەی گونجاو بوو لەگەڵ پلانەکە، لە دوای نیوەی شەو جووڵەیان کرد، لەو کاتەی کەش و هەوا هێمن بوو، جووڵەیش کەم بوو، کە لەو کاتە زۆرجار دوژمنان لە خەودا دەبن، بەهۆی ماندوویی ڕێگا کە هێزی لێ بڕیون، بێگومان خەوی دوای ماندووبوونیش خەوێکی قورسە و تیایدا هەست بە دەنگە بەرز و جووڵە قورسەکان ناکرێت.

واقیدی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) تاکو ساتە دواییەکانی شەو خەوی لێکەوت، لە بەرەبەیاندا فەرمووی: لە کوێن چاوساغان؟ لە پاش ئەوە ڕێگەی گونجاویان هەڵبژار تاکو بگەنە گۆڕەپانی شەڕەکە، باسی سیفەتێکیشی کرد لەو ڕێگەیە ئەویش ئەوەیە نهێنی بێت، بۆ ئەوەی دوژمنان نەتوانن سوپای موسڵمانان ببینن، پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵانی فەرموو: کێ دەتوانێت لە ڕێگەیەکەوە بمانبات بە لای ئەواندا نەڕوات؟

ئەبو خەیسەمە ئامادەیی دەربڕی(ڕەزای خوای لێ بێت) و وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا ، ئیتر توانی لە حەڕڕەی بەنی حاریسە و لە نێو ماڵەکانیانەوە تێپەڕێت، لە نێو باخێکی مەربەعی کوڕی قەیزییەوە بردنی، کە پیاوێکی مونافیقی کوێر بوو، جا کاتێك هەستی کرد بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) و موسڵمانان، هەڵساو دەستی کردە خۆڵ بەسەر پرژاندیاندا و دەیووت: ئەگەر پێغەمبەری خوای من ڕازی نابم بەناو باخەکەمدا تێپەڕبن، دەشگێڕنەوە مشتێ خۆڵی هەڵگرتووە و وتوویەتی: سوێند بە خوا ئەگەر بمزانیبا فڕێی بدەم تەنها لە تۆ نەبێت لە کەسی تر نادات وامدەکرد، ئیتر موسڵمانان هاتن بیکوژن، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: مەیکوژن

---

١ بڕوانە: غزوة احد لأبي فارس (٣٤-٣٥).

ئەم کوێرە، دڵیشی کوێرە، بەڵام سەعدی کوڕی زەید بەنی عەبدولئەشهەلی پێش ئەوەی ئەم قسەی پێغەمبەر(ﷺ)ی پێ بگات بە کەوانەکەی لەسەری ئەو کابرای داو شکاندی.[1]

بێگومان تێپەڕبوونی پێغەمبەر(ﷺ) لە نێو باخەکانەوە فێرمان دەکات کە پێغەمبەر(ﷺ) وریایی دەکرد لە کاتی ڕێکردنیان، چونکە ڕێگەکان هێزی موسڵمانانی دەردەخست بۆ دوژمنان و ئەوەیش کارێکی ترسناك بوو، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ئوممەتی فێر نهێنی پاراستن دەکرد لە ڕووی جێگا و کاتەوە، بۆ ئەوەی دوژمنان ژمارەی هێزی موسڵمانان نەزانن و بەپێی ئەوە پلانی گونجاو دانەنێن بۆ دژایەتی کردنی چونکە ئەوە دەبێتە مایەی پووچەڵ بوونەوەی ڕێکخستنی بەرژەوەندی گشتی لەسەر ربەرژەوەندی تایبەت، لە حاڵەتێکدا ئەو دوو بەرژەوەندییە ناکۆك بوون، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە سوپاکە لە نێو باخی ئەو مونافیقەوە تێپەڕبن و زیانیشیان پێ گەیاند، بەڵام ئەوە بەرژەوەندی سوپاکەی تیابوو بەوەی ڕێگاکەی بۆ کورتکردنەوە، بەرژەوەندی ئایینیش گرنگترە لە هەموو بەرژەوەندیەکیتر، بەپێی ئەو بنەمایەیش موسڵمانان ئەو کارەیان ئەنجامدا،[2] شەریعەتیش مەبەستەکانی تیا ڕێکخراوە بەپێی جێبەجێکردنی بەرژەوەندی بەندەکان وەکو پاراستنی ئایین و نەفس و هۆش و نەوە و ماڵ، ئەم بەرژەوەندیانەش بەپێی ئەم ڕێکخستنەیە لە ڕووی گرنگی و بایەخەوە بە کۆی ڕای زانایان.[3]

**ب- پاشەکشەکردنی ئیبنوسەلولی مونافیق بە سێیەکی سوپاکەوە:**

کاتێك سوپای موسڵمانان گەیشتنە ناوچەی(الشواط)،[4] ئیبنو سەلولی مونافیق بە سێ سەد کەس لە مونافیقانەوە پاشەکشەی کرد بۆ مەدینە، بە بەهانەی ئەوەی کە پێکدادان دروست نابێت لەگەڵ بتپەرستاندا و، وەکو ناڕەزاییەکیش لەسەر

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٧٣).
٢ بڕوانە: غزوة احد دراسة دعوية، (١٦٨).
٣ بڕوانە: المقاصد العامة للشريعة، يوسف حامد العالم (١٦٦).
٤ ناوی باخێکە لە نێوان مەدینە و ئوحودا.

دەرچوون بۆ دەرەوەی مەدینە و، وتی:(بە گوێی منداڵ و ئەوانە دەكات كە ڕاوبۆچوونیان پەسند نییە، بۆچی خۆمان بە كوشت بدەین)[١] مەبەستی سەرەكیش لەم هەڵگەڕانەوەی دروست كردنی شڵەژان و ئاژاوە بوو لە سوپای ئیسلامدا، بۆ ئەوەی ورەكان بڕوخێن و دوژمن ورەی بەرز ببێتەوە، ئەم كردارەیش بە ناپاكی هەرە گەورە دەژمێردرێت بۆ ئیسلام و موسڵمانان، دیارە ویستی خوای گەورەیش لەسەر ئەوە بوو كە سوپاكە پاك ببێتەوە و، خاوێن و پیس و ئیماندار و مونافیق لە یەكتر جیاببنەوە[٢] خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى ٱلْغَيْبِ﴾(ال عمران: ١٧٩).

ترس و پاشگەزبوونەوە مونافیقانی ئاشكرا كرد پێش ئەوەی قورئان پەردەیان لەسەر لادات.[٣]

**ج- هەڵوێستی عەبدوڵای كوڕی عەمری كوڕی حەرام لە دواكەوتنی مونافیقەكان:**

عەبدوڵای كوڕی حەرام(ﷺ) هەوڵی دا مونافیقان قایل بكات بە گەڕانەوە، بەڵام ئەوان قایل نەبوون، وتیان: ئەگەر بمانزانیبا ئێوە شەڕتان تووش دەبێت پشتی ئێوەمان بەر نەدەدا، بەڵام ئێمە پێمان وایە شەڕ دروست نابێت، كاتێك هەر سوور بوون لەسەر گەڕانەوە، وتی: خوای گەورە دوورتان بخاتەوە ئەی دوژمنانی خوا، خوای گەورە نایەڵێت پێغەمبەرەكەی پێویستی بە ئێوە بێت،[٤] لەو كەسانەیشدا خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند: ﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيَعْلَمَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٦٦﴾ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُوا۟ ۚ وَقِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ قَٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدْفَعُوا۟ ۖ قَالُوا۟ لَوْ نَعْلَمُ قِتَالًا لَّٱتَّبَعْنَٰكُمْ ۗ هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَٰنِ ۚ يَقُولُونَ بِأَفْوَٰهِهِم مَّا لَيْسَ فِى قُلُوبِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ ﴾(ال عمران: ١٦٦-١٦٧).

---

١ بڕوانە: البداية والنهاية (١٤/٤).

٢ بڕوانە: غزوة احد دراسة دعوية، (٨٤).

٣ بڕوانە: مرويات غزوة احد ، حسين احمد (٧١).

٤ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٢٧٧).

**د- بەنو سەلمە و، بەنو حاریسە:**

کاتێك موونافیقەکان گەڕانەوە، خەریك بوو بەنو سەلمە و، بەنو حاریسەیش بگەڕێنەوە بەڵام خوای گەورە جێگیری کردن و پاراستنی، جابیری کوڕی عەبدوڵا دەفەرمووێت ئەم ئایەتە دەربارەی ئێمە دابەزی: ﴿إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا﴾(ال عمران: ١٢٢). بەنی سەلمە و، بەنی حاریسە خۆزگەیش ناخوازن دانەبەزیبا چونکە خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَا﴾(ال عمران: ١٢٢).

لە ڕاستیدا هەڵوێستی موونافیقان کاری کردە سەر دەروونی دوو کۆمەڵ[1] لە موسڵمانان و بیریان کردەوە بگەڕێنەوە بۆ مەدینە، بەڵام زاڵ بوونە سەر ئەو لاوازییەی توشیان بوو و، سەرکەوتنە سەر خۆیاندا، دوای ئەوەی کە خوای گەورە یارمەتی دان و جێگیری کردن.

لە نێو هاوەڵانیشدا دوو بیروبۆچوون سەری هەڵدا دەربارەی موونافیقەکان:

**یەکەم: پێیان وابوو بکوژرێن لەسەر ئەو هەڵوێستەیان.**

دووەم: ئەو بۆچوونەیان پێ باش نەبوو بکوژرێن، قورئانی پیرۆزیش هەڵویستی هەردوو[2] کۆمەڵەکەی باس کردووە لەم ئایەتەدا: ﴿فَمَا لَكُمْ فِي ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِئَتَيْنِ وَٱللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓاْ أَتُرِيدُونَ أَن تَهْدُواْ مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلًا﴾(النساء: ٨٨).

**هـ- پەنا بردنە بەر کەسانێك کە موسڵمان نەبن:**

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتە جێگایەك پێی دەوترا(الشیخین).

دەستە سوارێکی بینی دەنگە دەنگیان دەهات، فەرمووی: ئەوە چییە؟ وتیان: ئەوانە هاوپەیمانی عەبدوڵای کوڕی سەلولن لە جوولەکە، پێغەمبەر(ﷺ)

---

١ البخاري في المغازي: باب ((اذ همت طائفتان)) رقم (٤٠٥١).

٢ بڕوانە: السیرة النبویة الصحیحة (٣/٣٨٢).

فەرمووی:(لا نستنصر باهل الشرك على اهل الشرك)[١] واتە: پەنا ناگرینە خەڵکی موشریك لە دژی خەڵکی موشریك. ئەمەیش بنچینەیەکە پێغەمبەر(ﷺ) جێگیری کرد لە پەنا بردنە بەر دوژمنانی ئیسلام.[٢]

**و- گێڕانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ هەندێك لە هاوەڵان بە بۆنەی منالی تەنەمیانەوە:**

پێغەمبەر(ﷺ) لە سەربازگەی خۆی لە(الشيخين) هەڵسا بە گێڕانەوەی هەندێك لە هاوەڵان چونکە تەمەنیان منالْ بوو، چواردە سالْ و کەمتر بوون، وەکو عەبدوڵای کوڕی عومەر و، زەیدی کوڕی سابیت و، ئوسامەی کوڕی زەید و، زەیدی کوڕی ئەرقەم و، بەرائی کوڕی عازیب و، ئەبو سەعیدی خودری، ژمارەی ئەوانە گەیشتە چواردە منالْ، جێگیریش بووە کە ئیبنوعومەر لەوانە بووە،[٣] پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگای دا بە ڕافیعی کوڕی خودەیج کاتێك پێیان وت ڕافیع تیر تیرهاوێژە، کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتە سومرەی کوڕی جوندەب، چووە لای موڕڕەی کوڕی سینانی کوڕی سەعلەبە، کە مێردی دایکی و مامی ئەبو سەعیدی خودری بوو، هەر خۆیشی سومرەی بەخێوکردبوو لە لای خۆی، پێی وت: ئەی باوکە، پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگای بە ڕافیع داوە و منی گێڕاوەتەوە، من لە زۆرانبازیدا ڕافیع دەبەزێنم، ئیتر ئەم پیاوە چووە لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەری کردە لای ڕافیع و سومرەوە و پێی فەرموون: زۆرانبازی بکەن، ئیتر سومرە ڕافیعی بەزان و پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگای ئەویشی دا لەگەڵیان دەرچێت و کردنی بە سەربازی سوپاکەی،کە هەریەکە و تایبەتمەندی خۆی هەبوو.[٤]

تێبینی دەکەین کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) مۆڵەتی ڕافیع و سومرەی دا بە هۆی تایبەتمەندییەکی سەربازییەوە کە هەیانبوو بەسەر هاوتەمەنەکانیاندا و، تەمەن منالەکانی تری گێڕایەوە لەبەر مەترسی ئەوەی ئارام نەگرن لە سەر لێدان و شمشێرو هاویشتنی تیر و ڕم و، هەڵبێن لە کاتی گەرم بوونی جەنگ و

---

١ بروانە: صحيح السيرة النبوية (٣٨٢/٣).

٢ بروانە: محمد رسول الله، محمد الصادق عرجون (٥٦١/٣).

٣ بروانە: السيرة النبوية الصحيحة (٣٨٣/٢).

٤ بروانە: محمد رسول الله، (٥٧١/٣).

هەڵهاتنەکەیان ببێتە مایەی شڵەژان لە ڕیزی موسڵماناندا.[١]

هەروەها تێبینی دەکەین لە کۆمەڵگای ئیسلامی هەمووی خەریکی جموجۆڵە و هەوڵ دەدا بۆ شەهید بوون بە پیرو گەنجەوە، تەنانەت منداڵەکانیش بە ئەوپەڕی نەبەردیەوە بەرەو شەهیدی دەچن، بە شێوەیەك کە مرۆڤ سەرسام دەکات، بەبێ ئەوەی هیچ یاسایەك ناچاریان بکات یان بە زۆر بیانبات بۆ گۆڕەپانی شەڕ، ئەوەیش بەڵگەیە لەسەر کاریگەری ڕێبازی پێغەمبەر(ﷺ) لە پەروەردەکردنی هەموو بەشەکانی کۆمەڵگا لەسەر خۆشەویستی دواڕۆژ و خۆ بە گەورەتر سەیرکردن لە خۆشیەکانی دونیا.

## شەشەم: پلانی پێغەمبەر( ﷺ ) بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بێباوەڕانی مەککە.

أ- پێغەمبەر(ﷺ) پلانێکی بەهێزی داڕشت بۆ بەرەنگاری کردنی قورەیش، تیایدا هەڵسا بە هەڵبژاردنی جێگەی گونجاو و کەسانی شیاو بۆ شەڕکردن و، گێڕانەوەی ئەوانەی توانای شەڕیان نییە و، پەنجا نیشانەچی هەڵبژارد و بە توندی ڕاسپاردەی پێ کردن و، سوپاکەی کرد بە سێ بەشەوە، بەیداخی دایە دەست یەکێك لەو سێ بەشە و، ئەو سێ دەستانەیش بریتی بوون لە:

١- دەستەی موهاجیرەکان و بەیداخەکەیان بە دەستی موصعەبی کوڕی عومەیرەوە بوو(ﷺ).

٢- دەستەی ئەوس لە ئەنصارەکان و بەیداخەکەی دایە دەستی ئوسەیدی کوڕی حوزەیر(ﷺ).

٣- دەستەی خەزرەج لە ئەنصارەکان و، بەیداخەکەی دایە دەستی حوبابی کوڕی مونزیر(ﷺ).[٢]

ب- بەرنامەی پێغەمبەر(ﷺ)ئەوەبوو کە هاوەڵانی هان دەدا لەسەر شەڕکردن و، دان بەخۆداگرتن لە گۆڕەپانی جەنگدا، بۆ ئەوەی ورەیان بەرز ببێتەوە و، لە کاتی

١ هەمان سەرچاوە (٣/٥٧٢).
٢ بڕوانە: غزوة احد دراسة دعوية، (٨٩)

ڕووبەڕووبوونەوەدا خۆڕاگر بن، واقیدی دەڵێت:(پێغەمبەر وتارێکی دا لە ڕۆژی ئوحوددا و فەرمووی: خەڵکینە ڕاسپاردەتان پێ دەکەم بەوەی خوای گەورە ڕاسپاردەی پێ کردووم لە قورئاندا، لە کارکردن بە گوێڕایەڵی خوا و، دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکانی و، ئەمڕۆ ئێوە لە جێگای پاداشت و پاشەکەوتکردندان بۆ کەسێك کە بزانێت چی لەسەرە و خۆی ڕابهێنێت لەسەر ئارامگرتن و دڵنیایی و کۆشش و چالاکی، چونکە جیهادکردنی دوژمن سەخت و ناخۆشە، کەم کەس ئارام دەگرێت لەسەری، مەگەر کەسێك خوای گەورە بیروهۆشی ساغ کردبێتەوە، خوای گەورەیش لەگەڵ کەسێکدایە گوێڕایەڵی بکات، شەیتانیش لەگەڵ کەسێکدایە سەرپێچی خوا بکات، بۆیە کارەکانتان بە ئارامگرتن لەسەر جیهاد دەست پێ بکەن، بەوەیش داوای بەدیهاتنی بەڵێنی خوا بکەن بۆتان، ئینجا لەسەرتانە گوێڕایەڵی ئەوە بکەن کە فەرمانتان پێ دەکەم چونکە من پەرۆشم لەسەر ڕابەریتان، ناکۆکی و ململانێ و ڕاوەستان بێ دەسەڵاتییە و، لاوازیش شتێکە خوای گەورە حەزی لێ ناکات و، سەرکەوتن و زاڵبوونیش لەسەر ئەوە نابەخشێت).[١]

لەم وتارە چەند ئامانجێك ڕوون دەبێتەوە، لەوانە:

١- هاندان لەسەر کۆشش و چالاکی لە گۆڕەپانی جیهاد.
٢- هاندان لەسەر ئارامگرتن لە کاتی شەڕکردن لەگەڵ دوژمندا.
٣- ئاشکراکردنی خراپییەکانی ناکۆکی و ململانێ.[٢]

ئەم ڕێبازە جوانەی کە پێغەمبەر(ﷺ) بۆی داناوین، هەندێك ڕاستی چەسپاومان فێر دەکات، ئەویش ئەوەیە سوپاکان هەرچەند هێز و ڕێکخستنیان گەورە بێت سوودی نابێت ئەگەر کەسانێك بەڕێوەی نەبەن بۆ مردن پەرۆشتر بن تاکو پەرۆش بوونیان بۆ ژیان، ئەوەیش بە ئامادەکردنی سەربازەکان دروست دەبێت بە ئامۆژگاری و ئاراستەکردن و خۆشەویستکردنی جیهاد و شەهیدی لە دڵەکانیاندا.

---

١ بڕوانە: المغازي للواقدي (١/٢٢١-٢٢٢).
٢ بڕوانە: القيادة العسكرية في عهد الرسول (ﷺ) (٤٦٩).

ج- پێغەمبەر(ﷺ) دەرکی کرد بە گرنگی کێوی ئوحود بۆ پاراستنی سوپای موسڵمانان، بۆیە کاتێك سوپاکە گەیشتە ئوحود، پشتیانی کرد لە کێوەکە و ڕوویان لە مەدینە و، ئەنجا تیرهاوێژیشی هەڵبژارد لە ژێر فەرماندەی عەبدوڵای کوڕی جوبەیردا،[١] لەسەر تەپۆلکەی عەینەین بەرامبەر کێوی ئوحود دایان، بە مەبەستی ڕێگەگرتن لەوەی سوپای بتپەرستان نەخولێنەوە و پشتیان بگرن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکردن:((جێگای خۆتان بەر مەدەن، ئەگەر ئێمەتان بینی سەرکەوتینە سەریاندا، هەر لە جێگای خۆتان بن، ئەگەر ئەوانتان بینی سەرکەوتنە سەرماندا، یارمەتیمان مەدەن)).[٢]

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بە سوپاکەی فەرموو: جوڵە مەکەن تا ئاگادارتان دەکەمەوە، هەروەها پێی فەرموون: کەسێك لە ئێوە شەڕ نەکات تاکو من فەرمانی پێ نەکەم. ئینجا بە فەرماندەی تیرهاوێژەکانی فەرموو: ئەسپی بتپەرستان تیرباران بکەن لە جیاتی ئێمە، بۆ ئەوەی لە پشتمانەوە بۆمان نەیەن، جێگای خۆتیش بەرمەدە ئەگەر ئەنجامی شەڕەکە بۆ خۆمان بوو یان لە دژمان بوو، بە تیرهاوێژەکانیشی فەرموو: جێگای خۆتان بگرن و بەری مەدەن، ئەگەر ئێمەتان بینی دوژمنمان تێکشکاند و چووینە سەربازگەکەیانەوە، جێگاکانی خۆتان چۆڵمەکەن، ئەگەر ئێمەتان بینی دەکوژرێین فریامان مەکەون و بەرگریمان لێ مەکەن و، تیربارانیان بکەن چونکە ئەسپ ناتوانێت هێرش بکات ئەگەر تیری تێ بهاوێژرێت، ئێمە سەرکەوتوو دەبین تاکو ئێوە لە جێگاکانی خۆتان بمێننەوە، خوایە من تۆ دەکەمە شایەت بەسەریانەوە.[٣]

موسڵمانان زاڵبوونە سەر بەرزاییەکان و دۆڵەکەیان بەجێهێشت بۆ سوپای مەککە، بۆ ئەوەی ڕووی لە ئوحود و پشتی لە مەدینە بێت، ئەرکی تیرهاوێژەکانیش لەم خاڵانە خۆی دەبینیەوە: داگیرکردنی جێگاکە و، پاراستنی موسڵمانان لە پشتەوە و، بەرەنگاری سوارەکان بۆ ئەوەی نەچنە سەر موسڵمانان.[٤]

---

١ بڕوانە: الاصابة (٢/٢٧٨).

٢ بڕوانە: البخاري في المغازي: باب (غزوة احد رقم ٤٠٤٣).

٣ بڕوانە: السيرة الحلبية (٢/٤٩٦).

٤ بڕوانە: غزوة احد دراسة دعوية، (٩٠).

د- ڕاستکردنەوەی ڕیزەکـان و ڕیکخـستنی سـوپا: پێغەمبـەر(ﷺ) پێشکەوت و هاوەڵانی بەشێوەی ڕیزی نوێژکردن ڕیزکرد، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) دەستی کـرد بـە ڕێکخستنی ئەو ڕیزانە و هاوەڵانی ئامادە دەکرد بۆ جەنگ و دەیفەرموو: ئـەی فـلان پێشکەوە، ئەی فلان دواکەوە، ڕێکیخستن تاکو ڕیزەکـان ڕێك و پێـك بـوون.پیـاوە نەبەردەکانی خستە ڕیزی پێشەوە، بۆ ئـەوەی ڕێگـە بـۆ ئەوانـەی دوای خۆیـان والآ بکەنـەوە، پێغەمبـەر(ﷺ) بـەم شـێوازە کـاری کـرد لەبـەر ئـەوەی کاریگـەرترە لـە جەنگی دوژمناندا.[1]

هـ- شەڕنەکردن بە فەرمانی سـەرکردە نـەبێت: تەبـەری دەڵێت:((پـاش ئـەوەی پشتیان کـرد لـە کێوەکـە، پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی:((لا یقـاتلن احـد حتـى نـأمره بالقتال))[2] واتە: کەس شەڕ نەکات تاکو فەرمانی پێ دەکەین.

ئــەم ئاڕاســتەکردنەیش ســوودێکی گرنگــی تیــابوو، ئــەویش ڕێکخــستنی سـەرکردایەتی و لێپرسـراوێتی یـە، چـونکە پێغەمبـەر(ﷺ) چاکتر بـە بەرژەوەنـدی شارەزایە.

١ بڕوانە: العبقرية في غزوات الرسول، محمد فرج (٣٥٥-٣٥٦).
٢ بڕوانە: تاريخ الطبري (٢/٥٠٧).

## باسی دووەم: لەناوجەرگەی جەنگدا

### یەکەم: دەستپێکردنی شەڕ و پەرەسەندنی و دەرکەوتنی سەرەتای سەرکەوتن بۆ موسڵمانان.

لە سەرەتای شەڕەکە، ئەبو سوفیان هەوڵیدا کەلێنێك لە سوپای خۆڕاگری موسڵمانان دروست بکات و، نێردەی نارده لای ئەنصارییەکان و وتی: مافتان نەبێت بەسەر ئێمە و ئامۆزاکەمان، ئێمە واز دەهێنین لە ئێوە و شەڕتان لەگەڵ ناکەین، ئەوانیش وەڵامیان بە شێوەیەك دایەوە کە پێی ناخۆش بێت.[1]

کاتێك ئەو هەوڵە سەری نەگرت، قوڕەیش هەوڵێکی تریان دا لە ڕێگەی بەکرێ گرتەیەکی ناپاك لە خەڵکی مەدینە، کە ناوی ئەبو عامیری ڕاهیب بوو، ئەم ئەبو عامیرە هەوڵی دا ئەنصارەکان پاشگەز بکاتەوە و وتی ئەی کۆمەڵانی ئەوس، من ئەبو عامیرم، وتیان: خوا چاوی کەست پێ شاد نەکات ئەی ناپاکی خراپەکار، کاتێك گوێی لە وەڵامەکەیان بوو وتی: خزمەکانم تووشی شتێکی خراپ بوونە لە پاش خۆم، ئینجا دەستی کردە شەڕکردن لەگەڵیان بە شێوەیەکی توند و بە بەرد لێیانی دا.[2]

شەڕەکە دەستی پێکرد بە شمشێربازی لە نێوان عەلی(ﷺ) و تەڵحەی کوڕی عوسمان کە هەڵگری ئاڵای بتپەرستان بوو لە ڕۆژی ئوحود، نووسەری(السيرة الحلبية) دەڵێت: تەڵحەی کوڕی عوسمان دەرچوو ئاڵاکەی بە دەستەوە بوو، چەند جارێك داوای شمشێربازی کرد، بەڵام کەس بۆی دەرنەچوو، بە موسڵمانانی وت: ئەی هاوەڵانی موحەممەد ئایا ئێوە بانگەشەی ئەوە ناکەن کە خوا بە شمشێرەکانی ئێوە ئێمە بە پەلە دەنێرێت بۆ دۆزەخ، ئێوەیش بە شمشێرەکانی ئێمە بە پەلە ڕەوانەی بەهەشت دەکات، دەی کەسێکتان تیایە بە پەلە ڕەوانەم بکات بە شمشێرەکەی بۆ ئاگر، یان پەلەی پێ بکەم بە شمشێرەکەم بۆ بەهەشت؟ ئیتر عەلی

---

١ بڕوانە: تاريخ الطبري (٢/٥٠٧).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٢/١٩٢).

## باسی دووەم: لەناوجەرگەی جەنگدا

### یەکەم: دەستپێکردنی شەڕ و پەرەسەندنی و دەرکەوتنی سەرەتای سەرکەوتن بۆ موسڵمانان.

لە سەرەتای شەڕەکە، ئەبو سوفیان هەوڵیدا کەلێنێك لە سوپای خۆڕاگری موسڵمانان دروست بکات و، نێردەی نارده لای ئەنصارییەکان و وتی: مافتان نەبێت بەسەر ئێمە و ئامۆزاکەمان، ئێمە واز دەهێنین لە ئێوە و شەڕتان لەگەڵ ناکەین، ئەوانیش وەڵامیان بە شێوەیەك دایەوە کە پێی ناخۆش بێت.[١]

کاتێك ئەو هەوڵە سەری نەگرت، قورەیش هەوڵێکی تریان دا لە ڕێگەی بەکرێ گرتەیەکی ناپاك لە خەڵکی مەدینە، کە ناوی ئەبو عامیری ڕاهیب بوو، ئەم ئەبو عامیرە هەوڵی دا ئەنصارەکان پاشگەز بکاتەوە و وتی ئەی کۆمەڵانی ئەوس، من ئەبو عامیرم، وتیان: خوا چاوی کەست پێ شاد نەکات ئەی ناپاکی خراپەکار، کاتێك گوێی لە وەڵامەکەیان بوو وتی: خزمەکانم تووشی شتێکی خراپ بوونە لە پاش خۆم، ئینجا دەستی کردە شەڕکردن لەگەڵیان بە شێوەیەکی توند و بە بەرد لێیانی دا.[٢]

شەڕەکە دەستی پێکرد بە شمشێربازی لە نێوان عەلی(ﷺ) و تەڵحەی کوڕی عوسمان کە هەڵگری ئاڵای بتپەرستان بوو لە ڕۆژی ئوحود، نووسەری(السيرة الحلبية) دەڵێت: تەڵحەی کوڕی عوسمان دەرچوو ئاڵاکەی بە دەستەوە بوو، چەند جارێك داوای شمشێربازی کرد، بەڵام کەس بۆی دەرنەچوو، بە موسڵمانانی وت: ئەی هاوەڵانی موحەممەد ئایا ئێوە بانگەشەی ئەوە ناکەن کە خوا بە شمشێرەکانی ئێوە ئێمە بە پەلە دەنێرێت بۆ دۆزەخ، ئێوەیش بە شمشێرەکانی ئێمە بە پەلە ڕەوانەی بەهەشت دەکات، دەی کەسێکتان تیایە بە پەلە ڕەوانەم بکات بە شمشێرەکەی بۆ ئاگر، یان پەلەی پێ بکەم بە شمشێرەکەم بۆ بەهەشت؟ ئیتر عەلی

---

١ بڕوانە: تاريخ الطبري (٢/٥٠٧).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٢/١٩٢).

کوڕی ئەبوتالیبی بۆ دەرچوو(ﷺ) و فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە لێت جیانابمەوە تاکو خێرا بە شمشێرەکەم هەواڵەی دۆزەخت نەکەم، یان خێرا بە شمشێرەکەت هەواڵەی بەهەشتم نەکەیت، عەلی لە قاچی دا و بڕی، لەسەر زەوی کەوت و گەڵ و گونی کەوتە دەشت و وتی: ئەی ئامۆزا تکات لێ دەکەم بە خوا و خزمایەتی، ئیتر عەلی گەڕایەوە و نەچووە سەری، پێغەمبەر(ﷺ) وتی:(الله اکبر) و هەندێ لە هاوەڵان بە عەلی یان وت: بۆ نەچوویتە سەری بیکوژیت؟ فەرمووی: ئەو ئامۆزایەم کاتێك گەڵ و گونی کەوتە دەشت بە خزمایەتی تکای لێ کردم منیش شەرمم کرد.[١]

هەردوو سوپاکە یەکیان گرت و شەڕ گەرم بوو، پێغەمبەر(ﷺ)یش ورەی هاوەڵانی بەرز دەکردەوە و شمشێرێکی هەڵگرت و فەرمووی: کێ ئەم شمشێرەم لێ وەردەگرێت؟ هەموویان دەستیان درێژ کرد و دەیانوت: من، من. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کێ وەری دەگرێت و مافی بدات؟ ئینجا ئەوانە گەڕانە دواوە، سیماکی کوڕی خەرەشە ئەبو دوجانە وتی: من وەری دەگرم و مافی بۆ وەردەگرم، جا لە پێغەمبەر(ﷺ) وەرگرت و سەری بتپەرستانی پێ لەت دەکرد،[٢] ئەبو دوجانە پیاوێکی نەبەرد و ئازا بوو، لە کاتی جەنگدا وەکو کەسێك لە خۆبایی بێت ڕێی دەکرد، جا کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بەو شێوە لە نێو ڕیزەکاندا بینی، فەرمووی: ئەوە جۆرە ڕێکردنێکە خوای گەورە ڕقی لێیەتی ئەگەر لە شوێنێکی وا نەبێت.

زوبەیری کوڕی عەووام باسی ئەبو دوجانەمان بۆ دەکات لە ڕۆژی ئوحود و دەفەرمووێت: ئەوەم لە دڵ گرت کاتێك داوای شمشێرەکەم لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد و بە منی نەدا و بە ئەبو دوجانەی دا و، وتم: من کوڕی صەفییەی پوریم و لە قوڕەیشم، پێش ئەویش هەڵسام و داوام کرد، بەڵام بە ئەبو دوجانەی دا و وازی لە من هێنا، سوێند بە خوا تەماشا دەکەم بزانم چی دەکات، شوێنی کەوتم بینیم پارچەیەکی سووری دەرهێنا و سەری خۆی پێ بەستەوە، ئەنصارەکان وتیان: ئەبو

---

١ بڕوانە: السيرة الحلبية (٢/٤٩٧-٤٩٨) تفسير الطبري (٧/٢١٨).

٢ مسلم كتاب فضائل الصحابة، رقم (٢٤٧٠).

دوجانە پارچەی مەرگی دەرکرد، ئەبو دوجانە دەیوت:

انـا الـذي عاهـدني خليلـي ونحـن بالـسفح لـدى النخيـل
الا اقـوم الـدهر فی الكيّـول اضـرب بـسيف الله والرّسـول

واتە: منم ئە کەسەی خۆشەویستەکەم پەیمانی پێدام، لەو کاتەی لە قەدپاڵی دارخورماکان بووین، کە هەرگیز لە پاش ڕیزەکانەوە نەوەستم و، بە شمشێری خواو پێغەمبەرەکەی بجەنگم.

ئەبو دوجانە تووشی هەرکەسێك دەبوو دەیکوشت، لە نێو بتپەرستەکانیشدا پیاوێك بوو هەر برینداری ئێمەی ببینیایە دەچووە سەری و دەیکوشت، ئیتر هەردووکیان لە یەکتر نزیك بوونەوە و لە خوا پاڕامەوە ئەو دووانە یەك بگرن و بەیەك گەیشتن، دوو شمشێریان لە یەکتر هاویشت و ئەبو دوجانە خۆی و قەڵغانەکەی پاراست لە لێدانەکەی ئەو، توانی بە شمشێرێك بیکوژێت، ئینجا بینیم شمشێرەکەی هەڵگرت و نزیکی کردەوە لە سەری هیندی کچی عوتبە و دوایی دووری خستەوە لێی، وتم: خوا و پێغەمبەر زاناترن،[1] ئەبو دوجانە وتی: کەسێکم بینی خەڵکی لەسەر شەڕکردن گەرم دەکرد، کاتێك شمشێرەکەم لێ بەرزکردەوە بینیم ئافرەتە، منیش ڕێزم لە شمشێری پێغەمبەر(ﷺ) گرت لە ئافرەتی بدەم[2]

## دووەم: سەرپێچی کردنی تیرهاوێژەکان بۆ فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ).

موسڵمانان ئازاییان دەربڕی لە شەڕکردن لە دژی بتپەرستان، دروشمیشیان بریتی بوو لە(أمت، أمت) واتە: بمرێنە، بمرێنە، شەڕێکی پاڵەوانانەی داستان ئاسایان کرد، تیایدا پاڵەوانانی ئیسلام جوانترین شێوەکانی ئازاییان نیشاندا،[3] مێژوو سەروەری و پاڵەوانێتی حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب و موسعەبی کوڕی

---

١ بڕوانە: البداية والنهاية (٤/١٨).
٢ هەمان سەرچاوە (٤/١٨).
٣ بڕوانە: نضرة النعيم في مكارم اخلاق الرسول الكريم (١/٣٠٣).

عومەیر و، ئەبو دوجانە و ئەبو تەڵحەی ئەنصاری و سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و زۆری تری هاوشێوەی ئەوان تۆمارکرد، موسڵمانان لە کایەی یەکەمدا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا،[١] لەو بارەشەوە خوای گەورە فەرموویی: ﴿ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ اللَّهُ وَعْدَهُ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِ حَتَّى إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَازَعْتُمْ فِي الْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّن بَعْدِ مَا أَرَاكُم مَّا تُحِبُّونَ مِنكُم مَّن يُرِيدُ الدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ الْآخِرَةَ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ ﴾(ال عمران: ١٥٢).

کاتێك تیرهاوێژەکان تێکشکانی قوڕەیش و هاوپەیمانەکانیان بینی و، دەستکەوتەکانیان بینی لە گۆڕەپانی جەنگدا، ئەوە وای لێکردن جێگەکانیان بەجێبهێڵن بە گومانی ئەوەی کە شەڕەکە تەواو بووە، بە ئەمیرەکەیان عەبدوڵلای کوڕی جوبەیریان وت: دەستکەوت، خزمینە دەستکەوت، هاوەڵانمان سەرکەوتن، ئیتر چاوەڕوانی چی دەکەن؟ عەبدوڵلای کوڕی جوبەیر وتی: ئایا بیرتان چوو پێغەمبەر(ﷺ) چی پێ فەرموون؟ وتیان: سوێند بە خوا دەڕۆین و ئێمەیش دەستکەوت کۆدەکەینەوە،[٢] ئینجا ڕۆیشتن بۆ کۆکردنەوەی دەستکەوت و ئاوڕیان نەدایەوە بۆ قسەی فەرماندەکەیان، ئیبنو عەبباس باسی حاڵەتی تیرهاوێژەکان دەکات و دەفەرموێت: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان سەرکەوتن و دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی دەستکەوت لە سەربازگەی دوژمن، تیرهاوێژەکانیش هاتنە خوارەوە بۆ کۆکردنەوەی دەستکەوت، ڕیزەکانی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) یەکیان گرت بەم شێوە — ئینجا پەنجەکانی بەیەکا ئاڵاند — جا کاتێك تیرهاوێژەکان ئەو کەلێنەیان بۆ دوژمن بەجێ هێشت، ئەسپ سوارەکانی ئەوان لەو جێگەوە هاتنە سەر هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) و خەڵکێکی زۆریان لێ کوشتن.[٣]

---

١ هەمان سەرچاوە (٣٠٣/١).
٢ البخاري كتاب الجهاد، رقم (٣٠٣٩).
٣ مسند احمد (٢٨٧/١)، رقم (٢٦٠٨).

لەم کاتە خالید – کە سەرکردەی ئەسپ سوارەکانی بتپەرستان بوو – هەڵەکەی قۆستەوە و خولایەوە بە دەوری موسڵماناندا، کاتێك موشریکەکان ئەوەیان بینی گەڕانەوە جارێکی تر و لە دوو لاوە دەوری موسڵمانانیان دا و، موسڵمانان جێگاکانی خۆیان لەدەستدا و، ئینجا دەستیان کردە شەڕکردن بەبێ هیچ پلان و نەخشەیەك، واشیان لێ هات بە پەرتەوازەیی شەڕیان دەکرد، بەبێ ئەوەی سیستەمێك کۆیان بکاتەوە، بەڵکو یەکتریشیان نەدەناسیەوە، تەنانەت یەمانی باوکی حوزەیفەیان بە هەڵە کوشت، موسڵمانان یەك لە دوای یەك بە شەهیدی دەکەوتن لە گۆڕەپانی شەڕەکەدا و، پەیوەندییان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بچڕا، قسەی دەماودەم پەیدابوو کە پێغەمبەر(ﷺ) کوژراوە و،[1] شەڕ گەرم بوو و کەس کەسی نەدەناسیەوە، موشریکەکان هەر کێیان لە موسڵمانان دەست دەکەوت دەیانکوشت، نزیکیش بوونەوە لە خودی پێغەمبەر(ﷺ) و بەردێکیان تێ هاوێشت و لووتی و دانە خڕێکانی پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ)یان شکاند و ڕوومەتی بەڕێزیان بریندار کرد و خوێنی پیاهاتە خوارەوە و،[2] پێغەمبەر(ﷺ) خوێنەکەی دەسڕی و دەیفەرموو: چۆن کەسانێك ڕزگاریان دەبێت پێغەمبەرەکەیان بریندارکرد و دانیان شکاند، ئەویش بانگیان دەکات بۆ لای خوای گەورە؟ ئیتر خوای گەورەیش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ﴾(ال عمران: ١٢٨).

ئیبنو قەمیئەیش پەلاماری موسعەبی کوڕی عومەیری دا(ﷺ) چونکە زۆر لە پێغەمبەر(ﷺ) دەچوو، بۆیە قوڕەیش وتیان: موحەممەدمان کوشت،[3] ئینجا ئەو هەواڵە بڵاوبوویەوە و موسڵمانان پەرتەوازە بوون، هەندێکیشیان گەڕانەوە مەدینە، هەندێکیشان چوونە سەر دارخورماکان و، هاوەڵان بارودۆخیان تێکچوو، نەیاندەزانی چی بکەن بە هۆی گەورەیی کارەساتەکەوە، کۆمەڵێك لە موسڵمانانیش

---

١ بڕوانە: غزوة احد دراسة دعوية، (٩٨)

٢ بڕوانە: فقه السيرة للغزالي (٢٩٤).

٣ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٨١/٣).

لە گۆڕەپانی شەڕەکە هەڵهاتن، هەندێکی تریش لە گۆڕەپانی جەنگ دانیشتن بەبێ شەڕکردن، هەندێکیش شەهیدیان هەڵبژارد دوای ئەوەی گومانیان برد کە پێغەمبەر(ﷺ) کوژراوە، لەوانە ئەنەسی کوڕی نەزر، کە زۆر خەمباربوو بەوەی نەیتوانی لە بەدر بەشداربێت، لەو بارەشەوە وتبووی: سوێند بە خوا ئەگەر خوای گەورە لە جەنگێکدا بەشدارم بکات لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەمبینێت چ شەڕێك دەکەم، ڕاستیشی کرد لەو بەڵێنەی، ڕۆژی ئوحود وای کرد لە کەسانێك کە گوێیان لە واتە واتی کوژرانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو هەڵبێن و چەکەکانیان فڕێ بدەن،ئەویش فەرمووی: بۆچی دادەنیشن؟ وتیان: پێغەمبەر(ﷺ) کوژراوە، فەرمووی: ئەی کەسەکانم ئەگەر موحەممەد کوژراوە، خوای موحەممەد نەکوژراوە، بمرن لەسەر ئەوەی پێغەمبەرتان لەسەری مرد. هەروەها فەرمووی: خوایە من داوای لێبوردنت لێ دەکەم لەوەی ئەوانە دەیڵێن – واتە موسڵمانان – بەریشم لەوەی ئەوانە پێی هاتوون – واتە بتپەرستان – ئینجا سەعدی کوڕی موعازی بینی و فەرمووی: ئەی سەعد بۆنی گوڵاوی بەهەشت دەکەم، ئینجا خۆی فڕێداوە ناو کڵپەی جەنگەکەوە، هەر شەڕیشی دەکرد تاکو شەهید بوو، دوای هەشتا و چەند برینێکی پێوە بوو، هەمووی لێدانی شمشێر و ڕم و تیر بوو، کەس نەیدەناسیەوە خوشکێکی نەبێت، بە پەنجەکانی ناسیەوە،[١] لە ئەنەس و هاوشێوەکانی خوای گەورە فەرمووی: ﴿ مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ رِجَالٞ صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيۡهِۖ فَمِنۡهُم مَّن قَضَىٰ نَحۡبَهُۥ وَمِنۡهُم مَّن يَنتَظِرُۖ وَمَا بَدَّلُواْ تَبۡدِيلٗا ﴾(الاحزاب: ٢٣).

سەبارەت بەوانەش هەڵهاتن و ئاوڕیان نەدایەوە لە هیچ سەرەڕای بانگەوازی پێغەمبەر(ﷺ) و داواکردنی لێیان بۆ ئەوەی خۆڕاگر و جێگیربن خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند: ﴿إِذۡ تُصۡعِدُونَ وَلَا تَلۡوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٖ وَٱلرَّسُولُ يَدۡعُوكُمۡ فِيٓ أُخۡرَىٰكُمۡ فَأَثَٰبَكُمۡ غَمَّۢا بِغَمّٖ لِّكَيۡلَا تَحۡزَنُواْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمۡۗ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴾(ال عمران: ١٥٣).

---

١ بڕوانە: غزوة احد دراسة دعوية، (١٠١).

خوای گەورەیش باسی هەڵهاتنی ئەو هاوەڵانەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە ڕێگەیان بە خۆیاندا هەڵبێن پاش بیستنیان بۆ هەواڵی کوژرانی پێغەمبەر(ﷺ) کە بڵاوبوویەوە لە گۆڕەپانی جەنگدا، یەکەمین کەس کە ئاگاداربوویەوە پێغەمبەر(ﷺ) ڕزگاری بووە و زیندووە، کەعبی کوڕی مالیك بوو، کە دەنگی بەو مزگێنییە بەرزکردەوە، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکرد بێدەنگ بێت بۆ ئەوەی موشریکەکان بەو هەواڵە نەزانن،[1] خوای گەورە قورئانی دابەزاند لەسەر لێخۆشبوون لەوانەی هەڵهاتن لە جەنگەکە و فەرمووی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوۡاْ مِنكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ إِنَّمَا ٱسۡتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِبَعۡضِ مَا كَسَبُواْۖ وَلَقَدۡ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴾(ال عمران: ١٥٥).

## سێیەم: پلانی پێغەمبەر(ﷺ) لە گێڕانەوەی پەرتەوازەبووانی سوپاکە:

کاتێك دژە هێرش دەستی پێکرد لەلایەن موشریکانەوە لە پشتەوە کە ئامانجی سەرەکییان خودی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە هەڵوێستی خۆی دانەبەزی و هاوەڵان لەبەر دەستیدا یەك لە دوای یەك دەکەوتنە خوار، ئینجا گەماڕۆش درا لەناوجەرگەی بتپەرستاندا، تەنها نۆ کەسی لەگەڵدا مابوو حەوتیان ئەنصار بوون، مەبەستیشی ئەوەبوو گەمارۆکە بشکێنێت و سەرکەوێتە سەر کێوەکە و بە سوپاکەی بگەیەنێت، ئەنصارەکان ئازایەکی زۆریان نواند لە بەرگری کردن لە پێغەمبەر(ﷺ) و زۆریان شەهید بوون،[2] قەیسی کوڕی حازیم دەیفەرموو: تەڵحەم بینی، ئەو دەستەی کە پارێزگاری پێغەمبەر(ﷺ)ی پێ دەکرد ئیفلیج بووە،[3] پێغەمبەریش(ﷺ) ویستی بچێتە سەر تاوێرێك و نەیتوانی، ئیتر تەڵحە دانیشت و پێغەمبەر(ﷺ) سەرکەوتە سەری تاکو چووە سەر تاوێرەکە، زوبەیر فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەر بوو(ﷺ) دەیفەرموو:((اوجب الطلحة))[4] سەعدی کوڕی

---

١ مجمع الزوائد للهيثمي (١١٢/٦).
٢ بڕوانە: نضرة النعيم (٣٠٤/١).
٣ البخاري رقم (٣٧٢٤).
٤ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٢٩٦).

ئەبی وەققاصیش لە پێش دەستی پێغەمبەر(ﷺ)دا شەڕی کرد و پێغەمبەر(ﷺ) تیری دەدایە دەستی و دەیفەرموو:((ارمي سعد فداك ابي وامي))[١] واتە: بیهاوێژە ئەی سەعد باوك و دایکم بە قوربانت بێت، هەروەها ئەبو تەڵحەی ئەنصاری لەپێش دەستی پێغەمبەر(ﷺ) شەڕی کرد و، ئەو یەکێك لە شارەزاترین تیرهاوێژەکان، پێغەمبەر(ﷺ)یش دەربارەی دەفەرمووێت:((لصوت أبي طلحة في الجيش أشد على المشركين من من فئة))[٢] واتە: دەنگی ئەبو تەڵحە لە کۆمەڵێك سەختترە لەسەر موشریکەکان، ئەبو تەڵحە بە قەڵغانەکەی خۆی پێغەمبەر(ﷺ)ی دەپاراست، خۆیشی تیرهاوێژێکی چاك بوو،[٣] لەو ڕۆژەدا دوو یان سێ کەوانی شکاند، ئەگەر کەسێك لەوێوە تێپەڕیبا و تیردانی پێبووایە، پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێدەکرد بیخاتە بەردەستی ئەبو تەڵحە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) سەری بەرز دەکردەوە و، ئەبو تەڵحە پێی دەوت: ئەی پێغەمبەر باوکم بە قوربانت بێت، سەر بەرز مەکەرەوە بۆیان، با تیرێك لێت نەدا، لە گەردنی من بدات نەك لە گەردنی تۆ.[٤]

هەروەها نوسەیبەی کچی کەعب بە شمشێر بەرگری دەکرد لە پێغەمبەر(ﷺ) و تیری دەهاویشت، بە خەستیش بریندار بوو، ئەبو دوجانەیش خۆی کردبووە قەڵغان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و تیرەکان دەچەقینە پشتی و ئەویش خۆی دابووە سەر پێغەمبەر(ﷺ) بۆئەوەی تیری بەر نەکەوێت.[٥]

لەو ساتە نارەحەتانەدا ئەبو بەکر و ئەبو عوبەیدە بە دەوری پێغەمبەردا(ﷺ) بوون، ئەبو عوبەیدە بە دگانەکانی دوو تیرەکەی لە ڕوومەتی پێغەمبەر(ﷺ) کردەوە، لە پاش ئەوە کۆمەڵێك لە پاڵەوانانی ئیسلام هاتن و بوونە نزیکەی سی کەس، بەرگرییان دەکرد لە پێغەمبەر(ﷺ)، لەوانە: قەتادە و، سابیتی کوڕی دەحداح و، سەهلی کوڕی حونەیف و، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف و، زوبەیری کوڕی عەوام. عومەری کوڕی خەتتابیش توانی دژە هێرشێك بشکێنێت لە بەرزایی شاخەکانەوە بە سەرکردایەتی خالید، ئەو هاوەڵانەیش لەگەڵ عومەر بوون ئازاییان

---

١ هەمان سەرچاوە (٢٩٥).

٢ المسند والفتح الرباني (٢٢/٥٨٩)، باسناد رجاله ثقات.

٣ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٢٩٦).

٤ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية لمنير الغضبان(٤٦٨-٤٧٠).

٥ بڕوانە: البداية والنهاية (٤/٣٥-٣٦).

نواند لە بەرپەرچدانەوەی ئەو هێرشە توندە، موسڵمان جارێکی تر زاڵ بوونە سەر بارودۆخەکە،[1] موشریکەکان بێ هیوا بوون لەوەی شەڕەکەی بە بەرژەوەندی خۆیان یەکلا بکەنەوە، ماندوویش بوون لە درێژی شەڕەکە و خۆڕاگری موسڵمانان، پێغەمبەر(ﷺ)یش پاشەکشەی کرد لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵی بوون و ئەوانەی دواتر هاتن بۆ یەکێك لە ڕچەڕێکەکانی ئوحود، موسڵمانان لەو کاتە لە حاڵەتێکی ئازار و ترس و پەژارەدا بوون بە هۆی ئەوەی تووشی پێغەمبەرەکەیان بوو(ﷺ) و ئەوەی تووشی خۆیان بوو، سەرەڕای ئەوەی توانیان بەرپەرچی موشریکەکان بدەنەوە،[2] بۆیە خوای گەورە وەنەوزێکی بەسەریاندادا و کەمێك خەویان لێکەوت و ئاگاداربوونەوە، هەستیان بە ئارامی دەکرد، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ ۖ وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَىْءٍ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِ ۗ يُخْفُونَ فِىٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبْدُونَ لَكَ ۖ يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَا ۗ قُل لَّوْ كُنتُمْ فِى بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقَتْلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمْ ۖ وَلِيَبْتَلِىَ ٱللَّهُ مَا فِى صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِى قُلُوبِكُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾(ال عمران: ١٥٤).

لێکدەرەوانی قورئانیش یەك دەنگن لەسەر ئەوە مەبەست لە ﴿وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ﴾ مونافیقەکان بووە،[3] سەبارەت بە قورەیشیش، بێ هیوابوون لە بەدەستهێنانی سەرکەوتنێکی یەکلاکەرەوە و پیاوەکانیان لەدرێژەی جەنگەکە و خۆڕاگری موسڵمان ماندووبوون، بەتایبەتی دوای ئەوەی موسڵمانان ئەو شێوە ئاسودەییان بەسەردا دابەزی و لەدەوری پێغەمبەر(ﷺ) کۆبوون، بۆیە چیتر نەیانتوانی دوای موسوڵمانان بکەون و بچنە نێو هێزەکانیانەوە.[4]

---

١ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية لمنير الغضبان (٤٦٨-٤٧٠).

٢ بڕوانە: نضرة النعيم (٣٠٥/١).

٣ هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

٤ هەمان سەرچاوە (٣٠٦/١).

**چوارەم: لە شەهیدانی ئوحود.**

**أ- حەمزەی کوڕی عەبدولموتتەلیب( ) سەرگەورەی شەهیدانە لای خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا:**

حەمزەی شێری خوا شەڕێکی سەختی کرد و، زۆری لە بتپەرستان کوشت، سەری هەندێکی لە هەڵگرانی ئاڵای بتپەرستان پەڕاند لە بەنی عەبدوددار، لە حاڵەتێکدا ئەو لە ئەوپەڕی ئازاییدا شەڕی دەکرد وەحشی خۆی بۆ حەشاردا و توانی بە ڕمەکەی بیکوژێت، وەحشی خۆی باسی ئەم ڕووداوە دەکات و دەڵێت: حەمزە, توعەیمەی کوڕی عەدی کوڕی خیاری کوشت لە بەدر، ئیتر جوبەیری کوڕی موتعیمی سەرگەورەم پێی وتم: ئەگەر حەمزە بکوژیت ئازادی، جا کاتێک خەڵکی دەرچوون لە ساڵی عەینەین – عەینەین شاخێکە لە شاخەکانی ئوحود – منیش لەگەڵ خەڵکەکە دەرچووم بۆ شەڕ، کاتێک ئەوان ڕیزیان بەست بۆ شەڕکردن، سیباع دەرچوو وتی: کەس هەیە شمشێربازی بکات؟ ئیتر حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب دەرچوو، وتی: ئەی سیباع، ئایا دژایەتی خوا و پێغەمبەر(ﷺ) دەکەیت؟ ئینجا پەلاماری دا و لەناوی برد، دەڵێت: منیش خۆم حەشار دابوو لە پشت تاوێرێکەوە، کاتێك لێم نزیك بوویەوە ڕمەکەم تێ هاویشت و لەناو شانی دا و لەو لاکەوە دەرچوو و کوشتی، کاتێك خەڵکی گەڕانەوە منیش گەڕامەوە لەگەڵیان، لە مەککەیش مامەوە تاکو ئیسلامی تیا بڵاو بوویەوە و دوایی ڕۆیشتم بۆ تائیف و، ئەوان نێردەیان ناردە لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێیان وتم: ئەو خراپە ناکات لەگەڵ نێردراوەکاندا، منیش لەگەڵیان دەرچووم تاکو ڕۆیشتمە لای پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك منی بینی فەرمووی: تۆ وەحشیت؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: تۆ حەمزەت کوشت؟ وتم: چۆن پێت گەیشتووە هەروایە، فەرمووی: ئایا دەتوانیت ڕوخسارتم لێ بشاریتەوە؟ دەڵێت: منیش دەرچووم، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لە دونیا دەرچوو، ئینجا موسەیلەمەی درۆزن سەری هەڵدا، وتم: ئەبێت دەرچم بۆ لای موسەیلەمە بەڵکو بتوانم بیکوژم و کوشتنی حەمزەی پێ هاوسەنگ بکەمەوە، دەڵێت: منیش لەگەڵ خەڵکەکە دەرچووم و پیاوێکم لە کەلێنی دیوارێکدا بینی، دەتوت وشترێکی

بۆرە، قژی هەڵچووبوو، دەڵێت: منیش ڕمەکەم تێهاویشت و لەسەر سینگیم دا و لە پشتیەوە دەرچوو و، دەڵێت: دوای ئەوە پیاوێک لە ئەنصارەکان بە شمشێرەکە لەسەری دا، عەبدوڵای کوڕی فەزڵ دەڵێت: سولەیمانی کوڕی یەسار پێی وتم، گوێی لە عەبدوڵای کوڕی عومەر بووە فەرموویەتی: کەنیزەکێك لەسەربانێکدا وتی: هاوار لە ئەمیرولموئمینین کۆیلەیەکی ڕەش کوشتی.[1]

**١- پرسیارکردنی پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی کوژرانی حەمزە(ﷺ):**

پاش تەواوبوونی شەڕەکە پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لە هاوەڵانی کرد:((من رأى مقتل حمزة)) واتە: کێ شوێنی کوژرانی حەمزە شارەزایە، پیاوێك وتی: من دەزانم لە کوێ کوژرا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: باشە پێمان نیشان بدە، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوو تاکو چووە سەر حەمزە و، بینی سکیان هەڵدڕیووە و ئەتکیان کردووە، ئیتر ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەتك کراوە سوێند بە خوا،[2] لە ڕیوایەتێکیشدا هاتووە، کاتێك هەواڵی کوژرانی حەمزە گەیشتە پێغەمبەر(ﷺ) گریا، کاتێکیش تەماشای کرد هەناسەیەکی هەڵکێشا،[3] ئینجا لە ناوەڕاستی کوژراوەکاندا ڕاوەستا و، فەرمووی: من شایەتم لەسەر ئەوانە، بە خوێنەکانیانەوە کفنیان بکەن، چونکە هەر برینێك لە پێناو خوا بێت لە ڕۆژی قیامەت خوێنی لێ دەتکێت، ڕەنگی خوێنە و، بۆنی بۆنی گوڵاوە، کامیان قورئانی زۆرتر لەبەر بووە لە پێشدا بیخەنە گۆڕەکەی.[4]

بە شەهیدبوونی حەمزە و هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) لە ئوحود، خەونەکەی پێغەمبەر(ﷺ) هاتەدی، چونکە پێش دەرچوونی پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵانی فەرموو:((رأيت في سيفي ذي الفقار فلاً، فاولته فلاً يكون منكم(اي انهزاماً) ورأيت اني مردف كبشاً فاولته كبش الكتيبة، ورأيت اني في درع حصنية، فاولتها المدينة، ورأيت بقراً تذبح، فبقر والله خير، فبقر والله خير))[5] واتە: لە خەونمدا بینیم،

---

١ البخاري المغازي: رقم (٤٠٧٢).
٢ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٢٨٣-٢٨٤).
٣ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٢٨٣-٢٨٤).
٤ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٢٨٣-٢٨٤).
٥ بڕوانە: المسند (٢٧١/١)، برقم (٢٤٤٥).

شمشێری(ذي الفقار)م لەگەڵ بووە، بە شکاندنی ئێوە لە جەنگدا لێکم دایەوە، هەروەها بینیم بەرانێکم لەگەڵ خۆم سوارکردووە، بە بەرانی دەستە سەربازیەکە لێکمدایەوە، ئینجا لە خەونمدا بینیم لە پەناگەیەکی قایمدام، ئەویشم بە مەدینە لێکدایەوە و، ئینجا مانگام بینی سەردەبڕدرا، مانگایش بە خوا چاکە، مانگایش بە خوا چاکە، ئیتر هەر وایش بوو لە پێغەمبەر(ﷺ).

**٢- ئارامگرتنی صەفییەی کچی عەبدولموتتەلیب لەسەر حەمزەی برای:**

زوبەیری کوڕی عەووام(ﷺ) دەفەرمووێت: لە ڕۆژی ئوحود ئافرەتێك بە هەڵەداوان هات و چووە سەر کوژراوەکان، پێغەمبەریش(ﷺ) پێی ناخۆش بوو کوژراوەکان ببینێت و فەرمووی:(المرأة، المرأة) واتە: ئەو ئافرەتە، ئەو ئافرەتە، زوبەیر دەفەرمووێت: بۆچوونم وابوو صەفییە بێت، دەڵێت: منیش بە پەلە بەرەو لای ڕۆیشتم و پێی گەیشتم پێش ئەوەی بگاتە ناو کوژراوەکان، کە پێی گەیشتم لە سینگی دام و پاڵی پێوە نام، خۆیشی ئافرەتێکی بەهێزبوو، وتی: بڕۆ وازم لێ بهێنە وتم: پێغەمبەر(ﷺ) جەختی کردووە لەسەرت نەچیت.

دەڵێت: ئیتر ڕاوەستا دوو پۆشاکی دەرکرد و وتی: ئەوە دوو پۆشاکە هێناومە بۆ حەمزەی برام، چونکە هەواڵی کوژرانیم پێ گەیشتووە، دەڵێت: ئێمەش هەردوو پۆشاکەکەمان هێنا بۆ ئەوەی حەمزەی پێ کفن بکەین، تەماشامان کرد پیاوێکی ئەنصاری لە پاڵیدا کوژراوە و وەکو حەمزە ئەتك کراوە،دەڵێت: ئێمەیش بەشەرم و کارێکی نابەجێمان زانی حەمزە لە دوو پۆشاکدا کفن بکرێت و ئەنصارییەکە بێ کفن بێت، وتمان: پۆشاکێك بۆ حەمزە و ئەوەی تر بۆ ئەنصارییەکە، پێوانەمان کرد یەکێکیان لەوی تر گەورەتر بوو، ئێمەیش تیر و پشکمان کرد لە نێوانیان دا و، هەریەکە و لە پشکی خۆی کفن کرا.[1]

**٣- بەڵام حەمزە کەس نییە بۆی بگری:**

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە لە ئوحود گوێی لە ئافرەتە ئەنصارەکان بوو دەگریان، فەرمووی:(لكن حمزة لا بواكي له)، واتە: بەڵام حەمزە کەسی نییە بۆی

---

١ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٢٨٥).

بگرێت، ئەو قسە گەیشتە ئەو ئافرەتانە و، دەستیان کرد بە گریان لەسەر حەمزە، پێغەمبەر(ﷺ) خەوت و هەڵسایەوە، ئەوان هەر دەگریان، فەرمووی: بەڵایان لێکەوێت، هێشتا هەر دەگرین، دە با بگرین، پاش ئەمڕۆیش لەسەر مردوویەك نەگرین.[1] ئیتر شیوەن کردن قەدەغە کرا لەو ڕۆژەوە.

**٤- پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناوی حەمزە لە منداڵێکی ئەنصارى دەنا:**

جابیری کوڕی عەبدوڵا دەفەرمووێت: یەکێك لە ئێمە منداڵێکی لە دایك بوو، وتی: ناوی چی لێ بنێین؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(سموه باحب الاسماء اليّ، حمزة بن عبدالمطلب)[2] واتە: ناوی بنێن بە خۆشەویسترین ناو بە لای منەوە، حەمزەی کوڕی عەبدولموتتەلیب. بەڵام دواتر خوای گەورە خۆشەویسترین ناو بە لای خۆیەوە دادەبەزێنێت و، پێغەمبەریش(ﷺ) دەفەرمووێت:(ان احب اسمائكم الى الله عبدالله وعبدالرحمن)[3] واتە: خۆشەویسترین ناوەکانتان لە لای خوا عەبدوڵا و عەبدوڕڕحمانە.

**٥- ئایا دەتوانیت ڕووخساری خۆتم لێ بشاریتەوە:**

ئەو ئاراستە بەڕێزە هیچ تاوانکردنێکی تیا نیە بۆ وەحشی، بەڵکو تەنها بیرخستنەوەیەکە کە بیبینێ ئەو هەندێ ئازاری دەروونی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دروست دەکات و یادگاری کوژرانی حەمزە لە لای دەهەژێنێت، لەوانە هەندێك شت لە دڵیدا دروست بکات و توانای نەبێت بەرگریان بکات. ئەوەیش دەبێتە جۆرێك لە سەرقاڵکردن بۆ پێغەمبەر(ﷺ).[4]

بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی بۆ کرد ڕوخساری لێ بشارێتەوە بۆ ئەوەی ئەو سەرچاوەی بیرخستنەوە نەمێنێت،[5] لە ڕیوایەتێکی ڕاستیشدا هاتووە وەحشی وتوویەتی: هاتمە لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێی فەرمووم: تۆ وەحشیت، وتم: بەڵێ،

---

١ بڕوانە: سنن ابي ماجه، محمد فؤاد عبدالباقي، كتاب الجنائزة، باب (ماجاء في البكاء على الميت) ج٢، برقم (١٥٩١) وصححه الالباني برقم (١٣٠٣٣).

٢ رواه الحاكم (٣/١٩٦) سنده حسن.

٣ مسلم، كتاب الادب رقم (٢١٣٢).

٤ بڕوانە: محمد رسول الله، محمد الصادق عرجون (٣/٦٠٣).

٥ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٥/٤٤١).

فەرمووی: حەمزەت کوشت؟ وتم: بەڵێ، سوپاس بۆ ئەو خوای ڕێزی لە ئەو گرت بە دەستی من و، منی ڕیسوا نەکرد بە دەستی ئەو، قورەیش وتیان: ئایا خۆشت دەوێت و ئەو بکوژی حەمزەیە؟ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا داوای لێخۆش بوونم بۆ بکە لە خوا، پێغەمبەر(ﷺ) سێ جار تفی لە زەوی کرد و، سێ پاڵی نا بە سنگمەوە فەرمووی: ئەی وەحشی، دەرچۆ و شەڕ بکە لە پێناو خوادا، وەکو چۆن شەڕت کرد بۆ ئەوەی ڕێگەی خوا قەدەغە بکەیت،[1] ئەوە ئاڕاستەکردنە و ئامۆژگاری پێغەمبەر(ﷺ) بوو بۆی، بۆ ئەوەی خوای گەورە دژایەتی کردنی کوشتنی بسڕێتەوە و هانی دا ئاڵای جیهاد بەرز بکاتەوە و، لەوانەشە دەرچوونی وەحشیش بۆ یەمامە و کوشتنە بۆ موسەیلەمەی درۆزن لە کاریگەری ئەو ئامۆژگارییانەی پێغەمبەر بێت(ﷺ)، وەحشی خۆیشی دەرکی کرد بەو ڕاستیە کاتێك وتی: چاکترین کەسم کوشت واتە حەمزە و، خراپترین کەسیشم کوشت واتە موسەیلەمەی درۆزن.[2]

**ب- موصعەبی کوڕی عومەیر(ﷺ):**

خەبباب دەفەرمووێت: کۆچمان کرد لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) و مەبەستمان خوای گەورە بوو، پاداشتمانیش کەوتە لای خوا، هەندێکمان بەڕێگەی خۆیدا ڕۆیشت و هیچی لە پاداشتەکەی نەخوارد، موصعەب یەکێك بوو لەوانە، کە لە ڕۆژی ئوحودا کوژرا، هیچی بەجێ نەهێشت تەنها پۆشاکێك نەبێت، ئەگەر سەریمان داپۆشیایە هەردوو قاچی دەردەکەوت، ئەگەر هەردوو قاچیشمان داپۆشیایە سەری دەردەکەوت، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((... غطوا رأسه، واجعلوا على رجليه إذخر))، واتە: سەری داپۆشن و ڕووەکی(الاذخر) بخەنە سەر هەردوو قاچی، هەندێکیشمان بەروبوومەکەی پێگەیشت و، هەروەها فەرموودەیەك هاتووە لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف کە خواردنێکیان بۆ هێناوە بۆ بەربانگ ئەویش فەرموویەتی: موصعەبی کوڕی عومەیر کوژرا و لە من چاکتر بوو، شتێکمان دەست نەدەکەوت پێی کفن بکەین، تەنها پۆشاکێك نەبێت، حەمزەیش کوژرا، یان پیاوێکی

---

١ رواه الطبراني في الكبير، اسناده حسن (٢٢/١٣٩)، رقم (٣٧٠) نقل عن صحيح السيرة النبوية (٢٨٦).

٢ بروانە: محمد رسول الله، محمد الصادق عرجون (٣/٦٠٢).

تر، لە من باشتر بوو، ئەویش هیچ نەبوو لاشەی پێ کفن بکەین، تەنها پۆشاکێك نەبێت، دەترسم خوای گەورە خۆشی و ڕابواردنەکانی بۆی پێش خستبێتین لەم دونیایە، ئینجا دەستی کردە گریان.[١]

**ج- سەعدی کوڕی ڕەبیع(ﷺ):**

ئەم پیاوە بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێکرد باسی دەرچوونی قورەیش بشارێتەوە و خۆشیشی دەویست، کاتێك جەنگی ئوحود کۆتایی پێهات پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: کێ تەماشا دەکات بزانە سەعدی کوڕی ڕەبیع ماوە یان کوژراوە؟ چونکە پێغەمبەر(ﷺ)بینیبووی ڕمەکان ڕووی تێکردبوو، ئوبەی کوڕی کەعب(ﷺ) فەرمووی: من تەماشات بۆ دەکەم ئەی پێغەمبەری خوا، ئینجا پێی فەرموو: ئەگەر سەعدت بینی لە منەوە سڵاوی پێ بگەیەنە و پێی بڵێ: پێغەمبەری خوا پێت دەڵێت: چۆن خۆی دەبینێت؟ ئیتر ئوبەی تەماشای کرد سەعد لەناو بریندارەکاندایە و گیانی تیا ماوە.

پێی وت: پێغەمبەری خوا فەرمانی پێ کردم هەواڵت بزانم، ئەویش وتی: دوانزە لێدانم پێوەیە و لێدانەکانم کوشندەن،[٢] لە ڕیوایەتێکی صحیحیشدا هاتووە فەرموویەتی: سڵاو لە پێغەمبەری خوا و لە تۆیش، پێی بڵێ: ئەی پێغەمبەر بۆنی بەهەشت دەکەم و، بە ئەنصارەکانی خزمم بڵێ: هیچ پۆزشێکتان نییە ئەگەر دوژمن بگاتە پێغەمبەر(ﷺ) و ئێوە چاوێکتان هەبێت تەماشا بکات، دەفەرمووێت: ئینجا گیانی سپارد ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت.[٣]

بەم شێوە سەعد لە کاتی سەرەمەرگیشدا هەر بانگەوازی دەکرد بۆ لای خوای گەورە و گوێی نەدەدا بە مردن.

---

١ البخاري في الجنائز رقم (١٢٨٦).

٢ بڕوانە: السيرة الحلبية (٢/٥٣٢).

٣ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٢٩٤).

**د- عەبدوڵای کوڕی جەحش(ﷺ):**

سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص(ﷺ) دەفەرمووێت: عەبدوڵای کوڕی جەحش لە ڕۆژی ئوحوددا پێی وتووە ئایا دوعایەك ناکەیت، ئیتر لە لایەکەوە وەستان و سەعد دوعای کرد: خوایە ئەگەر ڕووبەڕووی دوژمن بوومەوە بمخە بەرامبەر پیاوێکی ئازا، شەڕی لەگەڵ بکەم و شەڕم لەگەڵ بکات، ئینجا سەرکەوتنم پێ ببەخشە تاکو دەیکوژم و، دەستکەوتەکانی دەبەم، عەبدوڵای کوڕی جەحش وتی: ئامین، ئینجا فەرمووی: خوایە پیاوێکی بەهێزم پێ ببەخشە، لە پێناو تۆ شەڕی لەگەڵ بکەم و شەڕم لەگەڵ بکات و لووت و گوێم ببڕێت، کاتێك سبەی تۆم بینی، پرسیارم لێ بکەیت: کێ لووت و گوێتی بڕی، منیش بڵێم لە پێناو تۆ و پێغەمبەرەکەت، ئینجا پێم بڵێیت: ڕاست دەکەیت، سەعد وتی: کوڕم دوعاکەی عەبدوڵای کوڕی جەحش چاکتر بوو لە دوعاکەی من، لە کۆتایی ئەو ڕۆژە ئەوم بینی لووت و گوێی بەسترابوو بە پەتێکەوە،[1] لەم هەواڵەیش ئەوە وەردەگیردرێت کە ڕەوایە کەسێك دوعا بکات بکوژرێت لە پێناو خوادا و، ئاوات بخوازێت بمرێت، ئەوە لەو جۆرە ئاوات خواستنە نیە کە قەدەغەکراوە.[2]

**هـ- حەنزەڵەی کوڕی ئەبی عامیر(ﷺ):**

کاتێك موشریکەکان دەرکەوتن حەنزەڵە لە ئەسپەکەی ئەبو سوفیانی کوڕی حەربی داو کەوتە زەوی، ئەویش هاواری کرد کاتێك حەنزەڵە ویستی بیکوژێت، ئیتر ئەسوەدی کوڕی شەدداد فریای کەوت و ڕمێك لە حەنزەلەیدا، بەڵام حەنزەلە بەو حاڵەشەوە هەر بۆی ڕۆیشت و جارێکی تر لێیدا و حەنزەلە کوژرا و، ئەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باسکرا و فەرمووی: من بینیم فریشتەکان بە ئاوی هەورەکان دەیانشۆردەوە لە نێوان ئاسمان و زەویدا، لە ناو لەگەنی زیودا.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: پرسیار لە خێزانەکەی بکەن لەو بارەوە؟ ئیتر خێزانەکەی وتی: لەشگران بوو کە دەرچوو، کاتێك کە گوێی لە بانگکەر بوو، ئینجا

---

١ هەمان سەرچاوە (٢٩٣).

٢ بڕوانە: زاد المعاد (٢١٢/٣).

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بۆیە فریشتەکان شۆردوویانەتەوە.[١]

لە ڕیوایەتی واقیدیشدا هاتووە: کە حەنزەلە هاوسەرگیری کردبوو لەگەڵ جەمیلەی کچی عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول. ئەو شەوەیش گواستبوویەوە کە بە ڕۆژەکەیدا جەنگی ئوحود ڕوویدا، مۆڵەتی لە پێغەمبەر(ﷺ) وەرگرتبوو ئەو شەوە لای بمێنێتەوە، کاتێك نوێژی بەیانی کرد دوایی ویستی بچێت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام جەمیلە ڕایوەستان و جارێکی تر پێکەوە بوون و لەشی گران بوو لێی و، دوای ئەوە دەرچوو، جەمیلە پێشتر ناردبووی بە دوای چوار کەس لە خزمەکانیدا کردبوونی بە شایەت کە حەنزەلە ئەوی گواستۆتەوە و جووت بووە لەگەڵیدا، دوایی پێیان وت: بۆچی ئەو شایەتانەت گرت؟ وتی: لە خەونمدا بینیم ئاسمان کرایەوە و حەنزەلە چووە ناویەوە و جارێکی تر ئاسمان داخرایەوە، وتم: ئەوە شایەتی، شایەتیم بۆ دا کە ئەو ئافرەتەی گواستۆتەوە، منالێکی لە حەنزەلە بوو ناوی عەبدوڵا بوو، دواتر شووی کردە سابیتی کوڕی قەیس و کوڕێکی لێی بوو ناوی موحەممەد بوو.[٢]

ئەم هەواڵە چەند پەندێکی تیایە:

١- وابەستەبوونی جەمیلە بە حەنزەلەوە پاش بینینی ئەو خەونە، چونکە گومان وابوو لێی دوورکەوێتەوە بۆ ئەوەی شوو بکات دوای ئەو، بەڵام پەیوەست بوو پێوە بەهیوای ئەوەی منالێکی لێ بێت و، لە ڕاستیشدا کوڕێکی لێ بوو دوایی شانازی دەکرد کە کوڕی ئەو کەسەیە کە فریشتەکان شۆردیانەوە.

٢- پەرۆش بوونی حەنزەلە بۆ بەرەنگاری کردنی دوژمنانی خوا و بە پەلە دەرچوونی بۆ گۆڕەپانی شەڕ، بە شێوەیەك فریا نەکەوت خۆی بشۆرێت.

٣- نەبەردی حەنزەلە کاتێك کە توانی بگاتە ئەبو سوفیان کە سەرکردە بوو، سەرکردەیش زۆرجار پاسەوانێتی دەکرێت، ئەو سواربوو، حەنزەلەیش بە پیادە.

---

١ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٢٨٩).

٢ بڕوانە: المغازي للواقدي (١/٢٧٣).

٤- ڕێزگرتنی زۆری خوایەتی کە لە لایەن فریشتەکانەوەشۆرایەوە.

٥- ئەو موعجیزە خواییانەی کە بریتی بوو لە هەوڵدانی پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵان دەربارەی ئەو کارەی فریشتەکان پێی هەڵساون لەگەڵ حەنزەلە.[١]

٦- ئەگەر شەهید لەشی گران بوو بێت دەشۆردرێتەوە وەکو حەنزەلە.[٢]

**و-عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی حەرام(ﷺ):**

عەبدوڵا سوور بوو لەسەر بەشداری کردن لە غەزای ئوحود، بە جابیری کوڕی فەرموو: ئەی جابیر، هیچت لەسەر نییە ئەگەر لە مەدینە بمێنیتەوە تاکو دەردەکەوێت مەسەلەی ئێمە بە چی دەگات، سوێند بە خوا لەبەر ئەوە نەبێت کچ لە دوای خۆم بەجێ دەهێڵم، حەزم دەکرد لە پێش دەستمدا بکوژرێیت.[٣]

هەروەها بە کوڕەکەی وت: وا دەزانم لەسەرەتای ئەوانەی لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) دەکوژرێن من دەبم، ئینجا من لە پاشی خۆم کەسم نییە لە تۆ خۆشەویستتر بێت، پێغەمبەر(ﷺ) نەبێت، قەرزەکانم بدەرەوە و چاکە لەگەڵ خوشکەکانت بکە.[٤]

عەبدوڵا لەگەڵ موسڵمانان دەرچوو پلەی شەهیدی بەدەست هێنا، جابیر بۆمان دەگێڕێتەوە:((کاتێك باوکم کوژرا لە ئوحود، ڕوومەتیم خستە دەر و دەگریام، هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)یش داوایان لێ دەکردم نەگریم و پێغەمبەر(ﷺ) هیچی نەدەوت، ئینجا پوورەکەشم هەر لەسەر باوکم دەگریا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((تبكين او لا تبكين، مازالت الملائكة تظله بأجنحتها حتى رفعتموه))[٥] واتە: بگریت یان نەگریت، فریشتەکان بە باڵیان سێبەریان بۆ دەکرد تاکو بەرزتان کردەوە.

---

١ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٥/١٢٩-١٣٠).
٢ بڕوانە: زاد المعاد (٣/٢١٤).
٣ البخاري (٤٠٩٧).
٤ البخاري (١٣٥١).
٥ البخاري (١٢٤٤).

پێغەمبەریش(ﷺ) جارێك بە جابیری فەرموو: ئەی جابیر بۆچی داماوی؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، باوکم شەهید بوو و، هەندێ منالّ و قەرزی بەسەرمەوە جێ هێشتووە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا مژدەت پێ نەدەم خوای گەورە باوکتی چۆن پێشوازی کرد، وتم: بەلّێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، فەرمووی: خوای گەورە لەگەلّ کەسدا قسەی نەکردووە لە پشت پەردەوە نەبێت، بەلاّم لەگەلّ باوکت راستەوخۆ قسەی کرد و فەرمووی: بەندەکەم ئاوات بخوازە پێت دەبەخشم، ئەویش وتی: خوایە! زیندووم کەرەوە بۆ ئەوەی جارێکی تر بکوژرێمەوە، خوای گەورە فەرمووی: پێشتر بریومەتەوە کە ناگەرێنەوە بۆ دونیا، وتی: خوایە، ئەوانەی دوای ئێمە ئاگادار بکەرەوە،[1] ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾(ال عمران: ١٦٩).

**ز- خەیسەمەی ئەبو سەعد(ﷺ):**

خەیسەمەی ئەبو سەعد کورەکەی لە رۆژی بەدر شەهید بووبوو دەیوت: سوێند بە خوا پشکەکەم دەرنەچوو لە بەدر، ئەگینا بە خوا من سوور بووم لەسەر بەشداری کردن، بەلاّم من لەگەلّ کورەکەم تیروپشکمان کرد و ناوی ئەو دەرچوو، خوای گەورەیش شەهیدی پێ بەخشی، دوێنێ لە خەونمدا بینیم، کورەکەم لە جوانترین شێوەدا بوو لە نێو باخ و رووبارەکانی بەهەشتدا گەشتی دەکرد، دەیوت: فریامان بکەوە با لە بەهەشت لەگەلّماندا بیت، چونکە من ئەوەی خوای گەورە بەلّێنی پێدابووم پێی گەیشتم، سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆر پەرۆشم بۆ ئەوەی هاورێیەتی کورەکەم بکەم لە بەهەشتدا و، تەمەنیشم گەورە بووە و، ئێسقانەکانم ناسك بوونەتەوە و، بیری چاوپێکەوتنی خوای خۆم دەکەم، جا دوعام بۆ بکە خوای گەورە شەهیدی پێ ببەخشێت و بمکاتە هاورێی سەعد لە بەهەشتدا، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) دوعای بۆ کرد و لە ئوحود شەهید بوو.[2]

١ صحيح ابن ماجه الالباني، رقم (١٥٨-١٨٩).
٢ بروانە: زاد المعاد (٣/٢٠٩).

**ح- وەهبی موزەنی و برازاکەی(ﷺ):**

وەهبی کوڕی قابووسی موزەنی و حاریسی کوڕی قابووسی برازای، لە کێوی موزەینەوە بە مەڕەکانیانەوە هاتن بۆ مەدینە، بینیان شار چۆڵە، پرسیاریان کرد: لە کوێن خەڵکی؟ وتیان: لە ئوحود، پێغەمبەر(ﷺ) دەرچووە شەڕ لە دژ بتپەرستەکان بکات، وتیان: شوێنەوارێکیان ناوێت دوای ئەوەی بە چاو دەبینرا، ئیتر دەرچوون تاکو هاتنە لای پێغەمبەر(ﷺ) لەئوحود تەماشایان کرد شەڕگەرمەو، پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی زاڵبوونە، ئیتر ئەوانیش لەگەڵ موسڵمانان بەشدار بوون لە دەستکەوتەکاندا، ئینجا ئەسپ سوارەکان لە دواوە هاتن، خالیدی کوڕی وەلید و عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل، ئیتر هەردووکیان شەڕێکی سەختیان کرد، بەشێك لە سوپای بتپەرستان جیابووبوویەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کێ دەرەقەتی ئەو کۆمەڵە دێت؟ وەهبی کوڕی قابووس وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا. ئینجا دەستی کرد بە تیربارانکردنیان تاکو گەڕاندنیەوە.

کۆمەڵێکی تریان لێ جیابووبووەوە و، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کێ دەرەقەتی ئەو کۆمەڵە سەربازە دێت؟ موزەنی وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا. ئینجا هەڵسا بە شمشێر گەڕاندنیەوە و گەڕایەوە. کۆمەڵە چەکدارێکی تر هاتن و پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کێ هەڵئەسێت بۆ ئەوانە؟ دیسان وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: هەڵسە و مژدەی بەهەشتت لێ بێت، موزەنی بە خۆشحاڵیەوە هەڵسا و وتی: سوێند بە خوا نە پەشیمان دەبمەوە و، نە واز دەهێنم، ئینجا بە شمشێرەکەیەوە دەستی کرد لە لێدانیان و، پێغەمبەر(ﷺ) تەماشای دەکرد، تاکو لەوسەریانەوە دەرچوو، پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: خوایە سۆز و بەزەیی خۆت بڕێژە سەری، ئەو بەردەوام بە شمشێر و ڕمەکانیان کوشتیان و دواتر بینرا بیست لێدانی کوشندەی پێوەیە و ئەتکیش کراوە، ئینجا برازاکەی شەڕی کرد تا کوژرا، عومەری کوڕی خەتتاب دەیووت: خۆشترین مردن بە لامەوە مردنی موزەنییە.[1]

---

١ المغازي للواقدي (١/٢٧٥).

سەعد دەڵێت: شایەتی دەدەم پێغەمبەر(ﷺ)م بینی لەسەری ڕاوەستابوو بە کوژراوی، دەیفەرموو: خوای گەورە لێت ڕازی بێت من لە تۆ ڕازیم. ئینجا بینیم پێغەمبەر(ﷺ) بە هەموو برینەشیەوە لەسەری ڕاوەستابوو، تاکو خرایە گۆڕەکەی، بە پۆشاکێکی سەوز کفن کرابوو، پێغەمبەر(ﷺ) دەستی درێژکرد بەو پۆشاکە ڕووخساری داپۆشی و درێژی کردەوە سەر گیانی تاکو گەیشتە نێوەی قاچی و فەرمانی پێ کردین گوژاڵکمان هێنا و هەردوو قاچیمان داپۆشی لە گۆڕەکەیدا، ئینجا ڕۆیشت. منیش ئاواتەخوتزبووم بەو شێوەیە بمردمایە.[١]

بەم شێوە ئیمان خاوەنەکەی دەگۆڕێت، وەکو دەردەکەوێت وەهبی کوڕی موزەنی و برازاکەی مەڕەکانیان بەجێهێشت لە مەدینە و خۆیان گەیاندە نێو شەڕەکە و پەرۆشی شەهیدی بوون، بۆیە خوای گەورەیش ئەو ڕێزەی پێ بەخشین، ئەم داستانەیش لە یادی هاوەڵاندا هەر مایەوە، ئەوەتا سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص پاش سیانزە ساڵ یادی دەکاتەوە.

**ط- عەمری کوڕی جەموح(ﷺ):**

عەمری کوڕی جەموح(ﷺ) زۆر شەل بوو، چوار کوڕی بوو شێرئاسا لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئامادەی غەزاکان دەبوون ناویان: خەللاد و موعەوەز و مەعازو ئەبوئەیمەن بوون، لە ڕۆژی ئوحود ویستیان ڕێگەی لێ بگرن لە دەرچوون و وتیان: خوای گەورە پاساوی بۆت داناوە، ئەویش هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: کوڕەکانم دەیانەوێت ڕێگرم بن لەوەی دەرچم لەگەڵت، سوێند بە خوا ئاواتەخوازم بەم شەلیەوە بچمە ناو بەهەشتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: تۆ خوای گەورە پاساوی بۆت داناوە و جیهادی لەسەرت هەڵگرتووە، بە کوڕەکانیشی وت: ئەتوانن وازی لێ بهێنن، بەڵکو خوای گەورە شەهیدی پێ ببەخشێت، عەمر لەکاتی دەرچوونی ڕووی کردە قیبلە و وتی: خوایە بە نائومێدی مەمگێڕەوە لای کەس و کارم، ئیتر بە شەهیدی کوژرا.

---

١ هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

لە ڕیوایەتێکی تریشدا هاتووە، کە عەمر(ﷺ)، هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر شەڕ بکەم تاکو دەکوژرێم، ئایا قاچم چاك دەبێتەوە لە بەهەشتدا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵێ، ئیتر لە ڕۆژی ئوحوددا کوژرا لەگەڵ برازایەکی و هاوپەیمانێکیان، پێغەمبەر(ﷺ) بە لایاندا تێپەڕی و خرانە یەك گۆڕەوە.[1]

ئەم هەواڵەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەر کەسێك خوای گەورە بواری پێ دابێت دەرنەچێت بۆ جیهاد، بەڵام خۆی هەر دەربچێت پاداشتی هەیە.[2]

هەروەها بەڵگەشە لەسەر ئازایەتی عەمری کوڕی جەموح و حەزکردنی لە شەهیدی بە ڕاستەقینە.

**ی- ئەبو حوزەیفەی کوڕی یەمان و سابیتی کوڕی قەیس(ﷺ):**

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ)دەرچوو بۆ ئوحود، حوسەیلی کوڕی جابیر کە یەمانی باوکی حوزەیفەیە، لەگەڵ سابیتی کوڕی وەقش،خرانە ناو قەڵاکان لەگەڵ ئافرەت و منداڵەکان، یەکێکیان بەوەی تری وت: هەردووکیشیان پیر بوون: چاوەڕوانی چی دەکەیت؟ سوێند بە خوا ئەوەندەی دووجار ئاودانی گوێدرێژێکمان ماوە، ئێمە ئەمڕۆ یان سبەی دەمرین، ئایا بۆ شمشێرەکانمان هەڵنەگرین و خۆمان فریای پێغەمبەر(ﷺ) نەخەین؟ بەڵکو خوای گەورە شەهیدیمان پێ ببەخشێت. شمشێرەکانیان هەڵگرت و خۆیان کردە ناو خەڵکەکەدا بێ ئەوەی کەس پێیان بزانێت، سابیتی کوڕی وەقش بتپەرستان کوشتیان و، حوسەیلی کوڕی جابیریش موسڵمانان بە هەڵە کوشتیان چونکە نەیانناسی، حوزەیفە وتی: ئەوە باوکمە، وتیان: سوێند بە خوا نەمانناسی و ڕاستیشیان کرد، حوزەیفە وتی: خوای گەورە لێتان خۆش بێت و خۆیشی لە هەموو کەسێك بەسۆزترە، پێغەمبەر(ﷺ) ویستی خوێنبایی بۆ دەستنیشان بکات بەڵام حوزەیفە وازی لەو خوێنباییە هێنا و کردی بە خێر لەسەر موسڵمانان، بەوەش گەورەتر بوو لە لای پێغەمبەر(ﷺ)،[3] لەم هەواڵە

---

١ بڕوانە: المسند (٥/٢٩٩) رقم (٢٢٥٥٣)، السيرة النبوية لابن هشام (٣/١٠١).

٢ بڕوانە: زاد المعاد (٣/٢١٨).

٣ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٩٨).

کاریگـەری ئیمـان لـە لای ئەمـەن گـەورەکان دەردەکـەوێت و هـەروەها هەڵوێستی جوانی حوزەیفە دەردەکەوێت کە خوێنبایی باوکی کرد بە خێر لەسەر موسڵمانان، هەروەها ئەوەش دەردەکەوێت کە ئەگەر موسڵمانان ئەگەر موسڵمانێکیان بە هەڵە کوشت، پێشەوا پێویستە خوێنبایی لە ماڵی موسڵمانان بۆ دەربکات.[١]

**ك: مەسەلەکان بە کۆتاییەکانیانن.**

**١- بەسەرهاتی ئوصەیریم(ﷺ):**

نـاوی عـەمری کـوڕی سـابیتی کـوڕی وەقـشە، داوای لێکـرا موسـڵمان بێـت و موسڵمان نەبوو، ئەبو هورەیرە(ﷺ) ئەو بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە: ئوصەیریم ئیسلامی ڕەتکردەوە لەسەر کەس و کارەکەی، ڕۆژێك هات بۆ مەدینە و لەو ڕۆژەدا پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی لە ئوحود بوون، وتی: سەعدی کوڕی موعاز لە کوێیـە؟ وتیان: لە ئوحودە، وتی: برازاکانی لە کوێن؟ وتیان: لە ئوحودن، وتـی: قەومەکـەی خۆم لە کوێن؟ وتیان: لـە ئوحـودن، ئـەویش بڕیـاری دا موسـڵمان بێـت و شمـشێرو ڕمەکـەی هـەڵگرت و قەڵغانەکـەی لەبـەرکرد و سـواری ئەسـپەکەی بـوو تـاکو خـۆی گەیاندە نێو خەڵکەکە، کاتێك موسڵمانان ئەویان بینی، وتیان: بـڕۆ دوورکـەوە ئـەی عەمر، وتی: من ئیمانم هێناوە، ئیتر دەستی کرد بـە شـەڕ کـردن تـاکو بـە سـەختی برینـدار بـوو، ئینجـا لـە کاتێکدا چـەند کەسـێك لـە بـەنی عەبدولئەشـهەل بـە دوای کوژراوەکانیان دەگەڕان، چاویان بە ئوصەیریم کەوت و پێیان سەیربوو چـونکە ئـەو پێش شەڕەکە موسڵمان نەبوو، پێیان وت: بۆچـی هـاتی لەبـەر قەومەکـەت یـان لـە پێناو ئیسلامدا، وتی: بەڵکو لـە خۆشەویـستی ئیـسلامدا، شـەڕم کـرد تـاکو ئـەوەم بەسەر هات کە دەیبینن، پاش ئەوەی موسڵمان بووم، ئەگەریش مردم هەرچی مـاڵم هەیـە بـۆ موحەممـەدە ئـەو چـی لێ دەکـات ئـازادە، ئـەوەیان بـاس کـرد بـۆ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەو لەوانەیە کە دەچنە بەهەشتەوە.

ئینجـا دەیـانوت: مـرد و چـووە بەهەشـتەوە بـێ ئـەوەی نوێـژێك بکـات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((عمل قليلاً وأجر كثيراً))[٢] واتە: کاری کەم کرد و پاداشتی

---

١ بڕوانە: زاد المعاد (٣/٢١٨).

٢ بڕوانە: البخاري، الجهاد، رقم (٢٨٠٨).

زۆری وەرگرت، ئەبو هورەیرەیش دەیووت: کێ یە چووەتە بەهەشتەوە و هەرگیز نوێژی نەکردووە، جا ئەگەر خەڵکی نەیانزانیبا کێیە، دەیفەرموو: ئوصەیریمی کوڕی عەبدولئەشهەلە.[١]

**٢- بەسەرهاتی موخەیریق:**

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوو بۆ جەنگی ئوحود، موخەیریق کەس و کارە جوولەکەکانی کۆکردەوە و پێی وتن: ئەی کۆمەڵانی جوولەکە، سوێند بە خوا چاك بۆتان دەرکەوتووە کە پشتگیری کردنی موحەممەد پێویستە لەسەرتان، وتیان: ئەمڕۆ شەممەیە، وتی: شەممەتان نییە ئێوە.

ئینجا شمشێر و کەرەستەکانی هەڵگرت و وتی: ئەگەر کوژرام هەرچی ماڵم هەیە بۆ موحەممەدە، ئینجا بەرەو لای پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشت و شەڕی کرد تاکو کوژرا، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((مخيريق خير يهود)).[٢] واتە: موخەیریق چاکترینی نێو جوولەکەکانە.

سەبارەت بە موسڵمان بوونیشی هەندێ جیاوازی هەیە، پێشەوا(الذهبي) لە(التجريد) و(ابن حجر) لە(الاصابة)دا، دەگێڕنەوە لە ڕێگەی(الواقدي)یەوە کە موسڵمان بووە، هەروەها(السهيلی) لە(الروض الانف)دا دەگێڕێتەوە کە موسڵمان بووە، چونکە لە ڕیوایەتێکی(ابن اسحق)یشدا هاتووە کە موسڵمان بووە و، ناکرێت بە موسڵمانیك بوترێت ئەو چاکترینی گاورەکانە یان چاکترینی جوولەکەکانە، دکتۆر(عبدالله الشقاري)یش هەڵساوە بە لێکۆڵینەوەی ئەم مەسەلە لە کتێبی(اليهود في السنة المطهرة)دا و بۆی دەرکەوتووە کە موخەیریق موسڵمان بووە، هەر ئەوەیش بووەتە مایەی ڕۆیشتنی بۆ شەڕکردن و ڕاسپێری کردنی بەوەی هەموو ماڵەکەی کە چەندێ زۆریش بووە، بدرێتە پێغەمبەر(ﷺ)، سەرەڕای خۆشەویستی زۆری جوولەکە بۆ ماڵ و سامان.[٣]

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/١٠٠-١٠١).

٢ بڕوانە: المغازي للواقدي (١/٢٦٣)، والسيرة لابن هشام (٣/٩٩).

٣ بڕوانە: اليهود في السنة المطهرة (١/٣٠٦).

ل-(انما الاعمال بالنیات):

یەکێك لەوانەی لەگەڵ موسڵمانان شەڕیان کرد لە ئوحود پیاوێك بوو قوزمانی پێ دەوترا، بە ئازایی دەناسرا، بەڵام کە باسیان دەکرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو:((انه من اهل النار))، واتە: ئەو لە خەڵکی دۆزەخە. لە ڕۆژی ئوحوددا دواکەوت بۆیە ژنانی بەنی زەفەر تانە و تەشەریان لێدا، ئینجا هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) کە خەریکی ڕێکخستنی ڕیزەکان بوو، تاکو خۆی گەیاندە ڕیزی یەکەم، ئەم یەکەم کەس بوو موسڵمانان کە تیر بهاوێژێت، دوای ئەوەی شەڕێکی زۆر نەبەردانەی کرد بە تیر و شمشێر، ئینجا لێدرا و کەوتە زەوی، قەتادەی کوڕی نوعمان بانگی لێکرد: ئەی ئەبەلغەیداق پیرۆزت بێت شەهیدی، موسڵمانانیش پێیان وت: بە ڕاستی شەڕێکی چاکت کرد، مژدەت لێ بێت ئەی قوزمان، وتی: مژدەی چی؟ سوێند بە خوا لەبەر خزمەکانم شەڕم دەکرد، لەبەر ئەوەش نەبوایە شەڕم نەدەکرد، ئەوەیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باس کرد و فەرمووی:((انه من اهل النار، ان الله تعالى يؤيد هذا الدين بالرجل الفاجر))[1] واتە: ئەو دەچێتە دۆزەخەوە، خوای گەورە پشتیوانی ئەم ئایینە دەکات بە پیاوی خراپەکار.

لەم هەواڵە سوودی ئەوە وەردەگیردرێت کە نیەت لە جیهاددا پلە و پایەیەکی بەرزی هەیە، هەرکەسێ لە پێناو خوادا شەڕ نەکات لێی وەرناگیرێت.

## پێنجەم: لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی.

**١- چاوی قەتادەی کوڕی نوعمان(ﷺ):**

چاوی قەتادە(ﷺ) لێدرا و کەوتە سەر گۆنای بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) وەکو خۆی گەڕاندییەوە، دواتر لە چاوەکەی تری تیژتر و چاکتر بوو، تووشی ئێشیش نەدەبوو ئەگەر ئەوەکەی تووشی بووایە،[2] جارێکیش کوڕی ئەم پیاوە چووە لای عومەری کوڕی عەبدولعەزیز و کاتێك لێی پرسی تۆ کێی؟ بە هۆنراوە وتی: من کوڕی ئەو

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٩٩)، غزوة احد دراسة دعوية، (١١٣)..
٢ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٢/٢٨٨).

پیاوەم کە چاوی کەوتە سەر گۆنای و پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە جاران چاکتر بۆی گێڕایەوە، ئەویش ڕێزی لێی گرت و پاداشتی دایەوە.[١]

**٢- کوژرانی ئوبەی کوڕی خەلەف:**

ئوبەی کوڕی خەلەف کاتێک لە مەککە پێغەمبەر(ﷺ)ی دەبینی دەیووت: ئەسپێکم هەیە هەموو ڕۆژێک ئالفی پێ دەدەم، لەسەر ئەو ئەسپەوە دەیکوژم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((بل أنا اقتلك انشاء الله)) واتە: بەڵکو من دەتکوژم بە پشتیوانی خوا. جا لە ڕۆژی ئوحود، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) پشتی دابوویە ڕچەڕێی شاخەکە، ئوبەی هات و وتی: ڕزگارم نەبێت ئەی موحەممەد ئەگەر بهێڵم ڕزگارت ببێت، موسڵمانان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا یەکێکمان بۆی بچین؟ فەرمووی وازی لێ بهێنن، کاتێك نزیك بوویەوە پێغەمبەر(ﷺ) ڕمەکەی لە حاریسی کوڕی صیممە وەرگرت و تێی گرت، ڕمەکە لە گەردنی دا و کەمێك ڕووشانی، کاتێك گەڕایەوە لای بتپەرستەکان، وتی: بە خوا موحەممەد کوشتمی، وتیان: دیارە تێکچووی، عەیبت نییە، وتی: موحەممەد لە مەککە پێی وتبووم دەتکوژم، سوێند بە خوا ئەگەر تفێکیشم لێ بکات دەمکوژێت، ئیتر ئەم دوژمنەی خوا لە کاتی گەڕانەوەیان لە جێگایەك مرد ناوی سەرەف بوو.

ئەم ڕیوایەتە ئازایی پێغەمبەر(ﷺ)مان بۆ دەردەخات، چونکە ئوبەی کوڕی خەلەف خۆی بە قەڵغانی ئاسن پاراستبوو بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) توانی لە کونێکەوە ڕمەکەی پێ بگەیەنێت و ئەوەیش بەڵگەیە لەسەر لێهاتوویی پێغەمبەر(ﷺ) لە هونەری جەنگدا، هەروەها ئەم هەواڵە موعجیزەیەکیشە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) چونکە پێی فەرموو بوو کە دەیکوژێت، هەروەها پەندێکیشی تیایە لە ڕووی باوەڕهێنانی بتپەرستانەوە بە ڕاستگۆیی پێغەمبەر(ﷺ).

---

١ بڕوانە: البداية والنهاية (٤/٣٥).

## باسی سێیەم: ڕووداوەکانی پاش جەنگ

### یەکەم: گفتو گۆی ئەبو سوفیان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی.

بەڕائی کوڕی عازیب(ﷺ) دەفەرمووێت: ئەبو سوفیان سەرکەوتە جێگایەکی بەرز و وتی: ئایا موحەممەدتان تیایە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: وەڵامی مەدەنەوە، ئینجا وتی: ئایا کوڕی ئەبو قوحافەتان تیایە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: وەڵامی مەدەنەوە، ئینجا وتی: ئایا کوڕی خەتتابتان تیایە؟ ئینجا وتی: ئەو کەسانە کوژراون ئەگەر زیندوو بوایەن وەڵامیان دەدایەوە. عومەر خۆی پێ نەگیرا(ﷺ) و فەرمووی: درۆت کرد ئەی دوژمنی خوا، خوای گەورە ئەو کەسانەی هێشتۆتەوە بۆ ڕووڕەشی تۆ، ئەبو سوفیان وتی: بەرزی و بەڕێزی بۆ تۆ ئەی هوبەل، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: وەڵامی بدەنەوە، وتیان: بڵێین چی؟ فەرمووی: بڵێن:(الله اعلى وأجل) واتە: خوای گەورە بەرزتر و مەزنترە، ئەبو سوفیان وتی: عوزامان هەیە و ئێوە بێ عوززان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: پێی بڵێن:(الله مولانا ولا مولى لكم) واتە: خوای پەروەردگار گەورە و سەرپەرشتیاری ئێمە و ئێوە سەرپەرشتیارتان نییە. ئەبو سوفیان وتی: ئەم ڕۆژە لە جیاتی بەدر، شەڕیش هەر جارێك کەسێك تیای سەردەکەوێت، هەندێکتان ئەتك کراون، من فەرمانم پێ نەکردووە و لێشم قەدەغە نەکردوون،[1] لە ڕیوایەتێکیشدا هاتووە کە عومەر فەرموویەتی: وەکو یەك نین کوژراوەکانمان لە بەهەشتدان و کوژراوەکانتان لە دۆزەخدان.

پرسیارکردنی ئەبو سوفیان دەربارەی ئەو کەسانە ئەوە دەردەخات کە ئەوان گرنگیان داوە بەو کەسانە و، مردنیان بە لایانەوە نەمانی ئیسلامە.

وەڵام نەدانەوەیش بۆ ئەبو سوفیان سەرەتا وەکو سوکایەتیەك بوو بۆی، با فش بێتەوە و لە خۆی بایی بێت دوایی وەڵام بدرێتەوە.[2]

---

١ البخاري، المغازي، رقم (٤٠٤٣)، السيرة النبوية الصحيحة (٣٩٢/٢).

٢ بروانە: السيرة النبوية الصحيحة (٣٩٢/٢).

(ابن القیم) لە پەراوێزدانانی لەسەر ئەم گفت و گۆیە دەڵێت: كاتێك شانازی بە بتەكانیانەوە كرد پێغەمبەر(ﷺ)فەرمانی كرد وەڵام بدرێتەوە، وەكو مەزن ڕاگرتنێك بۆ یەكتاپەرستی و سەربەرزی موسڵمانان، پێشتریش وەڵامی پرسیارەكانی نەدانەوە لەبەر ئەوە بوو ئەوان هێشتا سارد نەبووبوونەوە، لە شەڕی موسڵمانان، بەڵام كاتێك ئەبو سوفیان بە كۆمەڵەكەی خۆی وت ئەو كەسانە كوژراون، عومەر(ﷺ) تووڕە بوو و، بەو شێوە وەڵامی دانەوە، ئەویش ئەوپەڕی ئازایی عومەر و لووت شكاندنی ئەوان دەردەبڕێت، پێغەمبەر(ﷺ) سەرەتا ئارامی گرت لەسەر وەڵامدانەوەیان و، دواتر ڕێگەی بە عومەر دا وەڵامیان بداتەوە، دواخستنی وەڵامەكەیش زۆر لەوە چاكتر بوو لە سەرەتاوە وەڵام بدرایەتەوە، چونكە ئەوە جۆرێك بوو لە سوكایەتی پێیان، جا كاتێك هەستی بە خۆبەزلزانینیان كرد خۆی قشكردەوە، وەڵامەكە سووكایەتی و بەرپەرچدانەوە بوو بۆیان، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ناڕازی نەبوو لە وەڵام دانەوەكەیان كاتێك ئەبو سوفیان وتی: ئەوانە كوژراون.....[1]

## دووەم: بەسەركردنی پێغەمبەر( ﷺ ) بۆ شەهیدان.

لە پاش پاشەكشەكردنی ئەبوسوفیان لە خاكی جەنگەكە، پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشت بۆ بەسەركردنەوەی هاوەڵانی(ڕەزای خوایان لێ بێت)، بەلای هەندێكیاندا تێپەڕی كوژرابوون، حەمزە و موصعەب و حەنزەلەی كوڕی ئەبو عامیر و سەعدی كوڕی ڕەبیع و ئوصەیریم و هاوەڵانی تر، كە چووە سەریان فەرمووی: من شایەتم لەسەر ئەوانە، هەر كەسێك برینێك لە لاشەیدا هەبێت لە پێناو خوا، لە ڕۆژی قیامەت خوای گەورە زیندووی دەكاتەوە و برینەكەی خوێنی لێ دەتكێ، ڕەنگ ڕەنگی خوێنە و بۆن بۆنی میسكە، تەماشا بكەن كامیان زۆرتر قورئانی لەبەر بووە، لە پێش هاوڕێكانی بیخەنە گۆڕەكەی.[2]

---

١ بڕوانە: زاد المعاد (٣/٢٠٢-٢٠٣) بە دەستكارییەوە.

٢ بڕوانە: السیرة النبویة لابن هشام (٣/١٠٩).

جابیری کوڕی عەبدوڵلایش لە ڕیوایەتی بوخاریدا دەفەرموویت: پێغەمبەر(ﷺ) دوو کەسی لە کوژراوانی ئوحود لە یەك پۆشاکدا دەناشت و پرسیاری دەکرد: کامیان قورئانی زۆرتر لەبەر بوو، ئەوی پێش دەخست لە گۆڕەکەی و دەیفەرموو:((انا شهيد على هؤلاء يوم القيامة)) واتە: من شایەتم لەسەر ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتدا، ئینجا فەرمانی دەکرد بە ناشتنیان بە خوێنەکانیانەوە و نوێژی لەسەر نەدەکردن و نەیدەشۆردنەوە.[1]

لە جابیری کوڕی عەبدوڵاشەوە هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) کە گوێزرانەوە بۆ مەدینە، فەرمانی کرد بیانگێڕنەوە بۆ ئەو جێگەی لێی کوژراون.

کاتێکیش پێغەمبەر(ﷺ) حەمزەی بینی بەو شێوە ئەتك کرابوو، خەم و پەژارە دایگرت و ئەوەندە گریا تاکو خەریك بوو ببوورێتەوە، فەرموویشی:((لو لا ان تحزن صفية، ويكون سنة من بعدي لتركته حتى يكون في بطون السباع وحواصل الطير، ولئن اظهرني الله على قريش في موطن من المواطن لا مثلن بثلاثين رجلاً منهم))، واتە: لەبەر ئەوە نەبێت صەفییە خەفەتبار دەبێت و دەبێتە سوننەت لە پاش خۆم، لاشەکەم بەجێ دەهێشت تاکو دڕندە و پەلەوەر بیخۆن، ئەگەر خوای گەورەیش سەرمخاتە سەر قوڕەیش لە جێگەیەکدا سی پیاویان لێ ئەتك ئەکەم، کاتێك موسڵمانان بینیان ئەوەندە بێ تاقەتە و خەمبارە، وتیان ئەگەر خوا سەرمانخاتە سەریان بە شێوەیەك ئەتکیان دەکەین لە نێو عەرەب شتی وا نەکرابێت، ئیتر فەرموودەی خوای گەورە دابەزی: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا۟ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ ۖ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّـٰبِرِينَ﴾(النحل: ١٢٦).

بتپەرستان چەند کارێکی دڕندانەیان ئەنجامدا و، سکی موسڵمانانیان هەڵدڕی و لووتیان بڕین و ئەندامی پیاوەتیان بڕین، سەرەڕای ئەوەش پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی دانیان بە خۆیاندا گرت و ڕازی بوو بە ئاڕاستەی خوای گەورە، پێغەمبەریش(ﷺ) ئارامی گرت و کەفارەتی سوێندەکەی دا و ئەتك کردنی قەدەغە

---

[1] البخاري، المغازي، رقم (٤٠٧٩).

کرد. هەروەها لە سومرەی کوڕی جوندوبەوە هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) لە هەموو جێگەیەك، فەرمانی پێیان دەکرد بە خێر و صەدەقە و نەهی لێدەکردن لە ئەتك کردن.[1]

## سێیەم: دوعای پێغەمبەر(ﷺ) لە ئوحود.

پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی نیوەڕۆی بە هاوەڵانی کرد بە دانیشتنەوە، چونکە خوێنێکی زۆر لە لاشەی دەڕۆیشت، موسڵمانانیش هەر بە دانیشتن لە پشتیەوە نوێژیان کرد، لە پاش نوێژەکەیش دوعای کرد و بە هاوەڵانی فەرموو: ڕێك ڕاوەستن با ستایشی پەروەردگارم بکەم، ئەوانیش لە پشتی پێغەمبەر(ﷺ) ڕیزیان بەست و ئەویش بەم وشانەی دوعای کرد کە ئاماژە دەکات بۆ قووڵی بیروباوەڕی،[2] فەرمووی: خوایە هەموو سوپاس و ستایشێك هەر بۆ تۆیە، ئەوەی تۆ بیبەخشیت کەس وەری ناگرێتەوە، ئەوەش تۆ وەریگریتەوە کەس نایگێڕێتەوە، هەر کێیش گومڕا بکەیت ڕێ پیشاندەری نییە، هەر کێیش ڕێنموونی بکەیت کەس ناتوانێت گومڕای بکات، ئەوەش تۆ قەدەغەی بکەیت بەخشەری نییە، ئەوەش بیبەخشیت قەدەغەکەری نییە، ئەوەی تۆ دووری بخەیتەوە کەس نزیکی ناکاتەوە، ئەوەیش نزیکی بکەیتەوە کە دووری ناخاتەوە، خوایە پیرۆزی و سۆز و چاکە و ڕۆزیمان پێ ببەخشە، خوایە داوای خۆشگوزەرانی هەمیشەییت لێ دەکەم کە تێك نەچێت و لا نەچێت، خوایە داوای خۆشحاڵیت لێ دەکەم لە ڕۆژی سەرکەوتندا و ئارامبوون لە ڕۆژی مەترسیدا، خوایە پەنات پێ دەگرم لە خراپترین ئەو شتەی پێت بەخشیوین و خراپترین ئەوەیش کە لێت قەدەغەکردووین. خوایە ئیمانمان لا برازێنەوە و جوانی بکەرەوە لە دڵەکانماندا و، بێباوەڕی و یاخی بوون و خراپەکاریمان لە لا ناشیرین بکە و بمانگێڕە بە هۆشمەندەکان، خوایە بە موسڵمانی بمانمرێنە و بە موسڵمانی زیندوومان بکەرەوە و فریای پیاوچاکانمان بخە، بێ ئەوەی تووشی ڕووزەردی و

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/١٠٧).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٢/٢١٠).

پەشیمانی و ئاژاوە بین، خوایە ئەو بێباوەڕانە لە نێو بدەیت کە پێغەمبەرانت بە درۆ دەخەنەوەو رێگای تۆ قەدەغە دەکەن و سزا و خەشم و قینی خۆتیان بەسەرا برێژە، خوایە ئەی خوای راستەقینەی ئێمە ئەوکافرانەی کە کتێبیان بەسەر دابەزیوە لەناویان بدەیت.[١]

ئینجا سوار ئەسپەکەی بوو و گەڕایەوە بۆ مەدینە.[٢]

ئەویش کارێکی مەزن بوو پێغەمبەر(ﷺ) ئوممەتەکەی فێرکرد بۆ ئەوەی داوای سەرکەوتن لە خوای گەورە بکەن و رابێن لەسەر دوعاکردن لە کاتی سەرکەوتن و بەزانیشدا، چونکە دەبێتە مایەی پەیوەست بوونی دڵ بە خواوە، وەرگرتنی هێز و وزە لە خوای گەورە و بەرزبوونەوەی ورەکان.

ئەم هەڵوێستەی پێغەمبەر(ﷺ) لە مەزنترین ئەو هەڵوێستانەیە کە خوا پەرستان بەرز دەکاتەوە و بەندەیش بەرێز دەکات.[٣]

## چوارەم: زانینی ئاراستەی دوژمن.

لە پاش پاشەکشەکردنی سوپای موشریکەکان، یەکسەر پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بەناردنی عەلی کوڕی ئەبو تالیب بۆ زانینی ئاراستەی سوپای دوژمنان و، پێی فەرموو: لە شوێنەواری ئەواندا بڕۆ و بزانە نیازی چیان هەیە، ئەگەر ئەسپەکانیان لە لاوە دانابوو، سواری وشترەکانیان بوون، ئەوە دەچن بۆ مەککە، ئەگەر سواری ئەسپەکانیان بووبوون و وشترەکانیان لەبەردەدا، ئەوە بۆ مەدینە دێن، سوێند بە خوا ئەگەر بیانەوێت بەرەو لایان دەچم و شەڕیان لەگەڵ دەکەم، عەلی دەفەرمووێت: منیش بە دوایاندا دەرچووم و بینیم ئەسپەکانیان خستۆتە لا و، سواری وشترەکانیان بوونە و، روویان لە مەککەیە،[٤] ئیتر عەلی گەڕایەوە و پێغەمبەر(ﷺ) ئاگاداری کردەوە. لەم ریوایەتە هەندێك پەند و ئامۆژگاری تیایە

---

١ بڕوانە: مجمع الزوائد (٦/١٢١-١٢٢)، وقال الهيثمي رواه احمد ورجاله رجال الصحيح.
٢ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٢/٣٩٤).
٣ بڕوانە: صور وعبر من الجهاد النبوي في المدينة، د. محمد فيض الله، (١٣٢-١٣٣).
٤ بڕوانە: البداية والنهاية (٤/٤١).

لەوانە: وریایی پێغەمبەر(ﷺ) و چاودێری کردنی بۆ جموجۆڵی دوژمن و ورە بەرزی و ئامادەیی بۆ جەنگکردن، هەروەها متمانەی پێغەمبەر(ﷺ) بە عەلی(رضي الله عنه) و، ئازایەتی عەلی، چونکە ئەو سوپا ئەگەر ئاگادار بووایە لە عەلی هەوڵی کوشتنی دەدا، ئینجا تێبینی ئەوە دەکەین کە پێغەمبەر(ﷺ) مایەوە لەسەر خاکی شەڕەکە پاش تەواوبوونی جەنگ، بۆ بەسەرکردنەوەی بریندااران و ناشتنی شەهیدان و دوعاکردن و هەروەها ناردنی عەلی بۆ هەواڵ زانینیان، هەموو ئەمانەش لەبەر پاراستنی ئەو سەرکەوتنەی لە ئوحود بەدەستهات، چونکە خوای گەورە هۆکاری داناوە بۆ سەرکەوتن و تێکشکان، هەرکەسێ بەو هۆکارانە کار بکات سەرەنجامی بەپێی ئەو کارەی دەبێت، وەکو خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ سُنَّةَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلُ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلًا ﴾(الفتح:٢٣).

## پێنجەم: غەزای( حمراء الاسد ).

لە هەندێك ڕیوایەتدا هاتووە كە پێغەمبەر(ﷺ) بەدواداچوونی كردووە بۆ هەواڵی بتپەرستان لە ڕێگەی هەندێ شوێنكەوتووانەوە، تەنانەت دوای گەڕانەوەشیان بۆ مەككە، لە ئیبنو عەبباسەوە هاتووە كە فەرموویەتی: كاتێك بتپەرستان لە ئوحود گەڕانەوە و گەیشتنە ڕەوحا،[1] ئەبو سوفیان وتی: نە موحەممەدتان كوشت و نە ئافرەتەكانتان لەگەڵ خۆتان هێنا، كارێكی خراپتان كرد، ئیتر ئەو قسە گەیشتە پێغەمبەر(ﷺ).[2] كاتێكیش پێغەمبەر(ﷺ) بیستی بە نیازی گەڕانەوەی قوڕەیش بۆ مەدینە، جارێكی تر دەرچوو لەگەڵ بەشداربووانی جەنگی ئوحود بەرەو(حمراء الاسد).

ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: جەنگی ئوحود لە ڕۆژی شەممەدا بوو لە ناوەڕاستی شەووال، لە ڕۆژی دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) بانگی كرد لە ناو خەڵكیدا بۆ ڕۆیشتن بەرەو ڕووی دوژمن، بانگكەری پێغەمبەریش(ﷺ) ڕایگەیاند كە تەنها ئەوانەی دوێنێ

---

١ (الروحاء) ٧٣ كیلۆمەتر لە مەدینەوە دوورە بە لای مەككەدا.
٢ بڕوانە: مجمع الزوائد للهيثمي (٦/١٢١) قال الهيثمي: رجاله رجال الصحيحة غير محمد بن منصور الجواز.

لەگەڵمان بێن، بەڵام جابیری کوڕی عەبدوڵا داوای مۆڵەتی کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش ڕازی بوو، دەرچوونیشی لەبەر ترساندنی دوژمن بوو، بۆ ئەوەی وا نەزانن ورەیان نەماوە و لاواز بوونە،[١] هاوەڵانیش بە دەنگی پێغەمبەرەوە هاتن(ﷺ) و تەنانەت بریندارەکانیش دەرچوون، پیاوێك لە بەنی عەبدولئەشهەل دەڵێت: خۆم و برایەکم ئامادەی بەدر بووین و بریندار بووین، بەڵام کاتێك بانگکەری پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کرد بە براکەمم وت: ئایا غەزایەکمان لەدەست بچێت لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)، بە خوا هیچ وڵاخێکمان نییە سواری بین و هەردووکمان برینداریشین، ئیتر دەرچووین لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)، منیش برینەکەم ئاسانتر بوو لە براکەم، بۆیە ئەگەر ماندووبووایە ماوەیەك هەڵم دەگرت و ماوەیەك ڕێی دەکرد، تاکو گەیشتینە ئەو جێگایە.[٢]

پێغەمبەر(ﷺ) بەرەو(حمراء الاسد) ڕۆیشت و لە سوپای بتپەرستان نزیك بوویەوە، سێ ڕۆژیش مایەوە بۆ بەرەنگاری کردنی ئەوان، بەڵام ئەوان نەیانتوانی ڕووبەڕووی ببنەوە و شەڕی لەگەڵ بکەن، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمانی کردبوو ئاگر بکەنەوە، ئەوانیش لە یەك کاتدا پێنج سەد ئاگریان کردبوویەوە.[٣]

ئینجا مەعبەدی خوزاعی هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوو، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکرد بچێتە لای ئەبو سوفیان و پەشیمانی بکاتەوە، ئەویش ڕۆیشت و لە ڕەوحا فریای کەوت، کەسیش بە موسڵمان بوونی نەدەزانی، ئەبو سوفیان وتی: چیت لە دوایە ئەی مەعبەد؟ وتی: موحەممەد و هاوەڵانی، زۆر بە پەرۆشن لە دژتان، لە کۆمەڵێکی زۆردا دەرچوونە، چونکە ئەوانەی دەرنەچووبوون پەشیمان بوونەتەوەو ئێستا دەرچوونە لەگەڵیان، وتی: ئەی تۆ چی دەڵێی؟ وتی: وا دەزانم نەڕۆی تاکو سەرەتای سوپاکە لە پشت ئەو بەرزاییەوە دەردەچێت،[٤] ئەبو سوفیان وتی: سوێند بە خوا بڕیارمان داوە ئەمجارە بنبڕیان

---

١ بڕوانە: البداية والنهاية (٤/٥٠).
٢ هەمان سەرچاوە (٤/٥٠).
٣ بڕوانە: غزوة احد لأبي فارس، (١٤٤) لە (الطبقات الكبرى) لابن سعد (٢/٤٣)..
٤ بڕوانە: زاد المعاد (٣/٢٤٥).

بکەین، مەعبەد وتی: بەڵام من پێت دەڵێم ئەو کارە مەکە، سوێند بە خوا بە شێوەیەك بینیمن هۆنراوەیەکیشم پیا وتن، ئینجا هۆنراوەکەشی بۆ خوێندنەوە کە تیایدا باسی گەورەیی سوپای پێغەمبەر(ﷺ) و توند و تۆڵیان دەکات، ئیتر ئەبوسوفیان پەشیمان بوویەوە، بەڵام هەوڵی دا پاشەکشەکردنی خۆی بپۆشێت بە ئەنجامدانی جەنگێکی دەروونی بۆیە هەڵسا بە ناردنی نامەیەك لەگەڵ کاروانی عەبدولقەیس کە دەرچوون بۆ مەدینە بۆ کڕینی خواردن، تیایدا نووسی کە ئەوان بە تەمان بگەڕێنەوە و بنەبڕیان بکەن، ئەبو سوفیان بەڵێنی دا بە کاروانەکە مێوژیان پیا بدات هەر کاتێك بێن بۆ بازاڕی(عکاظ)، ئیتر کاروانەکە بە لای(حمراء الاسد)دا تێپەڕین و نامەکەی ئەبوسوفیانیان گەیاند، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان وتیان:((حسبنا الله ونعم الوكيل))[1] موسڵمانان لە سەربازگەی خۆیان هەر مانەوە و، قورەیشیش گەڕانەوە بۆ مەککە، لە دوای ئەوەیش موسڵمانان بە ورەیەکی بەرزەوە دەگەڕانەوە بۆ مەدینە، بە سەربەرزی گەڕانەوە و، شاکامی مونافیقەکانیان پوچەڵ کردەوە لە مەدینە و قورئانیش ئاماژە بۆ ئەوە دەکات:[2] ﴿ٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡقَرۡحُۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ مِنۡهُمۡ وَٱتَّقَوۡاْ أَجۡرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٢﴾ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدۡ جَمَعُواْ لَكُمۡ فَٱخۡشَوۡهُمۡ فَزَادَهُمۡ إِيمَٰنٗا وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ فَٱنقَلَبُواْ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ لَّمۡ يَمۡسَسۡهُمۡ سُوٓءٞ وَٱتَّبَعُواْ رِضۡوَٰنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ عَظِيمٍ ﴿١٧٤﴾ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوۡلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمۡ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾(ال عمران: ١٧٢-١٧٥).

پێش گەیشتنی موسڵمانان بە مەدینە ئەبو عەززەی جومەحی شاعیریان بەدیلی گرت و کوشتیان، چونکە ئەو درۆی کرد لە بەڵێنی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك لە بەدر ئازادی کرد گوایە جارێکی تر لە دژی موسڵمانان شەڕ نەکات، ئەوەبوو ئەبوعەززە هەوڵیدا ئەمجارەیش خۆی لە مردن ڕزگار بکات، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو:

---

١ بڕوانە: تاريخ الاسلامي للذهبي، المغازي (٢٢٦).

٢ بڕوانە: صور وعبر من الجهاد النبوي في المدينة، (١٤٢).

سوێند بە خوا، نايەڵم هەردوو گۆنات بسڕیت لە مەککە و بڵێیت: دووجار موحەممەدم فريودا، ئەی زوبەير لە گەردنی بدە.[١]

ئەويش لە گەردنی دا، ئيتر لەو کاتە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((لا يلدغ المؤمن من جحر مرتين))[٢] واتە: ئيماندار لە کونێکەوە دووجار ناگەستريت. ئيتر ئەم فەرموودەيە بوو بە پەندێك کە پێشتر کەس نەيبيستبوو.

ئەم کارەی پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕووی سياسەتی شەرعيەوە ئەنجاميدا، بۆ ئەوەی ئەو پياوە جارێکی تر نەگەڕێتەوە بۆ دژايەتی موسڵمانان. هيچ کەسێکيش – جگە لە ئەبو عەززە – بە ديل نەگيرا لە موشريکەکان.[٣]

ژمارەی کوژراوی موسڵمانانيش گەيشتە حەفتا شەهيد، لێکدانەوەی ئەم ئايەتەيش پشتگيری دەکات لەم بۆچوونە: ﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾(ال عمران: ١٦٥).

کە بۆ دڵنەوايی موسڵمانان دابەزيووە لە ڕۆژی ئوحود، ئيبنو عەتيە دەڵێت: بتپەرستان حەفتا کەسيان لە موسڵمانان کوشتبوو، موسڵمانانيش لە بەدر حەفتايان لەوان کوشتبوو، حەفتايشيان بەديل گرتبوو، بەڵام ژمارەی ئەوانەی لە بتپەرستان کوژران لە ڕۆژی ئوحود بيست و دوو کەس بوون.[٤]

دەرچوونی پێغەمبەر(ﷺ) بە دوای بتپەرستاندا لە غەزای(حمراء الاسد) هەندێ ئامانجی لەخۆدەگرت، لەوانە:

١– بۆ ئەوەی دوايين شت لە دەروونی موسڵماناندا هەست بە شکان و بەزين نەبێت.

٢– ئاگادارکردنەوەيان کە پێويستە جارێکی تر بچنە سەر دوژمنەکانيان هەر کاتێك لاوازييان نەما و هاتنە پيری بانگەوازی خوا و پێغەمبەرەوە.

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/١١٦).

٢ البخاري، كتاب الادب، باب (لايلدغ المرء) (٧/١٣٤)، رقم (٦١٣٣).

٣ بڕوانە: البداية والنهاية (٤/٥٣).

٤ المحرر الوجيز لابن عطية (٣/٤١١).

٣- بەش بەش کردنەوەی هاوەڵان بۆ جەنگی دوژمنەکانیان.

٤- ئاگادارکردنەوەیان بەوەی ئەو کارەساتەی تووشیان بوو لەو ڕۆژەدا تاقیکردنەوەیەك بوو لە لایەن خواوە، ئەگینا موسڵمانان بەهێزن و دوژمنانیان هەر لاوازن با بە ڕواڵەتیش زاڵ بووبێتن.[1]

هەروەها دەرچوونی پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەیە بۆ گرنگی جەنگی دەروونی لەسەر دوژمن، کاتێك سێ ڕۆژ مایەوە و ئەو ئاگرانەیان کردەوە و هەموو لایەکی ڕۆشن کردەوە و دوژمنانی تۆقاند،[2] ئیبنو سەعدیش بە هەمان شێوە ئاماژەی کردووە بۆ گرنگی ئەو کارە.[3]

## شەشەم: بەشداری کردنی ئافرەتە موسڵمانەکان لە غەزای ئوحوددا.

غەزای ئوحود یەکەمین جەنگ بوو لە ئیسلامدا ئافرەتە موسڵمانەکان بەشداری تیا بکەن، کاریگەرییەکی زۆریشی هەبوو لە ئاوپێدانی جەنگاوەران و پێچانەوەی برینەکانیان، لە ڕاستیشدا پاڵەوانێتی ئافرەتان و ڕاستی ئیمانیان لەم غەزایەدا دەرکەوت، ئەوان سەرەڕای ئەوەی بۆ ئاودان و برینپێچی دەرچووبوون، بەڵام هەندێکیان بەرگریان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ)، لەوانەیش کە بەشدارییان کرد لە شەڕی ئوحود دایکی ئیمانداران عائیشە(رضي الله عنها)، ئوممو عومارە و،حەمنەی کچیجەحش و، ئوممو سەلیت و، ئوممو سولەیم و، هەندێ ئافرەت لە ئەنصارەکان.[4]

سەعلەبەی کوڕی ئەبی مالیك(رضي الله عنه) دەفەرمووێت: عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه)، هەندێك پۆشاکی دابەش کرد لە نێو هەندێ لە ئافرەتانی مەدینە و، پۆشاکێکی چاکی لێ مایەوە، یەکێك لەو کەسانەی لای بوون وتیان: ئەمەیان بدە بەو کچەی پێغەمبەر(ﷺ) کە لاتە، مەبەستیان(ام کلثوم)ی کچی عەلی بوو، عومەر فەرمووی: ئوموسەلیت مافدارترە پێی، چونکە ئەو یەکێکە لەوانەی بەیعەتیان داوە بە

---

١ بڕوانە: في ظلال القرآن (١/٥١٩)..

٢ بڕوانە: غزوة احد لأبي فارس (٥١).

٣ بڕوانە: طبقات ابن سعد (٢/٤٩).

٤ مسلم، کتاب الجهاد باب (غزو النساء) رقم (١٧٧٩).

پێغەمبەر(ﷺ) و، لە ڕۆژی ئوحوددا کونە ئاوەکانی(جەوەندە) بۆ هەڵدەگرتین.[١]

**١- ئاودان بە موجاهیدە تینووەکان:**

لە ئەنەسەوە(ﷺ) فەرموویەتی: لە ڕۆژی ئوحود خەڵکی هەڵاتن لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ) و من بینیم عائیشەی کچی ئەبوبەکر و ئوموسولەیم کونە ئاویان دەهێنا لەسەر شانیان و دەیاندایە موجاهیدەکان و، جارێکی تر دەگەڕانەوە پڕیان دەکرد و دەیاندایە موجاهیدەکان.[٢]

کەعبی کوڕی مالیکیش(ﷺ) دەفەرموێت:

ئوموسولەیمی کچی میلحان و عائیشەم بینی کونە ئاویان لەسەر پشتیان هەڵدەگرت لە ڕۆژی ئوحود، حەمنەی کچی جەحشیش ئاوی دەدایە تینووەکان و برینپێچی بریندارانی دەکرد، ئوممو ئەیمەنیش هەر ئاوی دەدایە بریندارەکان.[٣]

**٢- برینپێچی و دڵنەوایی کردن:**

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(ﷺ) فەرموویەتی: پێغەمبەر(ﷺ) بۆ غەزاکان ئوممو سولەیم و هەندێ لە ئافرەتانی ئەنصاری دەبرد لەگەڵ خۆی، ئەوانیش ئاویان دەدایە موجاهیدەکان و برینی بریندارەکانیان دەپێچایەوە.[٤] هەمان ئەم واتایە هاتووە لە زوهری و ڕوبەیعی کچی موعەووەزەوە.[٥]

لە ئەبی حازمیشەوە دەگێڕنەوە کە گوێی لە سەهلی کوڕی سەعد بووە(ﷺ)، کاتێك دەربارەی برینەکەی پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێ کراوە، فەرموویەتی: سوێند بە خوا من دەزانم کێ برینەکەی پێغەمبەر(ﷺ)ی دەشۆرد، کێ ئاوی دەڕشتە سەر برینەکە و بە چیش چارەسەر کرا. فاتیمەی کچی(ﷺ) دەیشۆرد و، عەلی ئاوی بەسەردا دەکرد و، کاتێك فاتیمە بینی ئاوەکە خوێنەکە زیاد دەکات، پارچە حەسیرێکی سوتاند و خستیە سەر برینەکە ئیتر خوێنەکەی ڕاوەستا.[٦]

---

١ البخاري، كتاب المغازي، رقم (٤٠٧١).
٢ البخاري، كتاب الجهاد والسير، باب (غزو النساء) رقم (٢٨٨٠).
٣ بڕوانە: المغازي للواقدي (١/٢٤٩).
٤ مسلم، كتاب الجهاد والسير، باب (غزو النساء مع الرجال) رقم (١٨١٠).
٥ بڕوانە: البخاري (٢٨٨٠، ٢٨٨٢، ٢٨٨٣).
٦ البخاري، كتاب المغازي، رقم (٤٠٧٥).

٣- بەرگری کردن لە ئیسلام و پێغەمبەر(ﷺ) بە شمشێر:

جگە لە ئوممو عومارە هیچ کەسێك لە ئافرەتان شەڕی نەکرد لە ڕۆژی ئوحود،(حمزة بن سعید)یش لە نەنکیەوە کە ئامادەی ئەو شەڕە بوو بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: پلە و پایەی نوسەیبەی کچی کەعب لە پلە و پایەی فلان و فلان بەرزترە، لەو ڕۆژەشدا چاکترین شەڕی دەکرد جل و بەرگەکەی لە ناوەڕاستیدا بەستبوو، لە سیازدە جێگاشەوە بریندار بووە لە کاتی مردنیدا من یەکێك بووم لەو کەسانەی شۆردمانەوە، برینەکانم ژمارد سییازدە برین بوون، ئیبنوقەمیئە شمشێرێکی لێدابوو – کە ئەوە گەورەترین برینەکان بوو یەك ساڵ تیماری دەکرد – ئەو کاتەیش بانگ کەری پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کرد بۆ دەرچوون بۆ(حمراء الاسد) جلەکانی لەبەر کرد و ویستی دەربچێت بەڵام لەبەر برینەکانی نەیتوانی، ئەوەیش تاکو بەرەبەیان ئێمە هەر تیمارمان دەکرد، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە و گەیشتە ماڵی خۆی عەبدوڵای[1] کوڕی کەعبی برای نوسەیبەی نارد بۆ ئەوێ هەواڵی بزانێت، ئیتر هەواڵی سەلامەتی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) گەڕانەوە و پێغەمبەر(ﷺ) پێ خۆشحاڵ بوو.[2]

مامۆستا(حسين الباكوري) دەربارەی بەشداری کردنی نوسەیبە لە جەنگدا دەڵێت:

سەبارەت بە بەشداری کردنی ئافرەت لە جەنگدا، تەنها بەشداری کردنی نوسەیبە جێگیر بووە، شەڕکردنیش حاڵەتێکی ناچاری بوو، چونکە بینی پێغەمبەر(ﷺ) لە مەترسیدایە کاتێك خەڵکی بەجێیان هێشت، ئوممو عومارە لە بارودۆخێکدا بوو هەڵگرتنی چەك واجب بوو لەسەر خاوەن توانا پیاو بێت یان ژن.[3]

هەروەها دکتۆر(اکرم ضياء العمري) لەو بارەوە دەڵێت: ئەم شوێنەوارانە ئاماژە دەکەن بۆ ئەوەی ڕەوایە لەکاتی پێویستیدا سوود وەربگیردرێت لە ئافرەت بۆ تیمارکردنی برینداران و خزمەتکردنیان، ئەگەر هیچ جۆرە کارێکی ناشەرعی تیادا

---

١ بڕوانە: سير اعلام النبلاء (٢/٢٧٨).
٢ المغازي للواقدي (١/٢٦٩-٢٧٠).
٣ بڕوانە: مرويات غزوة احد (٢٥٤).

نەبێت و بە تەواوی خۆیان داپۆشیبێت، بۆشیان هەیە بەرگری لە خۆیان بکەن ئەگەر دوژمنان دەستدرێژی بکەنە سەریان، سەرەڕای ئەوەی کە جیهاد تەنها لەسەر پیاوان پێویستە و مەگەر لە حاڵەتێکدا دوژمن هێرش بهێنێتە سەر خاکی موسڵمانان لەو کاتە هەمووان پێویستە شەڕ بکەن.[١]

مامۆستا(محمد احمد باشميل)یش لەم بارەوە دەڵێت:

جەنگی ئوحود یەکەمین جەنگ بوو ئافرەتی موسڵمان بەشداری تیا بکات جێگیریش بووە کە تەنها یەك ئافرەت بەشداری کرد لە شەڕ و بەرگری کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) و لە بنچینەیشدا ئەو بۆ شەڕ دەرنەچووبوو، بەڵکو بۆ هەندێ یارمەتی و فریاکەوتنی بریندار بە ئاو و ئەو جۆرە کارانە هاتبوو، ئینجا ئەو ئافرەتە قۆناغی گەنجی تەواو کردبوو، مێردەکەی و هەردوو کوڕەکەشی لەگەڵیدا بوون لەو جەنگە، بێجگە لە ڕەوشت و پەروەردەیەکی یەکجار بەهێز کە ئەو ئافرەتە لەسەری بوو، بۆیە بە هیچ شێوازێك بەراورد کردن دروست نییە لە نێوان ئەو هاوەڵە بەڕێزەو ئافرەتانێکی تر کە لەم سەردەمەی خۆماندا بچنە نێو سوپاوە، نێوانیان وەکو نێوان خاك و ئەستێرەکانە.

بەڵکو پیاوانی ئەو سەردەمەش کەسیان لەگەڵ بەراورد ناکرێت لە پیاوانی ئەم سەردەمە لە ڕووی مەردایەتی و سەڕاستی و دینداری و پیاوەتی، هەموو ئەو پیاوانەی کە ئافرەت بەشداری جەنگی دەکرد لەگەڵیاندا، بژاردەی ئوممەتی ئیسلام بوون و هێمای چاکی و پیاوەتی و دینداری بوون، بۆیە هەرگیز ڕەوا نییە بەراورد بکرێت لە نێوان ئەم دوو حاڵەتەدا، چونکە بەراوردێکە لەگەڵ جیاوازییەکی هەرە گەورە.

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٣٩١/٢).

## حەوتەم: چەند وانەیەك لە ئارامگرتن، هاوەڵە ئافرەتەکان پێشکەشی دەکەن.

**١- صەفییەی کچی عەبدولموتتەلیب( رضي الله عنها ):**

کاتێك حەمزەی برای لە ئوحود شەهید بوو، هات بۆ ئەوەی تەماشای بکات، بتپەرستان لاشەیان ئەتك کردبوو لە لووتبڕین و سکهەڵدڕین وگوێبڕین و ئەندامی پیاوەتیشیان بڕیبوو، پێغەمبەر(ﷺ) بە زوبەیری کوڕی عەوامی وت: کە کوڕی صەفییە بوو، بڕۆ بیگێڕەوە، با براکەی لەو حاڵەتە نەبینێت، ئەویش پێی وت: دایە گیان پێغەمبەری خوا فەرمانت پێ دەکات بگەڕێیتەوە، وتی: لەبەرچی؟ من دەزانم لاشەی براکەم ئەتك کراوە، ئەوەیش لە پێناو خوای گەورەیە، ئێمە زۆر ڕازین بەوەی لە پێناو خوا تووشمان هاتووە، چاوەڕوانی پاداشتم و ئارام دەگرم بە پشتیوانی خوای گەورە.

کاتێك زوبەیر هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەوەی پێ وت، فەرمووی: وازی لێ بهێنن، ئیتر ئەویش چووە سەر تەرمەکەی و تەماشای کرد، وتی:((انا لله وانا اليه راجعون)) و داوای لێخۆشبوونی بۆ کرد.[1]

**٢- حەمنەی کچی جەحش( رضي الله عنها ):**

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لە بەخاك سپاردنی هاوەڵانی بوویەوە، سواری ئەسپەکەی بوو، لەگەڵ موسڵماناندا گەڕانەوە بۆ مەدینە، ئیتر تووشی حەمنەی کچی جەحش بوو، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: ئەی حەمنە داوای پاداشتی خوا بکە، وتی: کێ کوژراوە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: خاڵۆت حەمزەی کوڕی عەبدولموتتەلیب، وتی:((انا لله وانا اليه راجعون)) خوای گەورە لێی خۆش بێت و شەهیدیشی پیرۆزبێت ، ئینجا پێی فەرموو: چاوەڕوانی پاداشتی خوا بکە، وتی: کێ کوژراوە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: موصعەبی کوڕی عومەیری مێردت، وتی: ئای لەو خەفەتە، ئینجا هاواری کرد و قیژاندی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: مێرد لە لای ژن

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (١٠٨/٣).

پلە و پایەیەکی گەورەی هەیە، ئەمەی فەرموو کاتێك بینی حەمنە خۆڕاگر بوو بەرامبەر کوژرانی خاڵۆی و براکەی، بەڵام بۆ کوژرانی مێردەکەی هاواری کرد، دوایی پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێکرد بۆ وات کرد؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، بیرم لە هەتیوی منداڵەکانی کردەوە و ناڕەحەت بووم، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) دوعای بۆ خۆی و منداڵەکانی کرد کە خوای گەورە چاکەیان لەگەڵ بکات و ئەو کەلێنەیان بۆ پڕبکاتەوە،[1] دواتر شووی کردە تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵا و دوو کوڕی لێ بوو بە ناوی موحەممەد و عیمران،[2] جا موحەممەدی کوڕی تەڵحە بەسۆزترین کەس بوو بۆ منداڵەکانی.[3]

### ٣- ئافرەتەکەی هۆزی دینار(رضي الله عنها):

سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص(رضي الله عنه) دەفەرمووێت: پێغەمبەر(ﷺ) بەلای ئافرەتێکدا لە بەنی دینار تێپەڕی، پیاوەکەی و باوکی و براکەی کوژرابوون لە ئوحود، کاتێك هەواڵی کوژرانی ئەو کەسانەی پێدرا وتی: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) چی بەسەر هات؟ وتیان: ساغ و سەلامەتە ئەی دایکی فلان، ئەو لە سایەی خوای گەورە بەو شێوەیە کە تۆ پێت خۆشە، وتی: پێم نیشان بدەن با تەماشای بکەم، ئاماژەیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کرد تاکو بینی و وتی: هەموو کارەساتێك لە پاش تۆ ئەی پێغەمبەری خوا ئاسانە،[4] بەم شێوە ئیمان کاردەکات لە دەروونی مرۆڤدا.

### ٤- دایکی سەعدی کوڕی موعاز کە ناوی کەبشەی کچی عوبەیدی خەزرە بوو(رضي الله عنها):

دایکی سەعدی کوڕی معاز بە خێرایی ڕۆیشت بەرەو لای پێغەمبەر(ﷺ) و، سەعد جڵەوی ئەسپەکەی بە دەستەوە بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە دایکمە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەخێر بێت، ئینجا نزیك بوویەوە لە پێغەمبەر(ﷺ) تاکو باش تەماشای کرد و وتی: کە تۆم بینی بە ساغ و سەلامەتی، کەواتە کارەساتەکە

---

١ بڕوانە: البداية والنهاية (٤/٧٤)، غزوة احد دراسة دعوية، (٢٣٦).

٢ بڕوانە: الاصابة (٨/٨٨) رقم (١١٠٦٠)..

٣ بڕوانە: غزوة احد لأبي فارس (١٠٩).

٤ بڕوانە: البداية والنهاية (٤/٤٨).

بچووك و ئاسانە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) دڵنەوایی کرد بە کوژرانی عەمری کوڕی موعازی کوڕی و، پێی فەرموو: ئەی دایکی سەعد،مژدەت لێ بێت و مژدە بە کەس و کارانیان بدە کە کوژراوەکانیان لە بەهەشتدا بوونە بە هاوڕێ و دوانزە کەسن، بوونەتە تکاکاریش بۆ کەس و کاریان. وتی: ڕازی بووین ئەی پێغەمبەری خوا، لە پاش ئەم قسە کێ بۆیان دەگری؟ ئینجا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دوعا بکە بۆ ئەوانەی لە پاش ئەوان ماون. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خوایە خەمی دڵەکانیان بڕەوێنەوەو دڵە شکاوەکانیان بگیرسێنەوە، جێگایشیان لەوانەی دوای خۆیان بڕ بکەرەوە.

## باسی چوارەم: هەندێك وانە و پەند و سوود

قورئانی پیرۆز بە وردی باسی غەزای ئوحودی کردووە، بە شێوازێکی زۆر ڕوون و ئارام بەخش و سەرزەنشتکاریش، قورئان باسی ئەوەی کرد کە لە دڵی موسڵماناندا بوو لە سوپای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەمەیش تایبەتمەندیەکی شێوازی باسکردنی قورئان بوو، جیاواز لە هەموو ئەو باسانەی لە کتێبەکانی سیرەدا هاتووە، چونکە ئەو نهێنیانەی قورئان لە دڵەکاندا ئاشکرای کرد خودی موسڵمانانیش پێیان نەدەزانی.

### یەکەم: بیرخستنەوەی ئیمانداران بە سوننەتەکان و بانگکردنیان بۆ ئیمانبەرزی:

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ ﴿١٣٧﴾ هَٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٨﴾ وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾(ال عمران: ١٣٧-١٣٩).

ئەو کەسەی وردبێتەوە لە ئایەتە پیرۆزەکان تێبینی دەکات کە ڕێگای بڕیوەتەوە لە وەسوەسەی شەیتان لە دەردەسەری ئوحوددا و، بەم ئایەتانە دوواندوونی کە هیوا دەبەخشێتە دڵەکان و بەهێزیان دەکاتەوە و بە ئاڕاستەکانی فرمێسکەکانیان دەسڕێت.[١]

قورتوبی دەڵێت: ئەوە دڵنەواییەکە لە خوای گەورەوە بۆ ئیمانداران.[٢]

لە ئایەتە ڕابردووەکاندا بانگەوازێك هەیە بۆ تێڕامان لەسەر ئەنجامی نەتەوە پێشووەکان کە دژی بانگەوازی خوا ڕاوەستاون، چۆنیش سوننەتی خوا لەناوی بردوون بە هۆی بێباوەڕی و خراپەکارییانەوە. ئایەتەکەیش بە وشەی(کیف)ی پرسیارکردن هاتووە کە مەبەست سەرسام بوونە لە حاڵی ئەو بێباوەڕانە، چونکە خوای گەورە دەسەڵاتی بە ئەوان بەخشی و نیعمەتی زۆری پێدان، بەڵام ئەوان سوپاسی خوایان نەکرد.[٣]

---

١ بڕوانە: حديث القران الكريم عن غزوات الرسول (١٩٠/١).

٢ بڕوانە: تفسير القرطبي (٢١٦/٤).

٣ بڕوانە: حديث القران الكريم عن غزوات الرسول (١٩١/١).

ئینجا لەم ئایەتەیش: ﴿وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾(ال عمران: ١٣٩).بانگی موسڵمانانی کردووە بۆ دوورکەوتنەوە لەلاوازی و خەمباری و ترس، چونکە ئەوان لە بێباوەڕان بەرزترن.

**دووەم: دڵنەوایی ئیمانداران و حیکمەتی ئەوەی ڕوویدا لە ئوحود.**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ الْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُ وَتِلْكَ الْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَاءَ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ (١٤٠) وَلِيُمَحِّصَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَيَمْحَقَ الْكَافِرِينَ (١٤١) أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ اللَّهُ الَّذِينَ جَاهَدُوا مِنكُمْ وَيَعْلَمَ الصَّابِرِينَ (١٤٢) وَلَقَدْ كُنتُمْ تَمَنَّوْنَ الْمَوْتَ مِن قَبْلِ أَن تَلْقَوْهُ فَقَدْ رَأَيْتُمُوهُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ﴾(ال عمران: ١٤٠-١٤٣).

خوای گەورە ڕوونی کردۆتەوە کە برین و کوشتن نابێت کاریگەری هەبێت لەسەر کۆشش کردنیان لە جیهادکردنی دوژمن، چونکە ئەوەی تووشی ئەمان بووە تووشی ئەوانیش بووە، جا ئەگەر ئەوان سەرەڕای ئەوەی لەسەر ناحەقن ئارام بگرن لەسەر جەنگ، ئێوە مافدارترن لەوەی لاوازیتان تووش نەبێت.[١]

دانەری(الكشاف) دەڵێت: واتە: ئەگەر ئەوان زاڵ بوونە سەرتان لە ئوحود، ئێوەیش زاڵ بوونە سەریان لە بەدر و، لاواز نەبوون لەوەی جارێکی تر بگەڕێنەوە سەرتان و شەڕتان لەگەڵ بکەن، بۆیە ئێوە لە پێشترن بەو کارە. خوای گەورە چوار هۆکاری باس کردووە بۆ ئەوەی تووشی موسڵمانان بوو لە ئوحوددا، کە بریتین لە: بەدیهاتنی زانستی خوای گەورە و دەرخستنی بۆ موسڵمانان، ڕێزگرتن لە هەندێکیان بە شەهیدی کە دەیگەیەنێتە بەرزترین پلە و، پاککردنەوەی ئیمانداران و ڕزگارکردنیان لە گوناهەکانیان و لە موونافیقەکان و لەناوبردنی بێباوەڕان و بنبڕکردنیان وردەوردە.[٢]

---

١ بڕوانە: تفسير الرازي (٩/١٤).

٢ بڕوانە: حديث القران الكريم عن غزوات الرسول (١/٩٩).

## سێیەم: چۆنیەتی چارەسەرکردنی هەڵەکان.

قورئان نەرم بوو لەگەڵ موسڵمانان لە ئاکامی ئەوەی بەسەریانداهات لە ئوحود، بە پێچەوانەی ئەو ئایەتانەی دەربارەی بەدر دابەزین، خوای گەورە دەربارەی بەدر دەفەرمووێت: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾ لَّوْلَا كِتَـٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾(الانفال: ٦٧-٦٨).

بەڵام دەربارەی ئوحود دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَـٰزَعْتُمْ فِي ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَ ۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۚ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ ۖ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾(ال عمران: ١٥٢).

ئەمەیش حیکمەتێکی کردەیی و پەروەردەیەکی قورئانی گەورەیە، پەروەرشکاران پێویستە وابەستە بن پێوەی.[١]

## چوارەم: هێنانەوەی نموونەی موجاهیدە دێرینەکان.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَـٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُوا۟ لِمَآ أَصَابَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُوا۟ وَمَا ٱسْتَكَانُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِيٓ أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْـَٔاخِرَةِ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾(ال عمران: ١٤٦-١٤٨).

---

١ بڕوانە: صور وعبر من الجهاد النبوي في المدينة، (١٣٧).

(ابن کثیر) دەفەرموێت: خوای گەورە بەم ئایەتانە و ئەوانەی پێشتر گلەیی کردووە لەوانەی لە ئوحود هەڵاتن و جەنگیان بەجێهێشت کە بیستیان هاوارکرا(موحەممەد کوژرا).[1]

هەروەها خوای گەورە نموونەی بۆ ئەوە هێناوەتەوە بەو موجاهیدانەی پێش خۆیان لە کۆمەڵانێکی زۆر بوون لە پشت پێغەمبەرەکانی خۆیانەوە ڕێیان دەکرد و جیهادیان دەکرد لە پێناو خوای گەورە و بە هیچ شێوەیەك لاوازی ڕووی تێ نەدەکردن، بەڵکو هەمیشە ئارامیان دەگرت و جێگیر دەبوون لەسەر جیهاد، ئەمەیش ئاماژەیەك بوو بۆ ئەو موسڵمانانەی پاش ئەو شکانەی تووشیان بوو لە ئوحود بە کاریگەری ئەو پڕوپاگەندەی کرا سەبارەت بە کوژرانی پێغەمبەر(ﷺ)، ئینجا نموونەی وەڵامی ئەو پیاو خوایانەی بۆ هێنانەوە کە فەرموویانە: ﴿وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِىٓ أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾(ال عمران: ١٤٧).

ئەم قسەشیانە کە تاوان و زیادەڕەوی دەدەنە پاڵ خۆیان سەرەڕای ئەوەی ئەوان پیاوی خوابوون، دان پێدانانێکە بە کەموکوڕی خۆیان، ئینجا ئەوان لێخۆشبوونیان پێش خستووەتە سەر سەرخستنیان بەسەر دوژمن، بۆ ئەوەی داواکردنیان لە خوای خۆیان لە پاکی و ملکەچییەوە سەرچاوە بگرێت، ئەمەیش فێرکردنە بۆ موسڵمانان کە پاڕانەوە چەند گرنگە و دەبێتە مایەی سەرکەوتنیش ﴿فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْـَٔاخِرَةِ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾(ال عمران: ١٤٨).

بەو شێوە پاداشتی هەردوو دونیایان وەرگرت: سەرکەوتن و دەسکەوت لەدونیاو ، پاداشت لە ڕۆژی قیامەت، بەرامبەر جوانی دوعا و پاڕانەوەیان و هەڵوێستیان لە کاتی جیهاد و، بوونە نموونەیەکیش خوای گەورە بیانگێڕێتەوە بۆ موسڵمانە موجاهیدەکان، ئینجا خوای گەورە پاداشتی دواڕۆژی بە(حسن) ناوبردووە وەکو ئاماژەیەك بۆ فەزڵ و پێشکەوتنی لەسەر پاداشتی دونیا.[2]

---

١ بڕوانە: تفسیر ابن کثیر (٤١٠/١) بە دەستکارییەوە.

٢ بڕوانە: المستفاد من قصص القران (٢٠٤/٢).

## پێنجەم: سەرپێچی کردنی فەرمانی سەرکردە هۆکارێکە بۆ هەرەسهێنان.

ئەوەیش لە سەرپێچی کردنی تیرهاوێژەکاندا دەردەکەوێت بۆ فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەو هەڵە گەورەی کە ئەنجامیان دا و، بوو بە مایەی تێکچوونی هاوکێشەکان و دروست بوونی ئەو زیانە گەورە کە بەسەر موسڵماناندا هات، ئینجا بۆ ئەوەی گرنگی گوێڕایەڵیمان بۆ دەرکەوێت بۆ سەرکردە، دەبینین پاشگەزبوونەوە و گەڕانەوەی عەبدوڵای کوڕی ئوبەی و مونافیقەکان کاریگەری نەبوو لەسەر موسڵمانان، بەڵام ئەو هەڵەی کە تیرهاوێژەکان ئەنجامیاندا زیانێکی گەورە و گشتی بوو لەسەر موسڵمانان و نزیک بوو بانگەوازەکە بە جارێك لەناوبچێت.

هەروەها تێبینی دەکەین: موسڵمانان لەسەرەتادا سەرکەوتن کاتێك گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پێغەمبەر(ﷺ)یان کرد، بەڵام تێکشکان کاتێك دەرچوون لە قسەی پێغەمبەر(ﷺ)و تیرهاوێژەکان دابەزین،[١] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذۡ تُصۡعِدُونَ وَلَا تَلۡوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٖ وَٱلرَّسُولُ يَدۡعُوكُمۡ فِيٓ أُخۡرَىٰكُمۡ فَأَثَٰبَكُمۡ غَمَّۢا بِغَمّٖ لِّكَيۡلَا تَحۡزَنُواْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمۡۗ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾(ال عمران: ١٥٣). دەڵێت:(یەکێك لە شوێنەوارەکانی گوێڕایەڵی نەکردن سەرپێچی کردنی هاوەڵان بوو بۆ پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتی جیهاد کردن لە پێناو خوای گەورە و، کاتێك ئیمانداران لە جەنگدا زاڵ بوون و تیرهاوێژەکان بینییان بتپەرستان هەڵاتن، ئەو جێگایەیان بەردا کە پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێ کردبوون بەجێی نەهێڵن، بە هۆی ئەوەشەوە دوژمن لە پشتەوە هێرشی کردە سەریان ئەو تاقی کردنەوەیە دروست بوو بۆ ئیمانداران کە خوای گەورە باسی کرد لە قورئاندا: ﴿وَلَقَدۡ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥٓ إِذۡ تَحُسُّونَهُم بِإِذۡنِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلۡتُمۡ وَتَنَٰزَعۡتُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ وَعَصَيۡتُم مِّنۢ

---

١ بڕوانە: غزوة احد دراسة دعوية، (٢٠٧-٢٠٩).

بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَ ۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۚ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ ۖ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾(ال عمران: ١٥٢).

ئەم تاوانەی کە بوو بە مایەی لەدەستدانی سەرکەوتنێك کە هەموو هۆکارەکانی دامەزراو بوو، سەرەتاکانیشی دەرکەوتبوو، کە تەنها تاوانێکیش بوو، پێغەمبەریش(ﷺ) خۆی لە ناویاندا بوو، نەخوازەلا تاوانی زۆر، بۆیە دەڵێن: یەکێك لە شوێنەوارەکانی تاوان ئەوەیە خوای گەورە هەندێ لە ستەمکاران زاڵ دەکاتە سەر هەندێکی تریان بە هۆی ئەو کارانەی کە ئەنجامی دەدەن، چەندیش ستەمیان لە خۆیان کردووە ئەوەندە هۆکارەکانی سەرکەوتن و سەربەرزی لە دەست دەدەن.[1]

## شەشەم: مەترسیەکانی هەڵبژاردنی دونیا لەسەر قیامەت.

هەندێك دەقی ئایەت و فەرموودەمان لەبەردەستدایە پلە و پایەی دونیا لە لای خوا ڕوون دەکاتەوە و ڕووپۆشی و شوێنەوارەکانی لە گومڕاکردنی ئادەمیزاد باسدەکات، وەکو: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ ﴾(ال عمران: ١٤).

پێغەمبەری خوایش(ﷺ) ئومەتەکەی وریاکردۆتەوە لەوەی بە دونیا فریو بخۆن، یان زۆر بۆی پەرۆش بن، لە چەندین جێگەدا، وەکو:

ئەو فەرموودەیەی ئەبو سەعدی خودری دەگێڕێتەوە(ﷺ) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە دەفەرموێت:((ان الدنيا حلوة خضرة وان الله مستخلفكم فيها فينظر كيف تعملون، فاتقوا الدنيا، واتقوا النساء، فان اول فتنة بني اسرائيل كانت في النساء))[2]

---

١ بڕوانە: الطاعة والمعصية واثرهما في المجتمع، محمد بن العثيمين نقلا عن غزوة احد (٢١١).
٢ مسلم، رقم (٢٧٤٢).

واتە: دونیا شیرین و سەوزە، خوای گەورەیش ئێوە دەکات بە جێنشینی بۆ ئەوەی تەماشاتان بکات چی دەکەن، بۆیە خۆتان بپارێزن لە دونیا و لە ئافرەت.

ئیبنو عەبباس(ﷺ) دەفەرموێت: ئەو کاتەی خوای گەورە بتپەرستانی شکاند لە ئوحوددا تیر هاوێژەکان وتیان: خۆتان فریا بخەن بە خەڵکی و پێغەمبەری خوا، با پێشتان نەدەنەوە بۆ دەسکەوتەکان و لێی بێبەش بن. هەندێکیشیان وتیان: جێگای خۆمان چۆڵ ناکەین تاکو پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێگەمان نەدا.[1] ئیتر ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا﴾. واتە: دەستکەوت، ئیبنو مەسعود دەفەرموێت: تاکو ئەم ئایەتە دانەبەزی لە ڕۆژی ئوحود نەماندەزانی کەسێك هەیە لە نێو هاوەڵانی موحەممەددا(ﷺ) دنیای بوێت: ﴿مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ﴾(ال عمران: ١٥٢).

ئەوەی کە ڕوویدا لە ئوحود پەندێکی گەورە بوو بۆ بانگخوازان و فێرکردن بوو بۆیان کە خۆشەویستی دنیا لەوانەیە بەبێ ئاگاداری خۆیان بچێتە ناو دڵیانەوە و، دنیا هەڵبژێرنە سەر قیاکەتدا و، فەرمانە ڕاشکاوەکانی شەرع بشکێنن، بە پاساوێك کە خۆیانی پێ بخەڵەتێنن، هەموو ئەمانە لە ئیماندار دەوەشێتەوە، بێ ئەوەی ئاگایان لە پاڵنەرە شاراوەکان بێت، لەسەرووی هەمووشیەوە خۆشەویستی دنیا و هەڵبژاردنی لەسەر قیامەت و پێویستیەکانی ئیمان، ئەوەش وا دەخوازێت لە بانگخوازان کە پشکنینی هەمیشەیی ئەنجام بدەن لە ناو دەروونی خۆیاندا بە دوای خۆشەویستی و وابەستە بوون بە دنیاوە.[2]

## حەوتەم: پابەندبوون و پەیوەندی بە ئایین.

(ابن کثیر) دەفەرموێت: کاتێك موسڵمانان لە ئوحود شکان و، ئەوانەیان لێ کوژرا کە کوژران، شەیتان هاواری کرد: هۆ خەڵکینە موحەممەد کوژرا، ئیبنو قەمیئەیش گەڕایەوە لای موشریکەکان و وتی: موحەممەدم کوشت، چونکە ئەو لە

---

١ بڕوانە: تفسیر طبري (٣/٤٧٤).

٢ بڕوانە: المستفاد من قصص القران (٢/١٩٧).

پێغەمبەر(ﷺ)ی دابوو و سەری شکاندبوو، ئیتر ئەوە بووە مایەی باوەڕهێنانی زۆر کەس بەم هەواڵە، وەکو خوای گەورە لە زۆرێك لە پێغەمبەرانی گێڕاوەتەوە، کە لاوازی و سست بوونەوە دروست بووە لە جەنگ کردن، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ﴾(ال عمران: ١٤٤).

واتە: موحەممەدیش(ﷺ) پێغەمبەرێکە وەکو پێغەمبەرانی پێشخۆی‌و دوور نییە بکوژرێت.[١]

لە تەفسیری ئەو ئایەتەیشدا هاتووە: پێغەمبەران هەمیشە لە ناو قەومەکانیان نامێننەوە و، هەموو کەسێك هەر دەبێت مردن بچێژێت، ئەرکی پێغەمبەرانیش گەیاندنی پەیامە و، ئەوانیش ئەوەیان کرد، یەکێك لە پێویستیەکانی پەیامەکەشیان ئەوە نییە هەمیشە هەر لەگەڵ بانگکراوەکاندا بن، بۆیە خوای گەورە نکۆڵی کردۆتە سەریان و فەرموویەتی: ﴿أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ﴾(ال عمران: ١٤٤).

مەبەست لەم ئایەتەیش پاشگەزبوونەوە و وازهێنانە لە جیهاد و ئەو کارەی کە پێغەمبەر(ﷺ) پێی هەڵدەستا، ﴿وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ﴾(ال عمران: ١٤٤). مەبەستیش لەو کەسانەیە، کە جێگیر بوون لەسەرئاینی خۆیان و شوێنکەوتووی پێغەمبەر(ﷺ)دەبن بەزیندوویی و بە مردوویی.[٢]

یەکێك لە هۆکاری ئەوەی بەسەر موسڵماناندا هات لە جەنگی ئوحود ئەوە بوو ئەوان بیروباوەڕو بانگەوازەکەیان بەست بە کەسایەتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئینجا بە هۆی پەیوەندی عاتیفی توندیش لە نێوان هاوەڵان و پێغەمبەرەکەیان، هەواڵی

---

١ بڕوانە: تفسیر القران العظیم (١/٤٤١).

٢ بڕوانە: المستفاد من قصص القران (٢/٢٠٠).

مردنی پێغەمبەر(ﷺ) بوو بە مایەی واق وڕمان و ئاژاوەیەکی گەورە، شوێنکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ) بنچینەیە بۆ هەر بانگەواز بکات بۆ ئیسلام و کۆڵەکەی گەورەی ئەو مەسەلەیەیش، لەو بارەشەوە پێویستە بەردەوامی کارکردن بۆ ئیسلام نەبەستڕێتە مانەوەی کەسایەتی پێغەمبەر(ﷺ) لە ژیاندا.[1]

(ابن القیم) دەڵێت: غەزای ئوحود پێشەکییەك بوو بۆ لە دنیا دەرچوونی پێغەمبەر(ﷺ)، بۆیە سەرزەنشت کران لەسەر ئەو کاردانەوەیان ئەگەر بێت و پێغەمبەر(ﷺ) بمرێت یان بکوژرێت، چونکە پێویستە لەسەریان بەردەوام بن یان ئەوانیش لەسەر هەمان ڕێباز بکوژرێن، ئەگەر موحەممەدیش بکوژرێت نابێت ئەوە وا بکات ئەوان واز لە ئاینەکەیان بهێنن، بەڵکو پێویستە لەسەر ئیسلام و یەکتاپەرستی بمرن، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) بمرێت یان بمێنێت.

بۆیە خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ ۚ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا ۗ وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ﴾(ال عمران: ١٤٤).(الشاکرون)یش مەبەست لەو کەسانەیە نیعمەتەکانی خوایان ناسی و لەسەری جێگیر بوون تاکو مردن، حوکمی ئەم گوتارەیش لەو ڕۆژەدا بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) مرد و خەڵکانێك لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو شوکرانە بژێرەکان جێگیر بوون لەسەر ئاینەکەیان و خوای گەورەیش سەری خستن.[2]

قورتوبی دەڵێت: (ئەم ئایەتە تەواوکەری گلەیی کردنە لە هەڵهاتووەکان، واتە ئەوان ڕەوا نەبوو بۆیان هەڵبێن ئەگەر پێغەمبەریش(ﷺ) بکوژرێت، چونکە ئاینەکان بە مردنی پێغەمبەرەکان لە ناو ناچن)،[3] ئەمەیش قسەیەکی زۆر ناوازەیە، چونکە ئەوانەی گومانیان برد ئیسلام بە مردنی پێغەمبەر(ﷺ) کۆتایی پێ دێت، یان ئیسلام و مانەوەی کورت هەڵهاتووە لەسەر کەسێکی دیاری کراو، ئەوانە هەڵەیان

---

١ بڕوانە: محمد رسول الله، الصادق عرجون (٣/٦١٦).

٢ بڕوانە: زاد المعاد (٣/٢٢٤).

٣ بڕوانە: تفسیر القرطبي (٤/٢٢٢).

کرد و، نەیانپێکا، چونکە سەرکەوتنی ئیسلام قەدەرێکە خوای گەورە دایناوە، وەکو فەرموویەتی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ ﴾(التوبة: ٣٣). هۆکاری زاڵبوون و سەرکەوتنیشی ئەوەیە ئاینێکی هەق و ڕاستە.[١]

لە غەزای ئوحود لەسەر ئەو کارەیان سەرزەنشت کران بە شەریعەتێکی خوای گەورە، لە ڕۆژی مردنی پێغەمبەر(ﷺ)یش ئەو شەریعەتە جێبەجێ کرا، چونکە کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد، ئەبو بەکر(ﷺ) لەسەر ئەسپەکەی لە لای ماڵی خۆیانەوە لە سونوح هات و تاکو گەیشتە ناو مزگەوتەکە و، قسەی لەگەڵ کەس نەکرد، تاکو ڕۆیشتە لای عائیشە و ڕووە و پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشت کە بە پۆشاکێکی حیبەرە(جۆرە پۆشاکێکی یەمەنی خەتخەتو گرانبەهایە)، داپۆشرابوو، ڕوومەتی ئاشکرا کرد و ماچی کرد و دەستی کرد بە گریان، ئینجا وتی: دایکم و باوکم بە قوربانت بن، سوێند بە خوا خوای گەورە دووجار مردنت لەسەر کۆ ناکاتەوە، بەڵام ئەو مردنەی کە لەسەرت نوسرابوو وا چەشتت.[٢]

هەروەها لە ئیبنو عەبباسەوە هاتووە فەرموویەتی:(ئەبو بەکر دەرچوو بینی عومەر بۆ خەڵکی قسە دەکات و پێی وت: دانیشە ئەی عومەر، بەڵام عومەر ڕازی نەبوو دانیشێت، ئیتر خەڵکەکە وازیان لە عومەر هێنا و چوونە لای ئەبو بەکر، ئەبو بەکر(ﷺ) فەرمووی:هەر کەسێك لە ئێوە موحەممەدی دەپەرست موحەممەد مرد، هەر کەسیش خوای گەورەی دەپەرست ئەوا خوای گەورە زیندووەو هەرگیز نامرێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوۡ قُتِلَ ٱنقَلَبۡتُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡۚ وَمَن يَنقَلِبۡ عَلَىٰ عَقِبَيۡهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيۡـًٔاۗ وَسَيَجۡزِى ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴾(ال عمران: ١٤٤).

---

١ بڕوانە: مرض النبي (ﷺ) ووفاته واثر ذلك على الامة، خالد ابو صالح، ص ٢٠ نقلا عن غزوة احد دراسة دعوية (١٩١).

٢ البخاري: كتاب المغازي، باب (مرض النبي (ﷺ) ووفاته) رقم ٤٤٥٤.

دەڵێت: سوێند بە خوا دەتوت خەڵکەکە یەکەم جارە دەزانن ئەو ئایەتە دابەزیووە تاکو ئەبو بەکر خوێندیەوە و خەڵکەکە لێیان وەرگرت و هەموویان دەیانخوێندەوە، سەعیدی کوڕی موسەییەب پێی وتم: کە عومەر وتویەتی: کاتێك گوێم لە ئەبو بەکر بوو ئەو ئایەتەی خوێندەوە کەوتم و هەستم دەکرد قاچەکانم هەڵم ناگرن و، بۆم دەرکەوت، کە پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کردووە.[1]

## هەشتەم: مامەڵەکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ تیرهاوێژەکان کە هەڵەیان کرد و، مونافیقەکان کە پشتی موسڵمانیان بەردا.

### ١- تیر هاوێژەکان:

پێغەمبەر(ﷺ) هەڵنەسا بە دەرکردنی ئەوان بۆ دەرەوەی ڕیزەکان، پێشی نەوتن ئێوە بۆ ئەم کارە ناشێن، دوای ئەو هەڵانەی کە کردتان، بەڵکو ئەو هەڵە و جیاوازیەیانی قبووڵ کرد بە ئەوپەڕی لێبوردەییەوە، ئینجا خوای گەورە لێخۆشبوونی بڕیاردا لەسەر هەڵەکانی هەموو ئەوانەی بەشداریان کرد لە غەزاکەدا و بوونە هۆکاری ئەو هەموو زیانە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ اللَّهُ وَعْدَهُ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِ حَتَّى إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَازَعْتُمْ فِي الْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّن بَعْدِ مَا أَرَاكُم مَّا تُحِبُّونَ مِنكُم مَّن يُرِيدُ الدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ الْآخِرَةَ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ ﴾(ال عمران: ١٥٢).

مەسەلەیەکی گرنگیش پەیوەست بوو بەم لێخۆشبوونەوە، ئەویش ئەوەیە ئەوان هەستیان دەکرد پێغەمبەر(ﷺ) تەنها خۆی دەرەنجامی ئەو هەڵانەی هەڵگرت و بۆیە پێویستە ئەویش لێیان خۆش بێت بۆ ئەوەی دڵەکانیان ئاسودە بێت و، نیعمەتی خوایان لەسەر تەواو بێت، بۆیە خوای گەورە فەرمانی کرد بە

---

١ بڕوانە: البخاري: كتاب المغازي، رقم ٤٤٥٤

پێغەمبەرەکەی لێیان خۆش بێت و داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکات، وەکو چۆن فەرمانی پێکرد ڕاوبۆچوونیان وەربگرێت و گوێیان لێ بگرێت،[١] ئەوەش وانەکات سوود لە شارەزاییەکانیان وەرنەگرێت. وەکو فەرموویەتی: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴾(ال عمران: ١٥٩).

**٢- سەرشۆڕی ئیبنو سەلولی مونافیق:**

عەبدوڵلای کوڕی سولول بە پاشەکشە کردنی بە سێ سەد کەس لە مونافیقەکان مەبەستی ئەوەبوو پشێوییەك لەسوپای ئیسلامدا دروست بکات و ورەکان بڕوخێن و، دوژمن غیرەت پەیدا بکات و ورەی بەرز بێتەوە، ئەم کارەشی سووکایەتی بوو بە ئایندەی ئیسلام و، ناپاکییەك بوو لە ناخۆشترین بارودۆخدا، عەبدوڵای کوڕی حەڕام هەوڵی دا ڕێگەیان لێ بگرێت لە ئەنجامدانی ئەو کارە، بەڵام ئەوان بانگێشتەکەیان ڕەتکردەوە و خوای گەورە دەربارەی فەرمووی: ﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيَعْلَمَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٦٦﴾ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُوا۟ ۚ وَقِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ قَٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدْفَعُوا۟ ۖ قَالُوا۟ لَوْ نَعْلَمُ قِتَالًا لَّٱتَّبَعْنَٰكُمْ ۗ هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَٰنِ ۚ يَقُولُونَ بِأَفْوَٰهِهِم مَّا لَيْسَ فِى قُلُوبِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ ﴾(ال عمران: ١٦٦-١٦٧).

چونکە سەرەڕای ترسناکی بارودۆخەکە و پێویستی موسڵمانان بەو ژمارەیە، لەبەر کەمی ژمارەی سوپای موسڵمانان و زۆری سوپای موشریکان، سەرەڕای هەموو ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) وازی هێنا لەو مونافیقانە و هیچ گرنگی پێ نەدان جگە لەوەی ئابڕووی بردن و باسی کردن،[٢] کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لە(حمراء

---

١ بڕوانە: غزوة احد دراسة دعوية، (٢١٨).

٢ هەمان سەرچاوە (٢١٩-٢٢٠).

الاسد)گەڕایەوە ئیبنو سەلول وەکو هەموو جارێك ویستی هانی خەڵکی بدات لەسەر گوێڕایەڵی بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئیمامی زوهری دەفەرمووێت: عەبدوڵای کوڕی ئوبەی هەموو جومعەیەك کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) دادەنیشت بۆ وتاردان، ئەو هەڵدەساو دەیوت: خەڵکینە ئەوە پێغەمبەری خوایە لە ناوتاندا، خوای گەورە سەربەرزی کردوون بە ئەو، بۆیە پشتگیری بکەن و ڕێزی لێ بگرن و گوێڕایەڵی بکەن، ئینجا دادەنیشت، ئینجا لە پاش ئەو کارەی لە غەزای ئوحود کردی بە هەمان شێوە ویستی ئەو قسانە بکات لە ڕۆژی جومعە، ئیتر هەندێك لە هاوەڵان کردیان بە پۆشاکەکەیدا و وتیان: دانیشە ئەی دوژمنی خوا، تۆ شایانی ئەو قسانە نیت، پاش ئەوەی کە ئەنجامت دا، ئەویش دەرچوو بەسەر خەڵکەکەدا و دەیوت: دەڵێی قسەیەکی خراپم کردووە، دەمەوێت کاروباری بەهێز بکەم، ئیتر لە دەرگای مزگەوتەکە پیاوانێك لە ئەنصار بینیان و وتیان بگەڕێرەوە با پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێ خۆش بوونت بۆ بکات، وتی: سوێند بە خوا پێویستم بەوە نییە داوای لێخۆشبوونم بۆ بکات.[١]

## نۆیەم: ئوحود کێوێکە خۆشمانی دەوێت و خۆشمان دەوێت.

لە ئەنەسی کوڕی مالیك(ﷺ) هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك چاوی کەوتووە بە کێوی ئوحود فەرموویەتی:((هذا جبل یحبنا ونحبە))،[٢] واتە: ئەوە کێوێکە خۆشی دەوێین و خۆشمان دەوێت. ئەمەیش ئاماژە دەکات بۆ وردی هەستی پێغەمبەر(ﷺ) چونکە بەراوردی کردووە لە نێوان ئەو سوودەی موسڵمانان کردیان لە خۆ بە پەنادانی ئەو شاخەو ئەو ئامادەییەی کە خوای گەورەی تیا دایناوە، ئیتر ئەوەی دەربڕیوە بە بەرزترین شێوەکانی پەیوەندی کە خۆشەویستییە، ئایا ئەوە واتای ئەمەك ناگەیەنێت؟ بە ڕاستی ئەو کەسەی دان دەنێ بە چاکەی بەردی بێ هەستداو هەندێ ئاکار دەداتە پاڵی کە تەنها لە هۆشمەندە بەڕێزەکاندا هەیە،

---

١ بڕوانە: البدایة والنهایة (٤/٥٣).

٢ بڕوانە: صحیح البخاري، والمغازي، رقم ٤٠٨٤.

شایانی ئەوەیە بە کەمترین چاکەکانی ئادەمیزادەکان بزانێت، ئینجا ئەگەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەمەکی بووبێت بۆ شتی بێ ڕوح و گیان، ئادەمیزادە بە ئەمەکەکان شایستەترن لەوە زیاتریان لێی بەرکەوێت، نەخوازەلا ئەوانەی کە برایەتی کۆیان دەکاتەوە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ).[١]

ئەم فەرموودە پیرۆزەیش واتای زۆر تیایە، هەندێکی مامۆستا حومەیدی باسی کردووە و، هەندێکی مامۆستا(صالح الشامي) کە دەڵێت: ئادەمیزاد زۆر جار بەستنەوە دەکات لە نێوان کارەسات و جێگەکەی یان کاتەکەی... جا بۆ ئەوەی ئەم بۆچوونە بەردەوام نەبێت پاش هاتنی ئیسلام ئەم فەرموودەیە وەکو ئاشکراکردنێك بوو بۆ ڕاستی و دوورکەوتنەوەیەك لە ڕەشبینی، بێگومان موسڵمانانیش لەسەر ئەو کێوە ڕادەوەستن و یادی ئەو جەنگە دەکەنەوە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) بۆی ڕوون کردنەوە کە جێگاو کات پەیوەندی و کاریگەریان نییە لەسەر ئەوەی تیایدا ڕوودەدات، بەڵکو هەموو شتێك بە دەستی خوایە و شەهید بوونیش ڕێزگرتنە لەو کەسەو کارەسات نییە، بەم شێوەیش چەمکەکان یەکسان دەبنەوە لە چوارچێوە ئیمانیەکەدا، بۆیە ئوحود جێگای ڕێز و خۆشەویستییە لەم ڕووانگەوە، چونکە خوای گەورە هەڵیبژارد بۆ ئەوەی ببێتە مەنزڵگای حەمزە و هاوەڵانی کە گیانی خۆیانیان کرد بە قوربانی ئیسلام و ڕەزامەندی خوای گەورە.[٢]

### دەیەم: فریشتەکان لە ئوحود.

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص دەفەرموێت: لە ڕۆژی ئوحود، لە لای ڕاست و چەپی پێغەمبەرەوە(ﷺ) دوو پیاوی جل سپیم بینی، شەڕیان دەکرد لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)، نە پێشتر و نە دواتر ئەوانم نەبینیبو – واتە جیبریل و میکائیل – سەلامی خوایان لێ بێت.[٣]

---

١ بڕوانە: التاريخ الاسلامي (١٩٨/٥).
٢ بڕوانە: من معين السير النبوية (٤٢٧).
٣ مسلم كتاب الفضائل، باب (في قتال جبريل وميكائيل) (١٨٠٢/٤).

ئەوەیش تایبەت بوو بە بەرگری کردن لە پێغەمبەر(ﷺ) چونکە خوای گەورە پاراستنی پێغەمبەر(ﷺ)ی دەستەبەر کردبوو، ئەگینا فریشتە بەشداریان نەکرد لە ئوحود جگە لەوە نەبێت، چونکە خوای گەورە بەڵێنی پێدان یارمەتیان بدات بە سێ مەرج ئارام گرتن و لە خوا ترسان و یەکسەر چوونە سەر دوژمن، کاتێك ئەمانە بەدی نەهاتن یارمەتیشیان بۆ بەدی نەهات،[١] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَاثَةِ آلَافٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُنزَلِينَ ﴿١٢٤﴾ بَلَىٰ ۚ إِن تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَٰذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ آلَافٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُسَوِّمِينَ﴾(ال عمران: ١٢٤-١٢٥).

## یانزەمین: یاساکانی سەرکەوتن و شکست لە سورەتی(الانفال) و(ال عمران).

سورەتی(الانفال) باسی لە غەزای بەدر کردووە بە شیکراوەیی، سورەتی(ال عمران)یش باسی لە غەزای ئوحود کردووە، بۆ ئەوەی ئوممەت زۆر چەمکیان لێوە فێر بن پەیوەندیان هەیە بە قەزا و قەدەر و،ژیان و مردن و، سەرکەوتن و شکست و قازانج و زیان و ئیمان و نیفاق و بەخشین و دەردەسەری... جا یەکێك لەو یاسایانە موسڵمانان فێری بوون لە ڕووداوەکانی بەدر و ئوحود و هەردوو سورەتی(الانفال و ال عمران) یاساکانی سەرکەوتن و شکست بوون، کە بەم شێوە پوختیان دەکەینەوە:

١- سەرەتای سەرکەوتن و کۆتایی بە دەستی خوای گەورەیە و موڵکی کەس نییە، بە هەرکەسێ بیەوێت دەیبەخشێت و لە هەرکێ بیەوێت وەری دەگرێتەوە، هەروەکو ڕۆزی و کاتی مردن و کردەوە: ﴿وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِ قُلُوبُكُمْ ۚ وَمَا النَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾(الانفال: ١٠).

٢- کە خوای گەورە سەرکەوتن ببەخشێت، هێزەکانی سەر زەوی هەموویان ناتوانن ڕێگای لێ بگرن، کاتێکیش بڕیاری شکست بدات بۆ هەرکەسێ بە هەمان

١ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٢/٣٩١).

شێوە کەس ناتوانێت ڕێگر بێتلە ڕوونەدانی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِن يَنصُرۡكُمُ ٱللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمۡۖ وَإِن يَخۡذُلۡكُمۡ فَمَن ذَا ٱلَّذِي يَنصُرُكُم مِّنۢ بَعۡدِهِۦۗ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾(ال عمران: ١٦٠).

٣- بەڵام ئەو سەرکەوتنە هەندێ یاسای هەیە، ئێمە پێویستمان هەیە بە تێگەیشتنیان، چونکە پێویستە ئاڵاکە تەنها بۆ خوای گەورە بەرزکرابێتەوە لە لایەن سەربازەکانەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرۡكُمۡ وَيُثَبِّتۡ أَقۡدَامَكُمۡ﴾(محمد: ٧). سەرکەوتنی خوایش لە گوێڕایەڵی کردنی فەرمایشتەکانی و بەردەوام بوونە لەسەر ڕێبازەکەی و جیهاد کردن لە پێناویدا.

٤- یەکڕیزیش بنچینەی سەرکەوتنە، پەرتەوازەییش لە بیروڕادا مایەی تێکشکانە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ وَٱصۡبِرُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾(الانفال: ٤٦).

٥- گوێڕایەڵی فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی و پابەند بوون پێیانەوە بناغەی سەرکەوتنە، سەرپێچی کردن و یاخی بوونیش دەبێتە مایەی شکست خواردن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ وَٱصۡبِرُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾(الانفال: ٤٦).

٦- خۆشەویستی دنیا و هەڵپە بۆ کردنی یارمەتی خوا لە ئوممەت دەگرێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلۡتُمۡ وَتَنَٰزَعۡتُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ وَعَصَيۡتُم مِّنۢ بَعۡدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنۡيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَ﴾(ال عمران: ١٥٢).

٧- کەمی ژمارە و کەرەستە هۆکار نین بۆ شکست خواردن: ﴿وَلَقَدۡ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدۡرٖ وَأَنتُمۡ أَذِلَّةٞۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾(ال عمران: ١٢٣).

٨- بەڵام پێویستە ئامادەکردن لە هەموو ڕوویەکەوە ئەنجام بدرێت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن،[١] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعْلَمُهُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَىْءٍ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ﴾(الانفال: ٦٠).

٩- جێگیربوون لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەدا و، ئارام گرتن کە هۆکارێکی سەرەکییە بۆ سەرکەوتن، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَٱثْبُتُواْ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾(الانفال: ٤٥). هەروەها فەرموویەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلْأَدْبَارَ﴾(الانفال:١٥).

١٠- بۆ ئەو مەبەستەیش هیچ باشتر نییە لە یادی خوای گەورە و ڕووکردنی دڵ بەرەو لای خوا، کە تەنها خۆی سەرکەوتن دادەبەزێنێت و داوای یارمەتی لێ دەکرێت و پشتی پێ دەبەسترێت و پشت بە ژمارە و کەرەستە و خۆ نابەسترێت...[٢]

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَٱثْبُتُواْ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾(الانفال: ٤٥).

## دوانزەمین: فەزڵی شەهیدان و ئەوەی بۆیان ئامادە کراوە لە بەهەشت.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: کاتێك براکانتان کوژران لە ئوحود، خوای گەورە گیانەکانی ئەوانی خستە ناو سکی باڵندەی سەوز، دەچنە سەر ڕووبارەکانی

---

١ بڕوانە: فقه السيرة النبوية للغضبان، (٤٦١-٤٦٢).
٢ فقه السيرة النبوية للغضبان، (٤٦٣).

بەهەشت و لە بەروبوومەکانی دەخۆن و، دەچنە پاڵ چراکەلێکی ئاڵتوونی لە لای عەرشی خوای گەورە، جا کاتێك ئەو خۆشگوزەرانییەیان بینی وتیان: خۆزگە براکانمان بەمەیان زانیبا بەڵکو واز لە جیهاد نەهێنن و لە جەنگ سارد نەبنەوە، ئیتر خوای گەورە فەرمووی: من پێیان دەگەیەنم، ئینجا خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاندە سەر پێغەمبەرەکەیدا.[1]

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا۟ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٧٠﴾ ۞ يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾(ال عمران: ١٦٩-١٧١).

واحیدی لە تەفسیری ئەم ئایەتانەدا دەگێڕێتەوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیر کە فەرموویەتی: کاتێك حەمزە و موسعەب لە جەنگی ئوحود کوژران و چاویان بەوە کەوت کە پێیان درا، وتیان: خۆزگە براکانمان بەم حاڵەی ئێمەیان بزانیبا، بۆ ئەوەی زیاتر جیهاد بکەن، ئیتر خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا۟ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٧٠﴾ ۞ يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾(ال عمران: ١٦٩-١٧١).[2]

## سیانزەمین: ڕاگەیاندن لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) بە هەڵبەست دەکرا.

شاعیرە موشریکەکان لە جەنگی بەدردا هەڵوێستی بەرگری و گریانیان وەرگرت، بەڵام لە جەنگی ئوحود شاعیرانی قورەیش هەوڵیان دا ئەو سەرکەوتنەیان زل

---

١ بڕوانە: تفسير الطبري (١٧٠/٤).

٢ بڕوانە: اسباب النزول للواحدي، (١٢٥)، تفسير الطبري (٢٦٩/٤).

بکەنەوە بەرامبەر ئەو لەخۆدەرچوونەیان، حەسسانی کوڕی سابیت و، کەعبی کوڕی مالیك و، عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە هەڵسان بە بەرپەرچدانەوەی ئەو هێرشە ڕاگەیاندنەی کە شاعیرانی کوفر پێی هەڵسان وەکو هوبەیرەیکوڕی ئەبو وەهەب و، عەبدوڵای کوڕی زیبەعرا و، زیراری کوڕی خەتتاب و، عەمری کوڕی عاص.[1]

شیعرەکانی حەسسان وەکو بۆمب بوون لەسەر موشریکەکان، تیایدا ستایشی ئازایی موسڵمانانی دەکرد و باسی ترسنۆکی بتپەرستانی دەکرد، کە نەیانتوانی ئاڵای جەنگەکەیان بپارێزن و لە دواییدا بە دەست ئافرەتێکەوە بوو، سەرگەورەکانیان هەڵاتن و بەجێیان هێشتن، ئەو هەڵبەستانە بیرخستنەوەیك بوو بۆ ئەوان سەبارەت بە سەرشۆڕی و هەڵهاتنیان لە سەرەتای شەڕەکە و، ئەم باسەی حەسسان کاریگەرییەکی سەختی دروست کرد لەسەریان.

نموونەیەك لە هۆنراوەکانی حەسسان:

| | |
|---|---|
| اذا عضل سيقت الينا كانها | جداية شرك معلمات الحواجب |
| اقمنا لهم طعناً مبيراً متكلاً | وحزناهم بالضرب من كل جانب |
| فلولا لواء الحارثية اصبحوا | يباعون في الاسواق بيع الجلائب |

نموونەیەك لە هۆنراوەکانی کەعبی کوڕی مالیك کە بەرپەرچی هەندێ شاعیرانی کوفری پێ دەداتەوە:

| | |
|---|---|
| ابلغ قريشاً وخير القول اصدقه | والصدق عند ذوي الالباب مقبول |
| ان قد قتلنا بقتلانا سراتكم | اهل اللواء ففيما يكثر القيل |
| ويوم بدر لقيناكم لنا مدد | فيه مع النصر ميكال وجبريل |
| ان تقتلونا فدين الحق فطرتنا | والقتل في الحق عند الله تفضيل |
| وان تروا امرنا في رأيكم سفهاً | فرأي من خالف الاسلام تضليل[2] |

---

١ بڕوانە: معين السيرة (٢٥٢-٢٥٣).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٨٧/٣)، (٦٤/٣).

# بەشی دەیەم

## گرنگترین ڕووداوەکان لە نێوان ئوحود و خەندەقدا

### باسی یەکەم: هەوڵەکانی بتپەرستان بۆ بزواندنی دەوڵەتی ئیسلامی

غەزای ئوحود هاندەرێ بوو بۆ دوژمنانی کە زیاتر ڕووبەڕوو ببنەوە، لە نێوان عەرەبە بیابانشینەکان ئەو هەستە بڵاو بوویەوە کە دەکرێت دەوڵەتی ئیسلامی شکستی پێ بهێنرێت، بۆیە بەنو ئەسەد تەماعیان لەو بارەوە پەیدا کرد و خالیدی کوڕی سوفیان دەستی کردە هێز کۆکردنەوە بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر مەدینە هەروەها هۆزەکانی(عضل) و (قارە) هەڵسان بە خەڵەتاندن و ناپاکی کردن لەگەڵ موسڵمانان، کاتێك عامیری کوڕی توفەیل هەڵسا بە کوشتنی بانگخوازە قورئان خوێنەکان کە بۆ فێرکردنیان چووبوون، هەروەها جوولەکەکانی(بني النضير) هەوڵیان دا پێغەمبەر(ﷺ) ڕەشە کوژ بکەن، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) بە ئازاییەکی زۆرەوە ڕووبەڕووی ئەو پیلان و هەوڵانە بوویەوە.

#### یەکەم: تەماعی بەنی ئەسەد لە دەوڵەتی ئیسلامی.

هەواڵ گەیشتە پێغەمبەر(ﷺ) کە بەنو ئەسەد بە سەرکردایەتی تولەیحەی ئەسەدی خۆیان ئامادە دەکەن بۆ هێرش کردنە سەر مەدینە، وەکو تەماعێك بۆ بەروبوومەکانی و بەرگری کردنێك لە بتپەرستان، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) بە پەلە هەڵسا بە پێکهێنانی پۆلێکی سەربازی لە سەد و پەنجا پیاو لە موهاجیر و ئەنصارەکان بە سەرکردایەتی ئەبوسەلەمەی کوڕی عەبدولئەسەدی مەخزومی،[1] ئاڵایەکی بۆبەست و پێی فەرموو:((سر حتى تنزل ارض بني اسد، فاغر عليهم قبل ان تتلاقى عليك جموعهم)).[2]

---

١ بڕوانە: نضرة النعيم (١/٣١٣).

٢ بڕوانە: قراءة سياسية للسيرة النبوية، (١٦٢-١٦٣).

واتە: بەڕێکەوە تاکو دەگەیتە خاکی بەنو ئەسەد و، هێرشیان بکە سەر پێش ئەوەی کۆمەڵانیان لەسەرتان یەك بگرن. ئەبو سەلەمە لە مانگی موحەڕەم بەڕێکەوت و، هێرشی کردە سەریان و هەڵهاتن و بە ئاسانی پەرتەوازەی کردن ولاخەکانیانی بە دەستکەوت هێنا و بە سەرکەوتوویی گەڕانەوە مەدینە، ئەبو سەلەمەیش یەکێکە لە موسڵمانە سەرەتاکان لە باوەڕهێناندا، لەم غەزایەیش بە ماندوویی گەڕایەوە، چونکە ئەو برینەی لە ئوحود توشی بووبوو دەمی کردەوە و زۆری نەبرد لە دنیا دەرچوو،[١] لەم پۆلە سەربازییەدا چەند مەسەلەیەك تێبینی دەکەین، لەوانە: وردی لە پلان دانانی جەنگیدا لە لای پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە توانی دوژمنان پەرتەوازە بکات پێش ئەوەی بە تەواوی کۆببنەوە و، سەرسام بوون بە هاتنی پۆلەکەی ئەبو سەلەمە، لە کاتێکدا ئەوان وایان دەزانی جەنگی ئوحود لاوازی کردوون و، توانای تیایاندا نەهێشتووە، ئیتر بتپەرستان تۆقین و ورەیان دابەزی و سەرقاڵی خۆیان بوون لە جیاتی هێرش کردنە سەر مەدینەدا، وردی موسڵمانان لە دەستنیشانکردنی جەنگو هەڵبژاردنی کاتی گونجاو دەردەکەوێت چونکە توانیان بگەنە دوژمنان سەرەڕای دووری ماوەی نێوانیان، ئەمەیش بەهێزترین هۆکارەکانی سەرکەوتن بوو، کاریگەرییەکی زۆریشی کردە سەر ورەی دوژمنان، چونکە ئەوان دڵنیا بوون لە توانای موسڵمانان و خۆشاردنەوە و شەڕی لە ناکاو، ئەمەیش وای کرد دان بنێن بە هێزی موسڵماناندا و ئەنجامدانی گرێبەستی ئاشتی لەگەڵیان.[٢]

## دووەم: خالیدی کوڕی سوفیانی هوزەلی و، بەرەنگاری کردنی عەبدوڵای کوڕی ئونەیس(ﷺ) بۆ ئەو.

خالیدی کوڕی سوفیان هەڵسا بە کۆکردنەوەی جەنگاوەر لە هۆزی هوزەیل و هۆزەکانی تر لە عەرەفات، خۆی ئامادە دەکرد بۆ هێرشکردنە سەر مەدینەدا وەکو هاوکاری و پشتگیری کردن بۆ قورەیش و، تەماعێکیش لە مەدینە، بۆیە

١ فقه السيرة للغزالي (٢٧٤).
٢ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٦/٢٣).

پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بە ناردنی عەبدوڵای کوڕی ئونەیس بۆ لای بە مەبەستی کوشتنی،[١] ئەوە عەبدوڵا خۆیەتی(رضي الله عنه) بۆمان باس دەکات و دەفەرمووێت: پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کردم و فەرمووی: من پێم گەیشتووە کە خالیدی کوڕی سوفیان خەڵکی کۆدەکاتەوە بۆ هێرش کردنە سەرمان، بۆیە بڕۆ ئەو لە عورنەیە و بیکوژە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا باسی بکە بۆم تاکو بیناسم، فەرمووی: کە بینیت تەزوویەك دێت بە جەستەتدا.

دەڵێت: منیش شمشێرەکەم کرد بە قەد خۆمدا و دەرچووم، تاکو پێی گەیشتم لەگەڵ هەندێ لە ئافرەتەکانیدا لە ماڵێکدا لە لایان بوو، لە کاتی عەسردا، کاتێك چاوم پێی کەوت ئەو لەرزەی کە پێغەمبەر(ﷺ) باسی کرد لە خۆمدا بەدیم کرد و چووم بۆ لای، ئیتر ترسام لە نێوان من و ئەودا شتێك ڕووبدات سەرقاڵم بکات لە نوێژەکەم، بۆیە دەستم کردە نوێژکردن لە کاتی ڕێکردنمدا بەرەو لای و بەسەرم ئاماژەم دەکرد بە ڕکوع و سوجدەکەی، کاتێك پێی گەیشتم وتی: تۆ کێی؟ وتم: پیاوێکی عەرەبم بیستومە بۆ ئەو پیاوە هێز کۆدەکەیتەوە منیش هاتوومەتە لات، وتی: بەڵێ ڕاستە، دەڵێت کەمێك لەگەڵیدا ڕێم کرد و شمشێرەکەم هەڵکێشا و کوشتم، ئینجا دەرچووم و ئافرەتەکانی خۆیان دا بەسەریدا، کاتێك گەیشتمە لای پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((افلح الوجه))، واتە: ڕوومەتت سەرفرازە،دەڵێت وتم: کوشتم ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ڕاست دەکەیت، دەڵێت: ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵم هەڵسا و چووە ژوورەکەی خۆیەوە و دارێکی پێدام، فەرمووی: ئەم دارە با لات بمێنێتەوە ئەی عەبدوڵای کوڕی ئونەیس، دەڵێت منیش دارەکەم بردە دەرەوە بۆ لای خەڵکی، وتیان: چیە ئەو دارە؟ وتم: پێغەمبەر(ﷺ) پێی دام و فەرمانی پێ کردووم لام بمێنێتەوە، وتیان: ئایا ناگەڕێیتەوە لای بزانە بۆچی پێی داوی؟ دەڵێت منیش گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بۆ ئەو دارەت پێدام؟ فەرمووی:((آية بيني وبينك يوم القيامة، ان اقل الناس المختصرون يومئذ يوم القيامة))، واتە: نیشانەیەك بێت لە نێوان من و تۆدا، کەمترین خەڵکانێك ئەوانەن لە ڕۆژی قیامەتدا دێن و کردەوەی چاکەیان هەیە

---

١ بڕوانە: نضرة النعيم (١/٣١٢).

کە پشتی پێ ببەستن. ئیتر عەبدوڵا دارەکەی بەست بە شمشێرەکەیەوە و هەر لە لای بوو تاکو لە دنیا دەرچوو، ڕاسپاردەشی کرد بیخەنە ناو کفنەکەی و لەگەڵی ناشتیان.[١]

**لەم هەواڵە هەندێ پەند و وانە وەردەگیردرێت، لەوانە:**

**١- تێبینی کردنی جەنگی:**

پێغەمبەری خوا(ﷺ) گرنگیەکی زۆری دەدایە لایەنی هێمنی، بۆیە بە دواداچوونی دەکرد بۆ جموجۆڵی دوژمنان و، چارەسەری گونجاویشی ئامادە دەکرد بۆ کێشە و قەیرانەکان لە کاتی خۆیدا، هەر بۆیە مۆڵەتی نەدا بە خالیدی کوڕی سوفیان تاکو خەڵکی کۆکاتەوە و هێزی زۆر بێتەوە، بەڵکو هەوڵیدا ئەو ئاژاوە هەر لە سەرەتاوە کپکاتەوە، بەم شێوەیش مەترسی خالیدی لەناوبرد، ئەم کارەیش پێویستی هەیە بە چاودێرییەکی جەنگی و خێرایی لە بڕیاردانا.

**٢- ڕووناسی پێغەمبەر(ﷺ) لە هەڵبژاردنی پیاواندا:**

پێغەمبەری خوا(ﷺ) خاوەنی توانایەکی گەورە بوو لەم بارەوە، بۆیە هەڵدەستا بە هەڵبژاردنی کەسی شیاو بۆ کارێك لەگەڵیدا بگونجێت، بۆ نموونە کەسێکی بۆ سەرکردایەتی هەڵدەبژارد کە بیروڕای چاك و مامەڵەی جوان و ئازایەتی تیا بووایە، بۆ کاری بانگەواز و فێرکردنیش کەسێکی هەڵدەبژارد خاوەنی زانستی فراوان و ڕەوشتی جوان و لێهاتوویی بووایە لە ڕاکێشانی خەڵکیدا، ئینجا بۆ نێردە بۆ لای پادشاکان کەسێکی هەڵدەبژارد خاوەنی ڕواڵەتی جوانو زمانپاراو و قسەزان بێت، لە کارە خۆبەختەکانیشدا کەسێکی هەڵدەبژارد لە ئەوپەڕی ئازایی و دڵ قایمیی و خۆڕاگریدا بووایە،[٢] چونکە عەبدوڵای کوڕی ئونەیس دڵ بەهێز و هۆشمەند بوو، دڵنیایی و باوەڕی پتەو بوو،[٣] جگە لەم سیفەتانەیش هۆکارێکی تریش هەبوو بۆ هەڵبژاردنی ئەویش ئەوە بوو عەبدوڵا شارەزای ئەو شوێنانە بوو بە هۆی نزیکیەوە لە هۆزەکەی خۆی کە جوهەینە بوو.[٤]

---

١ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٣١٩).

٢ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٦/٢٧).

٣ بڕوانە: محمد رسول الله، صادق عرجون (٤/٥٠-٥١).

٤ بڕوانە: غزوة احد احمد باشميل (٣١).

٣- پاداشتی ئەم کارە قیامەتی بوو:

پاداشتی ئەم کارە مەزنە بوێرانە پاداشتێکی مادی دونیایی نەبوو، وەکو زۆرێك لە سوپاکاندا لە کۆن تازە ئەنجامی دەدەن و چاوەڕوانی پاداشتی دەکەن، بەڵکو لە هەموو ئەوانە مەزنتر بوو، نیشانەیەکی سەربەرزی بوو بۆ دواڕۆژی کەم کەس دەستی دەکەوێت، کەم کەس بەو پلە دەگات،[1] چونکە هاوەڵان(ڕەزای خوایان لێ بێت)، هەروەها هەموو لە خواترسان چاوەڕوانی پاداشت نین لە دنیا، ئەگەر دەستکەوتێکی دنیاییشیان هەبێت، هیچ بایەخێکی پێ نادەن، بەڵکو چاوەڕوانی پاداشت دەکەن بۆ ڕۆژی دوایی، بۆیە پاداشتی عەبدوڵای کوڕی ئونەیس ئەو چڵە دارە بوو کە دەبێتە نیشانەیەك لە نێوان خۆی و پێغەمبەردا(ﷺ) ئەمەیش ئاماژە دەکات بۆ بەرزی پلە و پایەی لە ڕۆژی قیامەتدا.[2]

٤- هەندێك لە حوکمە شەرعیەکان:

ئەم هەواڵە هەندێك حوکم و سوودی تێدایە لەوانە نوێژی(صلاة الطالب) کە(الخطابي) دەربارەی دەفەرموێت: جیاوازی هەیە لە نێو زانایاندا سەبارەت بە ئەو نوێژە، زۆربەی زانایان وتوویانە: ئەگەر کەسێك بێت بە دوایەوە بن، دەتوانێت بە ئاماژە نوێژ بکات، ئەگەر خۆی بە دوای کەسی تر کەوتبێت ئەگەر سوار بێت دادەبەزێت لەسەر زەوی و نوێژ دەکات،[3](ابن المنذر)یش هەر وای تووە،[4] بەڵام شافعی مەرجێکی داناوە کەسێکی تر ئەو مەرجەی دانەناوە، دەڵێت ئەگەر ئەوانەی بە دوای کەسانێکەوەن بیانگرن و ژمارەی خۆیان کەمە و لە هاوڕێکانیان دابڕێن و ترسیان هەبێت ئەو کەسانەی مەبەستیانە بیانگرن بگەڕێنەوە سەریان، ئەگەر وابێت دەتوانن بە ئاماژە کردن نوێژ بکەن.

(الخطابي) دەڵێت: هەندێك لەم واتایانە بوونی هەیە لە بەسەرهاتەکەی عەبدوڵای کوڕی ئونەیسدا.[5]

---

١ بڕوانە: السرايا والبعوث النبوية (١٥٩-١٦٠).
٢ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٦/٢٩).
٣ بڕوانە: السرايا والبعوث النبوية (١٦٠).
٤ هەمان سەرچاوە (١٦٠).
٥ معالم السنن للخطابي (٢/٤٢)، على سنن ابي داود حاشية رقم واحد.

(بدر العینی) بە هەمان شێوە لە کتێبی(عمدة القاري) باسی ڕێڕەوی شەرع ناسەکانی کردووە لەم بارەوەو وتوویەتی بەلای ئەبو حەنیفەوە وایە کە ئەگەر پیاوێك داواکراو بێت و کەسانێك بە دوایەوە بن قەیناکە بە ڕێکردنەوە نوێژ بکات بەڵام ئەگەر خۆی بە شوێن کەسانێکی ترەوە بێت نەخێر، مالیك و کۆمەڵێك لە هاوەڵانی وتوویانە هەردووکیان وەکو یەکن و لەسەر وڵاخەکەیان نوێژ دەکەن. هەندێ زانای تریش هەر ئەم بۆچوونەی ئەبو حەنیفەیان هەیە.[1]

٥- کۆششکردنی شەرعی(الاجتهاد) ڕەوایە لەسەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ):

چونکە عەبدوڵای کوڕی ئونەیس(رضي الله عنه) بە بۆچوون و کۆششی خۆی ئەو نوێژەی کرد و پێغەمبەر(ﷺ) نکۆڵی لێ نەکرد، ئەوەیش بەڵگەیە لەسەر جائیز بوونی نوێژکردن لە کاتی ناڕەحەتی و ترسدا بە ئاماژە.[2] ئەم بەڵگە هێنانەوەیەش ڕاستە و گومانی تێدا نییە، چونکە عەبدوڵای کوڕی ئونەیس ئەو کارەی لە ژیانی پێغەمبەر(ﷺ)دا کردووە لە کاتێکدا وەحی دابەزییوە، مەحاڵیشە پێغەمبەریش(ﷺ) پێی نەزانیبێت.[3]

٦- لە بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی:

پێغەمبەر(ﷺ) وەسفی خالیدی کوڕی سوفیانی هوزەلی کردووە بە شێوەیەکی زۆر ورد بێ ئەوەی بیبینێت، تەنانەت عەبدوڵای کوڕی ئونەیس وەڵامی پێغەمبەر(ﷺ)ی دایەوە سەرسام بوو، وەکو لە ڕیوایەتی واقیدیدا هاتووە، وتوویەتی:(ئەی پێغەمبەری خوا لە هیچ شتێك نەترساوم هەرگیز) بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: نیشانەی من و ئەو ئەوەیە کاتێك بینیت تەزوویەك دێت بە جەستەتدا.[4] لە ڕاستیشدا خالیدی بەو شێوە بینی، عەبدوڵا دەفەرموێت کاتێك بینیم لێی ترسم و سامی دایگرتمەوە، وتم: خوا و پێغەمبەرەکەی ڕاستیان کرد.[5]

---

١ بڕوانە: عمدة القاري شرح صحيح البخاري (٦/٢٦٢).
٢ بڕوانە: السرايا والبعوث النبوية (١٦١).
٣ بڕوانە: عون المعبود، العظيم ابادي (٤/١٢٩).
٤ بڕوانە: المغازي للواقدي (٢/٥٣٢).
٥ بڕوانە: البيهقي دلائل النبوة (٤/٤١) من رواية موسى بن عقبة.

دواتریش عەبدولا ئەم ڕووداوەی وەکو هەڵبەست هۆنییەوە.[١]

## سێیەم: ناپاکی هەردوو هۆزی(عضل) و(قارة) و کارەساتی(الرجیع):

ڕیوایەتەکان دەربارەی پۆلەکەی(الرجیع) جیاوازیان تیایە سەبارەت بە هۆی ناردنی لە لایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ)، لە کاتێکدا بوخاری باس لەوە دەکات کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانی ناردبێت بۆ کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی دوژمن،[٢] هەندێ ڕیوایەتی صەحیحی تر هەن باسی ئەوە دەکەن کە کۆمەڵێك لەو دوو هۆزە هاتنە لای پێغەمبەر(ﷺ) کە لە بنچینەدا سەر بە هۆزی(مضر)ن و وتیان: ئێمە خەڵکانێکی موسڵمانمان تیایە، بۆیە چەند کەسێکمان لە هاوەڵان لەگەڵدا بنێرە فێرمان بکەن و قورئانمان پێ بخوێنن،[٣] واش دەردەکەوێت کە هۆزی(هذیل) هەوڵیان داوە تۆڵەی کوژرانی خالیدی کوڕی سوفیانی هوزەلی لە موسڵمانان بکەنەوە، بۆیە پەنایان بردۆتە بەر ئەم شێوازە لە فڕ و فێڵ و ناپاکی، واقیدی بە دڵنیاییەوە، وتوویەتی:[٤] هۆکار ئەوەبووە کە بەنی لیحیان تیرەیەك بوون لە(هذیل)و ڕۆیشتن بۆ لای هۆزی(قارة) و هەندێ ماڵ و سامانیان بۆ دەست نیشان کردن بۆ ئەوەی دەرچن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و بانگیان بکەن بۆ ئیسلام و فێری شەرعیان بکەن و، دواتر ئەوانە دەستگیر بکەن و لە مەککە بیانفرۆشن.[٥]

بەم شێوەیەش پێغەمبەر(ﷺ) ئەم کۆمەڵە هاوەڵەی نارد کە پێکدەهاتن لە دە کەس و،[٦] (عاصم بن ثابت بن الاقلح)ی کرد بە سەرکردەیان، جا کاتێك گەیشتنە نێوان عەسفان و مەککە، بەنو لیحیان بە نزیکەی دووسەد جەنگاوەرەوە هێرشیان کردە سەریان و ناچاریان کردن پەنا ببنە بەر تەپۆلکەیەك پاش ئەوەی کە چواردەورەیان دان، ئینجا بەڵێنیان پێدان ئەگەر خۆیان بدەن بە دەستەوە نەیان

---

١ بڕوانە: البداية والنهاية (٤/١٤٣).
٢ البخاري رقم (٤٠٨٦).
٣ بڕوانە: المغازي الواقدي (١/٣٥٤-٣٥٥).
٤ هەمان سەرچاوە (١/٣٥٤-٣٥٥).
٥ بڕوانە: نضرة النعيم (١/٣١٤).
٦ البخاري رقم (٤٠٨٦).

کوژن، سەرکردەی پۆلەکە ئەوەی ڕەت کردەوە کە باوەڕ بە بەڵێنی هیچ کافرێك بکات،[١] عاصمی کوڕی سابیت وتی: من نەزرم کردووە هەرگیز نەچمە پەنای هیچ بێباوەڕێکەوە، ئینجا دەستی کرد بە شەڕکردن و دەیوت:

ما علتي وانا جلد نابل    النبل والقوس لها بلابل
تزل عن صفحتها المعابل    الموت حق والحياة باطل
وكل ما حم الاله نازل    بالمرء والمرء اليه آئل
ان لم اقاتلكم فامي هابل

بەم شێوە لەو چەند دێڕەدا ڕاگەیاند کە ئەو خۆڕاگرە و تیر دەهاوێژێت و هیچ بایەخێك بە ژیان نادات و هەرچی خوا نوسیبێتی هەر دەبێت ئادەمیزاد بیچێژێت. ئیتر دەستی کردە تیر هاویشتن تاکو تیری پێ نەما، ئینجا دەستی کرد بە شەڕە ڕم تاکو ڕمەکەی شکا و تەنها شمشێرەکەی پێماو ووتی: خوایە سەرەتای ڕۆژم دینەکەتم پاراست تۆیش لە کۆتایی ڕۆژدا گۆشتەکەم بپارێزە! ئەوان هەر کەسێکیان لە هاوەڵان دەکوشت ڕووتیان دەکردەوە، ئینجا کاڵانی شمشێرەکەی شکاند و شەڕی کرد تاکو کوژرا، دوو پیاوی لێیان زامدار کرد و یەکێکیانی کوشت و دەیووت:

ابو سليمان ومثلي رامي    وكان قومي معشر كراما.

ئینجا ئەوان بە ڕمەکانیان کوشتیان، جا سولافەی کچی سەعدی کوڕی شەریف کە مێردەکەی و چوار کوڕەکەی کوژرابوون،(عاصم) بکوژی دوو کەس لەوانە بوو(الحارث و مسافع) نەزری کردبوو ئەگەر خوا دەسەڵاتی بداتە سەریدا لە کاسەی سەریدا مەی بخواتەوە،[٢] سەد وشتریشی دەست نیشان کردبوو بۆ هەر کەسێك سەری بۆ بهێنێت، ئەم قسەیش هەموو عەرەب و بەنو لیحیانیش پێیان دەزانی، جا کاتێك ویستیان سەری ببڕن و بۆی ببەن خوای گەورە زەردەواڵەیەکی زۆری ناردە سەر لاشەکەی هەر کەس نزیك بوایەتەوە پێوەی دەدا، وتیان: وازی لێ بهێنن تاکو شەو، تاکو زەردەواڵەکان لادەچن، کاتێك شەو هات، خوای گەورە لافاوێکی ناردە

---

١ بڕوانە: نضرة النعيم (١/٣١٤).
٢ بڕوانە: المغازي للواقدي (٢/٣٥٥).

سەری و هیچ پەڵە هەورێکیش بە ئاسمانەوە نەبوو، ئیتر ئەو لافاوە بردی و ئەوانیش پێی نەگەیشتن.[١]

(عاصم) و حەوت لە هاوەڵانی کوژران و عەرەبە بیابانشینەکان جارێکی تر سێ کەسەکەیان دڵنیا کردەوە لەوەی نایان کوژن ئەگەر خۆیان بدەن بە دەستەوە بەڵام ئەوان بە پەلە بەڵێنەکەی خۆیانیان هەڵوەشاندەوە و کاتێك عەبدوڵای کوڕی تاریق بەرگری کرد کوشتیان و دوو کەسەکەی تریان برد بۆ مەککە کە بریتی بوون لە خوبەیب و زەیدی کوڕی(الدثنة) و فرۆشتیانیان بە قوڕەیش،[٢] ئەم ڕووداوەیش لە(سخر)ی ساڵی چواری کۆچیدا بوو.[٣]

سەبارەت بە خوبەیب(بنو الحارث بن نوفل) کڕیان بۆ ئەوەی بیکوژن لە خوێنی(حارث) کە(خبیب) لە ڕۆژی بەدردا کوشتبووی، ئیتر بە دیلی لایان مایەوە تاکو کاتی کوشتنی نزیك بوویەوە، داوای تیغێکی کرد لە یەکێك لە کچەکانی حاریس بۆ ئەوەی هەندێ موو لە گیانی خۆی بکاتەوە، لەو کاتەیشدا لە منداڵێکیان بێ ئاگابوون چووە سەر ڕانی(خبیب) دانیشت، ئیتر ئافرەتەکە زۆر ترسا نەوەك لە تۆڵەی خۆیدا ئەو منداڵە بکوژێت، خوبەیب وتی: ئایا دەترسیت بیکوژم؟ بە هیچ شێوەیەك کاری وا ناکەم بە پشتیوانی خوا، جا دوایی ئەو ئافرەتە دەیوت: هەرگیز دیلێکم نەبینیووە ئەوەندەی خوبەیب بەخشندە، من ئەمبینی بۆڵە ترێی لابوو لە کاتێکدا ترێ لە مەککەدا نەبوو، بە ئاسنیش کۆت کرابوو، هەر ئەبێت ڕۆزییەك بێت خوای گەورە پێی بەخشیبێت، ئیتر دەریان کرد بۆ ئەوەی بیکوژن، وتی: ڕێگەم بدەن دوو ڕکات نوێژ بکەم، دوای ئەوە گەڕایەوە لایان و وتی: لەوە نەترسایەم وابزانن لە ترسی مردن نوێژ دەکەم زیاتر نوێژم دەکرد، ئینجا ئەو یەکەم کەس بوو، کە ئەو دووڕکاتەی پێش کوژران کرد،[٤] ئینجا فەرمووی: خوایە سەرژمێریان بکەیت و

---

١ هەمان سەرچاوە (٣٥٦/١).
٢ بڕوانە: نضرة النعيم (٣١٤/١).
٣ جوامع السيرة لابن حزم (١٧٦).
٤ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٣٩٩/١).

و یەك بە یەك بیانکوژێت و کەسیان نەهێڵێتەوە، هۆنراوەیەکیشی لە پێش کوژرانەکەی وت و فەرمووی:

ولست ابالي حين اقتل مسلماً    على اي جنب كان فى الله مصرعي
وذلك فى ذات الاله وان يشأ    يبارك على اوصال شلو ممزع
فلست بمبدٍ للعدو تخشعاً    ولا جزعاً اني الى الله مرجعي[1]

لەم هۆنراوەیشدا باس لەوە دەکات، کە ئەو هیچ گوێ بە کوژران نادات مادام بە موسڵمانی دەمرێت، چونکە ئەوە لە پێناو خوای گەورەدایە و ئەو بە هیچ شێوەیەك کزی و بێ ئارامی نیشان نادات بە دوژمن چونکە سەرئەنجامی بۆ لای خوای گەورەیە.

ئەبو سوفیان پێی وت: ئایا پێت خۆش بوو موحەممەد ئێستا لە لامان بوایە و لە گەردنمان بدایە و تۆیش لەناو منداڵەکانت بووایەیت؟ وتی: نە بە خوا، پێم خۆش نەبوو لە ناو کەس و کارم بوایەم و موحەممەد لە جێگای خۆی دڕکێك ئازاری بدایە،[2] ئینجا کوژرا و لە خاچ درا، کەسێکیانیش کردە پاسەوانی لاشەکەی، بەڵام(عمرو بن امية الضمري) بە شەو هات لاشەکەی هەڵگرت و ناشتی،[3] سەبارەت بە(زيد بن الدثنة)یش سەفوانی کوڕی ئومەییە کڕی و لە جیاتی باوکی کوشتی(ئومەییەی کوڕی خەلەف) کە لە بەدردا کوژرا، ئەبو سوفیان پێش کوژرانی پرسیاری لێکرد و وتی: سوێندت دەدەم بە خوا ئەی زەید پێت خۆش بوو موحەممەد ئێستا لە جێگەی تۆ بووایە و لە گەردەنی بدرایە تۆ لە ناو کەس و کارت بوایەیت؟ وتی: سوێند بەخوا پێم خۆش نییە ئێستا موحەممەد لەو جێگەیەی خۆی دڕکێك ئازاری بدات و منیش لە ناو کەس و کاری خۆمدا بووایەم، ئەبو سوفیان وتی: کەسم نەبینیووە کەسێکی خۆش بووێت ئەوەندەی هاوەڵانی موحەممەد موحەممەدیان خۆش دەوێت.[4]

---

١ بڕوانە: زاد المعاد (٣/٢٤٥).
٢ هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.
٣ هەمان سەرچاوە (٣/٢٤٦).
٤ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٢/٤٠٠).

ئەم ڕووداوە دڵتەزێنە بە ڕەجیع ناسرا، بە بۆنەی ئاوێکەوە لە نزیکیدا بوو، دەتوانین چەند سوود و پەندێکیش لەم ڕووداوە وەربگرین:

**١- هەندێ سوود کە(ابن حجر) باسی کردووە:**

لەم فەرموودەدا ئەوە وەردەگیردرێت کە دیل بۆی هەیە دڵنیا کردن قبووڵ نەکات لە لایەن دوژمنانەوە و، ڕێگەی نەدات دوژمن زاڵ بێت بەسەریدا ئەگەر بکوژرێتیش، وەکو ڕازی نەبوون بە حوکمی بێباوەڕان بەسەریدا، ئەمە لە حاڵەتێکدا ئەگەر لە لایەنە توندەکە کاربکات، بەڵام ئەگەر بیەوێت کار بکات بە ڕووخسەت لەو حاڵەتەدا بۆی هەیە دابەزێت لەسەر دڵنیاکردنی دوژمنەکانی و پەیمانیان، حەسەنی بەسری فەرموویەتی: ئەو کارە ڕەوایە، سوفیانی سەوری وتوویەتی: ئەو کارەم پێ باش نییە، هەروەها ئەوە وەردەگیردرێت کە پێویستە ئەمەك بۆ بتپەرستانیش هەر هەبێت و خۆ پاراو بگیردرێت لە کوشتنی منداڵەکانیان و، لوتف و ڕێزگرتنی خوای گەورە بە کەسێك بکوژرێت لە پێناویدا و جێگیربوونی کەرامەت بۆ ئەولیاکانی خواو، دوعاکردن لە دژی موشریکەکان بە گشتی و، نوێژکردن لە کاتی کوژراندا و، هۆنراوە وتن، کە لەو کاتەدا بەڵگەیە لەسەر بەهێزبوونی ئیمانی خوبەیب و توندی لە ئاینەکەیدا.

هەروەها ئەم ڕووداوە ئەوەی تیادایە کە خوای گەورە بەندە ئیماندارەکانی تاقی دەکاتەوە بۆ ئەوەی پاداشتیان بداتەوە، هەروەها قبووڵ بوونی دوعای موسڵمان و ڕێزلێگرتنی بە زیندوویی و مردوویی لەگەڵ چەندین سوودی تر وەکو پاراستنی گۆشتی ئەو شەهیدە بۆ ئەوەی ئەتك نەکرێت.[١]

**٢- لە نێوان خۆ بەدەستەوەدان و شەڕکردن تاکو مردن:**

بەڵگە وەردەگیردرێت لەمانەی تێپەڕین کە ئەگەر دیل توانی هەڵبێت ئەوەی پێویستە لەسەری خۆی دەرباز بکات، با ڕێگایش بدرێت ئاینەکەی ئاشکرا بکات لە نێوانیاندا، چونکە دیل سووکایەتی پێکراوە لە نێوان بێباوەڕاندا، بۆیە پێویستە

١ بڕوانە: فتح الباري (٧/٤٤٤-٤٤٥).

لەسەری خۆی ڕزگار بکات لەو دیلییە.[1]

**٣- مەزن ڕاگرتنی سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ):**

لەم فەرموودەدا مەزن ڕاگرتنی هاوەڵان دەردەکەوێت بۆ سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە کاتێك خوبەیب لە دیلی لای بتپەرستەکان بوو، دەشیزانی کە دەکوژرێت، سەرەڕای ئەوەیش بە پەرۆش بوو سوننەتی موو لابردنی لەش ئەنجام بدات(الاستحداد) و تیغێکی بۆ ئەو مەبەستە لێیان وەرگرت، ئەمەیش وبیرخستنەوەیە بۆ ئەو کەسانەی زۆرێك لەو سوننەتانە بە کەم سەیر دەکەن، بەڵکو هەندێ لە واجبەکانیش هەر بەو چاوە تەماشا دەکەن، بە بەهانەی ئەوەی نابێت موسڵمانان خۆیان سەرقاڵی ئەو شتانە بکەن لە سایەی ئەم بارودۆخەی کە ئوممەتی ئیسلامی پیا تێپەڕ دەبێت، لە ڕاستیدا هیچ ناکۆکییەك نییە لە نێوان مەزن ڕاگرتنی سوننەت و بەجێهێنانی شەریعەتەکانی ئیسلام بەگشتی[2]

**٤- ئیسلام ناپاکی و کینە ڕیشەکێش دەکات:**

کاتێك خوبەیب داوای تیغەکەی کرد لە یەکێك لە کچەکانی حاریس و ئەویش بۆی هێنا، ئافرەتەکە دەڵێت بێ ئاگابووم لە منداڵێکم تاکو چووە لای، ئەویش خستیە سەر ڕانی، کاتێك خوبەیب ئافرەتەکەی بینی زۆر دەترسێت وتی: ئایا دەترسی بیکوژم؟ بە هیچ شێوەیەك کاری وا ناکەم بە پشتیوانی خوای گەورە.[3] ئەوە هەڵوێستێکی جوانە ئاماژە دەکات بۆ بەرزی گیان و پاکی دەروون و، وابەستەبوون بە ڕێبازی ئیسلامەوە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾(الانعام: ١٦٤).

ئەوە ئەو ئەمەکەیە خەڵکی لەغەدر لێکراوانەوە فێری دەبن، چونکە سەرڕاستیو ڕێکوپێکی سروشتی ڕەفتاری موسڵمانانە لە کاتی خۆشی و تەنگانەدا.[4]

شێوازی وەڵامدانەوەکەی خوبەیبیش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو کارە لە بنچینەوە

---

١ بڕوانە: فتح الباري (٧/٤٤٤-٤٤٥).

٢ بڕوانە: وقفات تربوية مع السيرة النبوية، احمد فريد (٢٣٤).

٣ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٣٢٠) رواية غريبة.

٤ بڕوانە: معين السيرة (٢٥٩).

بە زەینیدا نەهاتووە و، هەرگیز سەرپێچی بنەما ڕەسەنەکەی خۆی ناکات و هەر بە ئەمەك دەبێت...[١] ئەوەیش نموونەیەکە لە مەزنی هاوەڵان ڕەزای خوایان لێ بێت کاتێك هەڵدەسن بە جێبەجێکردنی ئاکاری ئیسلامی لەسەر خۆیان و دوژمنەکانیان، با ستەمیشیان لێ کردبن، ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر هۆشمەندی و ئیمانی تەواویان.[٢]

**٥- خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) لە لای هاوەڵان:**

پشکی هاوەڵان لە خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر گەورە بوو، چونکە خۆشەویستی بەرهەمی ناسینە، ئەوانیش لە هەموو کەسێك زیاتر پلە و پایەی پێغەمبەر(ﷺ) شارەزابوون، بۆیە خۆشەویستیانیش بۆی گەورەتر بوو.[٣]

لە ڕووداوی ڕەجیع دا ئەم خۆشەویستییە بەدەردەکەوێت لە میانەی ئەو گفت و گۆیەی نێوان ئەبو سوفیان و زەیدی کوڕی(الدثنة) کە پێماندا تێپەڕ بوو، ئەم خۆشەویستیەیش بەشێکە لە ئیمان وەکو پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:((ثلاث من كن فيه وجد حلاوة الايمان، من كان الله ورسوله احب اليه مما سواهما، ومن احب عبدا لا يحبه الا لله، ومن يكره ان يعود في الكفر بعد ان انقذه الله منه، كما يكره ان يلقى في النار))،[٤] واتە: سێ شت هەیە لە هەر کەسێکدا بن شیرینی ئیمان دەچێژێت: کەسێك خوا و پێغەمبەر لە هەموو کەسێك بە لایەوە خۆشەویستتر بن و کەسێك ئەگەر کەسێکی خۆشویست تەنها لەبەر خوا خۆشی بوێت و کەسێك پێی ناخۆشبێت بگەڕێتەوە ناو کوفر دوای ئەوەی خوای گەورە ڕزگاری کردبێت لێی ،هەروەك چۆن پێی ناخۆشە بخرێتە ناو ئاگرەوە.

١ بڕوانە: صور وعبر من الجهاد النبوي في المدينة (١٥٣).
٢ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٦/٣٨).
٣ بڕوانە: حقوق النبي على امته، د. محمد التميمي (١/٣١٤).
٤ البخاري كتاب الايمان (١/٢١).

## سێیەم: تەماعی عامیری کوڕی توفەیل لە موسڵمانان و کارەساتی بیری مەعونە لە ساڵی چواری کۆچیدا.

عامیری کوڕی توفەیل یەکێك بوو لە سەرکردەکانی بەنی عامیر، کە پیاوێکی لەخۆ دەرچووی ستەمکار بوو، پێیشی وابوو پێغەمبەر(ﷺ) زاڵ دەبێتە سەر دوورگەی عەرەبدا، بۆیە ئەم بتپەرستە هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و لە نێوان سێ شتدا سەرپشکی کرد هەڵبژێرێت: یان دەسەڵات دابەشکرێت لە نێوان پێغەمبەر(ﷺ)و خۆی، یان ببێتە جێگری پێغەمبەر(ﷺ)، یان هێرش بکاتە سەر مەدینە بە هەزاران ئەسپ سوارەوە،[١] بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ڕێگە چارە نەفامانەی هەمووی ڕەت کردەوە، ئینجا عامیر کە(ملاعب الاسنة)ی پێ دەوترا و سەرگەورەی بەنی عامیر بوو خۆی هات بۆ مەدینە و، دیاری پێشکەش کرد بە پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێکرد موسڵمان بێت و ئەویش ڕازی نەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو:((فاني لا اقبل هدية من مشرك))، واتە: من دیاری لە بتپەرست وەرناگرم، ئەویش وتی: خەڵکانێك بنێرە بۆ نەجد من دڵنەیان دەدەم، پێغەمبەریش(ﷺ) هەڵسا بە ناردنی کەسانێك وەك لە فەرموودەکەی ئەنەسدا(خوای لێ ڕازی بێت) هاتووە فەرموویەتی: کەسانێك هاتنە لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتیان: چەند پیاوێکمان لەگەڵ بنێرە بەڵکو قورئان و سوننەتمان فێر بکەن، پێغەمبەریش(ﷺ) هەڵسا بە ناردنی حەفتا پیاو لە ئەنصارەکان،(القراء)یان پێ دەوترا، حەرامی خاڵۆی ئەنەسیشی تیابوو، ئەوانە قورئان خوێن بوون، شەوان پێکەوە دەیانخوێند و فێر دەبوون، بە ڕۆژیش ئاویان دەهێنا بۆ مزگەوتەکە و داریان دەبڕی و دەیانفرۆشت و، خواردەمەنییان پێ دەکڕی بۆ خەڵکی صوففە و هەژارەکان، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) ناردنی و ئەوانیش بۆیان دانیشتن و کوشتنیان پێش ئەوەی بگەن بە جێگای خۆیان، ئەوانیش وتیان: خوایە پێغەمبەرەکەت ئاگادار بکەرەوە لێمان کە ئێمە چاومان پێکەوت و ڕازیت کردین و لێمان ڕازی بووی، دەڵێت: پیاوێك هاتە لای حەرام ی خاڵۆی ئەنەس و لە پشتەوە بە ڕمەکەی لێیدا و لە سنگیەوە دەرچوو، حەرام وتی:(فزت ورب الكعبة)، واتە: سوێند بە

---

١ بڕوانە: البخاري رقم (٤٠٩١).

پەروەردگاری کەعبە سەرکەوتم، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵانی فەرموو:((ان اخوانكم قد قتلوا))، واتە: براکانتان کوژران و، وتیان خوایە پێغەمبەرەکەت لە حاڵمان ئاگادار بکە.[1]

لەم کارەساتە دڵتەزێنەدا چەند پەند و وانەیەك دەتوانین وەربگرین:

**١- پێویستە قوربانی بدرێت بۆ بانگەواز:**

بینیمان چۆن هاوپەیمانانی(هذیل) لەو قورئان خوێنانەی پێغەمبەر(ﷺ) ناردنی بۆ فێرکردن لە غەزای ڕەجیعدا، وا لێرەیش عامیری کوڕی توفەیل غەدر لە حەفتا قورئان خوێنەکە دەکات کە ڕۆیشتبوون بۆ بانگەواز کردن بۆ ئایینی خوا، لە قەتڵوعامێکی ترسناکدا لە ڕۆژی بیری مەعونە(بئر المعونە).

ئەم کارەساتانە کاریگەری سەختی هەبوو لەسەر دەروونی پێغەمبەر(ﷺ)، تەنانەت یەك مانگی بەردەوام قونوتی دەخوێند لە نوێژی بەیانیدا و دوعای دەکرد لە دژی هۆزەکانی سولەیم کە یاخی بووبوون لە خوا و پێغەمبەر(ﷺ).[2]

لە ئیبنو عەبباسەوە(ﷺ) فەرموویەتی: پێغەمبەر(ﷺ) یەك مانگ بەردەوام قونوتی دەخوێند بە دوای یەکدا لە نێوەڕۆ و عەسر و مەغریب و عیشا و بەیانی لە دوای هەموو نوێژێك، کاتێك دەیوت:(سمع الله لمن حمده) لە ڕکاتی کۆتاییدا، دوعای دەکرد لە دژی هەندێك لە تیرەکانی سولەیم و ڕیعل و زەکوان و عوسەییە و، لە پشتییەوە ئامین دەکرا،[3] ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرموێت: ئەوە سەرەتای قونوت بوو، پێشتریش قونوتمان نەدەکرد.[4]

بەڵام ئەو کارە موسڵمانانی پەك نەخست و ساردی نەکردنەوە لە بانگەوازکردن بۆ ئایینی خوا، چونکە بەرژەوەندی بانگەواز لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە، بەڵکو بانگەواز سەرناکەوێت ئەگەر گیان لە پێناویدا فیدا نەکرێت، هەر ئەوەش دەبێتە

---

١ مسلم في الامارة، باب ثبوت الجنة للشهيد (٦٧٧).
٢ بڕوانە: صور وعبر من الجهاد النبوي في المدينة (١٥١).
٣ بڕوانە: سنن ابي داود في الصلاة، باب (القنوت في الصلوات) (١٤٤٣).
٤ البخاري رقم ٤٠٨٨.

مایەی بە دەسەلاَت بوون و مانەوەی، بەبێ ئەوەش هەروەکو فەلسەفە و خەیاڵ دەبێت لە نێو کتێبەکاندا دەمێنێتەوە و، پاش ماوەیەك نامێنێت.

هەردوو ڕووداوی ڕەجیع و بیری مەعونە وریامان دەکاتەوە لە لێپرسراوێتی هەرە گەورەی بانگەواز لەسەرمان و ڕوونی دەکاتەوە کە بەختەوەری و ئاسوودەیی و سەربەرزی نرخێکی هەیە، نرخی بانگەوازیش خوێنی پاراوە پێویستە لە پێناو خوای گەورەدا بڕژێت.[1]

**٢- سەرکەوتم سوێند بە خوای کەعبە:**

خاوەنی ئەم وشە حەرامی کوڕی مولحانە(ﷺ)، کاتێك ڕمەکە لە پشتی درا و، لە سنگیەوە دەرچوو، بە خوێنەکەی ڕوومەتی خۆی دەسڕی و دەیفەرموو:(فزت ورب الکعبة)[2] ئەم دیمەنە کاریگەری دەخاتە سەر سەختترین دڵەکان، لە بەرامبەر ئەو مەزنانە خۆی بە کەم دەزانێت، کە لە جیاتی ئەوەی بتۆقن لە مردن، مژدەی خۆشی لێ وەردەگرن و پێی ئاسوودە دەبن،[3] تەنانەت ئەم دیمەنە کاریگەری هەبوو — دواتر — لەسەر خودی ئەو کەسەی حەرامی کوشت، کە جەبباری کوڕی سەلما بوو، هەر بە خۆیشی بۆمان باس دەکات و دەڵێت: ئەوەی کە وای لێ کردم موسڵمان بم ئەوەبوو لەو ڕۆژەدا لە پیاوێکمدا بە ڕمێك لە سنگیەوە دەرچوو، گوێم لێ بوو دەیوت: سوێند بە پەروەردگاری کەعبە سەرکەوتم! منیش لە دڵی خۆمدا دەموت: سەرکەوتنی چی؟ ئایا من ئەوم نەکوشت، بەلاَم دواتر پرسیاری ئەم قسەم کرد، وتیان: ئەوە بە هۆی شەهیدییەوە ئەو قسەی کردووە، وتم: سوێند بە خوا ڕاست دەکات سەرکەوت، بۆیە ئەوە بووە هۆکارێك بۆ موسڵمان بوونی.[4]

ئەم هەڵوێستە لە ئاسا بەدەرە وامان لێ دەکات پرسیار بکەین: ئایا شەهید تووشی ئازاری مەرگ دەبێتەوە؟ وەلاَمی سارێژکەرمان بۆ دێت لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە هەرگیز لە خۆیەوە قسەی نەکردووە و، دەفەرمووێت:((ما

---

١ بڕوانە: صور وعبر من الجهاد النبوي في المدينة (١٥٢).

٢ البخاري في المغازي رقم ٤٠٩١.

٣ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٦/٥٠).

٤ بڕوانە: السيرة النبوية الندوي (٢٤٣-٢٤٤)، وابن هشام (٣/٢٠٧).

يجد الشهيد من مس القتل الا كما يجد احدكم من مس القرصة))،[١] واتە: شەهید لە ئازاری کوژران ئەوەندەی بەر دەکەوێت وەکو کەسێك لە ئێوە تووشی گەستنێك بێت.

شەهید پلە و پایەی تایبەتی لە لای خوا هەیە، ئەو کاتێك گیانی بەو ئاسانیە لە پێناو خوا کردووە بە قوربانی، خوای گەورەیش شەش خەڵاتی گەورەی بۆ داناوە هەر یەکەی هەموو دنیا دەهێنێت، لە میقدادی کوڕی مەعدیکەرەبەوە(ﷺ) فەرموویەتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:((للشهيد عند الله ست خصال: يغفر له في اول دفعة من دمه ويرى مقعده من الجنة ويجار من عذاب القبر ويأمن الفزع الاكبر ويحلّى حلّة الايمان ويزوّج من الحور العين ويشفع في سبعين انسانا من اقاربه)).[٢]

واتە: شەهید شەش خەسڵەتی لە لای خوا هەیە: لەگەڵ یەکەم تکەی خوێنی، خوای گەورە لێی خۆش دەبێت، جێگای خۆیشی لە بەهەشت پێ نیشان دەدرێت و، لە سزای گۆڕ ڕزگاری دەبێت و، بێ ترس دەبێت لە کاتی ڕاچەڵەکانی گەورە و، بە پۆشاکی ئیمان دەڕازێنرێتەوە و، حۆری بەهەشتی لێ مارە دەکرێت و، دەبێتە تکاکار بۆ حەفتا کەس لە کەس و کاری. ئەمە جگە لە نیشانەی جێگا کەرەوەی لە ڕۆژی قیامەت پێوەی دیار دەبێت، کە برینەکەی وەکو ئەو ڕۆژەیە تیایدا بریندار بووە، ڕەنگی ڕەنگی خوێنە و بۆن بۆنی میسکە.[٣]

ئینجا ژیانی شەهیدان بە مردنیان تەواو نابێت، بەڵکو ئەوان زیندوون و لە بەختەوەریدا لە لای خوای خۆیانن،[٤] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا ۚ بَلْ أَحْيَاءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾(ال عمران: ١٦٩).

**٣- ئاگادار نەبوونی پێغەمبەر(ﷺ) لە غەیب:**

هەردوو ڕووداوی بیری مەعونە و ڕەجیع بەڵگەن لەسەر ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە غەیب ئاگادار نەبووە، وەکو لە ئایەتێکیشدا ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێت کاتێ

---

١ بڕوانە: صحيح سنن الترمذي للالباني (٢/١٣٣)، رقم ١٦٦٨.

٢ بڕوانە: صحيح سنن الترمذي للالباني (٢/١٢٩).

٣ سەرچاوەی پێشوو (٣/١٢٨).

٤ بڕوانە: السرايا والبعوث النبوية (٢٤٥).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ وَبَشِيرٞ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾(الاعراف: ١٨٨).

چونکە خوای گەورە تەنها خۆی زانایە بە غەیب، پێغەمبەران و فریشتەکان ئەوەندە نەبێت کە خوای گەورە پێی ڕاگەیاندوون شتی تر نازانن:[١] ﴿عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا﴾(الجن: ٢٦).

**٤- بە ئەمەك بوون بۆ پەیمان:**

(عمرو بن امية الضمري)(رضي الله عنه)، لە ڕۆژی بیری مەعونەدا بە دیل گیرا، کاتێك عامیری کوڕی توفەیل زانی لە هۆزی موزەرە بەریدا و، قژی تووێڵی بڕی و ئازادی کرد بەرامبەر ئازادکردنی گەردنێك کە لەسەر دایکی بوو، کاتێك عەمر بەرەو مەدینە دەرچوو لە ڕێگە لە سێبەرێکدا لایدا و دوو پیاوی لە بەنی عامیر بینی، کە گرێبەستیان هەبوو لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) و عەمری کوڕی ئومەییە بەوەی نەدەزانی کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانی بێ ترس کردووە لەسەر گیانی خۆیان، عەمر پرسیاری لێ کردن: ئێوە لە چی هۆزێکن؟ وتیان: لە بەنی عامیرین، ئیتر چاوەڕوانی کرد تاکو خەویان پێاکەوت و وەکو تۆڵە هەردووکیانی کوشت، کاتێك گەڕایەوە مەدینە و ئەوەی باس کرد پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((لقد قتلت قتيلين لادينهما)).[٢] واتە: دوو کەست کوشتووە پێویستە خوێنباییەکەیان بدەم، ئەمەیش هەڵوێستێکی بەرزە، چونکە ئەو دوو پیاوە گرێبەستێکیان هەبوو لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)، بۆیە هیچ ئەژماری نەکرد بۆ ئەو ستەمەی هۆزەکەی لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) کردوویانە، ئەوەیش ئەوپەڕی بە ئەمەك بوونە بەرامبەر پەیمان.

خۆ دەکرا پێغەمبەر(ﷺ) ئەو کارەی عەمری کوڕی ئومەییەی بە بەشێك لە تۆڵە کردنەوە بژماردایە لە دژ بەو ستەمکارانە، بەڵام گوناهی کەسانێکی بێتاوان چییە

---

١ بڕوانە: وقفات تربوية مع السيرة النبوية (٢٣٧).
٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٢٠٦).

تاکو بە تاوانی ستەمکارانی قەومەکەیان بکوژرێن؟ ئاراستە ئیسلامییەکان پاڵیان بە موسڵمانان و پێغەمبەر(ﷺ)ەوە دەنا ڕەوشتیان بەرزبێتەوە بە شێوەیەك کە هاوێنەی نەبێت لە دونیادا.[١]

٥- هاوەڵی بەڕێز عامیری کوڕی فوهەیرە(ﷺ):

لە پاش کوژرانی ئەوانەی لە بیری مەعونە کوژران و عەمری کوڕی ئومەییە بە دیلی کەوتە دەستیان، عامیری کوڕی توفەیل وتی: ئەوە کێیە؟ ئاماژەی بۆ یەکێك لە کوژراوەکان کرد، عەمری کوڕی ئومەییە وتی: ئەوە عامیری کوڕی فوهەیرەیە، وتی: من ئەوم بینی لە پاش کوژرانی بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان، تەنانەت سەیری ئاسمانم دەکرد لە نێوان ئەو و زەویدا، دوای ئەوە دووبارە دانرایەوە.[٢]

٦- حەسسانی کوڕی سابیت(ﷺ) هان دەدات لەسەر کوشتنی عامیری کوڕی توفەیل:

حەسسان(ﷺ) یەکێك بوو لە پیاوانی دەزگای ڕاگەیاندن، لەگەڵ کەعبی کوڕی مالیك و عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە و شەڕێکی دەروونییان بەرپا دەکرد لەسەر دوژمنان، دەربارەی هەموو ڕووداوەکانیش قسەیان دەکرد، بەرپەرچی هەموو هەڵبەستێکی بێباوەڕانیان دەدایەوە بە دە هەڵبەست، بینیشمان چۆن هۆنراوەکانی حەسسان ڕۆڵی بینی لە وەدەرنانی کەعبی کوڕی ئەشرەفی جوولەکە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بایەخی دەدا بە شاعیرانی دەوڵەتی ئیسلامی و، هانی دەدان لەسەر ئەنجامدانی ئەو جۆرە جیهادە، بۆیە لەسەر هەموو موسڵمانە هاوچەرخەکانە، بە سەرکردە و زانایانو کۆمەڵە ئیسلامییەکانەوە بایەخ بدەنە شاعیران و هانیان بدەن لەسەر ئەنجامدانی ئەم جیهادە مەزنە.[٣]

کاتێك حەسسان هەواڵی شەهیدانی بیری مەعونەی پێگەیشت هەندێ هۆنراوەی لەو بارەیەوە هەڵبەست کە کاروانەکان لە نێوان خۆیاندا دەستا و دەستیان

---

١ التاريخ الاسلامي للحميدي (٦/٥٠).

٢ البخاري في المغازي رقم (٤٠٩٣).

٣ بڕوانە: السيرة النبوية الاساس في السنة وفقهها (٢/٦٥٦).

پێدەکرد کە تیایدا دەیووت:

الا مــن مبلــغ عــنى ربيعــاً فما احدثت فى الحدثان بعدي
ابــوک ابــو الفعــال ابــو بــراء وخالــک ماجـد حکـم بـن سـعد
بــنى ام البــنين الم يــرعکم وانـتم مـن ذوائـب اهـل نجـد
تحکــم عــامر بــابي بــراء ليخفــره ومــا خطــأ کعمــد[1]

کاتێك ئەم هۆنراوە گەیشتە ڕەبیعەی کوڕی ئەبو بەرا هەڵسا و تۆڵەی باوکی لە عامیری کوڕی توفەیل کردەوە و بە شمشێرێك لە سەریدا بەڵام نەیکوشت، خەڵکەکە ڕەبیعەیان گرت و بە عامیریان وت: تۆڵەی لێ بکەرەوە، وتی: من ئەوم بەخشی...[2]

**٧- سەرەنجامی عامیری کوڕی توفەیل:**

خوای گەورە دوعای پێغەمبەرەکەی قبووڵ کرد کاتێك دەیفەرموو: خوایە عامیرم لە کۆڵ کەرەوە،[3] ئەو ستەمکارە تووشی نەخۆشییەکی کوشندە بوو، وەکو پێغەمبەر(ﷺ) باسی کردووە:((غدة کغدة البعير))،[4] واتە: لوویەکە وەکو لووی وشتر، هەروەها بە لاڕەشە ناوی بردووە، کە وەسفێکی وردی ئەو نەخۆشییەی کردووە کە خۆی لە بنچینەدا بریتیە لە بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەش و زلبوونی گرێ لەمفاوییەکان لە ژێر باڵدا، هەروەها گەورەبوونی سپڵ،[5] هەمان ئەو نەخۆشیە بوو کە تووشی عامیری کوڕی توفەیل بوو، بە هۆی ئەوەشەوە لە ماڵی یەکێك لە ئافرەتەکانی خزمیدا زیندانی کرا.

بەم شێوەیش عامیری کوڕی توفەیل تەماعەکانی بۆ پەیداکردنی دەسەڵات لەسەر دوورگەی عەرەب تەفرو تونا بوو، هەموو بوو بە ئازار لە گیانیدا و خەڵکی لێی هەڵدەهاتن لە ترسی تووش بوون بە نەخۆشیەکەی و لە کۆتایی ژیانیدا داوای

---

١ بڕوانە: محمد رسول الله، الصادق عرجون (٤/٦٤).
٢ هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.
٣ بڕوانە: السيرة النبوية الاساس في السنة وفقهها (٢/٦٣١).
٤ بڕوانە: السيرة النبوية، محمد الصوياني (١٣٠).
٥ بڕوانە: تعليق الدکتور قلعجي على الدلائل (٣/٣٤٦).

ئەسپەکەی کرد و سواری بوو، لەسەر ئەسپەکەشی گیانی دەرچوو، ئەو ستەمکارە سەرکەشە وەکو شێت دەرچوو، چونکە خەڵکی لێی هەڵدەهاتن بەهۆی نەخۆشیەکەیەوە.[1]

١ بڕوانە: السيرة النبوية، للصوياني (١٣١–١٣٢).

## باسی دووەم: هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) بە(ام المساكين)و (ام سلمة)و، (هەندێ ڕووداوی جیاجیا

### یەکەم: زەینەبی کچی خوزەیمە(ام المساكين)(رضي الله عنها):

زەینەبی کچی خوزەیمەی کوڕی حاریسی هیلالی، لە هۆزی بەنو عەبدولمەنافی کوڕی هیلالی کوڕی عامیری کوڕی سەعسەعە بوو، لە سەردەمی جاهیلیدا بە(ام المساكين) واتە: دایکی هەژاران دەناسرا، چونکە خواردنی پێ دەدان، پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕەمەزان لە پاش تێپەڕبوونی سی و یەك مانگ بەسەر کۆچی پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ) مارەی کرد، هەشت مانگ لە لای مایەوە و وەفاتی کرد لە ڕەبیعی یەکەم پاش سیو نۆ مانگ لە کۆچکردن، هەر لە مەدینەش نێژرا(رضي الله عنها).[1]

زەینەبی کچی خوزەیمە پێشتر خێزانی عەبدوڵای کوڕی جەحش بوو، کە لە شەڕی ئوحود شەهید بوو لە پێناوی خوادا، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) وەکو ڕێزێك لە ئەو شەهیدە هەڵسا بە مارەکردنی زەینەب دوای ئەوەی ئەو کارەساتەی تووش هات بە کوژرانی مێردەکەی، پێغەمبەر(ﷺ) پێی ناخۆش بوو بە تەنها و بێوەژنی بمێنێتەوە، بۆیە خەڵاتی کرد لەسەر چاکەکانی لە پاش کوژرانی پیاوەکەی.[2]

### دووەم: هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ(ام سلمة)(رضي الله عنها).

ناوی(هند بنت ابي أمية حذافة بن المغيرة القرشية المخزومية)یە، خێزانی ئەبو عەبدوڵای کوڕی عەبدولئەسەدی ئامۆزای بوو، مێردەکەی پوورزای پێغەمبەر بوو(ﷺ)- کوڕی بەڕەی کچی عەبدولموتەلیب بوو و برای شیری پێغەمبەریش بوو(ﷺ)- ، ئوممو سەلەمە لەگەڵ ئەبو سەلەمەی مێردی کۆچی کرد بۆ حەبەشە و دواتر گەڕانەوە بۆ مەککە و دیسان کۆچیان کرد بۆ مەدینە پاش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان کۆچیان کرد بۆ ئەوێ.[3]

---

١ بڕوانە: تفسير القرطبي (١٤/١٦٦).

٢ بڕوانە: المفصل في احكام المرأة، عبدالكريم زيدان (١١/٤٦٩).

٣ بڕوانە: سير اعلام النبلاء (٢/٢٠٢).

ئاخاوتنی(ام سلمة) لەگەڵ(ابو سلمة)(ڕەزای خوایان لێ بێت):

ئوممو سەلەمە بە ئەبو سەلەمەی وت: پێم گەیشتووە کە هەر ئافرەتێك مێردەکەی بمرێت و بەهەشتی بێت، خۆیشی لە دوای ئەو شوو نەکات، ئەوا لە بەهەشتدا خوای گەورە کۆیان دەکاتەوە، جا وەرە پەیمان بە یەکتر بدەین تۆ پاش من ژن نەهێنیت و منیش پاش تۆ شوو نەکەم، وتی: گوێڕایەڵم دەبیت؟ وتی: بەڵێ، وتی: ئەگەر من مردم لە دوای من شوو بکە، خوایە لە پاش من مێردێکی لە من باشتر ببەخشیت بە ئوممو سەلەمە، خەمباری نەکات و ئازاری نەدات، جا کاتێك مرد ئوممو سەلەمە وتی: کێ بێت لە ئەبو سەلەمە چاکتر بێت؟ زۆری پێ نەچوو پێغەمبەر(ﷺ) هات و خوازبێنی کرد لە برازاکەی یان لە کوڕەکەی...[1]

٢- دوعای ئوممو سەلەمە لە کاتی مردنی مێردەکەی:

کاتێك ئەبو سەلەمەی مێردی بە کاریگەری برینەکانی لە شەڕی بتپەرستاندا مرد، کە لە ڕاستیدا ئوممو سەلەمە زۆری خۆشدەویست و ڕێزی لێ دەگرت، لەو کاتەی هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەبو سەلەمە لە دونیا دەرچوو، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو:((قولي: اللهم اغفر لي وله، واعقبني منه عقبى حسنة))، واتە: خوایە لە من و لە ئەویش خۆش بە و، لە جێگای ئەویش قەرەبووی چاکم بکەیتەوە، وتی: خوای گەورە بە کەسێکی باشتر قەرەبووی کردم، بە موحەممەد(ﷺ).[2]

٣- گفتوگۆی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئوممو سەلەمە لە کاتی خوازبێنیدا:

عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە دەڵێت(ﷺ): کاتێك ئوممو سەلەمە عیددەکەی تێپەڕی ئەبو بەکر و عومەر خوازبێنیان کرد بەڵام ئەو ڕازی نەبوو، ئینجا دوای ئەوان پێغەمبەر(ﷺ) کەسێکی نارد و، ئەویش بەخێرهاتنی کرد و، وتی: پێغەمبەری خوا ئاگادار بکەرەوە کە من ئافرەتێکی بە گومانم، هەروەها خاوەن منداڵی وردم و کەسیش لە سەرپەرشتیارەکانم لێرە نییە.

---

١ بڕوانە: سير اعلام النبلاء (٢/٢٠٣)، وقال المحقق اخرجه ابن سعد ورجاله ثقات..

٢ مسلم في الجنائز رقم (٩١٩).

ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامی بۆ ناردەوە و فەرمووی: سەبارەت بەوەی خاوەن منالّی، خوای گەورە منالّەکانت بەخێو دەکات، سەبارەت بەوەش دلّ بە گومانی، لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە ئەوەت لەسەر لابدات، مەسەلەی سەرپەرشتیارەکانیشت هەموویان بە من ڕازی دەبن،[١] لە ڕیوایەتێکی تریشدا هاتووە کە وتوویەتی: من ئافرەتێکی بە تەمەنم، پێغەمبەریش(ﷺ) وەلامی دایەوە و فەرمووی:((واما السن فانا اكبر منك))، واتە: مەسەلەی تەمەن بلێی من لە تۆ گەورەترم و بە وەلامێکی جوان وەلامی دایەوە و هەموو قسەکانیشی هەر جوان بوو.[٢]

ئوممو سەلەمە وتی: ئەی عومەر[٣](واتە کوڕەکەی) هەڵسە و مارەم ببڕە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ)،(ابن كثير) دەربارەی ئەم وتەیەی ئوممو سەلەمە وتوویەتی: مەبەستی ئەوەیە ڕازی بوو و مۆڵەتی دا، ئەگینا عومەری کوڕی لەو کاتە منالّ بوو، ئەو کەسەش سەرپەرشتی ئەو مەسەلەی کرد سەلەمەی کوڕی بوو کە لە هەموو منالّەکانی گەورەتر بوو.[٤]

**٤- مالّ ئامادەکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئوممو سەلەمە و شێوەی مامەڵەکردنی لەگەڵیدا:**

پاش ڕەزامەندی ئوممو سەلەمە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو:((اما اني لا انقصك مما اعطيت فلانة رحيين وجرتين و وسادة من ادم حشوها ليف))،[٥] واتە: لە فلّانە خێزانم کەمترت بۆ ناکەم، دوو دەستاڕ و دوو گۆزە و سەرینێك ناوئاخنەکەی ڕیشالّ بێت.

ئوممو سەلەمە لە پاش ئەبو سەلەمەی مێردی منالّێکی بووبوو، ئیتر دەیخستە باوەشی و شیری دەدا، پێغەمبەر(ﷺ)یش چەند جارێك دەگەڕایەوە کاتێك ئوممو سەلەمە ئەوەی دەکرد، عەمماری کوڕی یاسر(رضي الله عنه) کە برای ئوممو سەلەمە بوو لە سومەییەی دایکیەوە، بەو مەسەلەی زانی و ڕۆیشت بۆ مالّ خوشکەکەی و

---

١ بڕوانە: سير اعلام النبلاء (٢/٢٠٣-٢٠٤) واسناده صحيح.
٢ بڕوانە: المفصل في احكام المرأة (١١/٤٧٠).
٣ بڕوانە: سير اعلام النبلاء (٢/٢٠٤) واسناده صحيح.
٤ بڕوانە: البداية والنهاية (٤/٩٢).
٥ بڕوانە: سير اعلام النبلاء (٢/٢٠٤).

خوشکەزایەکیشی بردە ماڵی خۆیان یان ماڵی ئافرەتێکی تر بۆ ئەوەی شیری ئەو منداڵەی ئومموسەلەمە بدات، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) هاتە ماڵ و فەرمووی:(این زناب ؟) کوا زەینەبە؟ لەو کاتە(قریبه بن ابی امیّه ) ش لەوێ بوو وتی عماری کوڕی یاسر بردوویەتی‌و پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((اني اتيكم الليلة))، واتە: ئەمشەو من دێمە لاتان.

ئوممسەلەمە وتی: منیش هەڵسام بە دانانی ئەو شتەی لە ژێر دەستاڕ دادەنرێت و هەندێ دەنکە جۆم دەرهێنا و، لەگەڵ هەندێ بەز هاڕیم، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) ئەو شەوە مایەوە و سبەی کە لە خەو هەڵسا فەرمووی: تۆ کەسێکی بەڕێزی لە لای کەس و کارت، جا ئەگەر پێت خۆشە حەوت شەو لە لات دەمێنمەوە، لەو حاڵەتە پێویستە لە لای خێزانەکانی تریشم حەوت شەو بمێنمەوە،[1] ئەگەریش حەز دەکەیت سێ شەو دەمێنمەوە و ئەمجار بەسەر خێزانەکانمدا دەگەڕێم، ئوممسەلەمە وتی: سێ شەو بمێنەوە، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) سێ ڕۆژ لە لای مایەوەو، فەرمووی:((للبكر سبع وللثيب ثلاث))، واتە: بۆ کچی عازەب حەوت شەوو، بێوەژنیش سێ شەو،[2] لە پاش ئەو سێ شەوە ئیتر وەکو خێزانەکانی تری شەوێکی بۆ دەستنیشان کرد.

**٥- گۆڕینی ناوی کچەکەی ئەبو سەلەمە:**

ئەو کچە هەتیووە(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) چووە لای ئوممسەلەمە لەو کاتەی خواستی و لێی بیست بانگم دەکات بە ناوی بەڕە(واتە چاکەکار) ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خۆتان بە پاك و پاراو ناو مەبەن، خوای گەورە خۆی چاکتر دەزانێت کێ چاکەکار و خراپەکارە، بەڵکو ناوی بگۆڕن بە زەینەب. ئوممسەلەمە وتی: کەواتە ئەو زەینەبە.[3]

پێغەمبەر(ﷺ) حەزی لە ناوی خۆش دەکرد و، تەنها ناوی منداڵی نەدەگۆڕی بەڵکو ناوی ژن و پیاو و کەسی بە ساڵاچوویشی دەگۆڕی، جارێك پێغەمبەر(ﷺ) بە

---

١ حديث حسن رواه ابن سعد (٩٣/٨).

٢ حديث صحيح، صحيح الجامع للالباني (٩١٩/٢).

٣ سنده قوي رواه ابن اسحق ومن طريقة البخاري في الادب المفرد (٨٢١).

پیاوێکی فەرموو: ناوت چییە؟ وتی: شیهاب، فەرمووی: بەڵکو تۆ هیشامی.[1]
جارێکیش ناوی ئافرەتێکی پیری گۆڕی لە(جثامة)ەوە بۆ(حسانة) و زۆر ڕێزی لێگرت و خواردن و گۆشتی پێدا لەبەر ئەوەی پێشتر دەچووە لای خەدیجە(رضي الله عنها).[2]

**٦- حیکمەت چی بوو لە هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ئومموسەلەمە:**

خاوەنی تەفسیری(المنار) لەو بارەوە دەڵێت: ئەوە تەنها بۆ ڕابواردنی حەڵاڵ نەبوو، بەڵکو لەبەر پلە و پایەی ئومموسەلەمە کە هەر کەس تەماشای بیروبۆچوونی بکات لە ڕۆژی حودەیبیە ئەو ڕاستیەی بۆ دەردەکەوێت. هەروەها وەکو دڵنەوایی بە مردنی مێردەکەی،[3] لە یادیشمان نەچێت کە ئومموسەلەمە لە بەنی مەخزوم بوو، کە ئەوان گرنگترین تیرەکانی هۆزی قورەیشن و، ئەم هاوسەرگیریەیش کاریگەری خۆی دەبێت لەسەر کەسانێك کە ئالای شەڕیان لە دژی پێغەمبەر(ﷺ) بەرز کردبوویەوە.[4]
هەروەها ئەم هاوسەرگیرییەی پێغەمبەر(ﷺ) تێگەیشتنی پێغەمبەر(ﷺ) دەردەخات لە بونیاتنان و دروستکردنی ئوممەت لە ناو خۆوە و، بەجێهێنانی مافی شەهیدەکان و خێزانەکانیان.[5]
ئومموسەلەمە ئاخرین کەس بوو لە خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لە دونیا دەرچوو لە ساڵی شەست و یەکی کۆچی، نزیکەی(٣٨٨) فەرموودەی لە پێغەمبەر(ﷺ) گێڕاوەتەوە، کە بوخاری و موسلم لەسەر سیانزە فەرموودەی پێکهاتوون، جگە لە سێ فەرموودە تەنها لە لای بوخاری و موسلیمیش سیانزە فەرموودەی گێڕاوەتەوە.[6] لە ڕاستیدا ئومموسەلەمە کۆششی کرد بۆ بڵاوکردنەوەی زانست لە پێغەمبەر(ﷺ) و بە مردنی دواترین چرا لە چراکانی ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) کوژایەوە.[7]

---

١ سنده حسن رواه البخاري في الادب المفرد (٨٢٥).
٢ سنده قوي رواه الحاكم (٦٢/١)، والبيهقي في شعب الايمان (٥١٧/٦).
٣ تفسير المنار (٣٧٢/٤).
٤ التربية القيادية (٣٥٦/٣).
٥ هەمان سەرچاوە (٣٥٧/٣).
٦ بڕوانە: سير اعلام النبلاء (٢١٠/٢).
٧ السيرة النبوية لأبي شهبة (٢٤٨/٢-٢٤٩).

## سێیەم: لە دایکبوونی حەسەنی کوڕی عەلی(رضي الله عنه).

پێشەوا قورتوبی(رضي الله عنه) دەفەرمووێت: حەسەن لە شەعبانی ساڵی چوارەمی کۆچی لە دایك بوو، کەواتە حوسەین پێش تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر هاتنە دونیای حەسەنەوە لە دایك بووە، واقیدیش جەختی کردووە لەسەر ڕاستێتی ئەم ڕیوایەتە.[1]

عەلی(رضي الله عنه) دەفەرمووێت: کاتێك حەسەن لە دایك بوو ناوی(حرب)م لێنا، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) هات و فەرمووی: کوا کوڕەکەم پێ نیشان بدەن.. ناوتان ناوە چی؟ وتم: حەرب، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵکو ناوی حەسەنە.[2]

بەم شێوە پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ناوە زبر و تیژەی گۆڕی بە ناوێکی جوان. ئەو منداڵە ناوە تازە جوانەکەی هەڵگرت و پێغەمبەریش(ﷺ) ئەوی هەڵگرت بە دەستەکانیو لە ناو دڵیدا، ئەبو ڕافیع دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوام بینی(ﷺ) بانگی فەرموو بە گوێی حەسەندا.[3]

هەروەها ئەبو ڕافیع دەربارەی گوێزەبانەی حەسەن فەرموویەتی: کاتێك حەسەن لە دایك بوو فاتیمە وتی: گوێزەبانە نەکەم بۆ کوڕەکەم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((لا ولكن احلقي رأسه وتصدقي بوزن شعره من فضة على المساكين والاوفاض))، واتە: نەخێر سەری بتاشە و بەکێشی مووەکانی سەری زیو ببەخشە لەسەر هەژاران و ئەو هاوەڵانەی من کە لە مزگەوتن، ئەویش وای کرد.[4]

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) پێی خۆش بوو خۆی گوێزەبانەی بۆ بکات، بۆیە دوو بەرانی بۆی سەربڕی و لەو بارەوە دەیفەرموو:((الغلام مرتهن بعقيقته، يذبح عنه يوم السابع ويسمى ويحلق رأسه))،[5] واتە: منداڵ بەستراوە بە گوێزەبانەکەیەوە، لە ڕۆژی حەوتەمدا بۆی سەردەبڕدرێت و ناو دەنرێت و سەری دەتاشرێت.

---

١ بڕوانە: شذرات الذهب لابن العماد الحنبلي (١/١٠).
٢ البخاري في الادب (٢٨٦).
٣ ابو داود رقم (٥١٠٥).
٤ رواه الطبراني (٣/٣٠)، بسند حسن.
٥ بڕوانە: صحيح سنن الترمذي للالباني (١٥٢٣).

## چوارەم: زەیدی کوڕی سابیت(ﷺ) فێری زمانی جوولەکەکان دەبێـت لـە سـاڵی چوارەمی کۆچی.

لەم ساڵەدا زەید فێـری کتێبـی جوولەکـەکان بـوو، لـە خاریجـەی کـوڕی زەیـدی کوڕی سابیت لە زەیدی باوکیـەوە هـاتووە، پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فـەرمانی پێکرد فێری نووسینی جوولەکەکان بێت بۆ ئەوەی نووسراوەکانی ئەوانی بۆ بخوێنێتەوە،[١] ئەویش لە پانزە ڕۆژدا فێری بوو، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) هاتە مەدینە، زەیدیان بردە لای و وتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا، ئەمـە لاوێکـە لـە بەنی نەجارِ چەند سوڕەتێکی لەبەرە لـە قورئـان، ئـیتر پێغەمبـەر(ﷺ) پێخۆشحاڵ بوو فەرمووی: ئەی زەیـد، خـۆت فێـری نووسـینی جوولەکـەکان بکـە بـۆم. چـونکە سوێند بە خوا من لە ئەوان دڵنیا نیم، زەید دەڵێت: منـیش لـە مـاوەی پـانزە ڕۆژدا تـەواو فێـری بـووم، دوای ئـەوە نووسـراوەکانی جوولەکـەم بـۆی دەخوێنـدەوە و وەڵامیشم دەدایەوە.[٢]

ئەم هەواڵەیش گرنگی کەسی وەرگێڕ دەردەخات لە دەوڵەتی ئیسلامیدا، چونکە تەماشـای نهێنییـەکانی دەوڵـەت دەکـات لـەو نووسـراوانەی بـۆی دێـن یـان لێـوەی دەڕوات بۆ شوێنەکانی تر، خۆ ناکرێت هەموو کەس ئەو نووسـراوانە ببینێـت، بۆیـە پێغەمبەر(ﷺ) ئەو فەرمانەی بە زەید کرد،[٣] فێربوونی زەیـدیش بـۆ ئـەو زمانـە لـەو مـاوە کەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ژیرییـەکی زۆر و، لەبـەرکردنێکی بـەهێز، زەیـد(ﷺ)، یەکێك بوو لەو کەسانەی کە هەموو قورئانیان لەبەر کرد لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) خۆیـدا، یەکێکیـشە لـە بـەناوبانگترین نووسـەرەکانی وەحـی لەبـەر دەسـتی پێغەمبەر(ﷺ) و، هەر ئەویش بوو لە سەردەمی ئەبو بەکردا(ﷺ) هـەموو قورئـانی نووسـیووە، یـەکێکیش بـوو لـە نووسـەرانی قورئـان لـە سـەردەمی عوسمـان(ﷺ)، فەرمانەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ زەید بەڵگەیە لەسەر هانـدانی ئـیسلام بـۆ فێربـوونی زمانەکانی تر و، شارەزابوون لە زانیارییەکان ئەگەر نیاز هەبوو بەو کارە.[٤]

---

١ البخاري، كتاب الاحكام، رقم (٧١٩٥).

٢ بڕوانە: سير اعلام النبلاء (٢/٢٢٩).

٣ بڕوانە: زيد بن ثابت، كاتب الوحي وجامع القران، صفوان داودي (٨٠-٨١).

٤ بڕوانە: السيرة النبوية لأبي شهبة (٢/٢٤٩).

## باسی سێیەم: دەرکردنی جوولەکەکانی(بني النضير)

جوولەکە تووشی ترسێکی زۆر بوون لە ماوەی نێوان کوژرانی کەعبی کوڕی ئەشرەف و، جەنگی ئوحود کە لە ساڵی سێی کۆچیدا ڕوویدا، بەڵام ئەو شکستەی تووشی موسڵمانان بوو لەو جەنگە هیوای لە دڵی ئەواندا تازەکردەوە بۆ بەدیهاتنی نیازە خراپەکانیان، ترسیشیان نەما لەسەر چارەنووسی خۆیان، ئەوەشی زیاتر ئاسوودە و بێ ترسی کردن مەسەلەی کوژرانی هاوەڵانی ڕەجیع و بیری مەعونە بوو، بۆیە جارێکی تر گەڕانەوە سەر بەکارهێنانی فێڵ و تەڵەکە و، دەستیان کردە بەهێزکردنی قەڵاکانیان بە چەك و کەرەستە بە مەبەستی پەلاماردانی موسڵمانان و دەوڵەتەکەیان، ئینجا بڕیاریشیان دا هەڵسن بە کوشتنی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەنجامدانی ناپاکی لەگەڵیدا.[١]

### یەکەم: مێژووی ئەو غەزا و هۆکارەکانی.

#### ١- مێژووی غەزاکە:

لێکۆڵەرەوانی مێژوونووسان پێیان وایە کە غەزای(بني النضير) لە دوای ئوحود بوو لە ڕەبیعی یەکەمی ساڵی چوارەمی کۆچی،(ابن القيم)یش بەرپەرچی ئەوانەی داوەتەوە کە پێیان وایە ئەو غەزایە لە پاش شەش مانگ بووە لە جەنگی ئوحود و فەرموویەتی: موحەممەدی کوڕی شیهابی زوهری بانگەشەی ئەوە دەکات کە ئەو غەزایە لە پاش بەدر بە شەش مانگ بووە، ئەوەش هەڵەیە، چونکە ئەوەی کە گومانی تیادا نییە ئەوەیە کە لە پاش ئوحود بووە، بەڵام ئەوەی کە لە پاش شەش مانگ لە بەدر ڕوویدا ئەوە غەزای(بنى قينقاع) بوو،(قريظة)یش لە پاش خەندەق بووە و، خەیبەریش لە پاش حودەیبیە.[٢]

---

١ بڕوانە: التاريخ السياسي والعسكري (١٨٨، ١٧٩).
٢ بڕوانە: زاد المعاد (٣/٢٤٩).

**٢- هۆکارەکانی غەزاکە:**

کۆمەڵێك هۆکار دەوەستێت لە دوای دەرکردنی ئەوان لە لایەن پێغەمبەر(ﷺ)، لەوانە:

أ- هەڵوەشاندنەوەی(بني النضير) بۆ پەیمانەکانیان کە دەبوو بە هیچ شێوەیەك دوژمنی موسڵمانان لە خۆ نەگرن، بەوەندەش ڕانەوەستان بەڵکو ڕێنموونیشیان کردن بۆ خاڵەکانی لاوازی لە مەدینە.

ئەم کارەیان لە غەزای(السويق)دا ئەنجام دا، چونکە ئەبو سوفیان لە پاش جەنگی بەدر نەزری کردبوو(بني النضير)سەری تەڕ نەکات لە جەنابە تاکو هێرش نەکاتە سەر مەدینە، جا کە بە دوو سەد سوارەوە بەرەو مەدینە هات، سەرگەورەی(بني النضير) کە(سلام بن مشكم) بوو، لەگەڵی ڕاوەستا و میوانداری پێکرد و هەواڵی گرنگی پێگەیاند و هەواڵگری ئیسلامی لەوە بێ ئاگا نەبوو.[١]

ب- هەوڵدان بۆ ڕەشەکوژکردنی پێغەمبەر(ﷺ): پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ هەندێك لە هاوەڵانیدا دەرچوو بۆ ڕێگای قوبا بەرەو لای ماڵەکانی(بني النضير) بە مەبەستی خوێنبایی ئەو دوو کەسەی لە هۆزی بەنیی عامیر بوون و(عمرو بن امية الضمري) کوشتنی بێ ئەوەی بزانێت پەیمانیان هەیە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)، بە پێی گرێبەستێك لە نێوان پێغەمبەر(ﷺ) و(بني النضير) سەبارەت بە کۆمەك کردن لە کاتی کۆکردنەوەی خوێنبایی، بێجگە لە ئەو هاوپەیمانێتییەی کە هەبوو لە نێوان(بني النضير) و(بني عامر).

جوولەکەکان بە ڕوویەکی گەشەوە پێشوازییان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد، ئینجا دەستیان کردە پیلان گێڕان بۆ کوشتنی پێغەمبەر(ﷺ)، واش دەردەکەوێت ڕێککەوتن لەسەر فڕەدانی بەردێکی گەورە بەسەر پێغەمبەر(ﷺ) لە سەرووی دیوارێکەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) لە پاڵیدا دانیشتبوو، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) کە لە ژێر چاودێر و پاراستنی خوای گەورەدا بوو، هەواڵی لە ئاسمانەوە پێگەیشت دەربارەی

---

١ بڕوانە: تاريخ الطبري (٢/٢٨٤).

نیازی خراپی ئەوان، بۆیە هەڵسا و بە پەلە گەڕایەوە بۆ مەدینە و پاش کەمێك هاوەڵانی بە دوایدا ڕۆیشتن.[1]

ئەم کارەشیان تەنها بۆ کوشتنی پێغەمبەر(ﷺ) نەبوو، بەڵکو بۆ لەناوبردنی بانگەوازی ئیسلام هەمووی بوو، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاری یەکلاکەرەوەی دا بۆ شەڕکردن لەگەڵیاندا،[2] لەم بارەشەوە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ هَمَّ قَوۡمٌ أَن يَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ فَكَفَّ أَيۡدِيَهُمۡ عَنكُمۡۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾(المائدة: ١١).

لێکدەرەوانی قورئان دەربارەی هۆکارەکانی دابەزینی ئەم ئایەتە هەندێ ڕیوایەتیان باس کردووە،(ابن جرير) لە نێوانیاندا ئەو ڕیوایەتەی پەسەند کردووە کە ئەم ئایەتە بە هۆی نیازخراپی(بني النضير) دابەزیووە بەرامبەر پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی و فەرموویەتی:(ڕاستترین وتەکان دەربارەی لێکدانەوەی ئەم ئایەتە ئەوەیە کە خوای گەورە مەبەستی(النعمة) کە لە ئایەتەکەدا باسی کردووە، ئەو نیعمەتەیە کە داوێتی بەسەر ئیمانداران و پێغەمبەر(ﷺ)، کە ڕزگاری کرد لەوەی(بني النضير) دەیانویست لە دژی ئەنجامی بدەن لە کوشتنی خۆی و هاوەڵانی، لەو ڕۆژەی کە ڕۆیشتن بۆ لایان بۆ مەسەلەی خوێنبایی ئەو دوو کوژراوە لە هۆزی(بنی عامر)، ئەم لێکدانەوەمان بە لاوە ڕاستترە بەهۆی ئەوەی خوای گەورە لە پاش ئەوە باسی کارە ناشیرینەکانی جوولەکەی کردوو، ناپاکی کردنیان بەرامبەر پێغەمبەرەکانیان.

دکتۆر(محمد ال عابد)یش هاوبۆچوونە لەگەڵ ئەم پەسەندکردنەی تەبەری وتوویەتی: دوور نییە ئەم ئایەتە لە پاش هەموو ئەو ڕووداوانە دابەزیبێت، چونکە ڕووداوەکان جۆراوجۆرن و لە یەك جێگەیشدا بوو، وەکو زانایان فەرموویانە.[3]

واتای ئایەتەکەیش ئەوەیە: ئەو نیعمەتەی خواتان لە یاد نەچێت بەسەرتانەوە کە گەورەترین دیاردەکانی دەست بەستنەوەی جوولەکەکان بوو لەوەی هیچ زیانێك

---

١ بڕوانە: الواقدي (١/٣٦٥)، التاريخ السياسي والعسكري (١٩٠).

٢ بڕوانە: التاريخ السياسي والعسكري لدولة المدينة (١٩٠).

٣ بڕوانە: حديث القران الكريم عن غزوات الرسول (١/٢٥١).

بکەیەننە پێغەمبەرەکەتان و، دووریش نەبوو پیلانە گڵاوەکەیان جێبەجێ بکەن، بەڵام خوای گەورە بۆی پووچەڵ کردنەوە و پێغەمبەرەکەی خۆی لە ئەوان ڕزگار کرد، دواتریش فەرمان دەکات بە لە خوا ترسان و دەفەرمووێت: ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ١١﴾.[١]

## دووەم: ئاگادارکردنەوەی(بني النضير) بە دەرکردنیان و گەمارۆدانیان.

### ١- ئاگادارکردنەوەیان:

زۆربەی کتێبەکانی ژیاننامەی پێغەمبەر(ﷺ) باسی ئاگادارکردنەوەی پێغەمبەر(ﷺ)یان کردووە بۆ(بني النضير) بە دەرچوون لە ماوەی دە ڕۆژدا، ئینجا موحەممەدی کوڕی مەسلەمەشی ناردە لایان پێی فەرموو: بڕۆ بۆ لای جوولەکەکانی(بني النضير) و پێیان بڵێ: پێغەمبەری خوا منی ناردووە بۆ لاتان کە دەربچن لە وڵاتەکەم، ئێوە پەیمانەکەتان هەڵوەشاندەوە بەو ناپاکییەی ویستتان ئەنجامی بدەن، منیش دە ڕۆژ مۆڵەتتان دەدەم، دوای ئەو دە ڕۆژە هەر کەسێکتان ببینرێت لە گەردنی دەدرێت.[٢] هیچ وەڵامێکیان نەبوو بۆ موحەممەدی کوڕی مەسلەمە ئەوە نەبێت وتیان: ئەی موحەممەد، پێمان وانەبوو ئەم هەواڵە کەسێك لە ئەوس بیهێنێت، ئەویش وتی: دڵەکان گۆڕاون و، ئیسلام ئەو پەیمانەی نەهێشت ئێوە باسی دەکەن، وتیان: باشە، ئیتر چەند ڕۆژێك مانەوە خۆیان بۆ کۆچکردن ئامادە کرد.[٣]

لەو ماوە عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سولول کەسێکی ناردە لایان و پێی وتن: جێگیر بن و دان بە خۆتاندا بگرن ئێمە پشتتان بەر نادەین، ئەگەریش شەڕتان لەگەڵ کرا لەگەڵتان دەبین، ئەگەریش دەربکرێن لەگەڵتان دەردەچین،[٤] دەریش

---

١ هەمان سەرچاوە (١/٢٥٢).
٢ بڕوانە: طبقات ابن سعد (٢/٥٧)، مغازي الواقدي (١/٣٦٣-٣٧٠).
٣ بڕوانە: تاريخ الطبري (٢/٥٥٢).
٤ السيرة ابن هشام (٣/٢١٢).

مەچن، چونکە من زیاتر لە دوو هەزار کەسم لەگەڵدایە لە عەرەب و خەڵکانی تر، ئەوانە دێنە نێو قەڵاکانتانەوە و دوا دانەیان دەمرن پێش ئەوەی ئەوان بە ئێوە بگەن.[1]

بۆیە جوولەکەکان متمانەیان بە خۆیان پەیدا کردەوە و(حيي بن الاخطب)ی سەرۆکیان ورەی بەرزبوویەوە و جەدی کوڕی ئەختەبی ناردە لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێی وت: ئێمەماڵەکانی خۆمان بەجێ ناهێڵین، تۆیش ئارەزووی خۆتە هەرچی دەکەیت، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ)(الله اكبر)ی کرد و موسڵمانان لەگەڵی وتیان(الله اكبر ئینجا فەرمووی:(حاربت يهود)،[2] واتە: جوولەکە شەڕیان کرد.

**٢- گەمارۆدان و دەرکردنیان:**

دە ڕۆژەکە تێپەڕوو بێ ئەوەی دەربچن، بۆیە هێزەکانی موسڵمانان بەرەو لایان بەڕێکەوتن و ئابلۆقەیان دان بۆ ماوەی پانزە شەو.

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە سوتاندنی دارخورماکانیان، بەوەش بێ هیوا بوون و وابەستەبوونیان نەما بە ماڵ و کشتوکاڵەکانیانەوە، ورەشیان نەما بۆ شەڕکردن و دەستیان کرد بە هاوارکردن: ئەی موحەممەد، تۆ خراپەکاریت قەدەغەکردو ئەنجامدەریشی بە خراپ دەژمارد، ئیتر بۆچی دارخورماکان دەبڕن و وێرانی دەکەن.

ئینجا خوای گەورە ترس و بیمی خستە دڵەکانیانەوە و، لەوە دڵنیا بوون کە ڕێگە چارەیان نییە جگە لە دەرچوون، پاش ئەوەی بۆیان دەرکەوت کەس ناتوانێت یارمەتیان بدات یان بەرگرییان لێ بکات، بۆیە ناردیانە لای پێغەمبەر(ﷺ) کە ڕێگەیان بدات دەربچن لە ماڵەکانیان. پێغەمبەر(ﷺ) ڕازی بوو لەسەر ئەوە و پێی فەرموون:((اخرجوا منها ولكم دماؤكم وما حملت الابل الا الحلقة))،[3] واتە: لە ماڵەکانتان دەربچن خوێنتان پارێزراوە و باری وشترەکانیشتان شت ببەن چەك نەبێت.

---

١ تاريخ الطبري (٣/٥٥٢).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابن كثير (٣/١٤٦).

٣ بڕوانە: حديث القران الكريم عن غزوات الرسول (١/٢٥٧).

ئەوانیش ڕازی بوون و هەڵسان بە ڕووخاندنی سابیتە و کۆڵەکەی خانووەکانیان بۆ ئەوەی موسڵمانان سوودیان لێ وەرنەگرن و هەرچی ئاڵتوون و زیویان هەیە بردیان، تەنانەت(سلام بن ابی الحقیق) بە تەنها خۆی پڕ پێستی گایەك ئاڵتوون و زیوی برد و دەیانوت: ئەمانەن داماننـاوە بۆ بەرزکردنـەوەی زەوی و داگرتنی، ئەگەرچی دارخورماکانیشمان بەجێهێشت لێرە لە خەیبەر دارخورما زۆرە.[١]

کەلوپەلەکانیان لەسەر شەش سەد وشتر گواستەوە و، دەرچوون بە دەف و تەپڵ و زوڕنا و گۆرانیەوە ، بۆ ئەوەی موسڵمانان شاکامیان پێ نەخوازن، هەندێکیان چوون بۆ خەیبەر وەکو(سلام بن ابی الحقیق) و(حيي بن اخطب) و ڕێزیان لێ گیرا لەوێ، هەندێکیشیان ڕۆیشتن بۆ(اذرعات) لە شام.[٢]

ئەو کەسەیش هەڵسا بە دەرکردنیان موحەممەدی کوڕی مەسلەمە بوو بە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ).[٣]

## سێیەم: پەند و وانەکان.

قورئانی پیرۆز لە یەك سورەتدا بە تەواوی باسی(بني النضير)ی کردووە، کە سورەتی حەشرە، تەنانەت عەبدوڵای کوڕی عەبباس ئەو سورەتەی بە سورەتی(بني النضير) ناوبردووە، وەکو لە بوخاریدا هاتووە.[٤]

ئەو سورەتە باسی وردەکارییەکانی ئەو غەزایەی کردووە، لەگەڵ باسکردنی حوکمی دەستکەوتەکان و شایستەکانی و هەڵوێستی مونافیقەکانی باسکردووە بەرامبەر جوولەکەکان و... دەشتوانین هەندێ پەند و وانە لەو سورەتە بە دەست بهێنین:

### ١- ستایش کردنی خوای گەورە و مەزن ڕاگرتنی:

سورەتەکە بە ستایشکردنی خوای گەورە دەستی پێکردووەو گەردوونیش بە هەر هەموو بوونەوەرەکانییەوە ستایشی خوای گەورە دەکەن، خوای گەورە

---

١ بڕوانە: السيرة الحلبية (٥٦٦/٢).
٢ هەمان سەرچاوە (٥٦٥/٢)، حديث القران الكريم (٢٥٧/١).
٣ بڕوانە: المغازي للواقدي (٣٧٤/١)، اليهود في السنة المطهرة (٣٢١/١).
٤ البخاري: كتاب المغازي، باب (حديث بني النضير) رقم (٤٠٢٩).

دەفــــــەرموویت:[١] ﴿ سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾(الحشر: ١).

سەرەتای ئەم سورەتە باسی ئەوە دەکات کە هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکانو زەویدان خوای گەورە پاک ڕادەگرن و ستایشی دەکەن، چونکە خوای گەورە خاوەن دەسەڵاتە و هەموو شتێك لە ژێر فەرمانیدایە.

هەروەها خوای گەورە دانایە لە دروست کردنو فەرمانەکانیدا و هیچ دروست ناکات بەبێ حیکمەت و بێ ئەوەی بەرژەوەندییەکی هەبێت، وەکو ئەوەی پێغەمبەرەکەی سەرخستە سەر بێباوەڕانی ئەهلی کیتاب لە(بني النضير) کاتێك ناپاکییان کرد بەرامبەر پێغەمبەر(ﷺ) و دەریکردن لە شوێن و ڕێگای خۆیان کە پێی ڕاهاتبوون.[٢]

**٢- ترس و سام لە سەربازەکانی خوایە:**

خوای گەورە دەفەرموویت ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَخْرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن دِيَٰرِهِمْ لِأَوَّلِ ٱلْحَشْرِ ۚ مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُوا۟ ۖ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ حُصُونُهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا۟ ۖ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ ۚ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي ٱلْمُؤْمِنِينَ فَٱعْتَبِرُوا۟ يَٰٓأُو۟لِي ٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٢﴾ وَلَوْلَآ أَن كَتَبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمُ ٱلْجَلَآءَ لَعَذَّبَهُمْ فِي ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَهُمْ فِي ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابُ ٱلنَّارِ ﴿٣﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَآقُّوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۖ وَمَن يُشَآقِّ ٱللَّهَ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾(الحشر: ٢-٤).

ئەو کەسەی وردبێتەوە لەم ئایەتە پیرۆزانەوە کە خوای گەورە خۆی جوولەکەکانی(بني النضير)ی دەرکردووە لە شوێن و جێگەکانی خۆیان بەرەو شام، لە کاتێکدا هەموو هۆکارە مادییەکان بە دەستی خۆیانەوە بوو، بە شێوازێك وایان دەزانی کەس ناتوانێت دەریان بکات، بەڵام خوای گەورە سەرسامی کردن بەترس و

---

١ بڕوانە: حديث القران الكريم عن غزوات الرسول (١/٣٢٧).

٢ بڕوانە: تفسير السعدي (٣/٣٢٧).

بیمێك خستیە دڵەکانیانەوە، بۆیە بە دەستی خۆیان و دەستی ئیمانداران خانووەکانیان دەڕووخاند، ئەم شێوە باسکردنەی قورئانیش بە تەواوی جیاوازە لە شێوازی باسکردنی مێژوونووسان چونکە شتە شاراوەکان دەردەخات و دەیانبەستێتەوە بە بکەری ڕاستەقینەیان کە پەروەردگارە، ئینجا ئایەتەکان بەردەوام دەبن لە ئاشکراکردنی ئەوەی ئەوان هەموو هۆکارەکانی هێزیان هەبوو بەڵام خوای گەورە لە ناخی خۆیانەوە شکستی پێ هێنان و بۆیە پێویستە هەموو خاوەن بیر و هۆشێك پەند وەربگرێت و بزانێت کە خاوەن دەسەڵات هەر خوا خۆیەتی.

ئەم غەزایە وانەیەك بوو بۆ موسڵمانان لە هەموو سەردەمێکدا ئەویش بریتییە لەوەی ڕێگای سەرکەوتن نزیکە و تەنها ئەوەیە بگەڕێینەوە لای خوا و پشتی پێ ببەستین، ئینجا خوای گەورە ئەوە ڕوون دەکاتەوە ئەگەر سزای نەدایەن بە دەرکردن، سزای دەدان بە کوشتن لە دونیادا، لە دواڕۆژیشدا سزای دۆزەخ چاوەڕوانیان دەکات.[1]

**٣- وێران کردنی ماڵ و سامانی دوژمنان:**

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بە سوپاکەی ئابلۆقەی(بني النضير)ی دا، ئەوان خۆیان قایم کرد لە قەڵاکانیاندا، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە بڕینی دارخورماکانیان و کڕدانیان، ئەوانیش ئەو قسانەیان کرد لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) کە بینیمان، ئینجا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند:[2] ﴿مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِيَ ٱلْفَٰسِقِينَ﴾(الحشر: ٥).

(محمد ابو زهرة) لەم بارەوە بە درێژی ڕا و بۆچوونەکانی هێناوەتەوە و، چەند خاڵێکی خستووەتە ڕوو:

١- لە بنچینەدا ماڵ وێران کردن و دار بڕین قەدەغەیە، چونکە ئامانج لە جەنگ

---

١ بڕوانە: حديث القران الكريم (١/٢٧٠-٢٧١).

٢ هەمان سەرچاوە (١/٢٧٤).

ئازاردانی خەڵکی نییە، بەڵکو نەهێشتنی ستەمکاری ئازاردەرە.

٢- ئەگەر پێویستییەك هەبوو بۆ ئەنجامدانی ئەو کارانە، بۆ نموونە ئەگەر دوژمن خۆی لە ناو ئەو دارانە حەشار بدات، ئەوە ڕێگە چارەیەکی تر نییە جگە لە بڕینیان، بینا ڕووخاندنیش لە پێویستیەکانی کوشتن بوو، وەکو ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لێرە و لە قەڵای سەقیف ئەنجامیدا.

٣- ئەو شەرعناسانەی ڕێگەیان داوە بۆ ئەنجامدانی ئەم جۆرە کارانە پێویستە بۆ کاتی ناچاری لێك بدرێتەوە، نەوەك تەنها لە پێناو ئازاردانی دوژمن و وێرانکردن، چونکە گەل هەموویان دوژمن نین، بەڵکو تەنها ئەوانەی کە چەك هەڵدەگرن.[1]

٤- گەشەپێکردنی سیاسەتی دارایی بۆ دەوڵەتی ئیسلامی:

خوای گەورە باسی ماڵ و سامانەکانی(بني النضير)ی کردووە و فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡهُمۡ فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾(الحشر: ٦).

هەروەها ڕوونی کردووەتەوە کە ئەو ماڵانەی بۆیان گەڕاپەوە لە ئەوانەوە ئەوە خوای گەورە بە موسڵمانانی داوە بەبێ شەڕێکی سەخت، چونکە موسڵمانان بە ئاسانی بەڕێکەوتن بۆ لای دوژمنەکانیان و فەتحیان کرد لە ڕێگەی گرێبەستی ئاشتییەوە،( ئەو ماڵانەی(بني النضير) کە بەو شێوە ئاسانە دەستی موسڵمانان کەوت بەبێ بەکارهێنانی وشتر و ئەسپ، بە تایبەت بۆ پێغەمبەر بوو(ﷺ)، بۆیە خەرجی ساڵێکی بۆ ماڵەکانی خۆی جیاکردەوە و، ئەوەشی مایەوە خەرجی کرد بۆ چەك و کەرەستەی شەڕ لە پێناوی خوادا)،[2] ئینجا خوای گەورە حوکمی دەستکەوتەکانی بە گشتی باس کرد لەو ناوچانەی بێباوەڕان تیا نیشتەجێن و فەرمووی: ﴿مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ﴾(الحشر: ٧).

---

١ بڕوانە: تفسير الطبري (٣٤/٢٨).

٢ مسلم، كتاب الجهاد، باب (حكم الفيء) رقم (١٧٥٧).

ئەم دەستکەوتە هەمووی بۆ پێغەمبەر بوو(ﷺ)، بۆیە بە ئارەزووی خۆی دەستکاری کرد و، گێڕایەوە بۆ موسڵمانان و لە ڕێگەی بەرژەوەندی خۆیاندا خەرج کران.

کاتێکیش پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ماڵانەی بە دەستکەوت، بانگی سابیتی کوڕی قەیسی کرد و پێی فەرموو:((ادع لي قومك))، واتە: قەومەکانتم بۆ بانگ بکە، وتی: خەزرەج؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵکو هەموو ئەنصارەکان. کاتێك هاتن پێغەمبەر(ﷺ) سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد و باسی فەزڵی ئەنصارەکانی کرد و فەرمووی: ئەگەر پێتان خۆشە ئەو ماڵانە بەش دەکەم لە نێوان ئێوە و موهاجیرەکاندا و ئەوان لە ماڵەکانتان لەگەڵتان بمێننەوە، ئەگەریش حەز دەکەن تەنها بەشی ئەوان دەدەم و لە ماڵەکانتان دەربچن. سەعدی کوڕی عوبادە و سەعدی کوڕی موعاز وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەڵکو بیدە بە موهاجیرەکان و با هەر لە ماڵەکانیشماندا بمێننەوە.[1]

ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) دەستکەوتەکانی دابەش کرد و بەشی هیچ کەسی لە ئەنصارەکان نەدا، تەنها ئەبو دوجانە و سەهلی کوڕی حونەیف نەبێت چونکە زۆر نەدار بوون.[2] پێغەمبەر(ﷺ) سەرەڕای ئەوەی دەیزانی کە ئەو دەستکەوتانە هەمووی بۆ خۆیەتی بەڵام ئەوانی هەر کۆکردەوە بۆ ئەوەی هیچ لە دڵیان دروست نەبێت، مەبەستیش لەم دابەشکردنە ئەرك سووك کردنەوە بوو لەسەر ئەنصارەکان، بەم شێوەیش موهاجیرەکان ڕۆیشتنە نێو ماڵەکانی(بنو النضیر) و ماڵەکانی ئەنصار بۆ خاوەنەکانیان گێڕدرایەوە، موهاجیرەکانیش هەندێك حاڵیان باش بوو، قەیرانەکەیش وردە وردە ئاسان بوویەوە.[3]

دابەشکردنی ئەو ماڵانە گەشەیەکی گەورەی لە سیاسەتی دارایی دروست کرد بۆ دەوڵەتی ئیسلامی، چونکە پێشتر دەستکەوتە جەنگییەکان دابەش دەکرایە سەر جەنگاوەرەکان لە پاش ئەوەی دەوڵەت پشکی پێنج یەکی لێ دەردەکرد بۆ هەندێ

---

١ مسلم كتاب الجهاد، باب (حكم الفيء) (١٢٧٦/٣) رقم (١٧٥٧).

٢ بڕوانە: شرح الزرقاني على المواهب (٨٦/٢).

٣ بڕوانە: السيرة النبوية لصالح الشامي (٢٢٢).

خەرجی دیاری کراو کە قورئان باسی کردووە، بەڵام لە پاش غەزای(بني النضير)ەوە، دەستکەوتە جەنگییەکان بە دوو شێوە دابەش دەکرا:

١- ئەو دەستکەوتانەی موجاهیدەکان بە شمشێرەکانیان بە دەستیان هێناوە، بەسەر خۆیاندا دابەش دەکرێت و پێنج یەکی بۆ دەوڵەت دەبێت.

٢- ئەو دەستکەوتانەی بەبێ شەڕ بە دەست دەکەون، ئەوەیش بۆ سەرۆکی دەوڵەت بێت چی بە بەرژەوەندی بزانێت خەرجی دەکات، واتە سەرۆکی دەوڵەتی بودجەیەکی تایبەتی بۆ تەرخان دەکرا بە پێی بەرژەوەندییەکان لێی خەرج دەکات،[1] خوای گەورەیش فەرموویەتی: ﴿مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾(الحشر: ٧).

واتە: بۆ ئەوەی ماڵ و سامان تەنها لە نێوان چینی دەوڵەمەندەکاندا دەستاودەستی پێ نەکرێت، واش دەردەکەوێت کە سیاسەتی دارایی شەریعەتی ئیسلام لەسەر ئەم بنچینەیە بونیات نراوە و، کتێبەکانی شەریعەتیش هەر باس لەوە دەکەن کۆمەڵگایەك بونیات بنرێت و چینەکان تیایدا لە یەکتر نزیك بن و، هۆکارەکانی دژە دادگەری لەناوببرێت.

ئەگەر حوکمەکانی شەریعەتیش لە بواری داراییدا جێبەجێ بکرێت، وەکو دەرکردنی زەکات و قەدەغەکردنی سوو، هەروەها قۆرغکردن، خەڵکی هەموویان لە خۆشترین حاڵدا دەبوون و کەس نەدەبووە بار بەسەر کەسی ترەوە و هەموویان هاوکاری یەکتریان دەکرد،[2] لە پاش ئاشکراکردنی شێوەی دابەشکردنەکە، خوای گەورە فەرمان دەکات بە گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەر(ﷺ) و دەفەرموێت: ﴿مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ

---

١ بڕوانە: قراءة سياسية للسيرة النبوية، محمد قلعجي (١٦٩).

٢ بڕوانە: فقه السيرة للبوطي (١٩٤).

كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاءِ مِنكُمْ وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴾(الحشر: ٧).

واتە: ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانتان پێدەکات ئەنجامی بدەن و، ئەوەی داواتان لێدەکات لێی دوورکەونەوە، چونکە ئەو چاکەی ئێوەی دەوێت و(اتقوا الله) واتە: لە خوا بترسن و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بکەن و لە قەدەغەکراوەکانی دووربکەونەوە.

﴿إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴾، واتە: سزاکەی سەختە بۆ کەسێك سەرپێچی بکات، ئەم ئایەتەیش – وەکو لێکدەرەوانی قورئان فەرموویانە– دەربارەی دەستکەوتەکان دابەزی، بەڵام کشتیە لە هەموو فەرمانێکی پێغەمبەر(ﷺ) یان قەدەغەکراوێکی، وەکو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾(النساء: ٦٥).

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:((ما نهيتكم عنه فاجتنبوه، وما امرتكم به فافعلوا منه ماستطعتم، فانما اهلك الذين من قبلكم كثرة مسائلهم واختلافهم على انبيائهم))،[1] واتە ئەوەی لێم قەدەغە کردن لێی دووركەونەوە، ئەوەشی فەرمانم پێکردن ئەوەندەی ئەنجام بدەن کە دەتوانن، چونکە ئەوانەی پێش ئێوە لە ناوچوونیان لەبەر زۆر پرسیارکردنیان و، ناکۆکیان بوو لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان.

**٥- فەزڵی موهاجیر و ئەنصارەکان و ئەوانەش شوێنیان دەکەون بە چاکە:**

*** فەزڵی موهاجیرەکان:**

ئایەتەکانی سورەتی(الحشر) چاکێتی ئەوانی دەرخستووە، کە ئەوان لە پێشەوەن، خوای گەورە دەربارەیان فەرموویەتی: ﴿لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ ﴾(الحشر: ٨).

---

١ مسلم كتاب الفضائل، باب (توقيره (ﷺ) وترك الاكثار من سؤاله) (٤/١٨٣٠).

* فەزڵی ئەنصارەکان:

خوای گەورە باسی ئەوانیشی کردووە و فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾(الحشر: ٩).

* فەزڵی شوێنکەوتووانیان:

خوای گەورە دەربارەیان فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾(الحشر: ١٠).

٦- هەڵوێستی مونافیقەکان لە مەدینە:

ئایەتە پیرۆزەکان حاڵەتی مونافیقەکانی ئاشکرا کردووە، لە هاوپەیمانێتیان لەگەڵ برا جوولەکەکانیان، هەروەها هەڵوێستیانی لە موسڵمانانیش ئاشکرا کردووە و، هەروەها هەڵوێستی جوولەکەکانیش، وەکو فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نَافَقُوا۟ يَقُولُونَ لِإِخْوَٰنِهِمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا وَإِن قُوتِلْتُمْ لَنَنصُرَنَّكُمْ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ﴾(الحشر: ١١).

هەروەها دەبینین لەم ئایەتەدا چۆن خوای گەورە کردوونی بە برای جوولەکەکان(لِإِخْوَٰنِهِمُ) چونکە بێباوەڕی هەردووکیان کۆدەکاتەوە.

٧- قەدەغەکردنی ئارەق:

لە شەوانی ئابلۆقەدانی(بنو النضير)دا لە ڕەبیعی یەکەمی ساڵی چوارەمی کۆچی ئارەق قەدەغەکرا،[1] قەدەغەبوونیشی پلە بە پلە بوو وەکو زانراوە، تاکو ئەو ئایەتە

١ بڕوانە: تفسير القرطبي (١٨/١٠).

یەکلاکەرەوەی سورەتی مائیدە دابەزی: ﴿فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾(المائدة: ٩١). ئیماندارانیش لە ئەوپەڕی گوێڕایەڵیدا وتیان: قد انتهينا يا رب.[١] واتە: وازمان هێنا ئەی پەروەردگارمان.

دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَـٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ۗ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ﴾(البقرة: ٢١٩).

مامۆستا سەید قوتب(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ئەم دەقە یەکەمین هەنگاوی قەدەغەکردن بوو، شت و کردەوەکان لەوانەی خراپی پەتی نەبن و چاکەیشیان لەگەڵ تێکەڵ بێت، بەڵام بنچینەی ڕەوا بوون و قەدەغەبوون زاڵبوونی چاکە و خراپەیە، جا ئەگەر خراپی لە ئارەق و قوماردا زاڵ بوو ئەوە هۆکاری حەرام بوون و قەدەغە بوونێتی، لێرەدا لایەنێکی ڕێبازی پەروەردەی ئیسلامیمان بۆ دەردەکەوێت، ئەویش ئەوەیە کاتێك فەرمان یان قەدەغەکردن پەیوەست بێت بە بناغەیەك لە بناغەکانی بۆچوونی ئیمان واتە بە مەسەلەی بیروباوەڕ، ئیسلام هەر لە سەرەتاوە بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوە دەیبڕێتەوە.

بەڵام کاتێك ئەو مەسەلە پەیوەندی هەبێت بە پەرستن یان داب و نەریت یان بە بارودۆخێکی کۆمەڵایەتی ئاڵۆز، ئیسلام لەسەرخۆ و پلەبەپلە چارەسەری دەکات، جا بە پێچەوانەی مەسەلەی یەکتاپەرستیەوە، کە ئیسلام لەسەر ئەو بناغەیە بونیات دەنرێت، مەسەلەی ئارەق و قومار پەیوەندی هەبوو بە ڕاهاتن و داب و نەریتەوە و پێویستی بە چارەسەرکردن هەبوو، بۆیە دەبینین سەرەتا خوای گەورە ئەوەی ڕوون کردەوە کە گوناهی ئەو دوو تاوانە زیاترە لە چاکیەکانیان، ئەمەیش ئاماژەیەکە بۆ وازهێنان، هەنگاوی دووەمیش لە سورەتی(النساء)دا هاتووە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِى سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا۟ ۚ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ

---

١ بڕوانە: الخصائص العامة للاسلام للقرضاوي (١٨١).

سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً فَتَيَمَّمُوا۟ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُوا۟ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا ﴾(النساء: ٤٣).

نوێژیش لە پێنج کاتی لە یەکتر نزیکدا ئەنجام دەدرێت، کاتەکەیش ئەوەندە هەڵناگرێت کەسەکە سەرخۆش بێت و بێتەوە هۆشی خۆیشی جارێکی تر، بۆیە کات لە پێش ئەو کەسانەدا تەسک بوویەوە چونکە ئەو کەسەی کە خووی گرتووە بە خواردنی شتێك لە کاتێکی دیارکراودا حەز لە خواردنی دەکات و کە ئەو کاتە تێپەڕی حەزەکەی دەشکێت، ئینجا لە پاش ئەم دوو هەنگاوە، هەنگاوی کۆتایی هات و حەرام بوونی یەکجاری دابەزی:[١] ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴾(المائدة: ٩١).

**٨- پیلانی خراپە بەسەر ئەنجامدەرانیدا دەگەڕێتەوە:**

تەڵەکە و پیلانەکانی جوولەکە لە دژی پێغەمبەر(ﷺ) و دەوڵەتی ئیسلامی لە ئەوپەڕی نزمی و نالەباریدا بوو، ئەوان بە دوای سەربەرزی و زاڵ بووندا دەگەڕان بەو کارانەیان، بەڵام خوای گەورە پیلانەکانی بەسەر خۆیاندا شکاندەوە و پێغەمبەرەکەی و موسڵمانانی لە دەستیان ڕزگارکرد و، ئەوانیشی سەرشۆڕکرد و ماڵەکانیشیان بوو بە دەستکەوت بۆ موسڵمانان بەبێ هیچ شەڕ و ماندوو بوونێك، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَخْرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن دِيَٰرِهِمْ لِأَوَّلِ ٱلْحَشْرِ ۚ مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُوا۟ ۖ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ حُصُونُهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا۟ ۖ وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ ۚ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِى ٱلْمُؤْمِنِينَ فَٱعْتَبِرُوا۟ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَبْصَٰرِ ﴾(الحشر: ٢).

ئەمە سەرئەنجامی کاری خراپەیە، ئینجا بڕوانە چۆن قورئانی پیرۆز ئاماژەی کردووە بۆ ئەو جێگایانەی پێویستە پەندیان لێ وەربگیرێت و هەڕەشەدانیشی لە

---

[١] بڕوانە: في ظلال القرآن (١/٢٢٩).

هەموو کەسێك ئەو ڕێبازە بگرێتە بەر[1] کە فەرموویەتی: ﴿فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ﴾.

پەند وەرگرتنیش لەم ئایەتانە لە چەند ڕوویەکەوەیە بە بۆچوونی من:

١- ئەو کەسەی لە ڕووی هەق و ڕاستیدا دەوەستێت و خەڵکی لێ دوور دەخاتەوە بانگخوازانی ڕاستی ڕاودەنێت، لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوا سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ ۚ وَبِئْسَ الْمِهَادُ﴾(ال عمران: ١٢).

٢- ململانێی نێوان هەق و باتڵ هەرگیز ڕاناوەستێت و بەردەوامە، هەردوو لاشیان پەلاماردان و زاڵ بوونیان دەبێت، بەڵام سەرەنجام هەر بۆ چاکەکارانە.

٣- پەند وەرگرتن بەوە دەبێت لەو سیفەتانەی جوولەکە خۆمان دوور بگرین، بۆ ئەوەی تووشی هەمان سەرەنجام نەبین لە سەرشۆڕی و شکست.[2]

**٩- زۆرکردن نییە لە ئاییندا:**

لە نێو(بني النضير)دا هەندێ کوڕە گاور بوون بە هۆی پەروەردە بوونیان لە نێوانیاندا بووبوون بە جوولەکە، جا کەس و کارە موسڵمانەکانیان ویستیان ڕێگەیان لێ بگرن لەگەڵ ئەواندا کۆچ نەکەن، بۆیە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ ۖ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ ۚ فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ لَا انفِصَامَ لَهَا ۗ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾(البقرة: ٢٥٦).

ئەبو داود لە سونەنەکەیدا لە عەبدوڵای کوڕی عەبباس دەگێڕێتەوە(ﷺ): هەندێك ئافرەت بوو منداڵیان بۆ نەدەما،بۆیە نەزریان دەکردئەگەر منداڵێکیان ببێت و بمێنێتەوە بیکات بە جوولەکە،[3] جا کاتێك(بنو النضير) دەرکران، هەندێك لە کوڕانی

١ بڕوانە: صور وعبر من الجهاد النبوي في المدينة (١٦٧-١٦٨).

٢ بڕوانە: الصراع مع اليهود لأبي فارس (١٧٩).

٣ سنن أبي داود (٣/١٣٢).

ئەنصارییان تیادا بوو، وتیان: واز لە کوڕەکانمان ناهێنن، خوای گەورەیش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾(البقرة: ٢٥٦).[١]

---

١ ابو داو كتاب الجهاد، (باب الاسير يكره على الاسلام) (٣/١٣٢)، ٢٦٨٢.

## باسی چوارەم: غەزای(ذات الرقاع)

### یەکەم: مێژوو و هۆکارەکانی، بۆچیش ناونرا(ذات الرقاع)؟:

نووسەرانی سیرە جیاوزییان هەیە دەربارەی مێژووی ئەم غەزایە، ئیمامی بوخاری پێی وایە لە پاش خەیبەر بووە، بەڵام بە لای(ابن اسحق)ەوە[١] لە دوای غەزای(بنو النضیر)ەوە بووە، دەشگێڕنەوە پاش خەندەق بووە لە ساڵی چوارەمی کۆچی، واقیدی[٢] و ئیبنو سەعد[٣] وتوویانە لە موحەڕڕەمی ساڵی پێنجی کۆچی بووە. مامۆستا(البوطي)وتوویەتی لەساڵی چوارەمی کۆچی بووە پاش تێپەڕبوونی مانگ و نیوێك بەسەر دەرکردنی(بني النضیر)دا، وتووشێتی زۆربەی زانایان لەسەر ئەم بۆچوونەن و،[٤] خۆمیش هەر ئەوە بەڕاست دەزانم، هۆکاری غەزاکە: دەرکەوتنی ناپاکی بوو لە لایەن زۆرێك لە هۆزەکانی نەجد لە دژ موسڵمانان، ئەو ناپاکییەی لە کوشتنی حەفتا کەسەکە دەرکەوت کە دەرچووبوون بۆ بانگەواز، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوو بۆ شەڕکردن لەگەڵ هۆزەکانی موحاریب و بەنی سەعلەبە،[٥] دکتۆر(محمد ابو فارس)یش دەگێڕێتەوە کە کەسێك هاتووە بۆ مەدینە و موسڵمانانی ئاگادارکردووە کە ئەو دوو هۆزە خۆیان ئامادە کردووە بۆ شەڕی پێغەمبەر(ﷺ)، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) خۆی دەرچوو بۆ لایان بە چوار سەد جەنگاوەرەوە، دەشگێڕنەوە بە حەوت سەد جەنگاوەر، کاتێك پێغەمبەری خوا(ﷺ) گەیشتە لای ماڵەکانیان ترسان و هەڵهاتن بۆ چڵەپۆپەی چیاکان، ماڵ و منداڵەکانیشیان لە دوای خۆیان بەجێهێشت، کاتی نوێژیش هات و موسڵمانان نەیانوێرا هێرش بکەنە سەریان و پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی(صلاة الخوف)ی پێکردن و گەڕانەوە بۆ مەدینە.[٦]

---

١ البخاري كتاب المغازي باب (غزوة الرقاع) (٦٢/٥) رقم (٤١٢٨).
٢ بڕوانە: المغازي للواقدي (٣٩٥/١).
٣ بڕوانە: الطبقات لابن سعد (٦١/٣).
٤ فقه السيرة النبوية (١٩٤).
٥ هەمان سەرچاوە (١٩٤–١٩٥).
٦ بڕوانە: غزوة الاحزاب لأبي فارس (١٤).

ئەم هەڵمەتە سەربازییە مەبەستەکانی خۆی بەدەست هێنا و، توانی دوژمنان پەرتەوازە بکات کە نیازی هێرشیان بوو بۆ سەر مەدینە، هەروەها ترسی خستە دڵیانەوە و، وانەیەکی فێرکردن کە موسڵمانان نەوەك هەر توانایان هەیە دوژمنانیان لە ناو ببەن، بەڵکو دەتوانن شەڕیش بگوێزنەوە خاکی دوژمن.[1] بۆیەش ناونرا(ذات الرقاع) چونکە پارچەیان دەبەست بە پێیانەوە لەبەر گەرماو لەبەر ئەوەی پێیەکانیان بووبووە زام لە پێخاوسیدا، یان لەبەر ئەوەی بەیداخەکانیان پینەکردبوو، یان لەبەر ئەوەبوو ئەو جێگای لێی دابەزین پەڵەی سپی و ڕەشی تیابووە، ڕاستیش ئەوەیە بە پارچە پێیان دەبەست.[2]

بوخاری و موسلیم لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە ڕیوایەتیان کردووە فەرموویەتی: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا دەرچووین لە غەزایەکدا، ئێمە شەش کەس بووین بە نۆرە سواری وشترێك دەبووین، ئیتر پێمان بریندار بوو، منیش هەردوو پێم بریندار بوو، نینۆکەکانیشم کەوتن، جا ئێمە پارچەی پەڕۆمان دەبەستە دەوری پێمانەوە، بۆیە ناونرا(ذات الرقاع) بە هۆی ئەو پارچانەی دەمانبەستە پێیەکانمانەوە.[3]

## دووەم: نوێژی ترس و پاسەوانێتی سنوورەکان.

١- نوێژی ترس: خوای گەورە ئەم شێوە نوێژەی لەم غەزایە دابەزاندە سەر پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، قورئانیش باسی شێوازەکەی کردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓاْ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُواْ فَلْيَكُونُواْ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّواْ فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ وَدَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةً وَلَا جُنَاحَ

---

١ بڕوانە: غزوة الاحزاب محمد احمد باشميل (٧٧-٧٨).

٢ حديث القران الكريم عن غزوات الرسول (٣٠٩/١)، صور وعبر من الجهاد النبوي في المدينة (١٧٠)..

٣ صحيح البخاري كتاب المغازي باب (غزوة ذات الرقاع) رقم (٤١٢٨).

عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓاْ أَسْلِحَتَكُمْ وَخُذُواْ حِذْرَكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴾(النساء: ١٠٢).

موسڵمانان(صلاة الخوف)یان کرد و شێوازەکەشی ئەمەیە، کۆمەڵێك لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) ڕیز دەبەستن و کۆمەڵێك ڕووەو دوژمن، یەك ڕکاتی بەو کەسانە کرد لەگەڵیدا بوون و خۆی هەر بە ڕاوەستان مایەوە و ئەوان بۆ خۆیان تەواو کرد و ڕوویان کردە دوژمن، ئەو کۆمەڵەکەیش هاتن کە نوێژیان نەکردبوو، ڕکاتەکەی تری پێیان کرد و لە دانیشتندا هەڵنەستایەوە و ئەوان بۆ خۆیان نوێژەکانیان تەواو کرد.[١] لە ڕیوایەتی موسلیمیشدا هاتووە: دوو ڕکات نوێژی بە کۆمەڵێکیان کرد و، ئەوان چوونە دواوە، ئینجا دوو ڕکاتی تری بە کۆمەڵەکەی تر کرد، دەڵێت: بۆ پێغەمبەر(ﷺ) چوار ڕکات بوو، بۆ ئەوانیش دوو ڕکات بوو.[٢] لەوانەشە – وەکو دکتۆر(البوطي) دەڵێت – چەند جارێك(صلاة الخوف)ی پێ کردبێتن، جارێك بەم شێوە و، جارێك بە شێوەکەی تر.

ئەم نوێژەی لە ناوچەی(نخل) کردیان کە دوو ڕۆژە ڕێ دوورە لە مەدینەوە،[٣] ئەم حوکمە شەرعیەیش بەڵگەیە لەسەر گرنگی نوێژ، تەنانەت لە ناوجەرگەی شەڕیشدا، نابێت کەمتەرخەمی تیابکرێت، هەرگیز بواریش نەدراوە لە ژێر هیچ بارودۆخێکدا نوێژ نەکرێت و لەگەڵ جیهادیشدا لکاون بە یەکەوە و جیاوازیینان لە نێواندا نەکراوە.[٤]

### ٢- پاسەوانێتی خاڵە سەربازییەکان:

کاتێك سوپای ئیسلامی گەڕانەوە لەو غەزایە، ئافرەتێکیان لە بتپەرستان کرد بە کۆیلە و هێنایان، ئیتر مێردەکەی نەزری کرد نەگەڕێتەوە تاکو خوێنێك نەڕێژێت لە نێو هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)، ئیتر لە کاتی شەو هات و، پێغەمبەریش(ﷺ) دوو

---

١ بڕوانە: السيرة: في ضوء المصادر الاصلية (٤٢٥).
٢ مسلم كتاب الصلاة، باب (صلاة الخوف) رقم (٨٤٣).
٣ بڕوانە: فقه السيرة النبوية للبوطي (٢٠٧).
٤ بڕوانە: التربية القيادية (٢/٣٠٣-٣٠٤).

پیاوی دانابوو بۆ پاسەوانێتی لە کاتی خەودا، کە عەبباسی کوڕی بیشر و، عەمماری کوڕی یاسر بوون، لەو کاتەی عەبباد نوێژی دەکرد ئەو پیاوە بە تیرێك لێیدا، ئەویش نوێژەکەی نەبڕی، تاکو سێ تیری تری لێدا، ئەویش وازی لە نوێژەکەی نەهێنا تاکو سەلامی دایەوە و، ئینجا هاوڕێکەی ئاگادار کردەوە، ئەویش وتی: پاکی بۆ خوای گەورە ئەی بۆچی ئاگادارت نەکردمەوە، وتی: لە سورەتێك بووم دەمخوێندەوە، حەزم نەکرد بیبڕم، بەڵام کاتێك تیرەکانی تری تێ هاویشتم، کڕنووشم برد و ئاگادارم کردیتەوە، سوێند بە خوا، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکردووم ئەم جێگایە بپارێزم هەناسەم دەبڕا و ئەو سورەتەم نەدەبڕی،[1] لەم ڕووداوەیش دەتوانین هەندێ پەند و وانە وەربگرین:

أ- گرنگیدانی پێغەمبەر(ﷺ) بە سەلامەتی سەربازەکانی، کاتێك دوو کەسی لە چاکترین هاوەڵان هەڵبژاردووە بۆ پاراستنیان بە شەو.

ب-دابەشکردنی پاسەوانێتی و تێبینی دەکەین کە ئەو دوو پیاوە کە پاسەوانێتیان پێ سپێردرابوو شەویان کردبووە دوو بەشەوە، چونکە سەرباز پێویستە هەندێك پشوو بدات.

ج- پەیوەست بوونیان بە قورئان خوێندنەوە، خۆشەویستی ئەو هاوەڵە بۆ قورئان وای لێ کردبوو ئازاری تیرەکانی لەبیر بچێتەوە کە دەچەقێتە لاشەیدا.[2]

د- هەستکردن بە لێپرسراوێتی پاسەوانێتی: عەبباد نوێژەکەی نەبڕیبەهۆی ئازاری تیرەکانەوە، بەڵکو بە هۆی هەست کردن بەو لێپرسراوێتییەی پێی سپێردرابوو، ئەمەیش وانەیەکی گرنگە لە چەمکی خوا پەرستندا.

هـ- ئیستراتریژیەتی جێگای پاسەوانێتی: پێغەمبەر(ﷺ) سەرەتای ڕچە ڕێگە شاخاوییەکەی هەڵبژارد بۆ پاسەوانێتی، چونکە لەو جێگەوە پێشبینی دەکرا هێرش بکرێتە سەر موسڵمانان.

و- نزیکی جێگای خەوتنی پاسەوانەکان لەو پاسەوانەوە، بۆیە توانی کەسە

---

١ بڕوانە: السير: في ضوء المصادر الاصلية (٤٢٧).

٢ بڕوانە: غزوة الاحزاب لأبي فارس (٣٠-٣١).

خەوتووەکە بێدارکاتەوە، خۆ ئەگەر دوور بوایە لێیەوە مەترسی ڕوودانی کاری ترسناك دەکرا.[١]

## سێیەم: ئەبەردیی پێغەمبەر(ﷺ) و مامەڵەکردنی لەگەڵ جابیری کوڕی عەبدولا.

### ١- ئەبەردی پێغەمبەر(ﷺ):

پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتی گەڕانەوەی لە غەزای(ذات الرقاع) کاروانێکی پێگەیشت لە دۆڵێکی پڕ لە دار و درەخت، هاوەڵان بڵاوەیان کرد و، پێغەمبەریش(ﷺ) لە سێبەری دارێکدا شمشێرەکەی هەڵواسی، جابیر دەڵێت:(ئێمە خەوتین، پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کردین و ڕۆیشتین عەرەبێکی بیابانشینی لا دانیشتبوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: من خەوتبووم، ئەم پیاوە شمشێرەکەی هەڵکێشام، بە ڕووتی بە دەستیەوە بوو، پێی وتم: کێ بەرگریت لێ دەکات بەرامبەر من؟ منیش پێم وت: خوا، ئەوەتا خۆیشی دانیشتووە لە لامدا، پێغەمبەر(ﷺ) سزای ئەو پیاوەی نەدا، ناوی ئەو کابرایەیش غەورەسی کوڕی حاریس بوو).[٢] ئەم غەورەسە پەیمانی بە پێغەمبەر(ﷺ)دا هەرگیز شەڕی لەگەڵ نەکات و لەگەڵ کەسانێکیش نەبێت شەڕی لەگەڵ بکەن، ئەویش وازی لێ هێنا، کاتێك گەڕایەوە لای کەس و کارەکانی وتی: لە لای چاکترین کەسەوە گەڕاومەتەوە بۆ لاتان،[٣] ئەم بەسەرهاتەیش بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرایەتی موحەممەد(ﷺ) و ئازایی لە ڕادە بەدەری، هەروەها ئەوەی لێ وەردەگیرێت کە بڵاوەکردنی سەربازەکان کارێکی ڕێگە پێدراوە ئەگەر جێگاکە مەترسی تێدا نەبێت.[٤] ئەم بەسەرهاتە جێگیرە و ڕاستە و، چاودێری گەورەی خوای گەورە ئاشکرا دەکات بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و زیاتر بەرچاومان ڕوون دەکاتەوە بە مەزنی ئەو پێغەمبەرە(ﷺ)، ئینجا دەتوانی هەست بکەیت بە

١ بڕوانە: غزوة الاحزاب لأبي فارس (٣٢).
٢ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٤٢٦).
٣ هەمان سەرچاوە (٤٢٧).
٤ بڕوانە: فتح الباري (١٥/٣١٧)نقلا عن السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٤٢٧).

لەخۆدەرچوونی ئەو پیاوە عەرەبە کاتێك دەڵێت: کێ بەرگریت لێ دەکات لە بەرامبەرم، ئەبێ چی بێت ئەو ڕێگرەی ئەو پیاوەی بەستەوە لەوەی هیچ زیانێك بە پێغەمبەر(ﷺ) بگەیەنێت، هیچی تر نییە لە چاودێری خوای گەورە زیاتر، ئەوەش بەس بوو بۆ ئەوەی دڵی ئەو بتپەرستە پڕ بکات لە ترس و بیم و شمشێرەکە لە دەستی بکەوێتە خوارەوە، ئەوەی کە ڕوویدا بەڵگە بوو لەسەر ڕاستێتی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥۚ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾(المائدة: ٦٧).

**٢- مامەڵەکردنی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ جابیری کوڕی عەبدوڵا:**

جابیری کوڕی عەبدوڵا(ﷺ) دەفەرموێت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەرچووم بۆ غەزای(ذات الرقاع) بەسەر وشترێکی لاوازەوە، لە کاتی گەڕانەوە هەر دوادەکەوتم، تاکو پێغەمبەر(ﷺ) پێم گەیشت و فەرمووی: چیتە ئەی جابیر؟ دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم وشترەم دوای خستم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بیهێنە بە چۆکدا، منیش وامکرد و، پێغەمبەر(ﷺ)یش وشترەکەی هێنا بە چۆکدا، ئینجا فەرمووی: ئەو دارەی دەستت بدە بە من، یان چڵە دارێکم بۆ ببڕە، دەڵێت: منیش وامکرد، دەڵێت: چەند جارێك پێغەمبەر(ﷺ) ئەو دارەی پیا چەقاند، ئینجا فەرمووی: سواربە، منیش سوار بووم و سوێند بە خوا پێشی وشترەکەی پێغەمبەر(ﷺ)ی دایەوە ئەوەندە خێرا بوویەوە.

لەم بەسەرهاتە دیمەنێکی جوان و ئاکارێکی بەرزی پێغەمبەر(ﷺ) دەردەکەوێت لەگەڵ هاوەڵانی، لە ڕووی قسەی نەرم و خۆبە کەمزانین و گاڵتەکردن و خۆشەویستی بۆ هاوەڵانی و پرسیارکردنی کاروباریان.

## باسی پێنجەم: غەزای بەدری کاتی دیاری کراو و( دومة الجندل ).

### یەکەم: غەزای بەدری کاتی دیاریکراو.

وەکو جێبەجێ کردنێك بۆ ئەو پەیمانەی ئەبو سوفیان پێشنیاری کرد لە پاش جەنگی بەدر، پێغەمبەر(ﷺ) وابەستەی ئەو بەڵێنە بوو، لەسەر سوپایەکەوە کە پێکهاتبوو لە هەزار و پێنج سەد کەس دەرچوو بۆ شوێنی دیاریکراو لە ساڵی چواری کۆچی، بەیداخی شەڕیش بە دەستی عەلی یەوە بوو(ﷺ)، لە پاش هەشت رۆژ چاوەڕوانکردن ئەوان نەهاتن، ئەگەرچی ئەبو سوفیان سوپایەکیشی کۆکردبوویەوە لە دوو هەزار جەنگاوەر، گەیشتبوونە نزیکی جێگایەك(ظهران)ی پێ دەوترێت، بەڵام ئەبو سوفیان سوپاکەی گەڕاندەوە بۆ مەککە،[١] پاش ئەوەی کە پێی وتن: ئەم ساڵ ساڵێکی وشك و نەهاتە و باشتر وایە بگەڕێینەوە بۆ مەککە.[٢]

ئەم دەرچوونەی پێغەمبەر(ﷺ) بەهێزبوونی موسڵمانانی پیشان دەدا و، ترسی دەخستە دڵی دوژمنانیانەوە،[٣] جموجۆڵی سوپای ئیسلامی لە مەدینەوە تاکو بەدر مانۆڕێکی سەرکەوتوو بوو، بەڵگەیەکی بەهێزیش بوو بۆ دوژمنانی ئیسلام لە ناوخۆو دەرەوەی مەدینە کە ئیسلام بووەتە هێزێکی ئەژماربۆکراو لە دوورگەی عەرەب. لە ڕووی زۆری ژمارە و پتەوی ڕێکخستنی و چاکی خۆ پڕ چەك کردن، تەنانەت ئەبو سوفیان پاشگەز بوویەوە لەو پەیمان و بەڵێنەی کە خۆی دەستنیشانی کردبوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سوپای ئیسلامی.[٤]

هەڵمەتی ڕاگەیاندنیش کە بتپەرستان پێی هەڵسابوون بەسەر خۆیاندا شکایەوەو ، بوونە مایەی گاڵتەجاڕی عەرەبەکان، هەروەها جێگیریش بوو لە لای خەڵکی کە ئەو زیانانەی تووشی موسڵمانان بوو لە ئوحود شکست و لاوازی سەربازی

---

١ بڕوانە: نضرة النعيم (١/٣١٨-٣١٩).

٢ بڕوانە: غزوة الاحزاب محمد احمد باشميل (٨٨).

٣ بڕوانە: من معين السيرة للشامي (٢٦٤-٢٦٥).

٤ غزوة الاحزاب محمد باشميل (٨٨-٨٩).

ناگەیەنێت،[١] بۆیە ئەم غەزایە ناوبانگی سەربازی موسڵمانانی پاراستو لە وەرزی بازرگانی بەدریش بەشداریان کرد و بە شێوەیەکی باش قازانجیان دەستکەوت.[٢]

**دووەم: (دومة الجندل).**

ئەم غەزایەیش بۆ جێگیرکردنی کۆڵەکەکانی دەوڵەتی ئیسلامی بوو، ئەمجارەیان سوپای ئیسلامی بە سەرکردایەتی پێغەمبەر(ﷺ) بەڕێکەوتن بەرەو(قضاعة) کە لە باکووری هۆزەکانی ئەسەد و غەتەفان بوون و، لە سنوورەکانی غەساسینەکان کە هاوپەیمانی دەوڵەتی ڕۆمییەکان بوون و سەرپەرشتی بازاڕی دەومەتولجەندەلیان دەکرد کە دەکەوتە(٤٥٠)کم لە باکووری مەدینە، ئەم هۆزە یەکەمین هۆز بوو پێغەمبەر(ﷺ) غەزای کردن کە بە غەزای(دومة الجندل) ناسرا،(ربيع الاول ٥ك – اغسطس ٦٢٦ز) چونکە هەواڵ گەیشتبووە موسڵمانان کە هەندێ لە هۆزەکان لەوێ کۆبوونەتەوە بۆ هێرش کردنە سەر ئەو کاروانانەی پێیاندا تێدەپەڕێت، هەروەها هەواڵەکان ئەوەیان ڕادەگەیاند کە ئەوانە بیر لەوە دەکەنەوە لە مەدینە نزیک ببنەوە بۆ هێرش کردنە سەریدا.[٣]

لە ڕاستیدا(دومة الجندل) جێگایەکی دوور بوو لە مەدینە و دەکەوتە سەر سنووری نێوان حیجاز و شام، لە ناوەڕاستی ڕێگایش بوو لە نێوان دەریای سوور و کەنداوی عەرەب، ڕێکردنی شانزە شەویش دوور بوو لە مەدینەوە، خۆ ئەگەر موسڵمانان خۆیان لەو کۆبوونەوەیش بێ ئاگا بکردایە کەس لۆمەی نەدەکردن، دیدی سیاسی دووربین و ئەقڵیەتی سەربازی ئەوەی سەپاندە سەر موسڵماناندا کە جموجۆڵ بکەن بۆ پەرتەوازەکردنی ئەو کۆمەڵانە، هەروەها بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجانە:

١- بێدەنگی لەو کۆبوونەوە دەبووە مایەی لاوازبوونی هێزی موسڵمانان و لەکەداربوونی شکۆمەندییان.

---

١ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٦/٦٦).

٢ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٦/٦٧).

٣ بڕوانە: تاملات في سيرة الرسول لمحمد الوكيل (١٦٩).

٢- بوونی ئەو کۆمەڵانە لە ڕێگای شام کاریگەری دەبێت لەسەر باروودۆخی ئابووری موسڵمانان و، کاروانەکانیان تووشی زیان و مەترسی دەبوون و پەشێوی ئابووری دروست دەکرد.

٣- مەسەلەیەکی گرنگیش هەبوو ئەویش سەپاندنی دەسەلاتی موسڵمانان بوو لەسەر هەموو ئەو ناوچەیە، بۆ ئەوەی خەڵکی وا هەست بکەن لە ژێر پارێزگاری دەوڵەتی ئیسلامیدان و ئەوان بازرگانییەکانیان بۆ دەپارێزن.[1]

٤- بێ بەش کردنی قورەیش لە هەر هاوپەیمانیەکی بازرگانی کە بۆیان ببێتە یارمەتیدەر و دوورخستنەوەیان لەو ناوچەیە، چونکە دەرکەوتنی دەوڵەتی بەم شێوە بەهێزە کاریگەری دەکاتە سەر دەروونی قورەیش و ورەیان لاواز دەکات.[2]

٥- سوور بوون لەسەر لابردنی ئەو ترسەی لە لای عەرەب بوو، کە خەونیان دەبینی بە ڕووبەڕووبوونەوەی ڕۆمەکان و، هەروەها جەختکردنەوە لەسەر جیهانێتی ئایینی ئیسلام، زۆریش لە مێژوونووسان پێیان وایە کە ئامانج لەو غەزایە ترساندنی ڕۆمەکان بووە کە تەنها ماوەی پێنج شەو دوور بوون لەو جێگایەی موسڵمانان غەزایان کرد.

هەر بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) هانی موسڵمانانی دەدا بۆ دەرچوون و بە هەزار کەس لە هاوەڵانەوە دەرچوو، بە شەویش ڕێیان دەکرد، بۆ ئەوەی بە ڕۆژ ئاراستەی ڕێکردنیان نەزانرێت.[3]

چاوساغێکیشی دیاری کرد لە(بني عذرة)(مذکور)ی پێ دەوترا، بەڵام کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) نزیکیان بوویەوە هەڵهاتن و مەڕ و ماڵاتەکانیان بۆ موسڵمانان بەجێ هێشت و پیاوێکیشیان لێیان بە دیل گرت و، هێنایانە لای پێغەمبەر(ﷺ) و پرسیاری خەڵکەکەی لێ کرد و ئەویش وتی: هەڵهاتن و ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ئیسلامی بۆ پێشنیار کرد و ئەویش موسڵمان بوو، لە پاش مانەوەی چەند ڕۆژێك موسڵمانان گەڕانەوە بۆ مەدینە، لە کاتی گەڕانەوەشیان پێغەمبەر(ﷺ) گرێبەستی

---

١ بڕوانە: تأملات في سيرة الرسول (١٦٩).

٢ بڕوانە: دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة للشجاع (١٤٤-١٤٥).

٣ بڕوانە: غزوة الاحزاب لأبي فارس (٤٠).

ئاشتی لەگەڵ(عيينة بن حصن الفذاري) ئەنجام دا، ئینجا عویەینە داوای مۆڵەتی کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) کە وشتر و مەڕەکانی لە جێگایەك لە نزیك مەدینە بلەوەڕێنێ.

ئەمانەش کە باسکرا بەڵگەیە لەسەر ئەو ئاستە بەهێزەی موسڵمانان پێی گەیشتبوون لە ڕووی هەست کردن بە لێپرسراوێتی بەرامبەر دابینکردنی ژیانێکی بێ مەترسی بۆ خەڵکی ئەو ناوچەیە و، دەوڵەتێکی ئیسلامیش ئەوەندە بەهێزبووە کە کەس نەتوانێت دەستدرێژی بکاتە سەر و ئەگەر کەسێکیش بیتوانیبا(عیینة بن حصن) دەیتوانی کە کاتێك تووڕە دەبوو دە هەزار کەس لەگەڵی تووڕە دەبوون.[1]

ئینجا ئەم غەزایە وەکو ڕاگەیاندنێك بوو بۆ ئیسلام لە نێو دانیشتوانی ناوچەکانی باکوور و دەڤەری لای باشووری شام، لە ڕاستیشدا ئەوان هەستیان کرد بە هێز و دەسەڵاتی ئیسلام، وەکو چۆن قەیسەر و سوپاکەی هەیانە، جگە لەوەی کە ئەم غەزایە جۆرێکیش بوو لە ڕاهێنان بۆ سوپای ئیسلامی لەسەر ڕێکردن بۆ شوێنە دوورەکان و ئەو شوێنانەی کە پێشتر نەیانبینیوو، بۆیە ئەم غەزایە بە سەرەتای فتوحاتی ئیسلامی بۆ ئاسیا و ئەفریقیا دێتە ئەژمار.[2] پلانی پێغەمبەر(ﷺ) لەم غەزایە ئامانجی زۆری لەبەرچاو گرتبوو، چونکە بریتی بوو لە جەنگێکی پەی پێ بردن بۆ دوورگەی عەرەب و، شارەزابوون لە ناوەندی هێزەکان تیایدا، ئینجا جەنگێکی ڕاگەیاندنیش بوو لە پاش کات و شوێنی دیاریکراو لە بەدر، هەروەها جەنگێکی سەربازیش بوو چونکە ئامانجی بەرپەرچدانەوەی هێرشێکی چاوەڕوانکراوی تیادابوو لە دژ موسڵمانان، بێجگە لەوەی کە جەنگێکی سیاسیش بوو، مەبەستی لەناوبردنی جموجۆڵی هۆزەکانی لەخۆ دەگرت لە دژی مەدینە.[3]

ئینجا ئەم غەزایە خولی پەروەردەیی بوو لە ئەوپەڕی توندی و گشتگیریدا پێغەمبەر(ﷺ) سەرکردایەتی دەکرد لەگەڵ هەزار کەس لە هاوەڵانی، کە تیایدا فێری چەندین وانەی گرنگ دەبن لە ڕووی سەربازی و شەرعی و برایەتی و

١ بڕوانە: تاملات في سيرة الرسول (١٧٠).
٢ بڕوانە: السيرة النبوية لأبي شهبة (٢٥١-٢٥٢).
٣ بڕوانە: التربية القيادية (٣/٣٧٢).

توانەوەیان لە یەك بۆتە لە دەرەوەی چوارچێوەی هۆز و عەشیرەت، چونکە زۆرێك لە ڕۆڵەکانی هۆزەکانی دەوروبەر بەرەو مەدینە دەهاتن لە بۆتەی خۆشەویستی بۆ خوا و پێغەمبەر(ﷺ) دەتوانەوە هەروەها ئەم غەزایە هەلێك بوو بۆ ناسینی کەسە لاوازەکان و هەر کەسێك پەیوەندی لەگەڵ سەربازگەی مونافیقەکاندا هەبێت و چەندین وانەی تریشی تیادا بوو.

لە ڕاستیدا جەنگێکی کپ بوو(دومة الجندل)، جۆرێکیش بوو لە ئامادەکاری بۆ داهاتوو، پێغەمبەر(ﷺ) لە ماوەی دەرچوونی لە مەدینە هەڵسا بە دانانی(سباع بن عرفطة) وەکو والی لەسەر مەدینە لە ئەزموونێکی تازەدا، چونکە ئەو نە ئەوسی و نە خەزرەجی و نە قورەیشی بوو، بەڵکو لە هۆزی غیفار بوو، کە بە دزی حاجیان دەناسران ئەو هۆزە، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر مەزنی ڕێبازی پێغەمبەر(ﷺ) لە پەروەردەکردنی ئوممەت، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دڵنیا بوو لە لێهاتوویی سیباع و توانای لەسەر بەڕێوەبردن.[١]

---

١ هەمان سەرچاوە (٣/٣٧٤).

## باسی شەشەم: غەزای(بني المصطلق).

### یەکەم:(بنو المصطلق) کێن و کەی ئەم غەزایە ڕوویدا و هۆکارەکانی چی بوون؟

**١-(بنو المصطلق):**

ئەوان تیرەیەکن لە هۆزی خوزاعە،(المصطلق)یش باپیرەیانە کە ناوی(جذیمة بن سعد بن عمرو بن ربیعة بن حارثة بن عمر بن عامر ماء السماء) بوو.[١]

**٢- مێژووی غەزاکە:**

لەو بارەوە زانایان هەندێ جیاوازییان تیادایە، کۆمەڵێك پێیان وایە لە شەعبانی ساڵی پێنجەمی کۆچیدا بووە، لەوانە(موسى بن عقبة) و(ابن سعد) و(ابن قتیبة) و(البلاذري) و(الذهبي) و(ابن القیم) و(ابن حجر العسقلاني) و(ابن کثیر) ڕەحمەتی خوایان لێ بێت، لە هاوچەرخەکانیش(الخضري بك) و(الغزالي) و(البوطي) مردنی سەعدی کوڕی موعاز لە پاش غەزای(بني قریظة) بوو، کە ئەو غەزایە لە(ذي القعدة)ی ساڵی پێنجەمی کۆچیدا بوو لەسەر بۆچوونی پەسەند، بۆیە لەم حاڵەتە غەزای(بني المصطلق) لە پێش ئەوە بووە.[٢]

**٣- هۆکارەکانی ئەم غەزایە:**

گرنگترین هۆکارەکانی بریتی بوون لە:

أ- پشتگیری کردنی ئەم هۆزە بۆ قورەیش و بەشداری کردنیان لە جەنگی ئوحود.

ب- زاڵبوونی ئەم هۆزە بەسەر هێڵی سەرەکی بۆ مەککە، بۆیە بەربەستێکی بەهێز بوون لە پێش موسڵمانان‌اندا بەرەو مەککە.[٣]

ج- پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی پێگەیشت کە ئەوان هێز کۆدەکەنەوە بۆ شەڕی

---

١ بڕوانە: حديث القران الكريم عن غزوات الرسول (٣١١/١).
٢ بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مرويات غزوة بني المصطلق (٩٧).
٣ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية للعلي (٣٣٢).

موسڵمانان بە سەرکردایەتی(الحارث بن ابي ضرار)، بۆیە دەرچوون بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان و بە یەککەیشتن لەسەر ئاوێك(المرسیع)ی پێ دەوترێت لە ناوچەی قەدیدی لای ڕۆخی دەریا و شکستێکی گەورەیان پێ هێنان.[١]

**٤- ڕووداوەکانی(بني المصطلق):**

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بە جموجۆڵەکانی ئەوانی زانی هەڵسا بە ناردنی(بریدة بن الحصیب الاسلمي) بۆ دڵنیا بوون لە نیازیان، بورەیدەیش وای بۆ دەرخستن کە هاتووە بۆ یارمەتیدانیان و بۆیە هەواڵەکە تەواو دڵنیا بوو، لە ڕۆژی دوو شەممە لە دووی شەعبانی ساڵی پێنجەمی کۆچی پێغەمبەر(ﷺ) لە مەدینە دەرچوو، لەگەڵ حەوت سەد جەنگاوەر[٢] سی سوار[٣] بەرەو لای(بني المصطلق) ئینجا لەبەر ئەوەی ئەوان بانگەوازی ئیسلامیان پێ گەیشتبوو لە جەنگی ئوحودیش بەشداریان کردبوو، بۆیە وەکو لە بوخاری[٤] و موسلیمدا[٥] هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) لە ناکاو هێرشی کردە سەریان و جەنگاوەرەکانی کوشتن و ئافرەتەکانی بە کۆیلە گرت و جوەیرییەی کچی حارسیشیان تیادا بوو.[٦]

## دووەم: هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ جوەیرییەی کچی حاریس(رضي الله عنها):

پێغەمبەر(ﷺ) ئافرەتانی(بني المصطلق)ی دابەش کرد و جوەیرییەی کچی حاریسیش لە ناویاندا بوو، عائیشە(رضي الله عنها) بەسەرهاتەکەی دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: لە کاتی دابەشکردنی کۆیلەکان جوەیرییە کەوتە پشکی سابیتی کوڕی قەیسەوە، یان پشکی ئامۆزایەکی، ئینجا جوەیرییە(مکاتبة)ی لەگەڵدا دەکرد بۆ ئەوەی خۆی ئازاد بکات و هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەوەی یارمەتی بدات لەو

---

١ حديث القران الكريم عن غزوات الرسول (٣١٥/١).
٢ بڕوانە: تاريخ الاسلام، المغازي للذهبي (٢٥٩).
٣ بڕوانە: الواقدي (٤٥٠/١).
٤ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٤٣٢).
٥ مسلم، كتاب الجهاد والسير، باب (جواز الاغارة على الكفار) (١٣٥٦/٣) رقم (١٧٣٠).
٦ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٤٣٣).

بارەوە. وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من کچی سەرگەورەی هۆزەکەی خۆمم و ئەوەشم بەسەر هاتووە کە دەیبینی، کەوتوومەتە پشکی سابیتی کوڕی قەیس یان ئامۆزایەکییەوە و ڕێککەوتووم لەگەڵی کە بەرامبەر بڕێك پارە خۆم ئازاد بکەم و هاتووم یارمەتیم بدەیت.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: لەوە باشترت بۆ دەکەم.

وتی: چی ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: ئەو پارەت لە جیاتی دەدەم و مارەت دەکەم.

وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ڕازیم.

دەڵێت: هەواڵەکە بڵاوبوویەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) جوەیرییەی مارە کرد. ئیتر خەڵکەکە وتیان ئەمانە خەزورانی پێغەمبەر(ﷺ) و ئازادیان کردن دەڵێت: بە بۆنەی شووکردنی جوەیرییە سەد کەس لە(بني المصطلق) ئازادبوون، بۆیە ئافرەتم نەبینیووە ئەوەندە پیرۆز بێت لەسەر کەس و کارەکەی.[1] ئینجا(حارث بن ابي ضرار) ڕزگارانەی کچەکەی هێنا بۆ مەدینە لە پاش شەڕەکە و پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کرد بۆ موسڵمان بوون و ئەویش موسڵمان بوو.[2]

ئەم غەزایە زۆر ناوازە و پیرۆز بوو چونکە هۆزێك بە تەواوی لە پاشی موسڵمان بوون، ئەو ڕووداوەیش کە بووە هۆی موسڵمان بوونیان ئەوە بوو پاش مارەکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ جوەیرییە خەڵکی دیلەکانیان ئازاد کرد پاش ئەوەی کە بووبوونە خاوەنیان بە پێی دابەشکردنی جەنگەکە، چونکە بە لایانەوە ناشیرین بوو خەزورانی پێغەمبەر(ﷺ) لە لایان کۆیلە بن، بەرامبەر ئەم ئازادکردنە بە کۆمەڵەش هەموویان موسڵمان بوون.

هۆکاری ئەم کارەیش خۆشەویستی هاوەڵان بوو بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و ڕێزگرتنیان لە کەسایەتی پیرۆزی، لە ڕاستیدا هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ جوەیرییە واتای زۆری دەگەیاند، یەکێك لەوانە بوو بە هۆکاری موسڵمان بوونی هەموو کەس و

---

١ بڕوانە: البداية والنهاية (٤/١٦٠-١٦١).

٢ بڕوانە: حديث القران الكريم عن غزوات الرسول (١/٣١٧).

کارەکەی و، بوون بە یارمەتییەکی گەورەیش بۆ ئیسلام.[١]

جوەیرییە بوو بە خێزانی سەروەری پێغەمبەران و، دایکی ئیمانداران(رضي الله عنها) بووە زانایەك و خواناسێکی هۆشمەند و خۆشەویست بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، جوەیرییە(رضي الله عنها) فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ)ی دەگێڕایەوە سەرانی هاوەڵانیش لەویان دەگێڕایەوە و بڵاویان دەکردەوە، وەکو:(ابن عباس) و(عبيدة بن السباق) و(كريب مولى بن عباس) و(مجاهد) و(ابو ايوب يحيى بن مالك الازدي). فەرموودەکانیشی لە چەندین بابەتی شەریعەتدا بوونە و، ئەو جگە لە هاوسەرێتی پێغەمبەر(ﷺ) و دایکایەتی ئیمانداران، گەیەنەریش بووە بۆ زانست و حەوت فەرموودەی هەیە لە کتێبەکانی فەرموودەدا لە لای بوخاری و موسلیم و ئەوانی تر.[٢]

جوەیرییە هەمیشە خەریکی خوا پەرستی بوو، خۆی دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) لە لای دەرچوو، خەریکی نوێژکردن بوو، ئینجا چێشتەنگاو گەڕایەوە بینی هەر لە جێگاکەی خۆی خەریکی نوێژە، پێی فەرموو:((ما زلت على الحال التي فارقتك عليها))، واتە: تۆ هێشتا لەسەر ئەو حاڵەی کە بەجێم هێشتی؟ وتی: بەڵێ. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: من لە دوای تۆ چوار وشەم وت سێ جار بەرامبەر کارەکانی تۆ دەبێت لەو کاتەوە:((سبحان الله وبحمده عدد خلقه ورضى نفسه وزنة عرشه ومداد كلماته)).[٣]

جوەیرییە(رضي الله عنها) لە ساڵی پەنجای کۆچی، یان لە پەنجا و شەشی کۆچی لە دونیا دەرچوو.[٤]

---

١ بڕوانە: صور وعبر من الجهاد النبوي في المدينة (١٩٩-٢٠٠).

٢ دور المرأة في خدمة الحديث، لآمال قرداش (٨٨).

٣ مسلم، كتاب الذكر والدعاء، باب (تسبيح اول النهار) رقم (٢٧٢٦).

٤ بڕوانە: الطبقات لابن سعد (٨/١٢١)، خليفة بن خياط تاريخه (٢٣٤).

**سێیەم: هەوڵدانی مونافیقەکان لەم غەزایەدا بۆ ئاژاوە نانەوە لە نێوان موهاجیر و ئەنصارەکاندا.**

لە غەزای(بني المصطلق) ژمارەیەکی زۆر لە مونافیقەکان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوون کە پێشتر دوادەکەوتن، بەڵام ئەمجارە بە تەماعی دەستکەوتەوە دەرچوون[١] لەسەر ئاوی(المريسيع) مونافیقەکان کینەی دڵی خۆیان ئاشکرا کرد و هەوڵیان دا ئاژاوە بنێنەوە لە نێوان موهاجیر و ئەنصارەکاندا، ئینجا جەنگێکی دەروونیان بەرپاکرد لە رێگەی ئەو درۆ و بۆ هەڵبەستنەی کە دروستیان کرد، زەیدی کوڕی ئەرقەم — کە شایەت حاڵ بوو — ئەو رووداوە دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: گوێم لە عەبدوڵای کوڕی ئوبەی بوو دەیوت: هیچ خەرج مەکەنە سەر پێغەمبەری خوا تاکو بڵاوە دەکەن لە دەوروبەری، کە بشگەڕێینەوە، سەربەرز سەرشۆڕ دەردەکات، منیش ئەوەم بۆ سەعدی کوڕی عوبادەی مامم باسکرد، پێغەمبەر(ﷺ)یش ئەوانی بانگ کرد و ئەوانیش سوێندیان خوارد قسەی وایان نەکردووە و پێغەمبەر(ﷺ) منی بە درۆوە خست و باوەڕی بە ئەوان کرد، منیش زۆر خەمبار بووم و لە ماڵ دانیشتم، ئینجا مامەم پێی وتم: خوای گەورە ئایەتی دابەزاندووە: ﴿إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ﴾(المنافقون: ١). ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) بە زەیدی وت: خوای گەورە باوەڕی پێت ئەکرد ئەی زەید.[٢]

ئینجا لە پاش هەوڵێکی تری مونافیقەکان بۆ ئاشووبە نانەوە لە نێوان موهاجیر و ئەنصارەکان و هەرەسیان تیا هێنا، پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاری گەڕانەوەی دا بۆ مەدینە لە کاتێکدا پێشتر لەو جۆرە کاتە جموجۆڵی نەدەکرد، ئیتر(اسيد بن حضير) هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و لێی پرسی بۆچی لەم کاتە بەڕێدەکەویت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی نازانیت عەبدوڵای کوڕی ئوبەی چی وتووە، دەڵێت کە بگەڕێینەوە مەدینە سەربەرزمان سەرشۆڕ دەردەکات، ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ سەربەرزی و دەتوانی ئەو دەربکەیت چونکە ئەو سەرشۆڕە.

---

١ بڕوانە: حديث القران الكريم (٣١٧/١).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٤٠٨/٢).

ئینجا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، چاوپۆشی لێ بکە، سوێند بە خوا، خوای گەورە تۆی بۆ ئێمە هێنا، کەس و کارەکەی خەریك بوون مورووی تاجەکەیان ڕێکدەخست بۆ سەرۆکایەتی.

ئەو ڕۆژ و شەوە ڕێیان کرد و هەندێ لە ڕۆژی دووەمیش تاکو خۆر گەرم بوو، خەڵکەکەیش لایاندا و خەوتن، پێغەمبەر(ﷺ) ئەو کارەی کرد بۆ ئەوەی قسە و باسەکەی دوێنێیان لەبیر بچێت، ئینجا سورەتی(المنافقون) دابەزی، پێغەمبەر(ﷺ) کردی بە گوێی زەیدی کوڕی ئەرقەم و فەرمووی: ئەم گوێیە بوو خوای گەورە بەو قسانەی بیستی ئایەتی دابەزاند.[١]

لەم ڕووداوەیشدا هەندێ پەند و وانە وەردەگرین:

**١- پاراستنی ناوبانگی سیاسی و یەکڕیزی ناوخۆیی:**

ئەم وانە لە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) دەردەکەوێت بۆ عومەر(ﷺ):((فکیف یا عمر اذا تحدث الناس ان محمداً یقتل اصحابه))،[٢] واتە: چۆن بێت ئەی عومەر ئەگەر خەڵکی باس لەمە بکەن موحەممەج هاوەڵانی خۆی دەکوژێت ئەوە ئەوپەڕی پارێزکاری کردنە لە ناوبانگی سیاسی، جیاوازیش زۆرە لە نێوان ئەوەی خەڵکی باسی خۆشەویستی هاوەڵانی موحەممەد بکەن بۆ موحەممەد و، لەگەڵ ئەوەی باس لەوە بکەن موحەممەد هاوەڵانی خۆی دەکوژێت، بێگومان ئەوە دەبێتە هەوڵدانێکی زۆریش بۆ چوونە ناو ڕیزی ناوخۆوە لە مەدینە، لە کاتێکدا ئەوان ئێستا دەستەوسانن چییان پێ بکرێت بەرامبەر ئەو خۆشەویستی و فداکارییە.[٣]

بەرامبەر هەوڵی مونافیقەکان بۆ پەرتەوازەکردنی ڕیزی موسڵمانان، پێغەمبەر(ﷺ) ڕانەوەستا بەڵکو هەندێ هەنگاوی باشی نا:

أ- ئەو ڕۆژە پێغەمبەر(ﷺ) خەڵکی بەڕێخست تاکو ئێوارە و شەویش تاکو بەیانی، ڕۆژی دووەمیش تاکو خۆر گەرم بوو، ئەمجار خەڵکەکەی ڕاگرت و، خەڵکی

---

١ بڕوانە: السیرة النبویة لابن هشام (٣/٢١٩-٢٢٠).
٢ بڕوانە: السیرة النبویة الصحیحة (٢/٤٠٩).
٣ بڕوانە: التربیة القیادیة (٣/٤٦٣).

خەویان لێکەوت.[١]

ب- پێغەمبەر(ﷺ) ڕووبەڕووی پیلانەکانی ئیبنو سولول نەبوویەوە بە چەك، چونکە سوور بوو لەسەر یەکڕیزی موسڵمانان، ئینجا ئەو شوێنکەوتووی زۆری هەبوو، لەوانەشە ئەگەر زیانێکی پێ بگەیشتایە کەسانێك هەڵسایەن بۆ پشتگیریکردنی، ئەو کاتەش شتێك ڕووی دەدا لە بەرژەوەندی ئیسلامدا نەبوو، ئەوەش سیاسەتێکی شەرعی بوو لە پێغەمبەر(ﷺ)،[٢] ئەو لێهاتووییە لە حیکمەت و سیاسەت و بەڕێوەبردنی کارەکان هەڵقوڵاوی پێغەمبەرایەتی موحەممەد بوو(ﷺ)،[٣] بۆ ئەوەی ئوممەت شوێن پێی پێغەمبەرەکەیان هەڵگرن.

لێبوردەیی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ سەری مونافیقەکاندا شوێنەواری گەورەی هەبوو، چونکە پاش ئەوە ئەگەر ئیبنو ئوبەی کارێکی ئەنجام بدایە کەس و کارەکەی خۆیان سەرزەنشتیان دەکرد و پێشنیاری کوشتنیان دەکردە سەر پێغەمبەری خوا(ﷺ)، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) هەر ڕازی نەدەبوو، دواتریش بە عومەری فەرموو: ئێستا پێت چۆنە ئەی عومەر؟ سوێند بە خوا ئەگەر لەو ڕۆژەی پێت وتم بمکوشتایە کەسانێك لەسەری بە دەنگ دەهاتن، ئەگەر ئەمڕۆ فەرمانیان پێ بکەیت خۆیان دەیکوژن، عومەر وتی: بەڵێ بە خوا دەزانم فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرمانی من پیرۆزترە.[٤]

**٢- بەڵکو نەرم دەبین لەگەڵی و مامەڵەی جوانی بەرامبەر دەکەین تاکو لەگەڵمان بێت:**

ئیبنو سەلول کوڕێکی ئیمانداری دڵسۆزی هەبوو ناوی عەبدوڵڵا بوو، کاتێك ئاگادار بوویەوە لە ڕووداوەکان و دابەزینی سورەتەکە هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پێم گەیشتووە کە دەتەوێت ئیبنو سولول بکوژیت بە هۆی ئەوەی پێت گەیشتووە دەربارەی، ئەگەر بە نیازی بیکوژیت فەرمانم پێ

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لأبي شهبة (٢/٢٥٥).

٢ بڕوانە: صور وعبر من الجهاد النبوي في المدينة (٢٠٢).

٣ بڕوانە: فقه السيرة النبوية للبوطي (٤٠٩).

٤ بڕوانە: السيرة النبوية لأبي شهبة (٢/٢٥٧).

بکە خۆم دەیکوژم و سەریت بۆ دەهێنم، سوێند بە خوا هەموو خەزرەج دەزانن کەس نەبووە لە من چاکەکارتر بۆ باوکی، ئینجا من ترسم هەیە فەرمان بە کەسێك بکەیت بیکوژێت و، منیش توانام نەبێت تەماشای بکوژی باوکم بکەم بە نێو خەڵکیدا ڕێ بکات و بیکوژم، ئەو کاتەش پیاوێکی ئیماندارم کوشتووە بە پیاوێکی بێ ئیمان و دەچمە دۆزەخەوە، ئەو کاتە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵکو نەرم و نیان دەبین لەگەڵی و هاوەڵی چاك دەبین بۆی تاکو لەگەڵمان بێت،[1] کاتێکیش موسڵمانان گەیشتنە نزیك مەدینە عەبدوڵڵا بە باوکی وت: ڕاوەستە، سوێند بە خوا ناچیتە ناو مەدینە تاکو پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێگەت پێ نەدا، ئیتر پێغەمبەریش(ﷺ) ڕێگەی پێدا.[2]

**٣- نموونەی بەرز لە ئیماندا:**

ئەو نموونەیە عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بەرجەستەی کرد، کاتێك دڵسۆزی و خۆشەویستی بۆ خوا و پێغەمبەر(ﷺ) پەسەند کردە سەر خۆشەویستی باوکیدا، ئەو بەرزترین نموونە بوو کاتێك قوربانی دا بە سۆزی باوکایەتی، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) بە ڕەوشتێکی بەرز و دڵێکی گەورەوە وەڵامی دایەوە بەو هەڵوێستەی جوانەی دەربڕی بەرامبەری، بە ڕاستی ئەوە مەزنی پێغەمبەرایەتییە.[3]

**٤- دژایەتی کردنی دەمارگیری نەفامانە:**

ئەو دەمارگیرییە کە بە نەفامانە ناودەبرێت تەنها بریتی نییە لە دەمارگیری هۆزایەتی، بەڵکو لە هەر واتایەکی تر کە کەسەکان لەسەر بنچینەی یەك بگرن و دەمارگیری بکەن، لەو غەزایەدا کاتێك پیاوێك لە موهاجیرەکان لە پیاوێکی ئەنصاڕی دا، ئەنصارییەکە وتی: هاوار لە ئەنصارەکان و، موهاجیرەکەش وتی هاوار لە موهاجیرەکان، جا پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك گوێی لەو قسانە بوو فەرمووی:((دعوها

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٣٢١).
٢ بڕوانە: الولاء والبراء في الاسلام (٢٠٩) للقحطاني.
٣ السيرة النبوية لأبي شهبة (٢/٢٥٧).

فانها منتنة))،[1] واتە: وازی لێ بهێنن بۆگەنە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ئەو هاوار لە دژ یەکتر کردنەی بە کارێکی نەفامانە ژمارد، خۆ ئەگەر هەر پێویست بوو داوای یارمەتی بکردایە پێویستە هەردوو لایان داوای یارمەتیان لە موسڵمانان بکردایە، بۆیە پێویستە لەسەر بانگخوازان جەخت بکەنەوە لەسەر فڕەدانی دەمارگیری بە هەموو شێوەکانی و، خۆشەویستی و پشت یەکتر گرتنیش تەنها لەسەر بنچینەی برایەتی ئیسلامی بێت وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾(الحجرات: ١٠). کۆمەك کردنی یەکتریش لەسەر بناغەی هەق و ڕاستی بێت و پشتگیری کەسی دەستدرێژکەر نەکرێت هەر کەسێك بێت.

چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ڕوونی کردەوە دەمارگیری کارێکی نەفامانەیە و بڕیاریشی داوە کە موسڵمان پێویستە پشتگیری براکەی بکات بەڵام ئەگەر هەڵوێستەکەی ڕەوا نەبوو لە دژی ڕاوەستێ و دەستی بگرێت، بەم شێوەیەش ئەو واتا نەفامانەی پووچەڵ کردەوە کە دەیانوت: لە هەق و ناهەقدا براکەت سەربخە.

## چوارەم: ئاراستەکردنی قورئانی پیرۆز بۆ موسڵمانان لە پاش غەزای(بني المصطلق).

سورەتی(المنافقون) دوابەدوای ئەو غەزایە دابەزی، لەو کاتەی موسڵمانان دەگەڕانەوە بۆ مەدینە، بە بەڵگەی ئەو ڕیوایەتەی پێشەوا(الترمذي):(فلما اصبحنا قرأ رسول الله(ﷺ) سورة المنافقون)،[2] واتە: کاتێك ڕۆژمان لێ بوویەوە پێغەمبەر(ﷺ) سورەتی(المنافقون)ی خوێندەوە. ئەم سورەتە بە تێر و تەسەل باسی ئەو دوو ڕووانەی کرد و ئاماژەشیدا بە هەندێك ڕووداوو لە کۆتاییشدا ئیماندارانی وریاکردووە لە خۆسەرقاڵکردن بە خۆشی و ڕابواردنی دونیا و هانی موسڵمانانی دا ماڵ ببەخشن لە پێناو خوادا.

---

١ السيرة النبوية الصحيحة (٢/٢٠٩).

٢ بڕوانە: سنن الترمذي، كتاب تفسير القران، باب (ومن سورة المنافقون) (٥/٤١٥).

لێکۆڵەرەوەش دەتوانێت تێبینی چەند تەوەرێك بکات لە سورەتەکەدا:

١- سەرەتای سورەتەکە باسی ڕەوشتی مونافیقەکان دەکات و پەردە لەسەر درۆکانیان هەڵدەماڵێت بە باسکردنی سیفەتەکانیان وەکو: درۆکانیان لە بانگەشەکردنی ئیمان و، سوێند خواردنیان بە درۆ و، ترسنۆکی و پیلان گێڕانیان لە دژی پێغەمبەر(ﷺ)،[1] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُوا۟ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ۝١ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَيْمَٰنَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ۝٢ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ۝٣ ۞ وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ ۖ وَإِن يَقُولُوا۟ تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ ۖ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ ۖ يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ ۚ هُمُ ٱلْعَدُوُّ فَٱحْذَرْهُمْ ۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ ۖ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ﴾(المنافقون: ١-٤).

٢- ئینجا ئایەتەکە سەرکەشی و سووربوونی ئەوانی لەسەر ناهەقی خۆیان دەرخست، وتە نابەجێکانیشیانی بە شێکراوەیی باسکرد، بە تایبەت ئەوەی کە لە غەزای(بني المصطلق)دا دەیانوت، گوایە پێغەمبەر(ﷺ) و ئیمانداران لە مەدینە دەرئەکەن.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ لَوَّوْا۟ رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ۝٥ سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ۝٦ هُمُ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُوا۟ عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّوا۟ ۗ وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ ۝٧ يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ ۚ وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا

---

[1] بڕوانە: حديث القران الكريم عن غزوات الرسول (٣٢٧/١)، التفسير المنير، د. وهبة الزحيلي (٢٣٠/٢٨ - ٢٣١).

يَعۡلَمُونَ﴾(المنافقون: ٥-٨).

بەم شێوە کۆمەڵگەی مەدینە بە ڕووداوەکان پەروەردە دەبوو، قورئانیش ئاراستە و فێریانی دەکرد، پێغەمبەری خوایش(ﷺ)سەرپەرشتی دەکرد.

## پێنجەم: هەوڵی مونافیقەکان بۆ تانە و تەشەرلێدانی پێغەمبەر(ﷺ).

لە ڕێگەی درۆ و دەلەسە هەڵبەستن بۆ خاتوو عائیشە(رضي الله عنها): مونافیقەکان لەم غەزایەدا هەڵسان بە هەڵبەستنی ڕووداوی(الافك)، پاش ئەوەی سەرکەوتوو نەبوون لە وروژاندنی دەمارگیری نەفامانە، ئەو ڕووداوە ناخۆش و کارەساتە گەورەیان هێنا بەسەر پێغەمبەر(ﷺ) و خاوخێزانەکەی.

هەموو مێژوونووسان[1] و لێکدەرەوانی قورئان[2] و فەرموودەناسان[3] لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ئەم ڕووداوە لە غەزای(بني المصطلق) ڕوویداوە.

بوخاری و موسلیم یش ڕووداوی(الافك)یان لە صەحیحەکەیاندا گێڕاوەتەوە، ئەمەیش شێوازی باسکردنەکەی بوخارییە:

عائیشە(رضي الله عنها) دەفەرمووێت کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) دەرچووبایە تیر و پشکی دەکرد لە نێوان خێزانەکانیدا، کامیان ناوی دەرچووبایە لەگەڵ خۆی دەیبرد، جا لە غەزای(بني المصطلق) ناوی من دەرچوو بڕۆم، پاش دابەزینی ئایەتی حیجاب بۆیە من هەر لەناو کەژاوەکەمدا بووم هەڵدەگیرام و دادەبەزێنرام. لە پاش تەواوبوونی غەزاکە، گەڕاینەوە تاکو نزیك بووینەوە لە مەدینە، لە وەستانێکدا من بۆ هەندێ کاری خۆم لە سوپاکە دوورکەوتمەوە، کە ویستم بگەڕێمەوە بینیم ملوانکەیەکم هەبوو لێم ون بووە، ئیتر منیش بۆی دەگەڕام لەو کاتەیش سوپاکە جووڵەی کرد و ئەوانەی کەژاوەکەی منیان هەڵدەگرت وایاندەزانی من هەر تیایدام، چونکە ئافرەت ئەوەندە قورس نەبوو لەو سەردەمە ئافرەت لاشەیان لاواز بوو نانمان بەکەمی

---

١ وەکو (الواقدي) و (الذهبي) و (الطبراني) و (ابن سعد) و (ابن حزم).

٢ وەکو (ابن کثیر) و (رازي) و (طبراني).

٣ وەکو (ابن حجر) و (النووي).

دەخوارد، بۆیە هەڵگرانی کەژاوەکە سووکی کەژاوەکە سەرنجی ڕانەکێشان و خستیانە سەر وشترەکە و بەڕێکەوتن، منیش ملوانکەکەم دۆزیەوە دوای ئەوەی سوپاکە بەڕێ کەوتبوو، کە گەڕامەوە جێگاکەی خۆم کەسی لێ نەمابوو، بۆچوونیشم وابوو ئەوان بە نەبوونی من لە کەژاوەکەدا دەزانن و دەگەڕێنەوە بۆ لام، ئیتر هەر لەو کاتەی دانیشتبووم خەو بردمیەوە و خەوتم، صەفوانی کوڕی موعەتتەلیش[١] لە دوای سوپاکەوە ڕێی دەکرد شەو گەیشتە جێگاکەی من و تارمایی ئادەمیزادێکی بینی خەوتووە، کە نزیك بوویەوە ناسیمی، چونکە پێش دابەزینی ئایەتی حیجاب منی بینیبوو، ئیتر منیش بە دەنگی(انا لله وانا الیه راجعون)ی صەفوان بە ئاگا بوومەوە، منیش ڕوومەتی خۆمم داپۆشی و،سوێند بە خوا گوێم لە وشەیەکی نەبوو جگە لەوەی وتی:(انا لله وانا الیه راجعون) ئینجا وشترەکەی دانیشتاند لەسەر دەستی و منیش سواری بووم. ئیتر ەو ڕای دەکێشا و ڕۆیشتین لە گەرمای نیوەڕۆ گەیشتینە لایان، ئیتر ئەوەی کە تیاچوو لەو مەسەلەی مندا تیاچوو، سەری ئەو هەموو درۆ و دەلەسەیش عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوری سەلول بوو.

### ١- بڵاوبوونەوەی پڕوپاگەندە لە مەدینە:

گەڕاینەوە مەدینە و یەك مانگ تەندروستیم باش نەبوو، خەڵکیش زۆر باسی قسەی بوختانچییەکانیان دەکرد و، منیش بێئاگا بووم لەو باسە، ئەوەش دەیخستمە گومانەوە ئەو ڕووخۆشیەی لە پێغەمبەر(ﷺ) دەمبینی لە کاتی نەخۆشیدا هەستم پێ نەدەکرد، بەڵکو دەهاتە لام سەلامی دەکرد و دەیفەرموو چۆن بووی؟ ئینجا دەڕۆیی، ئەوەش دەیخستمە گومانەوە، کاتێك لە نەخۆشیەکەم چاك بوومەوە، لەگەڵ ئوممومیستەحدا چووین بۆ ئەو جێگایەی پێویستی خۆمانمان تیادا ئەنجام دەدا، دەریش نەدەچوین شەو بۆ شەو نەبێت، پێش ئەوەی کە جێگای تایبەت بۆ ئەو مەبەستە لە نزیك ماڵەکانمان دروست بکرێت... کاتێك گەڕاینەوە

---

١ هاوەڵێکی بەڕێزە لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ)، کاروباری وشتری پێغەمبەر (ﷺ)ی بەڕێوە دەبرد لە غەزاکاندا.

لەگەڵ ئوممومیستەحدا پێی نا بە چمکی کراسەکەیدا و کەوت و تی: بەدبەخت بێت میستەحی کوڕم، وتم: ئایا قسە بە کەسێك دەکەیت ئامادەی جەنگی بەدر بووە؟ وتی: ئەی بێ ئاگا، نەتزانیووە چی وتووە؟ وتم: چی وتووە؟ ئیتر ئەویش باسی ئەوانەی بۆ کردم کە هەڵساون بە هەڵبەستنی بوختانەکە، ئیتر ئەوەندەی تر نەخۆش کەوتم، کاتێك گەڕامەوە ماڵ و، پێغەمبەر(ﷺ) هاتە ژوورەکەم و سەلامی لێ کردم، وتی: چۆنی، وتم: ئایا ڕێگەم دەدەیت بچمە لای باوك و دایکم؟ دەفەرمووێت: مەبەستیشم ئەوە بوو دڵنیا بم لە هەواڵەکە لە ڕێگەی ئەوانەوە، بە دایکمم وت: خەڵکی باسی چی دەکەن؟ ئەویش وتی: کچم دان بە خۆتا بگرە، سوێند بە خوا کەم جار هەیە ئافرەتێك جوان بێت و خاوەن هەوە بێت، تاکو قسەی لەسەر نەکرێت، دەفەرمووێت: وتم: پاکی بۆ خوا، کەواتە خەڵکی لەم بارەوە قسەیان کردووە، ئیتر ئەو شەوە تاکو ڕۆژ بوویەوە من هەر دەگریام.

**٢- ڕاوێژکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بە هەندێك لە هاوەڵان سەبارەت بە دواکەتنی وەحی:**

پێغەمبەر – کە بینی وەحی دواکەوت – بانگی عەلی کوڕی ئەبو تالیب و ئوسامەی کوڕی زەیدی کرد و، داوای ڕاوبۆچوونی کردن لە عائیشە جیابێتەوە، ئوسامە باسی پاك و خاوێنی عائیشەی کرد، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا خێزانی تۆیە و لە چاکە زیاتر هیچی ترمان لێی نەبینیووە، بەڵام عەلی کوڕی ئەبو تالیب وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێگەت لەسەر تەسك نەکراوەتەوە، ئافرەتی تریش زۆرن، ئەگەر پرسیار لە کەنیزەکەکەیشی بکەیت، قسەی ڕاستت بۆ دەکات.

دەفەرمووێت: پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بە دوای بەریرەدا و، فەرمووی: ئەی بەریرە ئایا شتێکت بینیووە بتخاتە گومانەوە، بەریرە وتی: نەخێر، سوێند بەو کەسەی تۆی بە ڕاستی ڕەوانە کردووە هیچ شتێکی خراپم لێی نەبینیووە... ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) چووە سەر مینبەر و فەرمووی: ئەی کۆمەڵانی موسڵمانان، کێ پاساوم بۆ دەهێنێتەوە لە دژ کەسێك ئازاری داوم و قسەی بە یەکێك لە خێزانەکانم وتووە، سوێند بە خوا جگە لە چاکە هیچم لە خێزانم نەبینیووە، ئینجا ئەوان باسی پیاوێکیان کردووە،[١] ئەویش جگە لە چاکە هیچ دەربارەی نازانم، هیچ کاتێکیش

---

١ صەفوانی کوڕی موعەتتەڵی سولەمی.

لەگەڵ خۆم نەبێت نەهاتووەتە لای خێزانم، ئیتر سەعدی کوڕی موعازی ئەنصاری هەڵسا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من پاساوت بۆ دەهێنمەوە، ئەگەر ئەو کەسە لە ئەوسە خۆم لە گەردنی دەدەم، ئەگەر لە برا خەزرەجەکانیشمانە فەرمانمان پێبکە جێبەجێی دەکەین.

**٣- شوێنەواری ئەو ئاشووبەیە :**

دەفەرمووێت: لەم کاتەدا سەرگەورەی خەزرەج سەعدی کوڕی عوبادە — کە پێشتر پیاوێکی چاکەکاریش بوو، بەڵام دەمارگیری پاڵی پێوەنا ئەو قسانە بکات — هەڵسا و بە سەعدی وت: درۆت کرد سوێند بە خوا ناتوانیت بیکوژیت، ئنجا(سعد بن حضير) کە ئامۆزای سەعدی کوڕی موعاز بوو هەڵسا و بە سەعدی کوڕی عوبادەی وت: تۆ درۆ دەکەیت سوێند بە خوا دەبێت بیکوژین و، تۆ پیاوێکی مونافیقیت و بەرگری لە مونافیقەکان دەکەیت، ئیتر هەردولا لە یەکتر هەڵسان و خەریك بوو شەڕ هەڵگیرسێت، پێغەمبەریش(ﷺ) هەر لەسەر مینبەر بوو، هەر هەوڵیشی دەدا ئارامیان بکاتەوە تاکو ئارام بوونەوە.

دەفەرمووێت: منیش هەر دەگریام و خەوم لێ نەدەکەوت، باوك و دایکیشم هاتنە لام و دوو ڕۆژ و شەوێك بوو هەر دەگریام و نەدەخەوتم، فرمێسك وشك نەدەبوویەوە، ئەوانیش دەترسان گریان جەرگم ببڕێت، دەفەرمووێت: ئەو کاتەی ئەوان لام بوون ئافرەتێك لە ئەنصارەکان هاتە لام و ئەویش لەگەڵم دەستی کرد بە گریان، لەو کاتە پێغەمبەر(ﷺ) هاتە ژوورەوە و، سەلامی کرد و پێشتریش لە لام دانەدەنیشت لەو کاتەوە ئەو قسە کرابوو.

**٤- دەستپێشخەری پێغەمبەر(ﷺ) بە قسەکردن لەگەڵ عائیشە و وەڵامدانەوەی عائیشە بۆ پێغەمبەر(ﷺ):**

یەك مانگ بەسەر ئەم قسە و باسە تێپەڕ بوو بێ ئەوەی وەحی دابەزێت، دەفەرمووێت: پێغەمبەر(ﷺ) کە لامان دانیشت شایەتمانی هێنا و فەرمووی:(اما بعد) من هەواڵێکی ئاوها و ئاوهام پێ گەیشتووە، جا ئەگەر تۆ بێ تاوانی خوای گەورە خۆی پاکت دەکاتەوە، ئەگەر گوناهێکیشت ئەنجام داوە، داوای لێخۆشبوون

بکە و بگەڕێرەوە لای، چونکە هەر بەندەیەك دان بە گوناهی خۆیدا بنێت و بگەڕێتەوە خوای گەورە لێی خۆش دەبێت. کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) قسەکەی تەواو کرد، هەستم کرد یەك دڵۆپە فرمێسکم نەما، بە باوکم وت: وەڵامی پێغەمبەر(ﷺ) بدەرەوە، وتی: بە خوا نازانم چی وەڵام بدەمەوە؟ بە دایکم وت: وەڵامی پێغەمبەر(ﷺ) بدەرەوە ئەویش هەر وای وت.

دەفەرمووێت: منیش هێشتا کچێکی منداڵ بووم و قورئانم زۆر لەبەر نەبوو، پێم وتن: سوێند بە خوا چاك دەزانم ئێوە ئەم قسەتان بیستووە و باوەڕیشتان پێکردووە، ئەگەر بڵێم من بێ تاوانم، خوایش دەزانێت من بێ تاوانم، باوەڕم پێ ناکەن،ئەگەر دان بە کارێکیشدا بنەم، خوایش دەزانێت من لەو کارە پاك و خاوێنم، ئێوە باوەڕم پێ دەکەن، سوێند بە خوا هەر قسەکەی باوکی یوسف دەکەم: ﴿ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴾(یوسف: ١٨).

دەفەرمووێت: ڕۆیشتم بۆ سەر جێگاکەم و، چاك دەمزانی کە پاك و خاوێنم و، خوای گەورە پاك و خاوێنم ڕادەگرێت، بەڵام سوێند بە خوا هەرگیز وام نەدەزانی وەحی دابەزێنێت و بخوێنرێتەوە، خۆیشم بە لای خۆمەوە لەوە بێ بایەخ تر بووم کە خوای گەورە لە بارەی منەوە قسەیەك بکات بخوێنرێتەوە بەڵکو ئومێدم وابوو پێغەمبەر(ﷺ) خەونێك ببینێت خوای گەورە تیایدا پاك و خاوێنم بکاتەوە.

**٥- دابەزینی وەحی بە پاك و خاوێنکردنەوەی عائیشە:**

دەفەرمووێت: سوێند بە خوا پێغەمبەر(ﷺ) لەو جێگایەی هەڵنەسا، تاکوو خوای گەورە وەحی بەسەردا دابەزاند و بارێکی نائاسایی بەسەردا هات و وەکو دنکە مرواری تك تك ئارەقی دەڕژاند، کە ئێمە لە زستانیشدا بووین. دەفەرمووێت: کاتێك باری ئاسایی بوویەوە، خەندەیەکی کرد و یەکەمین وشەی ئەوەبوو فەرمووی:((یا عائشة اما الله عز وجل فقد برأك))، واتە: ئەی عائیشە خوای گەورە پاك و خاوێنی تۆی ڕاگەیاند، دایکم وتی: هەڵسە بۆ لای، وتم، نە سوێند بە خوا هەڵناسم بۆ لای و، سوپاسی کەس ناکەم لە خوای گەورە زیاتر.

ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ ۚ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم ۖ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُم مَّا ٱكْتَسَبَ مِنَ ٱلْإِثْمِ ۚ وَٱلَّذِى تَوَلَّىٰ كِبْرَهُۥ مِنْهُمْ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١﴾ لَّوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُوا۟ هَٰذَآ إِفْكٌ مُّبِينٌ ﴿١٢﴾ لَّوْلَا جَآءُو عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ ۚ فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا۟ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٣﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِى مَآ أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٤﴾ إِذْ تَلَقَّوْنَهُۥ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُۥ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾ وَلَوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبْحَٰنَكَ هَٰذَا بُهْتَٰنٌ عَظِيمٌ ﴿١٦﴾ يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُوا۟ لِمِثْلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧﴾ وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾(النور: ١١-٢٠).

**٦- هەڵوێستی ئەبو بەکری صدیق لەوانەی قسەیان دەربارەی عائیشە کرد(رضي الله عنها):**

کاتێك خوای گەورە پاك و خاوێنی منی دابەزاند، ئەبو بەکر(رضي الله عنه)، کە پێشتر خەرجی دەکردە سەر(مسطح بن أثاثة) بە هۆی هەژاری و نزیکی لە ڕووی خزمایەتیەوە، وتی: سوێند بە خوا هەرگیز لەمە بە دوا هیچ بەسەر میستەحدا خەرج ناکەم دوای ئەو قسانەی دەربارەی عائیشە کردی، ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَلَا يَأْتَلِ أُو۟لُوا۟ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓا۟ أُو۟لِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلْيَعْفُوا۟ وَلْيَصْفَحُوٓا۟ ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾(النور: ٢٢).

ئەبو بەکر وتی: بەڵێ بە خوا حەزدەکەم خوای گەورە لێم خۆش بێت، ئیتر ئەو خەرجییەی گەڕاندەوە بۆ میستەح و وتی: هەرگیز بیّ بەشی ناکەم.

عائیشە دەفەرمووێت: پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لە زەینەبی کچی جەحش کرد دەربارەی من، دەیفەرموو: ئەی زەینەب چیت زانیووە؟ یان چیت بینیووە؟ ئەویش دەیفەرموو: گوێ و چاوی خۆم لە سزا دەپارێزم، بێجگە لە چاکە هیچ ئاگادار نیم، دەفەرمووێت:زەینەبیش بوو، کە خۆی لە من بە بەرزتر دەزانی لە ناو خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بەڵام خوای گەورە بە چاکەی خۆی پاراستی، بەڵام حەمنەی خوشکی،[1] یەکێك بوو لەوانەی خۆیان تاوان بار کرد لە مەسەلەی بوختانەکەدا.[2]

## شەشەم: گرنگترین ئەو حوکمانەی لە ئایەتەکانی ئیفك وەردەگیردرێت.

زانایان هەندێك حوکمیان وەرگرتووە لە ئایەتەکان، گرنگترینیان:

١- پاك و خاوێنکردنەوەی عائیشە(ﷺ) لەو بوختانەی بۆی کرا، بە ئایەتێك کە تا ڕۆژی قیامەت دەخوێنرێتەوە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡۚ لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُم مَّا ٱكۡتَسَبَ مِنَ ٱلۡإِثۡمِۚ وَٱلَّذِي تَوَلَّىٰ كِبۡرَهُۥ مِنۡهُمۡ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾(النور: ١١).

٢- حیکمەتی خوای گەورە وای دەخواست کە چاکە و پاداشت لە نێو ناڕەحەتی و خراپەوە سەرهەڵبدات، چونکە تاقیکردنەوەی خێزانی ئەبو بەکری صدیق(ﷺ) بەم بوختانە چاکەی ئەوانی تیابوو، پاداشتی زۆریان لەسەر ئارام گرتنیان وەرگرت... ﴿لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ﴾.

٣- پەرۆشی لەسەر ناوبانگی ئیمانداران و، گومانی چاکە بردن بە یەکتر لە نێو یەکتردا، ﴿لَّوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ ظَنَّ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمۡ خَيۡرٗا وَقَالُواْ هَٰذَآ إِفۡكٞ مُّبِينٞ﴾.

---

١ حەمنەی کچی جەحش پورزای پێغەمبەر (ﷺ) بوو خوشکی زەینەب بوو (ﷺ)

٢ البخاري، كتاب التفسير باب (لو لا اذ سمعتموه) رقم (٤٧٥٠).

٤- بە درۆخستنەوەی بوختانچییەکان: ﴿لَّوْلَا جَآءُو عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ ۚ فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا۟ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٣﴾﴾.

٥- ئاشکراکردنی سۆز و بەزەیی خوای گەورە بە ئیمانداران: ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِى مَآ أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾.

٦- پێویستی دڵنیابوون لە هەواڵ، پێش بڵاوکردنەوەی: ﴿وَلَوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبْحَٰنَكَ هَٰذَا بُهْتَٰنٌ عَظِيمٌ﴾.

٧- قەدەغەکردنی دووبارەکردنەوەی ئەو گوناهە: ﴿يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُوا۟ لِمِثْلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧﴾ وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾(النـــور: ١٧-١٨).

٨- قەدەغەکردنی بڵاوکردنەوەی خراپە لە نێو ئیمانداراندا: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٩﴾﴾.

٩- ڕوونکردنەوەی چاکەی خوای گەورە لەگەڵ بەندە ئیماندارەکانی و سۆز و بەزەیی لەسەریان، ئەوەشی دووپات کردووەتەوە: ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾(النور: ٢٠).

١٠- قەدەغەکردنی شوێن پێ هەڵگرتنی شەیتان کە موسڵمان بەرەو هەڵدێر دەبات: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۚ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾(النور: ٢١).

١١- هاندانی خەرجکردن لەسەر خزمان، سەرەڕای خراپەکردنیان:[١] ﴿ وَلَا يَأْتَلِ أُولُوا الْفَضْلِ مِنكُمْ وَالسَّعَةِ أَن يُؤْتُوا أُولِي الْقُرْبَىٰ وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۖ وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾(النور: ٢٢).

١٢- داکۆکی کردنی خوای گەورە لەسەر ئیمانداران و هەڕەشەکردنی لە هەر کەسێك بوختانیان بۆ بکات بە نەفرین لێکردنیان لە دونیا و لە قیامەت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٢٣﴾ يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٢٤﴾ يَوْمَئِذٍ يُوَفِّيهِمُ اللَّهُ دِينَهُمُ الْحَقَّ وَيَعْلَمُونَ أَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ الْمُبِينُ ﴾(النور: ٢٣-٢٥).

دانەری تەفسیری(الکشاف) دەربارەی ئەم ئایەتە دەفەرموێت: ئەگەر هەموو قورئان بپشکنی، بۆت دەردەکەوێت کە خوای گەورە بۆ هیچ تاوانێك هەڕەشەی لە جۆری ئەم هەڕەشەیە نەداوە، کە خۆی لە چەندین شێوازی جۆراوجۆر دەبینێتەوە، ئەگەر تەنها ئەم سێ ئایەتەش دابەزیایە لە ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ﴾ تاکو ﴿ هُوَ الْحَقُّ الْمُبِينُ ﴾(النور:٢٥). ئەوە بەس بوو بۆ ئەوانەی بوختان هەڵدەبەستن کە نەفرین لێکراون لە دونیا و قیامەتدا، کە دەست و قاچیان شایەتیان لەسەر دەدات...[٢]

١٣- ڕوونکردنەوەی سوننەتێك لە سوننەتەکانی خوای گەورە لە گەردووندا، ئەویش ئەوەیە کە خوای گەورە پیاوچاکان دەکاتە بەشی ئافرەتە چاکەکان و، ئافرەتە خراپەکانیش دەکاتە بەشی پیاوە خراپەکان: ﴿ الْخَبِيثَاتُ لِلْخَبِيثِينَ وَالْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَاتِ ۖ وَالطَّيِّبَاتُ لِلطَّيِّبِينَ وَالطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَاتِ ۚ أُولَٰئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَ ۖ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾(النور: ٢٦).

---

١ بڕوانە: حديث القران الكريم عن غزوات الرسول (١/٢٨٥-٢٨٦).

٢ بڕوانە: حديث القران الكريم عن غزوات الرسول (١/٢٨٦)، نقلا عن تفسير الكشاف (٣/٢٢٢).

١٤- خەڵکی بوون بە چوار بەشەوە، لەو کاتەی عائیشە (رضي الله عنها) بوختانی بۆ کرا: مامۆستا (عبدالقادر شيبة الحمد) لە پەراوێزدانانی لەسەر ئەو ڕووداوە دەڵێت: خەڵکی لەو بارەوە بوو بە چوار بەشەوە: یەکەمیان کە زۆرینەیان بوون، گوێ و زمانی خۆیان پاراست و، هیچیان لێ نەبیسترا جگە لە وشەی چاکە نەبێت، نە باوەڕیان کرد و نە بە درۆیان خستەوە، بەشێکیشیان ڕاستەوخۆ ئەو هەواڵەیان بە درۆ دەخستەوە وەکو (ابو ايوب الانصاری) و خێزانی (رضي الله عنها)، چونکە ئەو قسەیان یەکسەر بە بوختان ژمارد و عائیشەیان لێی پاراو کردەوە دەست بەجێ.

بەشی سێیەم: ئەمانیش هەر لە نێو موسڵمانان بوون نە باوەڕیان کرد و نە بە درۆیان خستەوە و نە نکۆڵیان کرد، بەڵام قسەکانیان دەگێڕایەوە و، وایان دەزانی باسکردنی ئەو مەسەلەیە کارێکی ئاساییە، ڕووبەڕووبوونەوەی سزای خوای گەورەیان ناکاتەوە.... لەوانەش: حەمنەی کچی جەحش و حەسسانی کوڕی سابیت و(مسطح)ی کوڕی(اثاثة).

بەشی چوارەم: ئەوانە بوون کە بوختانەکەیان هەڵبەست، لە سەرووی ئەوانەشەوە دوژمنی خوا عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی سەرۆکی موونافیقەکان ئەویش بوو کە خوای گەورە نەفرینی لێ کرد و سەرکردەی بوختانکەران ناوزەدی کرد.

خوای گەورەیش باسی هەڵوێستی بەشی دووەمی ئەم بەشانەی کردووە و، پێویستیش بوو هەموو موسڵمانان هەمان هەڵوێستیان وەرگرتبایە: ﴿لَّوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُوا۟ هَٰذَآ إِفْكٌ مُّبِينٌ﴾(النور: ١٢).

هەروەها باسی بەشی سێیەمیشی کردووە و فەرموویەتی: ﴿إِذْ تَلَقَّوْنَهُۥ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُۥ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾ وَلَوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبْحَٰنَكَ هَٰذَا بُهْتَٰنٌ عَظِيمٌ﴾(النور: ١٥-١٦).

خوای گەورەیش لە هەمان کاتدا باسی چاکە و فەزڵی ئەو کەسانەی کردووە، وەکو ئەوەی هیجرەت و ئیمانی بۆ میستەح جێگیر کردووە، کاتێك ئەبو بەکر

سوێندی خوارد خەرجی نەکاتە سەریدا... و فەرموویەتی: ﴿وَلَا يَأْتَلِ أُولُوا الْفَضْلِ مِنكُمْ وَالسَّعَةِ أَن يُؤْتُوا أُولِي الْقُرْبَىٰ وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾(النور: ٢٢).

بەڵام سەبارەت بە بەشی چوارەم نەفرینی خۆی بەسەریاندا دابەزاند و فەرمووی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٢٣﴾ يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٢٤﴾ يَوْمَئِذٍ يُوَفِّيهِمُ اللَّهُ دِينَهُمُ الْحَقَّ وَيَعْلَمُونَ أَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ الْمُبِينُ﴾(النور: ٢٣-٢٥).

## حەوتەم: هەندێ سوود و حوکم و وانە لە ڕووداوی (الافك) و غەزای (بني المصطلق).

### ١- ئادەمیزادییەتی پێغەمبەر(ﷺ):

لە ڕاستیدا دەردەسەری ئەو بوختانە حیکمەتێکی خوایی لەخۆ گرتبوو کە بریتی بوو لە دەرخستنی کەسایەتی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەگەر وەحی شتێکی دەرەکی نەبوایە لە کەسایەتی پێغەمبەر(ﷺ)، یەك مانگی تەواوی بەسەر نەدەبرد لەو کۆست و مەینەتیەدا، بەڵام دەرکەوت کە پێغەمبەر(ﷺ)پێغەمبەرە و ئادەمیزادیشە بۆیە کاتێك وەحی لە بارەی ئەو بوختانەوە دابەزی هەموو شتێك گەڕایەوە جێگەی خۆی، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ڕاستێتی وەحی، چونکە ئەگەر بێت و وەحی لە لایەن خواوە نەبووایە، پاشماوەی ئەو مەینەتییە هەر لە دڵی پێغەمبەر(ﷺ) دەمایەوە و، لە هەڵسوکەوتی لەگەڵ عائیشە ڕەنگی دەدایەوە، بەڵام خوای گەورە ویستی ئەم دەردەسەرییە بەڵگەیەك بێت لەسەر پێغەمبەرایەتی موحەممەد(ﷺ).[١]

### ٢- سزای بوختان و گرنگی لە پارێزگاری کردن لە ئابڕووی موسڵمانان:

کۆمەڵگای ئیسلامی لەسەر ڕووداوەکان پەروەردە دەبوو، کاتێك ڕووداوی بوختان دروست بوو، خوای گەورە ویستی هەندێ حوکم دابەزێنێت بۆ پاراستنی

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٤٤١).

ئابڕووی ئیمانداران، بۆیە سورەتی نور دابەزی، کە باسی لە حوکمی ئافرەت و پیاوی داوێن پێس دەکرد و، هەروەها باسی تاوانی داوێن پیسی و، ئەوەی کە لەسەر فەرمانڕەوایە ئەنجامی بدات ئەگەر یەکێك لە ژن و مێرد بوختانی بۆ ئەوی تر کرد و سزای ئەو کەسانەیش کە داوێن پیسی دەدەنە پاڵ کەسێك بێ ئەوەی چوار شایەت لەسەر قسەکەیان بهێنن و چەندین حوکمی تر.[١]

ئیسلام داوێن پێسی(زنا) قەدەغە کردووە و، سزایشی دیاری کردووە بۆ ئەنجامدەری ئەو تاوانە، هەروەها هەموو هۆکارەکانیشی قەدەغە کردووە، لەوانە بڵاوکردنەوەی باسی خراپەکاری بۆ ئەوەی نەبێتە باسێکی ئاسایی و لە لای گوێگران ئاسایی بێتەوە، هەر بۆیەش ئیسلام بوختانکردنی داوێن پێسی قەدەغە کردووە و سزای هەشتا قامچی بۆ دیاری کردووە و، ئەو کەسە جارێکی تر شایەتی قبووڵ ناکرێت تاکو تەوبەیەکی ڕاستی نەکات.[٢]

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) سزای بوختانکردنی جێبەجێ کرد لەسەر(مسطح) و (حسان) و(حمنە) وەکو(ابن اسحق) و(الترمذي) باسیان کردووە،(القرطبي)یش وتوویەتی ئەوەی بە ناوبانگە و زانراوە لە لای زانایان ئەو سێ کەسە داری حەدیان لێ دراوە و نەبیستراوە کە داری حەد لە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی درابێت،[٣] هەندێ ڕیوایەتی لاوازیش هاتووە کە لەسەری جێبەجێ کراوە.[٤]

(ابن القیم) حیکمەتی جێبەجێ نەکردنی سزای بوختانی بەم شێوە لێکداوەتەوە:

أ –دەگێڕنەوە لەبەر ئەوە بوو ئەو سزایە جۆرێکە لە ئاسانکاری بۆ ئەنجامدەری بوختانەکە، ئەو گەندەڵەیش شایستەی ئەوە نەبووە.

ب – دەشگێڕنەوە داوای لە خەڵکی تر دەکرد قسەکە بڵاو بکەنەوە...

ج – هەروەها وتراوە لەبەر ئەوە بوو ئەو تاوانە جێگیر نابێت بە بەڵگە و

---

١ بڕوانە: حديث القران الكريم (١/٣٥٧).
٢ بڕوانە: اثار تطبيق الشريعة، د. محمد المزاحم (١١٧).
٣ بڕوانە: تفسير القرطبي (١٢/١٩٧).
٤ بڕوانە: مرويات غزوة بني المصطلق (٢٤٢).

دانپێدانانندا نەبێت، ئەویش نە دانی نا بەو تاوانە و نە کەسیش شایەتی لەسەر دا.

د - هەروەها وتراوە بە هۆی بەرژەوەندییەکی گەورەترەوە ئەو سزایەی لەسەر جێبەجێ نەکراوە، وەکو چۆن نەکوژرا لە کاتێکدا مونافیق بوو قسەکانیشی کە دەیکرد شایانی ئەوە بوو بکوژرێت، بەرژەوەندییەکەیش ئەوە بوو دڵی خزمەکانی ڕابگیردرێت و لە ئیسلام دوور نەکەونەوە.

لە کۆتاییشدا وتوویەتی لەوانەیە بە بۆنەی هەموو ئەم هۆکارانەوە بووبێت.[1]

٣- ڕیوایەتەکان دەردەخەن هەموو ئەوانە بەشدارییان کرد لەو بوختانکردنەدا تەوبەیان کرد - تەنها ئیبنو ئوبەی نەبێت - حەسسانیش(رضي الله عنه) داوای لێبوردنی کرد و هۆنراوەیەکی هۆنیەوە تیایدا ستایشی عائیشەی کرد و وتی:

رأيتك وليغفر لك الله حرة     من المحصنات غير ذات غوائل

حصان رزان ماتزن بريبة     وتصبح غرثي من لحوم الغوافل

وان الذي قد قيل ليس بلائق     بك الدهر بل قول امرئ متناحل[2]

٤- هەندێ لەو حوکمانەی لە غەزای(بني المصطلق) وەردەگیردرێت:

- هێرش کردنە سەر ئەوانەی ئیسلامیان پێگەیشتووە بێ ئەوەی ئاگادار بکرێنەوە.

- ئازادکردنی کۆیلە بەرامبەر مارەیی، وەکو حاڵەتی جوەیرییە(رضي الله عنها).

- تیر و پشك کردن لە نێوان خێزانەکاندا.

- بە کۆیلەکردنی عەرەب ئەمەیش وتەی جمهوری زانایانە.[3]

- هەر هەموو زانایانیش یەکدەنگن لەسەر ئەوەی هەر کەسێك ئەو تۆمەتە بداتە پاڵ عائیشە پاش ئەوەی خوای گەورە پاکو خاوێنی کردەوە، ئەو کەسە

---

١ بڕوانە: زاد المعاد (٣/٢٦٣-٢٦٤).

٢ بڕوانە: تاريخ الاسلام للذهبي، المغازي (٢٨١).

٣ بڕوانە: كتاب الام للشافعي (٤/١٨٦).

بێباوەڕە چونکە دژایەتی قورئانی کردووە.[١]

– هاوەڵان لەم غەزایەدا پرسیاری عـەزلیان کـرد لـە پێغەمبـەر(ﷺ) و ئـەویش فەرمووی:((ما عليكم الا تفعلوا، ما من نسمة كائنة الى يوم القيامة إلا وهـي كائنـة))،[٢] واتە: هیچتان لەسەر نییە ئەگەر ئەو کارە بکەن، هەر گیانێك خـوای گـەورە بڕیـاری دروست کردنی دابێت تا ڕۆژی قیامەت هەر دروست دەبێت.

بۆیـە(جمهـور)ی زانایـان دەڵـێن عـەزل جـائیزە لەگـەڵ ئـافرەتی ئـازاددا بـە ڕەزامەندی خۆی، ئینجا ئایەتی(التيمم)یش هەر لەم غەزایەدا دابـەزی، وەکـو مـەزن ڕاگرتنێك بۆ نوێژ و، نەبوونی ئاو نابێتە ڕێگر بۆ ئەنجامدانی نوێژ، هـەروەها تـرس و لە دەستدانی ئاسایشیش هەر نابێتە پاساو بۆ نەکردنی نوێژ.[٣]

---

١ بڕوانە: شرح صحيح المسلم للنووي (٦٤٣/٥).
٢ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة للعمري (٤١٥/٢).
٣ بڕوانە: نيل الاوطار للشوكاني (٢٢٢/٦–٢٢٤)، صور وعبر من الجهاد النبوي في المدينة (١٢٠–٢١١).

# بەشی یانزەیەم

# غەزای(الاحزاب)

## باسی یەکەم: مێژوو و، هۆکار و، ڕووداوەکانی

### یەکەم: مێژووی ئەو غەزایە و هۆکارەکانی.

**١- مێژووی غەزای(الاحزاب):**

جمهوری مێژوونووسانی ئەو سەردەمە دەڵێن ئەو غەزایە لە مانگی شەووالی ساڵی پێنجەمی کۆچیدا بووە،[١] واقیدی دەڵێت:[٢] لە ڕۆژی سێ شەممە هەشتی(ذي القعدة)ی ساڵی پێنجەمی کۆچیدا بووە، ئیبنو سەعد دەڵێت:[٣] خوای گەورە نزای پێغەمبەرەکەی وەرگرت و ئەو کۆمەڵانەی شکست پێ هێنا لە ڕۆژی چوارشەممە لە مانگی(ذي القعدة)ی ساڵی پێنجەمی کۆچی.

هەروەها دەگێڕنەوە(الزهري) و(مالك بن انس) و(موسى بن عقبة) کە لە ساڵی چواری کۆچیدا بووە.[٤]

ئەو زانایانەی کە پێیان وایە ئەم غەزایە لە ساڵی چواری کۆچیدا بوو، مێژوو لە موحەڕڕەمی[٥] پاش کۆچکردنەوە دەژمێرن و ئەو مانگانەی پێش ئەوە تاکو(ربيع الاول) ناژمێرن ئەم کارەیش ناکۆکە لەگەڵ جومهووردا کە مێژوو لە مانگی موحەڕڕەمی ساڵی کۆچکردنەوە دەژمێرن،(ابن حزم)[٦] داکۆکی لەسەر ئەوە دەکات

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٤٤٣).
٢ بڕوانە: المغازي (٢/٤٤٠) بەبێ ئیسناد.
٣ الطبقات (٢/٦٥-٧٣)، باسناد متصل.
٤ بڕوانە: البداية والنهاية (٤/١٠٥).
٥ السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٤٣٣).
٦ بڕوانە: جوامع السيرة (١٨٥).

کە لە ساڵی چواردا بووە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) عەبدوڵڵای کوڕی عومەری گێڕایەوە لە جەنگی ئوحود، ئوحودیش بەبێ ناکۆکی لە ساڵی سێی کۆچیدا بووە، کە لەو کاتە ئیبنو عومەر تەمەنی چواردە ساڵ بوو،[١] بەڵام بەیهەقی و،[٢] ئیبنوحەجەر و،[٣] کەسانی تر بەوە لێکیان داوەتەوە کە ئیبنو عومەر لە کاتی غەزای ئوحود لە سەرەتای چواردە ساڵیدا بووە و، لە خەندەقیش لە کۆتایی پانزە ساڵیدا بووە، ئەم بۆچوونەیش لەگەڵ بۆچوونی جمهوری زانایاندا دەگونجێت.[٤]

ئیبنولقەییمیش هەمان بۆچوونی جومهوری زانایانی هەیە — کە لە لای خۆمیش هەر ئەوە پەسەندە — و دەڵێت: ڕاسترین بۆچوونەکان ئەوەیە کە لە ساڵی پێنجەمی کۆچی ڕوویداوە لە مانگی شەووالدا، چونکە هیچ جیاوازی نییە لەسەر ئەوەی کە ئوحود لە ساڵی سێی کۆچیدا بووە، بتپەرستەکانیش بەڵێنیان بە پێغەمبەر(ﷺ)دا لە ساڵی ئایندەدا بگەڕێنەوە واتە ساڵی چواری کۆچی، بەڵام بەڵێنەکەیان شکاند بەهۆی قات و قڕی ئەو ساڵەوە، لە ساڵی پێنجەمدا گەڕانەوە بۆ جەنگکردن.[٥]

**٢- هۆکارەکانی:**

جولەکەکانی(بنو النضير) لە مەدینە دەرچوون بەرەو خەیبەر و کینەیەکی زۆریان لە دڵابوو دژ بە موسڵمانان، کاتێك لەوێ جێگیربوون دەستیان کرد بە پیلان دارشتن بۆ تۆڵەسەندنەوە لە موسڵمانان، بۆیە پێکهاتن لەسەر ئەوەی هانی هۆزە عەرەبەکان بدەن بۆ جەنگی پێغەمبەر(ﷺ)، بۆ ئەم مەبەستە چەپەڵەیانیش نێردەیەکیان پێکهێنا لە(سلام بن ابي الحقيق)و (حيي بن اخطب) و(كنانة بن الربيع)و (الربيع بن ابي الحقيق) و(هوذة بن قيس الوائلي) و(ابي عمار).[٦]

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٤٤٤).

٢ بڕوانە: دلائل النبوة للبيهقي (٣/٣٩٦).

٣ بڕوانە: الفتح (٣/٣٩٦).

٤ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٤٤٤).

٥ بڕوانە: زاد المعاد (٢/٢٨٨).

٦ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٢٣٧).

لـە ڕاستیـشدا ئـەو نێردەیـە سـەرکەوتوو بـوون لـە کارەکانیانـدا، قـوڕەیش ڕەزامەنـدییان دەربـڕی چـونکە هەسـتیان بـە تـاڵی گـەمارۆی ئـابووری دەکـرد و، هەروەها غەتەفانیش ڕازی بوون بە تەماعی بەروبووم و تالانی مەدینەوە و، هەنـدێ لە هۆزەکانی تریش بە هەمان شێوە.

جوولەکەکان بەو هۆزانەیان دەوت ئاینی ئێوە لە ئاینی ئەوان چاکترە،[1] لەو بارەشەوە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا هَٰؤُلَاءِ أَهْدَىٰ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا سَبِيلًا ﴿٥١﴾ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ ۖ وَمَن يَلْعَنِ اللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُ نَصِيرًا﴾(النساء: ٥١-٥٢).

مامۆستا(ولفنسون)یش ئاماژەی کردووە بەو هەڵە گەورەی جوولەکە تێی کـەوتن کاتێك ئاینی قوڕەیشیان پەسەند کردە سەر ئایینی ئیسلامدا،[2] بێگومـان قـوڕەیش پـێ خۆشـحاڵ بـوون بـە ستایـشکردنی جوولەکـە بـۆ ئایینەکـەیان و ڕەزامەنـدییان دەربڕی بۆ بەشداری کردن لە جەنگی دژ بە مەدینە و کاتیشیان دیاری کرد.[3]

نێـردەی جوولەکـە ڕێککەوتننامـەی یـەکێتی عـەرەبی بتپەرسـتی جوولەکـەیی سەربازییان دژ بە موسڵمانان مۆر کرد و، گرنگترین بڕگەکانی بریتی بوون لە:

أ- پێویستە هێزی غەتەفان لەم یەکێتییەدا شەش هەزار کەس بێت.

ب- بەرامبەر ئەوە، جوولەکە خورمای خەیبەر بدەن بە غەتەفان بۆ ماوەی یەك ساڵ.[4]

نێردەی جوولەکە توانیان بە دە هەزار جەنگاوەرەوە بگەڕێنەوە، چوار هەزار لـە قـوڕەیش و هاوپەیمانـەکانیان و، شـەش هـەزار لـە غەتـەفان و هاوپەیمانـەکانیان، هەموو ئەو ژمارە زۆرەیش لە نزیك مەدینە لایاندا.

---

١ بڕوانە: التاريخ السياسي والعسكري، د. علي معطي (٣١٠).
٢ بڕوانە: تاريخ اليهود في بلاد العرب، ولفنسون (١٤٢).
٣ بڕوانە: تاريخ اليهود في بلاد العرب، ولفنسون (١٤٢).
٤ بڕوانە: غزوة الاحزاب محمد احمد باشميل (١٤١).

## دووەم: بە دواداچوونی موسڵمانان.

دەزگای ئاسایشی دەوڵەتی ئیسلامی لە ئەوپەڕی وریاییدابوو لە دوژمنانی، بۆیە بەدواداچوونی دەکرد بۆ هەواڵی ئەحزابەکان و جموجوڵەکانی دیاری دەکردن و، هەروەها جموجوڵی نێردەی جولەکەی چاودێری دەکرد هەر لەو ساتەوە لە خەیبەر دەرچوون بە ئاراستەی مەککە، لەگەڵ ئەو زانیاریانەش بە دەست هات، پێغەمبەر(ﷺ) دەستی کرد بە ئەنجامدانی شێوازەکانی پێویست بۆ بەرگری و، بانگێشتی کرد بۆ کۆبوونەوەیەکی پەلە بۆ سەرانی سوپای ئیسلامی لە موهاجیر و ئەنصارەکان، بۆ تاوتوێ کردنی هەوڵە گەندەڵەکانی جوولەکە و،[1] سەلمانی فارسی ئەوەی پەسەند کرد کە کەندرێکی گەورە دروست بکرێت بۆ بەرگری کردن لە هێرشی دوژمنان، پێغەمبەر(ﷺ) ئەو بۆچوونەی پەسەند کرد، واقیدی(رحمه الله) دەڵێت: سەلمان فەرمووی:(ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە لە وڵاتی فارس گەر لە سوار بترسایەین، کەندرمان دەکەن، ئایا تۆش ئەو کارە ئەنجام دەدەیت؟ ئیتر موسڵمانان ئەو بۆچوونەیان پەسەند کرد).[2]

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ)سواری ئەسپێکی بوو لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوەڵان و جێگای شیاویان بۆ ئەو کەندرە دیاری کرد لە(المذاذ)ەوە بۆ(ذباب)[3] تاکو(راتج)،[4] ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) سوودی لە شاخی(سلع)[5] وەرگرت بۆ پاراستنی هاوەڵان لە پشتەوە.

لە ڕاستیدا ئەوەش هەڵبژاردنێکی سەرکەوتوو بوو، چونکە تاکە جێگایەك کە مەترسی لێهاتنە ژوورەوەی دوژمنی هەبوو لای باکوور بوو، بەڵام لاکانی تر بە ماڵی بەرز و ناوچەی بەرداوی و قەڵاکانی بەنی قورەیزە گیرابوون و جێگای مەترسی نەبوون، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ بەنی قورەیزە ڕێککەوتنی هەبوو کە یارمەتی هیچ دوژمنێکی موسڵمانان نەدەن لە دژی موسڵمانان.[6]

---

١ هەمان سەرچاوە (١٤٢).

٢ بڕوانە: مغازي الواقدي (٢/٤٤٤)، والطبقات الكبرى (٢/٦٦).

٣ (ذباب) تەپۆلکەیەکی بچووکە (ثنية الوداع) کەوتۆتە نێوان ئەو و شاخی (سلع).

٤ (راتج) قەڵایەکە لە قەڵاکانی مەدینە، هی کەسانێك بوو لە جوولەکە.

٥ بە ناوبانگترین شاخەکانی مەدینەیە، بڕوانە: معجم البلدان (٢/٢٨٣-٢٨٥).

٦ بڕوانە: العبقرية العسكرية في غزوات الرسول (٤٤٢).

لە ڕاستیدا پلانی پێغەمبەر(ﷺ) لە دروستکردنی کەندرِ کارێکی پێشکەوتوو بوو، چونکە شێوازێکی نوێ بوو لە شەڕکردندا، کەندرێکی باو نەبوو لە شەڕەکانی عەرەبدا، بەم شێوەیش پێغەمبەر(ﷺ) یەکەم کەس بوو کە ئەو هۆکارە بەکار بهێنێت لە مێژووی عەرەب و موسڵمانناندا، چونکە شێوازێکی چاوەڕوان نەکراو بوو لە لایەن دوژمنانی ئیسلامەوە، لە ڕاستیدا ئەم شێوازەیش لە شەڕکردن وورەی ئەحزابەکانی داگرت و هێزەکانی پەرتەوازە کردن.

## سێیەم: گرنگی پێغەمبەر(ﷺ) بە بەرەی ناوخۆیی.

١- کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بە هاتنی هێزەکانی دوژمنی زانی و دەرچوون بەرەو لای کەندرەکە، فەرمانی کرد ئافرەت و منالی موسڵمانان بخرێنە قەلای(بني حارثة)ەوە بۆ ئەوەی لە سەلامەتیدا بن، هەروەها چونکە ئەوە کاریگەری زۆری هەیە لەسەر جەنگاوەرەکان کاتێك هەست دەکەن خێزان و منالەکانیان دوورن لە مەترسی و، بیریان پەرتەوازە نابێت پێیانەوە و بە هێز و ورەیەکی بەرزترەوە جەنگ دەکەن.[1]

٢- یەکێك لە هۆکارەکانی بەهێزبوونی بەرەی ناوخۆیی بەشداری کردنی پێغەمبەر(ﷺ) بوو لە کار و ئەرکەکاندا، کە بە دەستی پیرۆزی خۆی کاری دەکرد، لە هەڵکەندنی کەندرەکە، لە ئیبنو ئیسحاقەوە هاتووە: گوێم لە بەراء بوو دەیفەرموو: لە ڕۆژی ئەحزاب لە کاتی هەڵکەندنی کەندرەکە پێغەمبەر(ﷺ)م بینی خۆڵی دەگواستەوە، تەنانەت خۆڵ پێستی سکی داپۆشیبوو لێم و تووکنیش بوو.[2]

٣- ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بەشداری هاوەڵانی دەکرد لە ناڕەحەتی و ئاواتەکانیاندا، بەڵکو خۆی ناڕەحەتی هەڵدەگرت لە جیاتی هاوەڵانی، لە غەزای ئەحزابدا دەبینین ئازاری برسێتی دەچەشت و بەردێکی لەسەر سکی خۆی بەستبوو لە ئازاری برسێتیدا.[3]

---

١ بڕوانە: غزوة الاحزاب د. محمد عبدالقادر ابو فارس (٩٨).

٢ البخاري كتاب المغازي باب غزوة الاحزاب رقم (٤١٠٦).

٣ غزوة الاحزاب، د. محمد ابو فارس (١١٦-١١٧).

٤- بەرزکردنەوەی ورەی سەربازان و دڵخۆشکردنیان: هەڵکەندنی کەندڕەکە ناڕەحەتی زۆری تیادا بوو، دونیا زۆر سارد بوو، ڕەشەبایش توند بوو، بارودۆخی بژێویش لە ناخۆشترین شێوازدا بوو، بێجگە لە مەترسی هێرشکردنی دوژمن کە چاوەڕوانکراو بوو لە هەموو ساتێکدا، ئینجا هاوەڵانیش زۆر ماندوو بووبوون لە هەڵکەندنی کەندڕەکەدا، بێگومان ئەوەش توانا و هێزێکی گەورەی پێویست بوو، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) چونکە بەو ناخۆشییانەی دەزانی، لەگەڵیان خۆڵی دەگواستەوە و، هۆنراوەکەی عەبدوڵای کوڕی ڕەواحەی دەوتەوە:

اللهم لو لا انت ماهتدينا ولا تصدقنا ولا صلينا
فانزلن سكينة علينا وثبت الاقدام ان لاقينا
ان الا لى قد بغوا علينا وان ارادوا فتنة ابينا

لە کۆتاییشدا دەنگی پێی درێژدەکردەوە.[1]

لە ئەنەسەوە(ﷺ) هاتووە کە هاوەڵانی موحەممەد(ﷺ) لە ڕۆژی خەندەقدا دەیانووت:

نحن الذين بايعوا محمدا على الاسلام مابقينا ابدا

یان دەیانووت:(على الجهاد) و، پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو:

اللهم ان الخير خير الاخرة فاغفر للانصار والمهاجرة[2]

لە ڕاستیدا ئەم خۆش دواندنەی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵیان مایەی خۆشحاڵیان بوو، کاریگەریشی هەبوو بۆ گورجکردنەوەیان و ئەنجامدانی کارەکانیان پێش گەیشتنی دوژمن.[3]

---

١ البخاري كتاب المغازي باب (غزوة الخندق) رقم (٤١٠٦).
٢ مسلم كتاب الجهاد والسير، باب (غزوة الاحزاب) (١٤٣٢/٣) رقم (١٢٩).
٣ بڕوانە: القيادة العسكرية في عهد الرسول (٤٨٢).

٥- ڕێزگرتن لە بارودۆخی سەربازەکان و مۆڵەتدانیان بۆ گەڕانەوە لە کاتی پێویستدا:

هاوەڵان لە ئەوپەڕی ڕێز و ئەدەبدا بوون لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)، کاتێك پێویستییەکیان هەبوایە داوای مۆڵەتیان دەکرد بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانیان، ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمُ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾(النور: ٦٢).

واتای ئایەتەکەیش: ئەی موحەممەد ئەگەر ئەو کەسانە داوای مۆڵەتیان لێت کرد کە بەبێ مۆڵەتی تۆ لە خۆیانەوە هیچ ناکەن، مۆڵەتیان بدە و، داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکە،[١] بۆیە هەڵبژاردن بە دەستی پێغەمبەر بوو(ﷺ)، ئەگەر بە پێویستی بزانیایە مۆڵەتی دەدا، یان بە پێچەوانەوە بە پێی پێویست.[٢]

٦- دابەشکردنی هاوەڵان بۆ پاسەوانداری ئیشکگر: پێغەمبەر(ﷺ) هاوەڵانی دابەش کردبوو بۆ چەند کۆمەڵێك بە مەبەستی بەرگری کردن لە هەر کەسێك لە کەندرەکە بپەڕێتەوە، لە ڕاستیشدا موسڵمانان توانیان هەموو هێرشەکانی دوژمن بشکێنن، تەنانەت ڕۆژێکیان لە بەرەبەیانەوە تاکو شەوی ڕۆژی دوایی هەر بەردەوام بوون لە شەڕکردن، بە شێوەیەك کە چوار نوێژیان لە دەست چوو، چونکە نەیاندەتوانی بۆ ساتێکی کەم ڕاوەستن، ئینجا عەلی کوڕی ئەبو تالیب و کۆمەڵێك لە هاوەڵان توانیان پەلامارێکی عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل بشکێننەوە، بەڵکو عەلی توانی پاڵەوانی عەرەب عەمری کوڕی وددی عامیری بکوژێت،[٣] کۆمەڵێك لە ئەنصارەکانیش هەموو شەوێك پاسەوانێتی پێغەمبەر(ﷺ)یان دەگرت لە سەرووبانەوە عەببادی کوڕی بیشر بوو، ئینجا لەبەر ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ)

---

١ بڕوانە: صفوة التفاسیر للصابوني (٢/٣٥١).
٢ احکام القران لابن العربي (٣/١٤٠).
٣ بڕوانە: فقه السیرة لمنیر الغضبان (٥٠٤).

سەرکردەی گشتی بوو کە ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی شەڕەکەی دەکرد و پلانی دادەڕشت و چاودێری جێبەجێ کردنی دەکرد و هەر خۆیشی بوو کە:

أ- فەرمانی بە هەڵکەندنی کەندڕەکە کرد پاش ڕاوێژکردن و جێگایەکی گونجاوی دۆزییەوە لە ڕاستایی باکووری مەدینەوە.

ب- کارەکانی هەڵکەندنەکەی دابەشکرد، هەموو چل گەز بۆ دە کەس لە هاوەڵان، هەموو لایەکیشی بە کۆمەڵێکیان دەسپارد.

ج- زاڵ بوونی پێغەمبەر(ﷺ) بەسەر کارەکاندا، بۆیە کەس نەیدەتوانی کارەکەی بەجێبهێڵێت بەبێ مۆڵەت وەرگرتن لە پێغەمبەر(ﷺ).

د- پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بە دابەشکردنی شوێنەکان بەسەر هاوەڵاندا، بە شێوەیەك کە پاسەوانێتی بەردەوام بێت بە شەو و ڕۆژ لەسەر کەندڕەکە، پێغەمبەر(ﷺ) بە خۆیشی ئەرکی سەرپەرشتی گشتی دەبینی بەسەر سەربازەکاندا.

هـ- پێغەمبەر(ﷺ) بەو توانا و لێهاتوویی سیاسی کە لە کەسایەتی پێغەمبەرایەتیدا هەبوو، توانی کە جڵەوی مەسەلەکان بگرێت و ئیمانداران لەو هەڵوێستە ناڕەحەتە ڕزگار بکات، کاتێك هێزەکانی دوژمن گەیشتنە مەدینە،[1] لەو کاتە هەموو سەرکردەکانی موسڵمانان لە ژێر سەرکردایەتی پێغەمبەر(ﷺ) کۆبوونەوە، کە ئەوەش یەکێك بوو لە هۆکارەکانی بردنەوەی ئەو شەڕە.

---

١ بڕوانە: القيادة العسكرية في عهد الرسول ١١).

## باسی دووەم: سەخت بوونی مەینەتی لەسەر موسڵمانان

موسڵمانان هەموو دووربینیەکیان کرد و، هەرچی هەوڵیان هەیە بە گەڕیان خست بۆ بەرگری کردن لە مەدینە، بەڵام سوننەتی خوای گەورە جێگیر بوو کە سەرکەوتن بە دەست نایەت پاش نارەحەتی نەبێت، لە ڕاستیشدا مەینەتی موسڵمانان زیادی کرد لە کاتی:

### یەکەم: هەڵوەشاندنەوەی جوولەکەی(بني قريظة) بۆ پەیمانەکەیان و هەوڵدانیان بۆ لێدانی موسڵمانان لە پشتەوە.

موسڵمانان دەترسان لە غەدر و ناپاکی جوولەکەکانی(بني قريظة) کە نیشتەجێ بوون لە باشووری مەدینە، چونکە لەو کاتەدا موسڵمانان دەکەوتنە نێوان دوو ئاگر، جوولەکە لە پشتەوە و، ئەحزابەکانیش لە پێشەوە، لە ڕاستیشدا سەرۆکی(بني النضير) توانی سەرۆکی(بني قريظة) قایل بکات بۆ ئەوەی بێتە پاڵ ئەحزابەکان بۆ شەڕی موسڵمانان.

ئینجا دەنگۆیەك پەیدابوو لە نێوان موسڵماناندا کە(بني قريظة) پەیمانەکەیان هەڵوەشاندووەتەوە، هەر بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بە ڕەوانەکردنی زوبەیری کوڕی عەووام، کە پیاوی کارە قورسەکان بوو، بۆ هێنانەوەی ڕاستی ئەو هەواڵە، زوبەیریش ڕۆیشت و سەیری کرد و گەڕایەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بینیم خەریکی چاککردنی قەڵاکانیان و ڕێکخستنی ڕێگەکانن، مەڕ وماڵاتەکانیشیان کۆکردووەتەوە.[1]

ئینجا لە پاش ئەوەی بەڵگە زۆر بوو لەسەر هەڵوەشاندنەوەی(بني قريظة) بۆ پەیمانەکەیان، پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بە ناردنی سەعدی کوڕی موعاز و سەعدی کوڕی عوبادە و عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە و خەواتی کوڕی جوبەیر(رضي الله عنهم) و، پێی فەرموون: بڕۆن تاکو دڵنیا دەبن ئایا ئەو هەواڵە ڕاستە یان نا؟ ئەگەر وابوو

---

١ بڕوانە: المغازي للواقدي (٢/٤٥٧).

قسەیەکم بۆ بکەن کەسی تر لێی تێنەگەیەنن و ورەی خەڵکی دامەبەزێنن، بەڵام ئەگەر لەسەر ئەمەکی خۆیان مابوونەوە، بە دەنگی بەرز خەڵکی ئاگادار بکەنەوە.[١]

ئەوانیش ڕۆیشتن و بینییان(بني قريظة) پەیمانیان هەڵوەشاندووەتەوە، گەڕانەوە لای پێغەمبەر(ﷺ) و سەلامیان کرد و وتیان:(عضل) و(قارة)،[٢] ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) لە مەبەستیان تێگەیشت.[٣]

پێغەمبەر(ﷺ) لەم ناپاکییەی(بني قريظة) بە ئەوپەڕی خۆڕاگری و توند و تۆڵییەوە پێشوازی لێ کرد، هەموو ڕێگەیەکیشی گرتە بەر کە ببێتە مایەی ورە بەرزکردنەوەی ئیمانداران، بۆیە لە هەمان کاتدا هەڵسا بە ناردنی سەلەمەی کوڕی ئەسلەم لەگەڵ دوو سەد کەس و، زەیدی کوڕی حاریسە لەگەڵ سێ سەد کەسدا، بۆ پاسەوانێتی مەدینە و،(الله اكبر) کردن بە دەنگی بەرزەوە، بۆ ئەوەی(بني قريظة) بتۆقێنن، لەم کاتانەیش ئەوان ئامادە بووبوون بۆ بەشداری کردن لەگەڵ ئەحزابەکاندا و، بیست وشتریان ناردبوو، بارکراو لە خورما و جۆ و هەنجیر بۆ یارمەتیدانی ئەوان، بەڵام ئەو بارانە بوون بە دەستکەوت بۆ موسڵمانان کە توانیان دەست بگرنە سەریدا و هێنایانە لای پێغەمبەر(ﷺ).[٤]

## دووەم: سەخت بوونەوەی ئابلوقەی موسڵمانان و پاشەکشەکردنی مونافیقەکان و بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە.

هێزەکانی ئەحزاب گەمارۆی خۆیانیان توندکردەوە لەسەر موسڵمانان پاش ئەوەی(بني قريظة) هاتنە پاڵیان، مەینەتی موسڵمانانیش زیادی کرد و هەڵوێستەکە نارەحەتتر بوو، قورئانی پیرۆزیش باسی ئەم نارەحەتییەی موسڵمانانی کردووە و فەرمووتی: ﴿إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَـٰرُ وَبَلَغَتِ

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابن كثير (٣/١٩٩).
٢ ناوی ئەو دوو هۆزە بوو کە ناپاکیان کرد لەگەڵ هاوەڵانی پێغەمبەر لە (ذات الرجيع)دا.
٣ بڕوانە: البداية والنهاية (٤/٩٥).
٤ بڕوانە: السيرة الحلبية (٢/٣١٢).

ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴿١٠﴾ هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا ﴾(الاحزاب: ١٠-١١).

باوەڕی موسڵمانانیش بە خوای خۆیان بەهێز بوو: ﴿ وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُوا۟ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ۚ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا ﴾(الاحزاب: ٢٢).

سەبارەت بە مونافیقەکانیش، پاشەکشەیان کرد لە سوپاکە و ترسیان زیادی کرد، تەنانەت میعتەبی کوڕی قوشەیر دەیووت: موحەممەد بەڵێنی گەنجینەکانی کیسرا و قەیسەری پێداین، کەچی کەسێکمان دڵنیا نییە لە خۆی بچێتە سەر ئاو ئێستا، هەندێکی تریش داوای مۆڵەتیان دەکرد بگەڕێنەوە بۆماڵەکانیان چونکە دەرگاکانی کراوەتەوە و قایمیان نەکردووە، خۆیشی وانەبوو، بەڵام هەڵوێستەکەیان پڕ بوو لە ترس و ساردکردنەوەی ئیمانداران، هەندێ ڕیوایەتی لاوازیش هاتووە باسی پڕ و پاگەندەکانیان دەکات،[1] بەڵام قورئانی پیرۆز باسی ئەو هەڵوێستانەی بە شێوەیەکی ورد کردووە:

﴿ وَإِذْ قَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ يَٰٓأَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَٱرْجِعُوا۟ ۚ وَيَسْتَـْٔذِنُ فَرِيقٌ مِّنْهُمُ ٱلنَّبِىَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِىَ بِعَوْرَةٍ ۖ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا ﴿١٣﴾ وَلَوْ دُخِلَتْ عَلَيْهِم مِّنْ أَقْطَارِهَا ثُمَّ سُئِلُوا۟ ٱلْفِتْنَةَ لَـَٔاتَوْهَا وَمَا تَلَبَّثُوا۟ بِهَآ إِلَّا يَسِيرًا ﴿١٤﴾ وَلَقَدْ كَانُوا۟ عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ مِن قَبْلُ لَا يُوَلُّونَ ٱلْأَدْبَٰرَ ۚ وَكَانَ عَهْدُ ٱللَّهِ مَسْـُٔولًا ﴿١٥﴾ قُل لَّن يَنفَعَكُمُ ٱلْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ ٱلْمَوْتِ أَوِ ٱلْقَتْلِ وَإِذًا لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٦﴾ قُلْ مَن ذَا ٱلَّذِى يَعْصِمُكُم مِّنَ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوٓءًا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ رَحْمَةً ۚ وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٧﴾ ۞ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ وَٱلْقَآئِلِينَ لِإِخْوَٰنِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا ۖ وَلَا يَأْتُونَ ٱلْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٨﴾ أَشِحَّةً عَلَيْكُمْ ۖ فَإِذَا جَآءَ ٱلْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ كَٱلَّذِى يُغْشَىٰ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ ۖ

---

١ بڕوانە: المعجم الكبير للطبراني (٢٧٦/١١)، مجمع الزوائد (١٣١/٦).

فَإِذَا ذَهَبَ ٱلْخَوْفُ سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى ٱلْخَيْرِ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا۟ فَأَحْبَطَ ٱللَّهُ أَعْمَـٰلَهُمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿١٩﴾ يَحْسَبُونَ ٱلْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُوا۟ ۖ وَإِن يَأْتِ ٱلْأَحْزَابُ يَوَدُّوا۟ لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ فِى ٱلْأَعْرَابِ يَسْـَٔلُونَ عَنْ أَنۢبَآئِكُمْ ۖ وَلَوْ كَانُوا۟ فِيكُم مَّا قَـٰتَلُوٓا۟ إِلَّا قَلِيلًا ﴾(الاحزاب: ١٣-٢٠).

هەوڵەکانی بتپەرستانیش هەر زیادی دەکرد بۆ بەزاندنی کەندرەکە، ئەسپ سوارەکانیان بە ژمارەیەکی زۆرەوە هەموو شەوێك تا بەرەبەیان بە دەوری کەندرەکەدا دەسوڕانەوە، خالدی کوڕی وەلیدیش هەوڵی هاتنە ژوورەوەی دا لە لایەکی تەسکی کەندرەکەوە، بەڵام(اسید بن حضیر) و دوو سەد کەس کە لەگەڵی بوون، چاودێری جموجوڵیان دەکردن و هەندێك پەلامار دروست بوو لە نێوانیاندا و، توفەیلی کوڕی نوعمان بە دەستی وەحشی بکوژی حەمزە شەهید کرا.[1] هەروەها(حبان بن عرفة) لە موشریکەکان توانی بە تیرێك سەعدی کوڕی موعاز بریندار بکات لە دەمارێکی دەستی دا، ئەو کاتەی کە لێیدا وتی: وەریگرە ئەو تیرە لە ئیبنو عەرەفەوە، بەڵام سەعدی کوڕی موعاز کاتێك بریندار بوو فەرمووی: خوایە ئەگەر شەڕی قورەیشمان ماوەتەوە تەمەن درێژم بکە تا بتوانم جیهاد بکەم لە دژیان، چونکە هیچ کەسانێك نییە حەز بکەم جیهادیان بکەم ئەوەندەی کەسانێك کە پێغەمبەرەکەتیان بە درۆ خستووەتەوە، خوایە من وا دەزانم شەڕت تەواو کردووە لە نێوانماندا، جا ئەگەر وایە خوایە گیان برینەکەم بتەقێنیت و بیکەی بە هۆکاری مردنم.

ئینجا موشریکەکان پۆلێکی سەربازی گەورەیان ڕەوانەی بارەگای پێغەمبەر(ﷺ) کرد، موسڵمانان شەڕیان لەگەڵ کردن ڕۆژێك تاکو شەوەکەی، کاتێك نوێژی عەسر نزیك بوویەوە پۆلە سەربازییەکە نزیك بوونەوە، ئیتر نە پێغەمبەر(ﷺ)و نە کەسێك لە هاوەڵان نەیانتوانی نوێژ بکەن، ئەو هێزەش ئەو ناوچەیەیان بەجێ نەهێشت شەو نەبێت، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((ملأ الله

---

١ بڕوانە: حديث القران الكريم عن غزوات الرسول (٤٢٤/٢).

بیوتهم وقبورهم ناراً كما شغلونا عن الصلاة الوسطى حتى غابت الشمس))،[١] واتە: خوای گەورە ماڵەکانیان و گۆڕەکانیان پڕکات لە ئاگر، وەکو سەرقاڵیان کردین لە نوێژی عەسر.

## سێیەم: هەوڵدانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ سووککردنەوەی ئابلۆقەکە لە ڕێگەی ڕێککەوتن لەگەڵ غەتەفان و، بلاوکردنەوەی پڕوپاگەندە لە ڕیزەکانی دوژمندا.

**١- سیاسەتی پێغەمبەر(ﷺ) لە دانوستان لەگەڵ غەتەفاندا:**

لێهاتوویی پێغەمبەر(ﷺ) و شارەزایی سیاسی لەوەدا دەرکەوت، کاتێك هەڵساه بە هەڵبژاردنی هۆزی غەتەفان بۆ ئەوەی لەگەڵیان ڕێککەوێت لەسەر هەندێ ماڵ و بەروبووم کە بیانداتێ چونکە دەیزانی ئەوان نەهاتوون لە پێناو هیچ ئامانجێکی سیاسی یان پاڵنەرێکی بیروباوەڕ، بەڵکو تاکە ئامانجیان دەست بەسەراگرتنی هەندێ لە ماڵ و سامانەکانی مەدینەیە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) هەوڵی نەدا پەیوەندی بکات لەگەڵ جوولەکەکان یان قوڕەیش، چونکە چاك حاڵی بوو لە مەبەستی هاتنی ئەوان، بەڵکو تەنها پەیوەندی کرد بە سەرانی غەتەفانەوە، کە ئەوانیش هیچ دوو دڵیان دەرنەبڕی لە قبووڵ کردنی پێشنیارەکە، ئینجا دوو کەس لە سەرکردەکانیان(عیينة بن حصن و الحارث بن عوف) هاتنە لای پێغەمبەر(ﷺ) لە بارەگاکەی و لەو دیوی کەندەڕەکەوە کۆبوونەوەیان لەگەڵ کرد، بێ ئەوەی کەس پێیان بزانێت، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) دەستی کرد بە دانوستان لەگەڵیاندا بەم شێوازەی خوارەوە:

أ- ئەنجامدانی ڕێککەوتننامەیەکی یەك لایەنی لە نێوان موسڵمانان و غەتەفاندا کە لە نێو هێزەکانی ئەحزابدایە.

ب- غەتەفان ئاشتی بکات لەگەڵ موسڵمانان و ڕاوەستێت لە ئەنجامدانی هەر کارێکی سەربازی لە دژیان بە تایبەتی لەو کاتەدا.

ج- غەتەفان ئابلۆقەکە بکاتەوە لەسەر مەدینە و پاشەکشە بە هێزەکانی بکات

---

١ البخاري كتاب المغازي، باب غزوة الخندق (٤١١١).

بۆ دەڤەری خۆیان.

د- بەرامبەر ئەوە، موسڵمانان سێیەکی بەروبوومی مەدینە لە هەموو جۆرەکان بدەن بە ئەوان، واشدەردەکەوێت ئەوە بۆ ماوەی یەك ساڵ بووە،[1] وەکو لە ڕیوایەتی واقیدی هاتووە، ئەوان داوای نیوەیان کردووە، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ڕازی نەبووە.[2]

قبووڵ کردنی دوو سەرکردەکەی غەتەفان بۆ پێشنیارەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕووی سەربازییەوە، ئاماژە بۆ ئامانجی ئەوان دەکات، کە ئەوان تەنها بۆ دەستکەوت هاتووەن و، بەم شێوەیەیش توانی بەرەی ئەحزابەکان لاواز بکاتەوە.[3]

لەم دانوستانەدا پێغەمبەر(ﷺ) لایەنێکی گرنگی لە پێغەمبەرایەتی ئاشکراکرد، سەبارەت بە جموجۆڵ بۆ چارەسەرکردنی قەیرانەکان، بۆ ئەوەی نەوەکانی موسڵمان وانەیەکی کاریگەری لێ وەرگرن لە کاتی سەخت بوونی مەینەتیدا.[4] پێش ئەنجامدانی ڕێککەوتنەکەیش پێغەمبەر(ﷺ) ڕاوێژی بە هاوەڵان کرد لەم بارەوە، ئەوانیش پێیان وابوو هیچ بە غەتەفان نەدرێت، هەردوو سەعدی کوڕی موعاز و سەعدی کوڕی عوبادە وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە کارێکە خۆت حەزی لێ دەکەیت، تاکو ئێمەیش بیکەین، یان خوای گەورە فەرمانی پێ کردووی یان لە پێناو ئێمەدا دەیکەیت؟ فەرمووی: بەڵکو ئەمە کارێکە لە پێناو ئێوەدا دەیکەم، سەعدی کوڕی موعاز وتی ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە و ئەوان لەسەر بتپەرستی بووین، خوامان نەدەناسی و نەدەپەرست، لەو کاتە ئەوان تەماعیان نەبوو یەك دانە لە بەروبوومی مەدینە بخۆن، مەگەر بە میوانداری یان فرۆشتن نەبێت، ئایا دوای ئەوەی کە خوای گەورە ڕێزی لێ گرتین بە ئیسلام و بە تۆ و بەو ئایینە سەربەرزی کردین ماڵەکانمانیان پێ بدەین؟ ئێمە پێویستمان بەوە نییە، سوێند بە خوا تەنها شمشێرەکانمانیان پێ دەدەین، تاکو خوای گەورە خۆی حوکم دەکات لە

١ بڕوانە: غزوة الاحزاب محمد احمد باشميل (٢٠١-٢٠٢).
٢ بڕوانە: المغازي للواقدي (٢/٤٧٧).
٣ بڕوانە: القيادة العسكرية في عهد الرسول (٤١٣).
٤ بڕوانە: محمد رسول الله، الصادق عرجون (٤/١٧٦).

نێوانماندا، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر ئەو قسەیان ڕازی بوو، سەعدی کوڕی موعازیش لاپەڕەکەی هەڵگرت و ڕێککەوتن نامەکەی کوژاندەوە و وتی: با شەڕمان لەگەڵ بکەن.[1]

وەڵامی هەردوو سەرکردەکەی ئەنصار لە ئەوپەڕی گوێڕایەڵی و خۆبەدەستدانەوە بوو بۆ خوا و پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە کاتێك بۆیان دەرکەوت بە مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) لەو کارە لە پێناو خۆیاندایە، بەو شێوە وەڵامیان دایەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) پێخۆشحاڵ بوو بەو وەڵامەیان و ئیتر ڕێککەوتن نامەکە هەڵوەشایەوە لەگەڵ غەتەفان.[2]

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: من نامەوێت عەرەب هەموویان بە جارێك لەسەرتان کۆببنەوە،[3] ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) نەیدەویست دوژمن یەك ڕیز بن لە دژی موسڵمانان، ئەمەیش موسڵمانان فێری هەندێك شت دەکات:

- پێویستە موسڵمانان پشکنین بکەن بە دوای کەلێنی دوژمنەکانیاندا.
- پێویستە ئامانجی ئیستراتیژی سەرکردایەتی موسڵمانان بێ لایەن کردنی هەر لایەنێك کە بتوانێت بێ لایەنی بکات، بێ ئەوەی فەتوا و ڕاوێژکردن و بەرژەوەندی کاتی و ئاییندەیی ئیسلام لەبیر بکات.[4]

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بەڕاوێژکردنی بە هاوەڵانی، فێری گرنگی ڕاوێژمان دەکات و بۆ ئەوەی کەس بیر و بۆچوونی خۆی نەسەپێنێت، تەنانەت بۆ خودی پێغەمبەریش(ﷺ).[5]

قبووڵ کردنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ڕەتکردنەوەی هاوەڵان بۆ ئەو ڕێککەوتننامە، ئاماژە دەکات بۆ گرنگی ڕێزگرتنی سەرکردە لە بیروبۆچوونی سەربازەکانی، کارەکەی پێغەمبەر(ﷺ)یش بە سیاسەتی شەرعی دێتە ئەژمار کە بەرژەوەندی و

---

١ بڕوانە: البداية والنهاية (١٠٦/٤).
٢ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (١٢٥/٦).
٣ بڕوانە: البداية والنهاية (١٠٦/٤).
٤ بڕوانە: الاساس في السنة (٦٨٧/٢).
٥ بڕوانە: العبقرية العسكرية في غزوات الرسول (٤١٤).

زیانەکان لە چاو دەگرێت.[١]

هەڵوێستی هاوەڵانیش بەرامبەر ئەم ڕێککەوتن نامەیە سێ واتا لە خۆی دەگرێت:

أ- ئازایی و ئەدەبی موسڵمانان پیشان دەدات لە دەربڕینی بیروڕا، لە هەر بابەتێکدا پەیوەندی هەبێت بە کۆمەڵەوە.

ب- ڕاستی موسڵمانانی دەرخست سەبارەت بە پەیوەندیان لەگەڵ خوا و پێغەمبەر(ﷺ) و ئیسلام.

ج- دەرخستنی وورەی بەرزی موسڵمانان و توانایان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەڵوێستە نارەحەتەکان.[٢]

٢- بایەخدانی پێغەمبەر(ﷺ) بە بڵاوکردنەوەی بێ متمانەیی لە ڕیزەکانی دوژمندا:

پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بە بەکارهێنانی چەکی بە گومان خستنەوە بۆ پەرتەوازەکردنی دوژمنانی و نەمانی متمانە لە نێوانیاندا، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەیزانی جۆرە قلیشانەوەیەك هەیە لە نێوانیاندا، بۆیە هەوڵیدا گەورەی بکاتەوە، لە پاش ساردکردنەوەی غەتەفان، نوعەیمی کوڕی مەسعودی غەتەفانی هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانێتی خۆی ڕاگەیاند، بە پێغەمبەریشی وت(ﷺ) من کەس بە موسڵمان بوونم نازانێت، هەر فەرمانێکیشم پێ دەکەیت گوێڕایەڵ دەبم، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو:((انما انت فينا رجل واحد فخذل عنا ان استطعت، فان الحرب خدعة))،[٣] واتە: تۆ تەنها پیاوێکی، جا ئەگەر پێت دەکرێت پەشیمانیان بکەرەوە، چونکە جەنگ فێڵ و تەڵەکەیە.

ئیتر نوعەیمیش هەڵسا بە چاندنی گومان لە نێو هێزە هاوپەیمانەکاندا و، هانی جوولەکەی دا داوای بارمتە بکەن لە قوڕەیش نەوەك پاشگەز ببنەوە و وازیان لێ بهێنن، هەروەها بە قوڕەیشی وت: داواکردنی بارمتە لە لایەن جوولەکە، بۆ ئەوەیە بیدەن بە دەست موسڵمانانەوە وەکو نرخێك بۆ گەڕانەوە بۆ ڕێککەوتن لەگەڵیان،

---

١ بڕوانە: القيادة العسكرية في عهد الرسول (٤١٤).

٢ هەمان سەرچاوە (٤١٥-٤١٦).

٣ بڕوانە: البداية والنهاية (١١٣/٤).

ئەم كارەی نوعەیم بەوە بەناوبانگە كە ناكۆك نییە لەگەڵ بنچینەكانی سیاسەتی شەرعیدا چونكە جەنگ فێڵ و تەڵەكەیە.[١]

نوعەیم لە كارەكەیدا زۆر سەركەوتوو بوو، چونكە توانی پەرتەوازەیان بكات و، هۆكاری سەركەوتنیشی بریتی بوو لە:

أ- موسڵمان بوونی خۆی شاردەوە لە هەموو لایەنەكان، بۆیە هەموو لایەنەكان باوەڕیان پێی دەكرد.

ب- سەرەنجامی(بني قینقاع) و(بني النضیر)ی هێناوە یادی(بني قریظة)، بەرچاوی ڕوون كردنەوە لەو سەرەنجامەی چاوەڕوانیان دەكات ئەگەر بەردەوام بن لە شەڕی موسڵماناندا.

ج- سەركەوتوویش بوو لە قایل كردنی هەموو لایەنەكان بە شاردنەوەی ئەو قسانەی بۆیانی دەكرد، چونكە ئەگەر مەسەلەكەی ئاشكرا بوایە كارەكانی هەرەسی دەهێنا.

بەم شێوەیش نوعەیمی كوڕی مەسعود ڕۆڵێكی گەورەی بینی لە غەزای(الاحزاب)دا.[٢]

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٢/٤٣٠).

٢ بڕوانە: القيادة العسكرية في عهد الرسول (٤٧٧).

## باسی سێیەم: سەرخستنی خوای گەورە بۆ موسڵمانان و باسکردنی قورئان بۆ غەزای ئەحزاب

### یەکەم: زۆر پاڕانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) و دابەزینی سەرکەوتن.

پێغەمبەر(ﷺ) زۆر هاواری دەکرد و دەپاڕایەوە لە خوای گەورە، بە تایبەتی لە کاتی غەزاکاندا، کاتێکیش موسڵمانان کەوتنە حاڵەتێکی ناڕەحەتەوە بەو شێوەی خوای گەورە باسی کردووە، موسڵمانان چارەیان نەما ئەوە نەبێت ڕوویانکردە پێغەمبەر(ﷺ) و وتیان، ئایا شتێك هەیە بیڵێین؟ چونکە دڵەکان گەیشتوونەتە بینەقاقا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵێ..... بڵێن:((اللهم استر عوراتنا وآمن روعاتنا))،[1] واتە: خوایە عەیب و کەم و کوڕییەکانمان داپۆشە و ترسیشمان لەسەر لابدە، هەردوو پێشەوت بوخاری و موسلیم لە عەبدوڵای کوڕی ئەبی ئەوفا دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: پێغەمبەر(ﷺ)پاڕاوەتەوە لە دژ ئەحزابەکان و فەرموویەتی: خوایە ئەی ئەو کەسەی قورئانت دابەزاندووە و، بە پەلە لێپرسینەوە دەکەیت، شکست بهێنە بەو ئەحزابانە، خوایە بیانبەزێنە و بیان لەرزێنە،[2] خوای گەورەیش دوعای پێغەمبەرەکەی قبووڵ کرد و تەفر و تونای کردن و ڕەشەبایەکی ساردی ناردە سەریان و، ترس و بیمی خستە دڵەکانیانەوە، وەکو فەرموویەتی:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَآءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴾(الاحزاب: ٩).

قورتوبی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: ئەو ڕەشە بایە موعجیزەیەك بوو بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە نێوان هەردوولا تەنها پانایی کەندرەکە بوو، ئیتر خوای گەورە فریشتەکانی نارد و مێخی چادرەکانی هەڵکەندن و، ئاگرەکانی کوژاندنەوە و، مەنجەڵەکانی ڕشتن، ئەسپەکانیشیان بەیەکدا دەچوون و،(الله اکبر)ی

---

١ مسند الامام احمد عن ابي سعيد الخدري (٣/٢).

٢ البخاري: كتاب المغازي، (باب غزوة الاحزاب) (٥/٥٩) رقم (٤١١٤).

فریشتەکانیش زیادی کرد لە دەوروبەری سەربازگەکە و، بە یەکتریان دەوت با خۆمان ڕزگار بکەین، ئەوەندە تۆقیبوون.[١]

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ)یش سوور بوو لە جەخت کردن لەسەر ئەوەی ئەو ئەحزابانە لە لایەن جەنگاوەرە موسڵمانەکانەوە نەبەزێنران — سەرەڕای فیداکاری زۆریان — بەڵکو خوای گەورە خۆی بەزاندنی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَآءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴾(الاحزاب: ٩).

لە ئەبو هورەیرەشەوە هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: هیچ خوایەك نییە(الله) نەبێت، سەربازەکانی خۆی سەربەرز کرد و، بەندەی خۆی سەرخست و، تەنها خۆیشی ئەحزابەکانی شکاند و، هیچ شتێکیش نییە لە پاش ئەو.[٢] بەڵام پاڕانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) تەنها لە خوای خۆی، ناکۆك نییە لەگەڵ کارکردن بە هۆکارەکان، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) هەوڵی دا بۆ بڵاوەپێکردنی ئەو هێزانە و کردنەوەی ئابلۆقەکە و شتی تریش.[٣]

## دووەم: بە دواداچوونی گەڕانەوەی ئەحزابەکان.

پێغەمبەر(ﷺ) پێی خۆش بوو هەواڵیان لە نزیکەوە بزانێت، بۆیە فەرمووی: ئایا کامتان دەتوانێت هەواڵی ئەوانمان بۆ بهێنێت و ببێتە هاوڕێم لە قیامەتدا،[٤] ئەم شێوازەی سێ جار دووپات کردەوە، بەڵام کەس بە دەنگیەوە نەهات، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بە بەکارهێنانی توندی و دیاریکردن و، فەرمووی:((قم یا حذیفة فأتنا بخبر القوم ولا تذرعهم عليّ))، واتە: هەڵسە ئەی حوزەیفە هەواڵی ئەوانم بۆ بهێنەوە، مەیانشڵەژێنە لە دژم.

---

١ بڕوانە: تفسير القرطبي (١٤/١٤٤).
٢ البخاري كتاب المغازي باب (غزوة الخندق) رقم (٤١١٤).
٣ بڕوانە: فقه السيرة النبوية للغضبان (٥٠٣).
٤ مسلم كتاب الجهاد والسير، باب (غزوة الاحزاب) (١٧٨٨).

حوزەیفە دەڵێت: منیش ڕۆیشتم دەتووت بە ناو ئاوی گەرمدا دەڕۆم، بینیم ئەبو سوفیان پشتی خۆی دەدایە ئاگرەکە، منیش تیرێکم خستە ناو کەوانەکەم و، ویستم تێی بهاوێژم، بەڵام قسەکەی پێغەمبەر(ﷺ)م بیرکەوتەوە، کە فەرمووی مەیانوروژێنە، ئەگەریش بمهاوێشتایە دەمپێکا، ئیتر گەڕامەوە لای پێغەمبەر(ﷺ) و دەتووت بە ناو ئاوی گەرمدا ڕێدەکەم، بەڵام کاتێك گەڕامەوە لای پێغەمبەر(ﷺ) سەرمام بوو، ئینجا باسم کرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و، ئەویش عەبایەکی زیادی هەبوو نوێژی لەسەر دەکرد، ئەوەی لەبەرم کرد و، منیش تاکو بەیانی خەوتم، ئەو کاتە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم: هەڵسە ئەی خەواڵوو(خەوگران).[1]

لەم بەسەرهاتەی حوزەیفە دەتوانین هەندێ وانە وەربگرین:

١- ناسینی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ کەسەکان کاتێك هەڵسا بە هەڵبژاردنی حوزەیفە کە کەسێکی ئازا و نەبەرد بوو، هەروەها ژیریش بوو.

٢- توند و تۆڵی سەربازی لە لایەن حوزەیفە: چونکە هەلێکی بۆ ڕەخسا ئەبوسوفیان بکوژێت کە سەرکردەی ئەحزابەکان بوو، خەریکیش بوو بیکوژێت، بەڵام قسەکەی پێغەمبەر(ﷺ)ی بیرکەوتەوە.[2]

٣- ڕێزلێگرتنی دوژمنانی خوا: سەرەڕای ساردی کەش و هەوا و باران و ڕەشەبا، حوزەیفە ڕێی دەکرد وەکو چۆن لە ناو حەمامێکدا بێت وابوو، هەروایش مایەوە تاکو گەڕایەوە سەربازگەی موسڵمانان،[3] ئەوەیش کەرامەت بوو بۆی.

٤- میهرەبانی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ حوزەیفە لە کاتی گەڕانەوەی، شەونوێژ و پاڕانەوەی لەو کاتەدا ڕێگەی لێ نەگرت کە سۆز بنوێنێ بۆ حوزەیفە کە توانی چاکترین هەواڵ بهێنێتەوە، بۆیە ئەو پۆشاکەی خۆی کە نوێژی لەسەر دەکرد دای بە حوزەیفە بۆ ئەوەی گەرم ببێتەوە، بێداریشی نەکردەوە تاکو کاتی بەیانی نوێژی بەیانی، ئینجا شێوازی میهرەبانی جوانی لەگەڵدا بەکارهێنا، کاتێك پێی فەرموو:

---

١ مسلم كتاب الجهاد والسير، باب (غزوة الاحزاب) (١٧٨٨).

٢ فقه السيرة للغضبان (٢٠٥) السيرة النبوية لأبي فارس (٣٦٧).

٣ بڕوانە: السيرة النبوية لأبي فارس (٣٦٧).

هەڵسە ئەی خەواڵوو،وەکو خوای گەورەیش دەربارەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:[١] ﴿بالمؤمنين رؤوف رحيم﴾(التوبة: ١٢٨).

٥- هەروەها لە ڕیوایەتی زەرقانیدا هاتووە، کاتێك حوزەیفە چووە ناو هێزەکانی دوژمنەوە، گوێی لە ئەبو سوفیان بوو، وتی: هەر کەسێك لە ئێوە با دەستی هاوڕێکەی بگرێت، حوزەیفە دەڵێت: منیش لە دەستی ئەو پیاوەمدا کە لای ڕاستمەوە بوو، پێم وت: تۆ کێی؟ وتی: موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان، ئینجا لەسەر دەستی ئەوەی لای چەپمداو پێم وت: تۆ کێی؟ وتی: عەمری کوڕی عاص.[٢] بەم شێوەیش دەست پێشخەری کرد و خۆی ڕزگار کرد لەو هەڵوێستە ناخۆشە، کە دوور نەبوو ببێتە مایەی لەناودانی.[٣]

## سێیەم: باسکردنی قورئان بۆ ئەم غەزایە و ئاکامەکانی.

قورئان باسی غەزای ئەحزاب و بەنی قورەیزەی کردووە، چونکە موسڵمانان هەمیشە پێشبینی ئەوە دەکرێت کە هێرشیان بکرێتە سەر لە جێگا و بارەگای خۆیاندا و، لە پایتەختەکانیاندا و، هەروەها مەترسی ئەوە هەیە کە دوژمنانیان یەك بگرن لە دژیان، بۆیە قورئان ئەم دوو ڕووداوەی تۆمار کرد و بۆ ئەوەی هەمیشە دووبارە ببێتەوە و، موسڵمانان سوودی لێ وەربگرن، قورئان دەربارەی ئەحزابەکان گرنگی بە چەند لایەنێك داوە، لەوانە:

١- یادخستنەوەی ئیمانداران بە نیعمەتەکانی خوای گەورە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ جَآءَتۡكُمۡ جُنُودٞ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا وَجُنُودٗا لَّمۡ تَرَوۡهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرًا﴾(الاحزاب: ٩).

٢- باسکردنی خەم و خەفەتی موسڵمانان بە وردی لە ئەنجامی ئابلۆقەدانی موسڵمانان لە لایەن ئەحزابەکانەوە: ﴿إِذۡ جَآءُوكُم مِّن فَوۡقِكُمۡ وَمِنۡ أَسۡفَلَ مِنكُمۡ وَإِذۡ زَاغَتِ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلۡقُلُوبُ ٱلۡحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠﴾(الاحزاب: ١٠).

---

١ بڕوانە: صور وعبر من الجهاد النبوي في الدمينة (٢٤٦).

٢ بڕوانە: شرح الزرقاني (٢/٢٩٣).

٣ بڕوانە: من معين السيرة، (٢٩٣).

٣- دەرخستنی نیازە خراپەکانی مونافیقەکان و ڕەوشتە ناشیرینەکانیان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورًا ﴾(الاحزاب: ١٢).

٤- هاندانی ئیمانداران لە هەموو کات و سەردەمێکدا، بۆ ئەوەی پەیڕەوی بکەن لە پێغەمبەر(ﷺ): ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴾(الاحزاب: ٢١).

٥- ستایشکردنی ئیمانداران لەسەر هەڵوێستە مەردانەکانیان لە دژی دوژمنانیان، خوای گەوری دەفەرموێت: ﴿ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴾(الاحزاب: ٢٣).

٦- ئاشکراکردنی سوننەتێك لە سوننەتەکانی خوا کە دواناکەوێت، ئەوەیش ئەوەیە سەرەنجامی باش بۆ ئیماندارانە و، تێکشکانیش بۆ دوژمنەکانیانە، خوای گەوری دەفەرموێت: ﴿ وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا۟ خَيْرًا ۚ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴾(الاحزاب: ٢٥).

٧- منەت کردنی خوای گەورە بەسەر بەندە ئیماندارەکانی چونکە سەریخستنە سەر بەنی قورەیزە لە ناو قەڵا قایمەکانیان بەبێ جەنگ.... ﴿ وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن صَيَاصِيهِمْ وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ فَرِيقًا تَقْتُلُونَ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا ﴿٢٦﴾ وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ وَدِيَٰرَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُمْ وَأَرْضًا لَّمْ تَطَـُٔوهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرًا ﴾(الاحزاب: ٢٦-٢٧).

لە ڕاستیدا غەزای ئەحزاب لەو غەزا گرنگانە بوو کە موسڵمانان ئەنجامیاندا و، دەرەنجامی چاکیشی هەبوو، لەوانە:

* سەرکەوتنی موسڵمانان و، تێکشکان و پەرتەوازەبوونی دوژمنانیان و،

گەڕانەوەیان بەبێ هیوایی.

* گۆڕانی بارودۆخ بۆ بەرژەوەندی موسڵمانان، چونکە هەڵوێستیان گۆڕا لە بەرگری کردن بۆ هێرش کردن، پێغەمبەر(ﷺ)یش ئاماژەی کردووە بۆ ئەوە کاتێك فەرموویەتی: ئیتر ئێمە هێرشیان دەکەینە سەر و ئەوان هێرشمان ناکەنە سەر، ئیتر ئێمە بەرەو لای ئەوان دەچین.[١]

* ئەم غەزایە کینەی بەنی قورەیزەی دەرخست لە دژی موسڵمانان، چونکە ئەوان پەیمانەکەیان شکاند لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا لە ناخۆشترین بارودۆخدا.

* غەزای ئەحزاب ڕاستی ئیمانی موسڵمانان و ڕاستی مونافیق و جوولەکەکانی دەرخست، بۆیە ئەو تاقی کردنەوە پاککردنەوەیەك بوو بۆ موسڵمانان.

* غەزای بەنی قورەیزە یەکێك بوو لە دەرەنجامەکانی غەزای ئەحزاب.[٢]

## چوارەم: ڕزگاربوون لە بەنی قورەیزە.

لە پاش گەڕانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە خەندەق و دانانی چەك، خوای گەورە فەرمانی پێکرد جەنگ لە دژی(بني قريظة) بکات، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی بە هاوەڵانی کرد بۆ ئەوەی بەڕێکەون، ئاگاداریشی کردنەوە کە خوای گەورە جیبریلی ناردووە قەڵاکانیان بلەرزێنێت و ترس بخاتە دڵەکانیانەوە و،(کەس نوێژی عەسر نەکات لە بەنی قورەیزە نەبێت).[٣]

موسڵمانان بیست و پێنج شەو ئابلۆقەی(بني قريظة)یان دا،[٤] بەڵام لە کاتێکدا ئابلۆقەکەیان درێژەی کێشا توانای بەرگرییان نەما و، داوایان کرد پێغەمبەر(ﷺ) سەعدی کوڕی موعاز بکاتە دادوەر بەسەریاندا، چونکە وا بۆچوونیان ئەوە بوو کە بەزەیی پێیاندا دێتەوە بە هۆی هاوپەیمانێتی کۆن کە لە نێوانیاندا بوو، ئیتر

---

١ البخاري كتاب المغازي باب (غزوة الخندق) رقم (٤١١٠).
٢ بڕوانە: حديث القران الكريم عن غزوات الرسول (٢/٤٤٢).
٣ البخاري كتاب المغازي باب (مرجع باب النبي (ﷺ) من الاحزاب رقم (٤١١٩).
٤ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٣٧٢).

سەعدیان بە هەڵگیراوی هێنا، چونکە لە غەزای خەندەق بریندار بووبوو، ئەویش فەرمانی کرد شەڕکەرەکانیان بکوژرێن و ژن و منداڵەکانیان بە کۆیلە بگیردرێن و، ماڵەکانیشیان دابەش بکرێت، پێغەمبەر(ﷺ)یش ڕازی بوو و فەرمووی: بە حوکمی خوای گەورە دادوەریت کردووە.[1] فەرمانی کوشتنی لەسەر چوارسەد کەسیان جێبەجێ کرا لە بازاڕی مەدینە، چاڵی گەورەیان بۆ دروست کردن و بە کۆمەڵ نێژران، کۆمەڵێکی کەمیشیان ڕزگاریان بوو لە کوژران چونکە بە ئەمەك بوون بۆ پەیمانەکانیان و هاتنە ئیسلامەوە، ماڵ و منداڵەکانیشیان لەسەر موسڵمانان دابەش کرا.

ئەمەیش پاداشتێکی دادگەرانەیە بەرامبەر کەسانێك غەدر و ناپاکیان کردووە و، پەیمانیان لەگەڵ موسڵمانان شکاندووە، پاداشتیشیان لە جۆری کارەکەیان بوو، چونکە ئەوان بە ناپاکی خۆیان موسڵمانانیان تووشی شەڕ و تاڵان کرد.[2]

تەنها ئافرەتێکیش نەبێت کەس لە ئافرەتەکانی بەنو قورەیزە نەکوژران، عائیشە(رضي الله عنها) دەفەرمووێت: کەس لە ئافرەتەکانیان نەکوژرا یەك کەس نەبێت، سوێند بە خوا لە لای من بوو پێدەکەنی و خەمی پێوە دیار نەبوو، لە کاتێکدا پێغەمبەر(ﷺ) پیاوەکانیانی دەکوشت لە بازاڕدا، کەسێك هاواری کرد بە ناوی ئەو، کوا فڵانە کەس؟ وتی: بە خوا ئەو کەسە منم، دەڵێت: وتم: بەڵات لێکەوێت ئەوە چیتە؟ وتی: دەکوژرێم، وتم: بۆچی؟ وتی: لەبەر کارێك کە کردوومە،[3] وتی: ئیتر بردیان و لە گەردنی درا، عائیشە(رضي الله عنها) دەیفەرموو: سوێند بە خوا لە بیرم ناچێت چەند ڕووی خۆش بوو و، دەشیزانی دەکوژرێت.[4]

بە لەناوبردنی(بني قريظة) مەدینە پاك بوویەوە لە جوولەکە و، تەنها موسڵمانانی تیا مایەوە، بەرەی ناوخۆیش لە ڕەگەزێکی ترسناك ڕزگاری بوو، خەونی

---

١ البخاري كتاب المغازي باب (مرجع باب النبي (ﷺ) من الاحزاب رقم (٤١٢٠).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (١/٣١٥-٣١٧).

٣ دەستاڕێکی فڕێدایە سەر خەللادی کوڕی سوەید و کوشتی ئیتر پێغەمبەر (ﷺ) لە خوێنی ئەودا کوشتی.

٤ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٣٧٧).

قورەیشیش سەری نەگرت لەوەی ئەوان هەڵوێستێکیان هەبێت دژ بە موسڵمانان.[١]

پاراستنی بەرەی ناوخۆیی بۆ دەوڵەتی ئیسلامی لە گێرەشێوێنەکان، ڕێبازێکی پێغەمبەرانەیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کێشای بۆ ئوممەتەکەی.

١ بڕوانە: سیرة الرسول، دروزة (٢/٧٦)، نقلا عن دراسات في عهد النبوة للشجاع (١٥٣).

## باسی چوارەم: سوود و وانە و پەند

### یەکەم: موعجیزە هەستپێکراوەکانی پێغەمبەر(ﷺ):

لە قۆناغی هەڵکەندنی کەندڕەکە هەندێ موعجیزەی هەست پێکراو دەرکەوت لەسەر دەستی پێغەمبەر(ﷺ)، لەوانە، زۆربوونی ئەو خواردنەی جابیری کوڕی عەبدولڵا دروستی کرد، هەر خۆیشی(ﷺ) دەفەرمووێت: لە غەزای خەندەقدا خەریکی هەڵکەندن بووین، لە ناکاو بەردێکی سەختمان هاتە پێش، هاتنە لای پێغەمبەر(ﷺ) و بۆیان باس کرد، ئەویش فەرمووی: خۆم دێمە خوارەوە، ئینجا هەڵسا و بەردێکی لەسەر سکی بەستبوو، سێ ڕۆژ بوو خواردنمان نەخواردبوو، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ)پاچەکەی هەڵگرت و ئەو بەردەی کرد بە خۆڵ.

جابیر دەڵێت: وتم ئەی پێغەمبەری خوا، مۆڵەتم بدە بگەڕێمەوە ماڵ، ئیتر بە خێزانەکەم وت: پێغەمبەر(ﷺ)م لە حاڵەتێکی وەها بینی، ئایا هیچ خواردنت لایە؟ وتی: بەڵێ هەندێ جۆو گیسکێك، منیش گیسکەکەم سەربڕی و جۆکەم هاڕی و گۆشتەکەیشمان خستە ناو مەنجەڵەوە، ئیتر هاتمە لای پێغەمبەر(ﷺ) و گۆشتەکەم کە خەریك بوو دەکوڵا، وتم: کەمێك خواردنمان کردووە، جا خۆت و پیاوێك یان دوو پیاو ئەگەر بێن لەگەڵم،ئەویش پرسیاری لێکردم( خواردنەکەتان چەندە؟) منیش مەسەلەکەم بۆ گێڕایەوە وپێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: زۆر چاکە و فەرمووی: بە خێزانت بڵێ مەنجەڵەکە دەستکاری نەکات و نانەکە لە تەنوورەکە نەکاتەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەڵسن، موهاجیر و ئەنصارەکان هەڵسان، کاتێك چووە لای خێزانەکەی، وتی:بەلات لێکەوێت پێغەمبەر(ﷺ) هەموویانی هێناوە، وتی: پرسیاری لێت کرد خواردنەکە چەندە؟ وتم: بەڵێ، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بچنە ژوورەوە و، قەرەباڵغی دروست مەکەن. ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) نانی دەبڕی و گۆشتی تێدەکرد و سەری مەنجەڵەکە و تەنوورەکەی دادەپۆشی کە لێیان دەردەکرد و، دەیدا بە هاوەڵان، تاکو هەموویانی تێرکرد و، لێشی مایەوە و، فەرمووی بە ئافرەتەکە: لێی بخۆو لێشی ببەخشە، چونکە خەڵکی لە برسێتیدان.[١]

---

١ بڕوانە: البخاري كتاب المغازي باب (غزوة الخندق) رقم (٤١٠١).

موعجیزەیەکی تریش لەم شێوە ڕوویدا، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) پۆشاکێکی ڕاخست و چەند دانە خورمای لە کچەکەی بەشیری کوڕی سەعد وەرگرت و خستیە سەر ئەو پۆشاکە و بانگی خەڵکەکە کرا و هەموویان لێیان خوارد و، زیادەشی لێ مایەوە.[1]

لەم دوو هەواڵە موعجیزەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بە ئاشکرا بە دەردەکەوێت و، هەروەها ڕۆڵی ئافرەتی موسڵمانیش لە ڕێگەی گەیاندنی ئازووقە بۆ ئەو کەس و کارانەیان خەریکی هەڵکەندنی کەندرەکە بوون.[2]

هەروەها لە بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی لە کاتی ئەو غەزایەدا، ئەوەبوو پێغەمبەر(ﷺ) بە عەمماری کوڕی یاسری فەرموو: دەستە زۆردارەکە دەتکوژن، کە دواتر لە ناو سوپای عەلی دا کوژرا لە(صفین)[3] کاتێک پێغەمبەریش(ﷺ) لە تاوێرەکەیدا، بە سێ جار وردی کرد، لە دوای یەکەم لێدان فەرمووی:(الله اکبر) کلیلەکانی شامم پێ بەخشرا، سوێند بە خوا، تەلارە سوورەکانی دەبینم ئێستا، لە پاش لێدانی دووەمیش فەرمووی:(الله اکبر) کلیلەکانی فارسم پێ بەخشرا، سوێند بە خوا تەلاری مەدائین دەبینم سپی یە، لە دوای لێدانی سێیەمیش فەرمووی:(الله اکبر) کلیلەکانی یەمەنم پێ بەخشرا، سوێند بە خوا ئێستا لەم جێگایەی خۆمەوە دەرگاکانی(صنعاء) دەبینم.[4]

ئەم مژدانەش کە پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتێکدا بە موسڵمانانی دەدا لە ئابلۆقە و ترس و برسێتیدا بوون، هەر هەمووی هاتنە دی.[5]

## دووەم: لە نێوان وابۆچوون و ڕاستیدا.

پیاوێک لە دانیشتوانی کوفە بە حوزەیفەی کوڕی یەمانی وت: ئایا ئێوە پێغەمبەر(ﷺ)تان بینی و هاوەڵیتان کرد، فەرمووی: بەڵێ ئەی برازام، وتی: چۆن

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٢٤١).
٢ بڕوانە: المرأة في عهد النبوي (١٧٥).
٣ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٤٤٨).
٤ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٤٤٨).
٥ بڕوانە: نضرة النعيم (١/٣٢٥).

بوون لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)، فەرمووی: سوێند بە خوا هەوڵمان دەدا و کۆششمان دەکرد، وتی: سوێند بە خوا ئەگەر ئێمە فریای بکەوتینایە نەماندەهێشت بەسەر زەویدا ڕێ بکات، بەڵکو لەسەر ملمان هەڵماندەگرت، ئیتر حوزەیفە باسی بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ کرد لە شەوی خەندەقدا.[١]

ئەوە تابیعیەکە وادەزانێت ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ)ی ببینیایە لە هاوەڵانی زیاتری بۆ دەکرد، بەڵام ئەندێشە شتێکە و ڕاستیش شتێکی ترە، هاوەڵانیش ئادەمیزاد بوون و، هەموو توانایەکی خۆیشیان بە خەرجدا، لە هەموو ڕوویەوەکەوە، پێغەمبەر(ﷺ)یش دەفەرموێت: چاکترین سەدەکان ئەم سەدەی منە، ئاشکرایشی کرد کردەوەی هیچ کەسانێك بە کردەوەی ئەواندا ناگەیەت، چونکە ئەوان دوای ئەوان هاتن نازانن هاوەڵان لە چی بارودۆخێکی ناڕەحەتدا ژیاون تاکو بزانن چییان کردووە بۆ ئیسلام.[٢]

## سێیەم: سەلمان لە خۆمانە لە(اهل البيت).

لە ڕۆژی خەندەقدا موهاجیرەکان وتیان: سەلمان لە ئێمەیە، ئەنصارەکانیش وتیان: سەلمان لە ئێمەیە، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(سلمان منا اهل البيت)،[٣] واتە: سەلمان لە ئێمەیە لە(اهل البيت)ە.

ئەمەیش نیشانەیەکی پێغەمبەرانەیە بۆ ئەو، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات سەلمان لە موهاجیرەکانە.[٤]

## چوارەم: نوێژی ناوەڕاست.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خوای گەورەماڵەکانیان و گۆڕەکانیان پڕ بکات لە ئاگر، وەکو چۆن سەرقاڵیان کردین لە نوێژی ناوەڕاست تاکو خۆر ئاوا بوو.[١]

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٢٥٥).
٢ بڕوانە: من معين السيرة للشامي (٢٩١).
٣ السيرة النبوية (٣/٢٤٧) ضعفه الالباني في ضعيف الجامع الصغير.
٤ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٦/١٠٨).

هەندێك لە زانایانیش ئەم فەرموودەیان کردووەتە بەڵگە لەسەر ئەوەی نوێژی ناوەڕاست نوێژی عەسرە، هەندێکی تریش لە زانایان دواخستنی نوێژیان بە جائیز زانیووە ئەگەر پاساوێکی هەبێت، وەکو لە ڕێڕەوی مەکحول و ئەوزاعیدا هاتووە.[٢]

دکتۆر(البوطي) دەڵێت: وەکو دەبینی پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی عەصری لەدەست چوو لەم غەزایەدا، بەهۆی زۆری سەرقاڵیەوە، تاکو گەیشتە ئەوەی بە قەزا گێڕایەوە پاش خۆر ئاوابوون، لە ڕیوایەتی تریشدا هاتووە کە زیاتر لە نوێژێکی لە دەست چووە بە دوای یەکدا کردوونی پاش تێپەڕبوونی کاتەکەی، ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر گێڕانەوەی نوێژی نەکراو لە کاتی خۆیدا، تەنانەت ئەوەیش پاساو نییە هەندێك دەڵێن ئەوە بۆ ناچاری بووە بە هۆی جەنگەوە و دواتر نەسخ کراوە، چونکە نەسخ بوون بۆ گێڕانەوەی نوێژەکە نییە بە قەزا، بەڵکو بۆ ڕاستێتی ئەو نوێژەی بە هۆی سەرقاڵیەوە دوابخرێت.[٣]

## پێنجەم: حەڵاڵ و حەرام.

قورەیش پێشنیاری ڕزگارانەیان کرد بەرامبەر لاشەی عەمری کوڕی ود، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی((ادفعوا اليهم جيفته فانه خبيث الجيفة، خبيث الدية فلم يقبل منهم شيئاً))، واتە: لاشە بۆگەنەکەی بگێڕنەوە بۆیان، چونکە لاشەیەکی پیسەو ڕزگارانەشی هەر پیسەو هیچ شتێکی لێوەرنەگرتن.

پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتێکدا ئەمەی فەرموو: لە حاڵەتێکی ناخۆشدا بوون لە ڕووی بژێویەوە، سەرەڕای ئەوەش حەڵاڵ حەڵاڵە و حەرامیش حەرامە، ئەوە پێوەرەکانی ئیسلامە، جا ئەوە لە کوێ و، هەندێ لە موسڵمانان لە کوێ هەوڵ دەدەن پاساو بدۆزنەوە بۆ خواردنی سوو(الربا) و شتی تر.[٤]

---

١ البخاري كتاب المغازي باب (غزوة الخندق) رقم (٤١١١).

٢ بڕوانە: الاساس في السنة (٦٨٢/٢).

٣ بڕوانە: فقه السيرة النبوية (٢٥٣).

٤ بڕوانە: معين السيرة (٢٩٤).

## شەشەم: ئازایەتی صەفییەی پوری پێغەمبەر(ﷺ).

کاتێك جوولەکەکانی بەنی قورەیزە پەیمانەکانیان هەڵوەشاندەوە، یەکێکیان نارد بۆ قەڵای فاریع بۆ هێنانەوەی هەواڵی ئەو قەڵایە کە تەنها ژن و منداڵی تیادابوو، ئیتر لەو کاتە صەفییە کچی عەبدولموتەلیب ستوونێکی هەڵگرت و لەو جوولەکەیداو کوشتی، بۆیە ئەم کارە بوو بە ترسێنەرێك بۆ جوولەکەکان لەوەی توخنی ئەو قەڵایە بکەونەوە، چونکە ئەوان وایان دەزانی پاسەوانێتی دەکرێت.[1]

## حەوتەم: جێگیر نەبوونی ئەو هەواڵانەی باسی ترسنۆکی(حسان) دەکەن(ﷺ).

سەبارەت بە هەواڵی کوشتنی صەفییە بۆ ئەو جوولەکە، لە ڕیوایەتێکی لاوازدا هاتووە،[2] کە صەفییە بە(حسان)ی وتووە ئەو جوولەکە بە دەوری قەڵاکە دەسوڕێتەوە، دابەزە بیکوژە، ئەویش وتوویەتی: خوا لێت خۆش بێت ئەی کچی عەبدولموتەلیب، تۆ دەزانی من بۆ ئەو کارە ناشێم، ئیتر صەفییەیش ئەو کاتە هەڵسا بە کوشتنی و ئینجا بە(حسان)ی وتووە بڕۆ تالانییەکەی بهێنە من لەبەر ئەوەی پیاو بوو نەمهێنا، ئەویش وتوویەتی: پێویستم بە تالانی ئەو نییە.[3]

ئەم هەواڵەیش ڕاست نییە لەبەر چەند هۆکارێك:

١- لە ڕووی ئیسنادەوە ئەو ڕیوایەتە سەنەدی نییە و، ڕەوایش نییە باس بکرێت چونکە ناشیرین کردنە بۆ یەکێك لە هاوەڵان کە ژیانی لە بەرگری کردن لە بانگەوازی ئیسلامدا بەسەر بردووە.

٢- ئەگەر(حسان) بە ترسنۆکی بناسرایە، دوژمنانی لە هۆنراوەکانیاندا باسی ئەو خەسڵەتەیان دەکرد.[4]

---

١ بڕوانە: الرحيق المختوم (٢٨٣-٢٨٤)، المستفاد من قصص القرآن (٢/٢٤٦).

٢ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٣٦٥).

٣ هەمان سەرچاوە (٣٦٥).

٤ بڕوانە: غزوة الاحزاب، الدكتور ابو فارس.

## هەشتەم: یەکەم بیمارگەی ئیسلامی سەربازی.

پێغەمبەر(ﷺ) خێوەتێکی هەڵدا لە مزگەوتی پیرۆزی خۆی، کاتێك دەستاڕی جەنگ دەستی کرد بە خولانەوە، ئینجا فەرمانی کرد بە ڕوفەیدەی ئەسلەمی ببێتە سەرۆکی ئەو بیمارگەیە و ئەو ئافرەتەیش بوو بە یەکەم برین پێچی سەربازی لە ئیسلامدا،[1] ئەو کاتەیش سەعدی کوڕی موعاز پێکرا بە تیرەکە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بخرێتە خێوەتەکەی ڕوفەیدەو خۆی دەچێتە لای.[2]

لەو بەسەرهاتەیش ئەوە وەردەگیرێت، ئەو کەسەی بریندار بوایە لە موسڵمانان و کەس و کاری هەبووایە خۆیان چاودێریان دەکرد، ئەوەشی کەسی نەبووایە دەخرایە ئەو خێوەتە، بەڵام سەعد(ﷺ) سەرەڕای ئەوەی خاوەن کەس و کاری زۆر بوو، پێغەمبەر(ﷺ) خستیە ئەوێ بۆ ئەوەی بە خۆی هەڵسێ بە سەرپەرشتی کردنی، ئەوەیش ڕێز و پێزانین بوو بەرامبەر فیداکاری سەعد بۆ ئیسلام و، ئەوەکانی موسڵمانیش بەم بنەمایە هەمیشە کاریان کردووە پاش سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ).[3]

## نۆیەم: موسڵمان دەکەوێتە تاوانەوە، بەڵام بە پەلە دەگەڕێتەوە.

بەنو قورەیزە شتێکیان ناردە لای ئەبو لوبابەی کوڕی مونزیر، ڕاوێژیان پێی کرد ئایا دابەزن لەسەر حوکمی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەبو لوبابەیش ئاماژەی بۆ گەردنی خۆی کرد، واتە: سەرتان دەبڕن ئەگەر دابەزن، ئینجا پەشیمان بوویەوە لەسەر ئەو کارەی و خۆی بەستەوە بە یەکێك لە دارەکانی ناو مزگەوتەوە و بۆ ماوەی شەش ڕۆژ، لەو ماوەیش خێزانەکەی لە کاتی نوێژدا دەیکردەوە و، دوایی دیسان خۆی دەبەستەوە، تاوەکو خوای گەورە تەوبەکەی وەرگرت و پێغەمبەر(ﷺ) بە دەستی خۆی پەتەکەی بۆ کردەوە، ئەبو لوبابە نهێنییەکی سەربازی درکاند کە دەبوو باسی نەکردایە و، ئینجا چاودێری خوای گەورەی یادکەوتەوە و هەستی کرد بە

---

[1] المستشفيات الاسلامية، د. عبدالله السعيد، (٤٣).
[2] بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٢٦٣).
[3] بڕوانە: من معين السيرة (٢٩٤).

گەورەیی هەڵەکەی،[١] کارەکەشی وەکو جێبەجێ کردن بوو بۆ فەرمایشی خوای گەورە: ﴿إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٖ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا﴾(النساء: ١٧).

هاوەڵان و پێغەمبەر(ﷺ) پێخۆشحاڵ بوون بە وەرگیرانی تەوبەی ئەبو لوبابە و، پێشبڕکێیان دەکرد بۆ مژدەپێدانی تاکو ئومموسەلەمە یەکەم کەس بوو مژدەکەی پێ گەیاند.[٢]

خوای گەورە دەربارەی ئەبو لوبابە فەرمووی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمۡ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾(الانفال: ٢٧).

دەربارەی تەوبەکردنەکەشی فەرمووی: ﴿وَءَاخَرُونَ ٱعۡتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمۡ خَلَطُواْ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ﴾(التوبة: ١٠٢).

## دەیەم: فەزڵ و چاکەکانی سەعدی کوڕی موعاز(رضي الله عنه).

لەم غەزایەدا فەزڵ و پلە و پایەی سەعد دەرکەوت لە لای خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) لەوانە، قبووڵ بوونی پاڕانەوەکەی کاتێک داوای کرد نەمرێت تاکو جەنگی قوڕەیش بە تەواوی کۆتایی پێ دێت، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) لە غەزای بەنی قورەیزە حوکمی لەسەر ئەوان خستە دەست سەعدی کوڕی موعاز و، فەرمانەکەشی سەبارەت بە جوولەکەکان بەڵگەیە لەسەر یەکلابوونەوەی دڵی لەسەر ئیمان.[٣]

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) ڕێزی لە سەعد گرت کاتێک بە ئەنصارەکانی فەرموو:(قوموا الى سيدكم)،[٤] واتە: هەڵسن بۆ لای سەرگەورەکەتان.

---

١ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٦/١٦٥).
٢ صور وعبر من الجهاد النبوي في المدينة (٢٦١).
٣ التاريخ الاسلامي للحميدي (٦/١٧٠).
٤ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٢٦٣).

لە پاش جێبەجێ کردنی فەرمانەکەشی، جارێکی تر سەعد دەستی پاڕانەوەی بەرزکردەوەو فەرمووی: خوایە وادەزانم شەڕ لە نێوان ئێمە و قورەیشدا کۆتایی پێهات، جا ئەگەر وایە برینەکەم بتەقێت و ببێتە هۆی مردنیشم، ئیتر ئەو شەوە مرد،(ﷺ).[1]

پاڕانەوەکەی پاڕانەوەی پیاوی مەزن بوو، کە دەزانن پەیامیان تەنها شەهید بوون نییە، بەڵکو بە دواداچوونی جیهادە تاکو کۆتایی، چونکە خۆی بە بەرپرس دەزانی لە سەرخستنی ئیسلام.

ئینجا لە ژیاننامەکەیدا دەبینین خوای گەورە پاڕانەوەکەی وەرگرتووە، کەواتە ئەو پیاوێکی ڕێزدارە لە ئاسمانەکان و لە زەوی، بۆیە خوای گەورە ویستی فەرمانی بەنو قورەیزە بکەوێتە دەستی سەعد.

ئەو هیچ پەرۆش نەبوو لەسەر مانەوە لە ژیاندا پاش تەواوبوونی جیهاد، جا کە جەنگ کۆتایی پێهات و بە چاوی خۆی سەرەنجامی جوولەکەکانی بینی، تەنها ئەوە دەمێنێ بگات بە پلەی شەهیدی.

هیواکانیشی هەمووی هاتنەدی و، فەرمانی دەرکرد لەسەر(بني قريظة)ی هاوپەیمانی دوێنێ و دوژمنی ئەمڕۆی و، برینەکەی خوێنی بەربوو، ئینجا کەس و کارەکەی گواستیانەوە بۆ ماڵەکانی خۆیان لە(بني عبدالاشهل)، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان ئەوەندە خێرا دەڕۆیشتن پەتی نەعلەکانیان بڕا و، پۆشاکەکانیان لە شان دەکەوتە خوارەوە، پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: دەترسم فریشتەکان پێش ئێمە بیشۆرن وەکو چۆن حەنزەلەیان شۆرد، پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتی شۆردنێدا گوێی لە دایکی سەعد بوو دەگریا و سەعدی دەلاواندەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(كل نائحة تكذب الا ام سعد)، واتە: هەموو لاوێنەرێك درۆ دەکات تەنها دایکی سەعد نەبێت.

لە نەسائیدا هاتووە لە(ابن عمر)ەوە کە ژمارەی ئەو فریشتانەی بەشداریان کرد لە تەرمەکەی سەعد حەفتا هەزار فریشتە بوونە و، عەرشی خوا هاتە هەژان بۆ مردنیو دەرگاکانی ئاسمانی بۆ کراونەتەوە.[2]

---

١ بڕوانە: فقه السيرة لابن هشام (٣/٢٧٥).
٢ النسائي (٤/١٠٠) الجنائز.

عەبدوڵای کوڕی شەودا دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر(ﷺ) هاتە لای سەعد لەو کاتەی لە سەرەمەرگدا بوو و پێی فەرمووو: خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە ئەی سەرگەورەی قەومی خۆت، بە ڕاستی بەڵێنی خۆتت بەجێ هێنا، خوای گەورەیش بەڵێنی خۆی بەجێ دەهێنێت لەگەڵت.[١]

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) لە پاش مردنی سەعد زۆر ستایش و باسی دەکرد، لەوانە، بەڕائی کوڕی عازیب دەگێڕێتەوە کە پۆشاکێکی نەرم پێشکەش کرایە پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان بە دەستیانەوە گرت و پێی سەرسام بوون، فەرمووی:((اتعجبون من لين هذا؟ لمناديل سعد بن معاذ في الجنة خير منها والين))،[٢] واتە: ئایا سەرسام دەبن لە نەرمی ئەمە؟ دەسەسڕەکانی سەعدی کوڕی موعاز لە بەهەشت لەمە چاکتر و نەرمترن.

سەرەڕای ئەو کارە مەزنانەیش کە ئەنجامی دا بۆ خزمەتی ئیسلام، بەڵام هەر ڕزگاری نەبوو لە گوشارەوشار، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر گۆڕەکەی ڕاوەستا، ڕووخساری تێکچوو، سێ جار وتی:(سبحان الله) موسڵمانانیش هەموویان بە دوای پێغەمبەردا(ﷺ) وتیان:(سبحان الله) ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) سێ جار(الله اكبر)ی کرد و موسڵمانانیش بە دوایدا(الله اكبر)یان کرد و بە دوای ئەوە فەرمووی: گۆڕەکە لەسەر سەعد تەسك بوویەوە و بە شێوەیەك گۆڕەکەی سەعدی لەخۆگرت ئەگەر کەسێك لەوە ڕزگاری بووایە خۆی دەبوو، بەڵام خوای گەورە دوایی گوشادی بۆی کردەوە.[٣]

ئەم هاوەڵە بەڕێزە لە تافی لاویدا شەهید بوو، تەمەنی سی و حەوت ساڵ بوو ئەو ڕۆژەی لە دونیا دەرچوو، کەواتە ئەو سەرکردایەتی هۆزەکەی خۆی کردووە بەرەو ئیسلام لە تەمەنی سی ساڵیدا، توانا شاراوەکانیش خۆی لە پاش چل ساڵی دەردەکەون، وەکو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا

---

١ سير أعلام النبلاء (١/٢٨٨) رجاله ثقات.

٢ مسلم، فضائل الصحابة رقم (٢٤٦٦).

٣ بڕوانە: التربية القيادية (٤/٧٧)، نقل عن المسند الامام احمد (٦/١٤١).

حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِى فِى ذُرِّيَّتِىٓ ۖ إِنِّى تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾(الاحقاف: ١٥).

ئیتر ئەمە چ جۆرە کەسێك بێت کە مێژووی ئەوەندە پڕ بێت لە سەروەری‌و خەڵکی ئاسمانەکان مژدەی هاتنی بدەن‌و عەرشی خوا تەنها بۆ ئەو بێتە هەژان،[١] سەعدی کوڕی موعاز پیاوێکی سپی بوو، بالا بەرز و ڕوخسار جوان بوو، چاو گەورەو ڕیش جوان بوو،[٢] ڕەحمەت و ﷺ و باسی هەمیشە هەر بەرز بێت لە ناو چاکسازاندا.

## یانزە: کوژرانی حویەی کوڕی ئەختەب و کەعبی کوڕی ئەسەد.

*** کوژرانی (حيي بن الاخطب النضري):**

(عبدالرزاق) لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە دەگێڕێتەوە دەربارەی هەواڵی ئەحزابەکان و بەنی قورەیزە تاکو دەگاتە ئەوەی دەڵێت:

کاتێك خوای گەورە ئەو کۆمەڵانەی پەرتەوازە کرد، حویەی دەرچوو تاکو گیشتە ناوچەی(الروحاء) پەیمانەکەی بیرکەوتەوە کە بەوانی داوە، ئیتر گەڕایەوە ناویان، جا دواتر بە کۆتکراوی هێنرا و بە پێغەمبەر(ﷺ)ی وت: سوێند بە خوا هیچ کاتێك لۆمەی خۆمم نەکردووە لە دژایەتی تۆ، بەڵام ئەو کەسەی خوا سەرشۆڕی بکات سەرشۆڕ دەبێت، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد و لە گەردنی درا.[٣]

ئینجا پێش جێبەجێکردنی فەرمانی کوژران بەسەریدا ڕووی کردە خەڵکەکە و وتی: خەڵکینە، هەرچی لای خواوە بێت خراپ نییە، فەرمانی خوای گەورەیە و داستانێکە لەسەر نەوەی ئیسرائیل نووسراوە، ئینجا دانیشت و لە گەردنی درا.[٤]

---

١ بڕوانە: القيادية الربانية (٤/٨٧).

٢ بڕوانە: سير أعلام النبلاء (١/٢٩٠).

٣ بڕوانە: مصنف عبدالرزاق (٥/٢٧١) رقم (٩٧٢٧).

٤ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٢٦٥).

دەشتوانین لەم بەسەرهاتە چەند پەندێك وەربگرین:

**أ- پیلانی خراپ هەر بەسەر ئەنجامدەریدا دەشکێتەوە:**

چونکە حویەی هۆزەکانی لە دژی ئیسلام هاندەدا و، بەنی قورەیزەی قایل کرد بە پێویستی هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکەیان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)، خوای گەورەیش سەرەنجامی ئەم کارەی کردە لەناودانی خۆی.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: خوای گەورە مۆڵەتی ستەمکار دەدات، بەلام کاتێك گرتی ئیتر بەری نادات،[1] ئینجا فەرموودەی خوای گەورەی خوێندەوە: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾(هود: ١٠٢).

**ب- دان بە خۆداگرتن لە کاتی سەختیدا:**

حویەی خۆڕاگری پێشاندا و چووە پێشەوە بۆ ئەوەی لە گەردنی بدرێت، بۆ ئەوەی کەس شاکامی پێ نەخوازێت، لە کاتێکدا دەزانێتیش لەسەر ڕێگایەکی چەوتە و بەرەو هەڵدێریشی دەبات، سەرەڕای ئەوە هەر لەسەر ئەو ڕێبازە دەمرێت، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾(الجاثیة: ٢٣).

**ج- هەرکەسێ خوا سەرشۆڕی بکات سەرشۆڕ دەبێت:**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِن يَنصُرْكُمُ ٱللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمْ ۖ وَإِن يَخْذُلْكُمْ فَمَن ذَا ٱلَّذِى يَنصُرُكُم مِّنۢ بَعْدِهِۦ ۗ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾(ال عمران: ١٦٠).

ئینجا دژایەتی حویەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هەڵقولاوی ئێرەیی و کینەیە، لەبەر ئەوەش کە ئەو هەرگیز لەگەڵ خوا نەبووە، بەڵکو هەمیشە لەگەڵ شەیتان بووە دژ بە خۆشەویستانی خوا، بۆیە هێز نییە لەسەر زەویدا سەری بخات ...[2]

---

١ بڕوانە: الصراع مع الیهود لأبي فارس (١١٢/٢).

٢ بڕوانە: الصراع مع الیهود لأبي فارس (١١٢/٢).

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِن يَمْسَسْكَ اللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُ إِلَّا هُوَ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾(الانعام: ١٧).

*** کوژرانی (کعب بن اسد القرظي):**

ئینجا کەعبی کوڕی ئەسەدی سەرکەورەی بەنی قورەیزەیان هێنا و، پێش ئەوەی لە گەردنی بدرێت ئەم گفت و گۆیە لە نێوان خۆی و پێغەمبەر(ﷺ) ڕوویدا:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کەعبی کوڕی ئەسەد؟

کەعب وتی: بەڵێ ئەی باوکی قاسم.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بە ئامۆژگارییەکانی ئیبنو فەڕاش کارتان نەکرد، ئەو باوەڕی هێنابوو پێم، ئایا داوای لێ نەکردن شوێنم بکەون، کاتێك منیشتان دەبینی سەلامی ئەوتان بە من دەگەیاند.؟

کەعب وتی: بەڵێ سوێند بە تەورات ئەی باوکی قاسم، ئەگەر جوولەکەیش تانە و تەشەریان لێنەدایەم بەوەی ترسنۆکم شوێنت دەکەوتم، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) من لەسەر ئایینی جوولەکەم، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد و لە گەردنی درا.[1]

جوولەکەکان دەستە دەستە دەنێردران بۆ ئەوەی لە گەردنیان بدرێت، ئینجا پرسیاریان کرد لە سەرگەورەیان کەعبی کوڕی ئەسەد و وتیان: ئەی کەعب پێت وایە چیمان پێ دەکرێت؟ ئەویش وتی: ئایا لە هەموو جێگەیەکدا هەر هۆشمەند نابن؟ ئایا نابینن بانگکەر هەر واز ناهێنێت و، ئەوەی دەبرێت ناگەڕێتەوە، سوێند بە خوا کوشتنە.[2]

---

١ بڕوانە: اليهود في السنة المطهرة (٢/٣٦٨).

٢ هەمان سەرچاوە (١/٣٦٨).

## دوانزە: تکاکردنی سابیتی کوڕی قەیس بۆ زوبەیری کوڕی(باطا) و، سەلمەی کچی قەیس بۆ ڕیفاعەی کوڕی سمەوئەل.

### ١- تکاکردنی سابیتی کوڕی قەیس بۆ زوبەیری کوڕی باتا:

سابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: زوبەیری جولەکەم پێ ببەخشە چونکە چاکەی لەگەڵم کرد لە ڕۆژی بوعاسدا، پێغەمبەر(ﷺ) پێی بەخشی، ئینجا سابیت چووە لای و وتی: ئەی باوکی عەبدوڕڕەحمان ئایا دەمناسی وتی: بەڵێ، ئایا برا برای خۆی ناناسێتەوە؟ سابیت وتی: ویستم پاداشتت بدەمەوە بەو چاکەی لە ڕۆژی بوعاسدا لەگەڵتکردم، وتی: بەخشندە پاداشتی بەخشندە دەداتەوە؟ وتی: منیش وام کردووە، وتی: بەڵام خێزان و کوڕەکەم، ئیتر سابیت گەڕایەوە لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەوانیشی پێ بەخشی، ئینجا جولەکەکە وتی: باخێکیشم هەیە لەسەری دەژیم، هیچمان نییە لەوە زیاتر، ئینجا سابیت بە پێغەمبەر(ﷺ)ی وت و ئەویشی پێ بەخشی، سابیت گەڕایەوە لای زوبەیر پێی وت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەس و کار و ماڵەکەی بۆ گەڕاندیتەوە، جا موسڵمانبە باشترە، ئەویش وتی: فلان و فلان چیان بەسەر هات، سابیت وتی: کوژران و لێبوونەوە، لەوانەشە خوای گەورە چاکەی تۆی ویستبێت تاکو ئێستا تۆی هێشتووەتەوە، سوێندت دەدەم ئەی سابیت بە خواو بەو چاکەی هەمە لەسەرت ئەگەر فریای ئەوانم نەخەیت، چونکە مانەوە لە پاش ئەوان بایەخی نییە، سابیت ئەو قسەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باسکرد و فەرمانی کرد لە گەردنیان دا.[١]

### ٢- تکاکردنی سەلمەی کچی قەیس بۆ ڕیفاعەی کوڕی سمەوئەلی ئەلقەرزیی:

ئەم ئافرەتە یەکێك بوو لەوانەی بەیعەتی ژنانیان لێ وەرگیرا، داوای کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) ڕیفاعەی پێ ببەخشێت، ئەو گەنجێك بوو، هاواری بۆ هێنابوو، پێشتریش دەیانناسی، سەلمە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، باوك و دایکم بە قوربانت

---

١ بڕوانە: اليهود في السنة المطهرة (٢/٣٠٢).

بێت، ڕیفاعەم پـێ ببەخـشە، چـونكە دەڵێـت دوایـی نوێـژ دەكـەم و گۆشـتی وشـتر دەخۆم، پێغەمبەر(ﷺ)یش پێی بەخشی.[1]

ئەم ڕیوایەتەیش بەڵگەیە لەسەر ڕێزگرتنی ئیسلام لە ئافرەتان.

## سیانزە: ڕەوشتی جیاوازی.

كاتێك پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی كرد كەس نوێژ نەكات لە بەنی قـورەیزە نـەبێت، هەندێكیان بە پەلەكردن حاڵی بوون لە قسەكەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆیە نوێـژیان كـرد، هەندێكیشیان تەماشای ڕوواڵـەتی فەرمانەكـەی پێغەمبـەر(ﷺ)یـان كـرد و نوێـژیان نەكرد تاكو گەیشتنە ئەوێ، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) لۆمەی كەسیانی نـەكرد، ئەمـەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كۆشش كـردن ڕەوایـە بـۆ هـەڵێنجانی حوكمـە شـەرعیەكان، هەروەها ئەوەی لێ وەردەگیرێت كە بنەبڕكردنی ناكۆكی لـە مەسـەلە لاوەكییەكانـدا كارێكە بەدی نایەت،[2] هەوڵدان بۆ نەهێشتنی جیاوازی لەو جۆرە مەسەلانەدا، حـاڵی نەبوونە لە حیكمەتی خوای گەورە لە شەرعداناندا، ئەگەر ئەو كارەیش بگونجایە لە سـەردەمی پێغەمبـەر(ﷺ) دروسـت دەبـوو، شایـستەترین كەسـانێك بـەو كـارەیش هاوەڵان بوون(ڕەزای خوایان لێ بێت)، ئەگەرنا بۆچی ناكۆكیـان كەوتـە نێـوان لـەو مەسەلەدا،[3] هـەروەها ئـەوە وەردەگیرێـت كـە نابێـت سەرزەنـشتی كەسـێك بكرێـت ئەگەر حوكمێك دەربكات لە دەقەكـە كـە تایبـەت بێـت بـە خۆیـەوە، هـەروەها ئـەو كەسەی نەشپێكێت گوناهبار نابێت، چونكە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:((اذا حكم الحاكم فاجتهد، ثم اصاب فله اجران، واذا حكم فاجتهد ثم اخطأ فلـه اجـر))،[4] واتـە: ئەگـەر فـەرمانڕەوا كۆشـش بكـات و ڕاسـتی بپێكێـت دوو پاداشـتی هەیـە، ئەگـەر هەڵەیش بكات یەك پاداشتی هەیە، ئیبنوحەجەریش پەراوێزێكی داناوە لەسـەر ئـەم بەسەرهاتە ئەمە كورتەكەیەتی: بەڵگە وەرگرتن لەم بەسەرهاتە كە هـەموو كۆشـش

---

١ هەمان سەرچاوە (٢٧٣/١).

٢ بڕوانە: فقه السيرة للبوطي (٢٦٦).

٣ فقه السيرة للبوطي (٢٦٦).

٤ بڕوانە: البخاري، كتاب الاعتصام، باب (اجر الحاكم اذا اجتهد) رقم (٧٣٥٢).

کارێك ڕاستی دەپێکێت ڕوون نییە لەم بەسەرهاتەدا، بەڵکو ئەوە وەردەگیرێت کە هەرکەس کۆشش بکات سەرزەنشت ناکرێت و گوناهباریش نابێت، هاوەڵانیش هەندێکیان فەرموودەکەیان لەسەر ڕواڵەتەکەی وەرگرت و هەندێکیان لەسەر ڕواڵەت تەماشای فەرموودەکەیان نەکرد، بەڵکو ئەوە حاڵی بوون کە پێغەمبەر(ﷺ) تەنها مەبەستی ئەوەیە پەلە بکەن تاکو دەگەنە بەنی قورەیزە.[1]

## چوارەم: دابەشکردنی دەستکەوتەکانی بەنی قورەیزە و موسڵمان بوونی ڕەیحانەی کچی عەمر.

### ١- دەستکەوتەکانی جوولەکەی بەنی قورەیزە بەم شێوە بوو:

هەزار و پێنج سەد شمشێر، دوو هەزار ڕم، سێ سەد قەڵغان، هەزار و پێنج سەد جۆری تر لە قەڵغان و کەرەستەی شەڕ، هەروەها ژمارەیەکی زۆری مەڕوماڵات و وشتر و کەل و پەلیان بەجێهێشت، هەروەها موسڵمانان چەندین گۆزەی شەرابیان دۆزییەوە، پێغەمبەر(ﷺ) چواریەکی دەستکەوتەکانی دایە موهاجیر و ئەنصار، دوو پشك بۆ سوار و، یەك پشك بۆ پیادە، سوار سێ پشکی دەبرد بۆ خۆی و ئەسپەکەی، پیادەیش یەك پشکی دەبرد، پێنج یەکیش کە دەمێنێتەوە پشکی خواو پێغەمبەرەکەیەتی وەکو لە قورئاندا هاتووە.[2]

هەرچی ئارەقیشیان دەستکەوت هەموویان ڕژاند، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) پشکی سوەیدی کوڕی خەللادیشی دیاری کرد و دایە میراتگرەکانی،[3] هەروەها پشکی هاوەڵێکی تریشی دیاری کرد کە لە کاتی غەزاکە مرد، سەبارەت بەو ئافرەتانەیش کە ئامادەی غەزاکە بوون پێغەمبەر(ﷺ) وەکو پشك پشکی بۆ دیاری نەکردن، سەبارەت بە ماڵە نەگوێزراوەکانیش وەکو زەوی و ماڵ پێغەمبەر(ﷺ) دابەشی کردە سەر تەنها موهاجیرەکاندا و، فەرمانی پێکردن ئەو ماڵ و باخانەی ئەنصارەکان بگێڕنەوە بۆیان،[4] خوای گەورە دەربارەی ئەو زەوی و ماڵانە

---

١ فتح الباري (٤٧٣/٧) بە کورتی.
٢ بڕوانە: الصراع مع اليهود (٩٦/٢-٩٧).
٣ هەمان سەرچاوە (٩٧/٢).
٤ بڕوانە: الصراع مع اليهود (٩٨/٢).

دەفەرموێت: ﴿ وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ وَدِيَارَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ وَأَرْضًا لَّمْ تَطَـُٔوهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرًا ﴾(الاحزاب: ٢٧).

مامۆستا(محمد دروزة) دەڵێت: ﴿وَأَرْضًا لَّمْ تَطَـُٔوهَا﴾ لێکدەرەوانی قورئان دەفەرموون مەبەست لە زەوی خەیبەرە و، ئەم ئایەتەیش مژدەی پێش فەتح کردنێتی... ئەمەو پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بە ناردنی سەعدی کوڕی عوبادە(ﷺ) بۆ شام بە مەبەستی فرۆشتنی پێنج یەکی منداڵو ئافرەتەکانی بەنی قورەیزە، بە نرخەکەشیان چەك و ئەسپی کڕی بۆ ئەوەی موسڵمانان بەکاریان بهێنن بۆ شەڕی جوولەکەو بتپەرستان، هەروەها سەعدی کوڕی زەیدی نارد بۆ نەجد بۆ فرۆشتنی کۆیلەکان و بە نرخەکەیان چەکی کڕی.[1]

**٢- موسڵمان بوونی ڕەیحانە( رضي الله عنها ):**

ڕەیحانەی کچی عەمری کوڕی حوزافە یەکێکبوو لە ئافرەتە کۆیلەکان، پێغەمبەر(ﷺ) مارەی کرد پاش موسڵمان بوونی، بەڵام ئەو دوو دڵ بوو، تا ماوەیەکیش هەر لەسەر ئاینی خۆی بوو، بەڵام دواتر موسڵمان بوو، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بۆ ماڵ دایکی مونزیری کچی قەیس تاکو کەوتە سوڕاوی مانگانە و پاك بوویەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ئازادی کرد لە نێوان ئەوەی مارەی بکات یان هەر وەکو کەنیزەك لە لای بمێنێتەوە، ئەویش دووەمی هەڵبژارد( رضي الله عنها ).[2]

## پانزە: ڕاگەیاندنی ئیسلامی لە غەزای(الاحزاب)دا.

هاوەڵانی شاعیر هەڵسان بە ڕۆڵی جیهادی خۆیان و، چەندین هۆنراوەی جوانیان دەووت هەڵوێستی موسڵمانیان تیا ڕوون دەکردەوە و، باسی نەبەردی سوپای ئیسلامی و گورز وەشاندنیان لە بێباوەڕان دەکرد.

---

١ الصراع مع اليهود (٢/٩٨-٩٩).

٢ بڕوانە: الصراع مع اليهود لأبي فارس (٢/٩٩).

# بەشی دوانزەیەم

## گرنگترین ڕووداوەکانی نێوان غەزای ئەحزاب و حودەیبییە

### باسی یەکەم: هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ زەینەبی کچی جەحش(رضي الله عنها).

هاوکات لەگەڵ بەردەوام بوونی جموجۆڵی پۆلەسەربازییەکان و بونیاتنانی دەوڵەت و دەسەلات سەپاندن بەسەر دوورگەی عەرەب، بزوتنەوەی بنیاتنانی تەشریعی و کۆمەڵایەتیش بۆ ئوممەت هەر بەردەوام بوو، سیستەمی بە کوڕکردن نەما و، سەرپۆش فەرز کرا و، ڕێ و ڕەسمی دەعوەتکردن بڕیاری لەسەر درا و، جەخت دەکرایەوە لەسەر کوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ) و، دژایەتی ئەو داب و نەریتانە دەکرا کە ناکۆکە لەگەڵ ئیسلام، ئینجا لە هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ زەینەبی کچی جەحش هەندێ حوکم و وانە و پەند لەخۆ دەگرێت و ئەمەیش بەسەرهاتەکەیە.

#### یەکەم: ناو و ڕەچەڵەکی.

زەینەبی کچی جەحشی کوڕی ڕیئابی کوڕی یەعمودی ئەسەدی، خوشکی عەبدوڵای کوڕی جەحش و، حەمنەی کچی جەحش(ڕەزای خوایان لێ بێت).
دایکی ئومەیمەی کچی عەبدولموتەلیب، پووری پێغەمبەر(ﷺ) و خوشکی حەمزە(رضي الله عنه)،[1] دەڵێن خۆی ناوی بەڕە بووە، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ناوی ناوە زەینەب و نازناوی ئوممولحەکەمی هەبوو.[2]
زەینەب یەکێك بوو لە کۆچبارە سەرەکییەکان، خواپەرستێکی لە خواترس بوو،

---

١ بڕوانە: الاستيعاب في معرفة الاصحاب لابن عبدالبر (٣٧٢/١).
٢ هەمان سەرچاوە (١٨٤٩/٤).

چاکە و صەدەقەی زۆری دەکرد، عائیشەی دایکی ئیمانداران دەفەرموێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت:((اسرعكن لي لحاقاً بي اطولكن يدا، قالت: فكن يتطاولن ايتهن اطول يدا،قالت فكانت اطولنا يدا زينب لانها كانت تعمل بيدها, وتصدّق))،[١] واتە: یەکەم کەس لە ئێوە پاش مردنم کە پێم دەگات، ئەو کەسەیە کە خێر و چاکە زۆر دەکات، عائیشە دەفەرموێت: خێزانەکانی خۆیان هەڵدەنا کامیان چاکەیان زۆرترە، جا لە هەموویان چاکەکارتر زەینەب بوو، چونکە بە دەستی کاری دەکرد و صەدەقەشی دەکرد، هەروەها عائیشە(ﷺ) ستایشی کردووە و وتوویەتی کەسم نەبینیوە ئەوەندەی ئەو چاکەکار بەڵام تووڕەییەکی تیادابوو زوو لێی پاشگەز دەبوویەوە.[٢]

## دووەم: هاوسەرگیری زەینەب لەگەڵ زەیدی کوڕی حاریسە(ﷺ).

پێغەمبەر(ﷺ) ویستی جیاوازی چینایەتی لە ناو ببات، بۆ ئەوەی خەڵکی یەکسان بن، ئەو کەسانەش کە کۆیلە بوون و دواتر ئازاد بوون، چینێکی نزمتر بوون لە چینی ئازادەکان و، زەیدی کوڕی حاریسەیش یەکێك بوو لەو کۆیلە ئازادکراوانە، کە پێغەمبەر(ﷺ) خۆی ئازادی کردبوو، کردبووی بە کوڕی خۆیشی، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) بە باشی زانی ئافرەتێکی ئازادی بەڕێز لە زەید مارە بکات ئەویش زەینەبی کچی جەحشی پورزای پێغەمبەر(ﷺ) بوو(ﷺ)، بۆ ئەوەی ئەو جیاوازییە چینایەتیە لە ناو بچێت، ئەم جیاوازییانەیش ئەوەندە ڕەگدار بوو لە ناو کۆمەڵدا ڕیشەکێش نەدەکرا بە کردارێکی وا نەبێت لە پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەوەی ئوممەت تەماشای بکات وەکو پێشەنگ، هەروەها بۆ ئەوەی ببێتە پێشەکی بۆ کاری تر گرنگی لەمەیان کەمتر نییە.[٣]

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) خوازبێنی زەینەبی کرد بۆ زەید، زەینەب ڕازی نەدەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێکرد ڕازی بێت، تاکو خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند:

---

١ مسلم في فضائل الصحابة (٤/١٩٠٧) رقم (٢٤٥٢).

٢ مسلم (٤/١٨٩٢) رقم (٢٤٤٢).

٣ بڕوانە: قضايا نساء النبي والمؤمنات، حفصة بنت عثمان الخليفي (٢٠٥).

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا﴾(الاحزاب: ٣٦).

ئینجا زەینەب بە زەید ڕازی بوو و، وتی: سەرپێچی فەرمانی خوا و پێغەمبەر(ﷺ) ناکەم و بە زەید ڕازیم شووی پێ بکەم.[١]

زەید تاکو ئەو کاتە کوڕی موحەممەدی پێ دەوترا، ئیتر زەید زەینەبی مارەکردو مارەییەکەشی بریتی بوو لە دە دینارو شەست درهەم و سەرپۆشێك و، پەنجا مست لە خۆراك و دە مست لە خورما.[٢]

## سێیەم: جیابوونەوەی زەید لە زەینەب(رضي الله عنها).

ویستی خوای گەورە وابوو کە زەید و زەینەب پێکەوە تەبا نەبن، بۆیە زەید بڕیاریدا لە یەکتر جیاببنەوە و پێغەمبەر(ﷺ) هەر فەرمانی پێ دەکرد لێی جیانەبێتەوە و، لە خوا بترسێت، بەڵام پاش تێپەڕبوونی ساڵێك – وەکو(ابن کثیر) دەفەرمووێت – ناکۆکی زیادی کرد لە نێوانیاندا و لە یەکتر جیابوونەوە، لە کاتێکدا پێغەمبەر(ﷺ) هەر ئامۆژگاری دەکرد ئەو کارە ئەنجام نەدات.[٣]

(ابن کثیر) دەڵێت:(ابن ابی حاتم) و(ابن جریر) هەندێ ڕیوایەتیان لەم بارەوە باسکردووە لە هەندێ لە سەلەف، بە باشم نەزانی باسیان بکەم چونکە ڕاست نین.[٤]

## چوارەم: حیکمەتی هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ زەینەب(رضي الله عنها).

مەسەلەی بە کوڕکردن((التبني) پەلی هاویشتبوو لە دڵ و دەروونی خەڵکیدا، ڕیشەکێشکردنی ئاسان نەبوو، لە سەرەتای ئیسلامیشدا لە مەککە زۆر باو بوو، هەروەها لە سەرەتای کۆچ کردنیش بۆ مەدینە، بەڵام خوای گەورە ویستی ئەو مەسەلەیە نەهێڵێتو تەنها بە ناو باوکەوە بانگ بکرێت، خوای گەورە

---

١ بڕوانە: تفسیر الطبري (١١/٣٢).
٢ بڕوانە: تفسیر ابن کثیر (٣/٤٨٩).
٣ هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.
٤ هەمان سەرچاوە (٣/٤٩١).

دەفـــــەرموویت:﴿ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِۦ ۚ وَمَا جَعَلَ أَزْوَٰجَكُمُ ٱلَّـٰٓـِٔى تُظَـٰهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَـٰتِكُمْ ۚ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَآءَكُمْ أَبْنَآءَكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَٰهِكُمْ ۖ وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِى ٱلسَّبِيلَ ﴾(الاحزاب: ٤).

﴿ ٱدْعُوهُمْ لِءَابَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْ ۚ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ وَلَـٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾(الاحزاب: ٥).

لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(ﷺ) هاتووە کە، کە بانگی زەیدیان هەر بەو شێوەیە دەکرد کە زەیدی کوڕی موحەممەدە، تاکو خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ ٱدْعُوهُمْ لِءَابَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾.[1]

هەروەها خوای گەورە نەناسینی باوك و دایكی ئەوانەی بە پاساو نەزانیوە بۆ ئەوەی بە ناوی كەسێكی ترەوە بانگ بكرێن، چونكە لەو حاڵەتە دەبنە برا و یارمەتی دەر، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱدْعُوهُمْ لِءَابَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْ ۚ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ وَلَـٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾(الاحزاب: ٥).

واتە: ئەگەر باوكی ئەوانتان نەناسی، ئەوا برایەتی و هاوپەیمانێتیتان لە نێواندایە، واتە: دەوترێت: فلانە كەس مەولای فلانە...[2]

ئەم برایەتیەیش گرنگی زۆری هەیە، وەكو پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی بۆ زەید جێگیر دەكرد و دەیفەرموو:((انت اخونا ومولانا)) هەروەها خوای گەورە دەفـــــــەرموویت: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾(الحجرات: ١٠).

---

١ البخاري في التفسير باب (ادعوهم لآبائهم) (٢٧٦/٣) رقم (٤٧٨٢).

٢ بڕوانە: تفسير السعدي (١٣٦/٤).

هەندێ دەقی تریش هاتووە ئەم مەسەلەیە لە لایەکی ترەوە چارەسەر دەکات، ئەوەش غەدەغەبوونی ئەوەی کوڕێك خۆی بە کوڕی کەسێك بزانێت جگە لە باوکی، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:(( ومن ادعى الى غير ابيه او انتمي الى غير مواليه، فعليه لعنة الله والملائكة والناس اجمعين، لايقبل الله منه يوم القيامة صرفا ولا عدلا))،[1] واتە: هەر کەسێك کەسێکی تر جگە لە باوکی خۆی بە باوکی خۆی بزانێت، یان خۆی بداتە پاڵ کەسانێکی تر جگە لە سەرپەرشتیارانی، نەفرینی خوا و فریشتەکان و هەموو خەڵکی لەسەر بێت، خوای گەورە نە فەرز و نە سوننەتی لێ قبوول ناکات.

ئینجا ئیسلام هۆیەکی ئاشکرای داناوە بۆ ڕەچەڵەك، ئەویش پەیوەندی کردن لە ڕێگەی هاوسەرێتی یان لە ڕێگەی ئافرەتێك کە موڵکی کەسەکە بێت، هەموو ڕێگەکانی تریش قەدەغەکراوە بۆ پەیوەندی کوڕ و باوکایەتی وەکو داوێن پیسی، پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێت:((الولد للفراش وللعاهر الحجر))،[2] واتە: هەر منداڵێك دێت بەرهەمی پەیوەندی نێوان ژن و مێردە لەسەر جێگای شەرعی، بەڵام هاتنی منداڵ بە ڕێگەی تر دەبێتە مایەی بەردبارانی ئەو کەسە کە منداڵەکە دەهێنێت.[3]

لە پاش ئەمانەش، خوای گەورە حوکمی هەڵەی لەم مەسەلەدا باسکردووە و فەرموویەتی:﴿ ٱدْعُوهُمْ لِءَابَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْ ۚ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾(الاحزاب: ٥).

لەم ئایەتەدا خوای گەورە گوناهی لابردووە لەسەر کەسێك بە هەڵە خۆی بە کوڕی پیاوێکی تر بزانێت. بەڵام گوناه لەسەر ئەو کەسەیە بە ئەنقەست ئەو کارە ئەنجام بدات.

لە ڕاستیدا مەسەلەی بە کوڕ کردن بووبووە خوو لە ناو خەڵکیدا، بۆیە هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ خاتوو زەینەب(ﷺ)، جۆرێك بوو لە نەهێشتنی

---

١ مسلم (١٣٧).

٢ البخاري في الحدود (٤/٢٥٤) رقم (٦٨١٨).

٣ بروانە: علاقة الاباء بالابناء في الشريعة الاسلامية، د. سعاد الصانع (٥٢-٥٣).

کردەیی بۆ ئەو کارە.[١]

حیکمەت لە هاوسەرێتی پێغەمبەر(ﷺ)لەگەڵ خاتوو زەینەب ڕوون و دیارە، خوای گەورەیش ئاشکرای کردووە و فەرموویەتی: ﴿لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَرًا﴾(الاحزاب: ٣٧).

ئینجا بێباوەڕان و شوێنکەوتووانیان و نەفامەکان هەندێ درۆ و دەلەسە دووپات دەکەنەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) دڵی لە زەینەب چوو، پاش ئەوەی شووی کردووە بە زەیدی کوڕی حاریسە، زەیدیش کە بەو خۆشەویستییەی زانیی ویستوویەتی تەڵاقی بدات بۆ ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) مارەی بکات،[٢] ئەمەیش قسەیەکی بەتاڵە و پێشەوا(ابن العربي) ئەو وتەیەی لە ڕەگەوە ڕەتکردووەتەوە و فەرموویەتی: پێغەمبەر(ﷺ) هەموو کاتێك و لە هەموو جێگەیەکدا زەینەبی دەبینی و ئەو کاتە حیجابیش نەبوو، چۆن پێکەوە پەروەردە دەبن و هەموو ساتێك دەیبینی و دڵی لێی ناچێت، تاکو شوو نەکاتە زەید؟ حاشا بۆ خاوەنی ئەو دڵە پاراوە پەیوەندی نابەجێی لەو جۆرەی هەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ﴾(طه: ١٣١). ئەو کارە ڕەوا نییە لەگەڵ تەڵاق دراوەکانیشدا، نەخوازەڵا شووکردووەکان، ئینجا فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ﴾(الاحزاب: ٣٧). مەبەست لە هاوسەرێتی پێغەمبەرە(ﷺ) بۆ زەینەب نەك خۆشەویستی بۆی...[٣]

---

١ بڕوانە: من معين السيرة (٣١١).

٢ بڕوانە: المفصل في احكام المرأة، عبدالكريم زيدان (١١/٤٧٤، ٤٧٥).

٣ بڕوانە: احكام القران لابن العربي (٣/١٥٣١-١٥٣٢).

## پێنجەم: هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ زەینەب و ئەو پەندانەی لێی وەردەگیردرێت.

کاتێك عیددەی زەینەب تێپەڕبوو، پێغەمبەر(ﷺ) زەیدی نارده لای بۆ خوازبێنی کردنی بۆ خۆی، ئیتر زەید چووە لای بینی خەریکی هەویر شێلانە، دەڵێت کە بینیم زۆر مەزن بوو لە لام چونکە پێغەمبەر(ﷺ) باسی کردووە، بۆیە پشتم تێکرد و گەڕامەوە دواوە، وتم: ئەی زەینەب پێغەمبەر(ﷺ) منی ناردووە بۆ خوازبێنیت، وتی: هیچ کارێك ئەنجام نادەم بە فەرمانی خوای گەورە نەبێت و ڕۆیشت بەرەو جێگای نوێژکردنەکەی و، پاشان قورئان دابەزی و پێغەمبەر(ﷺ) هاتە لای بەبێ مۆڵەت خواستنی و،[1] چوارسەد درهەمی کرد بە مارەیی و، ئەو ڕووداوە لە ساڵی پێنجەمی کۆچی بوو، لە پاش غەزای بەنی قورەیزە.[2]

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) دەعوەتێکی گەورەی کرد بۆ زەینەب و مەڕێکی سەربڕی بە پێی فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەنەس چاوی بە هەرکەسێ کەوت بانگی کرد بۆ ئەو دەعوەتە.[3]

بەم شێوەیش پێغەمبەر(ﷺ) بە فەرمانی خوا زەینەبی کچی جەحشی مارە کرد، لە پاش جیابوونەوەی لە زەید، لەم هاوسەرێتیەشدا چەندین پەند و وانە دەتوانین وەریگرین، لەوانە:

١- لەوانەیە ناردنی زەید بۆ خوازبێنی لە لایەن پێغەمبەر(ﷺ)ەوە، کارێکی ویستراو بێت، بۆ ئەوەی قسەی ئەوانە ببڕێت کە زەید بەبێ ویستی خۆی لێی جیابووەتەوە و ئەمەیش کارێکە لە ئەوپەڕی داناییدایە وەکو ئیبنو حەجەر دەفەرموێت.[4]

---

١ مسلم في النكاح (١٠٤٨/٢) رقم (١٤٢٨).
٢ بڕوانە: البداية والنهاية (١٤٧/٤).
٣ البخاري في النكاح، باب من اولم على بعض نسائه (٣٨٧٠/٣)، رقم (٥١٧١).
٤ بڕوانە: فتح الباري شرح صحيح البخاري، لابن حجر (٥٢٤/٨).

هەروەها ئەوەی لێ وەردەگیرێت کە ژن و مێرد سەرەڕای ناکۆکی و جیابوونەوەیش هەر پێویستە ئامۆژگاری چاکەی یەکتر بکەن، چونکە ئەوە زەیدە سەرەڕای هەموو شتێك دەچێتە خوازبێنی زەینەب بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و پێی دەفەرمووێت: مژدەت لێ بێت ئەی زەینەب.

٢- ئەو ئایەتەی لەم بارەوە دابەزی گلەیی تیابوو لە پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە کاتێك زەید سکاڵای لە زەینەب دەکرد و دەیویست لێی جیابێتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) هەر پێی دەفەرموو: لێی جیامەبەوە و لە خوا بترسە، لە کاتێکدا ئەوەی دەشاردەوە کە زەید ئەو ژنە تەلاق بدات و دەبێتە خێزانی پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە لە قسەی خەڵکی دەترسا بڵێن خێزانی کوڕەکەی خۆی مارە کردووە.

ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرمووێت: ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) شتێکی بشاردایەتەوە لە وەحی ئەمەی دەشاردەوە.[1]

٣- خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا﴾ ئەمە ڕێزێکی زۆر گەورە بوو بۆ زەید، چونکە جگە لە ئەو ناوی هیچ کەس لە هاوەڵان نەهاتووە لە قورئاندا، سوهەیلی دەڵێت: دەوترا زەیدی کوڕی موحەممەد تاکو ئەم ئایەتە دابەزی ﴿ ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ﴾ ئیتر زەید وتی: من زەیدی کوڕی حاریسەم، جا کاتێك ئەم سەربەرزییەی لێ وەرگیرایەوە خوای گەورە بە ناڕەحەتی ئەوی زانی، ناوی لە قورئاندا باس کرد و موسڵمانان هەتا هەتایە هەر دەیخوێننەوە، تەنانەت کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بە ئوبەی کوڕی کەعبی دەفەرموو خوای گەورە فەرمانی پێ کردووم ئەم سوڕەتە بەسەر تۆ بخوێنمەوە، ئوبەی گریا، وتی: ئایا خوای گەورە بە ناو باسی کردووم؟ گریانەکەشی لە خۆشیدا بوو، ئەی چۆن بۆ کەسێك کە بە ڕاشکاوی ناوی لە قورئاندا باس بکرێت، کە پێغەمبەران نەبێت هیچ کەسێك باسی نەکراوە بە ناو لە قورئاندا.

---

١ البخاري في التوحيد (٣٨٨/٤) رقم (٧٤٢٠).

٤- هاوسەرێتی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ زەینەب بە فەرمانی خوای گەورە بوو، کە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِيٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِيٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْا۟ مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴾ (الاحزاب: ٣٧).

ئەمەیش شانازی و سەربەرزییەکی گەورە بوو بۆ زەینەب، کە خۆی پێ هەڵدەنا لەسەر هاوسەرەکانی تری پێغەمبەر(ﷺ) و دەیفەرموو: ئێوە هەمووتان کەس و کارەکانتان بە شووی داون، بەڵام من خوای گەورە لەسەر حەوت ئاسمانەوە کردوومی بە هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ).[١]

لەوانەشە ئەم ڕێز و پلە و پایە بۆ زەینەب وەکو پاداشتێك بێت بۆی، کاتێك گوێڕایەڵ بوو بە شووکردن بە زەید بێ ئەوەی حەزبکات، بەڵام کاتێك زانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی پێ باشە ڕازی بوو.[٢]

٥- لە وەلیمە کردنەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ زەینەب، نیشانەیەکی پێغەمبەرایەتی بەدی دەکرا ئەویش زۆربوونەوەی خواردن بوو بە پاڕانەوەی پێغەمبەر(ﷺ)، هەر لەم وەلیمەیەشدا ئایەتی حیجاب و ئادابەکانی میوانداری دابەزی.[٣]

ئەنەسی کوڕی مالیك(ﷺ) دەفەرموێت: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) خێزانی گواستەوە، دەڵێت: دایکم خواردنێکی دروست کرد و منیش لە مەنجەڵێك بردم و وتم ئەی پێغەمبەری خوا دایکم سەلامت لێ دەکات و ئەم خواردنەی بۆ ناردوویت و دەڵێت هەرچەند کەمیشە بۆ جەنابت! ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: داینێ، ئینجا پێی فەرموو: فلان و فلانم بۆ بانگ بکەو هەر کەسێکیش چاوت پێکەوت لە

---

١ البخاري في التوحيد، باب، وكان عرشه على الماء (٤/٣٨٨) رقم (٧٤٢٠) و (٧٤٢١).

٢ بڕوانە: قضايا نساء النبي والمؤمنات (٢١٨).

٣ هەمان سەرچاوە (٢١٨).

ڕێگا، ئیتر ئەنەس نزیکەی سێ سەد کەسی بانگ کرد و،ماڵو مزگەوتەکە پڕ بوو لە خەڵکی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: با دە دە کۆببنەوە و، هەر یەکە و لە پێش خۆیەوە بخوات، ئیتر پاش ئەوەی هەموویان تێر بوون، خواردنەکەم بەرزکردەوە نازانم سەرەتا زۆرتر بوو یان پاش ئەوەی خەڵکەکە لێیان خوارد زۆرتر بوو، ئینجا کەسانێك لە ماڵ پێغەمبەر(ﷺ) مانەوە قسە و گفت و گۆیان دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) دانیشت و خێزانیشی ڕووی لە دیوارەکە بوو، پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوو بۆ لای خێزانەکانی و گەڕایەوە هەر دانیشتبوون، ئەوانیش هەستیان کرد قورسن لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) و دەرچوون هەموویان، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) هات و پەردەکەی داخست و چووە ژوورەوە، زۆری پێ نەچوو هاتە دەرەوە و، ئەم ئایەتەی خوێندەوە لەسەر خەڵکی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ إِلَّآ أَن يُؤۡذَنَ لَكُمۡ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيۡرَ نَٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَٰكِنۡ إِذَا دُعِيتُمۡ فَٱدۡخُلُواْ فَإِذَا طَعِمۡتُمۡ فَٱنتَشِرُواْ وَلَا مُسۡتَـٔۡنِسِينَ لِحَدِيثٍۚ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ يُؤۡذِي ٱلنَّبِيَّ فَيَسۡتَحۡيِۦ مِنكُمۡۖ وَٱللَّهُ لَا يَسۡتَحۡيِۦ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ وَإِذَا سَأَلۡتُمُوهُنَّ مَتَٰعٗا فَسۡـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٖۚ ذَٰلِكُمۡ أَطۡهَرُ لِقُلُوبِكُمۡ وَقُلُوبِهِنَّۚ وَمَا كَانَ لَكُمۡ أَن تُؤۡذُواْ رَسُولَ ٱللَّهِ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓاْ أَزۡوَٰجَهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦٓ أَبَدًاۚ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا﴾(الاحزاب: ٥٣).

لە پاش دابەزینی ئەم ئایەتە ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) خێزانەکانی داپۆشی لە خەڵکی، ئینجا دابەزینی ئەم ئایەتە ڕێککەوتنێك بوو لەگەڵ بۆچوونی عومەر، وەکو بوخاری دەگێڕێتەوە کە عومەر بە پێغەمبەر(ﷺ)ی فەرمووە: ئەی پێغەمبەری خوا چاکەکار و خراپەکار دێنە لات، بۆچی فەرمان ناکەیتە دایکانی ئیمانداران لەبەر چاوی خەڵکی نەمێنن، دوای ئەوە ئایەتی حیجاب دابەزی.[1]

بە دابەزینی ئەم ئایەتە شەریعەتی حیجاب دەستی پێکرد بۆ خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، مەبەستیش ئەوەیە کە هیچ شوێنێکیان بە دەرەوە نەبێت بۆ

---

١ البخاري في التفسير (٦/٩٢) رقم (٤٧٩٠).

خەڵکی و، قسەیان لەگەڵ نەکەن و داوای شتیان لێ نەکەن لە پشت پەردەوە نەبێت، پاش دابەزینی ئەم ئایەتە باوك و کوڕ و خزمەکانیشیان وتیان ئێمەیش لە پشت پەردەوە قسەیان لەگەڵ بکەین، ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿لَّا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِي آبَائِهِنَّ وَلَا أَبْنَائِهِنَّ وَلَا إِخْوَانِهِنَّ وَلَا أَبْنَاءِ إِخْوَانِهِنَّ وَلَا أَبْنَاءِ أَخَوَاتِهِنَّ وَلَا نِسَائِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ ۗ وَاتَّقِينَ اللَّهَ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا﴾(الاحزاب: ٥٥).

هەروەها دەربارەی خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتانە دابەزی: ﴿يَا نِسَاءَ النَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ النِّسَاءِ ۚ إِنِ اتَّقَيْتُنَّ فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٣٢﴾ وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَىٰ ۖ وَأَقِمْنَ الصَّلَاةَ وَآتِينَ الزَّكَاةَ وَأَطِعْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾(الاحزاب: ٣٢-٣٣).

بە هەمان شێوە هەرچی پەیوەندی هەیە بە ئافرەتە موسڵمانەکانەوە، لە تەماشا نەکردن و، داوێن پاکی و جوانی لەش دەرنەخستن و... وقژوگەردن بۆ کەسانی مەحرەم نەبێت. هەمووی لە سورەتی(النور) باسکراوە و، سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) زیاتر ڕوونیکردۆتەوە.[١]

زەینەبی کچی جەحش(ﷺ) لە ساڵی بیستەمی کۆچی لە دونیا دەرچوو، لە تەمەنی پەنجا و سێ ساڵیدا، وەکو چۆن پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی یەکەمین خێزانی بوو لە پاش خۆی فریای کەوت و لە دنیا دەرچوو.[٢] بەپێی کتێبی(بقي بن مخلد) ریوایەتەکانی زەینەب گەیشتووەتە یانزە فەرمووده،[٣] لە شەش کتێبەکەی

١ السنة النبوية لأبي شهبة (٢/٣١٢-٣١٤).
٢ بروانە: الطبقات الكبرى (٨/١١٥).
٣ تلقيح الفهوم لابن الجوزي (٣٧٠).

فـەرموودەدا پێـنج فـەرموودەی هەیـە،[١] بوخـاری و موسـلیمیش لەسـەر دووانیـان ڕێککەوتوون و،[٢] زەینەب(رضي الله عنها) باسێکی خـۆش و جـوانی لـە کتێبـەکانی مێـژوودا هاتووە.[٣]

١ تحفة الاشراف للمزي (١١/٣٢١-٣٢٣).
٢ سير اعلام النبلاء (٢/١٢١).
٣ دور المرأة في رواية الحديث (٨٥).

## باسی دووەم: ئێستا هێرشیان دەکەینە سەر ناتوانن هێرشمان بکەنە سەر.[١]

پێغەمبەر(ﷺ) هەموو هێزەکانی دەوروبەری مەدینەی وریادەکردەوە و، لە هیچیان بێ ئاگا نەبوو، لە پاش غەزای خەندەقیش ئاشکرای کرد کە پلانی داهاتوو هێرشکردنە بۆ سەر قورەیش، چونکە ئێستا موسڵمانان توانای پەلاماردانیان لە هەموو کاتێك زیاترە، بۆیە هەوڵی دا دەسەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامی پانکاتەوە سەر هێزەکانی دەوروبەری مەدینە و، لە ماوەی یەك ساڵدا - شەشەمی کۆچی - دوو غەزای بە ئەنجام گەیاند و چواردە پۆلی سەربازی ڕەوانە کرد جگە لەوەی کە لە کۆتایی ساڵی پێنجەم پێی هەڵسا،مەبەستیش لەم جموجۆڵە سەربازییانە ماندووکردنی قورەیش و توندکردنەوەی گەمارۆ بوو لەسەریان،[٢] چالاکییە سەربازییەکانی قورەیشیش لەم ماوە بەم شێوەی خوارەوە بوو:

### یەکەم: پۆلی سەربازی موحەممەدی کوڕی مەسلەمە بۆ(بني القرطاء).

هۆزەکانی نەجد سەرسەختترین دوژمنەکانی ئیسلام بوون، چونکە هێز و ژمارەی زۆریان هەبوو، هێزەکانی ئەحزابیش زۆربەی لە ئەوان پێکهاتبوون چونکە شەش هەزاری لە غەتەفان و ئەشجەع و ئەسلەم و فەزارە و ئەسەد بوو کاتێك ئابلۆقەی مەدینە درا.

بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) لە پاش غەزای ئەحەزاب یەکەمین کاری سەربازی ئەنجامدا هێرش کردنە سەر ئەو هۆزانە بوو، کە لە لای(القرطاء)ەوە نیشتەجێ بوون، یەکسەر بە دوای غەزای(بني القرطاء) پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بە ناردنی موحەممەدی کوڕی مەسلەمە لەسەر پۆلێکی سەربازی لە(سی کەس) بۆ هێرش کردنە سەر(بني القرطاء) لە هۆزی(بکر بن کلاب) لە دەی موحەڕڕەمی ساڵی شەشی کۆچی،[٣] دە

١ البخاري في المغازي (٥/٥٨) رقم (٤١١٠).
٢ بڕوانە: دراسات في عهد النبوة للشجاع (١٣٩).
٣ بڕوانە: تاريخ الاسلام للذهبي، المغازي (٣٥١).

کەسیان لێ کوشتن و مەڕ و ماڵاتیانیان بە دەستکەوت هێنا، لە ڕێگەی گەڕانەوەیان(ثمامة بن اثال الحنفي)یان بە دیل گرت و بێ ئەوەی بزانن سەرگەورەی بەنی حەنیفەیە، هێنایانەوە مەدینەوبەستیانەوە بە یەکێك لە کۆڵەکەکانی مزگەوتەکەوە، پێغەمبەر(ﷺ) هات و ئەوی بینی و پێی فەرموو: چیت لایە ئەی(ثمامة)؟ وتی: چاکەم لە لایە ئەی موحەممەد، ئەگەر بمکوژی شایستەی کوشتنم، ئەگەریش بمبەخشی کەسێك دەبەخشی سوپاست دەکات، ئەگەر ماڵیشت دەوێت هەر چەندت دەوێت داوا بکە، ئیتر وازی لێ هێنا تاکو سبەی، ئینجا جارێکی تر پێی وت: چیت هەیە ئەی(ثمامة)؟ ئەویش هەر ئەو قسەی دووبارە کردەوە و، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئازادی بکەن، ئەویش چووە لای هەندێ دارخورما نزیك مزگەوتەکە و خۆی شوشت و گەڕایەوە ناو مزگەوتەکە و وتی:(أشهد أن لا اله الا الله وأشهد ان محمداً رسول الله) ئەی موحەممەد، سوێند بە خوا کەس نەبوو ئەوەندەی خۆت و ئاینەکەت و شارەکەت ڕقم لێی بێت، بەڵام سوێند بە خوا ئێستا خۆت و ئایینەکەت و شارەکەت لە هەموو شتێك بە لامەوە خۆشەویستترن، من بەرەو عومرە دەچووم کاتێك گیرام، ئێستا چی بکەم؟ ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) مژدەی پێدا و فەرمانی پێکرد عومرەکەی بکات، کاتێك هاتە مەککە کەسێك پێی وت: هەڵگەڕایتەوە؟ وتی: نە بە خوا موسڵمان بووم لەگەڵ پێغەمبەری خوا، نە سوێند بە خوا نایەڵم دەنکە گەنمێکیان بۆ بێت لە یەمامەوە ئەگەر بە ڕەزامەندی پێغەمبەر(ﷺ) نەبێت.[1]

ئەوانیش نامەیان نووسی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) تکایان لێ کرد بە خزمایەتی کە بۆ(ثمامة) بنوسێت بەڵکو ڕازی بێت خواردنیان بۆ بنێرێت،[2] پێغەمبەریش(ﷺ) ڕازی بوو سەرەڕای حاڵەتی شەڕ کە لە نێوانیاندا هەبوو، بەم شێوەیش لە گرانییەك ڕزگاری کردن کە ڕووی تێ دەکردن.. ئەم بەسەرهاتە دەتوانین چەند پەندێکی لێ وەربگرین:

١- ڕێدراوە کافر لە مزگەوتدا ببەسترێتەوە.

---

١ بڕوانە: نضرة النعيم (١/٣٣).

٢ هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

٢- ڕێدراوە دیلی کافر ببەخشرێت، چونکە بینیمان لێخۆشبوونەکە چ کاریگەرییەکی هەبوو لەسەر(ثمامة).

٣- خۆشتن لە کاتی موسڵمان بووندا.

٤- چاکە ڕق و کینە لادەبات.

٥- باشترە بۆ کەسی بێباوەڕ کە دەیەوێت کارێکی چاکە بکات و دوایی موسڵمان بێت هەر بەردەوام بێت لەو کارە چاکەیەدا.

٦- نەرم و نیانی لەگەڵ ئەوانەی چاوەڕوانی موسڵمان بوونیان لێ دەکرێت، بە تایبەت ئەوانەی کە کەس و کاری زۆریان هەیە.[١]

٧- ئیسلام ڕەفتاری ئیماندار دەگۆڕێت، وەکو بینیمان لە ڕەفتاری(ثمامة) لەگەڵ خەڵکی مەککە، کاتێك ڕازی نەبوو ئازوقەیان بۆ بنێرێت بە ڕەزامەندی پێغەمبەر(ﷺ) نەبێت.

٨- پێویستە ئیماندار لە کاتێك هەڵکەنرا لە بێباوەڕی واز لە هەموو پەیوەندییە ڕابوردووەکانی بهێنێت و، پەیوەست بێت بە فەرمانەکانی خوای گەورەوە.[٢]

## دووەم: پۆلی سەربازی ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح بۆ(سیف البحر).

وەکو درێژەپێدانێك بۆ سیاسەتی لاوازکردنی قورەیش و گەمارۆدانی، پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بە ناردنی ئەبو عوبەیدە لە سەرووی سێ سەد کەسەوە بۆ ڕۆخی دەریا بۆ چاودێری کردنی کاروانێکی قورەیش، لە ڕێگە توێشوویان پێ نەما،بۆیە ئەبو عوبەیدە هەموو خواردنی سوپاکەی کۆکردەوە و، تاکو وای لێهات ڕۆژی خورمایەکیان بەردەکەوت، سوپاکەیش زۆر هاوکاری ئەبو عوبەیدەیان کرد لەم کارەیدا و،[٣] خورمایان وەکو منداڵ دەمژی وەکوجابیر دەڵێت(ﷺ)، تەنانەت ئەو سوپا ناچار بوون گەڵای دار بخۆن، ئەم حاڵە کاری دەکردە یەکێك لەوانەی سەرباز بوون لە سوپاکە کە قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە بوو(ﷺ) و، سێ وشتری

---

١ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٣٨٦-٣٨٧).

٢ هەمان سەرچاوە (٣٨٧).

٣ بڕوانە: السرايا والبعوث النبوية (١١٨).

سەربڕی، ئینجا سێ وشتری تری سەربڕی و سێ وشتری تریشی سەربڕی، بەڵام ئەبو عوبەیدە ئیتر ڕێگەی نەدا.[١]

لە کاتێکدا ئەوان لەو برسێتییەدا بوون، نەهەنگێك لە دەریاکەوە کەوتە قەراغەکەی، جابیری کوڕی عەبدوڵا باسی گەورەیی ئەو نەهەنگەمان بۆ دەکات و دەفەرمووێت: لە ڕۆخی دەریاکە شتێکمان بینی ئەوەندەی تەپۆلکەیەك بوو، بینیمان ماسیەکی زۆر گەورەیە، ئەبو عوبەیدە وتی: مردارەوە بووە، ئینجا فەرمووی: ئێمە ڕەوانەکراوی پێغەمبەری خواین(ﷺ) و ناچارین بیخۆین، دەفەرمووێت: یەك مانگ لێمان خوارد تاکو قەڵەو بووین، دەفەرمووێت: لە چاڵی چاوی بە گۆزە ڕۆنمان دەردەهێنا، پارچە گۆشتی گەورەشمان لە گیانی دەکردەوە وەکو گا، یان ئەوەندەی گایەك، ئەبو عوبەیدە سیانزە کەسی لە ناو چاڵی چاویدا دانیشاند و، پەراسوویەکی ڕاست کردەوە و، وشترێك بە ژێریدا تێپەڕبوو،[٢] لە گۆشتەکەشمان هێنایەوە بۆ مەدینە، کاتێك هاتینە لای پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: چی دوای خستن؟ وتمان: بە دوای کاروانەکەی قوڕەیشدا دەگەڕاین، ئینجا باسی ئەو حوتەیشمان بۆ کرد.[٣] پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((هو رزق اخرجه الله لکم، فهل معکم من لحمه شيء فتطعمونا))، واتە: ئەوە ڕۆزیەکە خوای گەورە بۆتانی دەرکردووە، ئایا هیچتان پێیە لە گۆشتەکەی بیخۆین، دەڵێت: ئێمەیش هەندێکمان لێ نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و خواردی،[٤] ئەم پۆلە سەربازییە لەسەر بۆچوونی پەسەند پێش صولحی حودەیبیە بوو، نەك لە ڕەجەبی ساڵی هەشتەمی کۆچی وەکو ئیبنو سەعد دەڵێت،[٥] چونکە پێغەمبەر(ﷺ) غەزای نەکردووە و پۆلی سەربازی

---

١ فتح الباري (٧٨/٨).

٢ بڕوانە: السرايا والبعوث النبوية (١٢١).

٣ لەوانەیە کەسێك زانستی لەم بارەوە نەبێت، سەرسام بێت لە گەورەیی نەهەنگێکی لەو شێوە، بەڵام لە ڕاستیدا لە سەردەمی ئەمڕۆی خۆماندا لە دەریاکاندا جۆرێك نەهەنگ هەیە پێی دەوترێت (الحوت الازرق) کە درێژی سی مەترە و کێشی دەگاتە سەد و نەوەد تەن، تەنها سەری چواریەکی لاشەی دەبێت، ناو دەمیشی ئەوەندە گەورەیە کە بە یەك جار دووسەد تەن ئاو دەخواتەوە و، ڕۆژی چل و شەش تەن خواردن دەخوات لە ناو دەریادا، جێگای سەرنجیشە کە ئەم نەهەنگە زەبەلاحە گیاندارێکی زۆر هێمن و شەرمنە. (وەرگێڕ) بۆ زانیاری زیاتر لە ماڵپەڕی google بنووسە (الحوت الازرق).

٤ صحيح سنن النسائي للالباني (٩١٠/٣)، شرح النووي (٨٧/١٣).

٥ طبقات ابن سعد (١٣٢/٢)، والذهبي في المغازي (٥١٩).

دەرنەکردووە لە مانگی حەرامدا و، ڕەجەبیش لە ساڵی هەشتی کۆچی کاتی صوڵحەکە بوو.[١] لەم بەسەرهاتە چەند پەند و وانەیەك وەردەگرین:

١- دانایی ئەبو عوبەیدە کاتێك هەڵسا بە کۆکردنەوەی ئازوقەکان و، وەکو یەك دابەشی کردە سەریاندا، بۆ ئەوەی ئەو تەنگەژەیە تێپەڕێنێت، ئەوەیش وانەیەك بوو لە پێغەمبەر(ﷺ) فێری بوو.

٢- بەخشندەیی سەعدی کوڕی عوبادە(ﷺ)، لەو کاتە نارەحەتەدا واقیدی دەگێڕێتەوە کە ئیبنو سەعد ئەو وشترانەی بە قەرز وەرگرت لە پیاوێکی جوهەنی، بۆیە ئەبو عوبەیدە ڕێی لێ گرت و ترسا نەتوانێت قەرزەکەی بداتەوە.[٢]

قەیس ئەوەندەی وشتر سەربڕی تاکو ئەبو عوبەیدە لێی قەدەغەکرد، سەعد پێی وت: ئەی ئەبو عەبەیدە، باوکم کە قەرزی خەڵکی دەبژێرێت و یارمەتیان دەدات، لە گرانی خواردن دابەش دەکات، ناتوانێت هەندێ خورما بدات بۆ کەسانێك لە پێناو خوا جیهادیان کردووە، چونکە قەیس لەگەڵ پیاوێك لە هۆزی جوهەینە ڕێککەوتبوو ئەو وشترانەی لێ بکڕێت و دواتر لە مەدینە خورمای پێ بدات بەرامبەری، کابرای جوهەنیش لەسەر ئەو سەودایە ڕازی بوو.

کاتێکیش سەعدی کوڕی عوبادە بە ڕازی نەبوونی ئەبو عوبەیدەی زانی لەسەر کرداری قەیس بە بەهانەی ئەوەی پارە و ماڵی نییە، بەڵکو باوکی خاوەن ماڵە، چوار باخی بەخشی بە کوڕەکەی بۆ خۆی.[٣]

٣- حەڵاڵ و حەرام: موسڵمانان ئەوەندە برسێتیان کێشا لەو گەشتە، تەنانەت هەریەکە و دانە خورمایەکی بەردەکەوت و گەڵای داریان دەخوارد، لەو کاتە قەیس ئەو وشترانەی بە قەرز دەکڕی لەو پیاوە و، بەزەینیاندا نەهات هێرش بکەنە سەرێو بۆ خۆیان بیبەن وەکو لە جاهیلیەتدا دەکرا، چونکە ئەوان ئەمڕۆ هەڵگری پەیامی خوان و جیاوازی دەکەن لە نێوان حەڵاڵ و حەرامدا.[٤]

---

١ بڕوانە: المجتمع المدني للعمري (١٢٥).

٢ من معين السيرة (٣٢٣)، السرايا والبعوث النبوية (١١٩).

٣ بڕوانە: من معين السيرة (٣٢٣).

٤ هەمان سەرچاوە (٣٢٤).

٤- ڕێگەدان بە خواردنی گیانداری مردووی دەریا:
ئەم بەسەرهاتە ئەوە ئاشکرا دەکات و دەریشی دەخات لەو ئایەتە پیرۆزە کە دەفەرمووێت: ﴿حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةُ﴾(المائدة: ٣).
هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أُحِلَّ لَكُمۡ صَيۡدُ ٱلۡبَحۡرِ وَطَعَامُهُۥ مَتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِلسَّيَّارَةِۖ﴾(المائدة: ٩٦).

لە هەندێك لە هاوەڵانیشەوە هاتووە کە فەرموویانە ﴿صَيۡدُ ٱلۡبَحۡرِ﴾ مەبەست لەوەیە ڕاو دەکرێت لە دەریا و، ﴿وَطَعَامُهُۥ﴾یش مەبەست لە ئەوانەیە کە مردار دەبنەوە تیایدا.
هەروەها خواردنی پێغەمبەر(ﷺ) لە گۆشتی ئەو نەهەنگە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خواردنی ڕەوایە.[1]
٥- هەندێك لەو حوکمانەی ئیمامی نەوەوی باسی کردوون: ئەم فەرموودە ئەوە دەگەیەنێت کە ڕەوایە دوژمنی جەنگی ڕەشەکوژ بکرێت وماڵیشی بە دەستکەوت ببرێت و، سوپایش پێویستە سەرکردەی هەبێت گوێڕایەڵی بکرێت و پێویستە ئەو فەرماندەیش چاکترینی ناویان بێت، یان لە چاکەکانیان بێت، هەروەها کارێکی چاکیشە ئەگەر کەسانێك هاوڕێی بن با کەمیش بن، کەسێکیان بکەن بە ئەمیر و گوێڕایەڵی بن، خواردنەکانیشیان تێکەڵ بکەن چاکترە و، هەرکەسێ بۆ خۆی خواردن نەخوات.[2]

## سێیەم: پۆلی سەربازی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف بۆ(دومة الجندل).

ئەم پۆلە سەربازیە نێردرا بۆ دوورترین جێگایەك کە سوپای ئیسلامی پێی گەیشتبێت لە دوورگەی عەرەبی، چونکە(دومة الجندل) لە سنووری شام بوو، دانیشتوانیشی لە(کلب الکبری) بوون بووبوونە گاور، سەرکردەی ئەم پۆلە

١ برهانه: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٤٨٠).
٢ شرح النووي على مسلم (٨٦/١٣).

سەربازیە(عبدالرحمن بن عوف) بوو، یەکێکە لە دە کەسە مژدە پێدراوەکان بە بەهەشت، ئامانجەکانی ئەم پۆلەش بریتی بوون لە ئامانجی بانگەواز و ئامانجی سەربازی، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ)(عبدالرحمن)ی بۆ دیاری کرد کە پەروەردەی ئیسلام بوو لە سەرەتای سەرهەڵدانیەوە.[١] پاش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) عەبدوڕڕەحمانی ئاگادار کردەوە ئامادە بێت بۆ سەرکردایەتی ئەو هێزە، عەبدوڵای کوڕی عومەر دەڵێت حەزم کرد بزانم پێغەمبەر(ﷺ) چ ئامۆژگارییەکی دەکات پێش دەرچوونیان، پێغەمبەر(ﷺ) بە عەبدوڕڕەحمانی فەرموو: بۆچی دواکەوتیت؟ وتی: حەزم کرد دواکەس جەنابت ببینم بە جلکی گەشتەوە.

دەفەرموێت: لە پێش دەستی خۆی دایناو مێزەرەکەی لەسەری داکەند و، مێزەرێکی ڕەشی کردە سەری و، بەشێکی لێ شۆڕ کردەوە ناوشانی و، فەرمووی: بەم شێوە مێزەر ببەستە ئەی کوڕی عەوف! ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: غەزا بکە بە ناوی خوا و لە پێناو خوا، جەنگ بکە لەگەڵ ئەو کەسەی بێباوەڕە بە خوا، ناپاکی و ستەم مەکە و منداڵ نەکوژیت، ئیبنو عومەر دەفەرموێت: ئینجا دەستی درێژ کرد و فەرمووی: خەڵکینە، خۆتان بپارێزن لە پێنج شت پێش ئەوەی دابەزێتە سەرتاندا، هەر کەسانێك کێش و تەرازوو سووك بکەنەوە خوای گەورە گرانییان دەنێرێتە سەر، هەر کەسانێکیش پەیمان بشکێنن خوای گەورە دوژمنانیان لەسەر زاڵ دەکات، یان زەکات دەرنەکەن بارانیان لێ دەگرێت و، ئەگەر لەبەر مەڕ و ماڵاتیش نەبێت بارانیان بۆ نەدەباری، داوێن پیسیش لە نێو هەر کەسانێکدا بڵاوبێتەوە خوای گەورە لاڕەشەیان دەنێرێتە سەر، هەر کەسانێکیش بە قورئان کارنەکەن خوای گەورە پەرتەوازەیان دەکاتو ناکۆکی دەخاتە نێوانیان. دوای ئەوە سوپاکە بەڕێکەوت بەرەو جێگای مەبەست و عەبدوڕڕەحمان سێ ڕۆژ بانگیکردن بۆ ئیسلام، لە ڕۆژی سێیەم(الاصبغ بن عمرو الکلبي) موسڵمان بوون، کە سەرکردەیان بوو، گاوریش بوو، ئیتر(عبدالرحمان) نامەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) نووسی و ئاگاداری کردەوە، هەروەها نووسیشی کە دەیەوێت ژنیان لێ مارە بکات، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ)

---

١ التربیة القیادیة (٤/١٦٧-١٦٨).

نامەی بۆ نووسی کە(تماضر)ی کچی سەرگەورەکەیان(الاصبغ) مارە بکات، ئەویش مارەی کرد لەوێ و گواستیەوە، ئەو ئافرەتە دایکی سەلەمەی کوڕی(عبدالرحمان)ەو، واقیدی دەگێڕێتەوە کە ئەم پۆلە سەربازییە لە شەعبانی ساڵی شەشی کۆچیدا بووە.[١]

دەکرێت ئەم پەندانە وەربگرین لەم غەزایە:

١- خۆ بەکەم زانینی پێغەمبەر(ﷺ) و بەزەیی هاتنەوەی بە هاوەڵانیدا، چونکە بە دەستی خۆی مێزەرەکەی بۆ(عبدالرحمن) بەستەوە، ئەم کارەیش ورەی هاوەڵانی بەرزدەکردەوە، چونکە ئەو جۆرە پەیوەندییە لە نێوان سەرکردە و سەربازەکاندا دەبێتە مایەی بەدیهێنانی ئامانجەکان.[٢]

٢- سوپای عەبدوڕڕەحمان سوپای بنەما و عەقیدە بوو، بۆیە بە ناوی خوای گەورە جیهادیان دەکرد و نەك بە ناوی کەسی ترەوە، ئەوەیش ئامۆژگاری پێغەمبەر بوو(ﷺ) بۆیان کاتێك فەرمووی:(اغزوا باسم الله)، بۆ ئەوەی خوای گەورە تینوێتی ئەو بیابانە وشکە بە ئاوی سازگاری عەقیدەی یەکتاپەرستی تێربکات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ ﴾(الانعام: ١٦٢-١٦٣). ئەم سوپا بەهێزە زەمینی دەبڕی و دەڕۆیی بۆ جەنگ کردن لەگەڵ بێباوەڕانی دوژمنانی خوا.[٣]

٣- پێغەمبەر(ﷺ)(غلول)ی قەدەغە کرد لە(عبدالرحمان) واتە: لە دەستکەوت دەرکردن پێش دابەشکردنی و نەکوشتنی منداڵ و دوورکەوتنەوە لە ناپاکی، چونکە ئەوە ڕەوشتی ئیسلامە لە کاتی جەنگدا، بۆیە هێزی موسڵمانان هاوکات لەگەڵ ئەوەی لە ئەوپەڕی هێز و زەبر و زەنگدا بوو، لە ئەوپەڕی سۆز و بەزەیشدا بوو.[٤]

---

١ بڕوانە: المغازي (٢/٥٦٠-٥٦١).

٢ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٦/١٨٤).

٣ هەمان سەرچاوە (٤/١٧٢).

٤ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٦/١٨٤).

٤- (عبدالرحمن) یەکێك بوو لە سەرانی بانگخوازان، هۆشمەند و لێهاتوو و، دێرین لە ئیسلامدا، لەسەرخۆ و شارەزا بوو بە دڵ و دەروونەکان، بۆیە هەموو هەوڵەکانی بە گەڕ خست بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن.

٥- موسڵمان بوونی سەرگەورەی(بني کلب) لەسەر دەستی(عبدالرحمن) جەعفەری کوڕی ئەبو تالیبمان بیر دەخاتەوە کە نەجاشی لەسەر دەستی موسڵمان بوو، هەروەها موسعەب کە سەرانی ئەوس و خەزرەج لەسەر دەستی موسڵمان بوون، ئەم کەسایەتیانەش دامەزرێنەرانی قوتابخانەی ئیسلامن یەکەم جار لە مەککەی ڕێز لێگیراو.

(عبدالرحمن) کە سیانزە برینی پێوە بوو، هەندێکیان بوو بە مایەی شەل بوونی، خەڵکانێکی زۆر هاتنە پاڵ سوپاکەی و موسڵمان بوون،(دومة الجندل)یش بوو بە جێگایەکی نوێ لە جێگاکانی ئیسلام، بۆیە موسڵمانان دەستبەرداری ئەو جێگایە نابن، چونکە لە داهاتوودا دەبێتە بنکەیەك بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەو عەرەب و ڕۆمانەی کە دژایەتی ئیسلامیان دەکرد.

ئەوە یەکەم جاریش بوو ئیسلام لە دەرەوەی سنووری خۆی حوکم بکات و، موسڵمان و گاور پێکەوە بژین لە یەك دەوڵەتدا، چونکە موسڵمانان شەریعەتی ئیسلامیان بەسەردا جێبەجێ دەکرا و، سەرانە لە گاورەکان وەردەگیرا، ئەمەیش ڕاهێنان بوو بۆ هاوەڵان لەسەر ئەو کۆمەڵگا تازانەی فەتحی دەکەن لەعێراق و شام و فارس و ڕۆم، بۆ ئەوەی خەڵکی فێری ئیسلام بکەن لە ڕێگەی گفتوگۆوە، نەك لە ڕێگەی شمشێرەوە.[1]

٦- مارەکردنی(عبدالرحمن) بۆ کچی سەرگەورەی(بنی کلب) پەیوەندییەکان پتەوتر دەکاتەوە لە نێوان ئەو سەرکردە موسڵمانە کە تازە موسڵمان بووە و لە نێوان دەوڵەتی ئیسلامدا لە مەدینە و سەرەنجامی دەبەستێتەوە بە سەرەنجامی دەوڵەتی ئیسلامەوە...[2]

---

١ هەمان سەرچاوە (١٧٥/٤).

٢ بڕوانە: التربیة القیادیة (١٧٤/٤).

پێغەمبەر(ﷺ) بە پێویستی دەزانی خۆی و سەرکردەکانی هاوسەرێتی بگرن لەگەڵ کچی سەرانی هۆزەکان، چونکە ئەوە دەستکەوتێکە بۆ بانگەوازی ئیسلامیو دەبێتە مایەی موسڵمان بوونی کەسانێکی زۆر.

## چوارەم: سزادانی ناپاکەکان: غەزای(بني لحيان)و غەزای( الغابة ) و...

١- پاش گەڕانەوەی ئەحزابەکان، موسڵمانان گوێزرانەوە لە ڕۆڵی بەرگری کردن بۆ ڕۆڵی هێرش کردن و خۆیان بوونە خاوەن بڕیار، کاتی ئەوەش هاتووە تۆڵە بکرێتەوە لەوانەی ناپاکییان کرد لەگەڵ شەهیدانی(ذات الرجيع)دا، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) خۆی لەگەڵ دووسەد کەس لە هاوەڵانی دەرچوون لە ڕەبیعی یەکەم یان جومادی یەکەمی ساڵی شەشەمی کۆچی.[1]

### أ- گومڕاکردنی دوژمن:

خاکی(بنی لحیان) دووسەد میل لە مەدینەوە دوور بوو، کە ئەوە ماوەیەکی زۆر دوورە، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) سوور بوو لەسەر تۆڵە کردنەوە بۆ هاوەڵە بەڕێزەکانی، کە بە ناپاکی شەهیدکران.

پێغەمبەر(ﷺ)بە سوپاکەی کەوتەڕێ بەرەو باکوور، لە کاتێکدا ئەو هۆزە دەکەوتنە ئەوپەڕی باشوورەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) پێش دەرچوونی ڕایگەیاند کە نیازی وایە هێرش بکاتە سەر شامدا، تەنانەت هاوەڵانیشی نەیاندەزانی بەرەو(بنی لحیان) دەچن، بەڵام لە ناوچەی(البتراء) پێغەمبەر(ﷺ) ئاراستەی هێزەکەی گۆڕی بەرەو ڕۆژئاوا و، ئینجا ڕاست بوویەوە بەرەو باشوور.[2]

### ب- هەڵهاتنی ئەوان پێش گەیشتنی پێغەمبەر(ﷺ):

(بنی لحیان) لە ئەوپەڕی ووریاییدا بوون و، لەگەڵ نزیکبوونەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵەکانیان هەڵهاتن بەرەو لوتکەی چیاکان، پاش ئەوەی سیخوڕەکانیان هەواڵی نزیك بوونەوەیانیان پێ ڕاگەیاندن.

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٤٦٨).

٢ بڕوانە: صلح الحديبية، باشميل (٣٤-٣٥).

پاش گەیشتنیان پێغەمبەر(ﷺ) سەربازگەی لێدا لە نێو ماڵەکانیان و، پۆل سەربازی دەنارد بۆ بەدواکەوتنیان، دوو ڕۆژ ئەو پۆلە سەربازییانە بە دوایانەوە بوون بەڵام شوێنەواری ئەوانیان نەدۆزییەوە، چونکە لە لوتکەی چیاکان خۆیان قایم کردبوو، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) دوو ڕۆژ لە ناو ماڵەکانیان مایەوە بۆ دەرخستنی تواناو هێزی موسڵمانان.[١]

**ج- تۆقاندنی بتپەرستان لە مەککە:**

پێغەمبەر(ﷺ) ویستی ئەو هەلە بقۆزێتەوە کە نزیکی مەککەیەو مانۆڕێکی سەربازی بکات، بۆیە سوپاکەی جوڵانەوە بەرەو دۆڵی عوسفان و،[٢] فەرمانی بە ئەبو بەکر کرد لەگەڵ دە کەسدا بچن، تاکو نزیکی مەککە دەبنەوە، بۆ ئەوەی ترس و بیم بخەنە دڵیانەوە، ئەوانیش چوون تاکو گەیشتنە(کراع الغميم)، کە زۆر نزیک بوو لە مەککەوە، ئیتر قورەیش وایاندەزانی پێغەمبەر(ﷺ) دەیەوێت هێرش بکاتە سەریان و زۆر ترسان، پاش ئەوەی دڵنیا بوون کە خەڵکی مەککە ترسیان لێ کەوتووە گەڕانەوە و ئینجا لەگەڵ سوپاکە هاتنەوە بۆ مەدینە.

**د- پاڕانەوە و داوای درود کردن بۆ شەهیدان:**

کاتێک گەیشتنە دۆڵی(غران) ئەو شوێنەی کە هاوەڵان تیایدا شەهید کران لەسەر دەستی ناپاکانی هوزەیل، پێغەمبەر(ﷺ) لە خوا پاڕایەوە بۆیان و درودی بۆ ناردن.[٣]

٢- غەزای(الغابة):[٤] پاش گەڕانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە غەزای(بنی لحيان) بە چەند شەوێك،(عيينة بن حصن الفزاري) هێرشی کردە سەر ناوچەی(الغابة) و(ذر)ی کوڕی(ابو ذر الغفاري)یان کوشت و، خێزانەکەشیان بە دیل گرت و، وشترەکانیشیان برد کە بیست وشتر بوون، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ئەم هەواڵەی زانی، بە پێنج سەد

١ هەمان سەرچاوە (٣٦).

٢ لادێیەکی دوو ڕۆژە ڕێ لە مەککەوە دوورە.

٣ بڕوانە: صلح الحديبية، (٣٨).

٤ (الغابة) جێگایەکە نزیك مەدینە لە لای شامەوە.

لە هاوەڵانەوە بە دوایاندا دەرچوو، پاش ئەوەی سەعدی کوڕی عوبادەی کردە جێنشینی خۆی لە مەدینە لەگەڵ سێ سەد کەس لە قەومەکەی بۆ پاراستنی مەدینە.

لە لای شاخێك لە تەنیشت(ذي قرد) پێغەمبەر(ﷺ) فریای دوژمنان کەوت و هەندێکی لێ کوشتن و وشترەکانی گێڕایەوە.[1]

(سلمة بن الاكوع) نەبەردییەکی گەورەی لەم جەنگەدا پێشاندا، بە تایبەتی پێش گەیشتنی سوارەکان، تیربارانی کردن و، هەندێك وشتری لێ سەندنەوە سەبارەت بەو ئافرەتەیش کە بردیان، توانی بە سەلامەتی بگەڕێتەوە بۆ مەدینە و هەڵبێت لەسەر یەکێك لە وشترەکانی پێغەمبەر(ﷺ) و نەزریشی کردبوو ئەگەر ڕزگاری بێت ئەو وشترە سەربڕێت لە پێناوی خوا، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: نەزرێکی خراپت کردووە، واتە: ئەو وشترەی ڕزگاری کردی پاداشتی سەربڕین بێت، دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو:((لا نذر في معصية الله، ولا فيما لاتملكين)).[2] واتە: نەزر ڕەوا نییە لە شتی ناڕەوادا، یان لە شتێکدا کەماڵی خۆت نییە. پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە مەدینە، پاش ئەوەی پێنج شەو لە دەرەوەی مایەوە.[3]

ئەم غەزایە گەورەترین غەزا بوو بۆ تەمێ کردنی عەرەبە بیابانشینەکانی نەجد، لە پاش غەزای ئەحزاب و بەنی قورەیزە و خەیبەر،[4] پۆلە سەربازییەکانی پێغەمبەر(ﷺ) پەیتا پەیتا دەردەچوون بۆ ترساندنی بتپەرستان، هەندێکیان سەرکەوتن و هەندێکیان نەیانتوانی ئامانج بپێکن، لەوانە پۆلە سەربازییەکەی(عكاشە بن المحصن الاسدی) بوو، کە پێغەمبەر(ﷺ) لە مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی شەشی کۆچی ناردی بۆ بەنی ئەسەد و، گەیشتە جێگایەك غەمری پێ دەوترێت، بینی ئەوان هەڵاتوون بۆ سەر چیا نزیکەکان، ئیتر عوکاشە پەلاماری مەڕ و ماڵاتەکەی دان و دوو سەد وشتری هێنا و گەڕایەوە بۆ مەدینە.[5]

---

١ بڕوانە: التاريخ السياسي والعسكري (٣٢٧).
٢ بڕوانە: صلح الحديبية، (٤٥).
٣ بڕوانە: التاريخ السياسي والعسكري (٣٢٧).
٤ بڕوانە: صلح الحديبية، (٤٥).
٥ تاريخ الطبري (٢/٦٤٠).

هەروەها پۆلە سەربازییەکەی موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاڕی، بۆ(ذي القصة)[١] بۆ ترساندنی(بني ثعلبة) و(عوال)، لە مانگی ڕەبیعی دووەمی ساڵی شەشی کۆچی موحەممەدی کوڕی مەسلەمە و دە کەس چوونە سەریان بە شەو، ئیتر ئەوان دەرکیان پێ کردن کە سەد کەس بوون، بۆ ماوەیەك شەڕە تیریان کرد و دواتر عەرەبە بیابانشینەکان هێرشیان کردە سەریان و کوشتنیان، موحەممەدی کوڕی مەسلەمەیش برینـدار بـوو، نەشـیتوانی بگەڕێتـەوە بـۆ مەدینـە، تـاکو پیـاوێکی موسڵمانی پیا تێپەڕ بوو و هەڵی گرت بۆ مەدینـە،[٢] بـە دوایـدا پێغەمبـەر(ﷺ) ئـەبو عوبەیدەی لەگەڵ چل کەسدا نـارد بـۆ لای ماڵـەکانیان، بـەڵام کەسـیان نـەبینی و، هەندێ مەڕ و ماڵاتیان لەگەڵ خۆیان هێنا.[٣]

ئەم پۆلە سەربازییانە جۆرێك بوو لە تەمێ کردن بۆ ئەوانەی بیر لەوە دەکەنەوە یارمەتی جوولەکە بدەن، چونکە بۆیان دەرکەوت کە هەرچی جموجۆڵیـان هەیـە لـە ژێر چاودێری موسڵماناندایە.[٤]

ئینجـا ئـەم جموجۆڵـە سـەربازییانە موسـڵمانان فێردەکـات کـە گرنگـی بدەنـە کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی دوژمنانیان و پێویستە بایـەخی تـەواوی پـێ بـدەن هاوکات لەگەڵ ڕەچاوکردنی ڕێخەرە شەرعیەکاندا.[٥]

## پێنجەم: پۆلی سەربازی(کرز بن جابر الفهری) بۆ لای عورەنییەکان.

لە ساڵی شەشـەمی کۆچـی، کۆمـەڵێك لـە هـۆزی عوکـەل و عورەینـە هاتنـە لای پێغەمبەر(ﷺ) و باسی موسـڵمان بـوونی خۆیانیـان کـرد، وتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خوا، ئێمە ئاژەڵ دار بووین و لادێ نشین نەبووین، بۆیە دانیشتنی ناو مەدینەیان بە لاوە نـاخۆش بـوو، ئـیتر پێغەمبـەر(ﷺ) هەنـدێ وشـتر و شـوانێکی لەگـەڵ نـاردن،

---

١ جێگایەکە بیست و چوار میل لە مەدینەوە دوورە لە ڕێگەی (الربذة)ەوە.
٢ بڕوانە: التاريخ السياسي والعسكري (٣٢٨).
٣ الواقدي (١/٥٥١).
٤ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٦/١٨٩).
٥ بڕوانە: الاساس في السنة (٢/٧١٢).

فەرمانیشی پێ کردن لە شیرەکانیان بخۆن و بە میزەکانیشیان خۆیان بشۆن، کاتێک گەیشتنە لای حەڕە، لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە و، شوانەکەی پێغەمبەر(ﷺ)یان کوشت و وشترەکانیان برد، کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەم هەواڵەی زانی خەڵکی بە دوایاندا نارد دەستگیریان کردن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد، چاویان کوێرکرا و دەست و پێیان بڕا و، لە لایەکی حەڕەوە فڕێ دران تاکو بەو شێوەیە مردن، قەتادەی گێڕەرەوەی فەرموودەکە دەڵێت: پێمان گەیشتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) لە پاش ئەو ڕووداوە هانی خێرکردنی زۆر دەدا و ئەتک کردنی لاشەی قەدەغە کرد.[1]

ئەبو قەللابە دەڵێت: ئەوانە کەسانێك بوون دزییان کرد و پیاویان کوشت و، هەڵگەڕانەوە پاش موسڵمان بوونیان و جەنگیان لەگەڵ خوا و پێغەمبەر(ﷺ) کرد.[2]

جومهوری زانایان فەرموویانە، ئەم ئایەتە: ﴿إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾(المائدة: ٣٣). لە ئەو کەسانەدا دابەزیوە،[3] هەندێك هۆکاری تریش باس دەکرێت لە دابەزینیدا.[4]

هەر چۆنێکیش بێت پەند بە گشتگیری وشەکانە، نەك بە تایبەتمەندێتی هۆکارەن، چونکە ئەو حوکمە هەر ماوەتەوە تاکو ئەمڕۆ، بەڵگەش لەسەر ئەوە یەکدەنگی زانایانە لەسەر حوکمی(حرابة) لە ئیسلامدا، ئەم ئایەتەیش وەکو لە بوخاریدا هاتووە دەربارەی بێباوەڕان دابەزیووە، ئینجا لەبەر ئەوەی عورەنییەکان چاوی شوانەکەیان کوێر کرد ئینجا کوشتیان، بۆیە کردارەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵیاندا ئەتك کردن نەبوو، بەڵکو تۆڵە سەندنەوە بوو لێیان.[5]

---

١ السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٤٧٨).

٢ هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

٣ بڕوانە: سبل الهدى والرشاد للشامي (٦/١٨١-١٩٠).

٤ بڕوانە: تفسير الطبري (١٠/٢٤٢-٢٤٤).

٥ بڕوانە: علاج القران الكريم للجريمة، د. عبدالله الشنقيطي (٢٩٧-٢٩٨).

ئینجا ئەوانە بە ناشرینترین شێواز باس کراون، باسکراون کە دژایەتی خوا و پێغەمبەر(ﷺ) دەکەن و خراپەکاری دەکەن لەسەر زەوی بە ترساندنی دانیشتوانی و کوشتن و تالانکردنیان بە ستەم، بۆیە میهرەبانی خوای گەورە وای خواست یەکێك لە چوار سزایان لەسەر بسەپێنرێت: کوشتن و لە خاچدان و، دەست و پێ بڕین لە پشتەوە و، دوورخستنەوە و دابڕانیان بە دوورخستنەوە و، نامۆکردن تاکو ئەو تاوانە خراپەیان لێ دووبارە نەبێتەوە و، ترسێنەریش بێت بۆ کەسانی تر.

ئینجا خوای گەورە ئەوانەی جیاکردووەتەوە کە دەگەڕێنەوە و، تەوبە دەکەن، پێش ئەوەی دەستگیر بکرێن، خوای گەورەیش ئەو دوو ئایەتەی بە وشەی(غفور و رحيم) کۆتایی پێهێناوە بۆ ئەو کەسانەیان تەوبە دەکەن و کاری چاکە دەکەن و بێ هیوا نەبن لە میهرەبانی خوای گەورە، بە گشتی قورئانی پیرۆز چارەسەری(الحرابة)ی کردووە بەم چارەسەرانەی خوارەوە:

١- وەسف کردنی دژایەتی کار بەوەی کە جەنگ لەگەڵ خوا و پێغەمبەر(ﷺ) دەکات.

٢- گەورەیی سزای ئەو کەسانەی ئەم تاوانە ئەنجام دەدەن.

٣- پلە و پایەی نزمی ئەو کەسە لە دونیا و دواڕۆژدا ئەگەر تەوبە نەکەن.

٤- والاکردنی دەرگای تەوبە، بۆ ئەوەی بەردەوام نەبێت لە تاوانەکانی.[1]

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٣٣﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبۡلِ أَن تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهِمۡۖ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾(المائدة: ٣٣-٣٤).

بەم شێوە بزوتنەوەی بونیاتنانی کۆمەڵگا و بەرپاکردنی دەوڵەت ئاڵۆز بوو لە کێشە سەربازی و سیاسی و کۆمەلایەتی و ڕەوشتی و ئابووریەکاندا.

---

١ بڕوانە: علاج القران الكريم للجريمة (٣١٣-٣١٥).

## باسی سێیەم: لەناوبردنی دوژمنانی دەوڵەتی ئیسلامی

### یەکەم: پۆلی سەربازی عەبدوڵا کوڕی عەتیك بۆ کوشتنی (سلام بن ابی الحقیق).

سەلام لە جوولەکەی(بني النضير) بوو، هەمیشە خەریکی هاندان بوو لە دژی دەوڵەتی ئیسلامی، تەنانەت ماڵی زۆری دەستنیشان کردبوو بۆ غەتەفان و هۆزەکانی دەوروبەر ئەگەر دژایەتی ئیسلام بکەن، هەروەها ئەو یەکێك بوو لەوانەی ئەحزابەکانیان کۆکردەوە لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) و، بووبوویە کۆسپێکی مەترسیدار لە بەردەم دەوڵەتی ئیسلامیدا.[1]

**١- بەڕێکەوتنی پۆلە سەربازییەکە بەرەو خەیبەر:**

پێغەمبەر پیاوانێکی لە ئەنصار نارد بۆ لای ئەبو ڕافیعی جوولەکە و عەبدوڵای کوڕی عەتیکی کرد بە سەرکردەیان، ئەبو ڕافیع لە قەڵایەکی خۆیدا بوو، کاتێك خۆر ئاوا بوو لێی نزیك بوونەوە، عەبدوڵا بە هاوڕێکانی وت: لە جێگای خۆتان دانیشن، چونکە من بە نەرم و نیانی دەچمە لای دەرگاوانەکە بەڵکو بچمە ژوورەوە، ڕۆیشت تاکو نزیکی دەروازەکە بوویەوە و پۆشاکێکی بەسەر خۆیدا دا وەکو ئەوەی کارێکی هەبێت، خەڵکی چوونە ژوورەوە و دەرگاوانەکە هاواری کرد: ئەی بەندەی خوا، ئەگەر دەتەوێت بچیتە ژوورەوە بچۆ چونکە دەمەوێت دەروازەکە دابخەم، دەڵێت منیش چوومە ژوورەوە و، خۆم شاردەوە، بینیم دەروازەکەی گرت و کلیلەکانی هەڵواسی بە قەد دارێکدا، دەڵێت: منیش هەڵسام کلیلەکانم هەڵگرت و دەروازەکەم کردەوە.

**٢- جێبەجێ کردنی سزا لەسەر ئەبو ڕافیع:**

ئیبنو عاتیك و ئەندامانی پۆلەکەی چوونە ناو قەڵاکەوە و، چاوەڕوانی ساتی گونجاوییان دەکرد بۆ کوشتنی ئەو جوولەکە پیسە.

---

[1] بڕوانە: قراءة سياسية للسيرة النبوية، محمد قلعجي (٢١٢).

لە بوخاریدا هاتووە کە عەبدوڵا بینی ئەبو ڕافیع کۆمەڵێك لە هاودەمانی لە دەوروین و قسە و باس دەکەن، ئیتر چاوەڕوانی کرد تاکو هەڵسان، ئەو کاتە سەرکەوت بۆ لای، هەموو دەرگاکانیشی لە پشت خۆیەوە داخست تاکو کەس فریای نەکەوێت، گەیشتە لای ئەبو ڕافیع بینی لە ژوورێکی تاریکدایە لە ناو منداڵەکانیدا، دیار نییە لە کوێدا خەوتووە، ئیبنو عەتیك وتی: هۆ ئەبو ڕافیع، وتی: ئەوە کێیە؟ ئیبنو عەتیك بە شمشێرەکەیەوە بەرەو لای دەنگەکە ڕۆیشت و لێیدا.

دەڵێت لە ژوورەکە دەرچووم و پاش کەمێك گەڕامەوە لای.

وتی: ئەو دەنگە چییە ئەی ئەبو ڕافیع؟

وتی: بەڵا لە دایکتدا، پیاوێك بە شمشێر لێیدام ئێستا.

دەڵێت: ئینجا نوکی شمشێرەکەم کرد بە سکیدا و لە پشتیەوە دەرچوو.

ئینجا دەرگاکانم کردەوە، پێم خستە سەر پلەیەك وامزانی گەیشتوومەتە زەوی، بۆیە کەوتم و قاچم شکا، منیش بە مێزەرەکەم بەستم، ئینجا لە لای دەرگاکە دانیشتم، وتم: دەرناچم تاکو دڵنیا نەبم کوشتوومە کە دەنگی کەڵەشێرم بیست، بانگکەرێك هاواری کرد: ئەبو ڕافیع کوژرا، ئینجا لەگەڵ هاوەڵەکانم گەڕاینەوە، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم قاچت درێژ بکە، ئینجا دەستی پیا هێنا وەکو ئەوەی هیچی لێ نەهاتبێت.[1]

لە کتێبەکانی ژیاننامەی پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە کە خێزانەکەی ئەبو ڕافیع هاواری کرد و هات بیکوژێت، بەڵام وازی هێنا چونکە پێغەمبەر(ﷺ) کوشتنی ژن و منداڵی قەدەغە کردبوو،[2] ئینجا ئیبنوعەتیك کەمێکی لە زمانی جولەکە دەزانی ئیتر قسەی پێکرد لەگەڵ خێزانی ئەبو رافیع و منداڵەکانی.

لە کتێبەکانی سیرەدا هاتووە کە هەموو پۆلەکە بەشدارییان کرد لە لێدانی ئەبو ڕافیعدا و، هەمووشیان بانگەشەی ئەوەیان کردووە کە کوشتوویانە، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك تەماشای شمشێرەکانی کردن فەرمووی: عەبدوڵای کوڕی ئونەیس کوشتوویەتی، لە ڕاستیدا هیچ جیاوازییەکیش نییە لە نێوان ڕیوایەتی

---

١ البخاري كتاب المغازي، باب (قتل ابي رافع) (٥/٣٣) رقم (٤٠٣٩).

٢ بڕوانە: شرح (المواهب اللدنية) (٢/١٦٨).

بوخاری و کتێبەکانی تر، چونکە عەبدوڵای کوڕی عەتیك باسی خۆی دەکات و ناڵێت کەسم لەگەڵدا نەبووە.

پۆلەکەیش بریتی بوون لە: عەبدوڵای کوڕی عەتیك، مەسعودی کوڕی سینان، عەبدوڵای کوڕی ئونەیس، ئەبو قەتادەی حاریسی کوڕی ڕەبعی، خوزاعەی کوڕی ئەسوەد.[١]

ئەم پۆلە سەربازییە پەند و وانەی زۆری تیادا بوو:

١- ئەندامانی ئەم پۆلە سەربازییە هەموویان لە خەزرەج بوون، چونکە سوور بوون لەسەر کێبڕکێ لەگەڵ برا ئەوسییەکانیان کە کەعبی کوڕی ئەشرەفیان کوشت، ئەوان پێشبڕکێیان نەدەکرد لەسەر خۆشیەکانی دونیا، بەڵکو بۆ ڕەزامەندی پێغەمبەر(ﷺ) کە سەرفرازی دوارۆژی تێدایە.

کەعبی کوڕی مالیك دەڵێت: یەکێك لەو شتانەی خوای گەورە بۆ پێغەمبەرەکەی کرد، ئەوەبوو ئەوس و خەزرەج هەمیشە لە پێشبڕکێی ئەوەدابوون پێغەمبەر(ﷺ) ڕازی بکەن، ئەگەر ئەوس کارێکی چاکەیان بکردایە دەبوایە خەزرەجیش کارێکی لەو جۆرەیان ئەنجام بدایە.[٢]

٢- سوودی فێربوونی زمانی دوژمن: چونکە عەبدوڵای کوڕی عەتیك زمانی ئەوانی دەزانی بۆیە چووە ناو قەڵاکەوە و لەگەڵ خێزانەکەی قسەی کرد، کەواتە شتێکی چاکە موسڵمانان فێری زمانی دوژمنانیان بن.[٣]

٣- هۆکارەکانی سەرکەوتنی پلانەکەی ئیبنو عەتیك: ڕۆیشتنی بە تەنها خۆی بە مەبەستی دۆزینەوەی ڕێگەیەك بۆ کوشتنی ئەبو ڕافیع، بە شێوەیەکی ئاسایی ڕۆیشت کە سەرنجی پاسەوانەکەی ڕانەکێشا و، وای پیشاندا کە دەیەوێت کارێکی خۆی ئەنجام بدات، ئینجا چاودێری کردنی پاسەوانەکە، چونکە خۆی شاردەوە لە جێگایەك پاسەوانەکە ئەوی نەدەبینی، تاکو ڕۆیشت و کلیلەکەی هەڵگرت، بۆ ئەوەی بەکاری بهێنێت لە کاتی گونجا.

---

١ بڕوانە: الصراع مع اليهود (١/١٨٩).
٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٦/١٧٧).
٣ بڕوانە: الصراع مع اليهود (١/١٩١).

٤- چاودێری کردنی خوا بۆ ئیمانداران، چونکە ئەم هاوەڵە هەر کۆششی کرد تاکو قاچی شکا و هەستی نەدەکرد بە ئازارەکەی، بەڵام کاتێك کارەکەی تەواو بوو ئازارەکەی بۆ گەڕایەوە و دواتر پێغەمبەر(ﷺ) دەستی پیا هێنا.[١]

٥- (ابن حجر) هەندێ سوودی دەرکردووە لەم بەسەرهاتە، لەوانە: ڕەشەکوژکردنی ئەو بتپەرستەی کە بانگەوازی پێ گەیشتووە و، هەر سوورە لەسەر خراپەی خۆی، هەروەها کوشتنی هەر کەسێك یارمەتی پێشکەش بکات بۆ دژایەتی پێغەمبەر(ﷺ)، هەروەها سیخوڕی کردن لەسەر دوژمنە جەنگییەکان و، بەکارهێنانی توندی لەگەڵیان، ئینجا گومڕاکردن لەبەر بەرژەوەندی، هەروەها بەرەنگاری ژمارەی کەمی موسڵمانان بۆ ژمارەی زۆری موشریکان، هەروەها حوکم کردن بە بەڵگە و نیشانە، چونکە ئیبنو عەتیك بیستنی دەنگی ئەبو ڕافیعی کردە بەڵگە لەسەر نەمردنی و، دەنگی بانگەرەکە بە کوژرانی کردە بەڵگە لەسەر مردنی.[٢]

٦- عەبدوڵای کوڕی ئونەیس وەکو سەربازێك لەم پۆلەدا بوو، سەرەڕای ئەوەی کە بەشداری عەقەبە و بەدری کردووە و، نوێژی بەرەو هەردوو قیبلەکە کردووە، ئینجا هەر خۆی بوو کە سوفیانی کوڕی خالیدی هوزەلی کوشت کە هێزی زۆری کۆکردبووەوە بۆ جەنگی پێغەمبەر(ﷺ)، سەرەڕای هەموو ئەم خەسڵەتانە سەربازێك بوو نەك سەرکردە، ئەمەیش جۆرێکە لە پەروەردەکردنی بێ وێنە، چونکە لە سوپاکاندا ئەوەی ئەژماری بۆ دەکرێت پلە و پایەی سەربازییە و هەمیشە تەماشای تازە و دێرینی دەکرێت، بەڵکو چەندین جار پێغەمبەر(ﷺ) پۆلی سەربازی دەنارد ئەبو بەکرو عومەری وەکو سەرباز تێیدابوون.[٣]

---

١ البخاري، المغازي رقم (٤٠٣٩).

٢ فتح الباري (٧/٣٤٥).

٣ بڕوانە: التربية القيادية (٤/١٤٨).

## دووەم: پۆلی سەربازی عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە بۆ لای یوسەیری کوڕی ڕیزامی جوولەکە.

پێغەمبەر(ﷺ)هەواڵی زانی کە یوسەیری کوڕی ڕیزام سەرکردەی جوولەکە لە خەیبەر پاش(سلام بن ابی الحقیق) جوولەکەی باکوور کۆدەکاتەوە و هانیان دەدا لە دژی پێغەمبەر(ﷺ)، هەروەها هەوڵی دەدا هۆزەکانی غەتەفانیش کۆبکاتەوە بۆ ئەو مەبەستە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بە ناردنی عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە لەگەڵ چەند کەسێکی بۆ دڵنیا بوون لە نیازیان.[1]

هەوالگری پێغەمبەر(ﷺ) دڵنیا بوون لەو مەسەلەیە، ئەمەیش بەس بوو بۆ ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسێت بە ناردنی پۆلێکی سەربازی لە سی کەس بە فەرماندەیی عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە و، عەبدوڵای کوڕی ئونەیسیشیان تیادا بوو، هاتنە لای یوسەیر و وتیان: پێغەمبەر(ﷺ) ئێمەی ناردووە بۆ لات بۆ ئەوەی بتکات بە سەرۆکی خەیبەر لە لایەن خۆیەوە، ئیتر هەر هەوڵیان دا لەگەڵی تاکو ڕازی بوو خۆی و سی کەس بچن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) هەر یەکە و لەگەڵ سوارێك لە موسڵمانان سوار بوون و خۆیشی لەگەڵ عەبدوڵای کوڕی ئونەیس سوار بوو لەسەر وشترەکەی کاتێك ماوەی شەش میل لە خەیبەر دوورکەوتنەوە لە(قرقرة ثیار) یوسەیر پەشیمان بوویەوە لەم گەشتەی و دەستی برد بۆ شمشێرەکەی عەبدوڵای کوڕی ئونەیس و ئەویش پێی زانی بە شمشێرەکەی قاچی بڕی، ئەویش بە دارێك لە دەم و چاوی عەبدوڵای دا و بریندار کرد، ئینجا هەر یەکە و لەو جوولەکەی دا کە لەگەڵی سواربووبوو، هەموویان کوژران تەنها یەکێکیان نەبێت بە ڕاکردن هەڵهات، کاتێك گەڕانەوە پێغەمبەر(ﷺ) تفی کردە سەر برینەکەی عەبدوڵا و چاك بوویەوە.

ئەم پۆلە سەربازییە لە شەوواڵی ساڵی شەشەمی کۆچیدا بوو،[2] دەشتوانین ئەم پەندانەی لێ وەربگرین:

١- پلانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەوە بوو خوێن بوەستێت لە نێوان جوولەکە و موسڵمانان‌دا، بەڵام ئەوان بەوە ڕازی نەبوون و نیازی ناپاکییان بوو، بۆیە

---

١ بڕوانە: اليهود في السنة المطهرة (١/٢٨٨-٢٨٩).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٤٧٧).

پیلانەکەیان شکایەوە سەر خۆیان.

٢- پێویستە توند و تیژی بەکاربهێنرێت لەو کاتەی گفت و گۆ سوودی نامێنێت، بە شێوەیەك ترس بکەوێتە دڵی دوژمنانەوە و بزانن کە ئەو کەسەی شەڕیان لەگەڵ دەکات لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسێت لە پێناو خوادا.

٣- ساڵی شەشەم ڕووبەڕووبوونەوەی سەخت دروست بوو لەگەڵ دوژمندا، لە هەموو مانگێکدا پۆلێکی سەربازی یان دووان بیابانیان دەبڕی، چونکە دروشمی ئەم قۆناغە بریتی بوو لە((ئێمە هێرشیان دەکەینە سەر و ئەوان ناتوانن هێرشمان بکەنە سەر))، ئەو هێزانە بە ناوی خواوە بە هەموو لایەکدا دەڕۆیشتن و بنەما و بەها ئیسلامییە بەرزەکانیان هەڵدەگرت و ڕێبازی خوای گەورەیان پیادە دەکرد و خۆیان وەرگێڕانێکی کردەیی بوون بۆ پێشەنگەکانیان و، بەرەو قۆناغێکی تازە دەچوون کە خۆی لە صوڵحی حودەیبییە دەبینیەوە.[١]

---

١ بڕوانە: التربية القيادية (٤/١٨٩-١٩٢).

# بەشی سێ زدەیەم

# فەتحی ئاشکرا( صوڵحی حودەیبییە )

## باسی یەکەم: مێژوو و هۆکـار و کـاتی دەرچـوونی پێغەمبـەر( ﷺ ) بـۆ مەککە

### یەکەم: مێژوو و هۆکارەکانی.

لە ڕۆژی دوو شەممەی مانگی(ذي العقدة)ی ساڵی شەشی کۆچی،[١] پێغەمبەر(ﷺ) لەگـەڵ هـاوەڵانی بەڕێکـەوت بـۆ جێبـەجێ کردنـی عـومرە.[٢] هۆکـاری ئـەم غەزایـە ئەوەبوو پێغەمبەر(ﷺ) لە خەونیدا بینی – کاتێك لـە مەدینـە بـوو – کـە چـووەتە مەککەوە لەگەڵ هاوەڵانی و ئیحرامی پۆشیوە بـۆ ئەنجامـدانی عـومرە، قوربانیـشی لەگـەڵ خـۆی بردبـوو بـۆ مـەزن ڕاگرتنـی کەعبـە، ئـیتر پێغەمبـەر(ﷺ) مـژدەی بـە هاوەڵانیداوئـەوانیش پێخۆشـحاڵ بـوون،[٣] چـونکە ماوەیـەکی زۆر بـوو لـە مەککـە دابڕابـوون و، پـەرۆش بـوون بـۆ تـەواف کـردن بـە دەوری کەعبـەدا، بـە تایبـەتی موهاجیرەکـان کـە لـەوێ لـە دایك بووبـوون، جـا کاتێـك پێغەمبـەر(ﷺ) ئاگـاداری کردنەوە خۆیان ئامادەکرد،[٤] ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) داوای لە خەڵکی بیابان و عەرەبە بیابانشینەکان کرد لەگەڵی دەربچن، چونکە دەترسا قورەیش ڕێگەیان لێ بگرن لـەو سەردانە، هەواڵگری پێغەمبەر(ﷺ) ئاگاداریش بوو لە هاوپەیمانێتی نێوان قورەیشی باشـووری مەدینـە و خەیبـەری بـاکووری، بـە مەبەسـتی بنـەبڕکردنی قـەوارەی ئیسلامی، ئینجا کەعبە لە دیدی هەموو عەرەبانەوە، تەنها موڵکی قـورەیش نـەبوو، بەڵکو میراتی ئیسماعیلی باوکیان بوو، بۆیە قورەیش بۆی نییە کەس قەدەغە بکات

---

١ هەموو زانایان بەبێ جیاوازی یەکدەنگن لەسەر ئەو مێژوو، بڕوانە: المجموع للنووي (٧/٧٨).

٢ بڕوانە: نضرة النعيم (١/٣٣٤).

٣ بڕوانە: حديث القران الكريم عن غزوات الرسول (٢/٤٩٥).

٤ بڕوانە: السيرة النبوية للندوي (٢٧٣).

لە سەردانی ماڵی خوا.[١]

هەواڵی دەرچوونی پێغەمبەر(ﷺ) لە ناو هۆزەکانی عەرەب بڵاوبوویەوە، ئەو هەواڵە کاریگەری زۆریشی هەبوو لەسەر ڕای گشتی، چونکە پێغەمبەر(ﷺ)ڕایگەیاندبوو، کە بۆ جەنگ ناچێت و تەنها مەبەستی عومرەیە، ئەمەیش دەستکەوتی چاکی دەستەبەر کرد بۆ موسڵمانان، ئینجا لەبەر ئەوەی مەبەستیان عومرە بوو، هیچ جل و بەرگێکی دووراویان لەبەر نەکرد.

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) لە ئەوپەڕی وریاییدا بوو، بۆیە سوفیانی خوزاعی نارد بۆ هەواڵ هێنانەوە و، پێش دەرچوونیشیان پۆلێکی نارد لە بیست کەس بۆ زانینی دەنگ و باس وەکو واقیدی دەڵێت.[٢] بە مەبەستی ئامادە باشی بۆ شتی چاوەڕوان نەکراو.[٣]

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) بە قسەی عومەری کرد و کاتێك پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا دەچیتە لای دوژمنانت بەبێ چەك و قەڵغان، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بۆ مەدینە چەك و قەڵغان بهێنن،[٤] مەبەستی لەم کارەیش دووربینی بوو، نەوەك دوژمنان زیانیان پێ بگەیەنن، هەمیشەیش پێغەمبەر(ﷺ) ئەم دووربینانەی ئەنجام دەدا.[٥]

## دووەم: گەیشتنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ عوسفان.

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتە عوسفان بیشری کوڕی سوفیانی کەعبی خوزاعی هات و تی: ئەی پێغەمبەری خوا، قورەیش دەرچوونە لەگەڵ ژن و منداڵەکانیان، پێستی پڵنگیان لەبەر کردووە و پەیمانیان داوە نەهێڵن بە زۆر بچنە ناو مەککەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵا لە قورەیش بدات، جەنگ لەناوی بردن، چی تیایە

---

١ قراءة سياسية للسيرة النبوية (٢١٣-٢١٤).

٢ بڕوانە: مرويات غزوة الحديبية للحكمي (٥٨-٥٩)، المغازي للواقدي (٢/٩٧٤).

٣ بڕوانە: صلح حديبية، باشميل(٣٠٩).

٤ تاريخ الطبري (٢/٦٢٢).

٥ بڕوانە: القيادة العسكرية في عهد الرسول (٢٨٩).

ئەگەر ڕێگەم بدەن بگەمە خەڵکی؟ ئەگەر شتێکم پێ بکەن، ئەوە دەبێت کە خۆیان حەز دەکەن و، ئەگەر سەریش کەومە سەریان دێنە نێو ئیسلامەوە بێ ئەوەی هیچ زیانێك بکەن، ئیتر قورەیش گومانی چی دەبەن؟ سوێند بە خوا هەر جیهادیان لەگەڵ دەکەم لەسەر ئەوەی خوای گەورە منی پێ ڕەوانە کردووە، تاکو خوای گەورە سەرم دەخات.[1]

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ڕاوێژی کرد بە هاوەڵان چی بکرێت بەرانبەر قورەیش، هاوەڵانیش دوو بۆچوونیان هەبوو:

١- چوونە سەر منداڵ و خێزانی ئەو حەبەشانەی لەگەڵ قورەیش دەرچووبوون بۆ یارمەتیدانیان.

٢- ڕۆیشتن بەرە ماڵی خوا، هەرکەسێکیش ڕێی لێ گرتن شەڕی لەگەڵ دەکەن.[2]

ئینجا ئەبو بەکر بۆچوونی خۆی پێشنیار کرد پاڵپشت بە بەڵگەی بەهێزەوە، ئەویش ئەوەبوو شەڕ نەکرێت و بەردەوامیش بن لە ڕۆیشتن بۆ جێگای مەبەست، با دەست پێکردنی شەڕیش لە ئەوانەوە بێت، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) ئەو بۆچوونەی پەسەند کرد و،[3] کاتێك سوارەکانی بتپەرستانیش لە پێغەمبەر(ﷺ) نزیك بوونەوە، نوێژی(خوف)یان کرد لە ناوچەی عوسفان.

## سێیەم: پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگا دەگۆڕێت و لە حودەیبیە دادەبەزێت.

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ئاگادار بوویەوە کە قورەیش دەیانەوێت دەست بهێننە ڕێگای و بۆیان دانیشتوون لە ڕێگا بە سەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلید، بە باشی زانی ڕێگەی سوپاکە بگۆڕێت بۆ ئەوەی پێکدادان دروست نەبێت لەگەڵ بتپەرستەکاندا، بۆیە داوای کرد لە یەکێك لە موسڵمانان و ئەویش لە ڕێگەیەکی

١ البخاري، كتاب الشروط، باب الشروط في الجهاد (٣/٢٣٧) رقم (٢٧٣٢).
٢ بڕوانە: القيادة العسكرية في عهد الرسول (٤٨٩).
٣ البخاري، كتاب الشروط، باب الشروط في الجهاد (٣/٢٣٧) رقم (٢٧٣٢).

شاخاوییەوە تاکو گەیشتنە دەشتێك و ئەو کاتە پێغەمبەر(ﷺ) بە خەڵکەکەی فەرموو: بڵێن:(نستغفر الله ونتوب اليه) خەڵکەکەیش وایان وت.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی((والله انها الحطة التي عرضت على بني اسرائيل فلم يقولوها))،[1] واتە: سوێند بە خوا ئەمە ئەو وشەیەیە کە وترا بە بەنی ئیسرائیل و نەیان وت. ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی بە خەڵکی کرد لای ڕاست بگرن بەرەو(ثنية المرار) لە لای خواری مەککەوە،ئیتر سوپاکەی ئەو ڕێگەیان گرت و خالید ئەوەندەی زانی تۆزی سوپاکە بەرزبوویەوە، بۆیە بە پەلە گەڕانەوە مەککە و ئاگاداریانکردنەوە لەم ڕووداوە، لە ڕاستیدا دابەزینی سوپای موسڵمانان لە حودەیبیە کارێکی کتوپڕ بوو، چونکە مەککە توشی مەترسی بوو لە لایەن موسڵمانانەوە.

لیوا مەحمود شیت خەتتاب دەڵێت: موسڵمانان لە ترسدا نەبوو ئەو ڕێگەیەیان گرت، چونکە ئەو کەسەی لە دوژمنەکانی بترسێت ناچێت نزیك بێتەوە لە بنکەی سەرەکی ئەو هێزە، بەڵکو هەوڵ دەدا دوورکەوێتەوە لەو بنکە سەرەکییە تاکو هێڵی گواستنەوەی دوژمن درێژبێتەوەودووربکەوێتەوە لە بنکەی سەرەکی و گیروگرفت و ناڕەحەتیەکانی زیاد بکات و هەلی سەرکەوتنیشی کەم بکاتەوە.[2]

لە ڕاستیشدا حیکمەت لە گۆڕینی ڕێگە – وەکو لە کتێبی((اقتباس النظام العسكري في عهد الرسول ﷺ)) هاتوو – ئەوەبوو ڕێگەیەکی سەلامەت و دوور لە مەترسی بگیردرێت بۆ ئەوەی سوپاکە دوور بێت لە پەلاماری دوژمن.[3]

## چوارەم: وشتری قەسوا، هەر لە خۆیەوە ڕانەوەستا، بەڵکو تووشی هەمان ئەو کۆسپە بوو کە ڕێگەی لە فیلەکان گرت پێشکەوێت.

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لە حودەیبیە نزیك بوویەوە، وشترەکەی هاتە سەر چۆك و دانیشت، وتیان: بەبێ هۆ وای کرد، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: لە خۆیەوە وای

---

١ غزوة الحديبية لأبي فارس (٢٩).

٢ بڕوانە: الرسول القائد، محمود شيت خطاب (١٨٦–١٨٧).

٣ بڕوانە: السيرة النبوية لأبي فارس، (٣٧٤) نقلا عن اقتباس النظام العسكرية (٢٥٨).

نەکرد، نە ڕەوشتیشی وایە لە خۆیەوە ڕاوەستێت، بەڵکو ڕێگری فیل بوو بە ڕێگر لە پێش ئەمیشدا، ئینجا فەرمووی: سوێند بە خوا، داوای هەر پلانێکم لێ بکەن بۆ مەزن ڕاگرتنی قەدەغەکراوەکانی خوای گەورە دەیاندەمێ،[1] ئینجا تێیخوڕی و هەڵسا، پاش چوونە ئەوسەری حودەیبییە لە لای بیرێك ئاوی کەم بوو، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) تیرێکی لە تیردانەکەی دەرهێنا و فەرمانی پێکردن بخرێتە ناوی، ئیتر ئاوی زۆربوویەوە و تێر بوون هەموویان،[2] هەندێکیش دەڵێن پێغەمبەر(ﷺ) داوای دۆڵکەیەك ئاوی کردووە و ئاوی لەدەمی خۆی ڕاداوە و لەئەو دۆڵکەی کردوو و ڕژاندوویەتییە ناو بیرەکە، ئیتر ئاوەکەی زیادی کردووە، لەوانەشە – وەکو ئیبنو حەجەر – دەڵێت هەردوو ئەم حاڵەتانە ڕوویاندابێت، سەبارەت بە ڕاوەستانی وشترەکەیش، ئەم چەند پەندە وەردەگرین:

١- هەر شتێك لەم گەردوونەدا بە ویستو فەرمانی خوای گەورەیە، تەماشاکە وشترەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لە کوێ هات بە چۆکدا، ئینجا چۆن هاوەڵان بێ تاقەت بوون و هەوڵیاندا هەڵیسێننەوە، بۆئەوەی بەردەوام بن لە ڕێکردن بەرەو ماڵی خوا، بەڵام خوای پەروەردگار شتێکی تری ویست.[3]

٢- ئیبنو حەجەر سوودێکی گەورەی هەڵێنجاوە لەو فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ):((حبسها حابس الفيل)) و فەرموویەتی: سەرەڕای ئەوەی کۆمەڵی فیل لەسەر ڕێگای ناڕەوا بوون و، کۆمەڵی وشترەکە لەسەر ڕێگای ڕاست بوون، بەڵام لێکچوونیان لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە حەرەم لە هەموو حاڵەتێکدا هەر پارێزراوە.

٣- یەکێکیش لە سوودەکانی ئەوەیە کە بتپەرستان و خراپەکاران و ستەمکاران ئەگەر داوای شتێك بکەن سنوورەکانی خوای گەورەی پێ مەزن بکەنەوە، یارمەتی دەدرێن و بۆیان ئەنجام دەدرێت، لەسەر ئەوە یارمەتی دەدرێن

١ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٤٨٤).
٢ هەمان سەرچاوە (٤٨٤).
٣ بڕوانە: صلح الحديبية، لأبي فارس (٤٣).

نەك لەسەر کوفر و ستەمیان، هەر کەسێك داوای شتێك بکات خوای گەورە پێی خۆش بێت پێویستە یارمەتی و کۆمەکی بکرێت لەسەری.[١]

٤- خوای گەورە بە مەزنی و دانایی خۆی، نەینووسیبوو لەسەر موسڵمانان کە تووشی شەڕ بن لەگەڵ بتپەرستاندا لەم غەزایە، ئەوەش بە بۆنەی هەندێ حیکمەت بوو کە دواتر دەردەکەون:

أ- ئەگەر موسڵمان بەهێز بچوونایەتە مەککەوە کوشتارێکی زۆر دروست دەبوو لە هەردوولا، خوای گەورەیش ئەوەی نەدەویست.

ب- لەوانەیە ببوایەتە هۆی کوشتن و ئاوارەکردنی هەندێ لە ئیماندارە چەوساوەکان لە مەککە، ئەوەیش کارێکی نەگونجاو بوو لەگەڵ ڕەوشتی موسڵماناندا، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿هُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَٱلْهَدْىَ مَعْكُوفًا أَن يَبْلُغَ مَحِلَّهُۥۚ وَلَوْلَا رِجَالٌ مُّؤْمِنُونَ وَنِسَآءٌ مُّؤْمِنَٰتٌ لَّمْ تَعْلَمُوهُمْ أَن تَطَـُٔوهُمْ فَتُصِيبَكُم مِّنْهُم مَّعَرَّةٌۢ بِغَيْرِ عِلْمٍۖ لِّيُدْخِلَ ٱللَّهُ فِى رَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۚ لَوْ تَزَيَّلُواْ لَعَذَّبْنَا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾(الفتح:٢٥).

ج- خوای گەورە دەیزانی، ئەمانەی ئەمڕۆ ڕێگەی موسڵمانان نادەن عومرە بکەن، سبەی دەبنە هەڵگرانی پەیامی خوا بۆ خەڵکی و، ڕێگای تاریك بۆ ڕێبواران ڕووناك دەکەنەوە.[٢]

## پێنجەم: ناوبژیوانیکردن لە نێوان پێغەمبەر(ﷺ) و قورەیشدا.

پێغەمبەر(ﷺ) کۆششی دەکرد قورەیش حاڵی بکات کە ئەو نایەوێت شەڕیان لەگەڵدا بکات، بەڵکو تەنها دەیەوێت سەردانی ماڵی خوا بکات و ئەوەیش مافی موسڵمانانە، وەکو کەسانی تر، کاتێك قورەیش لەوە دڵنیا بوون، کەسێکیان نارد بۆ

---

١ بڕوانە: صلح الحديبية، لأبي فارس (٤٧).
٢ بڕوانە: صلح الحديبية، لأبي فارس (٤٥).

دانوستان و تێگەیشتن لە هێزی موسڵمانان و توانای شەڕکردنیان ئەگەر ناچار کران، هەروەها بۆ گێڕانەوەی موسڵمانان بە شێوازی ئاشتی لە لایەکی ترەوە.[١]

**١- کاروانێك لە خوزاعە بە سەرۆکایەتی بودەیلی کوڕی ومرقا:**

بودەیلی کوڕی وەرقا لەگەڵ هەندێ لە پیاوانی خوزاعە، کە جێگای متمانەی پێغەمبەر(ﷺ) بوون، هاتن و ڕایانگەیاند کە قورەیش ڕێگە نادەن موسڵمانان بچنە مەککەوە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) بۆی ڕوون کردنەوە کە بۆ جەنگ نەهاتوون و داوای کرد بۆ کاتێکی دیاری کراو شەڕ ڕابگیردرێت، ئەگەریش هەر ڕازی نەبن ئەوا موسڵمانان ناچار دەبن شەڕ بکەن، ئەوانیش ئەو قسانەیان گەیاندە قورەیش ئەوانیش بە شێوەیەکی ناشیرین وەڵامیان دانەوە و، وتیان ئەگەر وایش بێت هەر ڕێگە نادەین بێنە مەککەوە، لێهاتوویی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ پێشنیارکردنی ئاگربەست هەندێك سوودی تیادابوو، لەوانە:

أ- ڕاگرتنی شەڕ بێ لایەنی قورەیش دەستەبەر دەکات لە هەر ململانێیەك ڕوویدات لە دوورگەی عەرەب، لەگەڵ هەر لایەنێك لەو لایەنانەی دژایەتی ئیسلام دەکەن.

ب- پەرۆش بوونی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەوەی دەرگای پەیوەندی هەر کراوە بێت لەگەڵ قورەیشدا، ئەوەیش جۆرێك بوو لە نزیك بوونەوە و ساردکردنەوەی بارودۆخی جەنگ.

ج- پێغەمبەر(ﷺ) سوور بوو لەسەر ئەوەی خوزاعە و کاروانی هاوڕێی بزانن کە هاوپەیمانەکەیان بە هێزە و متمانەیان پێی زیاد بکات، چونکە ئەو هاوپەیمانێتییە هەر لە پێش ئیسلامیشەوە لەگەڵ بەنی هاشمدا هەر هەبوو، لەم غەزای حودەیبیەیشدا دووپاتکرایەوە.

د- هۆشمەندانی قورەیش کاتێك بۆیان دەردەکەوێت پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەزن ڕاگرتنی ماڵی خوا هاتووە، دەبنە لایەنگری پێغەمبەر(ﷺ) و هەڵوێستی قورەیش لاواز دەبێت.

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٤٨٥).

هـ- موشریکەکانی قورەیش دڵنیا نەبوون لە قسەکانی بودەیل کە بۆی گواستنەوە، چونکە بە پەیوەندی نێوان ئەوان و موسڵمانانیان دەزانی.[1]

و- لە وەڵامەکەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە وەردەگیردرێت، کە بە نەرم و نیانی پێویستە بگەین بە تاعەتی خوای گەورە، با واجبیش نەبێت، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی بتپەرستان داوایان کرد ئەنجامیدا لە پێناو ئەوەی بگاتە ئەو ئەنجامەی بۆی هاتووە.[2]

**٢- ناردنی عورووەی کوڕی مەسعودی سەقەفی:**

قورەیش بە قسەکانی بودەیلی کوڕی وەرقا ڕازی نەبوون و پێشنیاریان کرد عورووەی کوڕی مەسعود بنێرن بۆ قسەکردن لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) و هێنانەوەی هەواڵی ڕاست لە لایەوە،[3] ئینجا عورووە پاش باسکردنی پلە و پایەی خۆی لە لای قورەیش و بیرخستنەوەی بۆ قورەیش بە ئەو کارانەی کە لە بازاڕی(عکاظ) کردوویەتی لە پێناوی ئەواندا، داوای کرد ڕێگەی بدەن بچێتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و، ئەوانیش ڕازی بوون بینێرن، پێغەمبەر(ﷺ) هەمان ئەو قسانەی دووپات کردەوە کە پێشتر کردبووی بۆ بودەیل، لەو کاتەدا عورووە وتی: ئەی موحەممەد، تۆ هەرگیز بیستوتە کەسێك هێرش بکاتە سەر کەس و کاری خۆی پێش خۆت؟ ئەگەر بەولاکەی تریشدا دەڵێی، من هەندێ ڕووخسار دەبینم لە دەوروبەرت و کەسانێکی جۆراوجۆر دەبینم لەگەڵتدا وادەزانم لە کاتی هەڵگیرسانی شەڕ هەڵدێن و بەجێت دەهێڵن، کە ئەو قسەی کرد ئەبو بەکر قسەی ناخۆش و توندی پێکرد، عورووە وتی: ئەوە کێ بوو؟ وتیان: ئەبو بەکر، وتی: سوێند بە خوا ئەگەر لەبەر چاکەیەك نەبێت کە بۆت ئەنجام داوم و پاداشتم نەداوەتەوە، وەڵامتم دەدایەوە.

لە ڕاستیدا عورووە هەوڵی دەدا جەنگێکی دەروونی بەرپا بکات لە دژی موسڵمانان بۆیە پڕوپاگەندەی بەکارهێناو باسی هێزی قورەیشی دەکردو زلی

---

١ بروانە: صلح الحديبية، لأبي فارس (٦٧).

٢ هەمان سەرچاوە (٦٧).

٣ هەمان سەرچاوە (٦٨).

دەکردەوە، هەروەها هەوڵی دەدا بشێوی و کەم متمانەیی دروست بکات لە نێوان سەرکردە و سەربازەکانیداو هەوڵیشی دەدا قەیرانێك دروست بکات لە ڕووی سەربازییەوە بۆ کارتێکردنە سەر وورەیان و ترساندنیان بە هێزی قورەیش،[١] بەڵام هەموو ئەو هەوڵانەی بێ سوود بوون بەرامبەر ئیمانی پتەو و ڕیزی بەهێزی موسڵمانان، یەکێك لە شتە سەیر و سەرنج ڕاکێشەکان لە کاتی دانوستانەکە کە بەڵگە بوو لەسەر کارتێکردنی گەورەی ئیسلام لە هاوەڵاندا، ئەوە بوو یەکێك لەوانەی پاسەوانێتی پێغەمبەر(ﷺ)ی دەکرد لەو کاتە موغیرەی کوڕی شوعبە بوو،[٢] کە برازای عوروەی کوڕی مەسعود بوو، موغیرە پێش ئەوەی خوا ڕێنموونی بکات بۆ ئیسلام لاوێکی سەرخۆشی ڕێگر بوو، بەڵام دوای موسڵمان بوونی بوو بە یەکێك لە پاڵاوتەی ئیمانداران، لە سەردەمی جاهیلیدا و لە کاتی دانوستاندا ئەوە باو بوو کە ئەو کەسەی دانوستان دەکات ڕیشی بەرامبەرەکەی بگرێت، جا بە پێی ئەم بنەمایە عوروەی کوڕی مەسعود ڕیشی پێغەمبەر(ﷺ)ی دەگرت لە کاتی قسەکردندا، بەڵام موغیرە کە بە قەڵغان داپۆشرابوو، دەستی دایە مشتی شمشێرەکەی بە توندی و وتی: دەستت لادە لەسەر ڕیشی پێغەمبەر(ﷺ) تاکو نەبڕیوە بۆت، لەم کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) زەردەخەنەی دەکرد لەوەی کە ڕوویدا لە نێوان ئەم بتپەرستەو برازا ئیماندارەکەی، ئینجا عوروە بە توورەییەوە وتی خۆزگە دەمزانی موحەممەد ئەوە کێیە – چونکە موغیرە ڕوخساری داپۆشرابوو – پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوە موغیرەی کوڕی شوعبەی برازاتە، ئەویش وتی: ئەوە تۆی ئەی ناپاك؟ دوژمنایەتیەکت بە هەتاهەتایی بۆ بەجێ هێشتووین، سوێند بە خوا دوێنێ ناپاکییەکەتم شۆرد، مەبەستی ئەوە بوو موغیرە لەگەڵ کەسانێك بوو لە سەردەمی جاهیلی هەڵسا بە کوشتنیان و ماڵەکانیانی هێنا بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش پێی فەرموو: موسڵمانێتیت قەبووڵ دەکەم، بەڵام مافم نییە بەسەر ماڵەکەوە.

---

١ بڕوانە: منهج الاعلام الاسلامي في صلح الحديبية، سليم حجازي (١٣١-١٣٢).

٢ پێش عومرەی حودەیبیە موسڵمان بوو، ئامادەی بەیعەتی (رضوان)یش بوو، لە شەڕی یەرموك چاوی بریندار بوو، نێردەی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص بوو بۆ لای ڕۆستەم، الاصابە في تمييز الصحابە (٣/٤٥٢).

عوروە سەرکەوتوو نەبوو لە دانوستانەکەیدا و گەڕایەوە و قوڕەیشی وریاکردەوە لەوەی بچێتە شەڕەوە لەگەڵ موسڵماناندا، پێی وتن:من زۆر پاشا و سەرۆکم بینیووە، بەڵام هەرگیز کەسانێکم نەبینی بۆ سەرۆکەکەیان دڵسۆز ئەوەندەی هاوەڵانی موحەممەد بۆ موحەممەد، سوێند بە خوا بە درێژی تەماشای ناکەن و دەنگی لە لا بەرزناکەنەوە، تەنها ئەوەندە بەسەر ئاماژە بۆ کارێك بکات یەکسەر ئەنجام دەدرێت، ئاوی دەم و لووتی ناکەوێتە زەوی بەر لەوەی کەسێکیان دەستی بۆ نەبات و گیانی خۆی پێ نەسڕێت، کە دەست نوێژیش دەگرێت کۆدەبنەوە لەسەر پاشماوەی دەستنوێژەکەی بزانە کامیان دەستی دەکەوێت، پێم باشە ئەوەی پێشنیاری کردووە وەری بگرن و ڕێگەی بدەن سەردانی ماڵی خوا بکات، وتیان: قسەی لەو جۆرە مەکە ئەی باوکی یەعفور، ئەگەر کەسێکی تر ئەم قسانەی بکردایە سەرزەنشتمان دەکرد، بەڵام ئەمساڵ دەیگێڕینەوە و، ساڵی داهاتوو بێن بۆ سەردانی کەعبە.[١]

جەنگی دەروونی ئەمجارە گوێزراوە بۆ ڕیزەکانی قوڕەیش و نێو دەروونیان، دوای ئەو قسانەی کە عوروە پێی گەیاندن، دەربارەی ئامادەیی ئەوان بۆ جەنگ و گوێڕایەڵی هاوەڵان بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، وشەکانی عوروە زۆر کاریگەر بوون لەسەر سەرانی قوڕیش، بۆیە ناکۆکی دروست بوو لە نێو بەرەکەیاندا و بەڵگەکانیان لاواز بوو لە دژایەتی پێغەمبەر(ﷺ).

بەم شێوەیش پێغەمبەر(ﷺ) توانی بەرەی قوڕەیش پەرتەوازە بکات و، شێوازی ڕاگەیاندن و دیبلۆماسی بەکاربهێنێت و سەرکەوتن لەو بوارانەدا بە دەستبهێنێت.[٢]

**٣- ناردنی حیلسی کوڕی عەلقەمە:**

ئینجا هەڵسان بە ناردنی حیلسی کوڕی عەلقەمە کە سەرگەورەی ئەحباشەکان بوو، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بینی فەرمووی: ئەمە لە کەسانێکە کە خواپەرستی دەکەن،قوربانێکان بەرەو ڕووی بکەنەوەو فەرمانی کرد دەنگ بەرز بکرێتەوە

---

١ بڕوانە: المغازي للواقدي (٢/٥٩٨).

٢ بڕوانە: منهج الاعلام الاسلامي في صلح الحديبية، سليم حجازي (١٤٥).

بە((لبيك اللهم لبيك))، کاتێك حیلس ئەوەی بینی گەڕایەوە لای قورەیش پێش ئەوەی بگاتە پێغەمبەر(ﷺ)، لەبەر ئەو دیمەنانەی کە بینی،[1] نکۆڵیشی کرد لەو کردەوەیەی قورەیش کە ڕێ دەگرن لەو کەسانە سەردانیماڵی خوا دەکەن و، بە ڕەوای نەزانی یارمەتی کەسانێك بدرێت ئەمە ئاکاریانە،[2] ئینجا لەبەر ئەوەی هاوپەیمانێتی ئەحباشەکان و قورەیش کەوتە مەترسیەوە، قورەیش بە سەرگەورەی ئەوانیان وت: ئەوانەی کە بینیت فێڵ و تەڵەکەیە لە موحەممەد و هاوەڵانی، بۆیە وازمان لێ بهێنە تاکو کارێك ئەنجام دەدەین.

لە ڕاستیدا پێغەمبەر(ﷺ) حیلسی چاك دەناسی، بۆیە ڕاستیەکانی خستە بەر چاوی و کارێکی وای کرد کە هیچ نەبێت بێ لایەن بێت لەم ململانێیەدا، شایانی باسە کە حیلس ناوبانگێکی چاکی بوو لە نێو هەموو عەرەبدا، چونکە پیاوێکی هۆشمەند و سەرگەورەی قەومەکەی خۆی بوو، ڕێزیشی لە لای پێغەمبەر(ﷺ) و قورەیش وەکو یەك بوو، بۆیە ئەو شیکردنەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ کەسایەتی ئەو کردی، گونجاو بوو بە تەواوی لەگەڵ ئەو بنەمایانەی باوەڕی پێی بوو، بەم شێوەیش پێغەمبەر(ﷺ) توانی کاریگەری دروست بکات لەسەر عوروە و حیلس و قلیشان دروست بکات لە نێو قورەیشدا.

لەم بارەشەوە(عباس محمود العقاد) دەڵێت:

بانگەواز لە کاتی جەنگدا – وەکو دەردەکەوێت – دوو مەبەستی سەرەکی هەیە لە نێو مەبەستەکانیدا: یەکەمیان: قایلکردنی دوژمنەکەت و خەڵکی بەو مافانەی کە هەتە، دووەمیشیان: لاوازکردنی دوژمنت بە داگرتنی ورەی و پەرتەوازەکردنی، لەوانەشە پێغەمبەر(ﷺ) بە یەك پیاو کاری ئەوتۆی ئەنجام بدایە کە دەوڵەتان بە چەندین تیمی ڕێکخراو ناتوانن ئەنجامی بدەن.[3]

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٤٨٨).
٢ بڕوانە: منهج الاعلام الاسلامي في صلح الحديبية، سليم حجازي (١٠٨).
٣ عبقرية محمد (ﷺ) (٤٩).

٤- ناردنی(مکرزة بن حفص):

یەکێك لە نێردەکانی قوڕەیش لە ڕۆژی حودەیبیە ئەم پیاوە بوو، کاتێك هات، پێغەمبەر(ﷺ) – وەکو لە بوخاریدا هاتووە – فەرمووی:((هذا مکرز وهو رجل فاجر)) واتە: ئەوە میکرەزە و پیاوێکی خراپەکار، لەو کاتەی قسەی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد، سوهەیلی کوڕی عەمر هات، مەعمەر دەڵێت: ئەییوب لە عیکریمەوە بۆی گێڕامەوە، کاتێك سوهەیل هات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((لقد سهل لکم من امرکم))، واتە: کارتان ئاسان بوو.

## شەشەم: نێردەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ لای قوڕەیش.

پێغەمبەر(ﷺ) بە پێویستی زانی نێردراوێك لە لای خۆیەوە ڕەوانە بکات بۆ لای قوڕەیش، بۆ ئاگەدارکردنەوەیان کە موسڵمانان بۆ شەڕ نەهاتوون و بۆ بەجێهێنانی عومرە هاتوون، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ)(خراش بن امیة الخزاعي) ناردە لای قوڕەیش، بەڵام پێشوازی خراپیان لێکرد و ویستیان بیکوژن، بەڵام ئەحباشەکان نەیانهێشت بکوژرێت، پاش گەڕانەوەی(خراش) پێغەمبەر(ﷺ) ویستی عومەری کوڕی خەتتاب بنێرێت ئەمجارە، بەڵام عومەر(ﷺ) داوای لێبوردنی کرد لە ڕۆیشتن و، پێشنیاری کرد عوسمان بنێرێت، چونکە کەس و کاری هەیە لەوێ بەرگری لێ بکەن، سەبارەت بە خۆیشی وتی: دەترسم قوڕەیش بمکوژن و، خۆت دوژمنایەتی من دەزانی بۆ ئەوان و، کەسێکم نییە لەوێ بەرگریم لێ بکات، ئەگەریش حەز دەکەیت دەڕۆم،[1] ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) هیچی نەوت، عومەر وتی: بەڵام ئەی پێغەمبەری خوا کەسێکت پێ نیشان دەدەم لە من چاکتر بچێت بۆ مەککە عەشیرەتی لە من زۆرترە و، بەرگریشی لێ دەکەن،عوسمانی کوڕی عەففان، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) عوسمانی بانگ کرد و پێی فەرموو:((اذهب الی قریش فخبرهم انا لم نأت لقتال احد, وانما جئنا زوّارا لهذا البیت ,معظّمین لحرمته,معنا الهدي,ننحره,وننصرف.....))، واتە: برۆ لای قوڕەیش و پێیان بڵێ ئێمە بۆ شەڕ نەهاتووین، بەڵکو بۆ سەردانی ماڵی خوا هاتووین، ڕێزی لێ دەگرین و مەزن ڕای دەگرین، قوربانیمان لەگەڵ خۆمان هێناوە،

---

[1] المغازي للواقدي (٢/٦٠٠).

سەری دەبڕین و دەگەڕێینەوە. ئینجا عوسمان دەرچوو تاکو گەیشتە بەلدەح،[١] بینی قوڕەیش لەوێن، وتیان: بۆ کوێ دەچیت؟ فەرمووی: پێغەمبەر(ﷺ) ناردوومی بۆ لاتان،هەموتان وەرنە ئایینی خوای گەورەوە،خوایش ئایینی خۆی سەردەخات و پێغەمبەرەکەی سەربەرز دەکات، یان لێمانگەڕێن بچینە مەککەوە، ئەگەر سەرکەوتنە سەر موحەممەددا، ئەوە ئاواتی ئێوەیە و بەدی دێت، ئەگەریش موحەممەد سەرکەوت ئێوە ئازاد دەبن لەوەی موسڵمان بن، یان شەڕ بکەن، لە ڕاستیدا جەنگ ئێوەی ماندوو کرد و، پیاوە ناودارەکانتانی لەناوبرد... ئیتر عوسمان هەر قسەی لەگەڵ دەکردن و ئەوانیش دەیانوت: ئەم قسانەمان بیستووە، هەرگیز ئەوەش ڕوونادات، بە زۆریش هەرگیز ڕێگە نادەین بێنە مەککەوە، بۆیە بگەڕێرەوە لای هاوڕێکەت و پێی بڵێ نایەڵین بگاتە لامان.

ئینجا ئەبانی کوڕی سەعدی کوڕی عاص هەڵسا و ڕێزی لە عوسمان گرت و خستیە پەناهەندەیی خۆیەوە. وتیشی: درێغی مەکە لە هەر قسەیە دەتەوێت بیکەیت، ئینجا لە ئەسپەکەی دابەزی و عوسمانی لەسەر سوار کرد و خۆیشی سوار بوو، عوسمان چووە نێو مەککەوە و، چووە لای سەرانیان یەك لە دوای یەك، چووە لای ئەبو سوفیان و صەفوانی کوڕی ئومەییە و، کەسانی تر، هەمووشیان دەیانوت: نابێت موحەممەد بێتە مەککەوە هەتاهەتایە.[٢]

بتپەرستان پێشنیاریان کردە سەر عوسمان کە بە دەور کەعبەدا بسوڕێتەوە،[٣] بەڵام عوسمان ڕازی نەبوو، ئینجا هەڵسا بە گەیاندنی پەیامی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ موسڵمانە چەوساوەکانی مەککە و مژدەی ڕزگاربوونی نزیکی پێدان،[٤] نامەیەکی دەمی لە ئەوانەوە گواستەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کە تیایدا هاتبوو: سڵاومان بگەیەنە پێغەمبەر(ﷺ)، ئەو کەسەی ئەوی گەیاندە حودەیبیە، بە توانایە بیگەیەنێتە نێو مەککە.[٥]

---

١ جێگایەکە نزیك مەککە.

٢ زاد المعاد (٣/٢٩٠)، بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٣٤٤).

٣ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٣٤٤).

٤ بڕوانە: زاد المعاد (٣/٢٩٠).

٥ بڕوانە: صلح الحديبية، لأبي فارس (٨٥).

ئینجا موسڵمانان و بتپەرستان تێکەڵ بوون لە مەسەلەی صوڵحدا و، یەکێك تیرێکی هاویشتە یەکێك لەو کۆمەڵەکەی تر، بوو بە شەڕە تیر و بەرد و، هەردوو لا هەندێ بارمتەیان گلدایەوە لە لای خۆیان،[١] قورئانی پیرۆزیش باسی ئەمەی کردووە:

﴿وَهُوَ ٱلَّذِى كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا﴾(الفتح: ٢٤).

هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتەیش موسلیم دەیگێڕێتەوە و دەڵێت:

هەشتا کەس لە خەڵکی مەککە لە شاخی تەنعیمەوە هاتنە خوارەوە گوایە لە پڕێکدا بێنە سەر پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) گرتنی و لە لای خۆی گلیدانەوە، ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند.[٢]

سەلەمەی کوڕی ئەکوەعیش(ﷺ) ئەم ڕووداوەی بە درێژی گێڕاوەتەوە وەکو لە صەحیحی موسلیم دا هاتووە.[٣]

(ابن کثیر)یش دەربارەی ئەم ئایەتە فەرموویەتی: ئەمە منەتە خوای گەورە دەیکاتە سەر بەندە ئیماندارەکانیدا کە دەستی بتپەرستانی دوورخستەوە لێیان و دەستی ئەمانیشی لە ئەوان دوورخستەوە کە تووشی شەڕ بن لە مزگەوتی حەرامدا، بەڵکو هەردوو لایانی پاراست و ئاشتەوایییەکی دروست کرد کە چاکەی ئیماندارانی تیادا بوو لە دونیا و لە قیامەتدا.[٤]

## حەوتەم: بەیعەتی (الرضوان).

هەواڵ گەیشتە پێغەمبەر(ﷺ) کە عوسمان کوژراوە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) هاوەڵانی کۆکردەوە و داوای کرد بەیعەتی بدەنێ لەسەر شەڕی بتپەرستان، لە ڕیوایەتی تردا هاتووە، کە بەیعەتەکە لەسەر ئارام گرتن بووە، یان هەڵنەهاتن، ئیتر

---

١ بڕوانە: زاد المعاد (٣/٢٩١).
٢ مسلم كتاب الجهاد والسير (٣/١٤٤٢).
٣ هەمان سەرچاوە.
٤ تفسير ابن كثير (٤/١٩٢).

هاوەڵان هەموویان بەیعەتیان دا تەنها(الجد بن قيس) نەبێت چونکە موونافیق بوو.[١]

یەکەمین کەسیش بەیعەتی دا(ابو سنان عبدالله بن وهب الاسدی)[٢] بوو، ئینجا بە دوای ئەودا خەڵکی بەیعەتیاندا، سەلەمەی کوڕی ئەکوەع سێ جار بەیعەتی پێدا،[٣] ئینجا پێغەمبەر(ﷺ): بە دەستی ڕاستی وتی:((هذه يد عثمان))، واتە ئەمەیش دەستی عوسمانە، دای بە دەستی خۆیدا،[٤] ژمارەی ئەو هاوەڵانەیش پێغەمبەر(ﷺ) لە ژێر دارەکە بەیعەتی لێ وەرگرتن هەزار و چوارسەد کەس بوون،[٥] قورئانی پیرۆزیش باسی ئەو بەیعەتەی کردووە و، فەزڵ و چاکەیان لە زۆر جێگەی تردا باسکراوە، لەوانە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ۚ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَٰهَدَ عَلَيْهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا﴾(الفتح: ١٠).

ئەم ئایەتەیش ستایشی گەورەی ئەنجامدەرانی بەیعەتی(رضوان)ی تیایە و، خوای گەورە ئەوپەڕی ڕێزی لێ گرتوون.[٦]

لە سوننەتی پیرۆزیشدا، ستایش کراون لە چەندین فەرموودەدا، وەکو:

أ- جابیری کوڕی عەبدوڵا(ﷺ) دەفەرموێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی حودەیبیە دەیفەرموو:((انتم اليوم خير اهل الارض))، واتە: ئێوە ئەمڕۆ چاکترین خەڵکی سەر زەوین، دەفەرموێت، لەو ڕۆژەدا هەزار و چوار سەد کەس بووین، ئەگەر نابینا نەبوایەم جێگای دارەکەم پیشان دەدان.[٧]

---

١ بڕوانە: البخاري (٤١٦٩)، السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٤٨٦)، مسلم (١٨٥٦).
٢ السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٤٨٦).
٣ زاد المعاد (٣/٢٩١).
٤ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٤٠٤).
٥ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٤٨٢).
٦ بڕوانە: عقيدة اهل السنة والجماعة، د. ناصر الشيخ (١/٢٠٥).
٧ مسلم (٣/١٤٨٥).

ب- جابیری کوڕی عەبدوڵا دەڵێت: دایکی موبەشیر پێی وتم: گوێی لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو، لە لای حەفصەدا فەرموویەتی:((لایدخل النار، ان شاء الله من شهد الشجرة احد من الذین بایعوا تحتها))، واتە: ئەوانەی لە ژێر دارەکە بەیعەتیاندا کەسیان ناچنە ئاگرەوە، حەفصە وتی: بەڵێ دەچن ئەی پێغەمبەری خوا،((وان منکم الا واردها))، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا﴾(مریم: ٧١-٧٢).

پێشەوا نەوەوی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەربارەی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ):((لایدخل النار، ان شاء الله من شهد الشجرة احد من الذین بایعوا تحتها))، زانایان فەرموویانە: واتە: بە هیچ شێوەیەك ناچنە دۆزەخەوە، وشەی(ان شاء الله)یش بۆ پیرۆزی فەرموویەتی نەوەك گومانی بووبێت، قسەکەی حەفصەیش بەڵگەیە لەسەر ڕەوا بوونی مشت و مڕ، وەڵامەکەشی بۆ فێربوون بوو، نەوەك بەرپەرچدانەوەی پێغەمبەر(ﷺ)، وشەی(واردها)یش لە ئایەتەکەدا مەبەست لە تێپەڕبوونە بەسەر پردی(صراط) کە لەسەر دۆزەخە.[1]

بە تێڕامان دەردەکەوێت کە موهاجیرەکان لە کاتی جەنگی بەدردا ژمارەیان هەشتا و سێ کەس بووە لە کاتێکدا لە حودەیبیە هەشت سەد کەس دەبوون، کە زۆربەیان لە هۆزەکانی دەوروبەرەوە کۆچیان دەکرد و، دەهاتنە ژێر ئاڵای پێغەمبەر(ﷺ) و پەروەردە دەبوون لە مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ)، لە جەنگ و غەزاکاندا فێری سەربازی و گوێڕایەڵی دەبوون و ڕاستەوخۆ ئایینیان لە خوای گەورەوە فێردەبوون و کێبڕکێیان دەکرد بۆ گوێڕایەڵی قسەی خوا و پێغەمبەر(ﷺ)، هۆزە بچووکەکانی ئەم کۆچبەرانەش بە ناوبانگ بوون و پلە و پایەیان بەرز دەبوویەوە زیاتر لە هۆزە گەورەکان کە پشتگیری ئیسلامیان نەدەکرد، فەزڵ و چاکەش لەمەدا دەگەڕێتەوە بۆ کەڵەپیاوانی سەرەتای ئیسلام،

---

١ شرح النووي على صحيح المسلم (١٦/٨٥).

وەکو(ابو ذر الغفاري) کە پاش موسڵمان بوون گەڕایەوە لای قەومەکەی و هەموویان موسڵمان بوون لەسەر دەستی، یان بۆ(بريدة بن الحصيب الاسلمي) کە پێغەمبەر(ﷺ)ی بینی پێش ئەوەی بگاتە مەدینە و موسڵمان بوو لەگەڵ حەفتا لە هۆزەکەی.[1]

سەبارەت بە هۆزەکانی(مزينة) و(جهينة) و(أشجع) و(خزاعة)یش، گەنجەکانیان دەهاتن بۆ مەدینە بەڵام بە کەمی، قەوارەی هۆزەکانیش هەر لەسەر بتپەرستی بوون و دوور بوون لە پەروەردەی پێغەمبەر(ﷺ) و بێ بەش بوون لەم فەزڵ و چاکە، بۆیە ئەو ئایەتانەی لەسەر ئەحزابەکان دادەبەزی وەکو تریشقە بوو لەسەریان، چونکە دواکەوتن لەوەی ببنە سەرباز لە سوپای ئیسلامدا.[2]

---

١ بڕوانە: التربية القيادية (٢١٤/٤).

٢ بڕوانە: التربية القيادية (٢١٦/٤).

## باسی دووەم: ئاشتی حودەیبیە و ئەو ڕووداوانەی لەسەر بنەمای دروست بوون

### یەکەم: دانوستانی سوهەیلی کوڕی عەمر لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ).

کاتێك قوڕەیش بە بەیعەتی(رضوان)یان زانی، سەرانیشیان بۆیان دەرکەوت کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەمجارە سوورە لەسەر شەڕکردن، هەڵسان بە ناردنی سوهەیلی کوڕی عەمر و چەند کەسێك بۆ دانوستان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) جا کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) سوهەیلی بینی فەرمووی: ئەوان ئاشتیان دەوێت، کە ئەم پیاوەیان ناردووە.[1]

سوهەیلی کوڕی عەمر یەکێك بوو لە سەرکردە دیارەکانی قوڕەیش کە بە لێهاتوویی سیاسی و زیرەکی دەناسران و وتاربێژ و هۆشمەند و سەنگین بوو.
پاش گەڕانەوەی عوسمان، هەردوولا پێکەوە دەستیان کردە داڕشتنی خاڵەکانی ئاشتیەکە و تاوتوێ کردنی هەموو مەسەلە پەیوەندی دارەکانیان کرد، لە ئەنجامدا دیدی هەردوولا نزیك بوویەوە، بەڵام لە کاتی نووسینەوەی ئەو خاڵانەی پێکهاتن لەسەری ناکۆکییەك دروست بوو، خەریك بوو ڕێککەوتن نامەکە هەڵوەشێنێتەوە، ئەو بوو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی بە نووسەرەکەی کرد – کە عەلی کوڕی ئەبو تالیب بوو – لە سەرەتای ڕێککەوتننامەکە بنووسێت(بسم الله الرحمن الرحيم)، لێرەدا سەرۆکی نێردەی قوڕەیشی سوهەیلی کوڕی عەمر ناڕەزایی دەربڕی و وتی: نازانم ڕەحمان کێیە، بەڵکو بنووسە(باسمك الله)، لەم کاتەدا هاوەڵان دەنگیان بەرز بوویەوە و، وتیان: پێویستە جگە لە ڕەحمان هیچی تر نەنووسرێت، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) وەکو دانایی و نەرم و نیانی دەربڕین، بە نووسەرەکەی وت: بنووسە(باسمك اللهم)[2] تاکو گەیشتنە ئەوەی نووسرا: ئەمە بوو کە پێغەمبەری خوا لەسەری ڕێککەوت، بەڵام پێش ئەوەی ڕستەکە تەواو بکات، سوهەیل وتی: گەر

---

١ بڕوانە: المغازي للواقدي (٢/٦٠٢، ٦٠٤، ٦٠٥).
٢ بڕوانە: المغازي للواقدي (٢/٦١٠).

بمزانیبا پێغەمبەریت جیاوازیم نەدەکرد لەگەڵت و شوێنت دەکەوتم، ئایا پێت ناخۆشە ناوی خۆت و باوکت بنووسیت؟ ئینجا دیسان موسڵمانان ناڕەزاییان دەربڕی، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) بە لێبووردەیی و دووربینی خۆی ڕازی بوو وشەی(رسول الله) لە نووسراوە لابرێت و هاوەڵانیش پەنایان بردە بەر بێدەنگی.

پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر هەموو ئەو شتانە ڕازی بوو، هەروەها ڕازی بوو لەسەر گێڕانەوەی ئەو کەسەی لە لای ئەوانەوە دێت بۆ لای موسڵمانان و بێ ئەوەی ئەوان پەیوەست بن بەو مەرجەوە، ئینجا ئەو گۆڕانکارییەی کە لە(باسمك اللهم) و(محمد بن عبدالله) ڕووی دا هیچ کاریگەرییەکی نەبوو لە ڕووی شەرعییەوە شتی ناشەرعی ئەوە بوو باسی بتەکانی ئەوان بکرایە لە ڕێککەوتننامەکە و، هیچ شتێکیش لەو جۆرە ڕووی نەدا، بۆ مەسەلەی گێڕانەوەی ئەو کەسەیش لە لای ئەوانەوە دێت بۆ لای موسڵمانان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((من ذهب منا اليهم فأبعده الله! ومن جاءنا منهم سيجعل الله له فرجا ومخرجا))،[1] واتە: ئەو کەسەی لە لای ئێمەوە دەچێت بۆ لای ئەوان، ئەوە خوای گەورە لە میهرەبانی خۆی دووری خستۆتەوە، ئەو کەسەیش لە لای ئەوانەوە دێت بۆ لای ئێمە خوای گەورە گوشادی بۆ دەکاتەوە هەر وایش بوو وەکو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی.

ڕێککەوتننامەکە پێکهاتبوو لە دە برگە و بەم شێوەی خوارەوە:

١- (باسمك اللهم) واتە: بە ناوی تۆ خوایە.

٢- ئەمە بوو کە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵا لەسەری پێکهات لەگەڵ سوهەیلی کوڕی عەمر.

٣- ڕێککەوتن لەسەر کۆتایی پێهێنانی جەنگ بۆ ماوەی دە ساڵ، لەو ماوە خەڵکی دڵنیا دەبن و دەست درێژی ناکەنە سەر یەکتر.

٤- هەر کەسێ لە هاوەڵانی موحەممەد بۆ حەج و عومرە بێت یان بۆ هەر کارێکی چاکە بێ ترس دەبێت لەسەر خوێن و ماڵی، هەر کەسیش بێتە مەدینە و

١ بڕوانە: المستفاد من قصص القران للدعوة والدعاة (٢/٣٤٢).

تێپەڕبێت بەرەو میسر و شام، بۆ کاروباری چاکە، بێ ترس دەبێت لەسەر ماڵ و گیانی.

٥- هەر کەسێك لە قورەیش بەبێ ڕێگەپێدانی خاوەنی بێتە لای موحەممەد پێویستە بگێڕرێتەوە، بەڵام ئەو کەسەی لەگەڵ موحەممەددایە و بێتە لای قورەیش ناگێڕرێتەوە.

٦- پێویستە دڵنیا بین لە یەکتر و بێ ترس بین لەسەر خوێن و ماڵمان و کەس دەست درێژی نەکاتە سەر ماڵ و ژیانی ئەوی تر.

٧- هەر کەسێ حەز بکات بچێتە هاوپەیمانی موحەممەدەوە مافی خۆیەتی، هەرکەسێکیش حەز بکات بچێتە هاوپەیمانێتی قورەیشەوە مافی خۆیەتی(خوزاعە لەو کاتە وتیان: ئێمە دەچینە گرێبەست و هاوپەیمانی قورەیشەوە.

٨- ئەمساڵ پێویستە بگەڕێیتەوە و، نەیەیتە نێو مەککەوە، بەڵام لە ساڵی داهاتوو ئێمە بەجێی دەهێڵین و خۆت و هاوەڵانت دەچنە ناوەوە و، سێ ڕۆژ تیایدا دەمێننەوە بە چەکی ڕێبوارەوە، شمشێرەکان لە کاڵانەکانیان دەبن و جگە لەوەش هیچی تر نابەیتە ژوورەوە.

٩- قوربانیش لەگەڵ خۆت نەهێنی.

١٠- پیاوانێك لە موسڵمانان و بتپەرستان، ئامادەی ئاشتییەکە بوون لە موسڵمانان: ئەبو بەکری صدیق، عومەری کوڕی خەتتاب، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف، عەبدوڵای کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمر، سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص، عەلی کوڕی ئەبو تالیب وەکو نووسەری بەڵێننامەکە هەمووی. لە بتپەرستانیش: میکرەزی کوڕی حەفص و سوهەیلی کوڕی عەمر.[1]

ئەم ڕێککەوتننامەیە بە بنەمای ڕێککەوتننامە ئیسلامییەکان دادەنرێت، نموونەیەکی تەنیایشە بۆ ڕێککەوتن نامە نێودەوڵەتییەکان، بەو دانوستانەش کە لە

١ المعاهدات في الشريعة الاسلامية والقانون الدولي، د. محمد الديك (٢٧٠، ٢٧١).

پێشی ڕوویدا و، ئەو ڕەوشتەی پێغەمبەر(ﷺ) پیشانی دا لە دابەزین لەسەر بۆچوونی بەرامبەر و، شێوازی داڕشتنی و وابەستەبوون.

ئەم ڕێککەوتننامەیە لە کاتێکدا مۆرکرا موسڵمانان لە لاوازیدا نەبوون بەڵکو بەهێزبوون و دەشیانتوانی ئەو مەرجانە ڕەتکەنەوە کە هاوەڵان پێیان ناخۆش بوو، بەڵام ئەوان بە هیچ شێوەیەك لە قسەی پێغەمبەر(ﷺ) دەرنەدەچوون، ئینجا نێردەی قورەیش سەرەڕای سنوور بەزاندنی بە هیچ شێوەیەك ئازار نەدرا، چونکە نێردە لە ئیسلامدا نابێت بکوژرێت،[1] ئینجا بۆ ئەوەش بانگەوازی ئیسلامی بچێتە قۆناغێکی نوێوە لە بڵاوبوونەوە و پەیوەندی کردن بە خەڵکییەوە.بە تێڕوانین لە بەندەکانی ئەو ڕێککەوتننامەیە، هەندێك مەسەلەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە:

١- شێوازی ڕێککەوتن نامە ئیسلامییەکان بە(بسم الله) یان(باسمك اللهم) دەستی پێ دەکرد، یاسای نێودەوڵەتیش لە داڕشتنی ڕێککەوتن نامەکان دەڵێت: ڕێککەوتن نامە بە شێوازێك دەست پێدەکات کە هەردوولا لەسەری پێکدێن.

ئەوەشی پێویستە تێبینی بکەین، ئەوەیە کە ڕێککەوتن نامە لە ئیسلامدا پشت دەبەستێت بە خوای گەورە، کە بە ناویەوە دەست پێدەکات، چونکە هەر ئەو چاودێر و لێپرسەرەوەیە لەسەر نیازی دڵەکان ، ئینجا ناوی خوا پیرۆزە، لە هەموو دڵێکدا باوەڕی پێی هەبێت، تەنانەت ئەوانەش کە بیروباوەڕیان تێکچووە، هەر نکوڵی ناکەن لە خوای گەورە، بەڵام تێگەیشتنیان تێکچووە بۆ زاتی خوای گەورە، هەندێ لەوانەیش خەڵکی فریو دەدەن بە دروشمی بێ ناوەڕۆك لە جیاتی ناوی خوا، دەڵێن: بە ناوی گەل، یان نەتەوە، بەڵام ئەو کەسەی باوەڕی بە خوا بێت هیچ شتێك ناکاتە هاوتای خوای گەورە، هەر بۆیەیش سەرەتا بریتی بوو لە(باسمك اللهم).

٢- لە پاش پێشەکی ناوی هەردوو لایەنەکان براوە، یاسای نێودەوڵەتی گشتی بە هەمان شێوە ئەو کارە ئەنجام دەدات.

---

[1] هەمان سەرچاوە (٢٦٨، ٢٦٩).

٣- هۆکاری ڕێککەوتننامەکە، لە سەرەتاکەیەوە باسی ئاشتی کراوە، بە مەبەستی ڕاگرتنی جەنگ بۆ ماوەی دە ساڵ، تیایدا خەڵکی بە سەلامەتی دەژین و دەست درێژی ناکەنە سەر یەکتر، یاسای گشتی نێو دەوڵەتیش بە هەمان شێوەیە.

٤- چوونە نێو نێوەڕۆکی ڕێککەوتن نامەکەو مەرجەکانی، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) باسی ئەو مەرجانەی کردووە کە هەردوولا لەسەری قایل بوون، یاسای نێودەوڵەتیش بە هەمان شێوەیە.

٥- ڕێدراوە کە سەرۆکی دەوڵەتی ئیسلامی خۆی داوای ئاشتی بکات، ئەگەر بەرژەوەندی موسڵمانان وا بخوازێت، مەرجیش نییە دەستپێکردنی داواکردنی ئاشتی لە لای ئەوانەوە بێت.[١]

٦- ئاشتی کردن لەگەڵ بتپەرستان لەسەر هەندێ بڕگە کە جۆرێك لە ستەمی تیایە لەسەر موسڵمانان ڕەوایە بۆ بەرژەوەندییەکی پەسەندو خۆپزگارکردن لە زیانێکی لەو گەورەتر، بەپێی یاسای پاڵنانی گەورەترین زیان و هەڵگرتنی بچووکترینیان.[٢]

٧- خوای گەورە ئاشتی حودەیبیەی بە فەتح ناوبردووە، چونکە ئەو وشە لە زماندا بریتییە لە کردنەوەی شتی داخراو، ئەو ئاشتیەیش لەگەڵ بتپەرستاندا ئەنجام درا کارێکی داخراو بوو خوای گەورە کردییەوە، هەروەها ئاشتی دڵەکان دەکاتەوە بەرامبەر لایەنەکەی تر.

لە ڕاستیدا ڕواڵەتی ئاشتی لە حودەیبیە ستەمی تیادا بوو لەسەر موسڵمانان، بەڵام ناوەڕۆکەکەی سەربەرزی و سەرکەوتن بوو بۆ موسڵمانان، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) تەماشای فەتحی مەزنی دەکرد لە پشت پەردەیەکی تەنکەوە، ئینجا قایل دەبوو لەسەر هەموو ئەو مەرجانەی سەرانی هاوەڵان پێی قایل نەدەبوون، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) چاك دەیزانی چ بەرژەوەندییەکی گەورەی تیایە بۆ موسڵمانان.[٣]

---

١ بڕوانە: زاد المعاد (٣/٣٠٦).

٢ هەمان سەرچاوە و لاپەرە.

٣ بڕوانە: المعاهدات في الشريعة الاسلامية (٢٧٢).

٨- ڕێککەوتننامە پێدەچێت بە شێوازێك بێت لایەنەکانی تر بتوانن بەشداری بکەن، یاسای نێودەوڵەتیش بە هەمان شێوە ڕێگە دەدات ڕێککەوتن نامە کراوە بێت بۆ هەموو لایەنەکان بەشداری تیا بکەن، دواتریش خوزاعە و کینانە بەشدارییان کرد لە ئاشتیەکەدا و، حاڵەتی جەنگی کۆتایی پێهێنا لە نێو ئەو دوو هۆزەدا، کە چەندین ساڵ بوو هەر بەردەوام بوو.[1]

٩- پێویستە ڕێککەوتن مۆر بکرێت و شایەتی لەسەر بدرێت لە لایەن لایەنەکانەوە، قایل بوونی پێغەمبەر(ﷺ) و ئامادەبوونی هاوەڵانی وەکو مۆرکردن و باوەڕپێهێنان بوو لەسەر ئەو ڕێککەوتنە، وەکو باوە لە یاسای نێودەوڵەتی گشتیدا.

١٠- دەگونجێت کەسی ناوبژیکەر کەسێکی سەربەخۆ و بێ لایەن بێت، یان لایەنێك بێت دیدەکان لە یەکتر نزیك بکاتەوە وەکو سەرگەورەی ئەحباشەکان حولەیسی کوڕی عەلقەمە، یاسای نێودەوڵەتیش بە هەمان شێوە ڕێگە دەدات ڕێککەوتن بە یارمەتی دەوڵەتێکی تر بێت کە لایەن نەبێت لە کێشەکەدا.

١١- ڕێککەوتن کاری پێدەکرێت پاش پێکهاتن و قایل بوون لەسەر مەرجەکانی، با نەشنووسرێت یا لایەنەکانی مۆری نەکەن، وەکو ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بە گێڕانەوەی کوڕەکەی سوهەیلی کوڕی عەمر(ابو جندل) بە پێی بڕگەی پێنجەم لە ڕێککەوتن نامەکە.

١٢- ڕێککەوتن بە دوو نوسخە دەنووسرێتەوە، بۆ ئەوەی هەر یەکەو لە لای لایەنێك بێت، چونکە لە پاش بەجێهێنانی کۆتایی بۆ ئاشتی حودەیبیە هەر یەکێك لە هەردوو لایەن نووسخەیەکی برد لەو بڕوانامە مێژووییە و، نێردەی قوڕەیش گەڕانەوە بۆ مەککە.[2]

---

١ بڕوانە: صلح الحديبية، باشميل(٢٨٠).

٢ بڕوانە: المعاهدات في الشريعة الاسلامية (٢٧٣).

## دووەم: هەڵوێستی ئەبو جەندەل و ئەمەك بۆ پەیمان.

یەکێك لە کاریگەرترین وانەکانی حودەیبیە وانەی بە ئەمەك بوون بوو بۆ پەیمان، پێغەمبەر(ﷺ) بە خۆی جوان ترین نموونەی پێکهێنا لە مێژووی کۆن و نوێدا سەبارەت بە ڕێزگرتن لە وشەیەکی نووسراو، یان نەنووسراو، هەروەها ڕاشکاوی و حەز نەکردنی لە تەڵەکە و پیلان، کاتێك سوهەیلی کوڕی عەمر خەریکی دانوستان بوو لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)، لەو کاتەدا ئەبو جەندەلی کوڕی هات بۆ لای موسڵمانان چونکە باوەڕی بە ئیسلام هێنابوو، لە دەست بتپەرستان هەڵاتبوو و هاواری بۆ موسڵمانان هێنابوو، کاتێك سوهەیل کوڕەکەی خۆی بینی هەڵسا و یەخەی گرت و تی: ئەی موحەممەد تازە مەسەلەکە لە نێوانمان بڕایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ڕاست دەکەیت، ئەبو جەندەل وتی: ئەی کۆمەڵانی موسڵمانان ئایا ڕەوایە بمگێڕنەوە بۆ لای بتپەرستان بۆ ئەوەی لە ئاینەکەم پاشگەزم بکەنەوە؟ بەڵام ئەو قسە هیچ سوودی نەبوو بۆی و پێغەمبەر(ﷺ) گەڕاندییەوە و پێی فەرموو: ئەی ئەبو جەندەل ئێمە لەگەڵیان ئاشتیمان کردووە و پەیمانمان پێ داون، ئێمەیش ناپاکی ناکەین، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) لە بەرامبەر ئەم کارەساتەی کە نەیتوانی بە هۆی ڕێککەوتنەکەوە هیچ چارەسەرێکی بۆ پەیدا بکات – وەکو دڵنەوایییەك – فەرمووی:((یا ابا جندل اصبر واحتسب، فان الله جاعل لك ولمن معك من المستضعفين فرجا و مخرجاً))،[1] واتە: ئەی ئەبو جەندەل ئارام بگرە و چاوەڕوانی پاداشت بکە لە خواوە، چونکە خوای گەورە بۆ تۆ و ئەوانەی لەگەڵتدان لە موسڵمانە چەوساوەکان ڕێگە چارەیەك دەدۆزێتەوە.

دیارە ئەمەیش ئەوپەڕی بە ئەمەك بوونە بۆ پەیمان، بە دەر لەوەی ئاکامەکەی چۆن بێت لە دیدی خەڵکدا.[2]

لە ڕاستیدا دیمەنی ئەبو جەندەل لەو کاتەی کە خوێن لە گیانی دەهات و باوکی ڕایدەکێشا، کاریگەرییەکی زۆری هەبوو کە موسڵمانان هەندێکیان دەگریان بۆ ئەو

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (١٧٧/٦).

٢ بڕوانە: محمد رسول الله، محمد الصادق عرجون (٢٧٥/٤).

برا ئیمانییەیان، بەڵام ئەوە تاقی کردنەوەیەك بوو ناچار بوون ئارام بگرن لە بەرامبەری.

ئەبو جەندەلیش دانی بە خۆیدا گرت، بەرامبەر ئەوەی بەسەریدا هات لە پێناو ئاینەکەی و ،فەرموودەی خوای گەورەی لەسەر بەدی هات: ﴿وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا ۝ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۚ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ ۚ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ ۚ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا﴾(الطلاق: ٢-٣).

بۆیە پێش تێپەڕبوونی ساڵێك خۆی و برا موسڵمانەکانی توانیان هەڵبێن لە زیندانەکانی مەککە و بوون بە هێزێك بێباوەڕانی مەککە لێیان دەترسان، پاش ئەوەی کە چوونە پاڵ ئەبو بەصیر و، زاڵ بوونە سەر ڕێگەی کاروانی بتپەرستاندا کە لە شامەوە دەهاتن.[١]

## سێیەم: ڕێزگرتن لە نەیاری پاراو.

پاش ڕێککەوتن لەسەر پەیمانی ئاشتیەکە و پێش نووسینی ڕێکەوتنامەکە، ناڕەزاییەکی توند دروست بوو لە نێو موسڵمانانندا بەرامبەری، بە تایبەت لەسەر ئەو دوو بڕگەی کە پێغەمبەر(ﷺ) تەنها خۆی پابەند دەبێت بە گێڕانەوەی هەر موسڵمانێك لە لای قوڕەیشەوە بێت بۆ لای موسڵمانان، هەروەها ئەو بڕگەی کە موسڵمانان ناچار دەکات بگەڕێنەوە مەدینە بێ ئەوەی بچنە مەککەوە، ئەوانەش لە هەموویان زیاتر ناڕەزایمان دەردەبڕی، عومەری کوڕی خەتتاب و ئوسەیدی کوڕی حوزەیری سەرگەورەی ئەوس و سەعدی کوڕی عوبادەی سەرگەورەی خەزرەج بوون.

مێژوونووسان دەگێڕنەوە کە عومەری کوڕی خەتتاب هاتووەتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و ناڕەزایی خۆی بە ڕاشکاوی دەربڕیووە و بە پێغەمبەر(ﷺ)ی وتوە: ئایا تۆ پێغەمبەری خوا نیت؟ ئایا ئێمە موسڵمان نین؟ ئایا ئەوان بتپەرست

١ بڕوانە: صلح الحديبية، باشميل (٣٢٢-٣٢٥).

نین؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵێ، عومەر وتی: ئەی ئیتر بۆچی سووکی پیشان بدەین، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((اني رسول الله ولست اعصيه))،[1] واتە: من پێغەمبەری خوام و لە قسەی دەرناچم، ئیتر عومەر هەمان ئەو قسانەی کرد لەگەڵ ئەبو بەکردا(ڕەزای خوایان لێ بێت) و ئەویش ئامۆژگاری کرد کە ڕازی بێت و گوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بکات.

لە پاش ڕووداوی ئازاربەخشی ئەبو جەندەل، نارەزایی تازە بوویەوە بۆ ڕێککەوتنەکە، کۆمەڵێکیشیان عومەری تێدا بوو چوونە لای پێغەمبەر(ﷺ) دووبارە نارەزایی خۆیان لە ئاشتیەکە دەربڕی، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) بە ئارام و دانایی و هێمنی خۆی توانی قایلیان بکات کە ڕێککەوتنەکە سەرکەوتنە بۆ موسڵمانان و خوای گەورەیش ئەبو جەندەل و هاوشێوەکانی ڕزگار دەکات.

بەم شێوە دەردەکەوێت کە پێغەمبەر(ﷺ) بنەمایەکی دیاری کرد بۆ ڕێزگرتن لە نەیاری پاراو و، ئەوەیش ڕێنماییە بۆ سەرکردەکانی پاش خۆی بۆ ڕەچاوکردنی ئەو کارە.

هەروەها ئەم ڕێنموونیەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئازادی بیروڕا دەستەبەر کراوە لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا، با ئەو بیروڕایەیش ڕەخنە بێت لە سەرۆك یان خەلیفە، چونکە ئەو کەسە مافی خۆیەتی بیروبۆچوونی خۆی دەرببڕێت، بۆیە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەو کارە بە تاوانێك دانانرێت پێویست بە سزا بکات و بخرێتە تاریکایی بەندیخانەوە.[2]

## چوارەم: خۆکردنەوە لە عومرە و ڕاوێژی ئومموسەلەمە(ﷺ).

لە پاش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لێبوویەوە لە ئاشتی نامەکە فەمووی:((قوموا فانحروا ثم احلقوا))، واتە: هەڵسن و قوربانیەکانتان سەربڕن و سەرتان بتاشن، سێ جار ئەو قسەی فەرموو، کاتێك بینی کەس هەڵناسێت، چووە لای ئوممومسەلەمە و

---

١ بڕوانە: تاريخ الطبري (٢/٦٣٤).

٢ بڕوانە: غزوة الحديبية لأبي فارس (١٣٤–١٣٥).

باسی ئەوەی بۆ کرد، ئوممو سەلەمە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا حەز دەکەی ئەو کارە بکەن؟ دەرچۆ بێ ئەوەی قسە لەگەڵ کەس بکەیت و قوربانیەکەت سەربڕە و بانگی سەرتاشەکەت بکە سەرت بتاشێت، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) وای کرد، هەموویان هەڵسان قوربانییەکانیان سەربڕی و سەری یەکتریان تاشی تەنانەت خەریك بوو یەکتر بکوژن لە پەژارەدا.[١]

لەو ڕۆژەدا کەسانێك سەریان تاشی و کەسانێك قژیان کورت کردەوە، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) سێ جار فەرمووی:((یرحم الله المحلقین))، واتە: درودی خوای گەورە لەسەر ئەوانەی سەریان تاشیوە، لەسەر چوارەم جاریش درودی بۆ ئەوانە نارد کە قژی سەریان کورت کردووەتەوە.[٢]

یەکێك لە قوربانییەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لە حودەیبیە وشترێکی ئەبو جەهل بوو، کە ئەڵقەیەکی زیوی لەسەردا بوو، بۆ ڕق بەدڵکردنەوەی بێباوەڕان،[٣] لەم ڕووداوەیشدا، هەندێ مەسەلە و باس ڕاماندەوەستێنێت:

١- بۆچوونەکەی ئوممو سەلەمە ڕێدار و پیرۆز بوو، کاتێك پێشنیاری کرد پێغەمبەر(ﷺ) خۆی لە پێشی هاوەڵان هەڵسێت بە قوربانی کردن و سەر تاشین، چونکە کاتێك پێغەمبەر(ﷺ)یان بینی بەو شێوە ئیتر هیچ کەس نەما چاوەڕوانی بکەن، هەروەها دەردەکەوێت کە لە ئیسلامدا جیاوازی نییە لە نێو ئەوەی ڕاوێژ لە پیاوەوە بێت یان لە ئافرەتەوە، بە مەرجێك ڕاوێژەکە ڕاست بێت، ڕێزیش لەوە گەورەتر چی بێت ئافرەتێك بیروڕای خۆی پێشنیار بکاتە سەر پێغەمبەرێکی ڕەوانە کراو و ئەویش بە قسەی بکات.[٤]

٢- گرنگی پێشەنگی کردەیی، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) سێ جار بانگەوازی کرد بۆ مەسەلەیەك و کەس بە دەنگییەوە نەهات، تەنانەت سەرانی هاوەڵانیش، بەڵام کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ئەو مەسەلەی بە شێوەیەکی کردەیی ئەنجامدا سوودی بوو.[٥]

---

١ البخاري: كتاب الشروط (٣/٢٤٠) رقم (٢٧٣٢).
٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٣٤٨).
٣ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٣٤٩).
٤ بڕوانە: المعاهدات في الشريعة الاسلامية (٢٧٣).
٥ بڕوانە: تاملات في السيرة النبوية، عمر سيد الوكيل (٢١١).

٣- حوکمی(الاحصار) لە عومرە و حەجدا: کرداری پێغەمبەر(ﷺ) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو کەسەی ناچارە دەتوانێت خۆی بکاتەوە لە ئیحرام، بەوەی کە مەڕێك سەرببڕێت لەو شوێنەی گیردەدرێت ئینجا سەری بتاشێت و نیەتی(تحلل) بهێنێت لەو ئیحرامەی کە نیەتی بۆی هێناوە ئایا حەج بێت یان عومرە، هەروەها بەڵگەی ئەوەشی تیادایە ئەگەر ئەو حەج و عومرە فەرز نەبێت گێڕانەوەی لەسەر نییە، بە بەڵگەی ئەوەی هەموو ئەوانەی ئامادەی ئەم ڕووداوە بوون جارێکی تر لە عومرەی گێڕانەوەدا هاتنەوە مەگەر کەسێك مردبێت یان شەهید بووبێت لە غەزای خەیبەر.[1]

## پێنجەم: گەڕانەوە بۆ مەدینە و دابەزینی سورەتی(الفتح).

پێغەمبەر(ﷺ) لە حودەیبیە گەڕایەوە بەرەو مەدینە، لە نێوان مەککە و مەدینەشدا سورەتی فەتح دابەزی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿سَيَقُولُ لَكَ الْمُخَلَّفُونَ مِنَ الْأَعْرَابِ شَغَلَتْنَا أَمْوَالُنَا وَأَهْلُونَا فَاسْتَغْفِرْ لَنَا ۚ يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ ۚ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ لَكُم مِّنَ اللَّهِ شَيْئًا إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرًّا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ نَفْعًا ۚ بَلْ كَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾(الفتح: ١١).

پێغەمبەر(ﷺ) ئەوپەڕی خۆشحاڵ بوونی دەربڕی بە دابەزینی ئەم سوورەتە و، فەرمووی:((انزلت عليّ الليلة سورة هي أحب اليّ مما طلعت عليه الشمس))،[2] واتە: ئەمشەو سورەتێکم بەسەردا دابەزی، خۆشەویسترە لە لام لە هەموو شتێك خۆری لەسەر هەڵبێت، ئینجا خوێندییەوە: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا﴾(الفتح: ١).، هاوەڵانی فەرموویان: مژدەی خۆشی بێت، ئەی ئێمە چیمان بۆ هەیە، ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند:﴿لِّيُدْخِلَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾(الفتح: ٥).[3]

---

١ بڕوانە: فقه السيرة للبوطي (٢٤٣).

٢ البخاري، كتاب المغازي، باب غزوة الحديبية (٥/٨٠) رقم (٤١٧٧).

٣ البخاري، كتاب المغازي، باب غزوة الحديبية (٥/٨٧) رقم (٤١٧٢).

خەڵکەکەش بە پەلە هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) لە وڵاخەکەی لە(کراع الغمیم) و ئەویش بۆی خوێندنەوە: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا﴾، پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا فەتحە؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە فەتحە،[1] ئیتر پەژارەی موسڵمانان گۆڕا بۆ خۆشی و شادی.

ئەوەشیان بۆ دەرکەوت کە هەرگیز ئەوان ناتوانن بە تەواوی بگەن لە هۆکار و دەرەنجامەکان و، باشترە بۆیان خۆیان بدەنە دەست فەرمانی خوا و پێغەمبەرەوە.[2]

قورئانی پیرۆز ناوی(الفتح المبین)ی لەو ئاشتییە نا، سەرەڕای ئەوەی کە جەنگ لە بنچینەوە ڕووینەدا، کە وردیش دەبینەوە لە ڕووداوەکان دەبینین سورەتی فەتح پاش تەواوبوونی پێغەمبەر(ﷺ) لەو ئاشتییە دابەزی، لە کاتی گەڕانەوەی بۆ مەدینە، پاش ئەوەی موسڵمانان بەو ئەزموونانەدا تێپەڕ بوون سەبارەت بە هیوای عومرە و ڕووبەڕووبوونەوەی موشریکەکان و، بەیعەتی(رضوان) و ڕێککەوتن نامەکە کە هەندێك لە هاوەڵان لێی ڕازی نەبوون.

قورئانی پیرۆز دادەبەزی بۆ ئەوەی متمانەی موسڵمانان بە پێغەمبەر(ﷺ) پتر بێت، کاتێك لە پێش چاوی هەموواندا ڕایگەیاندا کە خوای گەورە لە هەموو گوناهەکانی ڕابووردوو و داهاتوویشی خۆش بووە و، بۆ ئەوەش بزانن کە خۆیان لەسەر هەق و ڕاستین و، خوای گەورە پشتگیری کردوون بۆ ئەوەی ئارام بگرن لەگەڵ پێغەمبەرەکەی بۆ مەسەلەی ئاشتییەکە و، لە کۆتاییدا کەسیان لە قسەی پێغەمبەر(ﷺ) دەرنەچوون، خوای گەورە خۆیشی دەفەرمووێت: ﴿هُوَ الَّذِي أَنزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَّعَ إِيمَانِهِمْ ۗ وَلِلَّهِ جُنُودُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾(الفتح: ٤).

ئەم غەزایەیش بەوە جیادەبێتەوە کە خوای گەورە سوکنایی دابەزاندە سەر موسڵماناندا بۆ ئەوەی چاکەی خوای گەورەیان هەرگیز لەبیر نەچێت و قورئانی

---

١ سنن ابي داود، معالم السنن، كتاب الجهاد رقم (٢٧٣٦).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٢/٤٤٩).

پیرۆزیش ئاماژەی کردووە بۆ بەیعەتی(رضوان) کە هاوەڵان لەسەر مردن پەیمانیان بە پێغەمبەر(ﷺ) دا، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ۚ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَٰهَدَ عَلَيْهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾(الفتح: ١٠).

قورئانی پیرۆز باسی ڕاستیەکان دەکات و بیروباوەڕەکان ڕاست دەکاتەوە و، دووڕووەکان ئابڕوو دەبات و، موژدە دەداتە موسڵمانان بە فەتحێکی نزیك لە خەیبەرەوە، هەروەها خاوەن پاساوەکانیشی ئاشکرا کرد و، کاتێك صوڵحی حەدەیبیە تەواو بوو، موسڵمانان گەڕانەوە بۆ مەدینە، بێ ئەوەی ئاواتەکەیان لە چوونە ژوورەوەی مەککە بێتەدی، خوای گەورە لەم کاتەدا ئاماژەی دەکرد بۆ خەونێکی پێغەمبەر(ﷺ) کە خەونێکی ڕاستە و دێتەدی: ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ۖ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ ۖ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴾(الفتح: ٢٧).

ئینجا سورەتەکەی کۆتایی پێ دەهێنێت بە ستایشکردنی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی.[١] خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٢٨﴾ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ۖ سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ ۚ وَمَثَلُهُمْ فِى ٱلْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسْتَغْلَظَ فَٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعْجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ ۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًۢا ﴾(الفتح: ٢٨-٢٩).

هاوەڵان بە تەواوی دڵنیا بوون لەوەی کە بانگەواز چووەتە قۆناغێکی نوێوە و، ئاسۆیەکی پان و بەرینی بۆ دەرکەوت و، سروشتی ئەم ئایینە ئەوەیە لە کەش و

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٣٥١).

هەوای ئاشتیدا گەشە دەکات، زیاتر لە کەش و هەوای جەنگ.

لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژانیشدا دەرەنجامەکانی ئاشتی حودەیبیەیان بۆ دەرکەوت کە گرنگترینیان بریتی بوو لە:

١- دانپێدانانی قورەیش بە قەوارەی دەوڵەتی ئیسلامی، چونکە ڕێککەوتن هەمیشە لە نێوان دوو هاوتادا دەبێت، ئەمەیش کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر دەروونی هۆزەکان کە تەماشای قورەیشیان وەکو پێشەنگ دەکرد.

٢- ترس و بیم چووە دڵی بێباوەڕان و مونافیقەکانەوە، زۆربەشیان دڵنیابوون لەوەی ئیسلام زاڵ بووە و، کاریگەریشی لەسەر هەندێك لە کەڵە پیاوانیان دەرکەوت وەکو خالیدی کوڕی وەلید و عەمری کوڕی عاص، هەروەها لە پەلەکردنی عەرەبە بیابانشینەکان بۆ داوای پۆزش کردن لە دواکەوتنیان.

٣- ئەم ئاگربەستە هەلێکی ڕەخساند بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام و ئاشناکردنی خەڵکی پێی، ئیمامی زوهری دەفەرمووێت:(هەرگیز فەتحێك لە ئیسلامدا نەبوو لەمە مەزنتر، لە کاتی ئاگربەستەکە و کاتێك موسڵمانان لەگەڵ خەڵکی قسەیان دەکرد، هەرکەسێ هەندێ هۆشی بووایە دەهاتە ئیسلامەوە، لەو دوو ساڵەیشدا ئەوەندەی پێشتر و زیاتر خەڵکی موسڵمان بوون).[1]

بەڵگەیش لەسەر قسەی زوهری - وەکو ئیبنو هیشام دەڵێت - ئەوەبوو پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك دەرچوون بۆ حودەیبیە هەزار و چوار سەد کەس بوون، بەڵام پاش دوو ساڵ دە هەزار کەس بوون لە کاتی فەتحی مەککە.[2]

٤- موسڵمانان ترسیان نەما لە لایەن قورەیشەوە، بۆیە گرنگی زۆریان دایە جوولەکە و ئەو هۆزانەی کە دژایەتی موسڵمانانیان دەکرد، بۆیە غەزوەی خەیبەر ڕوویدا لە پاش ئاشتی حودەیبیە.

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٣٥١).
٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٣٥١-٣٥٢).

٥- دانوستانەکانی ئاشتییەکە هاوپەیمانەکانی قورەیشی حالّی کرد لە هەڵوێستی موسڵمانان و، بۆ نموونە(الحليس بن العلقمة) کاتێك موسڵمانانی بینی لە ئیحرامدا دیمەنیان کاری تێکرد و لایەنگرییانی کرد.

٦- ڕێگە هەموار بوو بۆ ئامادەکردنی غەزای موئتە و گواستنەوەی بانگەواز بۆ دەرەوەی دوورگەی عەرەب.

٧- یارمەتی ئەوەی دا نامە بنێرێت بۆ پادشاکانی فارس و ڕۆم و قیبت و بانگ کردنیان بۆ ئیسلام.

٨- ئاشتی حودەیبیە لە ڕاستیدا پێشەکییەك بوو بۆ فەتحی مەککە، وەکو خوای گەورەیش هەمیشە بۆ مەسەلە گرنگەکان هەندێ پێشەکی دروست دەکات وەکو ئیبنولقەییم دەفەرموێت.[١]

## شەشەم: ئەبو بەصیر لە مەدینە و سەرکردایەتی کردنی بۆ جەنگی پارتیزانی.

لە پاش ئاشتی حودەیبیە ڕاستەوخۆ ئەبو بەصیر عوتبەی کوڕی ئوسەید توانی لە زیندانەکانی مەککە هەڵبێت و، خۆی بگەیەنێتە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە مەدینە، بەلام پێغەمبەر(ﷺ) بە پێی برگەکانی ڕێککەوتن نامەکە ئەبو بەصیری گەڕاندەوە و پێی فەرموو: ئەی ئەبو بەصیر بگەڕێرەوە خوای گەورە بۆ تۆ و ئەوانەی وەکو تۆن گوشادیان دەکاتەوە،[٢] ئیتر ئەویش گەڕایەوە لەگەڵ ئەو دوو پیاوەی قورەیش ناردبوونی بۆ گێڕانەوەی، موسڵمانانیش ئەوەیان زۆر لە لا قورس بوو براکەیان لە بیروباوەڕدا بگەڕێتەوە بۆ زیندانەکانی بێباوەڕان، بەلام پێغەمبەر(ﷺ) نەیدەتوانی پەیمانی خۆی بشکێنێتو خوای گەورەیش دەفەرموێت: ﴿ وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمۡ وَلَا تَنقُضُواْ ٱلۡأَيۡمَٰنَ بَعۡدَ تَوۡكِيدِهَا وَقَدۡ جَعَلۡتُمُ ٱللَّهَ عَلَيۡكُمۡ كَفِيلًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا تَفۡعَلُونَ ﴾(النحل: ٩١). بۆیە بە ئەمەك بوون بۆ پەیمان بنەمایەکە لە بنەماکانی ئایینی ئیسلام کە پێویستە هەموو موسڵمانێك پابەندبێت پێوەی.[٣]

---

١ بڕوانە: زاد المعاد (٣/٣٠٩).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٣٥٢).

٣ بڕوانە: منهج الاعلام الاسلامي في صلح الحديبية (٣٢٩).

پێغەمبەر(ﷺ) وابەستەی پەیمانەکەی بوو لەگەڵ قوڕەیش و ئەبو بەصیری دایە دەستیانەوە، جا کاتێك گەیشتنە(ذي الحليفة) بە یەکێك لە دوو کەسەکەی وت: شمشێرەکەت تیژە؟ وتی: بەڵێ، حەز دەکەیت تەماشای بکە، ئەویش هەڵیکێشا و کابرای بتپەرستی پێ کوشت، بۆیە ئەو پیاوەکەی تر هەڵهات بەرەو لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: هاوڕێکەتان هاوڕێکەی کوشتم، زۆری پێ نەچوو ئەبو بەصیر خۆی ئامادە بوو، شمشێرەکەشی بە قەد خۆیدا کردبوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوەی لەسەرت بوو ئەنجامتدا، منیش ڕازی نەبووم بمگێڕنەوە لە ئاینەکەم، یان گاڵتەجاڕیم پێ بکرێت،[1] پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((مسعر حرب، لو كان له احد))،[2] واتە: هەڵگیرسێنەری جەنگە ئەگەر کەسانێکی لەگەڵ بووایە، کاتێك ئەو قسەی لە پێغەمبەر(ﷺ) بیست زانی دەیگێڕێتەوە بۆ مەککە، بۆیە دەرچوو بەرەو ناوچەی(سيف البحر)،[3] ئینجا ئەو موسڵمانە چەوساوانە لە مەککە لە قسەکەی پێغەمبەر(ﷺ) وا حاڵی بوون کە ئەبو بەصیر پێویستی بە پیاو هەیە بۆیە دەستیان کردە هەڵاتن و خۆیان پێی دەگەیاند لە(سيف البحر)، ئیتر ئەبو جەندەل و کەسانێکی تر چوونە لای و، بوونە هێزێکی کاریگەر ڕێگەیان لە کاروانەکانی قوڕەیش دەگرت و کاروانچیەکانیان دەکوشت و، ماڵەکانیشیان تاڵان دەکرد، بۆیە بتپەرستان تکایان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەوانە بانگ بکاتە لای خۆی ئەوان واز لە مەرجەکەیان دەهێنن، بۆیە تووشی سەرشۆڕی بوون.[4]

ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بە دوایاندا کە ژمارەیان شەست کەس دەبوون، هاتنە مەدینە و هێزی موسڵمانانیشیان پێ پتر بوو، بەڵام ئەبو بەصیر ئەو کاتە لەسەر جێگای مردن بوو، کۆتا هەناسەکانیشی هەڵکێشا و دڵی هەر لەگەڵ کۆمەڵگای مەدینەدا بوو.[5]

لە ڕاستیدا بەسەرهاتی ئەو کەسانە سەرگوزشتەیەکە شایانی ئەوەیە ڕەچاو بکرێت وەکو نموونە بۆ جێگیربوون لەسەر بیروباوەڕ و هەوڵدان بۆ سەرخستنی،

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٣٥٣).
٢ البخاري، كتاب الشروط، باب الشروط في الجهاد (٣/٢٤١) رقم (٢٧٣٢).
٣ هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.
٤ بڕوانە: محمد رسول الله، عرجون (٤/٢٨١).
٥ بڕوانە: صور وعبر من الجهاد النبوي في المدينة (٣٩٦).

ئاماژەیش بۆ ئەو ڕاستیە دەکات کە دەڵێت: لەوانەیە ئەوەی بە تاکە کەسێك دەکرێت بە کۆمەڵێك نەکرێت، چونکە لە کاتێکدا ئەبو بەصیر و ئەو چەند کەسە ئەو گورزە کوشندانەیان لە قورەیش دەدا، دەوڵەتی ئیسلامی دەستەوسان بوو لەوەی هیچ زیانێك بەوان بگەیەنێت، خۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەیتوانی فەرمانیان پێ بکات واز بهێنن لەو کارانە، یان بگەڕێنەوە بۆ مەککە و نەشی کرد، ئەویش ڕازی بوو لەسەر کارەکانیان، هەڵوێستەکەی ئەوانیش لە ئەوپەڕی داناییدا بوو، کاتێك ڕازی نەبوون بچەوسێنرێنەوە بە دەست ئەو بتپەرستانەوە.[1]

حەوتەم: ڕازی نەبوونی پێغەمبەر(ﷺ) لە گێڕانەوەی ئافرەتە کۆچکردووەکان:

کۆمەڵێك لەو ئافرەتە موسڵمانانەی لە مەککە مابوونەوە، بڕیاریاندا کۆچ بکەن، لە مەککەی بێباوەڕەوە بۆ ماڵی ئیسلام لە مەدینە، لە سەرووی ئەو ئافرەتانەشەوە(ام کلثوم)ی کچی عوتبەی کوڕی ئەبو موعەیت، کاتێك گەیشتنە مەدینە، بێباوەڕانی مەککە ویستیان بیانگێڕنەوە، ئیتر خوای گەورەیش ئەم ئایەتانەی دەربارەیان دابەزاند:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٖ فَٱمۡتَحِنُوهُنَّۖ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّۖ فَإِنۡ عَلِمۡتُمُوهُنَّ مُؤۡمِنَٰتٖ فَلَا تَرۡجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلۡكُفَّارِۖ لَا هُنَّ حِلّٞ لَّهُمۡ وَلَا هُمۡ يَحِلُّونَ لَهُنَّۖ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّۚ وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ وَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقۡتُمۡ وَلۡيَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقُواْۚ ذَٰلِكُمۡ حُكۡمُ ٱللَّهِ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡۖ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾(الممتحنة: ١٠).

مامۆستا(محمد الغزالی) ﷺ دەڵێت: موسڵمانان ڕازی نەبوون ئەو ئافرەتانە بگێڕنەوە بۆ لای کەس و کارەکانیان، یان لەبەر ئەوەبوو کە ڕێککەوتن نامەکەیان بەوە لێکدایەوە کە تایبەتە بە پیاوانەوە، یان لەبەر ئەوەی دەترسان ئەو ژنانە نەتوانن بەرگری ئەشکەنجە بکەن و ئەوانیش توانای خۆ ڕزگارکردنیان نییە وەکو ئەبو بەصیر و ئەبو جەندەل و ئەوانی تر، هەر چۆنێکیش بێت گلدانەوەی ئافرەتەکان بە پێی ئایەتی قورئانی پیرۆز بوو.[2]

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٢/٤٥٢).

٢ بڕوانە: فقه السيرة للغزالي (٣٦٧).

## باسی سێیەم: پەند و ئامۆژگاری

غەزای حودەیبیە پەند و ئامۆژگاری زۆری تێدابوو، باسی هەندێکی دەکەین:

### یەکەم: ئەو حوکمانەی پەیوەندییان هەیە بە لایەنی بیروباوەڕەوە.

**١- حوکمی ڕاوەستان لە لای سەری سەرۆکەوە ئەو دانیشتبێت:**

موغیرەی کوڕی شوعبە لە لای سەری پێغەمبەر(ﷺ) ڕاوەستا بوو، ئەویش سوننەتێکە پێویستە پەیڕەو بکرێت لە کاتی هاتنی نێردەی بێباوەڕان، بۆ ئەوەی سەرگەورە ڕێزی لێ بگیرێت و مەزن ڕابگیردرێت، ئەمەیش پەیوەندی نییە بەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) کە هەڕەشە دەکات لەوانەی حەز دەکەن خەڵکی لەسەر پێ بۆیان ڕاوەستن و فەرموویەتی:((من احب ان یمثل له الرجال قیاماً فلیتبوأ مقعده من النار)).[١]

هەروەها شانازی کردنیش لەم جۆرە شوێنانە ڕەوایە و ڕێی پێدراوە، وەکو ئەوەی ئەبو دوجانە دەیکرد لە کاتی غەزای ئوحوددا، بە بەڵگەی ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی فەرمووی:((انها مشیة یکرهها الله الا في هذا الموضع)).[٢] واتە: ئەوە ڕێکردنێکە خوای گەورە حەزی لێ ناکات لەم جێگایە نەبێت.

**٢- گەشبینی:**

کاتێك سوهەیلی کوڕی عەمر هات بۆ دانوستان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(سهل امرکم) واتە: کارتان ئاسان بوو، ئەم گەیشبینیە جیاوازە لەگەڵ ڕەشبینی کە لە ئاییندا قەدەغەکراوە.[٣]

هەندێ فەرموودەیش هاتووە لەم بارەوە، وەکو:((لاطیره وخیرها الفأل))،[٤] واتە: ڕەوا نییە شتێك بە نیشانەی شوومی بزانیت، بەڵکو پێشبینی چاکە بکە. وتیان:

---

١ اخرجه ابو داود في الادب باب قیام الرجل للرجل (٥٢٢٩).

٢ بڕوانە: فقه السیرة للبوطي (٢٤١).

٣ زاد المعاد (٣/٣٠٥).

٤ بڕوانە: غزوة الحدیبیة للحکمي (٣٠٢).

ئەی پێغەمبەری خوا(فأل) چییە؟ فەرمووی:((الكلمة الصالحة يسمعها احدكم))، واتە: وشەیەکی چاك کە یەکێکیان دەیبیسن. ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر کەسێکتان شتێکی بینی کە پێی ناخۆش بوو، با بڵێت: خوایە کەس چاکە ناهێنێت تۆ نەبێت، کەس خراپە دوور ناخاتەوە تۆ نەبێت، هیچ هێز و پەنایەك نییە جگە لە تۆ.[١]

**٣- ئاشکراکردنی بێباوەڕی کەسێك وابزانێت هەسارەکان کاریگەرییان هەیە لەسەر باران بارین:**

خالیدی جوهەنی(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە حودەیبیە پێشنوێژی بەیانی بۆ کردین، دوای باران بارینێك لەو شەوەدا، کاتێك لە نوێژەکە بوویەوە، ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی: ئایا دەزانن خوای ئێوە ئەمشەو چی فەرموو؟ وتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی چاکتر دەزانن، فەرموویەتی: بەندەکانم هەندێکیان ئیماندار بوون و هەندێکیان بێباوەڕ بوون، ئەو کەسە وتی: بارانم بۆ باری بە چاکە و میهرەبانی خوای گەورە ئەوە ئیماندارە بە من و باوەڕی بە هەسارەکان نییە، ئەوەشی وتی: بە بۆنەی فلانە هەسارەوە بارانمان بۆ باری ئەوە بێباوەڕە بە من و باوەڕی بە هەسارە هەیە.[٢]

زانایان ئەم جۆرە بێباوەڕییەیان بە بێباوەڕی بیروباوەڕ یان بێباوەڕی نیعمەت لێکداوەتەوە بە پێی ئەو کەسەی کە لێی دەردەکەوێت.

واتە: ئەگەر کەسێك باوەڕی وابێت هەسارە کاریگەری هەیە لە باران باریندا، ئەوە کافرە و لە ئیسلام دەردەچێت وەکو ئیمامی شافیعی فەرموویەتی.[٣]

**٤- ئایا دەکرێت پاشماوە و شوێنەواری پیاوچاکان بە پیرۆز بزانرێت:**

لە فەرموودەکەی عوروەی کوڕی مەسعود دا هاتووە، کە پێغەمبەر(ﷺ) ئاوی لووتی و دەمی نە دەکەوتە سەر زەوی بەر لەوەی بکەوێتە سەر دەستی یەکێك لە

---

١ سنن ابي داود مع معالم السنن/ كتاب الطب (٣٩١٩).
٢ البخاري، كتاب الاذان (٨٤٦).
٣ الام (٢٥٢).

هـاوەڵانی، دەیانـساوی بـە ڕووخـسار و پێـستیاندا، ئەگـەر فەرمانیـشی بکردایـە گوێڕایەڵیان دەکرد، ئەگەر دەست نوێژیشی بگرتایـە خـەریك بـوو شـەڕیان دەکرد لەسەر پاشماوەی دەست نوێژەکەی.[١]

پێـشەوا(الـشاطبي) پــەراوێزێکی نوســیووە دەربــارەی ئــەم فــەرموودە و هاوشێوەکانی و وتوویـەتی: بـە ڕووالـەت ئـەوە وەردەگیردرێت کـە ئـەو بـە پـیرۆز تەماشاکردنە بۆ پاشماوەی هەموو خۆشەویستێکی خوایە، بەڵام هـاوەڵان پـاش لـە دونیا دەرچوونی پێغەمبەر(ﷺ) بە هیچ شێوەیەك کاری لەو جۆرەیان لێ نەبینراوە، کـە ئـەوان چـاکترینی ئوممـەتن، تەنانـەت لـە چـوار خەلیفەکـەیش بـەڵکو تـەنها شوێنکەوتووی کردار و گوفتارەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بوونـە، کەواتـە ئـەوە ئیجماعـە لەسەر وازهێنانی لەو کارە.[٢]

بەڵام(ابن وهـب) فەرموودەیـەکی گێڕاوەتـەوە لـە(ابـن شـهاب الزهـري)یـەوە، لـە پیـاوێکی ئەنـصارییەوە،[٣] کـە بـۆ پـیرۆزی لـە ئـاوی دەسـت نوێـژ و دەم و لـووتی پێغەمبـەر(ﷺ)ی بـەکارهێناوە بـۆ ئـەوەی بیـساوێ بـە پێـستی خۆیـدا، کاتێـك پێغەمبـەر(ﷺ) پرسـیاری لێ کـردووە بـۆ وا دەکـەیت، وتوویـەتی: بـۆ پـیرۆزی، پێغەمبەر(ﷺ)یش فـەرموویەتی:((من کان منکم یحب ان یحبه الله ورسـوله فلیـصدق الحـدیث ولیـؤد الامانـة ولا یـؤذ جـاره))،[٤] واتـە: هەرکەسـێ پێـی خۆشـە خـوا و پێغەمبەرەکەی خۆشی بوێن با ڕاستگۆ بێت و ئەسپەردە بەجێ بگەیەنێت و ئازاری دراوسێکەی نەدات.

بـە پێـی ئـەم فەرموودەیـەیش وا دەردەکـەوێت باشـتر وایـە لەگـەڵ خـودی پێغەمبـەر(ﷺ) وانەکرێت چاکترە، لەوانەشە بێدەنگ بـوونی پێغەمبـەر(ﷺ) لەسـەر ئەو کـارە لـە ڕۆژی حودەیبیـە بـۆ ئـەوە بوویێـت عـوروەی کـوڕی مەسـعود ببینـێ

---

١ البخاري، کتاب الشروط رقم (٢٧٣١، ٢٧٣٢).

٢ بڕوانە: غزوة الحديبية للحكمي (٣٠٥).

٣ (عبدالرحمن بن ابي قرد) ﷺ، الترغيب والترهيب (٣/٥٨٩).

٤ شـێخ ئـەلبانی دەربـارەی ئـەم فـەرموودە وتوویـەتی: فەرموودەیـەکی جـێگیرە و پاڵپـشتی هەیـە لـە موعجەمی تەبەرانی و فەرموودەی تر، السلسلة الصحيحة رقم (٢٩٩٨).

هاوەڵان چەند پێغەمبەر(ﷺ)یان خۆش دەوێت، بە تایبەتی کاتێك عوروە وتی: وادەزانم کەسانێکت بە دەوروبەر دایە هەڵدێن و بەجێت دەهێڵن.

## دووەم: هەندێ حوکمی فیقهی و ئوصولی.

### ١- بەسەرهاتی کەعبی کوڕی عوجرە و، دابەزینی ئایەتی فیدیە:

کەعب(ﷺ) دەفەرمووێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە حودەیبیە لە لامدا ڕاوەستا و، ئەسپێ لەسەرم دەکەوتە خوارێ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا ئەو ئەسپێیانە ئازارت دەدەن، وتم: بەڵێ، فەرمووی: سەرت بتاشە، ئیتر ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِۦٓ أَذًى مِّن رَّأْسِهِۦ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ﴾(البقرة: ١٩٦). ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو – وەکو لە ڕیوایەتی موسلیم دا هاتووە – سەرت بتاشە و، سێ(صاع) خواردن دابەش بکە بەسەر شەش کەسدا، یان سێ ڕۆژ ڕۆژوو بگرە...[١] ئایەتی سورەتی(البقرة)یش حوکمی ئەو کەسە ڕوون دەکاتەوە کە لە ئیحرامدایە و ئەو ئازارەی هەیە لەسەریدا وەکو کەعبی کوڕی عوجرە و هەر کەسێکیش وەکو ئەو بێت.

### ٢- ڕێدراوە نوێژکردن لە ماڵ و جێگای مانەوە:

(ابن ماجە) لە(أبي المليح بن اسامة)ەوە دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: لە شەوێکدا باران بوو دەرچووم و گەڕامەوە، باوکم وتی: ئەوە کێیە؟ وتم:(أبو المليح)ە، وتی: لە ڕۆژی حودەیبیە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووین و باران باری ژێر پێڵاوەکانیشمان دەبوو بە قوڕ، کەسێك لە لایەن پێغەمبەر(ﷺ)ەوە هاواری کرد: لە جێگاکانی خۆتان نوێژ بکەن،[٢] ئەم فەرموودەیەیش(ابن حجر) بە(صحيح)ی زانیووە.[٣]

---

١ مسلم كتاب الحج (١٢٠١).

٢ سنن ابن ماجه، كتاب إقامة الصلاة (٩٣٦).

٣ فتح الباري (١١٣/٢)، غزوة الحديبية للحكمي (٢٢١).

**٣- گەڕانەوەی موسڵمانان لە حودەیبیە و هەڵنەسانیان بۆ نوێژی بەیانی:**

مانەوەی موسڵمانان لە حودەیبیە بیست ڕۆژ کەمتر بوو، یان بیست ڕۆژ بوو بە پێی قسەی(الواقدي)[١] و(ابن سعد).[٢]

(ابن عائذ)یش دەڵێت: مانگ و نیوێك ماونەتەوە،[٣] واش دەردەکەوێت هەندێکیان مەبەستیان ماوەی مانەوەیە لە حودەیبیە و هەندێکیان مەبەستیان هەموو ئەو کاتەیە کە غەزاکە پێی چووە تاکو گەڕانەوە بۆ مەدینە.

لە ڕێگەی گەڕانەوەدا لە جێگایەك لایاندا و بیلالیان کرد بە پاسەوان و خەوتن، بەڵام بیلالیش خەوی پیاکەوت و گەرمی خۆری بەیانی ئاگاداری کردنەوە.[٤]

وەکو لە فەرموودەی عەبدوڵای کوڕی مەسعود دا هاتووە، بەڵام هەندێك فەرموودەی تر هەیە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم هەڵنەسانە بۆ نوێژی بەیانی لە حودەیبیە نەبووە، دکتۆر(حافظ الحکمي) جیاوازی فەرموودەکان دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی چەند جارێك ئەم بەسەرهاتە ڕوویداوە، ئەمەیش بۆچوون و پەسەندکردنی،(النووي)[٥] و(ابن کثیر)[٦] و(ابن حجر)[٧] و(الزرقاني)یە، بەڵکو(سیوطي)[٨] وتوویەتی: فەرموودەکان کۆنابنەوە بەوە نەبێت بەسەرهاتەکە چەند جارێك ڕووی دابێت.

**٤- شەرعی بوونی ئاگربەست لە نێوان موسڵمانان و دوژمنەکانیان و، ئەو ماوەی ڕێدراوە شەڕی تیا ڕاوەستێت:**

زانایان ئاشتی حودەیبیەیان کردووەتە بەڵگە لەسەر ڕەوابوونی ڕێککەوتن لە نێوان موسڵمانان و دوژمنەکانیان بۆ ماوەیەکی دیاری کراو، ئیتر ئایا بێ بەرامبەر

---

١ المغازي للواقدي (٢/٦١٦).

٢ الطبقات الکبری (٣/٩٨).

٣ شرح الزرقاني علی المواهب (٢/٢١٠).

٤ بڕوانە: غزوة الحديبية (٢٥١).

٥ بڕوانە: شرح النووي علی صحيح مسلم (٥/١٨١-١٨٢)، غزوة الحديبية (٢٥٨).

٦ بڕوانە: البداية والنهاية (٤/٢١٣).

٧ فتح الباري (١/٤٤٩)، شرح الزرقاني علی الموطأ (١/٤٧).

٨ تنوير الحوالك (١/٣٣).

بێت وەکو ئەوەی مەدینە، یان بە بەرامبەریش بێت، بەڵام ئەگەر ڕێککەوتنەکە لەسەر ئەوە بێت موسڵمان بەرامبەر بدەن ئەوە ڕەوا نییە چونکە سەرشۆڕی تیایە بۆیان، مەگەر لە حاڵەتێکدا موسڵمانان بترسن تووشی زیانی گەورە یان دیل بوون ببن، وەکو دیل چۆن دەتوانێ ڕزگارانە بدات.

شافیعی و ئەحمد ڕەحمەتی خوایان لێ بێت، هەروەها زۆرێك لە زانایان، بە لایانەوە وایە ڕێککەوتن پێویستە بۆ ماوەیەکی دیاری کراو بێت و لە دە ساڵ تێنەپەڕێت بە پێی ڕێککەوتنەکەی حودەیبیە.[1]

هەندێکیش لە زانایان – وەکو ئەبو حەنیفە – وتوویانە لە دە ساڵ زیاتریش هەر دەبێت ئەگەر سەرۆك بە بەرژەوەندی بزانێت.[2] بەڵام بۆچوونی یەکەم پەسەندترە، جا ئەگەر بەرژەوەندییەك بینرا لە دە ساڵ زیاتر، گرێبەستەکە نوێ دەکرێتەوە، وەکو شافیعی فەرموویەتی.[3]

هەندێك لە زانا(متأخر)ەکانیش وتوویانە دەکرێت ڕێککەوتن بکرێت بۆ هەتا هەتایی بە بەڵگەی فەرموودەی خوای گەورە : ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٌ أَوۡ جَآءُوكُمۡ حَصِرَتۡ صُدُورُهُمۡ أَن يُقَٰتِلُوكُمۡ أَوۡ يُقَٰتِلُواْ قَوۡمَهُمۡۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمۡ عَلَيۡكُمۡ فَلَقَٰتَلُوكُمۡۚ فَإِنِ ٱعۡتَزَلُوكُمۡ فَلَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ وَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سَبِيلٗا ﴾(النساء: ٩٠).

ئەم بۆچوونەیش لەسەر ئەوە بونیات نراوە کە پەیوەندی موسڵمانان لەگەڵ بێباوەڕاندا ئاشتیە نەوەك جەنگ، جیهادیش بۆ بەرگری کردنە لە موسڵمانان و هیچی تر،[4] ئەم بۆچوونە ڕەت دەکرێتەوە بە چەند بەڵگەیەك.

أ– خاوەنی ئەم بۆچوونە یەکبۆچوونی زانایانی شکاندووە لە، دوای ئەوەی کە خۆی گێڕاویەتیەوە لە کتێبەکەیدا.[1]

---

١ بڕوانە: فقه السيرة للبوطي (٢٤٢).
٢ بڕوانە: فتح القدير (٥/٥٤٦)، غزوة الحديبية (٢٩٤).
٣ بڕوانە: غزوة الحديبية (٢٩٥).
٤ بڕوانە: اثار الحرب في الفقه الاسلامي للزحيلي (٦٧٥).

ب- ئەو ئایەتەی کردوویەتی بە بەڵگە مەنسووخە بە فەرموودەی خوای گەورە: ﴿فَإِذَا انسَلَخَ الْأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾(التوبة: ٥). تەبەری و قورتوبی وایان فەرمووە.[٢]

ج- ئەو بنچینەیەی ئەم بۆچوونەی لەسەر دروست دەکرێت ڕەت دەکرێتەوە بە ئایەتی پێشوو لە سورەتی(براءة) و ژیاننامەی پێغەمبەر(ﷺ) و خەلیفەکانی دوای خۆی.

د- سەبارەت بە بیرۆکەی ئەوەش، کە جیهاد تەنها بۆ بەرگری کردنە لە موسڵمانان ئەوە بیرۆکەیەکی نامۆیە و سەید قوتب رحمه الله لە ڕووی وەستاوە و، بەرچەچی داوەتەوە، ڕوونیشی کردووەتەوە کە هۆکاری دروست بوونی کاریگەری هێرشی ڕۆژهەلاتناسەکانە و، تێنەگەیشتنە لە قۆناغەکانی بانگەواز.[٣]

٥- ڕەها لەسەر ڕەهایی خۆی دەمێنێتەوە:

ئەمە بنەمایەکی بنچینەییە، بە بەڵگەی ئەوەی ئیبنوهیشام دەیگێڕێتەوە لە ئەبو عوبەیدە و فەرموویەتی: کاتێك گەڕانەوە بۆ مەدینە، یەکێك بە پێغەمبەر(ﷺ)ی فەرموو: ئایا نەتفەرموو بەبێ ترس دەچینە مەککەوە؟ فەرمووی: بەڵێ، بەڵام ئایا پێم وتن ئەمساڵ دەچین؟ وتیان: نەخێر، فەرمووی: کەواتە قسەکە هەر بەو شێوەیە کە جیبریل(عليه السلام) وتوویەتی.[٤]

ئەم فەرموودەیەیش ئەوە دەگەیەنێت پێویستە بەڕەهایی باوەڕپهێنرێت و کار بکرێت بە بەڵگەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بێ ئەوەی بە جۆرێکی تر لێکبدرێتەوە و لە ڕەهایی خۆی دەربکرێت.[٥]

---

١ هەمان سەرچاوە و لاپەرە.
٢ تفسير الطبري (٩/٢٤-٢٦)، تفسير القرطبي (٥/٣٠٨).
٣ بڕوانە: غزوة الحديبية للحكمي (٢٩٦).
٤ بڕوانە: صور وعبر من الجهاد في المدينة (٢٩٧).
٥ بڕوانە: غزوة الحديبية للحكمي (٣١٣).

٦- پێویستی گوێڕایەڵی و ملکەچی بنوێنرێت بۆ فەرمانەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، با بە ڕوواڵەتیش ناکۆك بێت لەگەڵ پێواندن یان نەفس حەزی پێ نەکات:

لە بەسەرهاتی حودەیبیەدا هاتووە کە عومەری کوڕی خەتتاب و هەندێك لە هاوەڵان حەزیان بەو ڕێککەوتنە نەکرد لەگەڵ قوڕەیش، بەڵام دواتر پەشیمان بوونەوە لەسەر ئەو بۆچوونەیان، چونکە چۆن دەبێت بە شتێك ناڕازی بن پێغەمبەر(ﷺ) پێی ڕازییە، ئەمەیش بوو بە دەرسێك بۆیان و، عومەری کوڕی خەتتاب ڕەزای خوی لێ بێت دەیفەرموو: خەڵکینە بۆچوونی خۆتان بە هەڵە بزانن، من بە بۆچوونی خۆم فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ)م ڕەتکردەوە لە حودەیبیە، سوێند بە خوا لە هەق لانادەم جارێکی تر، ئینجا عومەر تا ماوەیەکیش هەر دەترسا سزای خوای گەورەی لەسەر دابەزێت بە هۆی ئەو کردارەی لە ڕۆژی حودەیبیە ئەنجامیدا.

دەشیفەرموو: من لەو ڕۆژەوە هەر ڕۆژوو دەگرم و خێر دەکەم و کۆیلە ئازاد دەکەم لە ترسی ئەو قسەی کە کردم، تاکو ئومێدم پەیدا کرد خوا لێم خۆش بێت.[١]

(ابن الدیبع الشیبانی) پەراوێزی داناوە لەسەر ئەم ڕووداوە و وتوویەتی: زانایان وتوویانە: ئاشکرایە لەم بەسەرهاتە کە پێویستە گوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بکرێت و ملکەچی بۆ فەرمانی بنوێنرێت با کەسەکە حەز لەو فەرمانەیش نەکات، پێویستە لەسەر هەموو داوالێکراوێك باوەڕی وا بێت کە چاکە لەوەدایە کە فەرمانی پێدەکرێت، بۆ دونیا و دواڕۆژی، بەڵام زۆر کەس ناتوانێت دەرك بەو ڕاستیە بکات.[٢]

## سێیەم: نموونەیەك لە پەروەردەکردنی پێغەمبەر(ﷺ).

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت:((من یصعد الثنیة ثنیة المرار، فانە یحط عنە ما حط عن بني اسرائیل))،[٣] واتە: هەر کەسێك سەرکەوێتە سەر(ثنیة المرار) خوای گەورە لەسەر بەنی ئیسرائیل لایداوە، لەسەر ئەویش لایدەدا. لە فەرموودەدا لایەنێکی گەورە لە لایەنەکانی پەروەردەی پێغەمبەر(ﷺ) دەردەکەوێت شایانی

١ بڕوانە: حدائق الانوار ومطالع الاسرار (٢/٦٢٢).
٢ بڕوانە: مرویات غزوة الحدیبیة (٣١٥).
٣ مسلم، کتاب صفات المنافقین (رقم ٢٧٨٠).

تێرامانە، جا کاتێك لێی ورد دەبینەوە، هەندێ واتای مەزنمان بۆ دەردەکەوێت:

١- پێغەمبەر(ﷺ) دەیەوێت دڵی هاوەڵان ببەستێتەوە بە دوا ڕۆژەوە لە هەموو ساتێك لە ساتەکانی ژیانیان.

٢- دەیەوێت سەرنجیان ڕابکێشێت کە هەموو جوڵەیەکیان پێویستە بقۆزێتەوە بۆ توێشووی ئەو ڕۆژەیان، هەمیشە هەوڵیشی دەدا ئەو واتایانە لە دڵ هاوەڵانیدا بچێنێت، لە شوێنێکی تردا دەفەرمووێت:((وفي بضع احدكم صدقة))... واتە: یەکێك لە ئێوە بچێتە لای خێزانەکەی خۆیشی هەر چاکە و پاداشتی دەست دەکەوێت، وتیان: ئایا لە حەزو ئارەزووی خۆیشماندا خێرمان دەست دەکەوێت؟ فەرمووی: پێم بڵێن ئەگەر بچوبایەتە لای ئافرەتێکی قەدەغەکراو گوناهبار نەدەبوو؟ بۆیە کە دەچێتە لای ئافرەتی حەڵاڵی خۆیشی چاکەی دەست دەکەوێت.[1]

ئەم واتایانە – ئەگەر جێگیر دەبێت لە دڵی موسڵمانانندا – دەستەبەرە بۆ ئەوەی هەموو ژیانی ڕەنگ بکات بە ڕەنگی بەندایەتی، چونکە ئەگەر خواپەرستی هەموو ژیانی موسڵمان بگرێتەوە شوێنەوارێکی پیرۆزی دەبێت، تاکو لە خۆیدا هەستی پێدەکات و، لە دەوروبەریشیدا دەبینێت.[2]

دیارترین ئەو شوێنەوارانەش بریتین لە:

أ- ژیانی موسڵمانان بە ڕەنگی خواپەرستی ڕەنگ دەکات و، بەرەو لای خوای گەورە ڕایدەکێشێت، ئەوەش وای لێدەکات سووربێت لەسەر کاری چاکەو هەمیشە کردەوە چاکەکانی زیاد دەکات لە لای خوای گەورە و، هەروەها هانی دەدا بۆ ئەوەی کردەوەکانی دونیایش چاکتر بکات.

ب- لایەنو یەك مەبەستی دەبەخشێتە موسڵمان لە هەموو ژیانیدا، قایل دەبێت بە یەك خوا و لە هەموو کارەکانیدا ڕوودەکاتە ئەو خوایە و، هەست ناکات بە دابەش بوون و ململانێ.[3]

---

١ مسلم كتاب الزكاة (٥٣).
٢ بڕوانە: مرويات غزوة الحديبية (٣١٥).
٣ بڕوانە: العبادة في الاسلام للقرضاوي (٦٦).

هاوەڵە بەڕێزەکان لەو واتایانەدا ژیان و کردیان بە ڕاستی هەست پێکراو لە خۆیاندا، هەر بۆیە خوای گەورەیش ژیاننامەی ئەوانی پاراستووە بۆمان بۆ ئەوەی پەیڕەوییان لێ بکەین و ببنە بەڵگە لەسەر هەموو ئەوانەی دوای خۆیان دێن.[١]

١ بڕوانە: مرويات غزوة الحديبية (٣١٦)، لەم کتێبە سوودی زۆرم وەرگرتووە، هەروەها (صلح الحديبيـة)ی باشميل و، ابو فارس، ئەم کتێبانە کۆڵەکەی ئەم بەشەی کتێبەکەم بوون لەگەڵ هەندێ سەرچاوەی ترشیدا..

# بەشی چواردەیەم

# گرنگترین ڕووداوەکانی نێوان حودەیبیە و فەتحی مەککە

## باسی یەکەم: غەزای خەیبەر

### یەکەم: مێژوو و هۆکارەکانی.

(ابن اسحق)[1] دەڵێت لە موحەڕڕەمی ساڵی حەوتەمی کۆچیدا بووە،(الواقدي)[2]یش دەڵێت لە صەفەر یان لە ڕەبیعی یەکەمی ساڵی حەوتەمی کۆچیدا بووە، پاش گەڕانەوەی لە غەزای حودەیبیە،(ابن سعد)[3]یش پێی وایە لە جومادی یەکەمی ساڵی حەوتەمی کۆچیدا بووە، هەروەها پێشەوا(الزهري و مالك) دەڵێن لە موحەڕڕەمدا[4] بووە،(ابن حجر)[5]یش ئەو بۆچوونەی پەسەند کردووە.

جوولەکەکانی(بني النضير) نەچوونە ناویان ، کە ئەوان زۆر قورس بوو لەسەریان دەرکران لە مەدینە، چونکە دەرکردنیان بەس نەبوو بۆ ئەوەی دڕکیان بشکێت، کاتێکیش دەرچوون ژن و ماڵ و منداڵەکانیان لەگەڵ خۆیان برد، گۆرانی بێژەکانیش لە پشتیانەوە دەف و زوڕنایان لێدەدا لە خۆنواندنێکدا کە شتی وا نەبینرابوو لەو سەردەمەدا.[6]

گەورەترین سەرگەورەکانیشیان، کە چوونە خەیبەر(سلام بن ابي الحقيق) و(كنانة بن ابي الحقيق) و(حيي بن اخطب) بوون، کاتێك چوونە ئەوێ خەڵکی

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٣/٤٥٥).
٢ المغازي (٢/٦٣٤).
٣ طبقات ابن سعد (٢/١٠٦).
٤ تاريخ دمشق لأبي عساكر (١/٣٣).
٥ الفتح (١٦/٤١)، السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٥٠٠).
٦ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (١/٣١٩).

ئەوانیان کرد بە سەرگەورەی خۆیان،[1] ئەوەندەش بەس بوو بۆ ئەوەی ئەوان ڕابکێشنە نێو ململانێ و تۆڵەکردنەوە لە موسڵمانان، ئەوان هەوڵێکی زۆریان دەدا بگەڕێنەوە جێگە و شوێنەکانی خۆیان، هەر بۆیە بەشداریشیان کرد لە غەزای ئەحزابدا دژ بە موسڵمانان، هەروەها هەوڵیاندا(قريظة) قایل بکەن بە هاوکاری ئەحزابەکان،[2]بەم شێوەیش خەیبەر بووە سەرچاوەیەکی ترسناکی گەورە بۆ دەوڵەتی ئیسلامی تازەپێگەیشتوو، موسڵمانان لە پاش حودەیبیە یەکلا بوونەوە بۆ لەناوبردنی مەترسی جوولەکەی خەیبەر کە هەڕەشەیان دەکرد لە هێمنی موسڵمانان، لە ڕاستیشدا سورەتی فەتح کە پاش حودەیبیە دابەزی بەڵێنێکی تیادا بوو بە فەتحکردنی خەیبەر و دەستگرتنە سەر ماڵەکانیان،[3] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَعَدَكُمُ ٱللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِۦ وَكَفَّ أَيْدِىَ ٱلنَّاسِ عَنكُمْ وَلِتَكُونَ ءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ وَيَهْدِيَكُمْ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢٠﴾ وَأُخْرَىٰ لَمْ تَقْدِرُوا۟ عَلَيْهَا قَدْ أَحَاطَ ٱللَّهُ بِهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرًا﴾(الفتح: ٢٠-٢١).

## دووەم: ڕێکردنی سوپای ئیسلام بەرەو خەیبەر.

سوپا بە گیانێکی بیروباوەڕی بەهێزەوە بەڕێکەوت، سەرەڕای ئەوەی دەیانزانی کە قەڵاکانی خەیبەر چەند قایمن و، هێزیشیان چەند زۆرە، موسڵمانان(الله اكبر) و(لا اله الا الله)یان دەکرد بە دەنگی بەرز، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموون: کە لەسەرخۆ بن، چونکە ئێوە بانگی کەڕ نا ئامادەبوو ناکەن بەڵکو هاوار بۆ(السميع البصير )دەکەن.[4]

ڕێکردنی سوپا بە شەو بوو، سەلەمەی کوڕی ئەکوەع دەفەرموێت: لەگەڵ

---

١ هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.
٢ هەمان سەرچاوە و لاپەڕە
٣بڕوانە: نضرة النعيم (٣٤٩/١).
٤البخاري كتاب الدعوات رقم (٦٣٨٤).

پێغەمبەر(ﷺ) دەرچووین بە شەو، عامیری کوڕی ئەکوەعیش بە هۆنراوە دەیوت:

اللهم لو لا انت ما اهتدينا ولا تصدقنا ولا صلينا

فاغفر فداء لک ما اتقينا وثبت الاقدام ان لاقينا

والقين سكينة علينا انا اذا صيح بنا اتينا

وبالصياح عوّلوا علينا[١]

پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری کرد، ئەو کەسە کێیە ؟

وتیان: عامیری کوڕی ئەکوەع.

فەرمووی: ڕەحمەتی خوای لێ بێت.

کاتێك سوپای ئیسلامی گەیشتە(الصهباء) لە خوارووی خەیبەر، نوێژی عەصریان کردو خواردنیان هێنا، تەنها خورما بوو، ئیتر تەریان کرد و پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی لێیان خوارد، پاش ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بۆ نوێژی شێوان و ئاوی ڕادا لە دەمی و نوێژی بە هاوەڵان کرد و دەست نوێژی نەگرتەوە.[٢]

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) عەببادەی کوڕی بیشری ناردبوو لە پۆلێکی سەربازیدا بۆ پەی بردن بە هەواڵی دوژمن، لە ڕێگەی تووشی پیاوێك بوو سیخوڕی جوولەکە بوو لە هۆزی ئەشجەع، عەبباد پێی وت: ئایا هەواڵی خەیبەر دەزانی؟ وتی: بەڵێ تازە لەوێوە هاتووم، ئینجا باسی ئامادەباشی ئەوانی کرد بۆ جەنگ و هاوپەیمانیشیان لەگەڵ غەتەفان و گوایە چەکدارێکی زۆری ئەوان بە سەرکردایەتی عوتبەی کوڕی بەدر چوونەتە نێو قەڵاکانەوە کە خۆی دە هەزار جەنگاوەری تێدایەو خواردەمەنی زۆری تیایە بەشی چەند ساڵێك دەکات، عەببادە قامچیەکەی بەرزکردەوە و چەند قامچیەکی لێیدا، وتی: تۆ سیخوڕی ئەوانی، ڕاستم پێ بڵێ، ئەگینا لە گەردنت دەدەم، ئینجا وتی: ئەوان تۆقیون، زۆر دەترسن ئەوەی بەسەر جوولەکەکانی

---

١ـهەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

٢ـبڕوانە: فتح الباري (٧/٤٦٦).

مەدینەدا هات، بەسەر ئەوانیشدا بێت، منیشیان ناردووە بۆ ئەوەی هەواڵی هێزو ژمارەتانیان بۆ ببەمو داوایان لێکردم زوو بگەڕێمەوە لایان.[١] کاتێک سوپای موسڵمانان گەیشتنە دەوروبەری خەیبەر، پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵانی فەرموو: ڕاوەستن، ئینجا فەرمووی: خوایە تۆ پەروەردگاری ئاسمانەکانو ئەوەشی دایدەپۆشن، پەروەردگاری زەوییەکانیو ئەوەشی هەڵیدەگرن، پەروەردگاری شەیتانەکانیو ئەوانەش کە گومڕایان دەکەن، پەروەردگاری ڕەشەباو ئەوەشی کە لەگەڵ خۆی دەیبات، داوای چاکەی ئەم گوندەت لێ دەکەین، چاکترینی خەڵکەکەیو ئەوەشی کە تیایدایە، پەنایشت پێ دەگرین لە خراپەیو خراپەی دانیشتووەکانی، پێشکەون بە ناوی خواوە. بچووبایەتە هەر ناوچەیەکیشەوە ئەمەی دەفەرموو.[٢]

شەو داهات و پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە سوپاکە بنون لە جێگایەکی نزیکی خەیبەر، سەر لە بەیانی زوویش ئاگایان بوویەوە و سەربازگەکەیان دامەزراند لە لای دۆڵی ڕەجیع لە نێوان خەیبەر و غەتەفان، بۆ ئەوەی ڕێگەی یارمەتیدانی غەتەفان ببڕن بۆ خەیبەر.[٣]

کە ڕۆژ بوویەوە جوولەکە بە بێڵ و کەرەستەکانیان دەرچوون و، کاتێک سوپاکەیان بینی، وتیان: موحەممەد و سوپاکەی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((الله اكبر خربت خيبر، انا اذا نزلنا بساحة قوم فساء صباح المنذرين))،[٤] واتە: گەورەیی بۆ خوا، خەیبەر وێران بوو، ئێمە ئەگەر دابەزینە گۆڕەپانی کەسانێك، ئیتر ڕۆژی هەڕەشە لێکراوان ڕۆژێکی سەخت و خراپ دەبێت.

---

١ المغازي للواقدي (٢/٦٤٠-٦٤١).
٢ المستدرك (٢/١٠٠)، الحاكم، حديث صحيح الاسناد واقره الذهبي.
٣ بڕوانە: الصراع مع اليهود (٢/٤٥).
٤ البخاري كتاب الاذان رقم (٦١٠).

## سێیەم: باسی کەوتنی قەڵاکانی خەیبەر.

جوولەکەکان هەڵاتن بۆ قەڵاکانیان و موسڵمانان ئابلۆقەیان دان، ئینجا توانیان قەڵاکانیان یەك بە دوای یەکدا بکەوێنن و دەست بگرنە سەریدا.....[١]

لە ڕاستیدا موسڵمانانیش تووشی بەرگرییەکی سەخت بوون لە کاتی فەتح کردنی قەڵاکاندا، وەکو قەڵای ناعیم کە مەحمودی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاڕی تیادا شەهید بوو، لە لایەن مەرحەبەوە کە دەستاڕێکی فڕێدایە سەری لە قەڵاکەوە، دەست بەسەراگرتنی ئەو قەڵایەیش دە ڕۆژی خایاند.[٢] پێش کردنەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: سبەینێ ئاڵاکە دەدەمە دەست کەسێکەوە خوا و پێغەمبەری خوا خۆشیان دەوێت، ئەویش خوا و پێغەمبەری خوای خۆش دەوێت، ناگەڕێتەوە تاکو قەڵاکە فەتح نەکات، ئیتر بۆ ڕۆژی سێیەم عەلی کوڕی ئەبو تالیبی بانگ کرد و ئاڵاکەی پێی دا و توانی قەڵاکە بکاتەوە،[٣] عەلی چاوی ئازاری دەدا، بەڵام کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کرد تفی لە ناو چاوی کرد و دوعای بۆ کرد، ئیتر چاك بوویەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ڕاسپاردەی کرد بە عەلی بانگیان بکات بۆ ئیسلام ئەمجار هێرش بکاتە سەریان، ئەگەریش شایەتمانیان هێنا ئیتر خوێن و ماڵیان پارێزراو دەبێت و لێپرسینەوەیان لە لای خوایە.[٤]

کاتێك گەمارۆی ئەو قەڵایەیان دا، پاڵەوانێکیان هەبوو ناوی مەرحەب بوو، دەرکەوت و بوو بە هۆی شەهید بوونی عامیری کوڕی ئەکوەع، ئینجا عەلی شمشێربازی لەگەڵ کرد و کوشتی،[٥] دەشڵێن موحەممەدی کوڕی مەسلەمە کوشتوویەتی، ئەمەیش بوو بەمایەی دابەزینی وەرەی جوولەکە و تێکشکانیان،[٦] کۆمەڵێك ریوایەتیش هەن باس لەوە دەکەن عەلی(ﷺ) دەرگایەکی گەورەی

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٥٠١).

٢ بڕوانە: الواقدي (٢/٦٥٧).

٣ المستدرك (٣/٣٧)، وصححه الحاكم، ووافقه الذهبي.

٤ مسلم (٢/١٨٧٢) رقم (٢٤٠٦) و (٢٤٠٥).

٥ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٥٠٢).

٦ هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

هەڵگرتووە وەكو قەڵغان، بەلام ئەو هەواڵانە هەموویان لاوازن، ئەوەش ناگەیەنێت كە عەلی ئازا نەبووبێت، چونكە بەڵگە زۆرە لەسەر ئازایەتی.[1]

موسڵمانان لە پاش كردنەوەی قەلای ناعیم قەلای(الصعب)یان كردەوە، پاش سێ ڕۆژ، كە خواردن و كەلوپەلی زۆریان تیادابوو، ئینجا چوون بەرەو قەلای(قلعة الزبیر) و گەمارۆیان دا و ئاویان لێ بڕی، بۆیە ناچار بوون دابەزن بۆ شەڕكردن و لە پاش ڕۆژ ئەوانیش بەزێنران، ئینجا ڕۆیشتن بەرەو قەلاكانی ناوچەی(الشق) قەلاكانیان كردەوە تاكو گەیشتنە قەلای(السلالم) و گەمارۆیاندا ماوەی چواردە ڕۆژ تاكو داوای ئاشتیان كرد.[2]

بەم شێوەیش خەیبەر بە هێز كرایەوە، بەپێی ئەو ڕووداوانەی باسمان كرد و، ئەویش كە لە بوخاری[3] و موسلیم[4] و ئەبو داود[5]دا هاتووە كە پێغەمبەر(ﷺ) خەیبەری بەهێز فەتح كرد.

پاش فەتح كردنی خەیبەر، خەڵكی فەدەك بە پەلە هاتن بۆ داوای ئاشتی، ماڵ و سامانیشیان هێنا و پێغەمبەر(ﷺ) ڕازی بوو لەسەر داواكارییەكەیان،[6] بۆیە فەدەك تەنها بۆ پێغەمبەر(ﷺ) بوو، چونكە ئەسپ و كاروانی تیا بەكارنەهێنرا، لە پاش ئەوە موسڵمانان(وادي القرى)یان ئابلۆقەدا، كە بریتی بوون لە كۆمەڵە لادێیەك لە نێوان خەیبەر و(تیماء لیالي)[7]دا، ئینجا خۆیان بە دەستەوە دا، موسڵمانانیش ماڵێكی زۆریان لەوێ دەست كەوت و زەوی و دارخورماكانیان دایە دەست خودی جوولەكەكان و، وەكو خەیبەر لەگەڵ ئەمانیشدا ڕێككەوتن.[8]

بەم شێوەیش قەلاكانی جوولەكە خۆیان نەگرت بەرامبەر هێزی موسڵمانان و، كوشتاری جوولەكە گەیشتە نەوەد و سێ كەس لە خەیبەردا و، ئافرەت و

---

١ السيرة النبوية الصحيحة (١/٣٢٤).
٢ الواقدي (٢/٦٥٨-٦٧١).
٣ السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٥٠٤).
٤ مسلم (٣/١٤٢٧) رقم (١٣٦٥).
٥ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٥٠٤).
٦ بڕوانە: المغازي للواقدي (٢/٦٩٩).
٧ بڕوانە: تاريخ خليفة ٨٥ نقلا عن ابن اسحاق.
٨ زاد المعاد (٣/٣٥٤-٣٥٥).

منداڵەکانیشیان بە کۆیلە گیران، یەکێك لەوانەش صەفییە بوو، کە پێغەمبەر(ﷺ) ئازادی کرد و کردی بە هاوسەری خۆی.[١]

بە پێی ڕیوایەتی(ابن اسحاق) بیست کەس لە موسڵمانان شەهید بوون،[٢] پانزە کەسیش بە پێی ڕیوایەتی(الواقدی).[٣]

## چوارەم: ئەعرابی شەهید و، شوانە ڕەش پێستەکە و، پاڵەوانێکیش بەرەو دۆزەخ.

### ١- ئەعرابی شەهید:

یەکێك لە عەرەبە بیابانشینەکان هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و باوەڕی پێی هێنا و، شوێنی کەوت، پێغەمبەر(ﷺ) ڕاسپاردەی ئەوی دایە دەست هەندێك لە هاوەڵانی، لە کاتی غەزای خەیبەردا، پێغەمبەر(ﷺ) پشکی ئەویشی دەستنیشان کرد، بەڵام ئەو هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ)و وتی: من لەسەر ئەمە بەیعەتم پێت نەداوە، بەڵکو لەسەر ئەوە بەیعەتم پێتداوە، ئا لێرەوە لێبدرێم و، دەستی برد بۆ گەردنیو بمرم و بچمە بەهەشتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر ڕاست بکەیت خوای گەورە ئەو ئاواتەت بەدی دەهێنێت، ئینجا هەڵسا بۆ شەڕی دوژمن و بە کوژراوی هێنایانەوە لای پێغەمبەر(ﷺ)، فەرمووی: هەر خۆیەتی؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: ڕاستی کرد لەگەڵ خوای خۆی، ئیتر هەر بە پۆشاکەکەی بەری خۆی پێغەمبەر(ﷺ)کفنی کرد و نوێژی لەسەر کرد و فەرمووی: خوایە ئەمە بەندەکەی تۆیە لە پێناو تۆ کۆچی کرد، بە شەهیدی کوژراوە و، منیش شایەتم لەسەری.[٤]

---

١ بروانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٥٠٤)، مسلم، كتاب النكاح (٢/١٠٤٥).

٢ السيرة النبوية الصحيحة (١/٣٢٧).

٣ بروانە: المغازي (٢/٧٠٠).

٤ اخرجه النسائي (٤/٦٠)، والطحاوي في شرح معاني الاثار (١/٢٩١)، والحاكم (٣/٥٩٥)، والبيهقي (٤/١٥-١٦) واسناده صحيح نقلا عن زاد المعاد (٣/٣٢٤).

**٢- شوانە ڕەش پێستەکە:**

کۆیلەیەکی حەبەشی ڕەش پێست لە خەڵکی خەیبەر هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ)، کە شوان بوو لە لای سەرگەورەکەی، کە خەڵکی خەیبەری بینی شمشێریان هەڵگرتووە پرسیاری لێ کردن، وتیان: شەڕ لەگەڵ ئەو کەسە دەکەین کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات، ئەویش مەڕەکانی برد چووە لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: چی دەڵێیت و خەڵکی بۆچی بانگ دەکەیت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بانگی خەڵکی دەکەم بۆ ئیسلام و، شایەتمان هێنان و نەپەرستنی هیچ کەسێك جگە لە خوای گەورە، وتی ئەگەر وامکرد، چیم دەست دەکەوێت، فەرمووی: ئەگەر لەسەر ئەوە بمریت بەهەشتت دەست دەکەوێت، ئەویش موسڵمان بوو، وتی: ئەو مەڕانە ئەسپەردەن لە لام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: لە(حصباء) وازیان لێ بهێنە خۆیان دەگەڕێنەوە لای خاوەنەکەی، ئیتر هەر لەو جەنگەدا ئەو شوانە کوژرا و شەهید بوو بێ ئەوەی سەجدەیەك بۆ خوا ببات.[١]

**٣- پاڵەوانە، بەڵام بەرەو دۆزەخ:**

لە سوپای موسڵمانانلدا لە خەیبەر پیاوێك بوو زۆر نەبەرد بوو، بە دوای جوولەکەکاندا دەڕۆیشت و بە شمشێر لێی دەدان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((أما انە من أهل النار)) واتە: ئەو پیاوە دۆزەخییە، موسڵمانان وتیان: کاممان بەهەشتین ئەگەر ئەو دۆزەخی بێت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەرگیز لەسەر ئەو حاڵە نامرێت، پاشان بریندار بوو بە سەختی و پەلەی مردنی کرد و مشتی شمشێرەکەی لەسەر زەوی دانا و نووکەکەی لەسەر سنگی خۆی دانا و خۆی کوشت، پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: شایەتی دەدەم تۆ پێغەمبەری خوای، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: پیاوی وا هەیە بە ڕواڵەت کارەکانی کاری خەڵکی بەهەشتە و، خۆیشی دەچێتە دۆزەخەوە، یان بە کرداری خەڵکی دۆزەخ کار دەکات خۆیشی خەڵکی بەهەشتە.[٢]

---

١ بڕوانە: زاد المعاد (٣/٣٢٢-٣٢٤)، السيرة الحلبية (٣/٣٩)..

٢ البخاري كتاب المغازي، باب غزوة خيبر رقم (٤٢٠٧).

## پێنجەم: هاتنەوەی جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب و هاوەڵانی لە حەبەشەوە.

گەڕانەوەیان لە ڕۆژی خەیبەردا بوو، پێغەمبەر(ﷺ) باوشی بە جەعفەردا کرد و نێوچەوانی ماچکرد، فەرمووی:((ما ادري بأيهما انا اسر بفتح خيبر ام بقدوم جعفر))، واتە: نازانم بە کامیان دڵ خۆشتربم، بە فەتحی خەیبەر، یان بە هاتنەوەی جەعفەر، پێغەمبەر(ﷺ) پێشتر(عمرو بن امية الضمري) ناردبوو بە دوایاندا لە لای نەجاشی و ئەویش لە دوو کەشتیدا ناردبوونیەوە و، هاتنەوەیان هاوکات بوو لەگەڵ فەتحی خەیبەر، ئەبو موسا و هاوەڵانیشی هەر لەگەڵ جەعفەر گەڕانەوە،[1] ئەبو موسا دەفەرمووێت: لە یەمەن بووین هەواڵمان پێگەیشت پێغەمبەر نیازی دەرچوونی هەیە بۆ خەیبەر، ئیتر ئەبو موسا و پەنجا و دوو یان پەنجا و سێ کەس لە خزمانی سواری کەشتی بوون و چوون بۆ لای نەجاشی لە حەبەشە و لەگەڵ جەعفەر پێکەوە گەڕانەوە لە کاتی فەتحی خەیبەر.[2]

جەعفەر و هاوەڵانی زیاتر لە دە ساڵ لە حەبەشە مانەوە، لەو ماوەیەدا قورئانی زۆر دابەزی و، جەنگی زۆر دروست بوو لەگەڵ بێباوەڕاندا و، باروودۆخی زۆر هاتە سەر موسڵمانانداا لەو چەند ساڵە، تەنانەت هەندێك وایاندەزانی کۆچکردوانی حەبەشە پلە و پایەیان کەمترە لەمان، چونکە ئامادەی ئەو هەموو ڕووداوانە نەبوونە.[3]

ئەبو موسا دەفەرمووێت: جارێك(اسماء بنت عميس) چووە لای حەفصەی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) و لەو کاتە عومەر هات(ﷺ) و، فەرمووی: ئەوە ئەسمائی حەبەشی دەریاییە؟ ئینجا وتی: ئێمە لە ئێوە مافدارترین بە پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەسماء وتی: نە بە خوا وانییە، ئێوە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوون برسیتانی تێر دەکرد و، نەفامتانی ئامۆژگاری دەکرد، ئێمەیش لە وڵاتی دووریی و ناخۆشی بووین لە حەبەشە! هەمووشی لەبەر خوا و پێغەمبەری خوا بوو، سوێند بە خوا خواردن و

---

١ بڕوانە: معين السيرة (٣٥٣).

٢ البخاري كتاب المغازي، باب غزوة خيبر رقم (٤٢٣٠).

٣ بڕوانە: فقه السيرة للغزالي (٣٥٠).

خواردنەوە ناخۆم تاکو ئەم قسەت وەکو خۆی نەگەیەنم بە پێغەمبەری خوا(ﷺ)، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((ليس بأحق بي منكم، وله, ولاصحابه هجرة واحدة، ولكم انتم واهل السفينة – هجرتان))،[1] واتە: ئەو بە من مافدارتر نیە، خۆی و هاوەڵانی یەك كۆچیان بۆ نووسراوە، بەڵام ئێوەی كۆمەڵی كەشتی دوو كۆچتان بۆ نووسراوە.

ئینجا ئەسما ئەم نیشانەی ڕێزلێگرتنەی وەرگرت و دابەشی کردە سەر ئەندامانی نێردەکە،[2] کە پۆل پۆل دەچوونە لای پرسیاری ئەو فەرموودەیان لێ دەکرد، هیچ شتێکیش نەبوو لەسەر زەویدا لەو قسانەی پێغەمبەر(ﷺ) خۆشەویستتر بێت بە لایانەوە..[3]

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) پشکی بۆ دیاری کردن لە خەیبەر پاش ئەوەی داوای مۆڵەتی کرد لەو هاوەڵانەی بەشداریان کردبوو.[4]

## شەشەم: دابەشکردنی دەستکەوتەکان.

١- دەستکەوتی غەزای خەیبەر لە هەموو غەزاکانی تر زۆرتر بوو، لە ڕووی زەوی و دارخورما و پۆشاك و خۆراك و شتی تر، وەکو لە کتێبەکانی سیرەدا هاتووە دەستکەوتەکان لەمانەی خوارەوە پێکدەهاتن:

أ- خۆراك: ڕۆن و هەنگوین و خواردنی زۆری تیابوون پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەی دا لەو خواردنانە بخورێت و پێنج یەکی لێ نەبرد.[5]

ب- پۆشاك و ناوماڵ و وشتر و مانگا و مەڕ، پێغەمبەر(ﷺ) پێنج یەکی لەوانە بۆ خۆی جیاکردەوە و، دووبارە، چوار بەشی لەو برە گێڕایەوە سەر جەنگاوەرەکاندا.

ج- کۆیلە: ئافرەتانی جوولەکە کران بە کۆیلە و دابەش کرانە سەر موسڵماناندا، چونکە ئەوەیش هەر حوکمی دەستکەوتی هەیە.

---

١ البخاري كتاب المغازي، باب غزوة خيبر رقم (٤٢٣١).
٢ بڕوانە: فقه السيرة للغضبان (٥٣٥).
٣ مسلم فضائل الصحابة رقم (٢٥٠٢، ٢٥٠٣).
٤ بڕوانە: الصراع مع اليهود لأبي فارس (٣/٩٦).
٥ بڕوانە: الصراع مع اليهود لأبي فارس (٣/١٤٠).

د- زەوی و دارخورماکان، پێغەمبەر(ﷺ) دابەشی کرد بە سی و شەش بەشەوە، بۆ هەر بەشێکیش سەد بەشی کۆکردەوە، بوو بە سێ هەزار و شەش سەد بەش، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان نیوەیان بەرکەوت و، نیوەکەی تر دانرا بۆ کاروباری نائاسایی موسڵمانان.[1]

هـ- لە نێو دەستکەوتەکاندا، هەندێ لاپەڕەی تەورات هەبوو، جوولەکەکان داوایان کردەوە، پێغەمبەر(ﷺ) بۆی گەڕاندنەوە و، کرداری ڕۆمان و گاورەکانیشی دووبارە نەکردەوە، کاتێك ئورشەلیم و ئەندەلوسیان داگیرکرد هەرچی کتێبە پیرۆزەکان هەیە سووتاندنیان.[2]

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) جوولەکەکانی خەیبەری هێشتەوە لەسەر کشتو کاڵەکان، لە ماڵی خۆیان خەرج بکەنە سەری و نیوەی بەروبوومەکەی بۆ خۆیان بێت، بە مەرجێك موسڵمانان هەر کاتێك بیانەوێت دەریان بکەن، جوولەکە خۆیشیان ئەم پێشنیارەیان کردبووە سەر پێغەمبەر(ﷺ) و وتیان: ئێمە لە ئێوە شارەزاترین بەم خاکە، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) ڕازی بوو پاش ئەوەی خەریك بوو دەریان بکات،[3] مەرجیشی کرد لەگەڵیان هەر کاتێك ویستی دەریان بکات، ئەمەیش لێهاتوویییەکی سیاسی نوێبوو پێغەمبەر(ﷺ) بەکاریهێنا، چونکە مانەوەی جولەکەکان لەسەر زەوییەکانیان ژمارەیەکی زۆری لە موجاهیدە موسڵمانەکانی هێشتەوە، لە لایەکی تریشەوە ئەوان شارەزاتر بوون بۆ کێڵانی زەوییەکانیان، مانەوەیان بەروبوومێکی باشتری دەستەبەر دەکرد، بەرامبەر نیوەی بەرهەمی زەوییەکە کەم بێت یان زۆر.

بەم شێوەیش پێغەمبەر(ﷺ) ملکەچ بوونیانی دەستەبەر کرد، چونکە دەیانزانی ئەگەر زیانێك بە موسڵمانان بگەیەنن لێی دەردەکرێن و جارێکی تر ناگەڕێنەوە ناوی.

ئەوەش لە ڕاستیدا ڕوویدا لە سەردەمی سەرگەورەماندا عومەری کوڕی خەتتاب(ﷺ)، کاتێك دەست درێژیان کردە سەر عەبدوڵای کوڕی عومەر و هەردوو

---

١ هەمان سەرچاوە (٣/١٤١-١٤٢).

٢ السيرة النبوية لأبي شهبة (٢/٤١٩).

٣ السيرة النبوية الصحيحة (١/٣٢٨).

دەستیان دەرهێنا لە مەچەکییەوە، پێشتریش عەبدوڵای کوڕی سەهلیان کوشتبوو، جا کاتێك عومەر بە تەواوی ناپاکیانی بۆ دەرکەوت فەرمانی کرد بە دەرکردنیان.[١]

جوولەکەی خەیبەر هەوڵیان دا ئاڵتوون و زیوەکانیان بشارنەوە، پێستەکانی حویەی کوڕی ئەختەبیشیان شاردەوە، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری کرد لە مامی حویەی دەربارەی ئەو پێستانە، ئەویش وتی: لە شەڕەکاندا خەرج کرا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((العهد قريب والمال اكثر من ذلك))، واتە: ماوەکە زۆر نییەو ماڵەکەش لەوە زیاترە ، ئینجا دایە دەستی زوبەیری کوڕی عەووامەوە و هەندێ ئازاری پێگەیاند، حویەی کاتێك لە ژیاندا بوو چووبووە ناو کەلاوەیەکەوە، مامەی وتی: ئەوم بینی دەچووە ناو ئەو کەلاوەوە، ئەوانیش ڕۆیشتن و لەوێ دۆزیانەوە.[٢]

پاش ئەو ڕێککەوتنەی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ جوولەکەی خەیبەر، عەبدوڵای کوڕی ڕەواحەی دەنارد بۆ ژماردن و مەزەندەکردنی، ئەوانیش سکاڵایان کرد لە لای پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە توندی و سەختی مەزەندەکردنەکەی، ویستیشیان بەرتیلی پێ بدەن، ئەویش فەرمووی: ئەی دوژمنانی خوا دەتانەوێ حەرامم دەرخوارد بدەن؟ سوێند بە خوا لە لای خۆشەویسترین کەسمەوە هاتووم، ئێوەش لە هەموو کەس زیاتر لە لام قێزەونن، لە مەیمون و بەرازیش زیاتر بەڵام ئەو ڕقەم وام لێناکات دادگەر نەبم لەگەڵتاندا، وتیان: بەمە ئاسمانەکان و زەوی ڕاوەستاون.[٣]

خەیبەر بوو بە موڵکی موسڵمانان و سەرچاوەیەکی گرنگ بۆیان، ئیبنوعومەر(ﷺ) دەڵێت: تێر نەبووین تاکو خەیبەر فەتح کرا،[٤] بارودۆخی ئابووریش پاش خەیبەر چاك بوو، کۆچکارانیش هەرچی دارخورمای ئەنصارەکان هەیە گێڕایانەوە.[٥]

---

١ تأملات في سيرة الرسول، عمر سيد الوكيل (٢٢٨-٢٢٩).
٢ تاريخ الاسلام، المغازي (٤٢٤).
٣ تاريخ الاسلام، للذهبي، المغازي (٤٢٤).
٤ البخاري، كتاب المغازي، غزوة خيبر رقم (٤٢٤٣).
٥ بڕوانە: معين السيرة (٣٥٢).

## حەوتەم: هاوسەرێتی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ صەفییەی کچی حوییەی کوڕی ئەختەب.

کاتێك موسڵمانان قەڵای(القموص)یان فەتح کرد، صەفییە لە ناو ئافرەتەکاندا بوو، پێغەمبەر(ﷺ) دایە دحیەی کەلبی، ئیتر پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صەفییەی کچی سەرۆکی هۆزەکەت داوەتە فلانە کەس و هەر شیاوی خۆتیشە، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) قسەکەی بە لاوە باش بوو، ئافرەتێکی تری دایە دحیە و صەفییەی بۆ خۆی برد و ئازادی کرد و ئازادکردنەکەشی کرد بە مارەیی بۆی، ئینجا پاش ئەوە پاك بوویەوە لە سوڕی مانگانە مارەی کرد و موسڵمانیش بوو.[1]

پێغەمبەر(ﷺ)لە خەیبەر دەرنەچوو تاکو صەفییە لە عادەتی شەرعی پاك نەبوویەوە، ئینجا لە پشتی خۆی سواری کرد، لە دووری شەش میل لە خەیبەرەوە ویستی لابدات و بیگوێزێتەوە، بەڵام صەفییە ڕازی نەبوو، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) ناڕەحەت بوو بەوە، دواتر لە جێگەیەك پێی دەوترێت(الصهباء) لایانداو ئومموسولەمە هەڵسا بە ئامادەکردنی صەفییە، پێغەمبەر(ﷺ) لەو جێگەیە خێزانی گواستەوە و، پرسیاریشی لێ کرد بۆچی یەکەمجار ڕازی نەبووە بیگوێزێتەوە؟ ئەویش وتی: ترسی جوولەکەکانم بوو لێت، بۆیە صەفییە لە دڵی پێغەمبەر(ﷺ)دا گەورە بوویەوە و، ئینجا وەلیمەیەکی بۆ کرد، و خواردنەکەیش بریتی بوو لە خورما و کەشكو ڕۆن، موسڵمانان کاتێك بینیان پێغەمبەر(ﷺ) خێزانی داپۆشی زانیان کە ئەویش یەکێکە لە دایکانی ئیمانداران.[2]

صەفییەی دایکی ئیمانداران خەونێکی بینیبوو، کە مانگێك دەکەوێتە باوەشی، ئەم خەونەشی بۆ(ابن حقيق) گێڕابوویەوە، ئەویش شەپازللەیەکی لە صەفییە دابوو، پێی وتبوو ئاوات دەخوازی بە مولکی یەسریب.[3]

---

١ السيرة النبوية لأبي شهبة (٢/٣٨٢).

٢ السيرة النبوية لأبي شهبة (٢/٣٨٢).

٣ السنن الكبرى (٩/١٣٨) نقلا عن الصراع مع اليهود (٣/١٠٢).

ئەم خەونەی صەفییە(ڕەزای خوای لێ بێت) بەدیهات و خوای گەورە ڕێزی لێگرت بە هاوسەرێتی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)، کە ئەوپەڕی ڕێزی لێدەگرت و لە لای وشترەکەی دادەنیشت بۆ ئەوەی ئەویش پێی بخاتە سەر ئەژنۆی پێغەمبەر(ﷺ) و سوار بێت، بەڵام صەفییە ئەوەندە بە ئەدەببوو بەرانبەری ئەژنۆی دەخستە سەر ئەژنۆی و سوار دەبوو.[١]

صەفییە(ڕەزای خوای لێ بێت) خۆی چەند بەسەرهاتێکی دەربارەی ڕەوشت جوانی پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت کە بیستبووی عائیشە و حەفصە وتبوویان کە ئەوان لە صەفییە بەڕێزترن لە لای پێغەمبەر(ﷺ) چونکە خێزان و ئامۆزای ئەون، کاتێك صەفییە ئەم قسانەی گەیاندە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی بۆ نەتوت چۆن لە من چاکتر دەبن، مێردم موحەممەدە و باوکم هارونە و مامم موسایە.[٢]

صەفییە زۆر پێغەمبەری خوای خۆشدەویست(ﷺ)، زیاتر لە هەموو کەس و کارەکانی و هەموو خەڵکی و لە خۆیشی، لەو نەخۆشیەی پێغەمبەر(ﷺ) گیانی تیایدا سپارد، صەفییە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەیفەرموو: سوێند بە خوا ئاواتم دەخواست ئەو ئازارەی تۆ لە مندا بوایە، ئیتر لەو کاتە خێزانەکانی(ڕەزای خوایان لێ بێت) چاویان لە یەکتر داگرت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئاو لە دەمتان ڕادەن، وتیان: لە چی؟ فەرمووی: لەو چاو داگرتنەتان، سوێند بە خوا صەفییە ڕاست دەکات.[٣]

یەکێك لەو شتانەش پەیوەندی هەبوو بە هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ صەفییە، لەو شەوەی کە گواستیەوە، ئەبو ئەییوبی ئەنصاری تاکو بەیانی پاسەوانێتی گرت، لە ترس ئافرەتێکی جوولەکە کە هەموو کەس و کاری کوژرابوو نەوەك زیانێك بە پێغەمبەر(ﷺ) بگەیەنێت، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) پاڕایەوە لە خوای گەورە ئەبو ئەییوب بپارێزێت وەکو چۆن ئەو شەوە پاسەوانێتی پێغەمبەر(ﷺ)ی کرد.[٤]

---

١ السيرة النبوية لأبي شهبة (٢/٣٨٤).
٢ بڕوانە: شرح المواهب اللدنية (٢/٢٢٣).
٣ سەرچاوەی پێشوو (٢/٢٣٣).
٤ زاد المعاد (٣/٣٢٨).

ئینجا هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ صەفییە(رضي الله عنها) ڕێزێکی گەورەی تێدا بوو بۆی، چونکە کچی سەرگەورەی خێڵەکەی خۆی بوو، بۆ ئەوەی نەکەوێتە لای کەسێك کە ڕێزی نەزانێت و نەیناسێت، جگە لەوەش دڵنەواییەکی تیادابوو بۆی لە پاش ئەوەی باوك و مێردەکەی و زۆرێك لە خزمانی کوژرابوون، بۆیە لەوە جوانتر نەدەکرا کە پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵی کردی، کەنیزەکێکی صەفییە جارێك چووە لای عومەر(رضي الله عنه) و وتی: صەفییە ڕۆژی شەممەی خۆش دەوێت و چاکە لەگەڵ جولەکەکاندا دەکات، عومەر پرسیاری لێکرد و صەفییە فەرمووی: سەبارەت بە ڕۆژی شەممە خۆشەویستیم بۆی نەماوە دوای ئەوەی خوای گەورە ئەو ڕۆژەی بۆ گۆڕیمەوە لەگەڵ جومعە، سەبارەت بە جولەکەیش خزمی تیایە و چاکەیان لەگەڵ دەکەم، ئینجا بە کەنیزەکەکەی وت: بۆ وات وت: وتی: شەیتان پێی کردم، صەفییەیش(رضي الله عنها) ئازادی کرد. لە ڕەمەزانی ساڵی پەنجای کۆچی و لە سەردەمی موعاویە(رضي الله عنه) کۆچی دوایی کرد، دەشڵێن لە ساڵی پەنجا و دوو بووە لە دونیا دەرچوونی.[1]

## هەشتەم: هەوڵێکی نالەبار... مەڕی ژاراوی.

پێشەوا بوخاری لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) پاش ئەوەی مەڕێکی پێشکەش کرا ژاراوی بوو، جولەکەکانی کۆکردەوە و هەندێ پرسیاری لێکردن لە کۆتایشدا پرسیاری مەڕەکەی کرد ئایا ژەهریان تێکردووە، ئەوانیش دانیان بە کارەکەیان نا و وتیان: ویستمان ئەگەر درۆزن بیت ڕزگارمان بێ لێت، ئەگەریش پێغەمبەر بیت زیانت پێ ناگەیەنێت.[2]

ئەو مەڕە لە لایەن زەینەبی کچی حاریسی جولەکە پێشکەشی کرابوو، کە خێزانی(سلام بن مشکم) بوو، زیاتریش ژەهرەکەی کردبوویە دەستی مەڕەکەوە چونکە زانیبووی پێغەمبەر(ﷺ) زیاتر حەز بە دەستی دەکات، بیشری کوڕی بەراء

---

١ السيرة النبوية لأبي شهبة (٢/٣٨٥).
٢ البخاري، كتاب الجهاد والسير (٤/٧٩) رقم (٣١٦٩).

لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لێی خوارد دەست بەجێ کوشتی.

(ابن القیم) دەفەرمووێت: ئافرەتەکەیان هێنایە لای پێغەمبەر(ﷺ) و، وتی: ویستم بتکوژم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((ما كان الله ليسلطك عليّ))، واتە: خوای گەورە هەرگیز تۆ زاڵ ناکات بەسەرمدا.... هەندێ جیاوازیش هەیە دەربارەی کوژرانی ئەو ئافرەتە، بۆچوونی ڕاستیش ئەوەیە، پاش مردنی بیشر ئەو ئافرەتە کوژرا،[1] پێغەمبەریش(ﷺ) لە پاش ئەو خواردنە ژاراوییە کەڵەشاخی کرد لە ناوشانی خۆی، بەڵام هەر ئازاری بۆ دەهاتەوە ناوبەناو تاکو پەیامی خوای گەورەی گەیاند و گەیشتە خوای خۆی، بوخاری لە عائیشە(ﵺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) لە سەرەمەرگدا فەرموویەتی:((يا عائشة مازلت اجد الم الطعام الذي اكلت بخيبر، فهذا اوان وجدت انقطاع ابهري من ذلك))،[2] واتە: ئەی عائشە! تاکو ئێستاش هەست بە ئازاری ئەو خواردنە دەکەم کە لە خەیبەر خواردم، ئێستا هەست بەپچڕانی دەماری دڵم دەکەم لەو ژەهرە.

## نۆیەم: گێڕانەوەیماڵەکانی(الحجاج بن علاط السلمي) لە مەککەوە.

ئەنەسی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك فەتحی خەیبەری کرد، حەججاجی کوڕی عەللات هاتە لای و وتی: ماڵ و کەس و کارم لە مەککەیە، دەمەوێت بیانهێنمەوە، ئایا ڕێگەم دەدەیت قسەت پێ بکەم بۆ ئەو مەبەستە، ئەویش ڕێگەی پێدا، ئەویش هاتە لای خێزانەکەی لە مەککە و پێی وت: هەرچیت لایە کۆی بکەرەوە، دەمەوێت ماڵەکانی موحەممەد بکڕم چونکە لە خەیبەر تێکشان و ماڵەکانیان تیاچووە، ئەم قسە لە نێو مەککە بڵاو بوویەوە و بتپەرستان زۆر پێی خۆشحاڵ بوون، کاتێك هەواڵەکە گەیشتە عەبباس دانیشت و نەیتوانی هەستێتە سەرپێ... ئینجا خوڵامێکی ناردە لای حەججاج و پێی وت: بەڵات لێدا ئەم هەواڵە چییە؟ بەڵێنی خوا لەوە چاکترە تۆ بە تەمایت، ئەویش پێی وت: بە عەبباس بڵێ لە

---

١ زاد المعاد (٣/٣٣٦).

٢ صحيح البخاري بشرح فتح الباري (٩/١٥٩-١٩٦) طبعة الحلبي.

یەکێك لەماڵەکانیدا چاوەڕوانم بێت، هەواڵەکەیش بە دڵ ئەو دەبێت، کە خولامەکە گەڕایەوە لای عەبباس لە خۆشیاندا ئازادی کرد، ئیتر حەججاج ئاگاداری کردەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) خەیبەری فەتح کردووە و، صەفییە وەکو خێزان بۆ خۆی هەڵبژاردووە و ئازادی کردووە، ئینجا داوای لێکرد سێ ڕۆژ ئەم هەواڵە باس نەکات، حەججاج هەرچی ماڵ و سامانی هەیە بردی و دوای ئەوە عەبباس هاتە لای خێزانی حەججاج و پێی وت: مێردەکەت چی کرد؟ وتی: ڕۆیشتەوە، بەڵام ئەی عەبباس خوا شەرمەزارت نەکات ئەو هەواڵەمان پێ ناخۆش بوو پێت گەیشت، عەبباس وتی: خوا شەرمەزارم ناکات و خەیبەر فەتح کراوە و دابەشیش کراوەتە سەر موسڵماناناو پێغەمبەری خوا(ﷺ) صەفییەی کردووە بە خێزانی خۆی و پێم باشە بڕۆیت بۆ لای مێردەکەت، ئینجا عەبباس بە لای کۆڕەکانی قورەیشدا تێپەڕدەبوو، ئەوانیش توانجیان لێ دەدا، ئیتر عەبباس باسی ڕاستی مەسەلەکەی بۆ کردن و زۆر خەم و پەژارە دایگرتن و موسڵمانان زۆر خۆشحاڵ بوون.[١]

## دەیەم: هەندێ حوکمی پەیوەندیدار بەم غەزایەوە.

### ١- قەدەغەبوونی خواردنی گوێدرێژ:

لە ئیبنو عومەرەوە(ﷺ) فەرموویەتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی خەیبەردا نەهی کرد لە خواردنی گۆشتی گوێدرێژ.[٢]

### ٢- قەدەغەبوونی چوونە لای ئافرەتی کۆیلەی سك پڕ:

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:((من كان يؤمن بالله واليوم الاخر فلا يسق ماءه زرع غيره))[٣] واتە: هەرکەسێ باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە ئاوی خۆی نەخاتە سەر کێڵگەی کەسی تر.

---

١ احمد في المسند (٣/١٣٨-١٣٩)، عبدالرزاق في المصنف (٩٧٧١)، ابو يعلى (٣٤٧٩) البيهقي (٩/١٥١)، الدلائل (٤/٥٢٦٦-٥٢٦٧)، البيهقي في المجمع (٦/١٥٤-١٥٥)، وقال ابن كثير في البداية والنهاية (٤/٢٣) عن مسند احمد وهذا الاسناد على شرط الشيخين، نقلا عن صحيح السيرة النبوية (٤٦٠).

٢ زادالمعاد (٤/١٢٢-١٢٣) البخاري، كتاب المغازي رقم (٤٢١٥).

٣ الطبقات (٢/١١٣).

**٣- قەدەغەبوونی چوونەلای ئافرەتانی تر لە کۆیلە پێش دڵنیابوون لەوەی سکیان پڕ نییە:**

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ڕەوا نییە بۆ کەسێك باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە بچێتە لای ئافرەتێك تاکو دڵنیا نەبێت کە سکی پڕ نییە.[١]

دڵنیابوونیش بەوە دەبێت لە یەك عادەتی شەرعی پاك بێتەوە و پێویست بە عیددە ناکات ئیتر با مێردیشی کردبێت بە کافرێك ئیتر ئایا پیاوەکەی مابێت یان مردبێت، چونکە عیددە بریتییە لە ئەمەك بۆ ئەو ئافرەتەی مێردی مردووە لەم حاڵەتەیشدا نابێت خەم بۆ مێردی کافر پێشان بدرێت.

**٤- قەدەغەبوونی سووی زیادە:**

لە ئەبو سەعیدی خودری و ئەبو هورەیرەوە: پێغەمبەر(ﷺ) پیاوێکی بەکارهێنا لەسەر خەیبەر، ئەویش جۆرێکی لە خورما هێنا جەنیبی پێ دەوترا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئایا هەموو خورمای خەیبەر وایە؟ وتی: نەخێر، ئێمە ئەندازەیەك لەم خورما بە دوو ئەندازە و سێ ئەندازە لە خورمای تر دەکڕین پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: وامەکە، خورماکە بە پارە بفرۆشە، دوایی بە پارەکەی خورمای جەنیب بکڕە.[٢]

**٥- قەدەغەبوونی فرۆشتنی ئاڵتون بە ئاڵتون و زیو بە زیو:**

عوبادەی کوڕی صامیت فەرموویەتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی خەیبەردا فەرمووی:((ابتاعوا تبر الذهب بالورق والعين، وتبر الفضة بالذهب والعين)).[٣]

مەبەست لەم فەرموودەیەش ئەوەیە ئاڵتون بە ئاڵتون بفرۆشرێت وەکو یەك، زیو بە زیو بفرۆشرێت وەکو یەك، بێ زیاد و کەم، بەڵام کاتێك ئاڵتون و زیو بەرامبەر بینەوە ئیتر مەرج نییە وەکو یەك بن.[٤]

---

١ الروض الانف (٤/٤١) ورواه ابو داود رقم (٢١٥٨).

٢ البخاري، كتاب المغازي، رقم (٤٢٤٤).

٣ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام مع الروض الانف للسهيلي (٤/٤١).

٤ بڕوانە: صور وعبر من الجهاد النبوي في المدينة (٣٢١).

**٦- شەرعی بوونی ئاودێری کردن و کشتوکاڵ کردن لەگەڵ یەکتر:**

لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە(ﷺ) فەرموویەتی: پێغەمبەر(ﷺ) خەیبەری دایە جولەکە کاری تیا بکەن و بیکێڵن و، نیوەی بەرهەمەکەی بۆ خۆیان بێت.[١]

هەندێك لە توێژەران پرسیویانە؟: ئایا بۆچی حوکمەکانی کڕین و فرۆشتن زۆری لە غەزای خەیبەردا هاتووە؟

مامۆستا موحەممەد ئەبو زوهرە وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە و دەڵێت: فەتحی خەیبەر کارێکی نوێ بوو سەبارەت بە پەیوەنییە داراییەکانەوە کە لە سایەیدا ئاڵوگۆڕکردنی دارایی پەیدا بوو، وەکو ئاودێری و کێڵان و ... ئەو کارانەش پێشتر لە یەسریب نەبوون.[٢]

**٧- ڕەوابوونی خواردنی گۆشتی ئەسپ:**

جابیر(ﷺ) دەفەرموێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی خەیبەردا لێی قەدەغە کردین گۆشتی گوێدرێژ بخۆین و، ڕێگەی دا بە خواردنی گۆشتی ئەسپ.[٣]

**٨- قەدەغەبوونی ژن هێنان بە شێوەی کاتی(زواج المتعە):**

لە عەلی یەوە(ﷺ) فەرموویەتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی خەیبەردا قەدەغەی کرد لەسەرمان کە ئافرەت مارە بکەین بۆ ماوەیەکی دیاری کراو، هەروەها خواردنی گۆشتی گوێدرێژیش.[٤]

**٩- بەشداری کردنی ئافرەت لە غەزای خەیبەر:**

یەکێك لە ئافرەتانی بەنی غیفار هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ هەندێك لە ئافرەتانی خزمی خۆی، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا حەز دەکەین لەگەڵتان دەربچین بۆ خەیبەر، بۆ تیمارکردنی برینداەکان و یارمەتیدان، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) ڕازی بوو، کچێکیان تیابوو دەڵێت کە دەرچووین بۆیەکەمین جار تووشی سوڕی

١ البخاري، كتاب المغازي رقم (٤٢٤٨).
٢ بڕوانە: خاتم النبيين (١١٠٤/٢)، الصراع مع اليهود (١٣٦/٣).
٣ البخاري، كتاب المغازي رقم (٤٢١٩).
٤ البخاري، كتاب المغازي رقم (٤٢١٦).

مانگانە بووم و لە شەرمدا خۆم دوور خستەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خۆت چاك بکە و قاپێك ئاو ببە خوێی تێ بکە ئەو جێگەیەی خوێنەکەی کەوتە سەر پاکی بکەرەوە و، بگەڕێرەوە سواری وڵاخەکە ببە، جا کاتێك خەیبەر فەتح کرا دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) بە دەستی خۆی ئەم ملوانکەی لە گەردنم کرد، بۆیە سوێند بە خوا هەرگیز لێم دوورناکەوێتەوە تاکو مردن، هەموو جارێکیش پاك ببوایەوە خوێ و ئاوی بەکاردەهێنا و، ڕاسپاردەی کرد بە خوێ و ئاویش بشۆردرێتەوە پاش مردن.[1]

ئەمەیش وێنەیەکی زیندووە لە پێش هەموو کچێکی موسڵمان، کە حەز بکات بەشداری جیهاد بکات لەگەڵ موسڵماناندا.[2]

ئەمە و فەتحی خەیبەر و دەورووبەری ناوبانگێکی گەورەی دەرکرد لە دوورگەی عەرەب، قوڕەیشیش تووشی خەم و پەژارەی زۆر بوون، چونکە چاوەڕوانی ئەوە نەبوون، لە کاتێکدا قەڵاکانی جوولەکە زۆر پتەو و قایم بوون و خاوەن چەك و کەرەستەی جەنگ بوون، هۆزەکانی تریش ڕێکدەکەوتن لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) پاش ئەوەی کە بۆیان دەرکەوت دژایەتی موسڵمانان بێ سوودە، ئەمەیش دەرگای لەپێش ئیسلامدا کردەوە بۆ بڵاوبوونەوەی لەناو هەموو دوورگەی عەرەبدا، پاش ئەو دەستکەوتانەی ئیسلام بە دەستی هێنا.[3]

بزووتنەوەی پۆلە سەربازییەکانیش لە پاش خەیبەر هەر بەردەوام بوو، ژمارەشیان لە زیادبووندا بوو، سەرانی هاوەڵانیش سەرکردەییان دەکرد و، لە هەندێکیان شەڕو پێکدادان هەبوو، لە هەندێکیشیاندا تیانەبوو.[4]

---

١ البداية والنهاية (٤/٢٠٥)، السيرة النبوية لابن هشام (٢/٢٧٢-٢٧٣).

٢ بڕوانە: فقه السيرة للغضبان (٥٣٤).

٣ نضرة النعيم (١/٢٥٣).

٤ السيرة النبوية للندوي (٢٢١).

## باسی دووەم: بانگەوازی پاشا و سەرکردەکان.

### یەکەم: ئاشتی حودەیبییە سەرەتای بڵاوبوونەوەی ئیسلام بوو.

هەر لەو کاتەوە پێغەمبەر(ﷺ) ڕێککەوتنی حودەیبییەی مۆرکرد لەگەڵ قورەیشدا و، دواتر جولەکەکانی خەیبەر و فەدەك و تەیما ملکەچی ئیسلام بوون، پێغەمبەر(ﷺ) هەر لە خەمی گەیاندنی ئیسلام بوو بۆ دەرەوەی دوورگەی عەرەب، ئەم ڕێبازەیش دەربڕینی لێکرا بە کردار و گوفتار لە ڕێگەی نێردەکانەوە بۆ لای سەرۆك و سەرکردەکانی دەوروبەری دورگەی عەرەب.

ئەمەیش وەرچەرخانێکی گەورە بوو لە مێژووی عەرەب و ئیسلامدا، نەك تەنها لەبەر ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) عەرەبی دورگەی عەرەب یەکدەخات لە ژێر ئاڵای ئیسلام، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەو عەرەبانە بوونە موسڵمان و هەڵگرتنی بانگەوازی ئیسلامیان پێ سپێردرا بۆ ئەوەی بیگەیەنن بە مرۆڤایەتی.[1]

هاوکات لەگەڵ بانگکردنی سەرۆك و گەلەکان، پێغەمبەر(ﷺ) شێوازێکی تازەی هەڵبژارد لە بانگەوازکردن ئەویش بریتی بوو لە نامە نووسین بۆ پادشا و سەرۆکهۆزەکان، ئەو شێوازەیش کاریگەری چاکی هەبوو لە موسڵمان بوونی هەندێك لەوانە و هەڵوێست نەرم بوونی هەندێکی تریان، هەروەها هەڵوێستی هەندێکی تریان دەرکەوت بەرامبەر دەوڵەتی مەدینە، بۆیە ئەم نامانە دەرەنجامی چاکیان هەبوو، چونکە دەوڵەتی ئیسلامی لە ڕێگەی وەڵامەکانی ئەوانەوە توانی ڕێبازێکی سیاسی و سەربازی ئاشکرا وەربگرێت و، ئەمەیش گرنگترین ئەو نووسراوانەیە:

١- ڕیوایەتێکی ڕاستمان بۆ هاتووە،[2] دەربارەی دەقی نووسراوی پێغەمبەر(ﷺ) کە لەگەڵ دیحیەی کەلبی ناردی بۆ هیرەقلی سەرۆکی ڕۆم،[3] کە بەم شێوە بوو: بە

---

١ بڕوانە: السفارات النبوية، د. محمد العقيلي (١٥).

٢ مسلم، (٣/١٣٩٣-١٣٩٧) رقم (١٧٧٣).

٣ بڕوانە: نضرة النعيم (١/٣٤٤)، پشتم بەم سەرچاوەیە بەستووە بۆ متمانە پێکردنی سەرچاوەی نامەکان.

ناوی خوای بەخشندە و میهرەبانەوە، لە موحەممەد پێغەمبەری خوا، بۆ هیرەقل مەزنی ڕۆمەکان، سڵاو لەو کەسەی شوێنکەوتووی ڕێگەی ڕاست و ڕەوان دەبێت: لە پاش ئەوەش، من بانگت دەکەم بۆ بانگەوازی ئیسلام، موسڵمانبە سەلامەت دەبیت، موسڵمان بە خوای گەورە دوو جار پاداشتت دەداتەوە، ئەگەریش پشت هەڵ بکەیت، گوناهی ئەریسیەکان هەموو لەسەر تۆ دەبێت: ﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴾[1](ال عمران: ٦٤).

هیرەقل نامەی گەشتە دەست و لێی ورد بوویەوە، وەکو لەو فەرموودە درێژەدا هاتووە لە هەردوو بوخاری و موسلیمدا، کاتێك بە ئەبو سوفیانی وتووە: ئەگەر ئەو قسانەی دەیکەی دەربارەی وابێت، ئەو پێغەمبەرە و من دەمزانی دەردەچێت، بەڵام گومانم وانەبوو لە ئێوە بێت، بشمزانیایە پێی دەگەم پێم خۆشبوو بیبینم، ئەگەریش لە لای بوایەم پێیم دەشۆرد.[2]

٢- هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) نووسراوێکی نارد بۆ کیسرای پادشای ئیمپراتۆریەتی فارسەکان لەگەڵ عەبدوڵای کوڕی حوزافەی سەهمی، فەرمانی پێکرد بیداتە دەستی سەرگەورەی بەحرێنەوە،[3] ئەویش ناردی بۆ کیسرا، کاتێك خوێندیەوە پارچە پارچەی کرد، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) لە دژیان پاڕایەوە خوا پارچە پارچەیان بکات،[4] ئەمەیش دەقی نامەکەیە:

بە ناوی خوای گەورە و میهرەبانەوە، لە موحەممەدی پێغەمبەر، بۆ کیسرای مەزنی فارس، سڵاو لە کەسێك شوێنکەوتووی ڕێگەی ڕاست و ڕەوان بێت، باوەڕیش

---

١ مسلم بشرح النووي، كتاب الجهاد، كتب النبي (١٢/١٠٧).

٢ مسلم (٢/١٢٩٢) رقم (١٧٧٣).

٣ شرح المواهب اللدنية (٣/٣٤١).

٤ البخاري مع فتح الباري (٨/٢٦). رقم (٤٤٢٤)، نووسراوەکە لە موحەڕەمدا لە ساڵی حەوتی کۆچی، وەکو لە (زاد المعاد)دا هاتووە.

بهێنێت بە خوا و پێغەمبەرەکەی و شایەتیش بدات کە تەنها یەك خوا هەیە و من پێغەمبەری ئەو خوایەم بۆ سەرانسەری خەڵکی، بۆ ئەوەی ئاگاداری هەموو زیندوویەك بکات، موسڵمانانبە سەلامەت دەبیت، ئەگەرنا گوناهی هەموو مەجوسەکان لەسەر تۆیە.[١]

٣- نووسراوی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ نەجاشی پادشای حەبەشە،(عمرو بن امیة الضمري) هەڵسا بە گەیاندنی و ئەمەیش دەقەکەیەتی:

بە ناوی خوای گەورە و میهرەبانەوە، لە موحەممەد پێغەمبەری خوا، بۆ نەجاشی پادشای حەبەشە، خۆت موسڵمانبە، ئینجا من سوپاس و ستایشی خوای گەورەت بۆ دەکەم، کە هیچ خوایەك نییە جگە لە خۆی پادشا و پاراو و چاودێر و ڕاستگۆ و پاراو لە هەموو کەم و کوڕییەك، هەروەها شایەتی دەدەم کە عیسای کوڕی مەریەم گیانێكو وشەیەك بوو لە لای خواوە ناردی بۆ مەریەمی پاراوی بێ نیاز لە پیاوان و سکی پێی پڕ بوو، لەو گیانە دروستی کرد و فووی پیاکرد، وەکو چۆن ئادەمی بە دەستی خۆی دروست کرد، ئینجا من بانگت دەکەم بۆ لای ئەو خوایەی کە هاوتای نییە، بۆ بەردەوامی گوێڕایەڵ بوونی، بۆ ئەوەش شوێنم بکەویت و باوەڕ بهێنی بەوەی من پێی ڕەوانە کراوم چونکە من پێغەمبەری خوام و بانگت دەکەم لەگەڵ سەربازەکانتدا بۆ لای خوای گەورە، منیش قسەی خۆمم گەیاند و ئامۆژگاریم کرد جا ڕازی بن و ئامۆژگاریم قبووڵ بکەن، سڵاویش لەسەر ئەو کەسە بێت کە شوێنکەوتووی ڕێگەی ڕاست و ڕەوانە.[٢]

٤- سەبارەت بە کتێبەکەی(المقوقس)ی فەرمانڕەوای میسرو وەڵامی ئەو،[٣] جێگیر نەبووە لە ڕێگەی ڕاستەوە،(ابن سعد)[٤] دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر(ﷺ) نووسراوی نووسیوە بۆ پادشای ئیسکەندەرییە و سەرگەورەی قیبت(جرەیح بن مینا) لەگەڵ حاتیبی کوڕی ئەبی بەلتەعە، ئەویش وەڵامی جوانی داوەتەوە خەریك

---

١ بڕوانە: تاريخ الطبري (٤/٦٥٤-٦٥٥).
٢ نصب الراية للزيلعي (٤/٤٢١)، نقلا عن نضرة النعيم (١/٣٤٦).
٣ نضرة النعيم (١/٣٤٦).
٤ طبقات ابن سعد الكبرى (١/٢٦٠-٢٦١).

بووە موسڵمان بێت و هەندێ دیاری ناردووە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ماریەی قیبتیش لە نێوانیاندا بووە و، دوایی پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ئەم پادشا پیسە ترسی موڵکەکەی هەیە و، موڵك بۆ کەس نامێنێتەوە.[١]

٥- ئینجا پێغەمبەر(ﷺ)(شجاع بن وهب) ناردووە بە نامەیەکەوە بۆ لای(المنذر بن الحارث ابي شمر الغساني) سەرکردەی دیمەشق،[٢] لە کاتی گەڕانەوەی لە حودەیبیە و، ئەمەیش دەقی نامەکەیەتی: سڵاو لەو کەسەی شوێن ڕێگەی ڕاست و ڕەوان دەکەوێت و باوەڕی پێ دەهێنێت، من بانگت دەکەم بۆ ئەوەی باوەڕ بهێنیت بە خوای بێ هاوتا و بۆ ئەوەی موڵکەکەت بۆ بپارێزێت.[٣]

٦- ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) نامەیەکی نارد بە(سليط بن عمرو العامري)دا بۆ(هوذة بن علي الحنفي)[٤] لە کاتی گەڕانەوەی لە حودەیبیە، ئەو کابرایەش کە نامەکەی پێغەمبەر(ﷺ)ی خوێندەوە مەرجی کرد کە پێغەمبەر(ﷺ) بەشداری بکات لە سەرۆکایەتی لەگەڵ خۆی، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی ڕەت کردەوە.[٥]

٧- هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بە ناردنی ئەبولعەلائی حەزرەمی بە نامەیەکەوە بۆ لای(المنذر بن ساوي العبدي) سەرۆکی بەحرێن، لە پاش گەڕانەوەی لە حودەیبیە، سەرچاوە مێژووییەکان باسی ئەوە دەکەن ئەو سەرۆکە خۆی هەموو ئەو عەرەبانەی لەگەڵی بوون لە بەحرێن موسڵمان بوون، بەڵام جولەکە و گاورەکان ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی سەرانە بدەن،[٦] ئەمەیش دەقی نووسراوەکەیە:

... سوپاس و ستایشی خوای گەورەت بۆ دەکەم کە هیچ خوایەکی تر نییە جگە لە خۆی، ئینجا، هەر کەسێ ئەم نوێژەی ئێمە بکات و ڕوو لە قیبلەمان بکات و قوربانیمان بخوات، ئەوە موسڵمانە و پەیمانی خوا و پێغەمبەری پێدەدرێت، هەر

---

١ البداية والنهاية (٥/٣٤٠).

٢ بڕوانە: تاريخ الطبري (٢/٦٥٢).

٣ هەمان سەرچاوە (٢/٦٥٢).

٤ سەرکردەی یەمامە بووە، ماوەیەك پێش فەتحی مەککە مرد.

٥ بڕوانە: نصب الراية (٤/٤٢٥)، اعلام السائلين، ابن طولون (١٠٥-١٠٧).

٦ بڕوانە: صبح الاعشى للقلقشندي (٦/٣٦٨)، الزيلعي تخريج احاديث الهداية (٤/٤١٩-٤٢٠).

کەسێ لە مەجووسەکان ئەوەی پێ باش بێت ئەو کەسە سەلامەت دەبێت، هەر کەسێکیش رازی نەبوو پێویستە سەرانە بدات.[١]

لە مانگی(ذي القعدة)ی ساڵی هەشتی کۆچیش پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بە ناردنی نامەیەك لەگەڵ عەمری کوڕی عاص بۆ لای جەیفەر و عەبدی کوڕانی جولوندای ئەزدیی لە عومان وتیایدا هاتووە:

(لە موحەممەدی پێغەمبەری رەوانەکراوی خوای گەورە بۆ بەندەکانی خوا(ئەزدیەکان) پادشایانی عومان و شێران عومان و ئەوانەی لە بەحرێنن، ئەگەر باوەڕ بهێنن و نوێژ بکەن و زەکات بدەن و گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر بکەن و مافی پێغەمبەر(ﷺ) بدەن، وەکو ئیمانداران خواپەرستی بکەن سەلامەت دەبن، ئەوەشی لەسەری موسڵمان بوون مافی خۆیان دەبێت، بەڵام سەروەتی ماڵی ئاگر بۆ خواو پێغەمبەرە، دەیەکی خورمایش صەدەقەیە، دانەوێڵەیش نیوەی دەیەکەو موسڵمانانیش پێویستە پشتگیریان بکەن و ئامۆژگاریان پێشکەش بکەن، ئەوانیش هەمان ماف پێویستە پێشکەش بکەن، ئاشەکانیشیان بۆ خۆیان هەرچی پێ بهاڕن.[٢]

سەرچاوەکانیش ژمارەیەکی زۆر ڕیوایەتیان باس کردووە لە نامەی تر، بەڵام لە رووی فەرموودەییەوە جێگیر نەبووە.[٣]

## دووەم: پەند و سوود و ئامۆژگاری.

### ١-(الاريسيون):

وشەی(الاريسيون) یان(اليريسيين) هاتووە لەو نوسراوەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ هیرەقل، زانایانیش بۆچوونی جیاوازیان هەیە دەربارەی واتاکەی لێکدانەوەی بەناوبانگیش ئەوەیە کە ئەو وشە کۆیە و تاکەکەی(اريسى) یە، کە بریتین لە خزمەتکار و بەکرێگرتە.[٤]

---

١ الاموال لأبي عبيد (٢٨).

٢ بڕوانە: الاموال لأبي عبيد (٢٨-٢٩).

٣ بڕوانە: نضرة النعيم (١/٣٤٨).

٤ بڕوانە: السيرة النبوية للندوي (٣٠٤).

بەڵام مامۆستای زانا(ابوالحسن الندوي) دەڵێ: مەبەست لەو وشە شوێنکەوتووانی ئاریۆسی میصرییە، کە دامەزرێنەری کۆمەڵێکی مەسیحییە، ڕۆڵی گەورەی بووە لە مێژووی بیروباوەڕ و چاکسازی ئاینی، بۆ ماوەیەکی زۆریش دەوڵەتی بێزەنتە و کەنیسەی مەسیحی سەرقاڵ کرد، ئینجا ئاریوس ئەو کەسەیە کە بانگەوازی یەکتاپەرستی دەکردن لە نێوان پەروەردگارو دروستکراو کوڕ- بەپێی دەربڕینی مەسیحییەکان- بۆ ماوەی چەندین سەدە.[1]

**٢- هەندێك لە تایبەتمەندی پادشاکان:**

هەندێك جیاوازی ورد هەیە لە نامەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ پادشاکان، بەپێی جیاوازی ئەو پادشایانە لە ڕووی بیروباوەڕەوە، بۆ نموونە هیرقەل و مقەوقس گاور بوون و عیسایان بەخوا دەزانی، بۆیە لە نامەکەیان وشەی(عبدالله) هاتووە لەگەڵ ناوی پێغەمبەر(ﷺ)(من محمد عبدالله ورسوله الى هرقل عظيم الروم) بە پێچەوانەی ئەو نوسراوەی بۆ کیسرا نێردرا، کە تەنها بەوە دەستی پێکرد موحەمەد پێغەمبەری خوا، هەروەها لەو دوو نامەیە ئەم ئایەتە هاتووە: ﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴾(ال عمران :٦٤)، بەڵام ئەو نامەی بۆ کیسرا ڕۆیشت ئایەتی تیا نەبوو چونکە ئەو ئایەتە تایبەتە بە ئەهلی کیتابەوە.[2]

ئینجا لەبەرئەوەی کیسرا و نەتەوەکەی باوەڕیان بە پەرستنی خۆر و ئاگر بوو، هەروەها هەبوونی دوو خوا، بۆیە لەو نامەی کە ئاراستەی ئیمپراتۆری ئێرانی کرد، ئەم ڕستەی تیابوو (واني رسول الله الى الناس كافة لينذر الناس من كان حيا)،[3] پێشوازی کردنی پادشاکانیش بۆ نووسراوەکانی پێغەمبەر(ﷺ) جیاواز بوو،

---

١ هەمان سەرچاوە و لاپەرە.
٢ بڕوانە: ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين للندوي (٣٨-٣٩).
٣ بڕوانە: السيرة النبوية للندوي (٢٩٠).

هیرەقل و نەجاشی و مقەوقس وەڵامیان جوان و ڕێك و پێك بوو، تەنانەت مقەوقەس هەندێ دیاری و دوو کەنیزەکی نارد یەکێکیان ماریەی قیبتی بوو، دایکی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام کیسرا کاتێك نوسراوەکەی خوێندەوە دڕاندی و ووتی: بەندەمەو نامەم بۆ دەنووسێ؟ کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ئەو قسەی پێگەیشت فەرمووی:(مزق الله ملكه)، واتە: خوای گەورە موڵکی وێران بکات. ئینجا کیسرا فەرمانی کرد بە(باذان)ی فەرمانڕەوای یەمەن بچێت نێرەری ئەو نامە بگرێت و ئەویش کەسێکی بۆ ئەو مەبەستە ناردە لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش پێی فەرموو: خوای گەورە شیرەوی کوڕی کیسرای زاڵکردە سەر باوکی و کوشتی،[1] هەواڵەکەی پێغەمبەریش(ﷺ) هاتە دی وەکو خۆی و موڵکی کیسرا پارچەپارچە بوو، وەکو یاریشی پێ هات بەدەست خیزانە فەرمانڕەواکانەوە تاکو گەیشتە یەزدەجەرد کە دوایین پادشای ساسانییەکان بوو، هەر ئەویش بەرهەڵستکاری بڵاوبوونەوەی ئیسلامی کرد، بەڵام سوپای ئیسلامی توانی ئەو دەوڵەتەی کە زیاتر لە چوار سەد ساڵ بوو حوکمی دەکرد ڕیشەکێش بکات لە ساڵی ٦٣٧ زاینی.[2]

**٣- وەسفی گشتی نامەکانی پێغەمبەر(ﷺ):**

أ- نامەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هەمووی بە(بسم الله الرحمن الرحيم) دەست پێ دەکات، کە ئایەتێکە لە قورئانی پیرۆز و، کاری گرینگی پێ دەستپێدەکرێت و، نامەی پێ دەست پێدەکرێت با ئاراستەکراویش بێت بۆ بێ باوەڕان، ئەوەشی لێ وەردەگیردرێت کە ڕەوایە بێ باوەڕ ئایەتێك یان زیاتر لە قورئان بخوێنێتەوە، هەروەها لەش گرانیش بۆی هەیە قورئان بخوێنێتەوە، چونکە ئەو بێ باوەڕە گوێ نادات بەوەی لەشی گران بێت لە کاتی نامە خوێندنەوەکەدا.

ب- هەروەها لە نامەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ پادشاکان دەردەکەوێت:

- ڕێدراوە نێردەی موسڵمان بنێردرێت بۆ لای سەرکردە بێباوەڕەکان:
- ڕێدراوە نامە بنوسرێت بۆ بێباوەڕان دەربارەی کاروباری ئاین و دونیا.

---

١ تاريخ الطبري (٣/٩٠).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية للندوي (٣٠٠).

• دەکرێت ناوی نێرەر و بۆ نێردراو لە نامەکەدا بنوسرێت، بابەتی نامەکانیش یەکن لە هەموو نوسراوەکاندا کە بریتی یە لە بانگەوازکردنیان بۆ ئیسلام.

• بەکارنەهێنانی سڵاوی موسڵمانان لەگەڵ بێباوەڕان(السلام علیکم و رحمة الله وبرکاته) چونکە پێغەمبەر(ﷺ) بەو سڵاوە نامەکانی دەستپێنەدەکرد بەڵکو بە(السلام علی من اتبع الهدی) دەستی پێدەکرد.

• بەکارهێنانی مۆر، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) نامەکانی بە مۆری خۆی مۆردەکرد سێ وشەی لەسەر بوو بەم شێوە: محمد رسول الله[١]

چونکە ئەنەس دەگێڕێتەوە کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ویستی نامە بنێرێت بۆ ڕۆمەکان پێیان وت: ئەوان نامەیەك مۆر نەکرابێت نایخوێننەوە، ئەویش مۆرێکی لە زیو دروستکرد و سپی بوو لە دەستی پێغەمبەر(ﷺ) بوو و نەخشەکەی:(محمد رسول الله) بوو.[٢]

## ٤- ڕێزگرتن لە پیاوان :

کاتێك(باذان بن ساسان) موسڵمان بوو، کە فەرمان ڕەوای یەمەن بووە پێغەمبەر(ﷺ) لاینەبرد پاش موسڵمان بوونی، بەڵکو پاش خۆی کوڕەکەشی کردە فەرمانڕەوای یەمەن، چونکە لێهاتووی بەڕێوەبردنی تیایان دەبینی.[٣]

## ٥- وەرگرتنی سەرانە لە مەجوسەکان:

ئەم حوکمە لەنامەکەی پێغەمبەر(ﷺ) وەردەگیردرێت بۆ(المنذر بن ساوی).[٤](ابن القیم) و هەندێك لە زانایان دەڵێن سەرانە لە هەموو کەسێك وەردەگیردرێت کە بیدات، ئیتر چی ئەهلی کیتاب بێت یان بتپەرستی عەرەب و کەسانی تر بێت، وەکو لە(زاد المعاد) دا باسی کردوە.[٥]

---

١ بڕوانە: غزوة الحديبية لأبي فارس (٢٣٩-٢٤٠).
٢ البخاري، باب دعوة اليهود والنصارى – فتح الباري (١٠٨/٦).
٣ غزوة الحديبية لأبي فارس (٢٤٢).
٤ بڕوانە: غزوة الحديبية لأبي فارس (٢٤٢).
٥ بڕوانە: زاد المعاد (٩١/٥).

**٦- وەرگرتنی دیاری لە کافر.**

چونکە سەرۆکی میسر لەگەڵ(حاطب بن ابی بلتعة) ئەو دیاریانەی نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کە بریتی بوون لە پۆشاك و هێستر و دوو کەنیزەك و پێغەمبەریش(ﷺ) وەریگرتن.[1]

**٧- دەرەنجامەکانی ئەو نوسراوانە:**

پێغەمبەر(ﷺ) لە سیاسەتی دەرەکی دا توانایەکی لە ڕادە بەدەری پیشانداوە، بوو بە نمونە بۆ خەلیفەکانی دوای خۆی، ئینجا ئازایەتیەکی زۆریشی دەربڕی، چونکە هەر کەسێکی تر بوایە دەترسا لە دەرەنجامی ئەو کارانەی، سیاسەتی پێغەمبەر لەو بارەوە ئەم دەرئەنجامانەی لێکەوتەوە:

أ- پێغەمبەر(ﷺ) شێوازێکی نوێی لە هەڵس و کات داڕشت پێشتر ڕەچاو نەدکرا.

ب- دەوڵەتی ئیسلامی بوو بە خاوەن پلەو پایەو بوونی خۆی لەو سەردەمەدا.

ج- نیازی ئەو پادشایانە دەرکەوت بەرانبەر دەوڵەتی ئیسلام.

د- نامە نووسین بۆ ئەو پاشایانە جیهانی بوونی بانگەوازی ئیسلامی دەرخست بەو شێوەی لە قورئانی پیرۆزدا باس کراوە: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾(الانبياء:١٠٧) .

بەم شێوەیش ئەو نامانە بوون بە خاڵێکی وەرچەرخان لە سیاسەتی دەوڵەتی پێغەمبەر(ﷺ) پێش فەتحی مەککە، هەر ئەم سیاسەتەیش بوو، بووە پێشەکی بۆ یەکخستنی وڵاتەکانی عەرەب لە لایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ) لە ساڵی نێردراوەکاندا.

---

[1] بڕوانە: غزوة الحديبية لأبي فارس (٢٤٣).

## باسی سێیەم: عومرەی گێڕانەوە

لە مانگی(ذي القعدة)ی ساڵی حەوتەمی کۆچی، دەرچوو بەرەو مەککە بە نیازی عومرە وە وەکو جێبەجێکردنی ئەو رێککەوتنەی مۆر کرا لەگەڵ قورەیشدا، ژمارەی موسڵمانان گەیشتە دوو هەزار کەس جگە لە ژن و منداڵ، کەسیش دوانەکەوت لەوانەی ئامادەی حودەیبیە بوون مەگەر کەسێك لە خەیبەر شەهید بووبێت یان مردبێت.[١]

پێغەمبەر(ﷺ)لەگەڵ هاوەڵانی لە کەژاوەیەکی شکۆداردا بەرەو مەککە رۆیشتن‌و خەڵکیش لە رێگا سەیری ئەم دیمەنەیان دەکرد کە پێشتر شتی وایان نەبینیبوو، موسڵمانان بە یەك شێوە پۆشاکەوە، بە یەك دەنگ دەیانوت:(لبيك اللهم لبيك) و قوربانییەکانیان لەبەر دەدا.[٢]

### یەکەم: دوربینی و وریایی لە ناپاکی قورەیش.

پێغەمبەر(ﷺ) چەکی تەواوی لەگەڵ خۆی برد، وەکو پێشبینی بۆ رووداني هەر کردەوەیەکی کت و پڕ لە لایەن بتپەرستانەوە.

بۆیە بتپەرستان(مكرز بن حفص) و چەند کەسێکیان نارد بۆ حاڵی بوون لە هەڵوێستی پێغەمبەر(ﷺ) کە دڵنیای کردن لەسەر پەیمانەکە ماونەتەوە و، چەکەکان ناهێنێتە نێو مەککەوە.[٣]

بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) هەموو چەکەکانی لە دەرەوەی مەککە بەجێ هێشت و دوو سەد سواری لە لا بەجێهێشت بە سەرکردایەتی موحەممەدی کوڕی مەسلەمە، کە لە ئامادەباشیدا بوون بۆ هەر ئەگەرێکی لە ناکاو.[٤]

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٤٦٤).
٢ الاعلام الاسلامي في صلح الحديبية (٣١٠).
٣ بڕوانە: المغازي للواقدي (٧٣٤/٣)، طبقات ابن سعد (٢٢١/٢).
٤ بڕوانە: صلح الحديبية لأبي فارس (٢٦٨).

پێغەمبەر(ﷺ) دڵنیا نەبوو لێیان، بۆیە ئەو دووربینییەی کرد، ئەو هاوەڵانەشی بۆ پاسەوانێتی چەکەکان دیاری کرد لە(یأجج).[١]

**دووەم: چوونە ناو مەککەوە.**

لە(یأجج)ەوە پێغەمبەر(ﷺ) درێژەی بە ڕێکردن دا لەسەر وشترەکەی(القصواء) ئیتر لە لای(حجون)ەوە هاتە نێو مەککەوەو موسڵمانان شمشێرەکانیان بە قەدیانەوە بوو لە کالانەکانیدا، خەڵکی مەککەیش لە هەموو لایەکەوە تەماشایان دەکردو ئەوانیش بە(لبيك اللهم لبيك) دەنگیان بەرز دەکردەوە،[٢] کە ئەو دەنگە هەر بەردەوام بوو لە سەرەتای دەرچوونەوە تاکو گەیشتن واتای خۆی بوو، کە یەکتاپەرستی ڕادەگەیاندو بتپەرستی پووچەڵ دەکردەوە و، ستایشی خوای گەورەی دەکرد لەسەر ئەوەی یارمەتی دان ئەم خوا پەرستنە بەجێ بهێنن.[٣]

لە ڕاستیدا دیاردەیەکی ئیسلامی کاریگەر بوو، کاتێك کەژاوەکە لە مەککە نزیك دەبوویەوە بەرەو ماڵی خوا، هەندێکیش لە خەڵکی مەککە دەرچوون بۆ بەرزایی شاخەکان بۆ تەماشاکردنی ئەو دیمەنەو هەندێکیشیان لە لای(دار الندوة)ی پاڵ کەعبە تەماشایان دەکرد.[٤]

بتپەرستان پڕوپاگەندەیەکیان بڵاوکردبوویەوە کە گوایە موسڵمانان گەرمای یەسریب لاوازی کردوون، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی دەکردە هاوەڵانی لە سێ جاری یەکەمدا لە تەواف خێرا ڕێبکەن لە نێوان هەردوو گۆشەکەدا، بۆ ئەوەی بتپەرستان هێزیان ببینن، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) چووە ناو مزگەوتی حەرامەوەو هەندێ لە پۆشاکی ئیحرامەکەی خستە ژێر باڵی ڕاستیو ئەو سەری دا بەسەر شانیدا، هاوەڵانیشی شوێنی دەکەوتن،جا کاتێك بتپەرستان ئەوەیان بینی وتیان: ئەوانەن دەڵێن گەرما ماندووی کردوون؟...[٥]

---

١ جێگەیەکە هەشت میل لە مەککەوە دوورە.

٢ بڕوانە: التاريخ السياسي والعسكري (٣٥٣).

٣ بڕوانە: صلح الحديبية (٢٧٧).

٤ بڕوانە: منهج الاعلام الاسلامي في صلح الحديبية (٣١٤).

٥ صحيح السيرة النبوية (٤٨١).

مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) لەم کردارانەی ترساندنی قورەیش بوو، هەروەها پیشاندانی هێزی موسڵمانان و ئەوەش کاریگەری خۆی هەبوو لەسەر دڵ و دەروونیان و[1] پێغەمبەر(ﷺ) خۆی لە خوا نزیك دەکردەوە بە ڕق خستنە دڵی بێباوەڕان، وەکو چۆن ڕێگەی دا بە(ابو دجانة) بەو شێوازە ڕێ بکات لە جەنگی ئوحود بۆ ئەوەی بێباوەڕان تووڕە بکات، هەروەها لە غەزای حودەیبییەدا پێغەمبەر(ﷺ) وشترێکی ئەبو جەهلی هێنابوو لە دەستکەوتەکانی بەدر، بۆ ئەوەی بتپەرستان بیبینن و پێی دڵتەنگ بن، وا لەم عومرەیەشدا فەرمان دەکاتە موسڵمان خێرا ڕێ بکەن و هێز پیشان بدەن.[2]

ئەوە شەڕی دەروونی بوو پێغەمبەر(ﷺ) بەرپای دەکرد لە دژیان، کاریگەریشی هەبوو، سێ ڕۆژ لە مەککە مانەوە ئاڵای یەکتاپەرستیان بەرز کردەوە و تەوافیان دەکرد و بانگیان دەدا و نوێژەکانیان بە جەماعەت دەکرد، بیلال بە دەنگە خۆشەکەی لەسەر کەعبەوە بانگەکانی بەرزدەکردەوە و، وەکو تریشقە بوو لەسەر بتپەرستان.[3]

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ئەو دوو سەد کەسەشی لە بیر نەکرد کە پاسەوانێتی چەکەکانیان دەکرد، بۆیە کۆمەڵێکی ناردەوە و جێگەکەیان و ئەوان هاتن بۆ بەجێهێنانی عومرە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) چاك دەیزانی ئەوان بە چی پەرۆشیەکەوە هاتوونە بۆ ماڵی خوا.

## سێیەم: هاوسەرگیری پێغەمبەر( ﷺ ) لەگەڵ مەیمونەی کچی حاریس( رضي الله عنها ).

مەیمونە خوشکی(ام الفضل)ی خێزانی عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب بوو، ئافرەتێك بوو تەمەنی بیست و شەش ساڵ بوو، پاش مردنی مێردەکەی خۆی دابووە دەستی(ام الفضل)ی خوشکی بە شووی بدات، ئەویش خستبوویە دەستی عەبباسی مێردی، بۆیە ئەویش مارەی کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) و خۆی مارەیی

١ بڕوانە: منهج الاعلام الاسلامي في صلح الحديبية (٣١٥).
٢ بڕوانە: صلح الحديبية لأبي فارس (٢٨٢).
٣ هەمان سەرچاوە (٢٧٠).

چوارسەد درهەمی بۆ پێشکەش کرد،[١] مەیمونە پووری عەبدوڵای کوڕی عەبباس و خالیدی کوڕی وەلیدە، پاش تەواوبوونی سێ ڕۆژەکە سوهەیلی کوڕی عەمرو حویتەبی کوڕی عەبدولعوززا هاتنە لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتیان: کاتەکە تەواو بوو لە مەککە بڕۆ دەرەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی بۆچی ڕێگەم نادەن لە ناوتان شادی ژن هێنان بگێرم و خواردنێك دروست بکەین ئێوەیش ئامادەی بن؟ وتیان: پێویستمان بە خواردنی تۆ نییە دەرچۆ لە مەککە.[٢]

پێغەمبەر(ﷺ) پاش دەرچوونی ئەبو ڕافیعی مەولای مەیمونەی بەجێهێشت و، دواتر مەیمونەی گەیاندە پێغەمبەر(ﷺ) لە سەرەف لە نزیك تەنعیم و، لەوێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) گواستیەوەو[٣] ئەوە کۆتا هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) و دوایین خێزانەکانیشی بوو لە مردندا پاش خۆی و هەر لەو شوێنەیشدا نێژراوە.[٤]

لە هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) مەسەلەیەکی فیقهی بە ناوبانگ هەیە، ئەویش ئەوەیە پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتی ئیحرامدا بوو مەیمونەی مارە کرد, یان پاش تەواو بوونی ئیحرامەکەی بوو، زانایانیش ئەم مەسەلەیان بە جوانی شیکردووەتەوە.

## چوارەم: گەیشتنی کچەکەی حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب بە کاروانی موسڵمانانندا.

هۆش و دەروونەکان گۆڕان، ئەو کچەی کە پێشتر مایەی تانەو تەشەر بوو، ئەمڕۆ بوو بە خۆشەویستێك پێشبڕکێ دەکرێت بۆ پەروەردەکردنی،[٥] کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ویستی لە مەککە دەربچێت کچەکەی حەمزە دوای کەوت و هاواری دەکرد: هۆ مامە! هۆ مامە! ئیتر عەلی هەڵیگرت و بە فاتیمەی وت(رضي الله عنها): ئەوە ئامۆزاکەتە، ئینجا عەلی و زەیدو جەعفەر بوو بە ناکۆکییان لەسەری، عەلی وتی: من بردوومە و ئامۆزامە، جەعفەر وتی: ئامۆزامە و پوریشی خێزانمە، زەید وتی: برازامە، ئیتر

---

١ بڕوانە: صور وعبر من الجهاد النبوي في المدينة (٣٢٦).
٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (١٩/٤).
٣ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (١٩/٤).
٤ بڕوانە: هذا الحبيب يامحب، للجزائري (٣٧٥).
٥ بڕوانە: السيرة النبوية للندوي (٣٢١).

پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاری دا بۆ پورەکەی بێت و فەرمووی:((الخالة بمنزلة الام))، واتە: پوور(خوشکی دایك) پلە و پایەی دایکی هەیە، ئینجا بە عەلی فەرمووی: تۆ لە منیو من لە تۆم، بە جەعفەریشی فەرموو: لە خۆم دەچیت لە ڕوخسارو ڕەوشتدا، بە زەیدیشی فەرموو: تۆ برا و یارمەتیدەرمانی.[1]

لەم بەسەرهاتە چەند سوود و پەندێك وەردەگرین:

١- پور – خوشکی دایك–وەکو دایکە.

٢- پور مافدارترە لە بەخێوکردندا لە کاتی نەبوونی باوك و دایك.

٣- ستایشکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ جەعفەر بەو فەرموودەیەی.

٤- ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ عەلی ڕێزێکی گەورەو پلەو پایەیەکە بۆی.

٥- هەروەها فەرموودەکەش بۆ زەید ڕێزێکی گەورە بوو، چونکە زەید برای حەمزە بوو بە بڕیاری پێغەمبەر(ﷺ) و ئەو کچەی بە برازای خۆی دەزانی.

٦- خوشکی دایك مافدارترە لە خوشکی باوك:چونکە پێغەمبەر(ﷺ) حوکمی دا ئەو کچە لە لای خێزانی جەعفەر بێت، لە کاتێکدا صەفییە کە خوشکی باوکێتی لە ژیاندا بوو.

٧- شوو کردنی ئافرەت مافی لانابات لە بەخێوکردندا، چونکە پوری کچەکەی حەمزە خێزانی جەعفەر بوو(ﷺ).

٨- پێویستە مێرد ڕازی بێت لەسەر ئەوەی خێزانەکەی خوشکەزای خۆی بەخێوبکات نەوەك ئەو بەخێوکردنە ببێتە هۆی زیان بۆ بەرژەوەندی ئەو مێردە.

٩- منداڵ ئەگەر شیر بخوات لەگەڵ مامی خۆی دەبێتە برای شیری، منداڵەکانیشی دەبنە برازای شیری و قەدەغەیە مارەیان بکات.

---

١ البخاري، كتاب المغازي (٥/١٠٠) رقم (٤٢٥١).

**پێنجەم: کاریگەری ئەو عومرەیە لەسەر دوورگەی عەرەب و موسڵمان بوونی خالیدی کوڕی وەلید و عەمری کوڕی عاص و عوسمانی کوڕی تەڵحە.**

کاریگەری ئەم عومرەیە یەکجار گەورە بوو لەسەر دوورگەی عەرەب، چونکە هەندێك واتای مەزنی لە خۆ دەگرت.

لە پاش دەرچوونی پێغەمبەر(ﷺ) لە مەککە بە ماوەیەکی کەم خالیدی کوڕی وەلید، لە نێو کۆمەڵێك لە قورەیشدا وتی: بۆ هەموو خاوەن هۆشێك ئاشکرا بوو، کە موحەممەد جادووباز و شاعیر نیەو قسەی پەروەردگاری هەموو جیهانە، پێویستە هەموو خاوەن عەقڵێك دوای کەوێت، ئەبو سوفیان گوێی لەم قسانە بوو، بۆیە ناردی بە دوای خالید بۆ دڵنیابوون لەو قسانەی ئەویش دڵنیای کردەوە کە وای وتووە، ئەبو سوفیان لە خالید تووڕە بوو، بەڵام عیکریمە هەڵسا و وتی: لەسەرخۆت ئەی ئەبو سوفیان، سوێند بە خوا خەریکە منیش دەچمە سەر ئاینەکەی، ئێوە دەتانەوێت خالید لەسەر بۆچوونێك بکوژن پێی باشە، وا قورەیش نزیکە هەموویان لەسەر ئەوە پێك بێن، وا دەزانم ساڵێك تێپەڕ نابێت تاکو هەموو مەککە شوێنی نەکەون. لەپاش خالید عەمری کوڕی عاص و عوسمانی کوڕی تەڵحە کە پاسەوانی کەعبە بوو موسڵمان بوون، بەڵکو ئیسلام لە هەمووماڵێك لە ماڵەکانی قورەیش سەری هەڵدا بە نهێنی و بە ئاشکرا، بەم شێوەیش دەکرێت بوترێت عومرەی قەزا دەرگای دڵەکانی کردەوە، بەر لەوەی موسڵمانان دەرگای خودی مەککە بکەنەوە.[١]

مامۆستا(عباس محمود العقاد) دەڵێت:(... بەسە بۆ کاریگەری عومرە کە بووە مایەی قایل بوونی خالید و عەمر بە موسڵمان بوون، کە ئەوان لە هۆشمەند و خاوەن ڕەوشتەکانی نێو قورەیش بوون و خەڵکی تەماشای دەکردن).[٢]

**١- موسڵمان بوونی عەمری کوڕی عاص:**

عەمری کوڕی عاص دەربارەی موسڵمان بوونی دەڵێت: کە لە ئەحزاب گەڕاینەوە پێشنیارم کردە سەر هەندێ لەوانەی گوێڕایەڵیان دەکردم بچین بۆ حەبەشە بۆ لای

---

١ بڕوانە: الرسول القائد (٢٠٩-٢١٠).

٢ بڕوانە: عبقرية محمد (٦٩).

نەجاشی، ئەگەر موحەممەد سەرکەوێت ئێمە لە مەترسیدا نابین، ئەگەر قورەیشیش سەرکەوێت ئێمە پلەو پایەمان پارێزراو دەبێت، ئەوانیش ڕازی بوون و پێستی زۆرمان کۆکردەوە وەکو دیاری بۆ نەجاشی چونکە لەم خاکەی ئێمە زیاتر حەزی لە پێست بوو، لەو کاتەی لای بووین نێردراوی پێغەمبەر(ﷺ)(عمرو بن امیة الضمری) هاتە لای نەجاشی و دەرچوو، منیش بە نەجاشیم وت: ئەو پیاوە دوژمنی قەومەکەمە و نێردراوی دوژمنەکەمانە، بیدە بە دەستمەوە تاکو بیکوژم، چونکە کەسانێکی لە پیاوە ناودارەکانمان کوشتووە، نەجاشی بە شێوەیەك تووڕە بوو لە ترسا ئەگەر بمتوانیبا دەچوومە شەقی زەوییەوە، وتم: ئەی پادشا ئەگەر بمزانیبا وا تووڕە دەبیت هەرگیز قسەی وام نەدەکرد، وتی: دەتەوێت پیاوێکت بدەمە دەست نێردەی کەسێکە پەیام هێنەری مەزن کە دەهاتە لای موسا دێتە لای ئەو، وتم: ئەی پادشا ئایا موحەممەد وایە؟ وتی: بەڵات لێدا ئەی عەمر بە قسەم بکە و شوێنی بکەوە، چونکە سوێند بەخوا لەسەر هەق و ڕاستییەو سەریشدەکەوێتە سەر دوژمنانیدا وەکو چۆن موسا سەرکەوتە سەر فیرعەوندا، دەڵێت: منیش موسڵمان بووم و نەمهێشت هاوڕێکانم بزانن و گەڕامەوە لای پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەوەی موسڵمان بم و، پێش فەتحی مەککە خالیدم بینی، بە هەمان مەبەستەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) دەچوو، ئیتر پێکەوە ڕۆیشتین بۆ مەدینە، خالید موسڵمان بوو و بەیعەتی دا، ئینجا منیش نزیك بوومەوە و، وتم: ئەی پێغەمبەر بەیعەتت پێ دەدەم بە مەرجێك هەرچی گوناهم هەیە بسڕێتەوە لە ڕابوردوودا و، باسی داهاتوو ناکەم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:

بەیعەت بدە، چونکە ئیسلام هەرچی پێشتر کردووتە لە تاوان بۆت دەسڕێتەوە، وەکو چۆن کۆچ کردنیش تاوانی پێشوو دەسڕێتەوە، دەڵێت: منیش بەیعەتم داو ڕۆیشتم.[1]

### ٢- موسڵمان بوونی خالیدی کوڕی وەلید(ﷺ):

خالیدی کوڕی وەلید دەربارەی موسڵمان بوونی دەڵێت: کاتێك خوای گەورە خۆشەویستی ئیسلامی خستە دڵمەوە و هۆشم گەڕایەوە... وەلیدی برام موسڵمان

---

[1] بڕوانە: صحیح السیرة النبویة (٤٩٤).

بوو لە عومرەی قەزا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوو، نامەیەکی بۆ نووسیم و سەرسامی خۆی تیادا دەربڕی لەوەی تاکو ئێستا موسڵمان نەبوومە، هەروەها دەیووت: پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری تۆی لێ کردووم و منیش وتم: خوای گەورە دەیهێنێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کەسی وەکو خالید نابێت لە ئیسلام حاڵی نەبووبێت، ئەگەر ئەو توند و تیژیەشی لەگەڵ موسڵمانان بەکاربهێنایە دژ بە بتپەرستان بۆ خۆی چاکتر بوو، دەشمانخستە پێش کەسانی تر، بۆیە داوات لێ دەکەم بە خۆتدا بێیتەوە برام، چونکە کاری چاکەت زۆر لە دەست چووە.

خالید دەڵێت: کە نووسراوی براکەم پێ گەیشت گورج بوومەوەو زیاتر حەزم کرد موسڵمان بم و قسەی پێغەمبەر(ﷺ)م پێخۆش بوو.

لە خەونیشدا بینیم لە ولاتێکی تەنگو وشکدام و دەرچوومە بۆ ولاتێکی سەوز و فراوان، وتم: ئەمە خەونە ئەگەر چووم بۆ مەدینە بۆ ئەبو بەکری دەگێڕمەوە کە چووم بۆم باس کرد و ئەویش وتی: ئەوە دەرچوونتە لە بتپەرستیەوە بۆ ئیسلام، پێش ڕۆیشتنم صەفوانی کوڕی ئومەییەم بینی و بانگم کرد بۆ ئەوەی پێکەوە موسڵمان بین، بەلام بە توندی ڕەتی کردەوە و وتی: ئەگەر تەنها خۆم بمێنمەوە لە قوڕەیشدا موسڵمان نابم، ئینجا عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهلم بینی و بانگی ئەویشم کرد بۆ هەمان مەبەست و هەمان وەلامی صەفوانی دامەوە و داوام لێ کرد ئەو قسە باس نەکات لای کەس و ڕازی بوو، دەرچووم بۆ ماڵی خۆم و ولاخم بۆ ئامادەکرا و، چوومە لای عوسمانی کوڕی تەڵحە و، هەمان ئەو قسانەم بۆ کرد و، ئەویش یەکسەر ڕازی بوو، ئیتر هەردووکمان کات و شوێنی دیاریکراومان دیاری کرد، پێش بەرەبەیان لە(یأجج) یەکترمان گرت و، ڕۆیشتین تاکو گەیشتینە(الهدة) و لەوێ عەمری کوڕی عاص مان بینی و وتی: بەخێر بێن، وتمان: خۆت بەخێربێی، وتی: بۆ کوێ دەچن، وتمان دەڕۆین موسڵمان بین، وتی: منیش هەمان مەبەستم هەیە.

دەڵێ ئیتر بووینە هاوڕێ و پێش ڕۆیشتنمان پێغەمبەر(ﷺ) ئاگادار کرایەوە و زۆر پێخۆشحاڵ بوو، منیش چاکترین پۆشاکم لەبەر کرد و چووم بەرەو لای پێغەمبەر(ﷺ)، براکەم بینی و، وتی: پەلە بکە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ)

چاوەڕوانتانە، منیش خێرا بوومەوە، بینیم پێغەمبەر(ﷺ) زەردەخەنەیەتی ، سڵاوم لێکرد و وەڵامی دامەوە، وتم:(اشهد ان لا الـه الا الله وان محمداً رسول الله) ئەویش فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە تۆی ڕێنموونی کرد بۆ ئیسلام، من تۆم دەبینی هۆشمەندیو تکام وابوو خوای گەورە تووشی خێر و چاکەت بکات، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا خراپەم زۆر کردووە، داوا بکە خوای گەورە لێم خۆش بێت، وتم: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئیسلام هەرچی پێش خۆی هەیە لای دەبات، ئینجا فەرمووی خوایە خۆش بە لەو خراپانەی خالید کردوویەتی بەرامبەر ئیسلام، ئینجا عەمر و عوسمان چوونە پێشەوە و بەیعەتیان دا، موسڵمان بوونمان لە مانگی صەفەری ساڵی هەشتی کۆچیدا بوو، لەم بەسەرهاتەش چەند سوودێك وەردەگرین:

أ- تووڕەبوونەکەی نەجاشی دەربڕینە لە بیروباوەڕی ڕاستەقینەی ئەو، کە ئەو بووە هۆکارێك بۆ موسڵمان بوونی یەکێك لە سەرانی قوڕەیش.[1]

ب- موسڵمان بوونی عەمری کوڕی عاص سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆئیسلام و، بتپەرستان بە لە دەستدانی هۆشمەندێکی وەکو عەمر زیانێکی گەورەیان بەسەردا هات.[2]

ج- خالید وەکو لە قسەکانی دەردەکەوێت - دڵنیا بوو لەوەی دوارۆژ تەنها بۆ ئیسلامە، ئەمەیش پەندێکە بۆ هەموو ئەوانەی دژایەتی ئیسلام دەکەن.[3]

د- بایەخدان بە مرۆڤەکان جۆرێکە لە کارتێکردنیان و ڕاکێشانیان بۆ ڕیزی ئیمانداران، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) ئەو قسانەی دەربارەی خالید فەرموو، کاریگەریشی هەبوو لەسەریو لەوەش دڵنیا بوو ئەگەر موسڵمان بێت ناکەوێتە کۆتایی لیستەکەوە، بۆیە بڕیاریدا گوێ بە پیلانەکانی شەیتان نەدات و موسڵمان بێت، خوای گەورەیش لەسەر دەستی خالید و عەمر چەند لاپەڕەیەکی پڕشنگداری لە مێژووی ئیسلام تۆمار کرد، کە هەرگیز لە یادەوەری نەتەوەی ئیسلامدا هەر دەمێنێتەوە لەگەڵ ڕۆژاندا.[4]

---

١ التاريخ الاسلامي (٧/٩٠).
٢ سەرچاوەی پێشوو (٧/٩١).
٣ صلح الحديبية لأبي فارس (٢٦٣)، التاريخ الاسلامي للحميدي (٧/٩٥).
٤ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٧/٩٥).

## باسی چوارەم: پۆلی سەربازی موئتە(٨ك)

### یەکەم: هۆکارو مێژووی.

عەرەبەکانی شام شەڕیان هەڵگیرسان لە نێو موسڵمانان و بێزەنتەکان، چونکە هەردوو هۆزی(کلب) و(قضاعة) کە لە نزیك(دومة الجندل) بوون هەمیشە کۆسپیان دروست دەکرد بۆ موسڵمانان لە ڕێگەی ڕێگەگرتن لەو بازرگانانەی کەلوپەلیان دەهێنا لە شامەوە بۆ مەدینە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) لە ساڵی پێنجەمی کۆچی غەزایەکی کردە سەر(دومة الجندل) بەڵام ئەوان بڵاوەیان کردبوو، هەروەها ڕێگەش گیرا لە (دحية الكلبي)لە کاتی گەڕانەوەی وەکو نێردراوی پێغەمبەر(ﷺ)، بۆیە پۆلە سەربازییەکەی زەیدی کوڕی حاریسە نێردرا بۆ یەکلاکردنەوەی لە ساڵی شەشەمی کۆچی و هەردوو هۆزی(مذحج) و(قضاعة) دەست درێژییان کردە سەری ، لە پاش ئاشتی حودەیبیەش ئەو دەست درێژییان زیادی کرد پاش کوژرانی(الحارث بن عمير الازدي) ڕەوانەکراوی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ لای فەرمانڕەوای(بصرى) سەر بە ڕۆمەکان، هەروەها فەرمانڕەوای دیمەشقیش پێشوازی ناشیرینی کرد لە ڕەوانەکراوی پێغەمبەر(ﷺ) هەڕەشەی کرد پەلاماری مەدینە بدات، لە پاش ساڵێکیش هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) لەو ناوچە کوژران کە ڕۆیشتبوون بۆ بانگەوازی ئیسلامی، تەنها سەرکردەکەیان نەبێت.[1]

ئینجا گاورەکانی شام دەستدرێژییان دەکردە سەر هەر کەسێك موسڵمان بێت، یان بیر لە موسڵمان بوون بکاتەوە، فەرمانڕەوای(معان)یشیان کوشت کاتێك موسڵمان بوو، هەروەها والی شام هەڵسا بە کوشتنی ئەوانەی موسڵمان بوون لە عەرەبەکانی شام.[2]

هەموو ئەم کارەساتانە، بە تایبەتی کوژرانی ڕەوانەکراوەکەی پێغەمبەر(ﷺ)، هاندەرێك بوو بۆ تۆڵەسەندنەوە و، تەمێ کردنی عەرەبەکانی شام، بۆ ئەوەی

---

١ بڕوانە: تاريخ الطبري (٣/٣)، (المسلمون والروم في عصر النبوة لعبدالرحمن احمد سالم (٨٧).
٢ بڕوانە: خاتم النبيين (١١٣٩/٢) نقلا عن الصراع مع الصليبيين لأبي فارس ، (٢٠).

شکۆداری دەوڵەتی ئیسلامی لەو ناوچانە بسەپێنرێت و، ئەو دەستدرێژییانە دووبارە نەبێتەوە و، بانگخواز و بازرگانە موسڵمانەکان بتوانن لە نێوان شام و مەدینە بەبێ ترس کاری خۆیان بە ئەنجام بگەیەنن.[١]

لە ساڵی هەشتەمی کۆچی بە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) پۆلێکی سەربازی ئامادەکرا لە سێ هەزار جەنگاوەر، پێغەمبەر(ﷺ) سێ کەسی بۆ سەرکردایەتی هەڵبژارد بە دوای یەکتردابن، زەیدی کوڕی حاریسەو جەعفەری کوڕی ئەبو تالیبو عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە،[٢] وەکو بوخاری دەگێڕێتەوە لە عومەری کوڕی خەتتاب(ﷺ).[٣]

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانیشی پێکردن بچنە ئەو جێگای حاریسی کوڕی عومەیری تیا کوژرا(ﷺ) و، بانگیان بکەن بۆ ئیسلام، ئەگەرنا جەنگیان لەگەڵ بکەن.[٤] هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) ڕاسپاردەی پێکردن و فەرمووی: ڕاسپاردەتان پێ دەکەم ترسی خواتان هەبێت.... و بە ناوی خوا و لە پێناو خوا غەزا بکەن دژ بە بێباوەڕان، ناپاکی مەکەن، منداڵ و ئافرەت و بە ساڵاچوو و قەشە مەکوژن کە لە کڵێسا خواپەرستی بکات، دارخورما و درەخت مەبڕن، خانوو مەڕوخێنن، کە دوژمنی موشریکتانیش بینی بانگی بکەن بۆ سێ شت: موسڵمان بوون، سەرانە، یان جەنگ...[٥]

## دووەم: بەڕێکردنی سوپای ئیسلامی.

کاتێک سوپاکە ئامادە بوو، پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان بەڕێیانخستن‌و پاڕانەوەخوای گەورە سەریان بخات‌و بە سەلامەتی و سەربەرزی بیانگێڕێتەوە.[٦]

---

١ بڕوانە: المسلمون والروم في عصر النبوي (٨٩).
٢ بڕوانە: الصراع مع الصليبيين، (٢٠).
٣ البخاري، كتاب المغازي (١٠٢/٥) رقم (٤٢٦١).
٤ بڕوانە: السيرة الحلبية (٧٨٧/٢).
٥ بڕوانە: المغازي (٧٥٧/٢-٧٥٨).
٦ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٢١/٤).

لەو کاتەدا عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە دەستی کرد بە گریان و خەڵکی سەرسام بوون لە گریانەکەی، ئەویش فەرمووی: سوێند بە خوا دونیام خۆش ناوێت، بەڵام گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو ئایەتێکی لە قورئان خوێندەوە: ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا﴾(مریم: ٧١). ئینجا عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە فەرمووی:

لكنني اسأل الرحمن مغفرة — وضربة ذات فرغ تقذف الزبدا
او طعنة بيدي حران مجهزة — بحربة تنفذ الاحشاء والكبدا
حتى يقولوا اذا مروا على جدثي — ارشده الله من غاز وقد رشدا

## سێیەم: سوپا دەگاتە مەعان و سێ فەرماندەکە شەهید دەبن.

کاتێك سوپای ئیسلامی گەیشتە مەعان لە خاکی شام – ئەمڕۆ یەکێکە لە پارێزگاکانی ئوردون – هەواڵیان زانی گاورەکان زیاتر لە سەد هەزار کەسیان کۆکردووەتەوە لە هۆزە عەرەبەکانی(لخم) و(جذام) و(بهراء) و(بلي) بە سەرکردایەتی مالیکی کوڕی ڕافیلە. هیرەقلیش سەد هەزار گاوری کۆکردووەتەوە بۆ ئەوەی سوپای ئیسلامی سەرسام بێت و وورەی بڕوخێت بە بینینی دووسەد هەزار جەنگاوەر.[1]

موسڵمانان لە نێو خۆیاندا دوو ڕۆژ ڕاوێژیان کرد لەم بارەوە، هەندێکیان وتیان: کەسێك دەنێرین پێغەمبەر(ﷺ) ئاگادار بکاتەوە بزانە فەرمانی بە چی دەبێت،[2] هەندێکیشیان گەڕانەوەیان بە باش زانی،[3] بەڵام عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە هەڵوێستەکەی یەکلاکردەوەو وتی: ئەی خەڵکینە، ئەوەی پێتان قورسە مەگەر شەهیدی بێت کە خۆتان داوای دەکەن! ئێمەیش بە زۆری و بەهێز شەڕ لەگەڵ دوژمن ناکەین، بەڵکو تەنها بەو ئایینەی خوای گەورە ڕێزی لێ گرتووین پێی،

---

١ بڕوانە: شرح المواهب اللدنية (٢/٢٧١).
٢ بڕوانە: زاد المعاد (٣/٣٨٢).
٣ بڕوانە: تاريخ دمشق لابن عساكر (١/٣٩٦).

ڕاپەڕن، یەکێك لەو دوو چاکەیە دەستگیرمان دەبێت: یان سەرکەوتن، یان شەهیدی وتەکانی عەبدوڵا هەستی موجاهیدەکانی گڕدا ، زەیدی کوڕی حاریسە خەڵکەکەی بەرەو ناوچەی موئتە برد بۆ شەڕی ڕۆم لەوێ، لەوێیش داستانێکی مەزنیان تۆمار کرد بە شەهید بوونیان کۆتایی پێهات،[١] زەیدی کوڕی حاریسە ڕۆیشتە نێو ڕیزەکانی دوژمنەوە بە ئاڵای پێغەمبەر(ﷺ) و شەهید بوو.[٢]

ئینجا جەعفەر ئاڵاکەی هەڵگرت و ڕووبەڕووی موشریکەکان بوویەوە، ئەوانیش دەوریاندا، ئەویش هەر بەردەوام بوو لە شەڕکردن رو لە ئەسپەکەشی دابەزی و ئەسپەکەی سەربڕی و دەیووت:

يـا حبـذا الجنـة واقترابهـا طيبـة وبـارداً شـرابها
والـروم روم قـد دنـا عـذابها كـافرة بعيـدة انـسابها
عليَ اذ لاقيتها ضرابها[٣]

ئاڵاکەی بە دەستی ڕاستی گرتو دەستی بڕا، ئینجا بە دەستی چەپی گرتی و ئەویش بڕا، ئینجا ئاڵاکەی بە باڵەکانی گرت و خۆی دایە سەر ئاڵاکەدا و شەهید بوو لە تەمەنی سی و سێ ساڵیدا، لاشەی نەوەد لێدانی پێوە بوو، هەمووشی لە پێشەوە بوو.[٤]

پێشەوا بوخاری لە عومەری کوڕی خەتتابەوە دەگێڕێتەوە فەرموویەتی:

لەو غەزایەدا بووم‌و بۆ جەعفەر گەڕاین، لە ناو کوژراوەکاندا دۆزیمانەوە، زیاتر لە نەوەد لێدان بە لاشەیەوە بوو.[٥]

خوای گەورەیش قەرەبووی جەعفەری کردەوە لەسەر ئازایەتییەکەی بەوەی دووباڵی پێ بەخشی لە بەهەشتدا، بوخاری دەگێڕێتەوە، کاتێك عەبدوڵای کوڕی عومەر سڵاوی لە کوڕەکەی جەعفەر دەکرد دەیووت: سڵاوت لێ بێت ئەی کوڕی

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٢/٤٦٨).
٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٤/٢٥).
٣ هەمان سەرچاوە (٤/٢٦).
٤ بڕوانە: الصراع مع الصليبيين، (٥٨).
٥ البخاري، كتاب المغازي (٥/١٠٢) رقم (٤٢٦١).

خاوەن دووباڵ.[١]

لە پاش شەهید بوونی جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب، عەبدوڵای کوڕی ڕەواحەی ئەنصاری ئاڵاکەی وەرگرت و سواری ئەسپەکەی بوو و دەیفەرموو:

| | |
|---|---|
| اقسمت یانفس لتنزلنّه | لتنزلن او لتكرهنّه |
| ان اجلب الناس وشدوا الرّنة | مالي اراك تكرهين الجنة |
| یا نفس الا تقتلي تموتي | هذا حمام الموت قد صليت.[٢] |

دەگێڕنەوە ئامۆزایەکی عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە پارچە گۆشتێکی پێدا بۆ ئەوەی هەندێ هێزی پێ ببەخشێت، ئەویش کەمێکی لێ خوارد و، گوێی لە دەنگی پێی ئەسپو دەنگە دەنگ بوو لە بەرەی جەنگدا، جا بە خۆی وت: تۆیش هێشا لە دونیای، ئینجا گۆشتەکەی فڕێدا و بەرەو ڕووی دوژمن ڕۆیشت و لە کۆتایی ئەو ڕۆژەدا شەهید کرا.[٣]

## چوارەم: موسڵمانان خالیدی کوڕی وەلید هەڵدەبژێرن بۆ سەرکردایەتی.

پاش شەهید بوونی عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە سابیتی کوڕی ئەقرەم ئاڵاکەی لە دەستی وەرگرت و داوای کرد لە موسڵمانان کەسێك هەڵبژێرن بۆ سەرکردایەتییان سابیت ڕازی نەبوو خۆی ئەو ئەرکە هەڵگرێ، بۆیە موسڵمانان لەسەر خالیدی کوڕی وەلید ڕێککەوتن،[٤] سابیت تەماشای خالیدی کردو وتی: ئاڵاکە بگرە باوکی سولەیمان، وتی: نەخێر، تۆ مافدارتری، تۆ ئامادەی جەنگی بەدر بوویتە، سابیت وتی: وەریبگرە، سوێند بە خوا لەبەر تۆ هەڵمگرتووە، ئینجا خالید وەریگرت،[٥]

---

١ البخاري، كتاب المغازي (٥/١٠٣) رقم (٤٢٦٤).
٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٤/٢٦-٢٧).
٣ بڕوانە: الصراع مع الصليبيين، (٦١).
٤ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٤/٢٧).
٥ إمتاع الاسماع (١/٣٤٨-٣٤٩).

ئەرکیشی لەو کاتە سەختەدا ئەوە بوو موسڵمانان ڕزگار بکات لە تیاچوونێکی بە کۆمەڵ کە چاوەڕوانیانی دەکرد، پاش ئەوەی بە تەواوی هەڵوێستەکەی تاوتوێ کرد، هاتە سەر ئەو بۆچوونەی کە پاشەکشە بکات بە موسڵمانان بۆ کەمکردنەوەی زیانەکان، چونکە هێزی دوژمن شەشت و شەش بەرامبەری هێزی موسڵمانان بوو، بۆیە پلانی خالید بەم شێوەی خوارەوە بوو:

أ- دروست کردنی بەربەست لە نێوان هەردوو سوپاکە بە مەبەستی پاشەکشە کردن بە سەلامەتی.

ب- بۆ ئەم مەبەستە، وای دەرخست بۆ دوژمنان کە یارمەتی بەڕێوەیە بۆ موسڵمانان، خالید خۆی ڕاگرت تاکو ئێوارە لەسەر ئەم پلانە، لە تاریکی شەویشدا جێگای جەنگاوەرەکانی گۆڕی ڕاست بۆ چەپ و پێشەوە بۆ دواوە و، لەم کاتەدا دەنگە دەنگێکی گەورە دروست بوو، ئینجا هێرشی کردە سەر دوژمن، لە کاتی سپێدە بە چەند پەلامارێکی خێرا و یەك لە دوای یەك بۆ ئەوەی ئەوە پیشان بدات کە یارمەتیەکە گەیشت.[1]

پیلانەکە سەرکەوت و کە ڕۆژ بوویەوە دوژمن هەندێ ئاڵا و ڕوخساری تازەی بەرچاوکەوت و، دڵنیا بوون لەوەی یارمەتیان پێ گەیشتووە، بۆیە زانیان کە ناتوانن بە شێوەیەکی یەکلایی کەرەوە سەرکەونە سەر موسڵماناندا، نەشیاندەتوانی بەردەوام بن لە هێرشەکانیان و پاڵەپەستۆ لەسەر موسڵمانان کەم بوویەوە، خالید ئەم هەلەی قۆستەوە، لە هەڵمەتێکی کەم وێنە لە مێژووی سەربازیدا کە لەگەڵ تەکنیکی نوێ دەگونجێت توانی سوپاکە بگەڕێنێتەوە، خالید هەردوو باڵی سوپاکەی دیاری کرد بۆ پاسەوانێتی ناوجەرگەی سوپاکە، لەو کاتەیشدا هێزی ناوڕاستی پاشەکشە پێکرد بۆ ئەوەی پاشەکشەیەکی گشتی دەستەبەر بکات بە سەلامەتی.[2]

مێژوونووسان دەڵێن کوژراوی موسڵمانان لەم جەنگەدا لە دوانزە کەس تێنەپەڕی، خالید خۆی دەفەرمووێت: لە جەنگی موئتە حەوت شمشێر بە

---

١ البداية والنهاية (٤/٢٤٧)، الواقدي (٢/٧٦٤).

٢ بڕوانە: معارك خالد بن الوليد، د. ياسين سويد (١٧٣).

دەستمەوە شکا...[١]

دەتوانین بڵێین خالید بەو پلانەی خۆی، موسڵمانانی دەرباز کرد لە تێکشکانێکی لە ناوبەر و، پاشەکشە کردنەکەشی ئەوپەڕی سەرکەوتن بوو، چونکە لەو جۆرە جەنگانە پاشەکشە کردن کارێکی یەکجار سەخت و گرانە.[٢]

## پێنجەم: موعجیزەی پێغەمبەر(ﷺ) و هەڵوێستی خەڵکی مەدینە لە سوپاکە.

پێغەمبەر(ﷺ) لە مەدینە هەواڵی کوژرانی زەید و جەعفەر و عەبدوڵای کوڕی ڕەواحەی گەیاندە موسڵمانان پێش ئەوەی بگەڕێنەوە، هەروەها ئاگاداریشیکردنەوە کە خالید ئاڵاکەی وەرگرتووە پاش ئەوان و ناوی خالیدیشی نا شمشێری خوا،[٣] پاش ئەوە کەسێك هات و هەواڵەکانی گەیاند و هەر ئەوانەی باسکرد کە پێغەمبەر(ﷺ) باسی کردبوو.[٤]

کاتێك سوپاکە لە مەدینە نزیك بوویەوە، موسڵمانان چوونە پێشوازییانەوە، پێغەمبەر(ﷺ) خۆیشی لەسەر ولاخێك بوو، دەیفەرموو:((خذوا الصبيان واحملوهم، واعطوني ابن جعفر)) واتە: منالەکان ببەن و هەڵیان گرن، کوڕەکەی جەعفەریش بدەن بە خۆم، ئیتر عەبدولایان هێنا، خەڵکەکە خۆڵیان دەکردە سەر سوپاکەدا دەیانوت: ئەی هەڵهاتووان، ئایا لە پێناو خوا هەڵهاتن؟ پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو:((ليسوا بالفرار، ولكنهم الكرار ان شاء الله))،[٥] واتە: نەخێر هەڵهاتوو نین، بەڵکو گەڕاوەن(انشاء الله).

مرۆڤ سەری سوڕ دەمێنێت لەو پەروەردە پێغەمبەرایەتییە کە لەو منالانەدا هەموو، پیاو و پاڵەوانی لەو جۆرەی دروست کردووە، ئەوان لە کوێ و لاوەکانی ئێمە لە کوێ کە لەسەر جادەکان دەسوڕێنەوە، ئوممەت ناتوانێت بەرزبێتەوە بۆ

---

١ البخاري، كتاب المغازي (١٠٣/٥) رقم (٤٢٦٦).

٢ هەمان سەرچاوە (١٧٥).

٣ بڕوانە: نضرة النعيم (٣٦٠/١).

٤ البداية والنهاية (٢٥٥/٤).

٥ بڕوانە: السيرة النبوية للندوي (٣٢٨)، تاريخ الذهبي (٤٩١).

ئەو ئامانجە بەرزانە بە پەروەردەی ئیسلامی نەبێت لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر(ﷺ).[١]

## شەشەم: وانە و پەندەکان.

### ١ـ گرنگی ئەو جەنگە:

ئەم جەنگە لە گرنگترین جەنگەکانی موسڵمانانو خاچ پەرستانە، چونکە یەکەم ڕووبەڕووبوونەوە بوو لە نێوان هەردوو کۆمەڵەکە، هەروەها کاریگەریشی هەبوو لەسەر دەوڵەتی ڕۆمانی، چونکە پێشەکییەك بوو بۆ فەتحکردنی وڵاتی شام و ڕزگارکردنی لە دەستی ڕۆمان، دەشتوانین بڵێین ئەو غەزایە یەکەمین هەنگاوی کردەیی بوو لە لایەن پێغەمبەر(ﷺ) بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی ڕۆمی ستەمکار و شکۆداریشی نەما لە چاوی عەرەبەکاندا، هەروەها ورە نزمی سەربازی خاچ پەرستی ئاشکرا کرد،[٢] هەلێکیشی ڕەخساند بۆ موسڵمانان بۆ ئەوەی ئاستی هێزەکانی ڕۆم تێبگەن.

### ٢ـ خۆشەویستی شەهید بوون هۆکاری فیداکاری بوو:

دان بەخۆگرتن و جێگیر بوون و فیداکاری کە لە هەریەك لە سەرکردەکاندا ئاشکرا بوو، هەڵقوڵاوی پەرۆشی بوو بۆ پاراستنی موجاهیدەکان و حەزکردن لە شەهیدی،بۆ ئەوەی خوای گەورە بیانخاتە بەهەشتی بەرینەوە لەگەڵ پێغەمبەران و شەهیدان و پیاوچاکان.

### ٣- جیاوازی ئەم جەنگە لەگەڵ جەنگەکانی تر:

تاکە جەنگێکە کە هەواڵەکەی لە ئاسمانەوە هات و، پێغەمبەر(ﷺ) ئاگادارکرایەوە لە شەهید بوونی سەرکردەکان و ڕووداوەکانی جەنگەکە، تاکە جەنگێکیشە، کە پێغەمبەر(ﷺ) سێ سەرکردەی بۆ دیاری کرد بە دوای یەکدا: زەیدو جەعفەر و عەبدوڵا.[٣]

---

١ بڕوانە: دروس وعبر من الجهاد النبوي (٣٥٨).

٢ بڕوانە: الصراع مع الصليبيين، (٦٤).

٣ بڕوانە: الصراع مع الصليبيين، (٦٦).

### ٤- ڕێزلێنانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ خاووخێزانی جەعفەر:

کاتێك جەعفەر کوژرا پێغەمبەر(ﷺ) چووە لای ئەسمائی کچی عومەیس و فەرمووی: منداڵەکانی جەعفەرم بۆ بهێنە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بۆنی دەکردن و ماچی دەکردن و فرمێسکی چاوەکانی دەهاتنە خوارێ، ئەسماء وتی: هیچ هەواڵێکت پێگەیشتووە دەربارەی جەعفەر و هاوەڵانی؟ فەرمووی: بەڵێ ئەمڕۆ کوژراون، ئینجا ئەسماء دەستی بەگریانو هاواری کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بێ ئاگا مەبن لە خاووخێزانی جەعفەر، خواردنیان بۆ دروست بکەن، چونکە سەرقاڵ بوون بە مردنی جەعفەرەوە.[1] لەم هەواڵە تێبینی چەند مەسەلەیەك دەکرێت:

#### أ- ڕێدراوە ئافرەت بگری لەسەر مێردەکەی:

چونکە ئەسماء لە پێش پێغەمبەر(ﷺ) گریا و هاواری کرد و پێغەمبەر(ﷺ) نکۆڵی لێ نەکرد، چونکە ئەوەی کە قەدەغەکراوە، شیوەن و لەخۆدان و یەخەدادڕینە و، ڕازی نەبوونە بە قەدەری خوای گەورە.

#### ب- چاکتر وایە خواردن دروست بکرێت بۆ ماڵی مردوو:

چونکە دڵنەوایی و ئاسانکردنەوەی تیایە لەسەریان، هەروەها هاوبەرپرسیارێتییە لە نێوان موسڵمانان، ئەم سوننەتەیش پێچەوانە بووەتەوە لەم ڕۆژگارە لای هەندێ لە موسڵمانەکان، خاووخێزانی مردووەکە خواردن دروست دەکەن بۆ خەڵکی، ئەمەیش کارێکی ناشیرینە پێویستە موسڵمانان لێی دووركەونەوە.[2]

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) نەهی کردوو لە گریان لە پاش سێ ڕۆژ، پێغەمبەر(ﷺ) چووە لای ئەسماء و فەرمووی:((لاتبكوا على اخي بعد اليوم، ادعوا لي بني اخي))، واتە: مەگرین لەسەر براکەم دوای ئەمڕۆ، برازاکانم بۆ بانگ بکەن.

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية مع الصليبيين (٦٨).
٢ بڕوانە: الصراع مع الصليبيين، (٦٨).

ئیتر هێنایان دەتوت جوجکەن، ئینجا سەرتاشەکەی بانگ کرد و سەری تاشین، فەرمووی: موحەممەد لە ئەبو تالیبی مامم دەچێت، عەبدولاًیش لە ڕواڵەت و ئاکاردا لە خۆم دەچێت، ئینجا دەستی ڕاستی عەبدولاًی گرت و فەرمووی: خوایە جێگای جەعفەر پڕبکەیتەوە دوای خۆی، درود و کامەرانیش بدەی بەسەر عەبدولاًدا، سێ جار ئەم قسەی دووپات کردەوە، ئینجا کاتێك دایکیان باسی ئەوەی کرد کە ئەوان هەتیوو و لاوازن پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((العيلة تخافين عليهم، وانا وليهم في الدنيا والاخرة))،[1] واتە: ئایا دەترسیت پێویستیان بە هیچ بکەوێت و من خاوەنیانم لە دونیا و دواڕۆژدا، ئەمەیش ڕێبازێکی بەخشندەی پێغەمبەرە(ﷺ) بۆ چاودێری کردنی منداڵی شەهیدان بۆ ئەوەی ئوممەت شوێن پێی هەڵگرێت.[2]

**ج- هاوسەرگیری ئەبو بەکر لەگەڵ ئەسمائی کچی عومەیس:**

پاش تێپەڕبوونی عیددەی ئەسمائی کچی عومەیس ئەبو بەکری صدیق(ﷺ) هاتە خوازبێنی و مارەی کرد و موحەممەدی لێ بوو، پاش کۆچی دوایی ئەبو بەکریش عەلی مارەی کرد و چەند منداڵێکی لێ بوو.[3]

(ابن كثير) دەڵێت: ئەسماء بۆ جەعفەری مێردی دەگریا و دەیوت:

فآليت لاتنفك نفسي حزينة عليك ولا ينفك جلدي اغبرا
فلله عينا من رأى مثله فتى اكبرّ واحمر في الهياج واصبرا

**٥- تێگەیشتنی سەرکردایەتی:**

بە ڕاستی وانەیەکی مەزنە هاوەڵی بەڕێز سابیتی کوڕی ئەقرەم پێشکەشمان دەکات، کاتێك خالیدی هەڵبژارد لەو کاتە سەختەدا، سوێندیشی خوارد ئالاکەی بە نیازی خالیدەوە هەڵگرتووە و، بە ڕاستی زانی کەسی گونجاو هەڵبژێرێت و قبووڵیشی نەکرد کاتێك موسڵمانان پێیان وت تۆ سەرکردەمانی، چونکە دەیزانی

---
١ البداية والنهاية (٤/٢٥٢).
٢ السيرة النبوية لأبي شهبة (٢/٤٣٠).
٣ البداية والنهاية (٤/٢٥٣).

خالید لە خۆی لێهاتووترە، خۆ سابیت بێ دەسەڵات نەبوو لەوەی سەرکردایەتی موسڵمانان بکات – کە خۆی یەکێکە لەوانەی ئامادەی بەدر بوونە – بەڵام بە ستەمی زانی کارێك لە ئەستۆ بگرێت و کەسێکی تر هەیە لە خۆی شیاوتر پێی هەڵسێت، با تەنها سێ مانگیش بێت موسڵمان بووبێت، چونکە ئامانج ئەوەیە فەرمانی خوای گەورە بە باشترین شێوە جێبەجێ بکرێت.[1]

**٦- وانەیەکی پێغەمبەرانە لە ڕێزگرتنی سەرکردایەتی:**

عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعی(ﷺ) دەفەرمووێت: لە غەزای موئتەدا بووم و پیاوێکی یەمەنیم لەگەڵدا بوو بۆ یارمەتی هاتبوو، پیاوێك لە ڕۆمەکان لەسەر ئەسپێکی خەنەیی بوو، زینی ئەسپەکەی و چەکەکەشی بە ئاوی ئاڵتون داپۆشرابوو، ئەو ڕۆمییە لە موسڵمانانی دەدا، ئیتر کابرای یەمەنی خۆی بۆ حەشاردا و لە ئەسپەکەی دا و ڕۆمییەکەشی کوشت، ئینجا شتەکانی تالان کرد، بەڵام خالید ناردی بە دوایدا هەندێکی لەو شتانە لێ وەرگرتەوە، عەوف هاتە لای خالید نکوڵی لێ کرد، بەڵام خالید هیچی بۆ پیاوە یەمەنییەکە نەگێڕایەوە، کە گەڕانەوە پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لە خالید کرد بۆ ئەو کارەی کردووە، وتی: بە زۆرم زانی بۆی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بیگێڕەرەوە بۆی، عەوف وتی: پێم نەوتی خالید؟ پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری کرد لە مەسەلەکە و بۆم باسکرد، ئینجا بینیم تووڕە بوو و، فەرمووی: ئەی خالید مەیگێڕەرەوە بۆی، ئایا واز لە فەرماندەکانم دەهێنن؟ چاکەیان بۆ ئێوەیە و خراپەیان بۆ خۆیانە.[2]

ئەمەیش هەڵوێستێکی مەزن بوو لە پێغەمبەر(ﷺ)ەوە بۆ پاراستنی سەرکردەکان بۆ ئەوەی تووشی سووکایەتی نەبن بە هۆی هەندێ هەڵە کە لێیانەوە دەردەکەوێت، چونکە ئەوان مرۆڤن و هەڵە دەکەن، جا پێویستە هەوڵ بدرێت هەڵەکانیان چاك بکرێتەوە بەبێ بەکەم تەماشاکردن یان سووکایەتی پێ کردن، عەوف کاری چاکەی خۆی کرد، بەڵام بەوە ڕانەوەستا و جۆرێکی لە شاکامی

---

١ التاريخ الاسلامي للحميدي (٧/٢٢٤)، من معين السيرة للشامي (٣٧٦).

٢ ابوداود، كتاب الجهاد رقم (٢٧١٩).

دەربڕی بەرامبەر بە خالید، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) بەوە ڕازی نەبوو و، فەرمانیشی کرد بە خالید ئەوەی وەریگرتووە نەیگێڕێتەوە، بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) ئەو موجاهیدەی ڕازی کردووە بە قەرەبوو کردن یان وازهێنانی یان هەر شتێکی تر کە باس نەکراوە لە هەواڵەکەدا.[1]

هەر نەتەوەیەك ڕێزی پیاوانی خۆی نەگرێت سیستەمی تیا بەرپانابێت، پەروەردەی ئیسلامیش توانی ئەو ئوممەتە بە شێوەیەکی پتەو دابمەزرێنێت، موسڵمان ئەمڕۆ زۆر پێویستیان بەوە هەیە هەریەکە و بە پێی خزمەتی بۆ ئیسلام ڕێزی لێ بگیردرێت، هەموانیش لەو چوارچێوەدا بن کە خوای گەورە وەسفی موسڵمانانی پێکردووە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾(المائدة: ٥٤).

ئینجا فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ خالید:((هل انتم تاركون لي امرائي)) نیشانەیەکی ترە دەدرێتە خالید، کە بە فەرمانڕەوایانی پێغەمبەر(ﷺ) ژمێردراوە.[2]

**٧- پێوەرەکانی ئیمان و کاریگەری لە جەنگەکاندا:**

سوپای ئیسلامی لە مەعان ڕاوەستا بۆ تاوتوێ کردنی زۆری سوپای دوژمن، پێوەرە مادییەکانیش هانی نەدەدان لەسەر هەڵگیرسانی جەنگ، بەڵام ئەوان بە پێوەری ئیمانییەوە چوونە جەنگەکەوە و بە دوای شەهیدبووندا دەگەڕان.

زەیدی کوڕی ئەرقەم دەفەرموێت: منداڵێکی هەتیوو بووم لە لای عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە بەخێوی کردم، لەو غەزایەشدا لەگەڵ خۆی بردمی و لە پشت خۆیەوە سواری کردم، سوێند بە خوا شەوێك گوێم لێ بوو دەیوت:

وجاء المسلمون وغادروني      بارض الشام مشتهي الثواء

واتە: موسڵمانان هاتن و بەجێیان هێشتم، لە خاکی شامدا کە حەزم لە مانەوەیە

---

١ التاريخ الاسلامي للحميدي (١٣٠/٧).

٢ بڕوانە: معين السيرة (٣٧٨).

تیایدا، دەڵێت: کاتێك گوێم لێ بوو وایوت گریام، ئەویش بە قامچیەکەی بە هێواش لێیدام و وتی: چیت لەسەرە تۆ ئەگەر خوای گەورە شەهیدیم پێ ببەخشێت و تۆ لەگەڵ کاروانەکە بگەڕێیتەوە.[1]

ئەگەر وردبینەوە لە غەزای موئتە یارمەتیمان دەدات بۆ چارەسەرکردنی شکستی گیانی کە ئوممەت پێیدا تێدەپەڕێت و بەڵگە بسەپێنێتە سەر ئەوانەی وا دەزانن هۆکاری شکستمان پێشکەوتنی تەکنەلۆژییە لە لای دوژمنامان.(ابن کثیر) بۆچوونی خۆی دەربارەی ئەم جەنگە تۆمار دەکات و دەڵێت:(... کارێکی مەزنە دوو سوپای دوژمن بەیەکتر لە ئاییندا بجەنگن لە دژی یەکتر، یەکێکیان لە پێناو خوا دەجەنگێت و سێ هەزار کەسن، ئەوی تریان بێباوەڕە و دووسەد هەزار جەنگاوەرن و لە ڕووی یەکتر ڕاوەستاون، سەرەڕای ئەوەیش تەنها دوانزە کەس لە موسڵمانان دەکوژرێت و خەڵکێکی زۆر لە موشریکەکان کوژرا، خالید تەنها خۆی نۆ شمشێر بە دەستیەوە شکا، پلێتێکی یەمانی بە دەستیەوە مایەوە، تۆ بڵێی چەندی بەو شمشێرانە کوشتبێت، لێگەڕێ لە پاڵەوانان و هەلگرانی تری قورئان چۆن زاڵ بوونە سەر خاچپەرستان نەفرینی خوایان لەسەر بێت لە هەموو جێگا و ساتێکدا).[2]

**٨- هۆنراوەی کەعبی کوڕی مالیك لە گریان بۆ کوژراوانی موئتە:**

هۆنراوەی زۆری نووسی دەربارەیان، لەوانە:

فی لیلة وردت علي همومها      طوراً احنّ وتارة اتململ

واعتادني حزن فبتّ كأنني      ببنات نعش والسماک موکّل

تاکو دەگاتە کۆتایی هۆنراوەکەی باسی پەژارەی خۆی دەکات لە شەهیدەکان و ئازایی موسڵمانان لەو غەزایەدا، هەروەها حەسسانی کوڕی سابیت بە هەمان شێوە هۆنراوەی فەرمووە دەربارەی جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب و، عەبدوڵای کوڕی

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٤/٢٤-٢٥).
٢ بڕوانە: البداية والنهاية (٤/٢٥٩).

ڕەواحە، چونکە دەزگای ڕاگەیاندن بە چاکی هەڵدەسا بە ڕۆڵی خۆی و بەهرەی شیعری بەکاردەهێنا بۆ خواپەرستن.

## باسی پێنجەم: پۆلی سەربازی( ذات السلاسل )

پاش چەند ڕۆژێك لە گەڕانەوەی سوپاکە لە موئتەوە بۆ مەدینە، پێغەمبەر(ﷺ) سوپایەکی ئامادە کرد بە سەرکردایەتی عەمری کوڕی عاص بۆ(ذات السلاسل) بۆ سزادانی هۆزی(قضاعة) کە هاوکاری ڕۆمی کرد دژ بە موسڵمانان و کۆیش بوونەوە، دەیانویست لە مەدینە نزیك ببنەوە، کاتێك عەمر لێیان نزیك بوویەوە، هەواڵی پێگەیشت کە ئەوان ژمارەیان زۆرن و موسڵمانان تەنها سێ سەد کەس بوون، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) هێزێکی پاڵپشتی نارد بۆ عەمر بە سەرکردایەتی ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحەوە،[1] موسڵمانان جەنگیان لە دژ بێباوەڕان کرد و چوونە نێو ماڵەکانیانەوە و ئەوانیش هەڵهاتن و پەرتەوازە بوون، عەمریش توانی شکۆداری ئیسلام بگێڕێتەوە بۆ دەوروبەری شام و گێڕانەوەی هاوپەیمانەکانی موسڵمانان و هەروەها موسڵمان بوونی زۆرێك لە بەنی عەبس و بەنی موڕڕە و، بەنی(ذبیان) و هەروەها فەزارە و سەرگەورەکەی و کەسانی تریش، موسڵمانانیش بوون بە بەهێزترین کەس لە باکووری وڵاتی عەرەب ئەگەر چی لە سەرتاسەری وڵاتی عەرەبدا وانەبوون.[2]

**وانەو ئامۆژگاری:**

**١- دڵسۆزی عەمری کوڕی عاص(ﷺ):**

عەمر دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بە دوامدا و فەرمووی: جل و بەرگ و چەکت کۆکەرەوە و، وەرە لام،منیش چوومە لای و دەست نوێژی دەگرت،تەماشای کردم و چاوی داگرت، فەرمووی: من دەمەوێت لەسەر سوپایەکدا بتنێرم، خوای گەورە سەلامەتت کات و دەستکەوتیشت هەبێت، حەزیش ماڵت دەستگیر بێت تیایدا، دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من لە پێناو پارە و ماڵ موسڵمان نەبوومە، بەڵکو لە خۆشی ئایینی ئیسلام موسڵمان بوومە و بۆ ئەوەی لەگەڵ پێغەمبەری خوا بم،

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٤٧١/٢).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٤٣٢/٢).

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((یا عمرو نعم المال الصالح للمرء الصالح))،[1] واتە: ئەی عەمر ماڵی باش بۆ پیاوی باش. ئەم هەڵوێستەیش بەڵگەیە لەسەر ئیمان و دڵسۆزی عەمر.

**٢- یەکبوون هێزە و ناکۆکی لاوازییە:**

کاتێك هێزی فریاکەوتن گەیشتە عەمر بە سەرکردایەتی ئەبو عوبەیدە لە(ذات السلاسل) ئەبو عوبەیدە ویستی پێشنوێژی موسڵمانان بکات و پێش عەمر بکەوێت، بەڵام عەمر ڕازی نەبوو، وتی: تۆ بۆ فریاکەوتن هاتوویت و من ئەمیرم، موهاجیرەکان وتیان تۆ ئەمیری کۆمەڵی خۆتی و ئەویش ئەمیری کۆمەڵی خۆی، بەڵام کاتێك ئەبو عوبەیدە هەستی کرد بە دروست بوونی ناکۆکی، خۆیشی کەسێکی ڕەوشت جوان و نەرم و نیان بوو فەرمووی: ئاسوودەبە ئەی عەمر و بزانە دواترین قسەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ من ئەوەبوو فەرمووی:((اذا قدمت علی صاحبك فتطاوعا ولا تختلفا))، واتە: هەر کاتێك گەیشتیتە ئەوێ لەگەڵ عەمر تەبا بە و ناکۆکی مەکە. بۆیە ئەگەر تۆ لە قسەم دەردەچیت من لە قسەت دەرناچم، ئیتر عەمر پێشنوێژی دەکرد بە خەڵکی.[2]

**٣- پەرۆشی عەمر بۆ سەلامەتی هێزەکەی:**

بلیمەتی سەربازی عەمر لە(ذات السلاسل) لەوەدا دەردەکەوێت کە پەرۆش بوو بۆ یەکڕیزی و سەلامەتی بە ڕەچاوکردنی ئەم خاڵانە:

**أ- بە شەو ڕێی پێ دەکردن و بە ڕۆژ خۆیان دەشاردەوە:**

چونکە دەیزانی دوژمن هەوڵ دەدات هەواڵیان بزانێت پێش ڕووبەڕووبوونەوە، بۆیە عەمر ئەو تەکنیکەی ئەنجام دا و، دوو شتی تیا بەدی کرد:

- شاردنەوەی جموجۆڵەکانی لە دوژمن بە مەبەستی دەستەبەرکردنی سەلامەتی.

---

١ رواه ابن حبان في الموارد (٢٢٧٧)، صحيح السيرة (٥٠٨) صححه الالباني في صحيح الادب المفرد

٢ بڕوانە: مغازي رسول الله لعروة (٢٠٧) سەنەدەکانیشی لاوازن.

• پاراستنی سەربازەکان لە گەرما، بۆ ئەوەی بە هێزی خۆیانەوە بگەنە جێگای مەبەست.

**ب- ڕێگە نەدان بە سەربازەکان کە ئاگر بکەنەوە:**

عەمر ئاگر کردنەوەی لە سەربازەکان قەدەغە کردبوو، بەپشت بەستن بە شارەزایی سەربازی خۆی، بۆ ئەوەی دوژمن بە ڕۆشنایی ئاگرەکە نەیاندۆزنەوە و هێرشیان بکەنە سەر، تەنانەت کاتێك ئەبو بەکر قسەی لەگەڵ کرد لەو بارەوە، وتی: هەر کەسێك ئاگر بکاتەوە دەیخەمە ناو ئاگرەکەیەوە. کاتێك گەڕانەوە بۆ مەدینە، پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری هۆکاری ئەو فەرمانەی لێکرد، وتی: ترسام دوژمن بە کەمی ژمارەمان بزانێت، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) ڕازی بوو.[1]

**ج- ڕێگرتن لە سەربازەکان لەوەی بەدوای دوژمنانیان بکەون:**

موسڵمانان کە دوژمنانی خۆیانیان تێشکاند، ویستیان دوایان کەون، بەڵام عەمر نارەزایی دەربڕی نەوەك بکەونەوە ناو هێزەکانی دوژمن، عەمر ئەمەشی بە پێغەمبەر(ﷺ) وت و پێغەمبەر(ﷺ) ڕازی بوو لەسەر ئەم کارە پڕ لە داناییە کە پارێزگاری دەستەبەر کرد بۆ موسڵمانان.[2]

**٤- تێگەیشتنی عەمری کوڕی عاص(ﷺ):**

عەمری کوڕی عاص(ﷺ) دەفەرموێت: لە شەوێکی سەرمادا لە غەزای(ذات السلاسل) لەشم گران بوو ترسام ئەگەر خۆم بشۆم تیابچم، بۆیە(تیمم)م کردو پێش نوێژیم کرد بە هاوەڵانم، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بەمەی زانی فەرمووی:((یا عمرو صليت باصحابك وانت جنب؟))، واتە: ئەی عەمر ئایا پێشنوێژیت بۆ هاوەڵانت کرد بە لەش گرانی؟ ئیتر باسی هۆکاری خۆشۆردنەکەم بۆ کرد و، وتم خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾(النساء: ٢٩). ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) زەردەخەنەی کرد و هیچی نەفەرموو،[3] لەم بەسەرهاتە هەندێ حوکم

---

١ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٥٠٩).

٢ بڕوانە: القيادة العسكرية في عهد الرسول (٥٤٠).

٣ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٥٠٩) قال ابراهيم العلي: الحديث اسناده صحيح..

وەردەگرین:

(تیمم) جێگای(غسل) دەگرێتەوە لەگەڵ هەبوونی ئاودا، ئەگەر مەترسی زیان بکریت بۆ ئەو کەسەی بەکاری دەهێنێت.

ڕێدراوە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) کۆشش بکرێت: چونکە عەمر ئەو کارەی بە پێی کۆشش و بۆچوونی خۆی ئەنجامدا و، لەسەر فەرموودەی خوای گەورە: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴾(النساء: ٢٩). پێغەمبەریش(ﷺ) نکۆڵی لەسەر نەکرد ئەوەش دوو شت دەگەیەنێت:

**یەکەم: شەرعی بوونی کۆشش کردن.**

**دووەم: بە ڕاست زانینی ئەو کۆششە.**

لەو هۆکارانەی ڕێ دەدەن بە(تیمم) نەتوانینی بەکارهێنانی ئاوە سەرەڕای هەبوونیشی.

پێش نوێژی کەسێك تەیەمومی کردبێت ڕەوایە بۆ کەسێك دەست نوێژی گرتبێت، چونکە عەمری کوڕی عاص بەو حاڵەوە پێش نوێژی کرد بۆ پێنج سەد کەس لە هاوەڵان و پێغەمبەر(ﷺ) ڕازی بوو لەسەر کارەکەی.

(اجتهاد)کردنی عەمری کوڕی عاص بەڵگەیە لەسەر تێگەیشتنی و هۆشمەندی و، وردی هەڵێنجانی حوکمی لە بەڵگەکەی.[1] ئەوەش لێرەدا ڕاماندەگرێت،[2] خێرایی وەرگرتنی عەمر لە قورئان بە شێوەیەك بتوانێت بەڵگەی لێ دەربهێنێت و هێشتا چوار مانگی تەواو تێپەڕ نەبووە بەسەر موسڵمانێتیدا، لەوانەشە عەمر پێش موسڵمان بوونی قورئانی خوێندبێتەوە، لەم حاڵەتەیشدا نموونەیەکی مەزنترمان دەست دەکەوێت کە قورئان توانیوێتی گەردنی بێباوەڕان بابدات و گوێ لە قورئانی پیرۆز بگرن. بەڵگەش لەسەر ئەوە عەمر بە نەجاشی وت پرسیار بکات لە موهاجیرین بۆچوونیان دەربارەی عیسا چییە سەلامی خوای لێ بێت.[3]

---

١ بڕوانە: غزوة الحديبية لأبي فارس (٢١٠).

٢ خاوەنی ئەم وتە (صالح احمد الشامی)یە خاوەن (معين السيرة) (٣٨١).

٣ بڕوانە: معين السيرة (٣٨١).

**٥- دەرەنجامی پۆلە سەربازییەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ باکوور:**

هەڵمەتە سەربازییەکانی موسڵمانان پاش ئاشتی حودەیبیە ئاڕاستەی باکووری وەرگرت و ڕۆژئاوا و باشووری ڕۆژئاوای دوورگەی عەرەب لە جەنگ دوورکەوتەوە لە سایەی ئەو ئاشتییەدا،[1] ئەو پۆلە سەربازییانە گەیشتنە سنووری ڕۆم و سنووری دەوڵەتی ئیسلامییان ئارام کردەوە، دوو ئامانجی گەورە لەو پۆلە سەربازیانە بە دەستکەوت:

١- دەستەبەرکردنی پارێزگاری لە ئایینی ئیسلام لە ناوەوە.

٢- پارێزگاری کردن لە ئایینی ئیسلام لە دەرەوە.[2]

ئەو کەسەی بە دواداچوون بکات بۆ ژیاننامەی پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ) بە هەموو وردەکارییەکانیەوە، بە ڕاستی بۆی دەردەکەوێت ئاشتی حودەیبیە گەورەترین دەستکەوتی سیاسی و سەربازی و ڕاگەیاندنەکانە، بەڵکو دەستکەوتی گەورەترین جەنگە ڕوویدا لە نێوان ئیسلام و بتپەرستیدا لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)، لە ڕووی ئەو دەرەنجامە چاکانەوە کە کۆڵەکەکانی ئیسلامی جێگیرکرد و بنچینەکانی بتپەرستیشی هەڵتەکاند، ڕووداوەکانی خەیبەر و موئتە و(ذات السلاسل) هەموویان شکۆداری دەوڵەتی ئیسلامییان بڵاوکردەوە و هەمووشیان دەرەنجامی ئاشتی حودەیبیەبوو،[3] هەروەها بە هۆی توانای لە ڕادەبەدەری مامەڵەکردنی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ سوننەتەکانی خوای گەورە لە کۆمەڵگاکان و دروستکردنی دەوڵەتدا.

---

١ بڕوانە: المجتمع المدني للعمري (١٧٠).

٢ الاعلام في صدر الاسلام، د. عبداللطيف حمزة (١٧٣).

٣ بڕوانە: منهج الاعلام الاسلامي (٣٣٧).

# بەشی پانزەم

## غەزای فەتحی مەککە( ٨ ك )

### باسی یەکەم: هۆکارەکان و ئامادەباشی دەرچوون و دەست پێکردن

**یەکەم: هۆکارەکانی.**

١- قورەیش هەڵەیەکی هەرەگەورەی ئەنجامدا کاتێك پشتگیری هاوپەیمانەکانی کرد دژ بە خوزاعە کە هاوپەیمانی موسڵمانان بوون، بەنو بەکر و هاوپەیمانەکانیان هێرشیان کردە سەر هۆزی خوزاعە لە لای ئاوێکدا(الوتیر)ی پێ دەوترێت و زیاتر لە بیست کەسیان لێ کوشتن،[1] ئینجا کاتێك هۆزی خوزاعە پەنایان هێنایە حەرەمی هێمن(الحرم الآمن)، ئامادەیش نەبوون بۆ جەنگ، بە سەرکردەکەیان وت: ئەی نەوفەل، ئێمە ئەمڕۆ هاتووینەتە جێگای قەدەغەکراوی خواکەی تۆ! نەوفەل وتی: ئەمڕۆ خوا نییە، ئەی بەنی بەکر تۆڵەی خۆتان بکەنەوە.[2] لەو کاتە عەمری کوڕی سالیمی خوزاعی و چل کەس لە خوزاعە هاتنە لای پێغەمبەر(ﷺ) لە مەدینە، کارەساتەکەیان بۆ گێڕایەوە، تەنانەت عەمری کوڕی سالیم هەڵسایە سەر پێ و بە هۆنراوە دەستی کردە باسکردنی ئەو هاوپەیمانێتییەی لە نێوان ئەوان و پێغەمبەر(ﷺ) و باوکیشی و دەیووت:

| | |
|---|---|
| یـارب انـي ناشـد محمـدا | حلف ابينا وابيه الاتلدا |
| قـد كنـتم ولـداً وكنـا والـدا | ثمت اسلمنا فلم ننزع يدا |
| فانصر هداك الله نصراً اعتدا | وادع عباد الله يأتوا مددا |

---

١ بروانە:المغازي للواقدي (٢/٧٨١-٧٨٤).

٢ بروانە: السيرة النبوية لابن هشام (٤/٣٩).

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: پشتگیریت بۆ هات ئەی عەمری کوڕی سالیم،[١] خوا پشتگیریم نەکات ئەگەر پشتگیریتان نەکەم ئەی بەنی کەعب، کاتێکیش پەڵە هەورێك هات پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەو پەڵە هەورە سەرخستنی بەنی کەعب دەست پێدەکات.[٢] لە ڕیوایەتێکی تریشدا هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) قوڕەیشی ئاگادار کردووەتەوە کە پاشگەزببنەوەلە هاوپەیمانێتی بەنی بەکر، خوێن بایی کوژراوەکانی خوزاعە بدەن، ئەگەرنا جەنگیان لەگەڵ دەکرێت.

ئەوانیش ڕازی نەبوونەو شەڕیان هەڵبژاردووە، ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە ناکاو هێرشی نەکردووەتە سەر قوڕەیش.[٣]

**٢- ئەبو سوفیان هەوڵ دەدا فریای گێلێتی قوڕەیش بکەوێت:**

قوڕەیش هەڵسان بە ناردنی ئەبو سوفیان بۆ درێژکردنەوەی ماوەی ئاشتیەکە، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ڕووی وەرگێڕا و وەڵامی نەدایەوە، پەنای بردە بەر گەورە هاوەڵان وەکو ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان و عەلی ئەوانیش ڕازی نەبوون لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) قسە بکەن لەو بارەوە، بۆیە ئەبوسوفیان بە دەستی خاڵی گەڕایەوە مەککە،[٤] دەشگێڕنەوە کاتێك لە مەدینە بوو چووە لای ئومموحەبیبەی کچی – دایکی ئیمانداران – و، ویستی لەسەر جێگاکەی پێغەمبەر(ﷺ) دانیشێت، بەڵام ئەو نەیهێشت، وتی: کچەکەم نازانم پێخەفەکەت بە شایانی من نەزانی لەسەری دانیشم یان منت بە شایستەی ئەوە نەزانی لەسەری دانیشم؟ فەرمووی: بەڵکو ئەوە پێخەفی پێغەمبەرە(ﷺ) و تۆیش بتپەرستێکی پیسی،ئەبوسفیانیش وتی: سوێند بە خوا دوای من خراپت بەسەر هاتووە.[٥]

ئەم هەڵوێستەیش جێگای سەرسوڕمان نییە لە ئومموحەبیبەوە(ﷺ)، چونکە خۆی یەکێکە لەو کەسانەی هەردوو کۆچەکەی کردووە، هەر لە مێژەوە هەموو

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٤٤/٤).
٢ هەمان سەرچاوە (٤٤/٤)، البدايه والنهايه (٢٧٨/٤).
٣ المطالب العالية (٢٤٣/٤) رقم (٤٣٦١). قال ابن حجر: مرسل صحيح الاسناده التاريخ الاسلامي (١٦٤/٧).
٤ بڕوانە: التاريخ السياسي والعسكري، د. علي معطى (٣٦٥).
٥ بڕوانە: البداية والنهاية (٤٧٩/٤).

پەیوەندییەکانی لەگەڵ جاهیلیەتدا بڕیوەتەوە. ئەو شانزە ساڵ بوو باوکی نەبینیبوو، کاتێکیش بینی بەو باوکە تەماشای نەکرد کە پێویستە ڕێزی لێ بگیرێت و نرخی بۆ دابنرێت، بەڵکو وەکو سەرکردەیەکی بێباوەڕ تەماشای کرد کە لە دژی ئیسلام وەستاوە و لەگەڵ پێغەمبەرەکەی چەندین ساڵە شەڕ دەکات،[1] ئەم شێوە قسەکردنەی ئوممو حەبیبەیش لەگەڵ باوکی کە سەرکردەیەکی گەورەیش بووە بەڵگەیە لەسەر پتەوی بیروباوەڕی و دیاردەیەکیشە لە کۆششی هاوەڵان بۆ پارێزگاری کەسایەتی موسڵمانان.[2]

لە بەرامبەر هەڵوەشاندنەوەی قوڕەیش بۆ پەیمانەکەی، پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاری دا فەتحی مەککە بکات و سزای بێباوەڕان بدات، هەندێ هۆکاریش یارمەتی دەری بوون لەم بارەوە:

أ- بەهێزبوونی بەرەی ناوخۆی موسڵمانان لە مەدینە، چونکە مەترسی جولەکە بە جارێ لەنێو چووبوو.

ب- لاوازی بەرەی دوژمنان لە ناوخۆ، لە پێشی هەمووشیانەوە مونافیقەکان کە پاڵپشت و مامۆستاکانیان لە دەستدا کە جولەکە بوون.

ج- پێغەمبەر(ﷺ) گرنگی دا بە پەرەسەندنی هێزی سەربازی و، ڕەوانەکردنی پۆلی سەربازی لە ماوەی ئاشتی حودەیبیە و سەریش کەوتە سەر هێزی بتپەرستان لە ڕووی ژمارە و کەرەستە و ورەوە.

د- ئەم غەزایە لە کاتێکدا بوو کە بتپەرستان لاواز بووبوون و موسڵمان بەهێز بووبوون لە ڕووی ئابووریەوە، چونکە موسڵمانان خەیبەریان فەتح کردبوو و ماڵ و سامانێکی زۆریان لەوێ دەستگیر بووبوو.

هـ- بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە هۆزەکانی دەوروبەری مەدینە، ئەمەیش جۆرێک بوو لە دڵنیایی بۆ سەرکردایەتی کاتێك بڕیارێکی لەو جۆرە دەرکات.

و- دروست بوونی هۆکاری سەرەکی و یاسایی بۆ هێرشکردنە سەر مەککە، ئەویش هەڵوەشاندنەوەی قوڕەیش بوو بۆ پەیمانەکەی،[3] پێغەمبەریش(ﷺ) ئەو

---

١ بڕوانە: من معين السيرة (٣٩٥).

٢ بڕوانە: التاريخ الاسلامي (٧/١٧٠-١٧١).

٣ بڕوانە: السيرة لأبي فارس (٤٠١).

هەلەی لە دەست نەدا و بە ئەوپەڕی ژیرییەوە مامەڵەی لەگەڵ کرد، پێویستیش بوو لەو زانیارییە نوێیانە سوود وەرگیرابا، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) سوپایەکی ئامادە کرد حیجاز هاوشێوەی نەبینیبوو، چونکە ژمارەی سوپاکە گەیشتە دە هەزار کەس.[١]

## دووەم: ئامادەباشی بۆ دەرچوون.

شێوازی جموجۆڵی پێغەمبەر(ﷺ) لە بونیاتنانی دەوڵەت و پەروەردەکردنی کۆمەڵگا و ناردنی پۆلە سەربازییەکان فێری مامەڵەکردنمان دەکات لەگەڵ سوننەتی کارکردن بە هۆکارەکان، بۆ نموونە لە غەزای فەتحی مەککەدا، دەبینین پێغەمبەر(ﷺ) مەبەستی بوو ئەو نیازە ئاشکرا نەکات بۆ ئەوەی قورەیش خۆیان ساز نەدەن، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بەم هۆکارانە کاری کرد:

### ١- شاردنەوەی مەسەلەکە لە نزیکترین کەسەکان:

تەنانەت ئەبو بەکر و عائیشەیش(ڕەزای خوایان لێ بێت) بە نیازی پێغەمبەر(ﷺ)یان نەزانی، چونکە کاتێك ئەبو بەکر پرسیاری کرد لە عائیشە دەربارەی نیازی و ئاڕاستەی پێغەمبەر(ﷺ) یان دەیوت نازانم، یان بێدەنگ دەبوو، لە هەردوو حاڵەتەکەیشدا وا دەردەکەوێت هیچ زانیارییەکی نەبووە لەو بارەوە،[٢] لەم مەسەلەیش ئەوە وەردەگیردرێت کە سەرکردە سەربازییەکان پێویستە پلانە سەربازییەکانیان بشارنەوە لە خێزانەکانیان، چونکە لەوانەیە بەبێ ئەوەی نیازیان خراپ بێت بڵاوی بکەنەوە و ببێتە هۆکارێك بۆ کارەساتێکی گەورە.[٣]

### ٢- ناردنی پۆلێکی سەربازی بە سەرکردایەتی ئەبو قەتادە بۆ(بطن اضم):

(ابن سعد) دەگێڕێتەوە: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ویستی هێرش بکاتە سەر مەککە، ئەبو قەتادەی کوڕی ڕەبعی نارد لە سەرووی هەشت کەسەوە بۆ(بطن اظم)[٤] بۆ ئەوەی وابزانرێت پێغەمبەر(ﷺ) بەو ئاڕاستەدا دەڕوا و زانیاری کۆدەکاتەوە.. بۆیە

---

١ بڕوانە: الكامل في التاريخ (٤/٢٤٤)، التاريخ السياسي والعسكري (٣٦٦).

٢ بڕوانە: البداية والنهاية (٤/٢٨٢)، الرسول القائد، شيت خطاب (٣٣٣-٣٣٤).

٣ بڕوانە: القيادة العسكرية في عهد الرسول (٣٩٥-٣٩٦).

٤ دۆڵێکە لە لای مەدینە هەرسێ دۆڵی بوتحان و قەنات و عەقیقی تیا کۆدەبێتەوە.

ڕێیـان کـرد تـاکو گەیـشتنە(ذي خُـشُب)[١] لـەوێ پۆلـە سـەربازییەکە زانییـان پێغەمبەر(ﷺ) بەرەو مەککە دەچێت لە لای سوقیا یەکیان گرت.[٢]

پێغەمبـەر(ﷺ) هەمیـشە سەرکردەکانیـشی وریـادەکردەوە وریا بـن و ڕێگـا لـە دوژمنانیـان ونبکـەن و نەیـەڵن بـە نیازیـان بـزانن کاتێـك ڕوودەکەنـە جێگایـەك بـۆ جیهاد.[٣]

**٣- ناردنی کەسانێك بۆ کۆکردنەوەی زانیاری:**

پێغەمبەر(ﷺ) دەزگای هەواڵگری دەوڵـەتی ئیسلامی خستبووە کار لـە پێنـاو ئەوەی هەواڵی موسڵمانان نەگاتـە قـوڕەیش، بـۆ ئـەو مەبەستـەیش هەنـدێ کەسـی لەسـەر هۆزەکـان دیـاری کردبـوو و عومـەری کـوڕی خـەتتابیش(ﷺ) بەسـەر ئـەو کەسانەدا دەسوڕایەوە....

لـە ڕاسـتیدا کۆکردنـەوەی زانیـاری چـەکێکە بـە دوو لادا کاردەکـات و، پێغەمبـەر(ﷺ) لـە لایـە سوودبەخـشەکەی کـەڵکی وەرگـرت بـۆ بەرژەوەنـدی موسـڵمانان، ئـەوەی کـە کـار و ئامادەباشـی لـە نهێنیـدا بـوو، بـۆ ئـەوەی دوژمـن نەتوانێت سوود وەربگرێت لە هیچ زانیارییەك یارمەتی بدات.[٤]

**٤- پاڕانەوەی پێغەمبەر(ﷺ):**

پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە هەموو هۆکارەکان کاری کرد کە لە توانایدا بوو، ڕووی کردە خوای گەورە و پاڕایـەوە: خوایـە گـوێ و چاوەکانیان دابخـە و بـا نەمانبینن وگوێیان لە دەنگمان نەبێت لە پڕێکدا نەبێت.[٥]

ئەمەش پیشەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو لە هەموو کاروبارەکانی، هـەرگیز پاڕانـەوەی لەبیرنەدەکرد.

---

١ (٣٥) میل لە مەدینەوە دوورە.
٢ بڕوانە: الطبقات الکبری لابن سعد (١٣٢/٢).
٣ بڕوانە: القیادة العسکریة (٤٩٨).
٤ بڕوانە: القیادة العسکریة (٣٦٥).
٥ البدایة والنهایة (٢٨٢/٤).

٥- کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) ئامادەیی تەواوی وەرگرت بۆ ڕۆیشتن بەرەو مەککە،(حاطب بن ابي بلتعة) نامەیەکی نووسی بۆ خەڵکی مەککەو ئەو هەواڵەی پێگەیاندن، بەڵام خوای گەورە بە وەحی پێغەمبەرەکەی لەوە ئاگادار کردەوە و، ئەو هەواڵە هەر لە سەرەتاوە لەناوبرا، پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بە ناردنی عەلی و میقداد، ئەو ئافرەتەیان گرت و هەڕەشەیان لێکردو ئەویش نامەکەی دایە دەستەوە، ئینجا حاتیب بانگ کرا بۆ لێکۆڵینەوە و وتی: پەلەم لێ مەکە ئەی پێغەمبەری خوا، من کەسێکی هاوپەیمان بووم لەگەڵ قورەیش و لەگەڵ خۆیان نەبووم، ئەوانەشی لەگەڵتدان لە موهاجیرەکان کەس و کاریان هەیە ماڵ و منداڵەکانیان بۆ بپارێزن، کە من بێ بەشیش بووم لەو ڕەچەڵەکە حەزم کرد کارێک بکەم کەس و کارەکەم بپارێزن، ئەو کارەیشم نەکردووە وەکو پاشگەزبوونەوە لە ئایینەکەم، یان ڕازی بووبێتم بە کوفر پاش ئیسلام، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ڕاست دەکات.

ئینجا عومەری کوڕی خەتتاب فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا، ڕێگەم بدە بدەم لە گەردنی ئەو مونافیقە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەو ئامادەی جەنگی بەدر بووە، چۆن دەزانی خوای گەورە تەماشای ئەوانی نەکردووە و نەیفەرمووە: هەرچی دەکەن بیکەن من لێتان خۆش بووم،[١] خوای گەورەیش ئەم ئایەتەی دابەزاند:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ عَدُوِّى وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا۟ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلْحَقِّ يُخْرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ ۙ أَن تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ رَبِّكُمْ إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَٰدًا فِى سَبِيلِى وَٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِى ۚ تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَأَنَا۠ أَعْلَمُ بِمَآ أَخْفَيْتُمْ وَمَآ أَعْلَنتُمْ ۚ وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ﴾(الممتحنة: ١).

مامۆستا(سيد قطب) دەفەرموێت: سەرەڕای هەموو ئەوەی موهاجیرەکان چەشتیان لە ئازار و ناخۆشی بە دەستی قورەیش، هەندێ لە دەروونەکان هەر حەزیان دەکرد چاکە و خۆشەویستی هەبێت لە نێوان خۆیان و ئەواندا، حەزیان

---

١ البخاري، كتاب المغازي، باب غزوة الفتح (٥/١٥) رقم (٤٢٧٤).

دەکرد ئەم ناکۆکییە ببڕێتەوە کە دەبێتە مایەی بەرپاکردنی جەنگ لەگەڵ خزم و کەسەکانیاندا و پەیوەندییەکانیان دەپچڕێنێت، وەکو چۆن خوای گەورە بیەوێت ئەو دڵ و دەروونانە پاك بکاتەوە لە ئەو پەیوەندییانە و یەکلای بکاتەوە بۆ ئایین و بیروباوەڕ و ڕێبازەکەی... بۆیە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ چارەسەری دەکردن، بە ڕووداوەکان و دوکەوتنی ڕووداوەکان، بۆ ئەوەی چارەسەرەکە لەسەر شانۆی خودی ڕووداوەکان بێت و لێدانەکە لەسەر ئاسنێکی گەرم بێت.[١]

## سێیەم: دەست پێکردنی دەرچوون و بەسەرهاتەکانی ڕێگا.

١- پێغەمبەر(ﷺ) لە دەی ڕەمەزانی ساڵی هەشتی کۆچی بەرەو مەککە بەڕێکەوت،[٢] ئەبو ڕەهمی کردە جێنشینی خۆی لە مەدینە کە ناوی(کلثوم بن حصين بن عتبة بن خلف الغفاري)یە،[٣] ژمارەی سوپاکەیش دە هەزار کەس دەبوو، بە ڕۆژوو بوون تاکو گەیشتنە(الكدين) لە لای ئاوێکی عوسفان و قەدید و لەوێ پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان ڕۆژووەکەیان شکاند،[٤] لە جوحفە پێغەمبەر(ﷺ) تووشی عەبباسی مامی بوو لەگەڵ منداڵەکانی کۆچی کردبوو، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) بەوە خۆشحاڵ بوو،[٥] دەرچوونی عەبباسیش لە مەککە - کە ڕۆڵی سەرۆکی دەزگای هەواڵگری دەبینی - ئەوەی دەگەیاند ئەرکەکەی لەوێ کۆتایی پێهات، مانەوەشی لەوێ هەر بە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.

٢- موسڵمان بوونی ئەبو سوفیانی کوڕی حاریسی کوڕی عەبدولموتەلیب و عەبدوڵای کوڕی ئومەییە:

ئەبو سوفیان و عەبدوڵای کوڕی ئومەییە لە مەککەوە دەرچوون لە(ثنية العقاب) گەیشتنە پێغەمبەر(ﷺ) لە نێوان مەککە و مەدینە و، ویستیان بچنە ژوورەوە بۆ

---

١ في ظلال القرآن (٦/٣٥٨).
٢ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٥٦٠-٥٦١).
٣ هەمان سەرچاوە (٥٦١).
٤ البخاري، كتاب المغازي، (٥/١٠٦) رقم (٤٢٧٦).
٥ بڕوانە: البداية والنهاية (٤/٢٨٦)، السيرة النبوية لأبي فارس (٤٠٦).

لای، ئوممو سەلەمە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئامۆزاکەت و پورزاکەت و زاواکەت، فەرمووی: پێویستم پێیان نییە، ئامۆزاکەم ئابڕووی بردم، پورزاکەم و زاواکەیشم هەر ئەوان بوون ئەو قسانەیان پێ وتم لە مەککە، کاتێك هەواڵەکەیان پێگەیشت، ئەبو سوفیان کوڕێکی خۆی لەگەڵدا بوو، وتی: سوێند بە خوا یان ئەوەیە پێغەمبەری خوا ڕێگەم دەدا بچمە لای،یان دەستی ئەم کوڕەم دەگرم و هەر دەڕۆین تاکو لە تینوێتی یان برسێتی دەمرین، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) دڵی نەرم بوو، ئەوانیش هاتنە لای، ئەبو سوفیان هۆنراوەیەکی وت لە موسڵمان بوونی خۆی و پۆزش هێنانەوەی لەو کارانەی کە کردوونێتی، کاتێك تەواوی کرد پێغەمبەر(ﷺ) لە سنگیداو فەرمووی: هەر تۆ بووی کە منت دەربەدەر کرد.[1]

ئەبوسوفیان هەمیشە جنێوی بە پێغەمبەر(ﷺ) دەدا بە هۆنراوە، عەبدوڵای کوڕی ئومەییەیش دەیووت: باوەڕت پێ ناهێنم تاکو پەیژەیەکت نەبێت پێیدا سەرکەویت بۆ ئاسمان و منیش تەماشا بکەم، ئینجا بەڵگەنامەیەك بهێنی، چوار فریشتەیش شایەتی لەسەر بدەن، سوێند بە خوا وا بزانم ئەوەیش بکەیت هەر باوەڕت پێ ناهێنم.[2]

سەرەڕای ئەو تاوانە زەبەلاحانەشیان پێغەمبەر(ﷺ) لێیان خۆش بوو، ئەوەیش نموونەیەکی هەرە بەرزە لە سۆز و میهرەبانیدا، بۆیە ئەبو سوفیان قەرەبووی ئەو هۆنراوە خراپانەی کرد لە دژی پێغەمبەر(ﷺ) بەو هۆنراوەی کە ستایشی پێغەمبەر(ﷺ)ی پێکرد لە پێش خۆیدا، بە باشی موسڵمانیش بوو، هەڵوێستی سەربەرزانەی نواند لە جیهاددا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لە جەنگی حونەین.[3]

---

١ اخرجه الحاكم في المستدرك (٣/٤٣-٤٥)، ومجمع الزوائد (٦/١٦٤-١٦٧).

٢ بڕوانە: ابن هشام (١/٢٩٥-٣٠٠).

٣ بڕوانە: التاريخ الاسلامي (٧/١٨٢).

**٣- دابەزین لە(مر الظهران) و موسڵمان بوونی ئەبو سوفیانی کوڕی حەربی سەرگەورەی قوڕەیش:**

پێغەمبەر(ﷺ) بەردەوام بوو لە ڕێکردن تاکو گەیشتە(مر الظهران)[1] و شەو لەوێ لایاندا و، دە هەزار ئاگریان کردەوە و پێغەمبەر(ﷺ) عومەری کوڕی خەتابی لەسەر پاسەوانەکان دیاری کرد.[2]

عەبباس وتی: وتم: ئەگەر پێغەمبەری خوا(ﷺ)بە زۆر بچێتە مەککەوە و، ئەوان نەیەن داوای داڵدەی بکەن، قوڕەیش هەتا هەتایە لەنێو دەچێت.

ئینجا سواری هێسترەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، بۆ ئەوەی کەسێك ببینێت و هەواڵ بنێرێت خەڵکی مەککە بێنە لای پێغەمبەر(ﷺ) داوای ئاسوودەیی بکەن، لەو کاتەدا ئەبو سوفیان و حەکیمی کوڕی حیزام و بودەیلی کوڕی وەرقا دەرچووبوون بۆ زانینی هەواڵ، ئەبو سوفیان وتی: لە ژیانمدا ئاگر و هێزی وا زۆرم نەبینیووە... جا عەبباس گوێی لە دەنگیان بوو، وتی: بەڵات لێدا ئەبو سوفیان ئەوە پێغەمبەری خوایە(ﷺ) و وای لە حاڵی قوڕیش، وتی: چارە چییە باوك و دایکم بە قوربانت بێت؟ وتم: گەر دەستی پێغەمبەر(ﷺ) بکەویت لە گەردنت دەدا، بۆیە سواریە لە پشتم با لەسەر ئەم هێسترە بچینە لای پێغەمبەر(ﷺ) و دڵنیات بکات، ئیتر بە لای هەر ئاگرێکدا تێپەڕ دەبوون دەیانووت ئەوە کێیە؟ بەڵام دواتر دەیانوت: ئەوە هێسترەکەی پێغەمبەر(ﷺ) و مامی لەسەریەتی، تاکو گەیشتنە ئاگرەکەی عومەر و هەڵسا و وتی: ئەوە کێیە؟ کاتێك ئەبوسوفیانی بینی وتی: ئەوە ئەبوسوفیانی دوژمنی خوایە، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە تۆی خستە ژێر دەستمان بەبێ هیچ پەیمان و گرێبەستێك، ئینجا بە پەلە خۆی گەیاندە لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە ئەبوسوفیانە بەبێ هیچ پەیمانێك کە لە نێوانماندا بێت، ڕێگەم بدە لە گەردنی بدەم، ئیتر عەبباس وتی: ئەوە پەناهێندەی لای منە.. کاتێك عومەر زۆر لەسەری ڕۆیشت، عەبباس پێی وت: لەسەرخۆبە ئەی عومەر، سوێند بە

١ دۆڵێکە لە حیجاز لە باکووری مەککە بە (٢٢) کیلۆمەتر
٢ بڕوانە: معین السیرة (٣٨٧)، الطبقات لابن سعد (٢/١٣٥).

خوا ئەگەر یەکێك بوایە لە بەنی عەدی ئەو قسانەت نەدەکرد، بەڵام تۆ دەزانی ئەو لە بەنی عەبدومەنافە، عومەر وتی: لەسەرخۆبە عەبباس، سوێند بە خوا موسڵمان بوونی تۆم پێ خۆشتر بوو لە موسڵمان بوونی خەتتابی باوکم، تەنها لەبەر ئەوەش بوو دەمزانی پێغەمبەر(ﷺ) موسڵمان بوونی تۆی پێ خۆشترە تاکو موسڵمان بوونی باوکم، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی عەبباس ببیە لای خۆت تاکو ڕۆژ دەبێتەوە، ئینجا بۆم بهێنەرەوە، کە ڕۆژ بوویەوە پێغەمبەر(ﷺ) بە ئەبو سوفیانی فەرموو: ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بزانیت جگە لە(الله) خوایەکی تر نییە؟ وتی: بەڵێ باوك و دایکم فدات بێت، چەند هێمنو بەخشندەو خزمایەتی بەجێهێنەری، سوێند بە خوا ئەگەر خوایەکی تر هەبوایە ئەمڕۆ بە کەڵکم دەهات، فەرمووی: بەڵات لێتدا ئەبوسوفیان، کاتی ئەوە نەهاتووە بزانیت من پێغەمبەری خوام؟وتم: باوك و دایکم بە قوربانت بن چەند لەسەرخۆ و بەخشندە و خزم دۆستی، ئەمەیان سوێند بە خوا هێشتا لە دڵمدا شتێك ماوە بەرامبەری، عەبباس پێی وت: بەڵام لێتدا موسڵمان بە پێش ئەوەی لە گەردنت بدەین، ئینجا شایەتمانی ڕاستی هێنا و موسڵمان بوو، عەبباس دەڵێت وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەبوسوفیان حەز لە شانازی دەکات تایبەتمەندییەکی پێ ببەخشە، فەرمووی: بەڵێ، هەرکەسێ بچێتە ماڵی ئەبوسوفیانەوە دڵنیا و بێ ترس بێت، هەرکیەسێکیش دەرگای ماڵەکەی لە خۆی داخات دڵنیا و بی ترس بێت، هەر کەسیش بچێتە مزگەوتەوە دڵنیا و بێ ترس دەبێت، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ)داوای کرد لە عەبباس ئەبوسوفیان گلداتەوە تاکو ئەو هەموو هێزە زۆرە ببینێت و عەبباس هەمووی پێ ناساندو ئەویش زۆر سەرسام بوو، وتی: ئەی باوکی فەزڵ موڵکی برازاکەت تەواو گەورە بووەتەوە، عەبباس وتی: ئەوە پێغەمبەرایەتییە، وتی: کەواتە وایە، ئینجا عەبباس پێی وت: ئینجا فریای خەڵکی مەککە بکەوە.[1]

١ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٥١٨–٥٢٠)

لەم بەسەرهاتە هەندێ پەند و وانە وەردەگرین:

١- کاتێك ئەبوسوفیان بووە بارمتە بە دەستی موسڵمانانەوە، چارەنووسی بە دەستی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، کاتێك سبەی گەڕایەوە لای پێغەمبەر(ﷺ) لە جیاتی ئەوەی قسەی پێ بکرێت و هەڕەشەی لێ بکرێت بانگ کرا بۆ ئیسلام، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ئەو تایبەتمەندییەی دایە ئەبوسوفیان و ئەویش جۆرێك بوو لە جێگیرکردنی لەسەر ئیسلام،[١] ئەوەیش وای کرد کینە لەدڵی ئەبوسوفیان نەمێنێت و بۆیشی دووپاتکردەوە کە پلە و پایەی لە ناو قورەیشدا کەم ناکات ئەگەر دڵسۆز بێت و هەوڵ بدات لە پێناویدا،[٢] ئەوەیش ڕێڕەوێکە پێویستە لەسەر زانایان پەیڕەوی بکەن لە کاتی مامەڵەکردنیان لەگەڵ خەڵکی.

٢- ئینجا کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) داوای کرد لە عەبباسی مامی ئەبوسوفیان گلداتەوە بۆ ئەوەی سەربازەکانی خوا ببینێت،[٣] ئەوەیش جەنگێکی نارەحەت بوو بۆ سەر باری دەروونی قورەیش، بۆ ئەوەی کە ئەبوسوفیان بە چاوی خۆی ئەندازەی هێزی موسڵمانان ببینێت و هەموو بیرۆکەیەك بڕوخێنێت لە مێشکیدا سەبارەت بە بەرەنگاری ئەو سوپایە، هەر وایش دەرچوو، چونکە ئەبوسوفیان بەخۆی دەووت: هیچ هێزێك توانای بەرەنگاریکردنی ئەم سوپایەی نییە.....[٤]

ئەوە پێغەمبەرایەتییە، ئەو وشەی حیکمەتی خوای گەورە وای دەخواست لەسەر زاری عەبباس دەرکەوێت، بۆ ئەوەی ببێتە بەرپەرچدانەوە بۆ هەر کەسێك گومان دەبات یان گومان دروست دەکات کە بانگەوازی پێغەمبەر(ﷺ) لە پێناو موڵك یان سەرۆکایەتی یان نەتەوایەتی بووە، ئەو وشەیە ناوونیشانی ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو لەسەرەتاوە تاکو کۆتایی، چونکە هەموو ساتەکانی ژیانی بەڵگە بوون لەسەر ئەوەی ئەو ڕەوانەکراوە بۆ گەیاندنی پەیامی خوای گەورە بە خەڵکی، نەك بۆ دروست کردنی موڵك بۆ خۆی لەسەر زەویدا.[٥]

---

١ بڕوانە: فقه السيرة للغضبان (٥٦٤)، المستفاد من قصص القران (٢/٤٠٣).
٢ بڕوانە: قراءة سياسية للسيرة النبوية، محمد رواس (٢٤٥).
٣ بڕوانە: السيرة ابن هشام (٤/٥٢).
٤ بڕوانە: القيادة العسكرية في عهد الرسول (٤٤٧)، السيرة لابن هشام (٤/٥٢).
٥ بڕوانە: فقه السيرة النبوية للبوطي (٢٧٥).

پێغەمبەر(ﷺ) بە ئەنقەست ئەو شەڕە دەروونیەی بەرپاکرد لەسەر دوژمنانی کاتێك فەرمانی کرد دە هەزار ئاگر بکرێتەوە لە یەك شەودا، بۆ ئەوەی دڵی قورەیش لە بن دەربهێنێ و ورەیان بڕوخێنێ ، هەرگیز بیرنەکەنەوە لە بەرگری کردنو خۆیان بدەن بە دەستەوە، بایەخدانی پێغەمبەر(ﷺ) بە ورەی جەنگاوەرەکانیو باری دەروونیان دەستپێشخەرییەکی سەربازی بوو، بە بەڵگەی ئەوەی قوتابخانە سەربازییەکان کە دواتر هاتن بایەخی زۆریان دا بەم لایەنە.[1]

---

١ بڕوانە: طبقات ابن سعد (١٣٥/٢)، العبقرية العسكرية وغزوات الرسول، للواء محمد فرج (٥٦٥).

## باسی دووەم: نەخشەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ چوونە ژوورەوەی مەککە و فەتحکردنی

### یەکەم: دابەشکردنی ئەرکەکان لە نێو سەرکردەکانی هاوەڵاندا.

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتە(ذي طوى)[١] فەرماندەکانی دابەش کرد، خالیدی کوڕی وەلیدی خستە لای ڕاستی سوپاکە، زوبەیری خستە لای چەپی سوپاکە، ئەبو عوبەیدەشی کردە لێپرسراوی پیادەکان،(بطن الوادي) ئینجا فەرمووی: ئەی ئەبو هورەیرە ئەنصارەکانم بۆ بانگ بکە، ئەوانیش خێرا هاتن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی کۆمەڵی ئەنصار، ئایە هەرچی و پرچییەکانی قوڕەیش دەبینن؟ وتیان: بەڵێ. فەرمووی: کە سبەی ئەوانتان بینی بە دوورینەوە بیاندوورنەوە، ئینجا دەستی ڕاستی خستە سەر دەستی چەپی و فەرمووی: کاتی دیاری کراومان لە صەفایە.[٢] ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) زوبەیری کوڕی عەوامی دیاری کرد وەکو سەرکردەی موهاجیرەکان و سوارەکانیان، فەرمانیشی کرد لە(کداء)ەوە لە سەرووی مەککەوە بچێتە ژوورەوە، فەرمانیشی پێکرد ئاڵاکەی لە حەجون بچەقێنێ و جموجۆڵ نەکات تاکو گەیشتنی پێغەمبەر(ﷺ) ئینجا خالیدی کوڕی وەلیدی نارد بەلای هۆزەکانی(قضاعة) و ئەوانی تر فەرمانیشی پێکرد لە خوارووی مەککەوە بچێتە ژوورەوە، ئاڵاکەشی لە نزیك ماڵەکان بچەقێنێ، سەعدی کوڕی عوبادەشی لە کەتیبەی ئەنصارەکاندا نارد، فەرمانیشی پێکردن شەڕ نەکەن مەگەر لەگەڵ کەسێکدا شەڕیان لەگەڵ بکات،[٣] بەم شێوەیش لێپرسراوێتی ڕوون و ئاشکرا بوو، هەریەکە و ئەرکی خۆی دەزانی.[٤]

---

١ معين السيرة (٣٨٩).
٢ مسلم، باب فتح مكة رقم (١٧٨٠).
٣ معين السيرة (٣٩٠).
٤ هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

هێزەکانی موسڵمانان لە هەر چوار لای مەککەوە چوونە ژوورەوە لەیەك کاتدا، ڕووبەڕووی هیچ بەرگرییەکیش نەبوونەوە، چونکە چوونە ژوورەوەی هێزی موسڵمانان بەم شێوازە هەلی بەرگریکردن لە دەست بتپەرستاندا، ئەم پلانەی پێغەمبەر(ﷺ) سەری گرتو هەر دەستەیەك جێگای دیاریکراوی خۆی گرت بەبێ جەنگ، تەنها ئەو ناوچە نەبێت خالید ڕووی تێکرد[1] توندڕەوەکانی قوڕەیش کۆبووبوونەوە وەکو: صەفوانی کوڕی ئومەییەو عیکرمەی کوڕی ئەبوجەهلو سوهەیلی کوڕی عەمرو کەسانی تر لەگەڵ هاوپەیمانەکانیان لە جێگایەك پێی دەوترێت خەندەمە، هێزی موسڵمانانیان تیر باران کرد، بەڵام لە ماوەیەکی کەمدا خالید توانی پەرتەوازەیان بکات و بەم شێوەیەش سوپا بەتەواوی دەستی گرتە سەر مەککەدا .

کتێبەکانی مێژوو باسی پیاوێکیان کردووە ناوی(حماس بن خالد) لە هۆزی بەنی بەکر ، چەك و کەرەستەی شەڕی ئامادە کردبوو بۆ پێشوازی سوپای موسڵمانان بە جەنگ، بە ژنەکەشی دەوت: دەبێت هەندێ لەو موسڵمانانە بکەمە خزمەتکارت، جا لە ڕۆژی فەتحدا بەشداری هەندێ شەڕی کرد لەگەڵ عیکریمە بەڵام زوو هەڵهات و دەرگای ماڵی خۆی داخست، خێزانەکەی پرسیاری لێکرد: کوا قسەکانت، ئەویش بە هۆنراوە وەڵامی دایەوە و پێی ووت: ئەگەر لەناو شەڕەکە دەبوی ئەو قسەت نەدەکرد.[2]

لە ڕاستیدا شێوازی قەدەغەکردنی گەڕان پەیڕەو دەکرا لە مەککە لە پێش چوونە ژوورەوەی هێزی موسـوڵمانان بە مەبەستی کەمترین زیان، دروشمی بەرزکراوەیش ئەوە بوو: هەرکەسێ بچێتە ماڵی ئەبوسوفیانەوە بێ ترسە، هەرکەسێ دەرگای خۆی دابخات بێ ترسە، هەرکەسێ بچێتە مزگەوتەکەوە بێ ترسە، ئەو تایبەتمەندییەیش دیاری کرا بۆ ماڵی ئەبوسوفیان بۆ ئەوەی یارمەتیدەر بێت بۆ قایلکردنی خەڵکی مەککە بە ئاشتی و ئارامی و خوێن نەڕشتن، هەروەها بۆ

---

١ بڕوانە: صور وعبر من الجهاد النبوي في المدينة (٣٩٧).
٢ بڕوانە: البداية والنهاية (٤/٢٩٥).

تێرکردنی حەزی شانازی لە دەروونیدا، تاکو ئیمان لە دڵیدا بچەسپێ.[١]

ئەبوسوفیان خێرا چووە مەککەوە و بە هەموو دەنگی هاواری کرد: ئەی کۆمەڵانی قورەیش وا موحەممەد بەهێزێکەوە هاتووە توانای بەرگریتان نییە لە دژی جا هەر کەس دێتە ماڵی منەوە سەلامەت دەبێت، لەم کاتەدا هیندی خێزانی هەڵساو کردی بە سمێڵی ئەبوسوفیاندا و وتی: ئەو توورەکە چەورە بکوژن– چونکە ئەبوسوفیان قەڵەو بوو– ڕووت ڕەش بێت چی سەرکردەیەکی. ئەبوسوفیان وتی: قوڕتان بەسەر گوێ بە قسەی هیند مەدەن، هێزی موحەممەد بەرگری لێناکرێت، هەرکەسێ دێتە ماڵی منەوە سەلامەت دەبێت، ئەوانیش وتیان: خوا بتکوژێت ماڵی تۆ چیمان پێ دەکات؟ وتی: هەرکەسێ دەرگای خۆی دابخات سەلامەت دەبێت، هەرکەسێ بچێتە مزگەوتەکەوە سەلامەت دەبێت، ئینجا خەڵکی بڵاوەیان کرد بۆ ماڵەکانیان و بۆ مزگەوتەکە.[٢]

پێغەمبەر(ﷺ) سوور بوو لەسەر ئەوەی لە(کداء)ی سەرەوەی مەککەوە بچێتە ژوورەوە، وەکو جێبەجێکردنێك بۆ قسەکەی حەسسانی کوڕی سابیت لەو کاتەی هەڵبەستێکی دانا لە دژی قورەیش و تیایدا باسی کرد کە ئەسپی موسوڵمانان لە کودائەوە دەچنە ژوورەوە، حەسسان دەیفەرموو:

عدمنا خيلنا ان لم تروها    تثير النقع موعدها كداء

واتا: یاخوا ئەسپمان بۆ نەمینێت ئەگەر ئێوە نەیانبینن، تۆز بکەن کاتێك لە کودائەوە دێنە ناو مەککەوە.[٣]

---

١ بڕوانە: دراسة في السيرة، د. عمادالدين خليل (٢٤٥).

٢ بڕوانە: البداية والنهاية (٤/٢٩٠).

٣ بڕوانە: البداية والنهاية (٤/٣٠٩).

## دووەم: چوونە ژوورەوەیەکی ملکەچ و خۆبەکەمزان، نەك چوونە ژوورەوەی داگیرکەری خۆبەزلزان.

لە ڕۆژی فەتحی مەککە پێغەمبەر(ﷺ) مێزەرێکی ڕەشی لە سەردا بوو بەبێ ئیحرام،[١] سەریشی نزم کردبوویەوە وەکو خۆبەکەمزانین بۆ خوای گەورە، چونکە ئەو ڕێزەی لێگرتن و دەرگای مەککەی بۆ والاکردن، تەنانەت چەناگەی موبارەکی خەریك بوو لە زینەکەی دەدا، لەو کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) سورەتی فەتحی دەخوێندەوە و، هەستی دەکرد بەنیعمەتی خوای گەورە بەسەریدا،[٢] کاتێك چووە مەککەوە کە ناو جەرگەی دورگەی عەرەب و مەڵبەندی گیانیو سیاسیان بوو، دروشمی دادگەری و یەکسانی بەرزکردەوە، ئوسامەی کوڕی زەیدیشی لە پشت خۆیەوە سوار کردبوو، کە کوڕی کۆیلەیەکی ئازادکراو بوو، نەیکرد کەسێك لە کوڕانی بەنی هاشیم یان ناودارانی قوڕەیش لەگەڵ خۆی سوار بکات، ئەوەیش لە ڕۆژی جومعە بوو، لە بیستی ڕەمەزانی ساڵی هەشتی کۆچی.[٣]

(محمد الغزالی) دەفەرمووێت:

لە کاتێکدا سوپاکە دەچووە پێشێ، پێغەمبەر(ﷺ) مێزەرێکی ڕەشی وەکو تاج لەسەر بوو، سەری موبارەکیشی دادەنواند بۆ خوای بالادەست، لە دیمەنێکی خۆ بەکەم زانیدا... ئەو کەژاوە پڕ شکۆیەی خێرا ڕێی دەکرد بەرەو ناوجەرگەی حەرەم، ئەو هێزەی کە دەورەیدابوو لەو پێغەمبەرە نازدارە، چاوەڕوانی ئاماژەیەك بوو لێی بۆ ئەوەی هیچ شتێك بەئاسوودە نەمێنێ لە حەرەمدا، ئەم فەتحە مەزنە ڕۆژانێك لە ئاسۆری دەربەدەرکردن دەهێنێتەوە یاد، چۆن ئەو دەربەدەرە ئێنجا بەسەرکەوتوویی دەگەڕێتەوە، چ ڕێزێکی مەزن بوو ئەم سپێدەیە لەگەڵ خۆی هێنای، کە ئەم یادەوەرییانە و هاتنە زەینی پێغەمبەر(ﷺ) زیاتر سەری دادەنواندو ترسی خوای لێ دەنیشت.[٤]

---

١ مسلم رقم (١٣٥٨).

٢ بڕوانە: صور وعبر من الجهاد النبوي في المدينة (٣٩٦).

٣ بڕوانە: السيرة النبوية لابي الحسن الندوي (٣٣٧).

٤ بڕوانە: فقه السيرة للغزالي (٣٧٩، ٣٨٠).

ئەمەو پێغەمبەر(ﷺ) زۆر پەرۆش بوو بۆ دڵنیاکردن و ئاسوودەکردنی بەرەی ناوخۆیی لە مەککە، کاتێك پێی گەیشت سەعدی کوڕی عوبادە بە ئەبوسوفیانی وتووە: ئەمڕۆ داستانێك دروست دەکەین و هێرش دەکەینە نێو کەعبەوە، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((هذا يوم يعظم الله فيه الكعبة، ويوم تكسى فيه الكعبة))، واتە: ئەمڕۆ ڕۆژێکە خوای گەورە کەعبە مەزن ڕادەگرێت و کەعبە دادەپۆشرێت تیایدا، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ئاڵاکەی لە دەستی سەعد وەرگرت دایە دەستی قەیسی کوڕی سەعد، بەم کارەیش ئەگەری شەڕێکی ناوخۆیی لابردو هەمان کات ئەنصارەکانیشی نەوروژاند، چونکە ئاڵاکەی دایە دەستی کوڕەکەی سەعد، چونکە زانراوە کە کەس ڕازی نابێت کەسێکی تر لە خۆی چاکتربێت مەگەر کوڕی خۆی بێت.[1] ئینجا پاش هێمن بوونەوەی خەڵکی، پێغەمبەر(ﷺ) هاتە حەرەمو تەوافی کرد بەدەوری کەعبەو کەوانێکی بەدەستەوە بوو، لەدەوری کەعبەیش سێ سەد و شەست بتی تیا بوو، ئیتر کەوانەکەی پێوە دەژەنین‌و دەیفەرموو: ﴿ وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَـٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَـٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴾(الاسراء:٨١)، ﴿قُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ ٱلْبَـٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ ﴾(سبأ:٤٩) بتەکان لەسەر ڕوویان دەکەوتن،[2] لەڕاستیدا دیمەنێکی ناوازە بوو بۆ سەرخستنی خوا و پشتگیری کردنی بۆ پێغەمبەرەکەی، چونکە بەدارێك کە بەدەستییەوە بوو لەو بتانەی دەدا و دەکەوتن و پارچە پارچە دەبوون، لەناو کەعبەیشدا هەندێ وێنەو بت هەبوون، ئەوانەش شکێنران،[3] ڕازیش نەبوو بچێتە ناو کەعبەوە تاکو ئەو پەیکەرانە دەرنەکران، هەندێ وێنەیشی تیا بوو دەیانووت وێنەی ئیبراهیم و ئیسماعیلە ئەزلامیان بەدەستەوە بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: نەفرینی خوایان لەسەر بێت، خۆیان چاك دەزانن ئەوان ئەزلامیان بەدەستەوە نەگرتووە.[4]

---

١ بڕوانە: قيادة الرسول السياسية والعسكرية (١٩٦).
٢ بڕوانە: السيرة النبوية للندوي (٣٣٩).
٣ بڕوانە:فقه السيرة النبوية للبوطي (٢٨٢) وللندوي (٣٣٩)..
٤ البخاري، كتاب المغازي، (١١٠/٥) رقم (٤٢٨٨).

کلیلی کەعبەیش لەلای عوسمانی کوڕی تەڵحە بوو، پێش ئەوەی موسڵمان بێت، بەڵام عەلی ویستی کلیلو ئاودان لەلای خۆی بێت، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) دای بە عوسمان دوای ئەوەی لە کەعبە دەرچوو و، فەرمووی: ئەمڕۆ ڕۆژی چاکە و ئەمەکە،[1] پێغەمبەر(ﷺ) پێشتر داوای کلیلەکانی لە عوسمان کردبوو پێش ئەوەی کۆچ بکات بۆ مەدینە و ئەویش بە شێوەیەکی ناشیرین وڵامی پێغەمبەر(ﷺ)ی دایەوە و قسەشی پێکرد، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: لەوانەیە ئەو کلیلە ڕۆژێك بە دەستی منەوە ببینی ئەویش وتی: ئەوە ڕۆژێکی سەرشۆڕییە، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: نەخێر ئەوە ڕۆژێکی سەربەرزییە... سەرەڕای ئەوەش پێغەمبەر(ﷺ) لەڕۆژی فەتحی مەککە کلیلەکانی دایە عوسمان و فەرمووی: بیبەن و بە هەمیشەیی با لاتان بێت کەس لێتانی وەرناگرێتەوە ستەمکار نەبێت،[2] پێغەمبەر(ﷺ) نەیویست کلیلی کەعبە زەوت بکات یان بیدات بە یەکێك لە بەنی هاشم، ئەمە واتای فەتحە تەنانەت لەگەڵ ئەوانەشدا کە ناپاکییان کردووە.

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ)فەرمانی کرد بیلال بچێتە سەر کەعبە و بانگ بدات، ئەویش بە دەنگە خۆشەکەی خۆی بانگی بەرزکردەوە و، خەڵکی مەککە دەتوت خەون دەبینن، ئەو وشانە دڵی شەیتانەکانی پڕ دەکرد لە ترس و بیم و تەنها ئەوەیان پێ دەکرێت هەڵبێن، یان ئیمان بهێنن.،

الله اکبر الله اکبر الله اکبر[3]

ئەو دەنگەی ڕۆژێك لە ڕۆژان لە ژێر قامچیدا نووزەی دەهات: ئەحەد، ئەحەد، ئەحەد، ئەوەتا ئەمڕۆ هاوار دەکات لەسەر کەعبەوە دەڵێت: لا الە الا الله، محمد رسول الله، هەموانیش گوێ دەگرن.

---

١ السيرة النبوية لابن هشام (٤/٦١).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٤/٦٢)، المغازي (٢/٨٣٨).

٣ فقه السيرة للغزالي (٣٨٣).

## سێیەم: ڕاگەیاندنی لێبوردنی گشتی.

١- خەڵکی مەککە لێبوردنی گشتیان دەستکەوت، سەرەڕای جۆرەها ئازار کە گەیاندبوویانە پێغەمبەر(ﷺ) و بانگەوازەکەی، سەرەڕای توانای سوپای ئیسلامی بۆ لەناوبردنیان، لێبوردنە گشتیەکە لە کاتێکدا بوو هەموویان کۆبوونەوە لە ناو کەعبەدا و چاوەڕوانی حوکمی پێغەمبەر(ﷺ) بوون، لەو کاتە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: گومان دەبەن چیتان لەگەڵ بکەم؟ وتیان: چاکە، برایەك و برازایەکی چاکی، فەرمووی: ((لاتثریب علیکم الیوم یغفر الله لکم))[1] واتە: سەرزەنشتتان ناکەم، خوای گەورە لێتان خۆش بێت.

ئەم لێبوردنە گشتییەیش بوو بە مایەی پاراستنی خەڵکی لە کوژران و بە کۆیلەکردن، مانەوەی ماڵەکان بەدەست خاوەنەکانیانەوە، نەسەپاندنی سەرانە لەسەریان، واتە مەککە وەکو شوێنەکانی تر مامەڵەی لەگەڵ نەکرا، چونکە شوێنی خواپەرستنە، بۆیە جومهوری زانایان لەسەر ئەوەن کە زەوی مەککە نابێت بفرۆشرێت و ماڵەکانیشی نابێت بدرێنە کرێ، خەڵکەکە جێگیر دەبن لەوەندە جێگەدا بەشیان بکات و ئەوەی دەمێنێتەوە دەیدەنە حاجیان و ئەوانەی دێن بۆ عومرەکردن، هەندێکی تریش لە زانایان ئەو بۆچوونەیان پێ هەڵەیە و بەڵگەی بەهێزیش لەسەر قسەکانیان دەهێننەوە.[2]

٢- پێغەمبەر(ﷺ) خوێن ڕێشتنی چەند کەسێك حەڵاڵ دەکات: لەگەڵ ئەو لێخۆشبوونەشدا پێویستە سەرکردایەتی هەڵوێستی توند و تۆڵیشی هەبێت، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) هەندێ کەسی دەرکرد لەو لێبوردنە گشتییەو فەرمانی کوشتنیان دەرکرا، ئەگەر خۆیانیش هەڵواسن بە پەردەکانی کەعبەوە، چونکە تاوانەکانیان زۆر گەورە بوون لە دژایەتی خوا و پێغەمبەرەکەی‌و ئیسلام، هەروەها بە هۆی مەترسی ئەوەی جارێکی تر ئاژاوەگێڕی بکەن پاش فەتح.[3]

---

١ بڕوانە: المجتمع المدني للعمري (١٧٩).

٢ بڕوانە: المجتمع المدني للعمري (١٨٠).

٣ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٢/٤٥١)، تأملات في السيرة (٢٦٢).

(ابن حجر العسقلانی) دەڵێت: ناوی ئەو کەسانەم لە چەندین شوێن کۆکردووەتەوە و ئەمانەن:

(عبدالعزى بن خطل، عبدالله بن سعد بن ابي سرح، عكرمة بن ابي جهل، الحويرث بن نُقيد، مقيس بن حبابة، هبار بن الاسود) دوو گۆرانی بێژیش کە کۆیلەی(ابن خطل) بوو، ناویان(مزتنی و قريبة) بوون، هەروەها سارەی کەنیزەکی بەنی عەبدولموتەلیب، هەروەها با ئەبو مەعشەر کەسێکی تری باسکردووە ناوی(الحارث بن طلال الحزامي)یە،(الحاكم)یش دەگێڕێتەوە کە(كعب بن زهير) و(وحش بن حرب)و (هند بنت عتبة) لەو کەسانە بوون کە کوشتنیان ڕەوا کرابوو.[1]

هەندێ لەوانەش کوژران، هەندێکیشیان موسڵمان بوون و پێغەمبەر(ﷺ) لێیان خۆش بوو، بوونە موسڵمانی چاکیش.[2]

٣- وتاری پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی فەتح و موسڵمان بوونی خەڵکی مەککە: لەو کاتە بوو پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی زانی خوزاعەی هاوپەیمانانی دەست درێژیان کردووەتە سەر پیاوێك لە(هذيل) بتپەرست بووە، بەرامبەر کەسێك لە جاهیلییەت لە ئەوان کوژرابوو، پێغەمبەر(ﷺ) تووڕە بوو و فەرمووی: خەڵکینە، خوای گەورە مەککەی لەو ڕۆژەدا قەدەغەکردووە کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، بۆیە بە فەرموودەی خوای گەورە قەدەغەکراوە تا ڕۆژی قیامەت، ڕەوا نیيە بۆ کەسێك باوەڕی هەبێت بە خوا و پێغەمبەر خوێنی تیا بڕێژێت، یان داری تیا ببڕێت، بۆ کەسێك پێش من ڕەوا نەبووە، بۆ کەسێك پاش منیش ڕەوا ناکرێت، تەنها لەم ساتە ڕێگەدرا بە من وەکو خەشمێك لەسەر خەڵکەکەی و، وەکو دوێنێ گەڕایەوە، با ئامادەبووتان ئەو کەسە ئاگاداربکاتەوە ئامادە نییە، هەر کەسێکیش پێی وتن: پێغەمبەری خوا جەنگی تیاکردووە، بڵێن: خوای گەورە ڕێگەی بە پێغەمبەرەکەی داوە و ڕێگەی بە ئێوە نەداوە.

---

١ فتح الباري (٧/٩).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٢/٤٥١).

ئەی کۆمەڵی خوزاعە دەستتان هەڵگرن لە کوشتن، چونکە زۆر بووە گەر سوودی بووایە، ئێوە کەسێکتان کوشتوو دەبێت خوێن بایی بدەم، لە دوای ئەمڕۆ هەر کێ بکوژرێت، کەس و کارەکەی دوو ڕێگە چارەیان لە پێش هەیە: گەر بیانەوێت بکوژەکە پێش دەخرێت و دەکوژرێت، یان بیانەوێت خوێنباییەکەی کۆدەکرێتەوە.[١]

لە ئەنجامی لێبوردنە گشتیەکە خەڵکی مەککە بە گشتی هاتنە ئایینی خوای گەورەوە و، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر تەپۆڵکەی صەفا دانیشت بەیعەتی لێوەردەگرتن لەسەر ئیسلام و گوێڕایەڵی بۆ خواو پێغەمبەرەکەی بەوەی کە دەتوانن، لەو ڕۆژەدا موجاشیعی کوڕی مەسعود موجالیدی برای هێنا،پاش فەتحی مەککە و بە پێغەمبەر(ﷺ)ی وت: وا براکەم هێناوە بەیعەتی لێ وەرگریت لەسەر کۆچکردن پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((ذهب اهل الهجرة بما فيها))، واتە: ئەوانەی کۆچیان کرد هەموو پاداشتەکەیان برد، وتی: کەواتە لەسەرچی بەیعەتی لێ وەردەگریت؟ فەرمووی: لەسەر ئیسلام و ئیمان و جیهاد.[٢]

بوخاری دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی فەتحی مەککە فەرمووی:

((لا هجرة بعد الفتح ولكن جهاد ونية، واذا استنفرتم فانفروا))،[٣] واتە: کۆچ نییە لە پاش فەتحی مەککە، بەڵام جیهاد و نیەت هەیە، ئەگەر داواتانیش لێکرا دەرچن بۆ جەنگ دەربچن، بەڵام کۆچکردن لە وڵاتی کوفرەوە بۆ وڵاتی ئیسلام، یان لە وڵاتێکەوە کە نەتوانێ ئایینی خۆی تیا ئاشکرا بکات بۆ وڵاتێك کە دەتوانێت دینداری خۆی تیا بکات هەر دەمێنێتەوە تا ڕۆژی قیامەت، بەڵام ئەمەیان وەکو ئەوی تریان نابێت لە پلە و پایە، جاری وا هەیە واجبە، جاری واش هەیە واجب نییە، وەکو چۆن جیهاد و بەخشین تا ڕۆژی دوای هەر دەمێنێتەوە، بەڵام وەکو جیهاد و بەخشین نییە پێش فەتحی مەککە، وەکو خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٢/٤٥١).

٢ البخاري، كتاب المغازي، (٥/١١٤) رقم (٤٣٠٥).

٣ البخاري، كتاب الجهاد والسيرة، رقم (٤٧٨٣).

قَبْلِ ٱلْفَتْحِ وَقَـٰتَلَ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُوا۟ مِنۢ بَعْدُ وَقَـٰتَلُوا۟ ۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾(الحديد: ١٠).

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لە بەیعەتی پیاوان بوویەوە، بەیعەتی لە ئافرەتان وەرگرت، هیندی کچی عوتبەشیان تیابوو، بەڵام خۆی نەناساندبوو، بەیعەتی ئافرەتان لەسەر ئەوە بوو هاوەڵ بۆ خوا پەیدانەکەن و، دزی و داوێن پیسی نەکەن و، منداڵەکانی خۆیان نەکوژن، هەروەها بوختانیش نەکەن و لە کاری چاکەدا گوێڕایەڵی بکەن، جا کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: دزی نەکەن، هیند وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەبوسوفیان پیاوێکی چروکە بەشی خۆم و منداڵەکانم نادات بە باشی، ئایا ڕەوایە بەبێ ئاگای خۆی لە ماڵەکەی ببەم؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوەندەی بەشی خۆت و منداڵەکانت دەکات دەربکە لە ماڵەکەی بە ڕێگای چاك. ئینجا کاتێك فەرمووی: داوێن پیسی مەکەن، هیند وتی: ئایا ئافرەتی ئازاد داوێن پیسی دەکات؟کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ناسی فەرمووی: تۆ هیندی کچی عوتبەی؟ وتی: بەڵێ: لەوە خۆشبە کە ڕابورد خوا لێت خۆش بێت.

ئینجا بەیعەتی ئافرەتان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بەبێ تەوقە کردن بوو، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) بە هیچ شێوەیەك تەوقەی لەگەڵ ئافرەتێك نەدەکرد حەلاڵ نەبێت بۆی، لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە، لە عائیشەوە فەرموویەتی: سوێند بە خوا، پێغەمبەر(ﷺ) دەستی هەرگیز لە دەستی ئافرەتی نەداوە.

### چوارەم: ناردنی خالیدی کوڕی وەلید بۆ لای(بني جذيمة).

لە مانگی شەوالی ساڵی هەشتی کۆچی، پێغەمبەر(ﷺ) خالیدی کوڕی وەلیدی لەگەڵ سێ سەد و پەنجا کەسدا نارد بۆ لای هۆزی(بني جذيمة)، لەوێ خالید پێی وتن: چەکەکانتان فڕێدەن چونکە خەڵکی موسڵمان بوونە، یەکێکیان تیابوو ناوی جەحدەر بوو، سوێندی بۆ خەڵکەکە خوارد ئەگەر چەکەکانیان فڕێبدەن خالید هەموویان دەکوژێت، بەڵام دواتر هەموویان چەکیان پێ دانرا، جا کە ویستیان موسڵمانبن، لە جیاتی ئەوەی بڵێن موسڵمان بووین، نەیانزانی، وتیان((صبأنا،

صبأنا)) واتە: لەڕێ دەرچووین یان هەڵگەڕاینەوە، بۆیە خالید دیلی دەکردن و دەیکوشتن، هەندێ لە هاوەڵانیش نکوڵیان لەسەر خالید کرد بۆ کوشتنی ئەو خەڵکە، خالید فەرمانی کرد هەریەکە و دیلەکەی لای خۆی بکوژێت، بەڵام هەندێ لە هاوەڵان وەکو عەبدوڵای کوڕی عومەر و کەسانی تر، بە قسەی خالیدیان نەکرد، کاتێك گەڕانەوە لای پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خوایە من بەریم لەوەی خالید کردوویەتی.[١]

خەریکیش بوو پەیوەندی نێوان عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف و خالید ئاڵۆز بێت، چونکە عەبدوڕڕەحمان پێی وابوو خالید تۆڵەی مامێکی دەکاتەوە لە سەردەمی نەفامیدا بە دەست ئەو هۆزە کوژرابوو، لە صەحیحی موسلیمیشدا هاتووە کە شتێك لە نێوان ئەو دوو هاوەڵە ڕوویدا و خالید جنێوی دا بە عەبدوڕڕەحمان ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: جنێو بە هاوەڵانم مەدەن، چونکە ئەگەر ئەوەندەی کێوی ئوحود ئاڵتوون ببەخشن ئەوەندەی مشتێکی چاکەی ئەوانتان بەرناکەوێت...[٢] ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) عەلی نارد و خوێنبایی کوژراوەکانی دا، وەکو دڵنەوایی و دەربڕینی ناڕەحەتی بۆ خوێنی ئەو کوژراوانە،[٣] کوشتنی خالید بۆ ئەو پیاوانە هەڵەیەك بوو لە خالیدەوە نەك بە ئەنقەست وای کردبێت، هەر بۆیەش پێغەمبەر(ﷺ) سزای نەدا لەسەر ئەو کارەی.[٤]

## پێنجەم: ڕووخانی خانووی بتەکان.

پاش پاککردنەوەی حەرەم لە بتەکان، پێویست بوو ئەو شوێنانەیش کە تەرخان کراون بۆ بتپەرستی بڕوخێنرێن، چونکە ئەو دیاردە نەفامییانە ساڵانێکی زۆری بەسەردا تێپەڕ بووبوو،[٥] بۆیە پۆلە سەربازییەکانی پێغەمبەر(ﷺ) یەك لە دوای یەك

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٢/٤٦٤).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٥٧٩).

٣ سەنەدەکەی لاوازە، السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٥٧٩).

٤ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٥٧٩).

٥ معين السيرة (٢٩٤).

ڕەوانە دەکران بۆ پاك کردنەوەی دوورگەی عەرەب.

**١- پۆلی سەربازی خالیدی کوڕی وەلید بۆ(العزی):**

پۆلێکی سەربازی پێکهاتوو لە سی سوار بە سەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلید ڕوویان کردە بتی هەرە مەزنی قورەیش و هەموو عەرەب کە بە(العزی) دەناسرا بۆ ئەوەی بۆ یەکجاری لە ناوی بدەن، کاتێك گەیشتنە لای بتەکە خالید ئەو خانوویەی ڕووخاند کە ئەو بتەی لەسەر بوو، لەو کاتەدا دەیووت: باوەڕم پێت نییە، وا خوای گەورە ڕیسوای کردی،[١] ئینجا خالید و هاوەڵانی گەڕانەوە لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش بە خالیدی فەرموو: هیچت بینی، وتی: نەخێر،[٢] فەرمووی: کەواتە بگەڕێرەوە چونکە هیچت نەکردووە،[٣] ئینجا خالید بە تووڕەیی گەڕایەوە و، بتەوانەکانی بینی، کە زانیان خالید بۆچی گەڕاوەتەوە، هەڵهاتن بەرەو شاخەکە و هاواریان دەکرد: ئەی عوززا شێتی کەیت، ئەی عوززا کوێری کەیت، ئینجا خالید ئافرەتێکی ڕووتی بینی قژی خۆی کردووەتەوەو خۆڵ بەسەر خۆیدا دەکات، ئیتر خالید بەرەو ڕووی ڕۆیشت و بە شمشێرەکەی لێیدا تاکو کوشتی، ئینجا گەڕایەوە لای پێغەمبەر(ﷺ) و بۆی باس کرد، جا پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: ئەوە خۆی عوززا بوو.[٤]

**٢- پۆلی سەربازی سەعدی کوڕی زەیدی ئەشهەلی بۆ(مناة):**

مەنات ناوی بتێك بوو لەسەر ڕۆخی دەریای سوور، لە لای قەدیدەوە لە ناوچەیەك بە(المشلل) دەناسرا، ئەو بتە بتی ئەوس و خەزرەج و غەسان و ئەوانە بوو کە لەسەر ئایینی ئەوان بوون، دەیانپەرست و لە لایەوە نیەتی حەجیان دەهێنا، هەرکەسێ لە لای مەناتەوە نیەتی حەجی بهێنایە نەدەسوڕایەوە لە نێوان صەفا و مەروەدا،[٥] هەر ئەمە پیشەیان بوو تا ئەو کاتەی موسڵمان بوون، جا کاتێك

---

١ بڕوانە: السرايا والبعوث النبوية (٢٨٣).
٢ بڕوانە: المغازي (٨٧٤/٢).
٣ بڕوانە: السرايا والبعوث النبوية (٢٨٢).
٤ هەمان سەرچاوە (٢٨٣).
٥ هەمان سەرچاوە (٢٨٦).

هاتن بۆ حەج لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەیان کەوتەوە یاد، خوای گەورەیش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ۖ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ۚ وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ﴾(البقرة:١٥٨).

یەکەمین کەسیش ئەو بتانەی دامەزراند، دامەزرێنەری بتپەرستی بوو(عمرو بن لحي الخزامي)، جا لە پاش فەتحی مەککە پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بە ناردنی بیست سوار بە سەرکردایەتی سەعدی کوڕی زەیدی ئەشهەلی بۆ لابردنی بتی مەنات بۆ یەکجارەکی.[١] کاتێك گەیشتنە لای بتەوانەکە وتی: چیتان ئەوێ؟ وتیان: مەنات دەڕوخێنین، وتی: ئەوە ئێوە و ئەوە مەنات، سەعد بەرەو لای بتەکە ڕۆیشت و ئافرەتێکی ڕووتی ڕەش و قژ هەڵچوو، شیوەنی دەکرد و لە سنگی خۆی دەدا، ئینجا بتەوانەکە هاوارێکی لەو ئافرەتە کرد و وتی: ئەی مەنات ئەوانە هەندێکن لە یاخی بووەکانت،[٢] لەو کاتەدا سەعد ئەو ئافرەتەی کوشت و ئینجا بتەکەشیان ڕووخاند و گەڕانەوە لای پێغەمبەر(ﷺ).[٣]

**٣- پۆلی سەربازی عەمری کوڕی عاص بۆ( سواع ):**

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَقَالُوا۟ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا﴾(نوح: ٢٣).

سواعیش ناوی بتێك بوو قەومەکەی نوح دەیانپەرست، دواتر کەوتە لای هۆزی(هذیل)ی سەر بە(مضر)[٤] و تاکو کاتی فەتحی مەککە هەر دەپەرسترا، عەمری

---

١ بڕوانە: السرایا والبعوث النبوي (٢٨٧).

٢ هەمان سەرچاوە (٢/١٤٦).

٣ بڕوانە: السرایا والبعوث النبویة (٢٨٨)، دانەری کتێبێکە دکتۆر (بریکك العمری) دەڵێت: ئەم هەواڵە لە ڕووی فەرموودەییەوە لاوازە، بەڵام لە ڕووی مێژووییەوە، وەکو کەڵك لێوەرگرتن وەردەگیرێت، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) هەندێ پۆلی سەربازی نارد بۆ ڕووخاندنی هەموو بتەکان لە دوورگەی عەرەب و ناکرێت تەنها مەناتی لێ جیابکرێتەوە، چونکە گەورەترینیشیان بووە.

سەبارەت بە ناردنی پۆلە سەربازی و نێردەکان پشتم بەستووە بە ئەم کتێبە زانستیە کە دکتۆر (اکرم العمری) سەرپەرشتی کردووە.

٤ بڕوانە: السرایا والبعوث النبوي (٢٩٢).

کوڕی عاص دەفەرمووێت: گەیشتمە بتەوانەکە و وتم پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێ کردووم ئەو بتە بڕووخێنم، وتی: دەسەڵاتی ئەو کارەت نابێت، وتم تاکو ئێستا هەر لەسەر ناهەقی، بەڵات لێدا ئایا ئەو بتە دەبیستێ، دەبینێ، ئینجا نزیك بوومەوە و شکاندم و، بینیم گەنجینەکەشی هیچی تێدا نییە، بە بتەوانەکەم وت: ئێستا چی دەڵێیت: وتی: موسڵمان بووم بۆ خوا.[1]

لە ڕووخاندنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەو بتانە تێدەگەین نابێت جێگای شیرك و تاغوت بە هیچ شێوەیەك بمێنێتەوە ئەگەر موسڵمانان دەسەڵاتیان هەبوو، چونکە ئەوانە دروشمی بێباوەڕین، نابێت شوێنەواریان لەسەر زەوی بمێنێتەوە، زۆرێکیش لەوانە لە لات و عوززا و مەنات کەمتر نین، ئەگەر مەزنتر نەبن لە دڵی ئەوانەی باوەڕیان پێیان هەیە.[2]

١ بڕوانە: المغازي للواقدي (٢/٨٧٠).
٢ بڕوانە: السرايا والبعوث النبوية (٣٠٢).

# باسی سێیەم: پەندو ئامۆژگاری

## یەکەم: هەڵوێستی بانگەوازانە و توانای مامەڵەکردن لەگەڵ دەروونەکاندا.

### ١- موسڵمان بوونی سوهەیلی کوڕی عەمر:

سوهەیل دەڵێت: کە پێغەمبەر(ﷺ) هاتە نێو مەککەوە، دەرگای ماڵەکەم لە خۆم داخست و ناردم بە دوای عەبدوڵای کوڕمدا و، داوام کرد کە پەیمانێکی دڵنیاکردنەوەم بۆ بهێنێت لە لای پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە کردەوەکانی خۆمم یاد دەکەوت لە حودەیبیە و لە بەدر و هەموو شوێنەکانی تر، ئیتر عەبدوڵا چووە لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش فەرمووی: با دەرکەوێت و دڵنیا بێت بە دڵنیابوونی خوای گەورە، ئینجا بە هاوەڵانی فەرموو: هەرکەسێ لە ئێوەسوهەیلی بینی با توند تەماشای نەکات، ئەو خاوەن پلەو پایە و ژیرییە، بۆیشی دەرکەوتووە کە ئەوەی تێیدا بوو بێ سوودە.

ئیتر عەبدوڵا هاتە لای باوکی و ئەویش وتی: سوێند بە خوا بە منداڵی و بە گەورەیی هەر چاکەکار بووە، سوهەیل دەهات و دوڕۆیشت و، لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوو، هەر لەسەر بتپەرستی خۆی بوو، تاکو لە(الجعرانة) موسڵمان بوو.[1] ئەو وشانەی پێغەمبەر(ﷺ) کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر سوهەیل، کە بووە مایەی موسڵمان بوونی سوهەیل، زوبەیری کوڕی بەککار دەڵێت: دواتر سوهەیل زۆر نوێژ و ڕۆژووی دەگرت، زۆری خێر و چاکەی دەکرد، ڕۆیشت بۆ شامیش لەگەڵ کۆمەڵەکەی بۆ جیهاد کردن، دەشڵێن: ئەوەندە نوێژی دەکرد و ڕۆژووی دەگرت تاکو ڕەنگی تێکچوو، زۆریش دەگریا کە گوێی لە قورئان دەگرت، فەرماندەیش بوو لەسەر بەشێکی گەورە لە سوپای ئیسلامی لە یەرمووك.[2]

١ بڕوانە: مغازي الواقدي (٢/٨٤٦-٨٤٧)، المستدرك للحاكم (٣/٢٨١).
٢ بڕوانە: سير اعلام النبلاء (٢/١٩٥)، تاريخ الاسلامي للحميدي (٧/٢١٦-٢١٧).

**٢- موسڵمان بوونی سەفوانی کوڕی ئومەییە:**

عەبدوڵای کوڕی زوبێر(ﷺ) دەفەرموێت: سەفوانی کوڕی ئومەییە هەڵهات بەرەو شوعەیبە،[١] بە(یسار)ی خوڵامی دەوت: تەماشاکە دەبینی؟ ئەویش وتی: ئەوە عومەیری کوڕی وەهبە، سەفوان وتی: چی لە عومەیر بکەم ئەو تازە موسڵمان بووە، کاتێك عومەیر هات، سەفوان پێی وت: ئەوەندەت بەس نییە قەرزاری و بەخێوکردنی منداڵەکانت خستە سەرم، ئینجا هاتووی بشم کوژی؟ وتی: ئەی ئەبو وەهەب، بە قوربانت بم! لە لای چاکترین کەسەوە هاتوومەتە لات، دڵنیاشی کردووی لەسەر ژیانی خۆت، سەفوان وتی: سوێند بە خوا ناگەڕێمەوە تاکو نیشانەیەکم بۆ نەهێنی لە لایەوە، کاتێك عومەیر گەڕایەوە لای پێغەمبەر(ﷺ) و مەترسی سەفوانی باس کرد لەسەر ژیانی خۆی، پێغەمبەر(ﷺ) مێزەرەکەی خۆی پێدا، ئینجا عومەیر گەڕایەوە لای و پێی وت: ئەی باوکی وەهب لە لای چاکترین کەسەوە گەڕامەتەوە لات، سەربەرزی ئەو سەربەرزییە بۆ تۆ، موڵکی ئەویش وەکو موڵکی خۆتە، کوڕی دایك و باوکتە، ناوی خوا بهێنە لە دەروونی خۆتدا، وا مێزەرەکەشی لەگەڵمدا ناردووە و، بانگت دەکات بۆ ئیسلام، ئەگەر نا دوو مانگیش بوارت دەدا، ئەو چاکترین و بە ئەمەکترین کەسە، ئیتر سەفوان گەڕایەوە لای پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتێکدا پێشنوێژی عەسری بۆ موسڵمانان دەکرد، سەفوان وتی: ئێوە چەند نوێژ دەکەن لە ڕۆژێکدا، وتی: پێنج نوێژ، وتی: موحەممەد پێش نوێژیان بۆ دەکات، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) سەلامی دایەوە، سەفوان هاواری کرد: ئەی موحەممەد، عومەیری کوڕی وەهب مێزەرەکەی تۆی بۆم هێناوە، گوایە ئەگەر موسڵمان نەبم دوو مانگ بوارم بدەیت، وتی: دابەزە ئەی باوکی وەهب، وتی: نە بە خوا، تاکو ڕوونی نەکەیتەوە بۆم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵکو چوار مانگ بوارت دەدەین، ئینجا دابەزی لە دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) بەرەو هەوازن ڕۆیشت، سەفوانیش لەگەڵی دەرچوو کە هێشتا هەر

---

١ بەندەرێکە لە ڕۆخی دەریای حیجاز، بەندەری مەککە و وێستگەی کەشتیەکانی بوو پێش جودە، معجم البلدان (٥/٢٧٦).

بێباوەڕ بوو، پێغەمبەر(ﷺ) داوای هەندێ چەکی کرد بەخواستن، ئەویش سەد قەڵغانی پێدا و وتی: ئایا بە ویستی خۆمە یان بە زۆر، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بە خواستنە و بۆت دەگێڕمەوە، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) لە حونەین گەڕایەوە بۆ(الجعرانة)، لەو کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) بە ناو دەستکەوتەکاندا ڕێی دەکرد و، صەفوانیش لە تەنیشت پێغەمبەر(ﷺ) تەماشای دۆڵێکی دەکرد پڕ لە ڕەشەوڵاخ و مەڕ و شوانەکانیان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: حەز لەو مەڕ و ماڵاتە دەکەیت لە ناو ئەو دۆڵەدا، وتی: بەڵێ، فەرمووی: هەمووی بۆ تۆیە، ئیتر صەفوان وتی: پێغەمبەر نەبێت کەس ئەوەندە ماڵی لە دەست دەرناچێت(اشهد ان لا الـه الا الله، وان محمداً رسول الله) ئینجا هەر لەو جێگایەدا موسڵمان بوو.[1]

لەم بەسەرهاتە تێبینی دەکەین پێغەمبەر(ﷺ) هەر هەوڵی دەدا دڵی صەفوان ڕاکێشێت بۆ ئیسلام تاکو موسڵمان بوو، صەفوان باسی بەخشندەیی پێغەمبەر(ﷺ)مان بۆ دەکات و دەڵێت: سوێند بە خوا پێغەمبەر(ﷺ) سەرەتا ئەو ماڵانەی پێدەدام و زۆر ڕقم لێ بوو، بەڵام هەر بەخشندە بوو لەگەڵم تاکو بووە خۆشەویسترین کەس لە لام.[2]

**٣- موسڵمان بوونی عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل:**

عەبدوڵای کوڕی زوبێر(ﷺ) دەفەرمووێت: ئوممو حەکیمی خێزانی عیکریمە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا عیکریمە هەڵهاتووە بۆ یەمەن لە ترسی ئەوەی بکوژرێت، جا داوات لێ دەکەم دڵنیای بکەی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: با دڵنیا بێت لە خۆی و بگەڕێتەوە، ئوممو حەکیم و خوڵامێکی ڕۆمی هەبوو پێکەوە دەرچوون بە دوای عیکریمەدا، لە ڕێگە خوڵامەکە ویستی دەست درێژی بکاتە سەر ئوممو حەکیمدا، ئەویش هەر بە تەمای دەکرد و دەیخەڵەتاند تاکو گەیشتە ناوچەی(عک) و لەوێ هانای بۆ بردن ئەوانیش بە پەتێک بەستیانەوە، ئینجا گەیشتە عیکریمە لە لای ڕۆخی دەریا ...و پێی وت: لە لای چاکترین کەسەوە هاتوومەتە لات و دڵنیاتیشی کردووە لەسەر گیانی خۆت، وتی: خۆت چوویتە لای؟ وتی: بەڵێ، وتی: ئەی

---

١ بڕوانە: مغازي الواقدي (٢/٨٥٣-٨٥٥).

٢ مسلم، كتاب الفضائل رقم (٢٣١٣_١٨٠٦).

خولامە ڕۆمییەکە چۆن بوو لەگەڵت؟ ئەویش باسی بەسەرهاتەکەی ئەوی بۆ کرد، بۆیە عیکریمە ئەو خولامەی کوشت، کە هێشتا موسڵمان نەبووبوو، کە نزیک بوونەوە لە مەککە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل دێتە لاتان بە ئیمانداری و کۆچکردوویی، بۆیە جنێو بە باوکی مەدەن، چونکە جنێودان بە مردوو ئازاری زیندوو دەدات و بە مردووەکە ناگات.

عیکریمە لەو ماوەیە داوای دەکرد بچێتە لای خێزانی و ئەویش ڕازی نەدەبوو، دەیووت: تۆ کافری و من موسڵمانم، ئەویش دەیووت: بەڕاستی ئەوەی وای لە تۆ کردووە خۆتم لێ قەدەغە بکەیت مەسەلەیەکی یەکجار گەورەیە، کە عیکریمە هات، پێغەمبەر(ﷺ) چووە پیرییەوە و هیچی لەسەر شان نەبوو، لە خۆشیدا، لە پێش دەستی پێغەمبەر(ﷺ) ڕاوەستا و وتی: ئەی موحەممەد ئەم ئافرەتە دەڵێت تۆ منت دڵنیا کردووە لەسەر گیانی خۆم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵێ ڕاست دەکات، عیکریمە وتی: باشە بۆچی بانگم دەکەیت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بۆ ئەوەی بڵێیت(اشهد ان لا اله الا الله، وان محمداً رسول الله) و نوێژ بکەیت و زەکات بدەیت، و ئەوە و ئەوە بکەیت، تاکو خەسڵەتەکانی ئیسلامی بۆ باس کرد، عیکریمە وتی: سوێند بە خوا بانگەوازی تۆ بۆ کاری چاکەیە، بۆیە دەڵێم(اشهد ان لا اله الا الله، واشهد ان محمداً رسول الله) ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) زۆر پێخۆشحاڵ بوو، عیکریمە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا فێری باشترین شتم بکە بیڵێم، فەرمووی: بڵێ:(اشهد ان لا اله الا الله، وان محمداً رسول الله) عیکریمە وتی: پاش ئەوە چی بڵێم: فەرمووی: شایەتمان بهێنە و بڵێ ئامادەبووان دەکەم بە شایەت لەسەر ئەوەی موسڵمانم و کۆکچار و موجاهیدم. ئینجا عیکریمە وای وت:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی داوای هەرچی بکەیت دابێتمە کەسێك بە تۆیشی دەدەم، عیکریمە وتی: داوات لێ دەکەم داوای لێخۆش بوونم بۆ بکەیت لەسەر هەموو دژایەتییەك ئەنجامم داوە بەرامبەرت، یان ڕێکرد و ڕاوەستان و قسەیەك کە لە دژت کردبێتم. پێغەمبەر(ﷺ) ئەو دوعایەی بۆ کرد. عیکریمە وتی: ڕازی بووم ئەی پێغەمبەری خوا، هەرچی ماڵێکم خەرج کردبێت لە دژایەتی خوا، دەبێت دوو بەرامبەری بکەمەوە لە پێناو خوادا و ئەمجارە. هەرچی شەڕێکیشم دەکرد لە دژی

ئیسلام، ئەمجارە دەبێت لە دژی بێباوەڕان بیکەم تاکو شەهید دەبم.[١] پاش موسڵمان بوونی پێغەمبەر(ﷺ) خێزانەکەی بۆ گەڕاندەوە لەسەر هاوسەرگیری یەکەم جاریان.[٢]

پێغەمبەر(ﷺ) ڕەفتاری لەگەڵ عیکریمە نەرم و نیان و بەسۆز بوو، ئەوەندە بەس بوو بۆ ڕاکێشانی بۆ ئیسلام، تەنانەت کەواکەی لە شان نەکرد و زەردەخەنەی بۆ کرد و بەخێرهاتنی کرد، عیکریمەیش هەستی جوڵا بەم هەڵوێستەو موسڵمان بوو، هەروەها هەڵوێستی خێزانیشی هەر کاریگەری خۆی هەبوو، کاتێك دڵنیابوونی بۆ هێنا لە لای پێغەمبەر(ﷺ)، خۆی لێ قەدەغەکرد تاکو موسڵمان نەبێت، عیکریمەیش ڕاستگۆ بوو لە موسڵمان بوونیدا، داوای ماڵی دونیای نەکرد، بەڵکو تەنها داوای لێخۆشبوونی کرد لە کارە خراپەکانی، ئینجا عیکریمە خاوەن بەڵێنی خۆیشی بوو، یەکێکی لێ دەرچوو لە موجاهید و سەرکردەکان لە جەنگەکانی هەڵگەڕانەوەدا( حروب الرِّدە) و لە فتوحاتی شام، تاکو لە جەنگی یەرمووك شەهید بوو.[٣]

**٤- نموونەیەك لە خۆبەکەمزانینی پێغەمبەر(ﷺ)، موسڵمان بوونی باوکی ئەبو بەکر:**

ئەسمائی کچی ئەبوبەکری صدیق دەفەرموێت: کە پێغەمبەر(ﷺ) هاتە مەککەوە و لە ناو مزگەوتەکەدا بوو، ئەبو بەکر باوکی هێنا بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش فەرمووی:((هلا ترکت الشیخ في بیته حتی اکون انا اتیه فیه؟)) واتە: ئایا بۆ ئەم پیاوە بە تەمەنەت واز لێ نەهێنا لە ماڵی خۆی تاکو خۆم دەچوومە لای لەوێ، ئەبو بەکر فەرمووی: ئەو لەپێشترە بێتە لات، ئینجا داینیشاند لەبەر دەستی و پێغەمبەر(ﷺ) دەستی هێنا بەسەر سنگیدا و فەرمووی: موسڵمان بە، ئەویش موسڵمان بوو، لەو کاتە سەری باوکی ئەبو بەکر تەواو سپی بووبوو، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەو قژە ڕەنگ بکەن،[٤] دەشگێڕنەوە کە پێغەمبەر(ﷺ)

---

١ لە ڕۆژی یەرموك شەهید بوو.
٢ بڕوانە: مغازي الواقدي (٢/٨٥١-٨٥٣).
٣ بڕوانە: التاریخ الاسلامي (٧/٢٢٣-٢٢٥).
٤ بڕوانە: السیرة النبویة لابن هشام (٤/٥٤-٥٥).

پیرۆزبایی لە ئەبو بەکر کردووە بە موسڵمان بوونی باوکی.[١]

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت:((لیس منا من لم یرحم صغیرنا ویوقر کبیرنا))،[٢] واتە: لە ئێمە نییە کەسێك میهرەبان نەبێت بەرامبەر بچووکمان و ڕێزی گەورەمان نەگرێت. هەروەها فەرموویەتی:((ان من اجلال الله تعالی اکرام ذي الشیبة المسلم))،[٣] واتە: ڕێزگرتن لە موسڵمانی ڕیش سپی لە مەزن ڕاگرتنی خوای گەورەیە.

**٥- نموونەیەك لە لێبوردەیی پێغەمبەر(ﷺ) و لەسەرخۆیی، موسڵمان بوونی(فضالة)ی کوڕی عومەیر:**

لە ساڵی فەتحدا، لەو کاتەی پێغەمبەر(ﷺ) بە دەوری کەعبەدا دەسوڕایەوە،(فضالة) ویستی پێغەمبەر(ﷺ) بکوژێت، کاتێك نزیك بوویەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(فضالة)؟ وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: نیازی چیت کردبوو لە دڵی خۆتدا، وتی: هیچ نیازێکم نەبوو، یادی خوام دەکردەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) پێکەنی و فەرمووی:(استغفر الله) واتە: داوای لێخۆشبوون لە خوا بکە و، دەستی خستە سەر سنگی، ئیتر دڵی سوکنایی بۆ هات،(فضالة) پاش ئەوە دەیوت: سوێند بە خوا لەگەڵ دەستی بەرزکردەوە لەسەر سنگم، کەس نەبوو لە ئەو خۆشەویستتربێت بە لامەوە، دەڵێت: ئینجا گەڕامەوە لای کەس و کارەکەم و بە لای ئافرەتێکدا ڕەت بووم پێشتر قسەم لەگەڵی دەکرد، بانگی کردم، وتم: نەخێر، ئینجا بە هۆنراوە وەڵامی دایەوە کە خوا و ئیسلام ئەو کارە قبووڵ ناکەن.[٤]

## دووەم: ئایا قسەم لەگەڵ دەکەیت دەربارەی سنوورێك لە سنوورەکانی خوا.

عوروەی کوڕی زوبەیر دەڵێت:

ئافرەتێك لە کاتی غەزای فەتحدا دزی کرد، کەس و کارەکەی هاواریان هێنا بۆ لای ئوسامە بۆ ئەوەی تکایان بۆ بکات، کاتێك چووە لای پێغەمبەر(ﷺ)،

---

١ بڕوانە: السیرة النبویة في ضوء المصادر الاصلیة (٥٥٧).
٢ بڕوانە: سنن الترمذي، کتاب البر (باب ١٥ رقم ١٩٨).
٣ بڕوانە: سنن ابي داود، کتاب الادب (باب ٢٠ رقم ٤٨٤٣).
٤ التاریخ الاسلامي (٢١٣/٧).

ڕووخساری گۆڕا و، ئێوارە وتارێکی دا، ستایشی خوای گەورەی کرد و فەرمووی: ئەوانەی پێش ئێوە، ئەگەر کەسی ناودار دزی بکردایە وازیان لێ دەهێنا، ئەگەر کەسی لاوازیش دزی بکردایە سزایان لەسەری جێبەجێ دەکرد، سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بە دەستە، ئەگەر فاتیمەی کچی موحەممەد دزی بکردایە دەستم دەبڕییەوە، ئینجا فەرمانی کرد و دەستی ئەو ئافرەتەیان بڕی.

پاش ئەوە تەوبەیەکی چاکی کرد و شووی کرد، عائیشە دەفەرموێت: دواتر دەهاتە لام و کارێکی هەبوایە دەمگەیاندە پێغەمبەر(ﷺ).[1]

بەم شێوە بونیاتنانی پەروەردەیی بەردەوام بوو بۆ ئوممەت، قورەیش خۆی لە بەرامبەر شەریعەتێکی خواییدا دەبینییەوە جیاوازی ناکات لە نێوان خەڵکیدا، پێوەرەکانی پلە و پایەیش بوو بە پابەندبوون بە شەریعەتی خوای گەورە، بۆیەیش پێغەمبەر(ﷺ) بەو جۆرە تووڕە بوو تاکو کەمتەرخەمی نەکرێت لە جێبەجێ کردنی حوکمەکانی خوای گەورە، یان تکا بکەن لە لای فەرمانڕەوایەك لە پێناو پەکخستنی سزا شەرعییەکان.[2]

### سێیەم: ئەو کەسەی تۆ پەنات داوە، ئێمەیش پەنای دەدەین.

ئوممومهانیئی کچی ئەبو تالیب دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لە بەرزایی مەککە هاتە خوارەوە، دوو پیاو لە خەزورانم هەڵهاتن بۆ لام، لەو کاتە عەلی برام هات و وتی: سوێند بە خوا دەبێت بیانکوژم، منیش دەرگای ماڵەکەم لەسەریان داخست، ئینجا هاتمە لای پێغەمبەر(ﷺ)، لە سەرووی مەککە بوو، لە لەگەنێکی گەورە خۆی دەشۆرد، شوێنەواری هەویری پێوە دیار بوو، فاتیمەی کچیشی بە پۆشاکێك دایدەپۆشی پاش لێبوونەوەی، پۆشاکەکەی هەڵگرت و خۆی پێ داپۆشی، ئینجا هەشت ڕکات نوێژی کرد و هاتە لام، فەرمووی: بەخێر بێی ئەی دایکی هانیء،چی تۆی هێنا؟ منیش باسی ئەو دوو پیاوەم بۆ کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((قد

---

١ البخاري، المغازي، رقم (٤٣٠٤).

٢ بڕوانە: من معين السيرة (٤٠٢)، التاريخ الاسلامي (٢٣٣/٧).

اجرنا من اجرت وامنا من امنت فلا يقتلهما)).[١] واتە: ئەو کەسەی تۆ داڵدەت داوە ئێمەیش داڵدەی دەدەین، ئەو کەسەی تۆدڵنیات کردووە ئێمەیش دڵنیای دەکەین و ناتوانێت بیانکوژێت.

## چوارەم: بۆ هیچ پێغەمبەرێك نییە ناپاکی چاوی هەبێت.

(عبدالله بن سعد بن ابی السرح) موسڵمان بووبوو، ئینجا پاشگەزبوویەوە، جا کاتێك کوشتنی حەڵاڵ کرابوو، لەگەڵ عوسمان هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەوەی تکای بۆ بکات، پێغەمبەر(ﷺ) ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوو، ئینجا فەرمووی: باشە، ئینجا لەگەڵ عوسمان ڕۆیشتن، پێغەمبەر(ﷺ) بە دەوروبەری خۆی فەرمووی: ئایا پیاوێکی هۆشمەندتان تیانەبوو کە بینی ئەوەندە بێدەنگ بووم بینکوشتایە، وتیان: ئاماژەیەکت بکردایە ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، فەرمووی:((ان النبي لا يقتل باشارة))،[٢] واتە: پێغەمبەر نابێت بە ئاماژە خەڵکی بکوژێت.

ئیبنو هیشام دەڵێت:(عبدالله) بوو بە موسڵمانێکی چاك لە پاش ئەوە و، عومەرو عوسمان هەندێ کاروباریان پێ سپارد.[٣]

(ابن کثیر) دەڵێت: لە کاتی سوجدە بردندا گیانی سپارد لە نوێژی بەیانیدا، یان پاش تەواوبوونی نوێژەکەی لە ماڵی خۆی.[٤]

## پێنجەم: ژیان و مردنم لەگەڵ ئێوە دەبێت.

ئەبو هورەیرە دەفەرموێت: پێغەمبەر(ﷺ) چووە سەر کێوی صەفا و، تەماشای ماڵەکانی دەکرد، دەستی بەرزکردەوە لە خوا دەپاڕایەوە و، ئەنصارەکانیش لە خوارەوەی بوون، هەندێکیان دەیانووت: پێغەمبەر(ﷺ) حەزی مانەوەی هەیە لە مەککە و سۆزی هەیە بۆ هۆزەکەی خۆی، لەو کاتە وەحی بۆ

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٤/٥٩-٦٠)، صحيح السيرة (٥٢٧).
٢ البداية والنهاية (٤/٢٩٦).
٣ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٤/٥٨).
٤ بڕوانە: البداية والنهاية (٤/٢٩٦).

پێغەمبەر(ﷺ) هات کەس چاوی بەرزنەکردەوە تاکو وەحیەکە تەواو بوو، ئینجا فەرمووی: ئەو قسەتان کردووە: وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ......نەخێر من بەندە و پێغەمبەری خوام، کۆچم کردووە بۆ لای خوا و بۆ لای ئێوە، ژیان و مردنم هەر لە لای ئێوە دەبێت، دەڵێت: ئینجا بە گریانەوە بەرەو لای پێغەمبەری خوا هاتن(ﷺ) و دەیانووت: سوێند بە خوا ئەو قسەمان نەکرد لەبەر ئەوە نەبێت، ئەوە گومانمان بوو لە خوا و پێغەمبەرەکەی، فەرمووی: خوا و پێغەمبەرەکەشی باوەڕتان پێ دەکەن و پۆزشتان بۆ دەهێننەوە.[١]

## شەشەم: موسڵمان بوونی عەبدوڵای کوڕی زیبەعری شاعیری قوڕەیش.

پاش فەتحکردنی مەککە ئەم شاعیرە هەڵهات بەرەو نەجران، بەڵام هۆنراوەکانی حەسسان بە دوایدا ڕۆیشتن، چونکە دوژمنێکی سەرسەختی ئیسلام بوو، حەسسان دەربارەی ئەو دەیووت:

غضب الاله على الزبعرى وابنه      وعذاب سوء في الحياة مقيم

واتە: خوای گەورە ڕق و تووڕەیی خۆی دابەزاندووەتە سەر زیبەعری و کوڕەکەی، سزای خراپ و بەردەوامیشی هەیە لە دونیادا.

عەبدوڵا زۆر مەسەلەکانی لە یەك دەدایەوە و، لە کۆتاییدا بڕیاری موسڵمان بوونی دا، بۆیە ڕۆیشتن بۆ مەککە، موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند و داوای لێبوردنی کرد لە هەموو ئەو خراپانەی کردوویەتی و وتوویەتی، پێغەمبەر(ﷺ) فەموویەتی:((ان الاسلام يجبّ ماقبله))،[٢] واتە: ئیسلام هەرچی پێش خۆی هەیە دەیسڕێتەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) لە خۆی نزیك کردەوە و، دڵی خۆشکرد و پۆشاکێکی پێ بەخشی.[٣] مێژوونووسان ڕێککەوتوون لەسەر ئەوەی کە عەبدوڵا پاش موسڵمان بوونی هۆنراوەی زۆری وتووە تیایدا داوای لێبوردنی کردووە لە پێغەمبەر(ﷺ).[٤]

---

١ بروانە: صحيح السيرة النبوية (٥٢٩-٥٣٠)
٢ المغازي (٢/٨٤٨).
٣ الاعلام للزركلي (٤/٨٤)، الاصابة لابن حجر (٢/٣٠٨)، نقلا من المرجع الذي بعده.
٤ بروانە: الصحابي الشاعر عبدالله بن الزبعري (٩٧).

(ابن حجر) و(ابن عبدالبر) و(القرطبي) هەموویان لەسەر ئەوەن کە عەبدوڵای کوڕی زیبەعری هۆنراوەی زۆری وتووە لە ستایشی پێغەمبەر(ﷺ)دا، پاش ئەوەی کە ئەو هەموو هەڵبەستەی دەهۆنیەوە لە دژایەتی ئیسلامدا و، تەوبەیەکی باشی کرد و گەڕایەوە سەر ڕێگای ڕاستی ئیسلام.[1]

## حەوتەم: ئەو حوکمە شەرعییانەی لە غەزای مەککە وەردەگیردرێت.

**١- لە کاتی فەتحی مەککە زۆر حوکمی شەرعی ئاشکرا بوو، لەوانە:**

أ- ڕێدراوە بۆ گەشتیارێك گەشتەکەی لە ڕەزامەندی خوادابێت، ڕۆژو بگرێت یان بیشکێنێت، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) تاکو کەدید بەڕۆژو بوو، لە دوای ئەوە شکاندی.[2]

ب- پێغەمبەر(ﷺ) هەشت ڕکاتی سووکی کرد لە نوێژی چێشتەنگادا،[3] هەندێك لە زانایانیش ئەوەیان کردووەتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ئەو نوێژە سوونەتێکی جەخت لەسەر کراوە.[4]

ج- کورتکردنەوەی نوێژی چواری بۆ گەشتیار، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) نۆزدە ڕۆژ لە مەککە مایەوە نوێژی کورت کردەوە.[5]

د- حەرام بوونی هاوسەرگیری کاتی(نكاح المتعة) بۆ هەتا هەتایی، پاش ئەوەی کە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ حەڵاڵ کرا.[6] پێشەوا نەوەوی،[7] بە لایەوە وایە دوو جار ڕێی پێدراوە و، دوو جاریش قەدەغەکراوە، چونکە ڕێگەی پێ درابوو پێش غەزای خەیبەر و، لەو ڕۆژەدا قەدەغەکرا، ئینجا لە ڕۆژی فەتحدا ڕێگەی پێ درایەوە و،

---

١ بڕوانە: الاستيعاب (٢/٣١٠)، الاصابة (٢/٣٠٨)، تفسير القرطبي (٦/٤٠٧)، البداية والنهاية (٤/٣٠٨).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٥٧٤).

٣ هەمان سەرچاوە (٥٧٤).

٤ هەمان سەرچاوە (٥٧٤).

٥ بڕوانە: المجتمع المدني (١٨٥).

٦ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٥٧٥).

٧ النووي على شرح مسلم (٩/١٨١)، بە پشت بەستن بەوە هەردوو دکتۆر (اكرم العمري و مهدي رزق الله) پێی گەیشتوون لە کتێبی (المجتمع المدني) و (السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٥٧٩).

جارێکی تر هەتاهەتایی قەدەغەکرایەوە، بەڵام(ابن القیم) پێی وایە لە ڕۆژی خەیبەر قەدەغە نەکرا، بەڵکو تەنها لە ڕۆژی فەتحدا قەدەغەکرا، بەڵام ئەوەی زانایان لەسەری ڕێککەوتوون ئەوەیە لە پاش فەتح بۆ هەتاهەتایی قەدەغەکرا.[1]

هـ- پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاری دا کە منداڵ ئەوەیە کە بەرهەمی جێگای ژن و مێردایەتی بێت، داوێن پیسیش بەشی بەردباران کردنە، وەکو لە فەرموودەی وەلیدی کوڕی زەمعە هاتووە. چونکە ناکۆکی کەوتە نێوان سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و عەبدوڵای کوڕی زەمعە، ئیتر پێغەمبەری خوا(ﷺ) بڕیاری دا بۆ عەبدوڵای کوڕی زەمعە چونکە لەسەر جێگای باوکی لە دایك بووبوو.

و- ڕێ نەدراوە ڕاسپاردە بە زیاتر لە سێیەکی ماڵ بکرێت، وەکو لە بەسەرهاتی سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص دا هاتووە لە کاتی نەخۆشکەوتنی لە مەککە و ڕاوێژکردنی بە پێغەمبەر(ﷺ) کە ڕاسپاردە بکات بە زیاتر لە سێیەکی ماڵەکەی.[2]

٢- جێگای دابەزینی پێغەمبەر(ﷺ) لە مەککە:

لادانی پێغەمبەر(ﷺ) لەو جێگەی بوو کە قورەیش بڕیاریان دا دابڕێن لەگەڵ بەنی هاشم و موسڵمانانندا لە لای حەجون، کاتێکیش ئوسامەی کوڕی زەید پرسیاری لێ کرد لە کوێ لادەدا و ئایا دەچێتە ماڵەکەی خۆی؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا عەقیل هیچ ماڵ و حاڵیان بۆ هێشتینەتەوە. ئەوەشی ڕوون کردەوە کە موسڵمان میراتی کافر وەرناگرێت، چونکە عەقیل و تالیبی برای میراتی ئەبو تالیبیان هەموو وەرگرت، بەڵام عەلی و جەعفەر هیچ میراتییەکیان وەرنەگرت چونکە موسڵمان بوون، ئەبو تالیبیش بە بێباوەڕی مرد.[3]

---

١ بڕوانە: زاد المعاد (٣/٣٤٣-٣٤٥، ٤٥٩-٤٦٤)، السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٥٧٥).
٢ المجتمع المدني للعمري (١٨٦)، سنن الترمذي (٣/٢٩١).
٣ هەمان سەرچاوە (٢/٤٨٢).

## هەشتەم: لە دەرەنجامەکانی فەتحی مەککە.

١- مەککە کەوتە ژێر دەسەڵاتی موسڵمانان و دەوڵەتی کوفر بۆ یەکجارەکی لەناوچوو، هەلی ئەوەش ڕەخسا گروپەکانی بتپەرستی لە حونەین و تائیف و هەموو شوێنەکان لە نێو بدرێن.

٢- موسڵمانان بوونە هێزێکی گەورە لە دوورگەی عەرەب: ئاواتی پێغەمبەریش(ﷺ) هاتەدی بەوەی قورەیش هاتنە نێو ئایینی ئیسلامەوە، هێزێکی گەورەیش لە دوورگەی عەرەبدا دەرکەوت، کە هیچ کۆبوونەوەیەکی هۆزایەتی توانای ڕووبەڕووبوونەوەیانی نییە، ئەو هێزە ئامادەیشە بۆ یەکخستنی عەرەب لە ژێر ئاڵای ئیسلام و لابردنی دەسەڵاتەکانی ستەم و دەست درێژی و، دابینکردنی ئازادی بۆ مرۆڤەکان بۆ ئەوەی بچنە ئایینی خوا و تەنها خوای گەورەیش بپەرستن.[١]

٣- فەتحی مەککە شوێنەواری مەزنی هەبوو لە ڕووی ئایینی و سیاسی و کۆمەڵایەتی، لایەنە کۆمەڵایەتییەکە خۆی لە هێمنی و پەروەرشی پێغەمبەر(ﷺ) دەبینیەوە لەوەی دەستیان بگرێت بۆ ئەوەی متمانە بە خۆیان پەیدا بکەنەوە و، هەروەها بەو بار و دۆخە تازەی لە شارەکەیاندا دروست بوو و، دانانی کەسانێك بۆ فێرکردنیان، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) موعازی کوڕی جەبەلی بەجێهێشت لە مەککە بۆ ئەوەی فێری ئایینەکەیان بکات، لە ڕووی سیاسیشەوە پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بە دانانی(عتاب)ی کوڕی ئوسەید وەکو ئەمیر لەسەر مەککە، سەبارەت بە لایە ئایینییەکەیش، فەتحکردنی مەککە هەموو عەرەبی قایل کرد کە ئیسلام ئەو ئایینەیە کە خوای گەورە پێی ڕازی بووە و خەڵکی پۆل پۆل موسڵمان دەبوون.[٢]

٤- جێبەجێبوونی بەڵێنی خوای گەورە بە پێدانی دەسەڵات بە ئیمانداران، پاش ئەوەی هەموو شتێکیان کرد بە قوربانی و مەرجەکانی دەسەڵاتیان لە خۆیاندا دروست دەکرد و قۆناغەکانیشیان بڕی و، مامەڵەیان کرد لەگەڵ سوننەتەکانی

---

١ بڕوانە: قیادة الرسول (ﷺ) السیاسیة والعسکریة، احمد عرموش (١٢٩).
٢ تأملات في سیرة الرسول (٢٦٦-٢٦٧).

خوای گەورە، ئەو دیمەنەشمان لە یاد نەچێت کە بیلال لەسەر کەعبە ڕاوەستا و بانگی دەدا بۆ نوێژکردن، پاش ئەوەی لە بیابانی مەککەدا ئەشکەنجە دەدرا و هاواری دەکرد بە کۆت و زنجیرەوە: ئەحەد، ئەحەد، وا ئەمڕۆ چووەتە سەر کەعبەو بە دەنگە دڵڕفێنەکەی خۆی بانگی ئیسلام بەرز بکاتەوە.

# بەشی شانزەیەم

## غەزای حونەین و تائیف( ٨ ك )

### باسی یەکەم: هۆکار و ڕووداوەکانی ئەو جەنگە

لە پاش فەتحی مەککە و ملکەچ بوونی قورەیش، هەوازین و سەقیف وتیان: موحەممەد ئەم جارە دەستی خاڵی بوو بۆ جەنگی ئێمە، بۆیە با ئێمە هێرشی بکەینە سەر پێش ئەوەی هێرشمان بکاتە سەر، بۆ ئەو مەبەستەیش(مالك بن عوف النضري)یان کردە سەرکردەی خۆیان، ئیتر هەوازین و سەقیف و بەنی هیلال کۆبوونەوە، بەڵام کەعب و کیلاب دواکەوتن لە هۆزی هەوازین، هەروەها(درید بن الصمة)یشیان تیابوو، بەڵام تەمەنی گەورە بووبوو تەنها بۆ ڕاوێژکردن لەگەڵیاندا بوو.

بۆچوونی مالیکی کوڕی عەوف ئەوە بوو ئافرەت و ماڵ و منداڵ لەگەڵ خۆیان دەربکەن بۆ جەنگ بۆ ئەوەی کەس هەڵنەیەت، بەڵام دورەید بۆچوونی وانەبوو، بەڵکو دەیووت ئەو کەسەی بیەوێت هەڵبێت هیچ نایگێڕێتەوە، بەڵام بە قسەیان نەکرد.[1]

### یەکەم: گرنگترین ڕووداوەکانی غەزای حونەین.

لە پێنجی شەووال موسڵمانان جوڵەیان کرد بەرەو حونەین، لە ئێوارەی دەی شەووال گەیشتنە ئەوێ،[2] پێغەمبەر(ﷺ) عەتتابی کوڕی ئوسەیدی لەسەر مەککە کردە جێنشینی خۆی، ژمارەی سوپای موسڵمانان دوانزە هەزار کەس بوون، بەڵام ژمارەی هەوازین و سەقیف دووبەرامبەری ژمارەی موسڵمانان بوون، هەندێ لەوانەی

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لأبي شهبة (٤٦٧/٢)، السيرة النبوية لابن هشام (٨٨/٤).

٢ بڕوانە: طبقات ابن سعد (١٥٠/٢).

لە فـەتحی مەککـەدا موسـڵمان بـوون دەیـانوت: ئێمـە لـە ڕووی کەمییـەوە تووشـی شکست نابین و هەستیان بە لەخۆبایی بوون دەکرد.[١]

**أ- کۆکردنەوە و ئامادەکاری مالیکی کوڕی عەوف بۆ جەنگ:**

**١- ورەی بەرزی جەنگاوەرەکان:**

لە وتارێکدا مالیك زۆر هانیدان لەسەر جەنگ کردن و دەربڕینی ئـازایی، وتیـشی: موحەممەد هەرگیز تووشی کەسانی شارەزا نەبووە لە جەنگدا تـاکو ئـەمڕۆ، بـەڵکو لەگەڵ کەسانێکی بێ ئەزموون‌دا شەڕی دەکرد بۆیە سەرکەوتە سەریاندا.[٢]

**٢- ماڵ و منالی جەنگاوەرەکان لە پشتیانەوە بوون:**

مەبەست لـەم کـارەیش نەبـەردی جـەنگاوەرەکان بـوو بەرامبـەر دوژمنـەکانیان، چونکە جەنگاوەر لەو حاڵەتـە ئەسـتەمە هـەڵبێت و هاوسـەر و منـاڵی خـۆی بـەجێ بهێڵێت، ئەنەسی کوڕی مالیك(ﷺ) دەفـەرمووێت: فـەتحی مەککـەمان کـرد، ئینجـا چـووین بـۆ غـەزای حونـەین، بتپەرسـتان هـاتن لـە جـوانترین ڕیزبەندیـدا، بیبیـنم: سەرەتا ڕیزی ئەسپەکان بوو، ئینجا ڕیزی جەنگاوەرەکان، ئینجا ڕیزی ئافرەتان، لە دواشیان مەڕ و ماڵاتەکان ڕیزکرابوون.[٣]

**٣- هەڵکێشانی شمشێرەکان و شکاندنی کێلانەکانیان:**

ئەم کارەیش گوزارشـتی دەدا لـە سـووربوونی جـەنگاوەر لەسـەر جێگیربـوون و ئارامگرتن تاکو سەرکەوتن یان مردن، مالیك پێـی دەوتـن: ئەگـەر دوژمنتـان بینـی، کێلانی شمشێرەکانتان بشکێنن و بە یەکجاری هەڵمەتیان بۆ ببەن.[٤]

**٤- دانانی هێزی نادیار بۆ سوپای موسڵمانان:**

لەم بارەوە مالیك بە ڕاوێژی دورەید کاری کرد و هەنـدێك هێـزی نادیـاری دیـاری کرد لە چەند شوێنێکدا بۆ سوپای موسڵمانان، چاودێری خوای گـەورەیش نەبووایـە خەریك بوو ئەم بەجێهێنانە هێزی موسڵمانان لە نێو ببات.

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٤٩٧/٢).
٢ بڕوانە: مغازي الواقدي (٨٩٣/٣).
٣ مسلم، كتاب الزكاة، باب اعطاء المؤلفة قلوبهم (٧٣٦/٢) رقم (١٠٥٩).
٤ بڕوانە: مجمع الزوائد (١٧٩/٦-١٨٠)، المستدرك للحاكم (٤٨/٣-٤٩)، صحيح الاسناد.

**٥- وەرگرتنی جڵەوی دەست پێشخەری پەلاماردان لە دەستی موسڵمانان:**

چونکە سەرکەوتن زۆرجار بۆ هێزی پەلاماردەر دەبێت، بەڵام ئەو کەسەی بەرگری لە خۆی دەکات لە هەڵوێستێکی لاوازدایە، بۆیە ئەم پلانەیان بە شێوەیەکی کاتی بەرهەمی هەبوو، بەڵام پێوەری هێزەکان – بە فەزڵی خوای گەورە – لە بەرژەوەندی موسڵمانانندا تەواو بوو.[١]

**٦- هەڵگیرسانی جەنگی دەروونی لە دژی موسڵمانان:**

مالیکی کوڕی عەوف دەیان هەزار وشتری هێنابوو لەگەڵ سوپاکە و ئافرەتی لەسەریان سوار کردبوو، بۆیە ئەو کەسەی تەماشای ئەم دیمەنەی دەکرد وایدەزانی ئەو سوپایە لە سەد هەزار کەس پێکهاتووە، خۆیشی وانەبوو.[٢]

**ب- هەنگاوەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەم هێزانە:**

**١- ناردنی عەبدوڵای کوڕی ئەبو حەدرەدی ئەسلەمی بۆ هێنانەوەی هەواڵی هەوازین:**

ڕۆیشت و ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ لە نێوانیاندا مایەوە و، ئینجا گەڕایەوە و، هەواڵەکانی هێنا بۆ پێغەمبەر(ﷺ).[٣]

عەبدوڵا ئەگەرچی بە پەلە ئەم ئەرکەی ڕاپەڕاند بەڵام کەمتەرخەمیشی تیاکرد، چونکە بە باشی تێکەڵاوی ئەوانی نەکرد تاکو تێبگات بتپەرستان لە کوێ هێزەکانی خۆیان حەشارداوە بۆ موسڵمانان، بۆیە ئەو هێزانە موسڵمانانیان تیرباران کرد و توانیان لە قۆناغی یەکەمدا موسڵمانان شکست پێ بهێنن، ئەوەش کە ڕوویدا لە ئەنجامی ئەم هەڵەیە پەیوەندی نییە بە مەعسومی پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە ئەوە وەحی نەبوو لە لای خوای گەورەوە، بەڵکو ئەوە مەسەلەیەک بوو پەیوەندیدار بە لایەنی سەربازییەوە، پێغەمبەر(ﷺ) هەموو هەوڵێکی خستەگەڕ بۆ بەدەستهێنانی وردترین زانیاری بۆ ئەوەی پلانی سەربازی خۆی لەسەر ڕۆشنایی ئەوە دابنێت.[٤]

---

١ بڕوانە: القيادة السياسية والعسكرية على عهد رسول الله (٢٥٢).

٢ بڕوانە: غزوة حنين للشيخ محمد احمد باشميل (١٢٨-١٣١).

٣ بڕوانە: تاريخ الطبري (٧٣/٣).

٤ بڕوانە: القيادة السياسية والعسكرية على عهد رسول الله (٣٦٩).

**٢- کەرەستەی سوپا و خواستنی قەڵغان و ڕم:**

سوپای پێغەمبەر(ﷺ) دوانزە هەزار کەس بوون دە هەزاری لە مەدینەوە دوو هەزاریشی لە تازە موسڵمانان بووەکانی مەککە، ئەنەسی کوڕی مالیك(ﷺ) دەفەرمووێت: لە ڕۆژی حونەیندا هەوازین و غەتەفان ماڵ و منداڵەکانیان لەگەڵ خۆیان هێناوە گۆڕەپانی جەنگ و دە هەزار کەس لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوو، بێجگە لە تازە موسڵمانبووەکان، کە ئەوانیش دوو هەزار کەس دەبوون، پێغەمبەر(ﷺ) هەوڵی دەدا کەرەستە و پێداویستی سوپاکە دابین بکات، بۆیە داوای کرد لە نەوفەلی کوڕی حاریسی ئامۆزای سێ هەزار ڕمی بە خواستن پێبدات، هەروەها لە صەفوانی کوڕی ئومەییە داوای هەندێ قەڵغانی کرد بە دەستەبەری، نەوفەل و صەفوان تاکو ئەو کاتە لەسەر بتپەرستی خۆیان بوون، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: کە نێردراوەکانم هاتنە لات سی قەڵغان و سی وشتریان پێبدە، یان کەمتر، ئەویش وتی: شتی خوازراو پێویستە دەستەبەر بکرێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵێ،[1] بەڵام لە پاش تەواوبوونی جەنگەکە کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ویستی کەرەستە فەوتاوەکان قەرەبوو بکات، صەفوان وتی: من ئەمڕۆ زیاتر حەزم لە موسڵمان بوونە.[2]

ئەبو داود دەڵێت: صەفوان ئەو کەرەستانەی پێش موسڵمان بوونی بە پێغەمبەر(ﷺ) دابوو، بەڵام لە دوای ئەوە موسڵمانیش بوو.

**٣- خۆڕاگری پێغەمبەر(ﷺ) و کاریگەری لە بردنەوەی جەنگەکەدا:**

هەوازین پێش هاتنی موسڵمانان گەیشتنە دۆڵی حونەین، جێگای خۆیشیان چاك گرت لە نێو ڕچەڕێ و دۆڵ و درەختەکاندا، پلانەکەشیان ئەوە بوو لە ناکاو موسڵمانان تیرباران بکەن، لە ڕاستیشدا بەو کارەیان توانیان موسڵمانان شپرزە بکەن و زۆربەی سوپاکەشیان ناچارکرد هەڵبێن و، هەرکەسێ دەیویست خۆی ڕزگار بکات، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) و چەند کەسێك مانەوە لە ڕووی هێرشی بتپەرستان،

---
١ بڕوانە: مسند الشاميين للامام احمد.
٢ رواه الامام احمد في المسند.

عەبباسی مامی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو دیمەنە سامناکە باس دەکات و دەفەرموێت: لە حونەیندا من و ئەبوسوفیانی کوڕی حاریس لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) ماینەوە و بەجێمان نەهێشت، پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر هێسترێکی سپی بوو، هەر بەرەو ڕووی بێباوەڕان دەڕۆیشتو زۆربەی موسڵمانانیش هەڵهاتبوون، عەبباس دەفەرموێت: ڕەشمەی هێسترەکەی پێغەمبەر(ﷺ)م گرتبوو بۆ ئەوەی خێرا نەبێتەوە، لەو کاتەدا فەرمووی: ئەی عەبباس بانگی هاوەڵانی سەمورەم بۆ بکە،[1] ئیتر عەبباس – کە پیاوێکی دەنگ گەورە بوو – بە هەموو دەنگی هاواری کرد: کوا لە کوێن هاوەڵانی سەمورە؟ دەفەرموێت: سوێند بە خوا وەکو مانگا چۆن بەرەو بەچکەکەی دێت ئاوها گەڕانەوەو وتیان: وا هاتین! فەرمووی: بێباوەڕان بکوژن، ئینجا بانگی کرد: هۆ کۆمەڵانی ئەنصار، هۆ کۆمەڵانی ئەنصار، دوای ئەوە تەنها بانگی نەوەی(الحارث)ی دەکرد لە خەزرەج، لەو کاتە پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر هێسترەکەیەوە تەماشای کرد و فەرمووی:((هذا حين حمي الوطيس))،[2] واتە: ئەمە ساتێکە شەڕی تیا گەرم بووە.

خوای گەورە لە ڕۆژی حونەیندا پشتگیری پێغەمبەرەکەی کرد بە چەند شتێك:

- دابەزینی فریشتە لە ئاسمانەوە.
- چەکی تۆقاندن.[3]
- کاریگەری دوو مشتە بەرد و خۆڵەکە لە چاوی دوژمناندا و، هەموو چاوەکانیان لەو خۆڵ و بەردەی تێچوو، ئەوەیش یەکێك بوو لە هۆکاری شکستەکەیان،[4] ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەڵهاتن سوێند بە پەروەردگاری موحەممەد، دەڵێت: چووم تەماشا بکەم – سوێند بە خوا لەگەڵ ئەو بەردانەی تێهاویشتن، کوڵ بوون و توانایان نەما.[5]

---

١ مسلم، كتاب الجهاد والسير باب، غزوة حنين (٣/١٣٩٨)، رقم (١٧٧٥).
٢ مسلم، كتاب الجهاد والسير باب، غزوة حنين (٣/١٣٩٩)، رقم (١٧٧٢).
٣ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٥٩٩).
٤ بڕوانە: القيادة السياسية والعسكرية على عهد رسول الله (٢٥٩).
٥ مسلم، كتاب الجهاد والسير باب، غزوة حنين (٣/١٣٩٩)، رقم (١٧٧٥).

## دووەم: ڕاونانی پاشماوەی هەڵهاتووەکان بەرەو ئەوتاس و تائیف.

### أ- ئەبو موسای ئەشعەری(ﷺ) دەفەرموویت:

پاش تەواوبوونی جەنگی حونەین، پێغەمبەر(ﷺ) ئەبو عامیری لەسەر سوپایەکەوە نارد بۆ ئەوتاس، لەوێ چاوی کەوت بە(درید بن الصمة) و کوشتی، و هاوەڵانیشی هەڵهاتن، ئەبو موسا دەفەرموویت: منیش لەگەڵ ئەبو عامیردا بووم و تیرێك بەر ئەژنۆی کەوت، وتم: ئەی مامە کێ لێی دای؟ ئەویش دەستی بۆ لێدەرەکەی درێژ کرد و، منیش دوای کەوتم و کوشتم، ئینجا ئەبو عامیر وتی: تیرەکە لە ئەژنۆم دەربهێنە، دەڵێت: منیش دەرمهێنا و ئاوی لێ دەهاتە خوارەوە.

پێی وتم: ئەی برازام، سڵاوم بگەیەنە پێغەمبەر(ﷺ) پێی بڵێ: با داوای لێخۆش بوونم بۆ بکات، ئینجا ئەبو عامیر منی کردە جێنشینی خۆی و زۆری پێ نەچوو، گیانی سپارد، گەڕامەوە لای پێغەمبەر(ﷺ)..... بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە.. پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: خوایە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەبو عامیر بخەیتە سەرووی زۆر کەس لە بەندەکانت. وتم: داوای لێخۆش بوون بۆ منیش بکە، فەرمووی: خوایە لە عەبدوڵای کوڕی قەیس خۆش بیت، لە ڕۆژی دواییشدا میهرەبان بیت لەگەڵی.

ئەبو بوردەی کوڕی ئەبو موسا دەڵێت: دوعاکانی پێغەمبەر(ﷺ) یەکێکیان بۆ ئەبو عامیر و ئەوی تریان بۆ ئەبو موسا بوو.[1]

### ب- گەمارۆدانی هەڵهاتووەکان بۆ تائیف:

پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بە گەمارۆدانی ئەوانەی خەڵکی تائیف و چەندین شێوازی جۆراوجۆری لەگەڵ بەکارهێنان، لەوانە:

#### ١- بەکارهێنانی شێوازی نوێ لە جەنگ کردن:

پێغەمبەر(ﷺ) هەندێ چەکی بەکارهێنا پێشتر بەکارنەهێنرابوو، لەوانە:

- مەنجەنیق: جێگیر بووە کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەم چەکەی بەکارهێناوە لە

---

١ البخاري، المغازي، (١٢٠/٥)، رقم (٤٣٢٣).

ئابلۆقەدانی تائیفدا، وەکو مەکحول دەگێڕێتەوە،[1] ئینجا مەنجەنیق یەکێکە لەو چەکە کاریگەرانەی کە بەردەکانی قەڵاکان دەڕوخێنن و، بۆمبەکانی ماڵ و سەربازگەکان دەسوتێنن، پێویستیشی هەیە بە چەند سەربازێك بۆ بەڕێوەبردنی.[2]

– دەبابە: پێغەمبەر(ﷺ) بۆ یەکەم جار هەڵسا بە بەکارهێنانی دەبابە. کە بریتی بوو لە خانوویەکی بچووك لە دار دروست دەکرێت و بەکاردەهێنرێت بۆ خۆپاراستن لە تیری دوژمنان، بە شێوازێك کاتێك سەربازەکان دەچنە ناوییەوە پارێزراو دەبن لە تیر.[3]

– چقڵی دڕکاوی: ئەمەیش یەکێك بوو لە ئەو چەکانەی پێغەمبەر(ﷺ) بەکاری هێنا لە کاتی گەمارۆدانی خەڵکی تائیف. لە دوو دار پێکدێت لە وێنەی خاچ، تاکو چوار نووکی تیژی لێ دەردەهێنرێت، ئەگەر لە زەویدا فڕێبدرێت نووکێکی بەرز دەبێتەوە پێی ئەسپ و جەنگاوەرەکانی لێ هەڵدەکەوێت جوڵەی ڕێکردن پەکدەخات لە گۆڕەپانی شەڕدا.[4]

بەکارهێنانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەم چەکە:ئاماژەیە بۆ سەرکردەکانی ئوممەت بە تایبەت و، موسڵمانان بە گشتی کە بیروهۆشی خۆیان لە کار نەخەن لە پێناو سوود وەرگرتن لە هەموو شتێکی بەسوود و نوێ، کە بەرژەوەندی ئوممەت لە هەردوو دونیا جێبەجێ بکات.

**٢- هەڵبژاردنی جێگای گونجاو بۆ جەنگ لە لایەن پێغەمبەر(ﷺ):**

(عمرو بن امية الضمري) کە خۆی شایەت حاڵێك بوو لەو جەنگەدا دەفەرموێت: لەو ساتەی دابەزین لە نزیك قەڵاکەیان، ئەوەندە تیریان تێ هاویشتین هەر خوا ژمارەی دەزانێت، دەتووت کوللەیە، ئێمەیش خۆمان لێی دەپاراست بەڵام لە زۆرێك لە موسڵمانان بریندار بوون، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بانگی حوبابی کرد و

---

١ الترمذي، باب، الاستئذان والاداب، رقم (٢٩١٢).

٢ بڕوانە: المدرسة العسكرية الاسلامية، اللواء محمد فرج (٤٠٧).

٣ بڕوانە: القيادة في عهد الرسول (٤٠٥).

٤ بڕوانە: الفن الحرب في صدر الاسلام، اللواء عبدالرؤوف عون (١٩٥).

فەرمووی:((انظر مکاناً مستأخراً عن القوم))، واتە: بڕوانە جێگایەك دووربێت لە ئەوانەوە، ئیتر حوباب جێگایەکی لای مزگەوتی تائیف[1] دیاری کرد لە دەرەوەی لادێکە، ئینجا هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئاگاداری کردەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمانی پێکردن بچنە جێگە تازەکە.[2]

٣- بەکارهێنانی جەنگی دەروونی و پڕوپاگەندە:

کاتێك بەرگری خەڵکی تائیف توند بوویەوە و، کۆمەڵێکیان لە موسڵمانان کوشت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە سوتاندنی ڕەزو دارخورماکانیان لە دەوروبەری تائیف وەکو فشار دروست کردن لەسەر سەقیف، بەڵام دواتر کە بینی کاریگەری هەبوو لەسەر ورەیان ئەو کارەی ڕاگرت، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بانگەوازێکی ئاڕاستەی کۆیلەکانی تائیف کرد هەرکەسێ دابەزێت لە قەڵاکە و بێتە لای موسڵمانان ئازادە، ئیتر بیست و سێ کەسیان لێ هاتە خوارەوە، یەکێ لەوانە(ابو بکرة الثقفي) بوو و، موسڵمان بوون، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) ئازادی کردن و نەیگەڕاندنەوە بۆ سەقیف پاش موسڵمان بوونیان.[3]

٤- حیکمەت لە لابردنی ئابڵۆقەکە:

حیکمەت لەو کارە ئاشکرا بوو، چونکە ناوچەکانی دەوروبەری هاتنە ژێر دەسەڵاتی ئیسلامەوە، ئەوانیش هێزیان تەنها لە قایمی و پتەوی قەڵاکانیانەوە وەردەگرت، پێغەمبەر(ﷺ) ڕاوێژی کرد بەوانەی دەوروبەری سەبارەت بە گەمارۆکە،[4] نەوفەلی کوڕی موعاوییەی دەیلی وتی: ڕێوییەکە و لە کونی خۆیدایە، ئەگەر لەسەری بمێنیتەوە دەیگری، ئەگەر وازیشی لێ بهێنی زیانت لێ نادات، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە عومەری کوڕی خەتتاب، خەڵکی ئاگادار بکاتەوە کە ئەو جێگایە بەجێدەهێڵن، بۆیە دەنگ و هەرا لەناو خەڵکی دروست بوو، وتیان:

---

١ جێگایەکە ئێستا بە مزگەوتی (ابن عباس) دەناسرێت.
٢ بڕوانە: مغازي الواقدي (١/٤١٦).
٣ بڕوانە: السیرة النبویة الصحیحة (٢/٥١٠).
٤ بڕوانە: دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة للشجاع (٢٠٦).

چۆن بڕۆین، هێشتا تائیفمان فەتح نەکردووە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی کەواتە بچن بەرەو جەنگ، ئەوانیش ڕۆیشتن و قایل بوون و دەستیان کردە گەڕانەوە پاش ئەوەی هەندێکیان بریندار بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئێمە سبەی دەگەڕێینەوە، لە کاتی گەڕانەوەدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو: بڵێن:(آیبون، تائبون، عابدون لربنا حامدون)،[1] واتە: دەگەڕێینەوە تەوبە دەکەین، خوا دەپەرستین و سوپاسی دەکەین، بە پێغەمبەریان وت(ﷺ) دوعا لە سەقیف بکە، ئەویش فەرمووی: خوایە ڕێنموونی سەقیف بکەیت و، بیانهێنی.

---

١ بڕوانە: مسلم: كتاب الجهاد والسير، باب غزوة حنين (١٤٠٢/٣) رقم (١٧٧٨)، زاد المعاد (٤٩٧/٣).

## باسی دووەم: تێگەیشتنی پێغەمبەر(ﷺ) لە مامەڵە کردن لەگەڵ دڵ و دەروونەکاندا

### أ- بتپەرستن گەڕانەوەی نییە:

هەندێ لەوانەی تازە لە بتپەرستی دابڕابوون، لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوون بۆ جەنگی حونەین، هەندێ لە هۆزەکانیش درەختێکی گەورەیان هەبوو سالانە سەردانیان دەکرد ناوی(ذات انواط) بوو، چەکەکانیان پیا هەڵدەواسی و، قوربانیان لە لایدا سەردەبڕی و ڕۆژێك لە لای دەمانەوە، لەو کاتەی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) ڕێیان دەکرد ئەو درەختەیان بینی، سۆزیان تازە بوویەوە بۆ جەژنەکانیان لەسەردەمی نەفامیدا، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ذات انواط)یکیش بۆ ئێمە دیاری بکە، وەکو(ذات انواط)ەکەی ئەوان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: مەزنی بۆ خوا، سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بە دەستە قسەی قەومەکەی موساتان دووپات کردەوە: ﴿ٱجْعَل لَّنَآ إِلَٰهًا كَمَا لَهُمْ ءَالِهَةٌ ۚ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ﴾(الاعراف: ١٣٨). دەبێت ڕێگەی ڕابوردووتان بگرنە بەر.[١]

ئەمەیش ڕوونەبوونەوەی بۆچوونیان بۆ یەکتاپەرستی تەواو دەردەخات سەرەڕای موسڵمانبوونیان، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) ڕوونی کردەوە بۆیان کە ئەو داواکارییان واتای بتپەرستی دەگرێتەوە،[٢] ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەی دابوون دەرچن بۆ جیهادکردن چونکە جیهاد مەرج نییە ئەو کەسەی پێی هەڵدەستێ بە تەواوەتی لە چەمکی نەفامی ڕزگاری بووبێت، بەڵکو جیهاد قوتابخانەیەکی پەروەردەییە بۆ فێربوونی بیرباوەڕ و شەرع و ڕەوشت....[٣]

### ب- خۆ بەدڵ بوون بە هۆی زۆری سەرکەوتنی خوا دوادەخات:

قورئانی پیرۆز باسی ئەوەی کردووە: ﴿لَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِى مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية للندوي (٣٤٩).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٢/٣٩٧).

٣ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٨/٦٢).

﴿وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْئًا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ﴾(التوبة: ٢٥).

پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموویەتی: خوایە هەوڵدان و پەلاماردان و جەنگ کردنم هەر بە پشتیوانی تۆوەیە.[١]

ئینجا سەرەڕای ئەو شکستەی هاتە سەر موسڵماناندا لە سەرەتای جەنگەکە و هەڵهاتنی زۆرێك لە موسڵمانان، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) توندی نەنواند لەگەڵ کەسدا لەوانەی هەڵهاتبوون لە گۆڕەپانی شەڕدا، تەنانەت کاتێك هەندێ پێشنیاریان کرد ئەو تازە موسڵمانانەی کە هەڵهاتن بکوژرێن پێغەمبەر(ﷺ) ڕازی نەبوو.[٢]

### ج- دەستکەوتەکان هۆکارێکن بۆ ڕاکێشانی دڵەکان:

پێغەمبەر(ﷺ) بە باشی زانی تازە موسڵمان بووەکان و عەرەبە بیابانشینەکان بە دەستکەوتەکان دڵیان ڕاکێشێت، بۆیە پشکێکی گەورەی دەدایە سەرانی قورەیش و غەتەفان و تەمیم دەگەیشتە سەد وشتر بۆ هەریەك لە ئەوان وەکو ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب و، سوهەیلی کوڕی عەمرو حەکیمی کوڕی حیزام و، صەفوانی کوڕی ئومەییە و، عویەینەی کوڕی حیصنی فەزاری و ئەقرەعی کوڕی حابیس و موعاویە و یەزیدی کوڕانی ئەبو سوفیان و، قەیسی کوڕی عەدی.[٣]

ئامانجیش لەم کارە گۆڕینی ئاڕاستەی دڵەکانیان بوو بەرەو ئیسلام، بەڵام هەندێك لە کەم تەمەنەکانی ئەنصار، بە هۆی سروشتی ئادەمیزادانەیانەوە کاریگەر بوون بەو کارەی پێغەمبەر(ﷺ) و قسەیەکیان لە ناودا بڵاوبوویەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) چاوپۆشی کرد لەو قسەیە و، بە شێوەیەکی ئیمانی گفت و گۆی کرد لەگەڵیان و گوتاری ئاڕاستە کردن، بە شێوەیەك کە موسڵمان بە درێژایی سەردەم و کاتەکان هیچی پێنەکرێت جگە لە گریان لە بەرامبەر ئەم ڕووداوە مەزنە، کاتێك سەعدی کوڕی عوبادە هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری

---

١ المسند للامام احمد (٤/٣٣٢).

٢ بڕوانە: المجتمع المدني في عهد النبوة للعمري (١٩٩).

٣ بڕوانە: معين السيرة (٤٢١).

خوا! ئەو گەڕەکە لە ئەنصارِ شتێکیان لە دڵدا دروست بووە بەرامبەر ئەو دابەشکردنەی کە سەرانی قورەیش ماڵێکی زۆریان بەرکەوتووەو ئەنصارەکان هیچیان بەرنەکەوتووە، فەرمووی: ئەی تۆ چی دەڵێیت ئەی سەعد؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من کەسێکم لە قەومەکەی خۆم. فەرمووی: کەواتە ئەوانم بۆ کۆبکەرەوە.... کاتێک کۆبوونەوە... پێغەمبەر(ﷺ) سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد و فەرمووی: ئەی کۆمەڵی ئەنصارِ ئەو قسەتانە چییە پێم گەیشتووە و، لە دڵەکانتانا شتێك بەرامبەرم دروست بووە؟ ئایا نەهاتمە لاتان گومڕابوون و خوای گەورە بە هۆی منەوە ڕێنموونی کردن، ئایا هەژار نەبوون بە هۆی منەوە دەوڵەمەندی کردن، ئایا دوژمن نەبوون خوا دڵەکانتانی یەکخستەوە؟ وتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی خاوەن منەت و چاکەن بەسەرمانەوە. ئینجا فەرمووی: ئایا وەڵامم نادەنەوە ئەی کۆمەڵی ئەنصارِ؟ وتیان: بەچی وەڵامت بدەینەوە ئەی پێغەمبەری خوا، تۆ خاوەن چاکە و منەتی بەسەرماندا. فەرمووی: سوێند بە خوا گەر بتانویستبا دەتانووت و ڕاستگۆیش دەبوون و باوەڕتانیش پێدەکرا! هاتیتە لامان بە درۆخراوەیی باوەڕمان پێکردی و، بەشکست خواردوویی و پشتمان گرتی و، بە دەرکراوی دالدەمان دای و، بە هەژاری و دڵنەواییمان کردی، ئایا بە بۆنەی کەمێك لە ماڵی دونیاوە دڵەکانتانم لێ زویر دەبێت کە بەو ماڵە ویستوومە دڵی کەسانێکی پێ ڕاکێشم بۆ ئیسلام و، ئێوەم هەواڵەی موسڵمانێتی خۆتان کردووە، ئایا بەوە ڕازی نابن ئەی کۆمەڵی ئەنصار، خەڵکی بە مەڕ و وشتر بگەڕێنەوە و، ئێوەیش بە پێغەمبەری خوا بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانتان؟ سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بە دەستە ئەوەی ئێوە پێی دەگەڕێنەوە چاکترە لەوەی ئەوان پێی دەگەڕێنەوە، ئەگەر کۆچکردنیش نەبوایە من یەکێك دەبووم لە ئەنصارەکان، ئەگەر ئەوان ڕێگا و دۆڵێك بگرن و خەڵکی ڕێگا و دۆڵێکی تر بگرن، من ڕێگا و دۆڵی ئەنصار دەگرمەبەر خوایە سۆز و بەزەیی خۆت برێژە سەر ئەنصارەکان و کوڕ و کوڕەزای ئەنصارەکان، ئینجا خەڵکەکە دەستیان کردە گریان تاکو ڕیشیان تەڕ بوو لە فرمێسکەکانیان، وتیان: ڕازی بووین بەوەی بەشی ئێمە پێغەمبەری خوا بێت،

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشت و ئەوانیش بڵاوەیان کرد.[1]

ئەوەشی پێویستە ئاماژەی بۆ بکرێت لێرەدا، ئەو قسە و گلەییە لە هەموو ئەنصارەکانەوە دەرنەچوو، بەڵکو هەندێکیان کە تەمەنیان مناڵ بوو ئەو قسەیان کردبوو، بە بەڵگەی فەرموودەیەکیش کە لە بوخاری و موسلیمدا هاتووە ئاماژە بۆ ئەو ڕاستیە دەکات.[2]

بە پێی ئەم ڕووداوەیش،(ابن القیم) پێی وایە پێویستە لەسەر سەرۆك دڵی دوژمنەکانی ڕابکێشێت و خراپەیان دوورخاتەوە لە موسڵمانان،[3] ماڵ پێدانی ئەو کەسانەش لە ڕووی هاندانەوەیە لەسەرەتاوە، تاکو ئیمان تێکەڵی دڵی دەبێت و شیرینیەکەی دەچێژێت.

مامۆستا(محمد الغزالی) بە نموونەیەکی هەست پێکراو ئەم مەسەلەیە ڕووندەکاتەوە و دەڵێت: زۆر کەس هەیە لەم دونیاوە لە ڕێگەی سکیانەوە بۆ ڕێگای ڕاست ڕادەکێشرێن لە جیاتی ئەوەی لە ڕێگای بیروهۆشیانەوە ڕابکێشرێن، وەکو چۆن ولاخ بە چەپکێك لە وێنجە ڕادەکێشرێت بۆ گەوڕەکەی، هەندێك لە مرۆڤەکانیش پێویستیان بە جۆرەها فریودان هەیە تاکو بە بیروباوەڕی ڕاست ڕازی دەبن و دڵیان بۆی بکرێتەوە.[4]

پێغەمبەر(ﷺ) نموونەیەکی جوان و کاریگەری بۆ ئەنصارەکان هێنایەوە: کەسانێك مژدەی ئیمانیان پێ دەدرێت، بەرامبەر کەسانێك کە مژدەی وشتریان پێ دەدرێت، کەسانێك پێغەمبەری خوایان لەگەڵدا دەڕواتەوە و، کەسانێکیش بە وشتر و مەڕەوە دەڕۆنەوە، لە ڕاستیدا ئەو نموونانە ڕایچەڵەکاندن و پەیان برد بەوەی کەوتوونەتە هەڵەیەکەوە، نەدەبوایە ئەوان بکەوتنایەتە ئەو جۆرە هەڵەوە، بۆیە قورگیان پڕبوو لە گریان و فرمێسك بە چاوەکانیاندا هاتە خوارەوە.[5]

---

١ بڕوانە: زاد المعاد (٣/٤٧٤).
٢ مسلم، کتاب الزکاة، باب اعطاء المؤلفة قلوبهم (٢/٧٣٤).
٣ بڕوانە: زاد المعاد (٣/٤٨٦).
٤ بڕوانە: فقه السیرة (٤٢٧).
٥ بڕوانە: المجتمع المدني في عهد النبوة للعمري (٣١٩).

**د- ئارامگرتن لەسەر دڵڕەقی عەرەبە بیابانشینەکان:**

پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ئەواندا نموونەی پەروەرشیار بوو، دڵنیای دەکردنەوە و لەسەر بەرژەوەندییەکانیان و، بە گوێرەی بیر و هۆشیان لەگەڵیان مامەڵەی دەکرد، وەکو پادشاکان مامەڵەی لەگەڵیان نەدەکرد، کە ژێردەستەکانیان کڕنووشیان بۆ دەبەن، کاتێکیش قسەیان لەگەڵ دەکەن ڕستە مەزن ڕاگرتنیان بۆ بەکاردەهێنن، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) قسەیان لەگەڵ دەکرد و گلەییان ئاراستە دەکرد و، هرگیز خۆی لێیان نەدەشاردەوە، هاوەڵانیش ڕێزی زۆریان لێ دەگرت و بە دەنگی نزمەوە قسەیان لەگەڵ دەکرد، بەڵام عەرەبە دڵڕەقەکانی بیابان، قورئان سەرزەنشتی دەکردن لەسەر ڕەوشتی ناشیرینییان و دەنگ بەرزکردنەوەیان لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ).[1]

ئەو عەرەبە بیابانشینەی، کە مژدەکەی پێغەمبەری(ﷺ) ڕەتکردەوە:

ئەبو موسای ئەشعەری دەفەرموێت: لە لای پێغەمبەر(ﷺ) بووم لەو کاتەی لە(الجعرانة) لایدابوو لە نێوان مەککە و مەدینەدا، بیلالیشی لەگەڵدا بوو، لەو کاتە یەکێك لە عەرەبە بیابانشینەکان هات و بە پێغەمبەر(ﷺ)ی وت: ئایا ئەو بەڵێنەی پێتدام بۆم بەجێ ناهێنی؟ ئەویش فەرمووی: مژدەت لێ بێت، وتی: ئەم قسەیەم زۆر بیست، پێغەمبەر(ﷺ) وەکو تووڕە ڕووی کردە ئەبو موسا و بیلال و، فەرمووی: ئەو مژدەکەی ڕەت کردەوە، ئێوە قبووڵی بکەن، وتیان: قبووڵمان کرد، ئینجا پەرداخێك ئاوی داوا کرد و لە ئاوی دەمی خۆی تێیکرد و فەرمووی: هەردووکتان لێی بخۆن و لێی بکەنە ڕوومەت و گەردنتاندا و چاوەڕوانی مژدە بن، ئەوانیش وایان کرد و ئوممو سەلەمە بانگی کرد لە پشت پەردەوە بەشی دایکتانیش بەجێبهێڵن، ئەوانیش کەمێکیان بۆی بەجێهێشت.[2]

گوتەی ئەو عەرەبە بیابانشینە: مەبەست لەم دابەشکردنە, خوای گەورە نەبوو:

عەبدوڵای کوڕی مەسعود دەفەرموێت: لە ڕۆژی حونەیندا پێغەمبەر بە

---

١ هەمان سەرچاوە و لاپەرە.

٢ البخاري، كتاب المغازي، رقم (٤٣٢٨).

خەڵکانێك زۆرتری دا لە کەسانێکی تر، سەد وشتری دایە ئەقرەعی کوڕی حابیس، بە عویەینەیش هەر ئەوەندەی دا، هەروەها زۆریشی دایە هەندێ لە ناودارانی عەرەب، پیاوێك وتی: سوێند بە خوا ئەم دابەشکردنە دادگەری تیادا نەبوو، لە پێناو خوایشدا نەبوو، دەفەرموێت: وتم: سوێند بە خوا ئەبێت پێغەمبەر(ﷺ) ئاگادار بکەمەوە، کە ئەو هەواڵە گەیاندە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕەنگی گۆڕا و فەرمووی: کێ دادگەرە ئیتر ئەگەر خوا و پێغەمبەرەکەی دادگەر نەبن، ئینجا فەرمووی: ڕەحمەتی خوا لە موسا بێت، لەمەیش زیاتر ئازار درا و ئارامیشی گرت. دەفەرمووێت: وتی: جارێکی تر بێگومان هیچ قسەیەکی پێ ناگەیەنم.[١]

**مامەڵەکردنی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ هەوازن کاتێك موسڵمان بوون:**

نێردەی هەوازن هاتنە لای پێغەمبەر(ﷺ) لە(الجعرانة) و، موسڵمان بوون، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە هۆزێکین خۆت دەزانی چیمان بەسەر هاتووە داوات لێ دەکەین و ماڵ و منالەکانمان بۆ بگێڕیتەوە، ئینجا زوهەیری کوڕی صەرەدی وتاربێژیان هەستا و، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لە ناو بە کۆیلەکراوەکاندا، پوور و دایەنگەی خۆتی تیایە، ئینجا ئێمە ئەگەر ئەم کارەساتەمان لەسەر دەستی(ابن ابی شمر) یان(النعمان بن المنذر) بەسەر بهاتایە، چاوەڕوان دەبووین سۆز و بەزەییان بجوڵایە بۆمان، بەڵام تۆ پێغەمبەری خوایت و چاکترینی خەڵکیت، ئینجا هەندێ هۆنراوەی بۆ خوێندەوە، کە بووە مایەی ئازاکردنی هەموو کەس و کارەکانیان، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) بووە خاوەن چاکەی کۆن و نوێ و، تایبەت و گشتی لەسەریان.

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) گوێی لە قسەکانیان بوو، فەرمووی: ژن و منالەکانتان بە لاوە خۆشەویستترە یان ماڵەکانتان، وتیان: بەڵکو ژن و منالەکانمان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوەی پشکی من و ئەوەی عەبدولموتەلیبە دەیگێڕمەوە، بەڵام کاتێك نوێژم تەواو کرد بۆ خەڵکی، تکایان لێ بکەن بە من کە منال و ژنەکانتان بۆ بگێڕنەوە، ئەوانیش وایان کرد، موهاجیر و ئەنصارەکان وتیان هەرچی لە لای ئێمەیە دەیبەخشینە پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام ئەقرەعی کوڕی حابیس وتی: من

---

١ مسلم، كتاب الزكاة، باب اعطاء المؤلفة قلوبهم، حديث (١٠٦٢).

و تەمیم نایانگێڕینەوە، عویەینە وتی: من و بەنی سولیەم نایانگێڕینەوە، بەڵام بەنی سولیەم وتیان: بەڵکو هەرچی موڵکی ئێمەیە دەیگێڕینەوە بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)، عەبباس وتی: هەڵوێستی منتان لاواز کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەرکەسێ پشکی خۆی ناگێڕێتەوە، لەگەڵ یەکەم دەستکەوتدا بەرامبەر هەر مرۆڤێك شەش وشتری پێ دەدەین، ژن وماڵی خەڵکی بگێڕنەوە.[1] هەر ئەم واتایە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە لە ڕێگەی(ابن هشام)ەوە.[2] سیاسەتی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ناحەزانیدا نەرم و نیان بوو، بەو شێوەیش توانی خۆیان و هاوپەیمانەکانیان بۆ ئیسلام ڕابکێشێت، ئەم هۆزەشی کردە سەرەڕم بۆ لێدانی هێزە بتپەرستەکان لە ناوچەکەدا بە سەرکردایەتی مالیکی کوڕی عەوفی سەرۆکیان کە شەڕی لەگەڵ سەقیف کرد تاکو فشاری لەسەر دروستکردن، چونکە سەرانی ئەوان بیریان کردەوە لەو تەنگەژە دەرچن پاش ئەوەی ئیسلام دەورەی تائیفی دابوو لە هەموو لایەکەوە و، توانای جموجۆڵ و بازرگانی نەمابوو، بۆیە هەندێ لە سەرانی هۆزی سەقیف موسڵمان بوون وەکو عوروەی کوڕی مەسعودی سەقەفی کە گەیشتە پێغەمبەر(ﷺ) پێش ئەوەی بگاتە مەدینە و پاش موسڵمان بوونی گەڕایەوە بۆ تائیف، عوروە کەسێکی خۆشەویست بوو لە لای هۆزەکەی، چووە سەر ماڵەکەی خۆی و بانگی دا، بۆیە هەندێکیان تیریان تێ هاویشت و پێکایان، ئەویش ڕاسپاردەی کرد لەگەڵ شەهیدانی موسڵماناندا بنێژرێت لە کاتی گەمارۆی تائیف.[3] ئادەمیزاد سەرسام دەبێت لە تێگەیشتنی پێغەمبەر(ﷺ) لە مامەڵەکردن لەگەڵ دەروونەکاندا و، هەوڵدانی بێ وچانی بۆ بەهێزکردنی ئایینی خوا، پێغەمبەر(ﷺ) توانی دیاردەکانی بتپەرستی لابدات، هەروەها کاروباری ئەو زەوییە تازانەی خرانە سەر دەوڵەتی ئیسلامی ڕێك بخات و، عەتتابی کوڕی حەبەشی بە مامۆستا و پەروەرشیار دەست نیشان کرد، ئینجا مالیکی کوڕی عەمریشی کردە سەرکردە و موجاهید لەسەر هۆزی هەوازن، ئینجا عومرەی کرد و گەڕایەوە بۆ مەدینە.

---

١ بڕوانە: البداية والنهاية (٤/٣٥٢-٣٥٣).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٤/١٤٤).

٣ هەمان سەرچاوە (٤/٩٢).

## باسی سێیەم: وانە و پەند و سوود

### یەکەم: ڕاڤەکردنی ئەو ئایەتانەی دەربارەی غەزای حونەین دابەزین.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْئًا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَنزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَىٰ رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ الَّذِينَ كَفَرُوا وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ يَتُوبُ اللَّهُ مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾(التوبة: ٢٥-٢٧).

لە ڕاستیدا غەزای حونەین لەبەرئەوە تۆمارکراوە لە قورئانی پیرۆزدا ببێتە وانەیەك بۆ موسڵمانان لە هەموو کات و شوێنێکدا...[١]

أ- قورئانی پیرۆز باسی ئەوەی کردووە کە موسڵمانان دڵیان لە زۆری خۆیان چووبوو: ﴿وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ ...﴾ ئینجا قورئان ئاشکرای کرد کە ئەو زۆرییە سوودی نیە: ﴿فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْئًا ...﴾.

ب- قورئانی پیرۆز ئاشکرای کرد کە موسڵمانان هەڵهاتن جگە لە پێغەمبەر(ﷺ)و چەند کەسێك نەبێت لە هاوەڵانی: ﴿وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ﴿٢٥﴾﴾.

ج- قورئانی پیرۆز ڕوونی کردووەتەوە کە خوای گەورە پشتگیری پێغەمبەرەکەی خۆی کرد لەم جەنگەدا و سوکنایی دابەزاندە سەر دڵی ئەو و ئیمانداراندا: ﴿ثُمَّ أَنزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَىٰ رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾.

---

١ بڕوانە: حديث القرآن (٢/٦٠٢-٦٠٣).

د- هەروەها ڕوونی کردووەتەوە کە فریشتەی دابەزاندووە بۆ یارمەتی پێغەمبەرەکەی: ﴿وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ الَّذِينَ كَفَرُوا وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ﴾.

ئینجا خوای گەورە جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی تەوبە و گەڕانەوە لە بەندەکانی وەردەگرێت: ﴿يَتُوبُ اللَّهُ مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾.

## دووەم: هۆکارەکانی شکست و سەرکەوتن لە حونەیندا.

### أ- هۆکارەکانی شکست:

١- جۆرێك لەخۆبایی بوون لە لای موسڵمانان دروست بوو بە هۆی زۆری ژمارەیانەوە، یەکێکیان وتی: ئەمڕۆ بە هۆی کەمییەوە نابەزێنرێین، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی زۆر پێ ناخۆش بوو.

٢- دەرچوونی هەندێ لاو لەگەڵ سوپاکە بێ ئەوەی چەکی تەواویان پێ بێت، بەڵکو تەنها دڵگەرمی و پەلەکردن نەبێت.

٣- ژمارەی بتپەرستان دوو ئەوەندەی موسڵمانان زیاتر بوو.

٤- مالیکی کوڕی عەوف سوپاکەی پێشتر گەیاندبووە حونەین و ئامادەکاری خۆی وەرگرتبوو، توانیشیان موسڵمانان شپرزە بکەن بە تیر باران کردنیان.

٥- دوژمن لە ئەوپەڕی ئامادەباشیدا بوو بۆ جەنگی موسڵمانان، ڕیزەکانیشیان بە جوانترین شێوە ڕێکخستبوو.

٦- سوپای موسڵمانان هەندێکی تیا بوو لەوانەی ئیمانیان لاواز بوو، کە تازە موسڵمان بووبوون لە مەککە، ئەوان کە هەڵهاتن ڕەوتی سوپاکەشیان تێکدا.[1]

---

[1] بڕوانە: المستفاد من قصص القران (٢/٤٠٩).

**ب- هۆکارەکانی سەرکەوتن:**

١- خۆڕاگری پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتی جەنگ و، هەڵنەهاتنی: ئەوەیش بووە مایەی جێگیربوونی سەربازەکان و، بەدەنگ هاتنەوەیان بۆ بانگەوازی سەرکردەی خۆڕاگر.

٢- نەبەردی سەرکردە: چونکە پێغەمبەر(ﷺ) هەر ئەوە نەبوو خۆڕاگر بێت، بەڵکو بەرەو ڕووی دوژمنیش دەڕۆیشت ، عەبباس هەوساری وڵاخەکەی دەگرت بۆ ئەوەی پەلە نەکات.

٣- خۆڕاگری ژمارەیەکی کەم لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ): تاکو ئەوانی تر گەڕانەوە و کاروانی جەنگیان درێژە پێدا تا سەرکەوتن.

٤- زوو وەڵامدانەوەی هەڵاتووەکان و گەڕانەوەیان بۆ ناو گۆڕەپانی جەنگ.

٥- ئەنجامدانی سوپای دوژمن بۆ هەڵەیەکی کوشندە: ئەویش بریتی بوو لە بەردەوام نەبوون لە دواکەوتنی سوپای ئیسلامی پاش هەڵهاتنی، ئەوەیش هەلێکی زێڕینی ڕەخساند بۆ موسڵمانان کە پشوویەك بدەن و بگەڕێنەوە بۆ نێو گۆڕەپانی جەنگ.

٦- هاویشتنی وردە بەرد: کە پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بە فڕێدانی بە ڕووی بێباوەڕاندا، ئینجا فەرمووی:(انهزموا ورب محمد)[1] واتە: سوێند بە خوای موحەممەد هەڵهاتن.

٧- کۆمەك خواستن و هانابردنە بەر خوای گەورە: چونکە پێغەمبەر(ﷺ) سوور بوو لەسەر داواکردنی سەرکەوتن لە خوای خۆی.

٨- بەشدای کردنی فریشتە لەو غەزایەدا،[2] وەکو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ الَّذِينَ كَفَرُوا وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ﴾(التوبة: ٢٦).

---

١ مسلم بشرح النووي (١٢/١١٦-١١٧).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية لأبي فارس (٤٢٣).

## سێیەم: حوکمە هەڵێنجراوەکان لە غەزای حونەین و تائیف.

١- دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ﴾(النساء: ٢٤). لە ڕۆژی(أوطاس) بۆ دەرخستنی حوکمی ئەو ئافرەتە بە کۆیلەکراوانەی کە مێردیان هەیە و بەو هۆیەوە لێیان دابڕاون، ئایەتەکەیش ئاشکرای کرد کە پاش تێپەڕبوونی عیددەیان، یان پاش منداڵ بوونیان ئەگەر سکیان پڕ بێت، خاوەنەکانیان دەتوانن بچنە لایان.

٢- قەدەغەکردنی نێرەمووکەکان کە بچنە لای ئافرەتە نامەحرەمەکان: پێشتر ڕێگەیان پێدرابوو بەڵام دواتر لێیان قەدەغەکرا، بوخاری لە زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە ئەویش لە دایکییەوە دەگێڕێتەوە،کە پێغەمبەر(ﷺ)جارێکیان چووتە لای و کابرایەکی نێرەمووکی لابووە بە عەبدوڵای کوڕی ئەبو ئومەییەی وتووە: ئەگەر سبەی چوونە ناو تائیفەوە، کچەکەی غەیلان بە دەست بهێنە چونکە ئاوها و ئاوهایە(باسی لاشەی ئافرەتەکەی دەکرد) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(لایدخلن هؤلاء عليكن)[1] واتە: ئەو جۆرە کەسانە با نەیەنە لاتان.

ئەم قەدەغەکردنەیش لەبەر سووربوونی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر جوانی ڕەوشتی کۆمەڵگا.

٣- قەدەغەکردنی کوشتنی ئافرەت و منداڵ و بەساڵاچوو: هەروەها بەکرێ گرتەکان کە بەشداری ناکەن لە جەنگی دژ بە موسڵمانان، لە ڕۆژی حونەیندا خالیدی کوڕی وەلید ئافرەتێکی کوشت و.. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((ما كانت هذه لتقاتل))، واتە: ئەم ئافرەتە توانای جەنگی نەبوو، ئینجا بە یەکێکیانی فەرموو:((الحق خالداً فقل له لا يقتلن ذرية ولا عسيفاً))،[2] واتە: فریای خالید بکەوە و پێی بڵێ نە منداڵو نەئافرەت، نە بەکرێ گرتە نەکوژێت.

٤- عومرە کردن لە(الجعرانة)ەوە: پێغەمبەر(ﷺ) لەوجێگایەوە ئیحرامی کرد

١ البخاري، كتاب المغازي (٥/١٢٠)، رقم (٤٣٢٤).

٢ البداية والنهاية (٤/٣٣٦).

کە بەرەو مەککە دەچوو، سوننەتیش وایە هەرکەسێ لە تائیفەوە بچێت بۆ مەککە لە(الجعرانة)ەوە ئیحرام بکات، بەڵام ئەوەی زۆرێك لە نەشارەزاکان دەیکەن کە لە مەککەوە دەچنە(الجعرانة) بۆ ئەوەی لەو جێگەوە ئیحرام بکەن و بگەڕێنەوە بۆ مەککە، ئەمە هەڵەیە و پێغەمبەر(ﷺ) وای نەکردووە.[1]

٥- ڕێپیشاندانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ عەرەبە بیابانشینینەکە، ئەوەی لە حەج دەیکات لە عومرەیش هەروا بکات: یەعلای کوڕی مونەببیە دەڵێت: لە جیعڕانە پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) جوببەیەکی لەبەرابوو بۆنی خۆش بوو، یان وتی: شوێنەواری زەردی پێوە دیار بوو، وتی: فەرمانم پێ دەکەیت چی بکەم لە عومرەکەم؟ دەڵێت ئیتر وەحی لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) دابەزی و بە پۆشاکێك داپۆشرا، یەعلا دەیووت: خۆزگەم دەخواست ڕۆژێك لە لای پێغەمبەر(ﷺ) بم و وەحی لەسەر دابەزێت، ئینجا عومەر بەشێکی لە پۆشاکەکە لابرد لەسەر پێغەمبەر(ﷺ)، بینیم پرخەی دێت، لە پاش ئەوە فەرمووی: کوا ئەو کەسەی پرسیاری عومرەی کرد؟ شوێنەواری زەردییەکە بشۆرە و، یان وتی: بۆنە خۆشەکە لابدە و، جوببەکە دابکەنە و، ئەوەی لە حەجدا ئەنجامی دەدەیت لە عومرەیشدا ئەنجامی بدە.[2]

٦- هەر کەسێك کەسێك بکوژێت شتەکانی بۆ خۆی دەبێت: ئەبو قەتادە دەڵێت: لە ڕۆژی حونەین موسڵمانێك و بتپەرستێکم بینی شەڕە شمشێریان دەکرد و، بتپەرستێکی تریش لە پشتەوە دەیویست موسڵمانەکە بکوژێت، منیش بە پەلە چووم بەرەو ئەو بتپەرستە و ویستی لێمدا بەڵام من دەست پێشخەریم کرد و لە دەستمدا و بڕیم بەڵام ئەو گرتمی و خۆمم لە دەستی دەرکرد و کوشتم، ئینجا کە موسڵمانان هەڵهاتن منیش لەگەڵیان هەڵهاتم... پاش گەڕانەوەمان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەرکەسێ بەڵگەیەك بهێنێت لەسەر ئەوەی کەسێکی بێباوەڕانی کوشتووە، کەرەستەکانی بۆ خۆی دەبێت، منیش کەس نەبوو شایەتیم بۆ بدات ئەو

---

١ بڕوانە: زاد المعاد (٣/٥٠٤).

٢ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٥٧٨).

پیاوەم کوشتووە، بەڵام خۆم باسم کرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، یەکێك وتی: چەکی ئەو کوژراوە لای منە... ئەبو بەکر فەرمووی: نەخێر نابێت بدرێتە چۆلەکە لاوازێك لە قورەیش و نەدرێتە شێرێك لە شێرەکانی خوا کە بەرگری دەکات لە پێغەمبەر(ﷺ)، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا و شمشێرەکەی پێدام و.. ئەوە یەکەم دەستکەوتم بوو لە ئیسلامدا.[1]

تێبینی دەکەین چۆن ئەبو قەتادەی ئەنصاری(ﷺ) سوور بووە لەسەر سەلامەتی براکەی و، ئەو بێباوەڕەی کوشتووە، هەڵوێستی ئەبو بەکریش(ﷺ) بەڵگەیە لەسەر ویستی ئەو لەسەر چەسپاندنی هەق و، پتەوی بیروباوەڕی و، ڕێز گرتنی لە برایەتی ئیسلامی.[2]

٧- قەدەغەکردنی دزی کردن لە دەستکەوتەکان: پێغەمبەر(ﷺ) تاڵە موویەکی پشتی وشترێکی گرتە دەستەوە و فەرمووی: خەڵکینە! ئەوەی خوای گەورە پێتانی بەخشیوە جگە لە پێنج یەك ئەم تاڵە مووەشی بۆ من ڕەوا نییە، پێنج یەکیش هەر دەگەڕێتەوە سەر خۆتاندا، بۆیە ئەگەر دەرزی و دەزوویەکتان لایە بیگێڕنەوە، ئامان دزی نەکەن لە دەستکەوتەکان، چونکە ئەو کارە ئابڕوو چوونە و شورەییە بۆ ئەو کەسەی ئەنجامی دەدات لە دونیا و قیامەتدا.[3]

خەڵکیش کاتێك ئەمەیان بیست زۆر ترسان و، کابرایەکی ئەنصاری هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و کلۆڵە بەنێکی پێ بوو بردبووی بۆ دوورینەوەی پارچەیەك لەسەر وشترەکەی بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: لە مافی خۆم و نەوەی عەبدولموتەلیب گەردنت ئازاد بێت، بەڵام ئەو وتی: پێویستم پێی نییە و فڕێی دایەوە نێو دەستکەوتەکانەوە.[4]

عەقیلی کوڕی ئەبو تالیبیش دەرزییەکی دابووە خێزانی لێی وەرگرتەوە پاش ئەو قسەیەی پێغەمبەر(ﷺ).[5]

---

١ البخاري، كتاب المغازي (١١٩/٥)، رقم (٤٣٢٢).

٢ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٢٦/٨).

٣ بڕوانە: البداية والنهاية (٣٥٣/٤).

٤ بڕوانە: البداية والنهاية (٣٥٣/٤).

٥ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (١٤٥/٤).

ئەم توندییە لەسەر ئەم مەسەلە هێمایەکە لە هێماکانی ڕێبازی پێغەمبەرایەتی لە پەروەردەکردندا، بۆ ئەوەی موسڵمان هەمیشە دوور بێت لە ناپاکی و، چونکە کەمتەرخەمی لە شتی بچووك دەبێتە مایەی ئەنجامدانی تاوانی گەورە و، ناپاکیش ناشیرینترین ئاکاری مرۆڤە کە ناگونجێت لەگەڵ کۆمەڵگای موسڵماندا.[1]

٨- بەجێهێنانی نەزرێك لە سەردەمی نەفامی: عەبدوڵای کوڕی عومەر(ﷺ) دەفەرمووێت: کە گەڕانەوە لە حونەین عومەر پرسیاری کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی نەزرێك کە لەسەردەمی جاهیلیدا کردبووی، ئایا ئێستا ئەنجامی بدات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکرد ئەنجامی بدات.[2]

## چوارەم: هەڵوێستی هەندێك لە هاوەڵان.

### ١-(انس بن ابي مرثد الغنوي) و پاسەوانێتی موسڵمانان:

پێش بەرپابوونی جەنگەکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کێ ئەمشەو پاسەوانێتیمان دەکات؟ ئەنەس فەرمووی: من ئەی پێغەمبەری خوا، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکرد سواری ئەسپەکەی بێت و بچێتە بەرزاییەك بۆ ئەنجامدانی کارەکەی.(سهيل بن الحنظلية) دەفەرمووێت: بەیانی پێغەمبەر(ﷺ)دوو ڕکات نوێژی کرد و فەرمووی: ئایا هەستتان کرد بە سوارەکەتان؟ وتیان: نەخێر، ئینجا بانگ درا بۆ نوێژی بەیانی و پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی کرد و ڕووی وەردەگێڕایە لای ئەو بەرزاییەی ئەنەسی پاسەوانێتی دەکرد، کە نوێژەکەی تەواو کرد، فەرمووی: مژدەتان لێ بێت سوارەکەتان گەڕایەوە، کە هاتەوە، باسی ئەوەی کرد کە چۆن چووە بۆ کارەکەی و تەماشای بەرزاییەکی تریشی کردووە، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: ئایا شەو دابەزیت؟ وتی: نەخێر مەگەر بۆ نوێژ یان چوونە سەر ئاو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: لە پاش ئەم کارەت هەرچی بکەیت زیانی نابێت بۆت.[3]

---

١ بڕوانە: محمد رسول الله،محمد الصادق عرجون (٤/٣٨٧-٣٨٨).

٢ البخاري، كتاب المغازي (٥/١١٨)، رقم (٤٣٢٠).

٣ ابوداود في الجهاد رقم (٢٥٠١) صحيح السيرة النبوية (٥٥٠).

پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەندە بایەخی دەدا بە ئەنەس لە ناو نوێژەکەیدا تەماشای دەکرد، ئینجا مژدەی گەڕانەوەی دایە موسڵمانان، چونکە موسڵمان لە ئیسلامدا ژمارەیەك نییە لە تۆمارگەکەیدا، لە کاتی پێویستدا لابرێت و کەسێکی تر بخرێتە جێگای، ئەوە هەندێکە لە ڕاڤەکردنی ڕێبازی خوای گەورە،[1] کە دەفەرموێت:

﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴾(الاسراء: ٧٠).

هەروەها لەم بەسەرهاتەدا نیشانەیەك هەیە لە نیشانەکانی ڕێبازی پێغەمبەر(ﷺ) لە پێویستی وریابوون و زانینی حاڵی دوژمن و چاودێری کردنی جموجۆڵەکانی، ئەوەش سیاسەتێکی گرنگە بۆ سەرکردەکان کە هەوڵ دەدەن ئایینی خوا بەرز بکەنەوە لەسەر زەویدا.[2]

سەبارەت بەوەیش کە پێغەمبەر(ﷺ) بە ئەنەسی فەرموو هەرچی بکەیت پاش ئەم کارەت زیانت پێ ناگەیەنێت، مەبەستی ئەوەیە کارێکی چاکی زۆر گەورەت ئەنجام دا هەرچی خراپەت بێت لە داهاتوودا دەیسڕێتەوە و، پلەتی پێ بەرز دەبێتەوە لە بەهەشتدا، نەك مەبەستی ئەوە بێت ئەرکە ئاینییەکانت مەکە.[3]

**٢- ئازایەتی ئوممو سولەیم لە ڕۆژی حونەیندا:**

ئەنەسی کوڕی مالیك(رضي الله عنه) دەفەرموێت: دایکی سولەیم خەنجەرێکی پێ بوو لە ڕۆژی حونەیندا، ئەبو تەلحەیش بۆ پێغەمبەر(ﷺ)ی باس کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەو خەنجەرە چیە؟ ئوممو سولەیم وتی: هەڵم گرتووە ئەگەر بتپەرستێك نزیك ببێتەوە سکی دەدڕم، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) پێکەنی ئوممو سولەیم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو تازە موسڵمان بووانەی مەککە بکوژە کە تۆیان بەجێهێشت و هەڵهاتن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((یا ام سلیم ان الله قد کفی واحسن))،[4] واتە:

---

١ بڕوانە: معین السیرة (٤٢٩).

٢ بڕوانە: محمد رسول الله، صادق عرجون (٤/٣٦٦).

٣ بڕوانە: التاریخ الاسلامي (٨/١٤).

٤ مسلم (١٨٠٩)، صحیح السیرة النبویة (٥٦٣).

ئەی دایکی سولەیم خوای گەورە پێویستیمانی بەجێهێناوە و چاکەی لەگەڵمان کردووە.

**٣- شەیمائی کچی حاریسی خوشکی شیری پێغەمبەر(ﷺ):**

شەیمائی کچی حەلیمەی سەعدیە یەکێك بوو لەو ئافرەتانەی بە دیل گیران، وتی: من خوشکی شیری پێغەمبەرەکەتانم، بەڵام ئەوان باوەڕیان پێ نەکرد و کاتێك گەیشتنە لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من خوشکی شیری تۆم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بە بەڵگەی چی؟ وتی: لە منالی قەپێکت گرت لە پشتم لەو کاتەی تۆم لەسەر ڕانم دانابوو، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) زانی ڕاست دەکات و، کەواکەی خۆی بۆ ڕاخست و لەسەری داینیشاند و سەرپشکی کرد لە نێوان ئەوەی بیگەڕێنێتەوە، یان بە ڕێزی زۆرەوە لە لای پێغەمبەر(ﷺ) بمێنێتەوە، ئیتر ئەویش گەڕانەوەی هەڵبژارد بۆ لای کەس و کارەکەی خۆی، ئینجا موسڵمانیش بوو و، پێغەمبەر(ﷺ) سێ کۆیلە و کەنیزەکێك و هەندێ وڵاخ و مەڕی پێدا.[1]

## پێنجەم: موسڵمان بوونی کەعبی کوڕی زوهەیری شاعیر و، زاڵبوونی ڕاگەیاندنی موسڵمان بەسەر دوژمنەدا.

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لە تائیف گەڕایەوە، کەعبی کوڕی زوهەیری شاعیری کوڕی شاعیر هاتە لای و، پێشتر جنێوی دابوو بە پێغەمبەر(ﷺ) و بوجەیری برای هانی دەدا بگەڕێتەوە لای پێغەمبەر(ﷺ) و تەوبە بکات، ئیتر ئەویش ئەو هۆنراوە بەناوبانگەی خۆی نووسی(بانت سعاد) و، لە کاتی نوێژی بەیانیدا هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و تەوقەی لەگەڵ کرد و لە لای دانیشت بێ ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بیناسێت، ئینجا وتی: وا کەعبی کوڕی زوهەیر هاتووتە لات بە موسڵمانی و داوات لێ دەکات لێی خۆش بێت، لەو کاتەدا پیاوێکی ئەنصاری هەڵسا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێگەم بدە بدەم لە گەردنی دوژمنی خوا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:

---

١ بڕوانە: البداية والنهاية (٣٦٣/٤)، السيرة النبوية الصحيحة (٥٠٦/٢)، السيرة النبوية للندوي (٣٥٨).

نەخێر، ئەو هاتووە بگەڕێتەوە، ئینجا کەعب هۆنراوەکەی خوێندەوە:

بانت سعاد فقلبي اليوم متبول متيّم إثرها لم يفد مكبول
وما سعاد غداة البين إذ رحلوا الا اغنّ قرير العين مكحول
ان الرسول لنور يستضاء به مهند من سيوف الله مسلول

دەشگێڕنەوە کاتێك ئەم هۆنراوەی خوێندووەتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) کراسەکەی خۆی پێ بەخشیوە،(ئەو کراسەی کە بۆ خەلیفەکان مایەوە).

(ابن کثیر) دەڵێت: ئەم بەسەرهاتە زۆر بەناوبانگە، بەڵام لە کتێبە بەناوبانگەکاندا نەمبینیوە بە ئیسنادێك پێی ڕازی بم.[1]

دەگێڕنەوە دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووە: ئەگەر باسی ئەنصاریش بە چاکە بکەیت چاکترە، ئەویش وتوویەتی:

من سره كرم الحياة فلا يزل من مقنب من صالحي الانصار
ورثوا المكارم كابراً عن كابر ان الخيار هم بنوالاخيار

تاکو دەگاتە کۆتایی هۆنراوەکەی.

بە موسڵمان بوونی کەعبی کوڕی زوهەیریش دەتوانین بڵێین شاعیرە نەیارەکانی بانگەوازی ئیسلامی ڕۆڵیان کۆتایی پێهات چونکە(ضرار بن الخطاب) و( عبدالله بن الزبعري) و(ابو سفيان بن الحارث) و(الحارث بن هشام) و(العباس بن مرداس) هەموویان هاتنە ڕیزی ئیسلامەوە، هەندێکیشیان جگە لەوەی شاعیر بوون شەڕکەری چاکیش بوون لە سوپای ئیسلامیدا.[2]

---

١ بڕوانە: البداية والنهاية (٤/٣٦٩-٣٧١)، السيرة النبوية لأبي شهبة (٢/٤٨٧).
٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٤/١٦٧-١٦٨)، من معين السيرة (٤٣١-٤٣٢).

## شەشەم: دەرەنجامەکانی غەزای حونەین و تائیف.

١- سەرکەوتنی موسڵمانان بەسەر هەردوو هۆزی هەوازن و سەقیفدا.

٢- ئەم دوو غەزایە دواترین غەزاکانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو بۆ سەر بتپەرستانی عەرەب.

٣- گەڕانەوەی زۆرێك لە خەڵکی مەککە و عەرەبە بیابانشینەکان بۆ جێگاکانی خۆیان بە دەستکەوتی زۆرەوە و، بەدەستهێنانی ئەنصارەکان بۆ نیشانەی ڕێز لێگرتنی پێغەمبەر کە شایەتی ئیمانی بۆ دان و دوعای بۆ خۆیان و کوڕ و کوڕەزاکانیشیان کرد و بە پێغەمبەری خوا گەڕانەوە بۆ مەدینە.

٤- کەژاوەیەکی پیرۆز لە سەرکردەکانی مەککە و تائیف گەڕانەوە بۆئیسلام و، بوونە سەرکردەی جیهادکردن لە دژی جاهیلیەت لە دوورگەی عەرەبدا وەکو چۆن هۆزی هەوازن ڕۆڵێکی گەورەیان بینی لە جیهادی خەڵکی تائیف دا تاکو موسڵمان بوون.

٥- بڵاوبوونەوەی دەوڵەتی ئیسلامی، چونکە ئەو جێگە تازانە سەرکردەی ئیسلامیان لەسەر بوو، بەشێکیش بوون لە دەوڵەتی ئیسلامی کە پایتەختەکەی مەدینەیە، کە لە پاش فەتحی مەککە پێشوازیای تیا دەکرا لە نێردەکان و، پۆلە سەربازییەکان لە هەموو لایەك بتەکانیان دەڕوخاند و، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بە ڕێکخستنی فەرزی زەکات و، کەسانێکی دیاری کرد بۆ کۆکردنەوەی لە هۆزەکان.[1]

---

١ بڕوانە: الاساس في السنة وفقهها في السيرة النبوية (٢/٩٦١).

## باسی چوارەم: گرنگترین ڕووداوەکانی نێوان حونەین و تەبووك

### یەکەم: ڕێکخستنی وەرگرتنی زەکات.

لە کۆتایی مانگی(ذي القعدة) پێغەمبەر(ﷺ) پاش گەڕانەوەی بۆ مەدینە، دەستی کرد بە ڕێکخستنی بەڕێوەبردنی زەکات کۆکردنەوە، عەتتابی کوڕی ئوسەیدیشی لە مەککە وەکو جێنشینی خۆی بەجێهێشت و موعازی کوڕی جەبەلیش بۆ فێرکردنی خەڵکی وەکو مامۆستا، چونکە یەکێك لە ڕێنماییەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە بوو کەسێکی دیاری کرد بۆ فێرکردنی ئەو هۆزانەی دەهاتنە ئیسلامەوە، ئینجا لە موحەڕەمی ساڵی نوێ کۆچی هەندێ لە هاوەڵانی نارد بۆ ئەو ناوچانە،(بريدة بن الحصيب)ی نارد بۆ ئەسلەم و غیفار و،(عباد بن بشر الاشهلي) نارد بۆ سولەیم و موزەینە و،(رافع بن مكيث)ی نارد بۆ جوهەینە و،(عمرو بن العاص)ی نار بۆ فەزارە و،(الضحاك بن شعبان الكلابي) نارد بۆ بەنی کیلاب و،(بشر بن سفيان الكلبي) نارد بۆ بەنی کەعب و،(ابن اللتبية الازدي) نارد بۆبەنی(ذبيان) و، پیاوێکی لە بەنی سەعد نارد بۆ بەنی(هذيل) و،(المهاجر بن ابي امية)ی نارد بۆ(صنعاء) و،(زياد بن لبيد)ی نارد بۆ(حضرموت) و،(الزبرقان بن بدر) و(قيس بن عاصم)ی نارد بۆ بەنی سەعد و،(العلا بن الحضرمي) نارد بۆ بەحرێن و،(علي بن ابي طالب)ی نارد بۆ نەجران بۆ ئەوەی زەکاتەکانیان کۆبکاتەوە و، سەرانەیان بهێنێت.[1]

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) لێپرسینەوەی دەکرد لەگەڵ ئەو کاربەدەستانە، وەکو ئەوەی ئەنجامیدا لەگەڵ(ابن اللتبية) کاتێك وتی: ئەمە بۆ ئێوەیە و، ئەمەیش بە دیاری بە خۆم دراوە، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) چووە سەر مینبەر و فەرمووی: ئەوە چییە کەسانێك لە ئێوە دەنێرم و دەڵێت ئەمە بۆ ئێوەیە و ئەوەیش دیارییە بە خۆم دراوە، ئایا بۆ ناچێت لە ماڵی باوکی یان دایکی دابنیشێت و بزانێت ئایا دیاری بۆ دێت یان نا؟ سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بە دەستە هەر کەسێکتان

---

١ بڕوانە: نضرة النعيم (١/٣٨٣-٣٨٤).

شتێکی لێ ببات لە ڕۆژی قیامەتی لەسەر گەردنی هەڵی دەگرێت، ئەگەر وشتر بێت گرمەی دێت و، ئەگەر مانگا بێت بۆڕەی دێت ئەگەر مەڕ بێت باڕەی دێت، ئینجا دەستی بەرزکردەوە تاکو سپێتی بن باڵیمان بینی و فەرمووی: خوایە گیان ئایە فەرمانەکانتم گەیاند.[١]

## دووەم: گرنگترین پۆلە سەربازییەکان لەم قۆناغەدا.

### أ- پۆلی سەربازی توفەیلی کوڕی عەمر بۆ(ذي الكفلين):

پێغەمبەر(ﷺ) توفەیلی کوڕی عەمری لە حونەینەوە ناردبوو بۆ تائیف، بۆ ئەوەی بتی(ذي الكفلين) بروخێنێت، ئینجا یارمەتی لە لای عەشیرەتەکەیەوە بهێنێت و بگەڕێتەوە بۆ تائیف، توفەیل فەرمانەکانی پێغەمبەر(ﷺ)ی بەجێهێنا و ئەو بتەی ڕوخاند و سوتاند و، چوار سەد کەسیشی لە عەشیرەتەکەی خۆی هێنا لەگەڵ دەبابەیەك و مەنجەنیقێکدا بۆ یارمەتی پێغەمبەر(ﷺ)، ئیتر پاش چوار ڕۆژ لە هاتنی بۆ تائیف گەیشتنە لای.[٢]

### ب- پۆلی سەربازی(عبدالله بن حذافة السهمي) دەشڵێن ئەوە پۆلەکەی ئەنصار بووە:

عەلی کوڕی ئەبو تالیب دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) پۆلێکی سەربازی ڕەوانە کرد بە لێپرسراوێتی پیاوێکی ئەنصاری و فەرمانی کرد بە قسەی بکەن، ئەویش توڕە بوو و وتی: ئایا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێ نەکردن بە قسەی بکەن؟ وتیان: بەڵێ، وتی: کەواتە دارم بۆ کۆبکەنەوە و ئاگرێکم بۆ بکەنەوە، ئینجا وتی: بچنە نێو ئەو ئاگرەوە، ئەوانیش خەریك بوو بە قسەی بکەن و بەڵام یەکتریان دەگرت و دەیانووت: ئێمە لە ترسی ئاگر هەڵهاتووین بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ئەم هەواڵەی پێگەیشت فەرمووی:(لو دخلوها ماخرجوا منها الى يوم القيامة، الطاعة في المعروف)،[٣] واتە: ئەگەر بچوونایەتە ناوی ئاگرەکە تاکو

---

١ مسلم، باب محاسبة الامام عماله رقم (١٨٣٢). صحيح السيرة (٥٧٩).
٢ بڕوانە: نضرة النعيم (٣٨٥/١).
٣ البخاري، كتاب المغازي (١٢٦/٥)، رقم (٤٣٤٠).

ڕۆژی قیامەت لێی دەرنەدەچوون، بە گوێگرتن لە کاری چاکدا ڕەوایە.

**ج- پۆلی سەربازی عەلی کوڕی ئەبو تالیب بۆ ڕووخاندنی بتی فولس لە ناوچەی تەی.**

لە(ربیع الاخر) ئەو پۆلە سەربازییە بەڕێکەوت کە پێکهاتبوو لە پێنج سەد کەس لە ئەنصارەکان، لەگەڵ سەد وشتر و پەنجا ئەسپ، ئالایەکی ڕەشیشی پێ بوو، لەگەڵ بەیداخێکی سپی، پەلاماریان دایە سەر گەڕەکی حاتیمی تائی، کە نموونەی بەخشندەیی بوو. لەگەڵ بەرەبەیاندا بتەکەیان ڕوخاند و وێرانیان کرد، بە کۆیلە و ڕەشەوڵاخ و مەڕ و ماڵاتەوە هاتنەوە، یەکێك لە ئافرەتە بەدیلگیراوەکان خوشکێکی عەدی کوڕی حاتیم بوو، عەدی خۆیشی هەڵهاتبوو بۆ شام.[1]

**د- پۆلی سەربازی جەریری کوڕی عەبدوڵای بەجەلی بۆ(ذي الخلصة ):**

جەریری کوڕی عەبدوڵا دەفەرمووێت: پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم: ئایا ئاسوودەم ناکەیت بە لەناوبردنی(ذي الخلصة)؟ وتم: بەڵێ، ئینجا لەگەڵ سەد و پەنجا سوار دەرچووم، بەڵام من لەسەر ئەسپ خۆم ڕانەدەگرت، بۆیە ئەوەم بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باسکرد و ئەویش بە دەستی لەسەر سنگمی دا، تەنانەت هەستم کرد بە شوێنەواری دەستی لەسەر سنگم، فەرمووی:((اللهم ثبته واجعله هادياً مهدياً))، واتە: خوایە جێگیری بکەیت و بیکەیتە ڕێپیشاندەر و ڕێپیشاندراو. دەڵێت: دوایی لەسەر ئەسپ نەدەکەوتم، ئینجا دەڵێت:(ذي الخلصة) ماڵێك بوو لە یەمەن سەر بە خەشعەم و بوجەیلە، پەیکەرێکی تیابوو کەعبەی پێ دەوترا، ئەویش ڕووخاندی و سوتاندی، پیاوێکیش لە یەمەن هەبوو خەریکی(ازلام) بوو، پێی دەوترا: ڕەوانەکراوی پێغەمبەری خوا لێرەیە، کە دەستی پێت بگات لە گەردەنت دەدات، جا لە کاتێکدا خەریکی ئەو ئەزلامانەی بوو ڕایدەکێشا، جەریر هاتە سەری و وتی: یان بیشکێنە و شایەتمان بهێنە، یان لە گەردنت دەدەم، ئەویش شکاندی و شایەتمانی هێنا، لەوێوە جەریر پیاوێکی لە ئەحمەس ناردە لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەم هەواڵانەی پێگەیاند، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) پێنج جار دوعای کرد بۆ سواری ئەحمەس و پیاوەکانی.[2]

---

١ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للذهبي، المغازي (٦٢٤).

٢ البخاري، المغازي، (١٣٢/٥)، رقم (٤٣٥٧).

## سێیەم: موسڵمان بوونی عەدی کوڕی حاتیم.

کاتێك خوشکەکەی عەدی کوڕی حاتیم بە دیلی گیرا، پێغەمبەر(ﷺ) مامەڵەی میهرەبانانەی لەگەڵی کرد و، بە ڕێزلێگیراوی مایەوە و پێغەمبەر(ﷺ) پۆشاکێکی لەبەری کرد و ئەوەندەشی پێدا لە گەشتەکەی بە کەڵکی بێت، جا کاتێك گەیشتەلای عەدی برای لە شام هانی دا بگەڕێتەوە لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش گوێی لە ئامۆژگارییەکەی گرت و گەڕایەوە بۆ مەدینە.[1]

ئەبو عوبەیدەی کوڕی حوزەیفە دەڵێت: باسی عەدی م بۆ دەکرا، وتم ئەوە عەدی یە لە لای کوفە، دەچمە لای و گوێی لێ دەگرم، چوومە لای و پێی وتم: کاتێك بە هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) م بیست هەڵهاتم بۆ ئەوپەڕی خاکی موسڵمانان لە نزیك ڕۆمەکان. بەڵام لەوێ زۆر بێزار بووم و، وتم: دەگەڕێمەوە لای ئەو پیاوە، ئەگەر ڕاستگۆ بێت گوێی لێ دەگرم، ئەگەر درۆزنیش بێت زیانم پێ ناگەیەنێت، گەڕامەوە و، خەڵکی تەماشایان دەکردم و دەیانووت: ئەوە عەدی کوڕی حاتیمە، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم: موسڵمان بە سەلامەت دەبیت، وتم: من خاوەن ئاینم، سێ جار لێی دووبارە کردمەوە و منیش هەر وام پێ وت: فەرمووی: شارەزاترم لەو ئاینەی تۆ باسی دەکەیت، تۆ سەرگەورەی هۆزەکەی خۆت نیت؟ وتم: بەڵێ، ئیتر ئەویش باسی(الركوسية)ی[2] بۆ کردم، ئینجا فەرمووی: کەواتە(المرباع)[3] لە ئاینی تۆ ڕەوا نییە، ئینجا فەرمووی: وا بزانم ئەوەی ڕێگەت لێ دەگرێت موسڵمان بیت ئەو هەژارییەیە کە لە دەوروبەرم دەیبینی و، ڕێکەوتنی خەڵکی لە دژمان، ئایا ناوچەی(حيرة) دەناسیت؟ وتم: بیستوومە بەڵام نەمبینیووە، فەرمووی: زۆری پێ ناچێت ئافرەت لەوێوە بە تەنها دەردەچێت و بە دەوری کەعبەدا دەسوڕێتەوە، خەریکە گەنجینەکانی کیسرای کوڕی هورموزیش دەردەچێت. وتم: کیسرای کوڕی هورموز؟ ئەویش سێ جار وتی بەڵێ، زۆریشی پێ

---

[1] بڕوانە: التاريخ الاسلامي (٨/٨١).
[2] کەسانێك بوون ئایینێکیان هەبوو لە نێو گاور و صابیئەکاندا.
[3] (المرباع) واتە چواریەکی دەسکەوت سەرگەورەی هۆز پێش دابەش کردن دەیبات.

ناچێت وای لێ دێت کەسێك خێر بکات کەسی دەست ناکەوێت وەری بگرێت، دەڵێت: دوانیم بینی و سوێند بە خوای گەورە سێیەمیشیان ڕوودەدات ئەوە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ).[1]

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە عەدی چووەتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێکەوە چوونەتە ماڵ و لە جێگاکەی خۆی دایناوە و پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر زەویەکە دانیشتووە.[2]

لەم بەسەرهاتە چەند وانە و پەندێك وەردەگرین:

١- عەدی لە زەینی خۆیدا دوو بۆچوونی هەبوو دەربارەی پێغەمبەر(ﷺ): یان پادشایە، یان پێغەمبەرە، بەڵام کە بینی دڵنیا بوو کە پێغەمبەرە.

٢- پێغەمبەر(ﷺ) سەرکەوتوو بوو لە بانگەوازەکەیدا چونکە شارەزابوو نەخۆشی دەروونەکان و تیمارکردنیان، بۆیە لەگەڵ هەموو کەسێکدا بەو شێوە مامەڵەی دەکرد کە لەگەڵیدا بگونجێت، هەر بۆیەیش کاریگەری هەبوو لەسەر سەرۆکی هۆزەکان.[3]

٣- کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بۆی دەرکەوت عەدی دڵنیا بوو لە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر(ﷺ) باسی کۆسپەکانی کرد کە ڕێگە لە هەندێ خەڵك دەگرن بۆ موسڵمان بوون، لەوانە لاوازی موسڵمانان و بچووکی دەوڵەتەکەیان، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) باسی ئەوەی بۆ کرد کە ئاسایش هەموو ناوچەکان دەگرێتەوە، تاکو تەنها ئافرەتێك لە عێراقەوە دەچێتە مەککە بەبێ هیچ ترسێك، هەروەها دەوڵەتی فارسیش دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی ئیسلامەوە.

٤- عەدی نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی لە شێوەی گوزەرانی پێغەمبەردا(ﷺ) بینی، دواتریش باشتر نیشانەکانی بۆ ئاشکرا دەبوو، ئەویش هۆکارێك بوو بۆ موسڵمان بوونی و دەست هەڵگرتنی لە خۆشیەکانی دونیا.[4]

---

١ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٥٨٠).
٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٤/٢٣٦).
٣ بڕوانە: التاريخ الاسلامي (٨/٥٨-٨٦).
٤ بڕوانە: فقه السيرة للبوطي (٣٢١).

## چوارەم: چەند بەسەرهاتێکی جیاجیا لە ساڵی هەشتی کۆچی.

(ابن کثیر) لە واقیدیەوە دەگێڕێتەوە: لەم ساڵەدا پێغەمبەر(ﷺ) عەمری کوڕی عاصی ناردە لای جەعفەر و عەمری کوڕانی جەلەندی لە ئەزد، سەرانەشی وەرگرت لە ئاگر پەرستەکانی ئەو وڵاتە و دەوروبەری، هەر لەو ساڵەشدا پێغەمبەر(ﷺ) هاوسەرگیری کرد لەگەڵ فاتیمەی کچی(الضحاك) لە(ذي القعدة) و ئەو ئافرەتە پەنای گرتە خوا لە پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش وازی لێ هێنا، لە(ذي الحجة)یش ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر(ﷺ) لە ماریەی قیبتی لە دایك بوو، بۆیە دایکانی ئیمانداران پتر غیرەیان هەستا بەرامبەر ماریە چونکە کوڕی بوو.[1]

هەر لەو ساڵەیشدا خاتوو زەینەبی کچی پێغەمبەر(ﷺ) کە خێزانی ئەبولعاصی کوڕی ڕەبیع بوو لە دونیا دەرچوو، لە دایك بوونیشی دە ساڵ پێش ڕەوانەکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، کچی گەورەی پێغەمبەریش بوو(ﷺ)، زۆریشی خۆشدەویست، هەر لە سەرەتاوە موسڵمان بوو، کۆچیشی کرد پێش موسڵمان بوونی مێردەکەی بە شەش ساڵ، منالێشی لە کاتی کۆچکردندا لەبار چوو و تووشی خوێن بەربوون بوو، نەخۆشیەکەشی ناو بە ناو هەر بۆی دەگەڕایەوە تاکو گیانی سپارد، ئەو کاتە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((اغسلنها وترا: ثلاثاً، او خمساً، واجعلن في الاخرة كافوراً))،[2] واتە: بیشۆن، یان سێ جار، یان پێنج جارو لە دوا جاریشدا کافوور بکەنە ئاوەکەوە.

---

١ بڕوانە: البداية والنهاية (٤/٢٧٤).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٢/٤٩٠)، کافور: ڕووەکێکە بۆنی خۆشە، جگە لەوەی بۆنی مردووەکە خۆشتر دەکات لاشەی وشك و توند دەکاتەوە و نایەڵێت بە پەلە تێك بچێت.

# بەشی حەڤدەیەم

## غەزای تەبوك( ٩ ك ) یان غەزای عوسرە

### باسی یەکەم: مێژووی غەزاکە وناوەکانی و هۆکارەکانی

#### یەکەم: مێژوو و ناوەکانی.

پاش گەڕانەوە لە گەمارۆدانی تائیف بە شەش مانگ، پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوو بۆ ئەم غەزایە لە مانگی ڕەجەبی ساڵی نۆیەمی کۆچی.[1]

ئەم غەزایە بە ناوی(تبوك) ناوبانگی دەرکردووە، بە بۆنەی ئەو کانییەی سوپای ئیسلامی لایدا لە تەنیشتی، بنچینەی ئەم ناوەیش لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە، کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:((ستأتون غدا انشاء الله عين تبوك، وانكم لن تأتوها حتى يضحى النهار، فمن جاءها منكم فلا يمس من مائها شيئاً حتى آتيه))،[2] واتە: سبەی بە ویستی خوای گەورە دەچنە لای کانی ئاوی تەبوك، ناشگەنە ئەوێ پێش چێشتەنگا، جا هەرکەسێ لە ئێوە گەیشتە ئەوێ دەست بە ئاوەکەوە نەدان تا خۆم دێم.

بەڵام ئەم غەزایە ناوێکی تریشی هەیە پێی دەوترێت غەزای(العُسرة) کە لە قورئانیشدا هاتووە: ﴿ لَقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾(التوبة: ١١٧).

---

١ بڕوانە: تفسير الطبري (١٤/٥٤٠-٥٤٢)، السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٦١٤)، فتح الباري (١٦/٣٣٧).

٢ صحيح مسلم (٤/١٧٨٤) رقم (٧٠٦).

بوخاری لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: هاوەڵانم منیان ناردە لای پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێ بکەم لەگەڵ خۆی بیانبات، چونکە ئەوان لەگەڵی بوون و سوپای عوسرە، کە غەزای تەبوکە... هەروەها بوخاری ناونیشانی داناوە لە صەحیحەکەیدا:(باب غزوه تبوك وهى غزوه العسره).[1] ئەم ناوەیش بەهۆی ناخۆشی و دەردەسەرییەکانی لەو غەزایە نراوە، چونکە کەش و هەوا زۆر گەرم بوو، گەشتەکەیش دوور و ناخۆش بوو، خەرجی و وڵاخیش کەم بوو، کە موجاهیدەکان بگەیەنێت بە گوڕەپانی شەڕەکە، هەروەها بە هۆی کەمی ئاو لەم گەشتە ناڕەحەتدا و کەمی پارە کە سوپای پێ ئامادە بکرێت.[2]

لە تەفسیری(عبدالرزاق)دا هاتووە کە ئەوان وڵاخیان کەم بوو، گەرمایش سەخت بوو، تەنانەت وشتریان سەربردەبڕی بۆ ئەوەی ئاوەکەی ناو سکی بخۆنەوە،[3] عومەری کوڕی خەتتابیش دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەرچووین بۆ تەبوك لە گەرمایەکی سەختدا، لە جێگەیەك لاماندا و تووشی تێنوێتییەکی زۆر بووین، تەنانەت وامان دەزانی دەخنکێین لە تینوێتیدا، کەسێکمان دەچووە سەر ئاو و دەگەڕایەوە وا گومانی دەبرد گەردنی ببڕێتەوە، کەسی وایش هەبوو وشترەکەی سەردەبڕی بۆ ئەوەی ئاوی ناو سکی بخواتەوە و..[4]

ئەم غەزایە ناوێکی دیکەشی هەیە پێی دەوترێت(الفاضحة) واتە: ئابڕووبەر ڕاستی مونافیقەکانی دەرخست و، پەردەی لەسەر ڕاماڵین.[5]

جێگای(تبوك)یش دەکەوێتە باکووری حیجازەوە،(٧٧٨) میل لە مەدینەوە دوورە بە پێی ڕێگای ئەمڕۆ، ئەو سەردەمەیش دەکەوتە ناوچەی(قضاعة)ی سەر بە دەسەڵاتی ڕۆمەکان.

---

١ البخاري (١٥٠/٥) رقم (٤٤١٥).
٢ بڕوانە: الصراع مع الصليبيين لأبي فارس (٨٣).
٣ فتح الباري (١٧٤/٩).
٤ بڕوانە: مجمع الزوائد (١٩٤/٦).
٥ بڕوانە: شرح المواهب اللدنية (٦٢/٣)، الصراع مع الصليبيين (٨٤).

**دووەم: هۆکارەکانی.**

مێژوونووسان باسی هۆکارەکانی ئەم غەزایەیان کردووە و، وتوویانە: بازرگانە ئەنباتەکان کە ڕۆنیان دەهێنا لە شامەوە بۆ مەدینە هەواڵیان هێنا کە ڕۆمەکان لەگەڵ عەرەبە گاورەکان لە(لخم) و(جذام) و کەسانی تر کۆمەڵی زۆریان کۆکردووەتەوە و دەیانەوێت هێرش بکەنە سەر موسڵمانان. ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) ویستی دەست پێشخەری بکات لە هێرش کردندا.[1]

(ابن کثیر) پێی وایە ئەم غەزایە وەڵامدانەوەیەکی سروشتی بوو بۆ فەرزی جیهاد، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاری دا جەنگی ڕۆمەکان بکات، چونکە ئەوان لە هەموو کەسێك نزیکتر و لە پێشتر بوون بانگەوازی ئیسلامیان پێ بگات خوای گەورەیش دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلْكُفَّارِ وَلْيَجِدُواْ فِيكُمْ غِلْظَةً وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ﴾(التوبة: ١٢٣).

بۆچوونەکەی(ابن کثیر)یش پەسەندە و نزیکترە لە ڕاستیەوە، چونکە ئەوەی جێگیر بوو لە ئیسلام ئەوەبوو جەنگ لە دژ هەموو موشریکەکان بکرێت و، ئەوانیش دەست درێژیان زیادی کردبوو لە دژی موسڵمانان وەکو مێژوو نووسەکان باسی دەکەن.[2]

لە ڕاستیدا موسڵمانان وریا بوون لەوەی هۆزی(غسان) لە شامەوە نەیەن، ئەویش لە ڕووداوەکەی عومەری کوڕی خەتتاب ئاشکرا دەبێت، لەو کاتەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) مانگێك دوور کەوتەوە لە خێزانەکانی خۆی قسەی لەگەڵنەدەکردن، وەکو لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە: ئێمە باسی ئەوەمان دەکرد کە غەسسانییەکان پێڵاو لەپێ دەکەن بۆ هێرش کردنە سەرمان، ئیتر ئەو ڕۆژە نۆرەی هاوەڵەکەم بوو دابەزێتە مەدینە، لە گەڕانەوەیدا بە توندی لە دەرگاکەمی دا و، وتی: لەوێیە؟ منیش زۆر ترسام و دەرچووم بۆ لای، وتی: کارەساتێکی گەورە

---

١ بڕوانە: الطبقات الکبری لابن سعد (٢/١٦٥).

٢ البداية والنهاية (٥/٣).

ڕوویداوە، وتم: چییە؟ غەسسانیەکان هاتن؟ وتی: لەوەش خراپتر، پێغەمبەری خوا(ﷺ) خێزانەکانی تەڵاقدا...[1]

## سێیەم: خەرج کردن لەم غەزایەدا و، پەرۆش بوونی ئیمانداران بۆ جیهاد.

پێغەمبەر(ﷺ) هانی هاوەڵانی دەدا لەسەر خەرج کردن لەم غەزایەدا بە بۆنەی دووری ڕێگا و، زۆری ژمارەی بێباوەڕان تیایدا، بەڵێنی پاداشتی زۆریشی دایە ئەو کەسانە، بۆیە هەر کەسە و بە گوێرەی توانای خۆی ماڵی بەخشی، عوسمان(ﷺ) بە گەورەترین پشك بەشداری کرد،[2] عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حوباب باسی عوسمانمان بۆ دەکات و دەفەرمووێت: پێغەمبەرم بینی(ﷺ) هانی دەدا بۆ خەرجکردن لەسەر سوپای عوسرە، عوسمانی کوڕی عەففان هەڵسا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سەد وشتر بە هەموو پێداویستیەکانییەوە لەسەر من، جارێکی تر هەڵسایەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دوو سەد وشتر لەسەر من بە هەموو پێداویستیەکانیەوە، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) دیسان هانی خەرج کردنی دا و، عوسمان هەڵسایەوە و، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سێ سەد وشتر بە هەموو پێداویستیەکانیەوە لەسەر من، من خۆم پێغەمبەرم بینی(ﷺ) لە مینبەرەکەی دابەزی و فەرمووی:((ما على عثمان ما عمل بعد هذه، ما على عثمان ما فعل بعد هذه))،[3] واتە: ئیتر عوسمان هیچی لەسەر نییە هەرچی بکات پاش ئەمڕۆ؟ لە(عبدالرحمن بن سمرة)یشەوە هاتووە کە فەرموویەتی: عوسمان هەزار دیناری لە پۆشاکەکەیدا هێنا لە کاتی ئامادەکردنی سوپای عوسرە، پێغەمبەر(ﷺ) پارەکانی لە دەستیدا هەڵدەگێڕایەوە و دەیفەرموو: لە پاش ئەمڕۆ عوسمان هەرچی بکات زیانی نابێت بۆی، ئەم قسەی چەند جار دووبارە کردەوە.[4]

---

١ البخاري، كتاب النكاح، باب موعظة الرجل ابنته (١٨٠/٦) رقم (٥١٩١).
٢ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٦١٥).
٣ سنن الترمذي، مناقب (٦٢٥/٥-٦٢٦) رقم (٣٧٠٠).
٤ مسند احمد (٦٣/٥).

عومەریش(ﷺ) نیوەی ماڵەکەی بەخشی و، وایزانی پێشی ئەبو بەکر دەداتەوە بەو کارەی، خۆی باس دەکات و دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی پێ کردین بە بەخشین، لەو کاتەی سەروەت و ماڵم هەبوو، وتم ئەمڕۆ مەگەر پێشی ئەبو بەکر بدەمەوە، ئیتر نیوەی ماڵەکەم هێنا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: چیت هێشتەوە بۆ کەس و کارت؟ وتم: ئەوەندەی تر، بەڵام ئەبو بەکر هەموو ماڵەکەی هێنا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: چیت بۆ کەس و کارت هێشتەوە؟ وتی: خوا و پێغەمبەرەکەی، وتم: هەرگیز پێشی ئەبو بەکرم بۆ نادرێتەوە.[1]

هەروەها دەگێڕنەوە کە(عبدالرحمن بن عوف) دوو هەزار درهەمی بەخشی، کە بریتی بوو لە نیوەی ماڵەکەی.[2]

هەندێکی تریش لە هاوەڵان بەخشینی مەزنیان تەرخان کرد، وەکو عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب و، تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلا و، موحەممەدی کوڕی مەسلەمەو، عاسیمی کوڕی عەدی(ڕەزای خوایان لێ بێت).[3]

بەم شێوە موسڵمانان تێدەگەن کە پارە هۆکارێکە و، سەرانی هاوەڵان توانیان بیسەلمێنن کە ماڵەکەیان لە خزمەت ئاینەکەیاندایە، مێژووی دەوڵەمەندە موسڵمانەکانیش مێژوویەکی ڕۆشنە، وەکو چۆن جیهاد بە گیان کراوە، بە هەمان شێوە جیهاد بە ماڵیش کراوە.[4]

پەلەکردنی دەوڵەمەندەکان لە بەخشیندا بەڵگەیە لەسەر کاریگەری ئیمان لە دەروونداو، کە هەموو ئوممەتێك پێویستی بەوە هەیە بۆ ئەوەی سەرکەوێتە سەر دوژمنەکانیدا، چاکترین کاری چاکخوازەکان چاندنی ئایینە لە دڵی خەڵکیدا.[5]

هەژارەکانیش بە شەرمەوە بەخشینی خۆیان ئەنجام دا، بۆیە دوچاری تانە و تەشەری مونافیقەکان بوونەوە، ئەبو عوقەیل نیو ئەندازە خورمای هێنا و، کەسێکی

---

١ سنن ابي داود، الزكاة (٢/٣١٢-٣١٣) رقم (١٦٧٨).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٦١٦).

٣ بڕوانە: مغازي، الواقدي (٤٤٩).

٤ من معين السيرة (٤٤٩).

٥ بڕوانە: السيرة النبوية دروس وعبر للسباعي (١٦١).

تر هەندێ خورمای زیاتری هێنا، ئەوانیش تانەی لێدان و وتیان: خوا پێویستی بەو خێرەی ئەوان نییە!! ئەوەی دووەمیش تەنها بۆ ڕووپامایی ئەو کارەی کردووە، ئیتر خوای گەورەیش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهۡدَهُمۡ ﴾(التوبة: ٧٩).

ئەوان دەوڵەمەندەکانیان تۆمەتبار دەکرد بە ڕیایی و، گاڵتەشیان دەکرد بە بەخشینی هەژارەکان.[١]

لە ڕاستیدا ئیماندارە هەژارەکان زۆر خەمبار بوون چونکە خەرجی دەرچوونیان نەبوو بۆ جیهاد و لە پێناو خوادا، عولەبەی کوڕی زەید یەکێك بوو لە(البكائين) شەونوێژی کرد و گریا و، فەرمووی: خوایە تۆ فەرمانت بە جیهاد کردووە و هانی موسڵمانانت داوە لەسەری، بەڵام هیچت پێم نەداوە بتوانم پێی دەربچم لەگەڵ پێغەمبەرەکەت، بۆیە من گەردنی هەموو موسڵمانێك ئازاد دەکەم ستەمێکی لێ کردووم یا دەست درێژی کردووەتە سەر لاشە و ئابڕوومدا، دوایی پێغەمبەر(ﷺ) ئاگاداری کردەوە کە خوای گەورە لێی خۆش بووە.[٢]

ئەم بەسەرهاتە بەڵگەیە لەسەر دڵسۆزی و خۆشەویستی جیهاد و بڵاوکردنەوەی بانگەواز لە هەموو لایەك، هەر بەزەیی خوای گەورەی تیا بەدی دەکرێت بە بەندە لاوازەکانی.[٣]

(واثلة بن الاسقع) باسمان بۆ دەکات و دەفەرمووێت: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کرد بۆ غەزای تەبوك... لە ناو مەدینە هاوارم دەکرد: کێ لەگەڵ خۆی دەمبا و پشکی من لە دەستکەوتدا بۆ خۆی بێت، پیاوێکی بە تەمەنی ئەنصاری وتی: بەشەکەی بۆ ئێمە و بە نۆرە لەگەڵ خۆمان سواری دەکەین و، خواردنی لەسەر خۆمانە، کاتێك دەستکەوتەکان بەشکران پێنج وشترم بەرکەوت، منیش وشترەکانم بۆ برد و، وتی: وشترەکانت ببە بۆ خۆت ئەی برازا، من مەبەستم ئەم بەشە نەبوو.[٤]

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٦١٦).

٢ بە هەندێك سەنەدی لاواز هاتووە، بەڵام شاهێدێکی صەحیحی هەیە، بۆیە دەگونجێت بکرێتە بەڵگەیەکی مێژوویی، بڕوانە: المجتمع المدني للعمري (٢٣٥).

٣ بڕوانە: محمد رسول الله، محمد الصادق عرجون (٢/٤٤٣).

٤ بڕوانە: جامع الاصول رقم (٦١٨٨)، معين السيرة (٤٥٣).

(واثلـة) دەسـتی هـەڵگرت لـە پـشکی خـۆی لـە دەسـتکەوتەکان بـۆ ئـەوەی دەستکەوتی قیامـەتی بەرکـەوێت، پیـاوە ئەنـصاریەکەیش وازی هێنـا لـە بەشـێکی گەورە لە پشوی خـۆی و خـواردنی بـە(واثلـة)دا بەرامبـەر پـشکێکی تـر کـە پـشکی قیامەتە. ئەم چەمکانە هەڵقوڵاوی ئەو کۆمەڵگایـەن کـە لەسـەر قورئـان و سـوننەت پەروەردە بوون، هەندێکیان هەندێکی تریان تەواو دەکەن.[١]

ئینجا ئەشعەرییەکان هاتن و ئەبو موسای ئەشعەری پێشیان کەوتبوو، داوایان دەکرد لە پێغەمبەر(ﷺ) وشتریان بۆ دابین بکات بۆ ئەوەی دەرچن بۆ جیهاد، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ماوە تەنها توانی سێ وشتریان بۆ دابین بکات.[٢] تەنانەت لاواز و پەککەوتە و نەخۆشەکان و ئەوانەی خەرجی دەرچوونیان نەبوو دەستیان کردە گریان لەبەر پەرۆش بوونیان بۆ جیهاد، تاکو خوای گەورە ئایەتی لەسەر دابەزاندن:

﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا۟ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩١﴾ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا۟ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا۟ مَا يُنفِقُونَ ﴾(التوبة: ٩١-٩٢).

لە ڕاستیدا دیمەنێکی کاریگـەر بـوو بـۆ حـەزی ڕاسـتەقینە لەسـەر جیهـاد کـردن لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)، ئەگەرچی ئەو کەسانەیش کە هەریەکە و پاساوێکیان هـەبوو لـە نـەهاتن، بـەڵام بـە دڵـەکانیان موجاهیـد بـوون،[٣] هـەر ئەوانـەش بـوون کـە پێغەمبەر(ﷺ) باسی کردن و دەیفـەرموو:((ان بالمدینـة أقوامـاً مـا سـرتم مـسیراً ولا قطعتم وادیاً الا کانوا معکم))، واتە: کەسانێك هەن لە مەدینە، هەر ڕێگەیەك دەبڕن، یان دۆڵێك تێدەپەڕێنن لەگەڵتانان، وتیان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا، لـە مەدینەشـن؟ فەرمووی: بەڵێ پاساویان هەیە لە نەهاتندا.[٤]

---

١ بڕوانە: معين السيرة (٤٥٣).

٢ بڕوانە: المجتمع المدني (٢٣٦).

٣ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٦١٨).

٤ البخاري، كتاب المغازي، رقم (٤٤٢٣).

## چوارەم: هەڵوێستی مونافیقەکان لە غەزای تەبوك.

کاتێك بانگ کرا بۆ جیهاد و پێغەمبەر(ﷺ) بانگەوازی کرد بۆ ئامادەکردنی سوپاکە، مونافیقەکان خەڵکیان سارد دەکردەوە، دەیانووت: لەم گەرمایە دەرمەچن: ﴿فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓا۟ أَن يُجَٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُوا۟ لَا تَنفِرُوا۟ فِى ٱلْحَرِّ ۗ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَّوْ كَانُوا۟ يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾ فَلْيَضْحَكُوا۟ قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا۟ كَثِيرًا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾(التوبة: ٨١-٨٢).

پێغەمبەریش(ﷺ) بە(الجد بن قیس)ی فەرموو: ئایا ئەمساڵ دەتوانی جیهادی ڕۆمەکان بکەیت؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێگەم بدە نەیەم، نەوەك لە خشتە بچم، سوێند بە خوا کەس و کارەکەم دەزانن کەس نییە ئەوەندەی من حەز لە ئافرەت بکات، دەترسم ئافرەتەکانیان ببینم و خۆم پێ ڕاناگیرێت، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) ڕووی لێ وەرگێڕا و فەرمووی: بەڵێ مۆڵەتت دەدەم، لەسەر ئەو پیاوە ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّى وَلَا تَفْتِنِّىٓ ۚ أَلَا فِى ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُوا۟ ۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ﴾(التوبة: ٤٩). هەندێکیشیان چوونە لای پێغەمبەر(ﷺ) و پاساوی درۆیان دەهێنایەوە بۆ ئەوەی دوابکەون، پێغەمبەریش(ﷺ) ڕێگەی دەدان نەیەن، خوای گەورەیش لەو بارەوە گلەیی لێ کردو فەرمووی: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَتَعْلَمَ ٱلْكَٰذِبِينَ﴾(التوبة: ٤٣).

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ئاگادار کرایەوە کە کەسانێك لە ماڵی سوەیلیمی جولەکە کۆدەبنەوە و خەڵکی سارد دەکەنەوە لە دەرچوون لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) کەسێکی نارد و ماڵەکەی سوتاند.[1]

[1] بڕوانە: السیرة النبویة في ضوء المصادر الاصلیة (٦١٨).

ئەم کارەیش بەڵگەیە لەسەر چاودێری کردنی موسڵمانان بە وردی بۆ کاروباری مونافیق و جولەکەکان و لە باربردنی هەوڵەکانیان لە دژ بانگەوازی ئیسلامی، هەروەها ڕێبازێکی پیرۆزیشە پێویستە هەموو لێپرسراوێك لێیەوە فێر بێت، چۆن ڕووبەڕووی بانگخوازانی بشێوی و مەڵبەندەکانی گومڕاکردن ببنەوە، کە زیان دەگەیەننە تاك و کۆمەڵگا ئیسلامییەکان.[1]

قورئانی پیرۆز باسی هەڵوێستی مونافیقەکانی کردووە پێش غەزاکە و، فەرموویەتی: ﴿لَوْ كَانَ عَرَضًا قَرِيبًا وَسَفَرًا قَاصِدًا لَّاتَّبَعُوكَ وَلَٰكِن بَعُدَتْ عَلَيْهِمُ الشُّقَّةُ ۚ وَسَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَوِ اسْتَطَعْنَا لَخَرَجْنَا مَعَكُمْ يُهْلِكُونَ أَنفُسَهُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾(التوبة: ٤٢). ئینجا باسی ئەوەشی کردووە کە دوای غەزاکە دەیڵێن: ﴿وَسَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَوِ اسْتَطَعْنَا لَخَرَجْنَا مَعَكُمْ يُهْلِكُونَ أَنفُسَهُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ ئەم ئایەتەیش پێش گەڕانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو لە تەبوك.

واتە: ئەوان بە درۆوە دەڵێن: ئەی ئیمانداران گەر بمانتوانیبا لەگەڵتان دەرچین بۆ تەبوك دەردەچووین، بەڵکو ئێمە ناچارین دواکەوین، پاساوی بەهێزمان هەیە بۆ دواکەوتن.[2]

ئینجا خوای گەورە گلەیی کرد لە پێغەمبەرەکەی کە فەرموویەتی: ﴿عَفَا اللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَتَعْلَمَ الْكَاذِبِينَ﴾(التوبة: ٤٣). موجاهید دەڵێت: ئەم ئایەتە لە کەسانێکدا دابەزی دەیانووت: داوای مۆڵەت بکەن لە پێغەمبەری خوا، ئەگەر مۆڵەتی دان و نەدان ئێوە هەر مەڕۆن، ئەوانیش مونافیقەکانن: لەوانە: عەبدوڵای کوڕی ئوبەی و(الجد بن قيس) و(رفاعة بن التابوت)، ژمارەیان سی و نۆ کەس بوون داوای لێبوردنیان کرد بە هەندێ پاساوی درۆینە.[3]

---

١ بڕوانە: الصراع مع الصليبيين (١٢١).
٢ بڕوانە: حديث القران الكريم (٢/٦٤٧).
٣ بڕوانە: التحرير والتنوير (١٠/١٠٩).

پاش ئەم گلەییە نەرم و نیانە، خوای گەورە فەرمووی: ﴿لَا يَسْتَـْٔذِنُكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ أَن يُجَٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَا يَسْتَـْٔذِنُكَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَٱرْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ فَهُمْ فِى رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ﴾(التوبة: ٤٤-٤٥).

ئەمەیش سەرەتای ئەو ئایەتانەیە دابەزین لە جیاوازی کردن لە نێوان مونافیق و ئیماندارەکاندا لە جەنگ، چونکە قورئان ئاشکرای کرد کە خۆ دزینەوە لە جەنگ پیشەی مونافیقەکانە نەك ئیمانداران، بەوەش وەسفکراون ﴿وَٱرْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ واتە: بە گومانن لەوەی تۆ بۆیانت هێناوە و، هەر وەها فەرموویەتی: ﴿فَهُمْ فِى رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ﴾، واتە: دوو دڵ دەبن، پێیەك پێش دەخەن و پێیەك دوا دەخەن و، دامەزراویش نین لە هیچ شتێکدا.[1]

لە ڕاستیدا غەزای تەبوك هەر لە سەرەتای ئامادەکاری بۆی، گونجاو بوو بۆ جیاکردنەوە لە نێوان ئیمانداران و مونافیقەکاندا، هیچ بوارێکیش نەما بۆ ڕووخۆشی لەگەڵ موناتیقەکان، بەڵکو پێویستە ئیتر سنوورێك دابنرێت بۆ دژایەتیان و ڕاوەستانیان لە دژ پێغەمبەر(ﷺ) و بانگەوازی ئیسلامی.[2]

## پێنجەم: ڕاگەیاندنی سەربازگیری و ئامادەکردنی سوپا.

سەربازگیری گشتی ڕاگەیەنرا بۆ غەزای تەبوك و، ژمارەی ئەوانەی دەرچوون لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) گەشتنە سی هەزار کەس، قورئانیش گلەیی کرد لەوانەی ساردییان نواند بەوەی فەرمووی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى ٱلْأَرْضِ ۚ أَرَضِيتُم بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مِنَ ٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ فَمَا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ﴾(التوبة: ٣٨).

---

١ بڕوانە: تفسير ابن كثير (٢/٣٦٠)، التحرير والتنوير (١٠/٢١٠)، حديث القران (٢/ )، تفسير المراغي (٤/١٢٧).

٢ نضرة النعيم (١/٣٨٩).

قورئان داوای کرد لە هەموان دەرچن بۆ جەنگ: ﴿ٱنفِرُواْ خِفَافٗا وَثِقَالٗا وَجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴾(التوبة: ٤١).

پێغەمبەر(ﷺ) توانی سی هەزار کەس لە موهاجیر و ئەنصار و هۆزەکانی تر کۆبکاتەوە، ئەمجارەشیان بە پێچەوانەی جارەکانی ترەوە – جێگای مەبەستی ئاشکرا کرد هەر لە سەرەتاوە.[١]

زانایانیش ئەمەیان کردووەتە بەڵگە کە ڕێدراوە جێگای مەبەست ئاشکرا بکرێت لە کاتی دەرچوون بۆ غەزا، ئەگەر بەرژەوەندی لەوەدا نەبێت بشاردرێتەوە.

هۆکاری ئاشکراکردنی ئاراستەی ڕوولێکراویش ئەمانەی خوارەوە بوون:

١– دووری ڕێگاکە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەیزانی ڕۆیشتن بۆ وڵاتی ڕۆم کارێکی قورسە و، ڕێگاکەیش بیابانە و ئاوی ڕووەکی کەم تیایە و، پێویستە ئامادەکاری لە پێش دەرچوون ئەنجام بدرێت.

٢– زۆری دوژمن و جیاوازییان لەو دوژمنانەی کە پێشتر جەنگیان لەگەڵ کردوون.[٢]

٣– سەختی کاتەکە،بۆئەوەی هەموو کەسێك تەماشای بارودۆخی خۆیبکات و، خەرجی بۆ ئەوانەی لە دوای خۆی بەجێ دەهێنێ دابین بکات.[٣]

٤– نیاز نەما بە شاردنەوە لەم کاتەدا، چونکە هێزێکی ترسناك نەما لە دوورگەی عەرەب پێویست بکات ئەم هێزە گەورەی بۆ کۆبکرێتەوە جگە لە ڕۆمەکان و ئەو عەرەبە هاوپەیمانانە نەبن لەگەڵیان.[٤]

لەڕاستیدا پێغەمبەر(ﷺ)نەرمونیانی دەنواند لە کاتی نەخشەکێشانی جەنگیدا و، ڕەچاوی بەرژەوەندی گشتی دەکرد لە هەردوو حاڵەتی شاردنەوە و، ئاشکراکردن.[٥]

---

١ بڕوانە: الصراع مع الصليبيين (٩٧).

٢ بڕوانە: الرسول القائد (٣٩٨).

٣ بڕوانە: البداية والنهاية (٥/٤).

٤ بڕوانە: غزوة تبوك محمد احمد باشميل (٥٧).

٥ بڕوانە: القيادة في عهد رسول الله (ﷺ) (٥١٠).

کاتێکیش موسڵمانان ئاگادار بوون بە جێگای مەبەست، بە پەلە هاتن بە دەم بانگەوازی پێغەمبەر(ﷺ) کە دەیفەرموو:((من جهز جيش العسرة فله الجنة))،[1] واتە: هەر کەسێك بەشداری بکات لە ئامادەکردنی سوپای عوسرە دەچێتە بەهەشتەوە.

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاری کردە جێنشینی خۆی لە مەدینە و، عەلی کوڕی ئەبو تالیبیشی بەجێ هێشت لەسەر کەس و کارەکەی، ئیتر مونافیقەکان وتیان: بە قورسی زانی و ویستی خۆی لێ سووك بکاتەوە، ئیتر عەلی چەکەکەی هەلگرت و خۆی گەیاندە پێغەمبەر(ﷺ) لەجورووف[2] و وتی: مونافیقەکان وادەڵێن: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی درۆ دەکەن، بەڵکو تۆم کردووە بە جێنشین ی خۆم لەسەر ئەوانەی کە بەجێم هێشتوون، بۆیە بگەڕێرەوە لای کەس وکاری من و خۆتیش، ئایا ڕازی نابیت پلە و پایەت لە لای من وەکو پلە و پایەی هارون بێت لە لای موسا، بەلام هەر ئەوەیە من پێغەمبەر نییە لە دوام،[3] ئینجا عەلی گەڕایەوە بۆ مەدینە.[4]

جێنشینی عەلی(ﷺ) بۆ پێغەمبەر(ﷺ) تایبەت بوو بە مانەوە لە نێو کەس و کارەکانی بە هۆی خزمایەتی، بەلام جێنشینی موحەممەدی کوڕی مەسلەمە لە هەمان غەزادا بۆ کاروباری گشتی بوو، ئیتر ئەوانەی کە ئەم بەجێهێشتنەی عەلی بە بەڵگە دەزانن بۆ خەلیفە بوونی لە پاش پێغەمبەر(ﷺ) بە هەڵەداچوون. چونکە جێنشینی عەلی(ﷺ) بۆ کارێکی تایبەت بوو.[5]

لە کاتی کۆبوونەوەی موسڵمانانیش لە(ثنية الوداع) پێغەمبەر(ﷺ) ئالای هەرە مەزنی دایە دەستی ئەبو بەکری صدیقەوە(ﷺ)، ئالایەکی گەورەی دیکەشی دایە دەستی زوبەیری کوڕی عەووام(ﷺ)، ئالای هۆزی ئەوسیشی دایە دەستی ئوسەیدی کوڕی حوزەیر، ئالای خەزرەجیشی دایە دەستی ئەبو دوجانە و، فەرمانی کرد

---

١ البخاري، كتاب المناقب، باب مناقب عثمان (٢٤٣/٤).

٢ بڕوانە: زاد المعاد (٥٢٩/٣).

٣ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٥٨٩)، البخاري، كتاب المغازي رقم (٤٤١٦).

٤ بڕوانە: زاد المعاد (٥٣٠/٣).

٥ بڕوانە: صور وعبر من الجهاد النبوي في المدينة (٤٦٦–٤٦٧).

هەموو تیرەیەکیش لە ئەنصارەکان ئاڵایەکیان هەبێت،[1] عەببادی کوڕی بیشریش دانرا بۆ پاسەوانێتی تەبوك بە دەوری سەربازگەکە دەسوڕایەوە،[2] چاوساغیش لەم غەزایە(علقمة بن الفغواء الخزاعي) بوو، چونکە شارەزایی چاکی هەبوو لەو ڕێگایە.[3]

ئەم زانیاریانەش تەنها واقیدی دەیگێڕێتەوە، باسکردنیشی لە ڕووی مێژووییەوە زیانی نییە.[4]

توێژەر تێبینی زیادبوونی ژمارەی موسڵمانان دەکات، وەکو جەنگاوەر بە گشتیو، سوارەکان بە تایبەت: بۆ نموونە ژمارەی جەنگاوەران لە غەزای بەدری گەورە سێ سەد و سیانزە جەنگاوەر بوون، لە ئوحود ژمارەیان گەیشتە نزیکەی حەوت سەد جەنگاوەر، لە غەزای ئەحزابدا ژمارەیان گەیشتە سێ هەزار کەس و لە فەتحی مەککە دە هەزار جەنگاوەر دەبوون، لە حونەین دوانزە هەزار جەنگاوەر و، لە غەزای تەبوك ژمارەی جەنگاوەران گەیشتنە زیاتر لە سی هەزار کەس.

ئینجا وەکو سوار تەنها دوو سوار هەبوو لە جەنگی بەدردا، لە غەزای ئوحودیشدا هەر ئەوەندە بوو، بەڵام لە پاش تەنها شەش ساڵ ژمارەکە باز دەدات بۆ دە هەزار سوار بێگومان ئەوەش بە هۆی بڵاوبوونەوەی ئیسلامەوە بوو لە ناو هۆزەکانی بیابان چونکە گرنگی زۆریان دەدا بە ئەسپ و بەخێوکردنی زیاتر لە خەڵکی شار.[5]

---

١ بڕوانە: المغازي (٣/٩٩٦)، الطبقات الكبرى لابن سعد (٣/١٦٦).
٢ بڕوانە: سبيل الهدى والرشاد (٥/٦٥٢)، الصراع مع الصليبيين (٩٩).
٣ بڕوانە: امتاع الاسماع (١/٤٥١)، شرح المواهب اللدنية (٣/٧٢).
٤ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٢/٥٣٢).
٥ بڕوانە: الصراع مع الصليبيين (١٠٠).

## باسی دووەم: چەند ڕووداوێك لە ڕێگاو کاتی گەیشتن بە تەبوك

پـاش ئامـادەکردنی سـوپاکە و بەسـتنی ئاڵاکـان، پێغەمبـەر(ﷺ) بەڕێکـەوت و چاوەڕوانی کەسی نەکرد و دەربارەی ئەوانەش دواکەوتوون دەیفـەرموو: وازیـان لێ بهێنن ئەگەر چاکەیان تیا بێت فریامان دەکەون، ئەگەرنا خـوای گـەورە ئێـوەی لـە ئەوان ڕزگار کردووە.[1]

### یەکەم: بەسەرهاتی(ابو ذر الغفاري).

ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) بەڕێکەوت و کەسانێك دواکەوتن، ئیتر هەر دەیفەرموو وازیـان لێ بهێنن ئەگـەر چـاکەیان تیابێـت خۆیـان فریامـان دەکـەون... وتیان:(ابو ذر)یش دواکەوتووە، پێغەمبەر(ﷺ) هەمان قسەی دووبارە کردەوەوە.

(ابـو ذر) کاتێـك بینـی وشـترەکەی خـاوە، شـتەکانی دا بەکۆڵیـدا و بـە پیـادە بەڕێکەوت، تاکو گەیشتەپێغەمبەر(ﷺ)، لـە دوورەوە موسـڵمانێك وتـی: پیاوێـك بـە تەنیا ڕێدەکات بەرەو لامان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: یاخوا(ابـو ذر) بێـت، وتیـان: بەڵێ خۆیەتی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ڕەحمەتی خوای لێبێت بە تەنها ڕێـدەکات و بە تەنها دەمرێت و بە تەنها زیندوو دەکرێتەوە،[2] ڕۆژگار تێپـەڕی و لـە سـەردەمی عوسمانـدا، هەنـدێك ڕووداو هاتـە پێـشێ و،(ابـو ذر) نێـردرا بـۆ(الربـذة) و لـە کـاتی سەرەمەرگدا، فەرمووی بە خێزانەکەی و خوڵامەکەی: ئەگەر مـردم بمشۆن و کفـنم بکەن و ئینجا لە ناوەڕاستی ڕێگاکە دامبنێن، بـەڵکو کاروانێك تێپـەڕێت بڵـێن ئـەوە تەرمی(ابو ذر)ە، یەکەم کاروانیش کە هات عەبدوڵای کوڕی مەسعودی تیـابوو، کـە زانـی(ابـو ذر)ە مـردووە دابـەزی و دەسـتی کـردە گریـان و فەرموودەکـەی پێغەمبەر(ﷺ)ی بیرکەوتەوە، ئینجا سپاردیان بە خاك،[3] ئـەم بەسـەرهاتەیش چـەند

---

١ بروانە: الاكتفاء بما تضمنه من مغازي رسول الله والثلاثة الخلفاء للكلاعي (٢/٢٧٦).

٢ بروانە: السيرة النبوية لابن هشام (٤/١٧٨).

٣ هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

وانەیەکی تیایە:

١- ئەو ناڕەحەتییەی(ابو ذر) تووشی بوو لە ڕێگا تاکو گەیشتە سوپاکە.

٢- فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ):((رحم الله ابا ذر، یمشي وحده، ویموت وحده، ویبعث وحده))، بەڵگەی ئاشکرایە لەسەر ڕاستێتی پێغەمبەرایەتی موحەممەد(ﷺ).[1]

٣- زانست و بیر تیژی(ابن مسعود) کە ئەو بەسەرهاتەی یەکسەر بیرکەوتەوە.[2]

## دووەم: بەسەرهاتی(ابو خیثمة).

(ابن اسحاق) دەڵێت: لە پاش دەرچوونی پێغەمبەر(ﷺ) بە چەند ڕۆژێك(ابو خیثمة) گەڕایەوە ماڵی خۆی لە ڕۆژێکی زۆر گەرمدا، بینی هەردوو خێزانەکەی دوو کەپریان بۆ ئامادەکردووە لە ناو باخەکەیدا و فێنکیان کردووەتەوە و خواردنیان ئامادەکردووە، ئەویش تەماشای کرد و وتی: پێغەمبەری خوا لەبەر گەرمای خۆر بێت و لە ناو تۆز و ڕەشەبا،(ابو خیثمة)یش لە سێبەری فێنك و خواردنی خۆش و ئافرەتی جوان لە ماڵی خۆیدا، ئەمە هەرگیز دادگەری نییە! ئینجا وتی: دانانیشم تاکو توێشووم بۆ ئامادە نەکەن بەڵکو بگەمە پێغەمبەر(ﷺ)، لە ڕێگە پێش گەیشتن بە تەبوك لەگەڵ(عمر بن وهب الجمحی) بوون بە هاوڕێ، کە گەیشتنە تەبوك(ابو خیثمة) داوای کرد لە عومەیر دواکەوێت و وتی: من گوناهێکم هەیە، با من پێش تۆ بچمە لای پێغەمبەر(ﷺ)، جا کاتێك نزیك بوویەوە، خەڵکەکە وتیان: سوارێك بەرەو لامان دێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: یاخوا(ابو خیثمة) بێت، وتیان: بەڵێ خۆیەتی، ئیتر هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و سڵاوی لێکرد، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: ئەوە چاکترە ئەی(ابو خیثمة)، ئینجا دوعای چاکەی بۆ کرد.[3]

---

١ بڕوانە: الصراع مع الصلیبیین (١٢٩)، التاریخ الاسلامي للحمیدي (١١٤/٨).

٢ بڕوانە: التاریخ الاسلامي (١١٤/٨).

٣ بڕوانە: البدایة والنهایة (٨/٥).

لەم بەسەرهاتەیش چەند پەندێك وەردەگرین:

**١- موسڵمان خاوەنی ویژدانی زیندووە:**

چونكە(ابو خیثمة) ڕازی نەبوو لە خۆشی و ناز و نیعمەتدا بێت و، پێغەمبەر(ﷺ) لە ناڕەحەتیدا بێت، بۆیە ویژدانی ئاگادار بوویەوە و، ڕێگای دوور و دوڵ و شیوی بڕی تاكو گەیشتە پێغەمبەر(ﷺ)، ئەم دیمەنە ڕەفتاری موسڵمانە لە خوا ترسەكانمان بۆ دەردەخات لە ساتەكانی لاوازیدا، كە دواتر دەگەڕێنەوە بۆ حاڵەتێكی ئیمانی چاكتر وەكو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ﴾(الاعراف: ٢٠١).(ابو خیثمة) هەر هەستی بە تاوان دەكرد تاكو گەیشتە لای پێغەمبەر(ﷺ) لە تەبوك و ڕەزامەندی ئەوی بەدەست هێنا.[١]

**٢- ناسینی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ هاوەڵانی:**

كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: یا خوا(ابو خیثمة) بێت، چاك هاوەڵانی خۆی دەناسی و شارەزای خەسڵەتەكانیان بوو، چونكە پێغەمبەر(ﷺ) تێكەڵاوی هەموویانی دەكرد و، گوێی لێ دەگرتن و، لەگەڵیان ڕێی دەكرد.[٢]

**٣- وەرەبەرزی و ئارامگرتنی(ابو خیثمة):**

بڕوانە لەو بڕیارەی كە وەریگرت، گەشتێكی یەكجار ناخۆشی لەبیابانێكی وشك و ناخۆش، ئەو بڕیارە سەختەی وەرگرت و جێبەجێشیی كرد.[٣]

**٤- گلەیی سەركردە بۆ سەرباز كاریگەری خۆی هەیە:**

(ابو خیثمة) گەیشت و دانیشتا بە تاوانی خۆیدا، پێغەمبەر(ﷺ) كە پێی فەرموو:((اولى لك يا ابا خيثمة))، واتە: خەریك بوو تیابچیت، بە واتایەكی تر

١ بڕوانە: التاريخ الاسلامي (٨/١١١-١١٢).
٢ بڕوانە: الصراع مع الصليبيين (١٣٣).
٣ هەمان سەرچاوە (١٣٣-١٣٤).

گوناهەکەی خستە پێش چاوی، چونکە سەرکردە نابێت بێ دەنگ بێت لەسەر هەڵەی سەربازەکانی، چونکە لەوانەیە زیان بە خۆیان و کەسانی تر بگەیەنن، بەڵکو پێویستە لەسەری هەڵەکەی چاك بکاتەوە و لێپرسینەوە لەگەڵ ئەنجامدەری بکات، بەم شێوەیش دەبنە ڕێپیشاندەر و پەروەرشیار.[١]

## سێیەم: گەیشتن بە تەبوك.

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتە تەبوك هیچ شوێنەوارێکی نەبینی بۆ هێزەکانی ڕۆمان و هۆزە عەرەبەکان، سەرەڕای مانەوەی موسڵمانان لەوێ بۆ ماوەی بیست ڕۆژ ڕۆمەکان بیریان لەوە کردەوە بێنە جەنگ لەگەڵیان، فەرمانڕەواکانی دەوروبەری شامیش بە باشیان زانی ئاشتی بکەن و سەرانە بدەن، پادشای ئەیلە هێسترێکی سپی و پۆشاکێکی نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و لەسەر ئەوە ڕێکەوتن سەرانە بدەن بە موسڵمانان، ئینجا خالیدی کوڕی وەلیدیش لەگەڵ چوارسەد سوار ڕۆیشت بۆ(دومة الجندل) و توانی پادشاکەیان(اكيدر بن عبدالملك الكندى) بە دیلی بگرێت، لەو کاتەی ناوبراو لە ڕاو بوو،[٢] بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵی ڕێککەوت لەسەر سەرانە، ئینجا موسڵمانان سەرسام بوون لە جوانی ئەو کەوای پادشاکە لەبەریدا بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا لەوە سەرسام دەبن؟ سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە دەسەسڕەکانی سەعدی کوڕی موعاز لە بەهەشتدا لەوە جوانترە.[٣] دەشگێڕنەوە دەستکەوتەکانی(اكيدر) گەشتە(٨٠٠) کۆیلە و(١٠٠٠) وشتر و(٤٠٠) قەڵغان و(٤٠٠) ڕم، ئینجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێککەوتننامەی بەست لەگەڵ خەڵکی(جرباء) و(اذرع)[٤] و(مقنا)[٥] کە بە گوێرەی ئەو ڕێککەوتنە پێویستە ئەوان ساڵانە سەرانە بدەنە موسڵمانان و لە ژێر دەسەڵاتی موسڵماناندا بن، بەم شێوەیش پێغەمبەر(ﷺ) زاڵبوو بە سەر ئەو ئیمارەتانەی کەوتوونەتە باکووری

---

١ بڕوانە: الصراع مع الصليبيين (١٣٤).
٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (١٨٠/٤).
٣ هەمان سەرچاوە (باسناد جيد).
٤ المغازي (١٠٣٢/٣).
٥ بڕوانە: الوثائق السياسية في عهد النبوة والخلافة الراشدة (١١٩–١٢٤).

دوورگەی عەرەبیەوەو بە هۆیەوە توانی سنووری باکووری دەوڵەتی ئیسلامی بپارێزێت[١] و توانیان باڵی ڕۆمەکان ببڕن، چونکە ئەو هۆزانە سەر بە گاورەکان بوون، لە ڕاستیشدا ئەوان بە ئەمەك بوون بەرامبەر ڕێککەوتنەکە و سەرانەکەیان دەدا بە ئەوپەڕی بێ دەنگی و ملکەچیەوە،[٢] ئەمەیش سیاسەتێکی ژیرانە بوو پێغەمبەر(ﷺ) ڕەچاوی کرد لەوەی نێوان موسڵمانان و ڕۆمەکانی دابڕی بە هەندێ میرنشینی کە گوێڕایەڵییان دەربڕی بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدینیشدا ئەو هۆزانە بوونە هێڵی ئاسانکاری بۆ فتوحاتی ئیسلامی.[٣]

## چوارەم: ڕاسپاردەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ سوپاکە لە کاتی تێپەڕبوونیان بە(حجر ثمود).

(ابو کبشة الانصاري) ﷺ دەفەرمووێت: لە غەزای تەبوك، خەڵکی پەلەیان دەکرد و، دەچوونە حیجری سەمودەوە، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) خەڵکەکەی کۆکردەوە و، فەرمووی: بۆچی دەچنە لای کەسانێك حوا ڕقی لێهەڵگرتوون، ئیتر پیاوێك وتی: سەرسام دەبین پێیان ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ئایا ئاگادارتان نەکەمەوە لە شتی لەوە سەیرتر؟ پیاوێکە لە خۆتان ئاگادارتان دەکات لە هەواڵی ڕابوردوو و داهاتوو، ئێوە لەسەر ڕێگای ڕاست بن و ڕاستی بپێکن، چونکە خوای گەورە باکی نییە لەوەی سزاتان بدات، کەسانێکیش دێن هیچ بەرگرییەکیان پێ ناکرێت لە خۆیان.[٤] هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: مەچنە شوێنەواری ئەو کەسانەی ستەمیان لە خۆیان کرد، مەگەر بە گریانەوە لە ترس ئەوەی تووشی ئەوان هات تووشی ئێوەیش نەیەت، ئینجا بە توندی لە وڵاخەکەی خوڕی و بەجێی هێشت.

پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێ کردن پەند وەربگرن لەو جێگایە و، ڕق و کینی خوای گەورەیان بێتەوە یاد لە دژ ئەوانەی خوا و پێغەمبەریان خستووەتە درۆوە، قەدەغەشی کرد لێیان سوود لە هیچ شتێك وەربگرن لەو شتانەی لەو جێگایەدایە،

---

١ بڕوانە: الصراع مع الصليبيين (٢١٧).
٢ عن الصادق العرجون (٤/٤٧٩).
٣ بڕوانە: الصراع مع الصليبيين (٤/٤٧٩).
٤ بڕوانە: الفتح الباري (٢١/١٩٥).

تەنانەت ئاویش، فەرمانیشی پێکردن بگرین، یان خۆیان بهێننە گریان، ئەگەر ئەوانیش وەکو ئێمە بە لای ئەو شوێنەوارانەدا تێپەڕبوونایە، تووشی سزای خوای گەورە دەبوون، چونکە ئەوان بە چاوی خۆیان موعجیزەکانی پێغەمبەر(ﷺ)یان بینی.

خوای گەورە لەبەر ئەوە باسی نەتەوە پێشووەکانی بۆ کردووین پەندی لێ وەرگرین، بۆیە ئەگەر ئەو شوێنەوارانەمان بینی، پێویستە پەندی لێ وەرگرین، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك بەوێدا تێپەڕ بوو بە پۆشاکەکەی خۆی داپۆشی و وڵاخەکەی خێرا کردەوە.[١]

## پێنجەم: مردنی هاوەڵ(عبدالله ذو البجادین) ﷺ.

عەبدوڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەفەرمووێت: شەو نوێژم دەکرد لە غەزای تەبوکدا، بینیم بڵێسەیەکی ئاگر لە لایەکی سەربازگەکەوە پەیدا بوو، دەڵێت: منیش تەماشام کرد پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبو بەکر و عومەر لەوێن و(عبدالله ذو البجادین) گیانی سپاردووە و، ئەوان خەریکن بە خاکی دەسپێرن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: براکەتانم بۆ نزیك بکەنەوە، ئەوانیش شۆڕیان کردەوە و، کاتێك لە جێگای خۆی داینا، فەرمووی: خوایە من لە ئەو ڕازیم، تۆیش لێی ڕازی بە، عەبدوڵای کوڕی مەسعود دەڵێت: وتم: خۆزگە من خاوەن ئەو گۆڕە بووایەم.[٢]

(ابن هشام) دەڵێت: هۆی ناونانی بە(ذو البجادین)[٣] ئەوە بوو، حەزی دەکرد موسڵمان بێت و کەس و کارەکەی ڕێگەیان لێ دەگرت، تاکو وازیان لێ هێنا بە پۆشاکێکی ئەستوورەوە و هیچی تر، ئەویش هەڵهات و کاتێك نزیك بوویەوە لە پێغەمبەر(ﷺ) پۆشاکەکەی دڕی و کردی بە دوو پارچە، یەکێکیان بۆ دەرپێ و، یەکێکیان بۆ سەرەوەی لەشی پێداپۆشی. ئینجا هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئیتر ناویان نا(ذو البجادین).[٤]

---

١ بڕوانە: صور وعبر من الجهاد النبوي في المدينة (٤٨٠).

٢ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٥٩٨).

٣ بجاد: پۆشاکێکی ئەستوور و زبرە.

٤ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (١٨٢/٤).

لەم سەرگوزشتەیش چەند وانە و حوکمێك وەردەگرین:

**١- ڕێزلێنانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ سەربازەکانی بە زیندوویی و مردوویی:**

چونکە ئەو هاوەڵانە گیانی خۆیان دەکردە قوربانی ئیسلام و ماڵ و منداڵیان بەجێ دەهێشت، بۆیە دەبینین پێغەمبەر(ﷺ) بەو شێوە ڕێزیان لێ دەگرێت و بە خاکیان دەسپێرێت و دوعایان بۆ دەکات، ئەم ڕێزلێنانە دەبێتە هاندەر بۆ ئەوانی تر کە ئازادی بنوێنن لە گۆڕەپانی شەڕدا، دەشتوانین بڵێین: چاودێری کردنی سەرکردەی موسڵمانان بەم شێوازە پێشەنگێکی سەربازییە، سیستەم و دەستوورە دانراوەکان شتی وایان بە خۆیانەوە نەبینیووە پاش هەڵاتنی خۆری ئیسلام نەبێت.[1] لە هەموو مێژووی سەرکردە و سەرۆکەکانیشدا خۆبەکەمزانینی لەو جۆرە نابینی کە پێغەمبەر(ﷺ) کردی لەگەڵ یەکێك لە سەربازەکانی، کە بە دەستی خۆی بیخاتە دوا ئارامگایەوە، ئینجا بشپارێتەوە لە پەروەردگاری جیهان و ڕابگەیەنێت کە خۆی لەو کەسە ڕازییە.[2]

**٢- ناشتنی مردوو بە شەو:**

چونکە پێغەمبەر(ﷺ) تەرمی عەبدوڵای بە شەو شاردەوە، سوننەتیش وایە مردوو پەلە بکرێت لە ناشتنی، هەروەها ڕێدراوە موسڵمان خۆشی دەرببڕێت، بە کاری چاکە بێتە ڕێی وەکو دێتە ڕێی براکەی، ئەمەیش پێچەوانەی ئێرەییە، چونکە حەسوودی بریتی یە لە ئاوات خواستن بەلاچوونی نیعمەتێك لەسەر کەسێك، نموونەی ئەوەیش کاتێك عەبدوڵای کوڕی مەسعود گوێی لە پاڕانەوەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو بۆ(ذو البجادين) ئاواتی خواست خۆی لەناو گۆڕەکەدا بووایە. ئەوە وشەی کەسێکە باوەڕی تەواوی هێنابێت بە خوا و ڕۆژی دوایی.[3]

---

١ بڕوانە: المدخل الى العقيدة والاستراتيجية العسكرية الاسلامية (٢٩٩).

٢ بڕوانە: صور وعبر من الجهاد النبوي في المدينة (٤٧٢).

٣ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٥٩٨)، معين السيرة (٤٥٢).

## شەشەم: هەندێك لەو موعجیزانەی ڕوویاندا لە غەزاکە.

### ١- خوای گەورە بە پاڕانەوەی پێغەمبەرەکەی هەور دەنێرێت:

کاتێك موسڵمانان لە(حجر ثمود) تێپەڕبوون ئاویان پێ نەما و، هاواریان هێنایە لای پێغەمبەر(ﷺ) و داوای بارانی بۆ کردن، خوای گەورەیش پەڵە هەورێکی نارد و خەڵکەکە تێر ئاو بوون و لێشیان هەڵگرت، ئیبنو ئیسحاق لە کەسێك دەگێڕێتەوە لە مەحمودی کوڕی لەبیدی پرسییە: ئایا خەڵکی مونافیقەکانیان دەناسی؟ وتی: بەڵێ سوێند بە خوا... کەسانێك لە خزمەکانم پێیان وتم: پیاوێکی مونافیق بوو گومان نەبوو لە مونافیقی ئەو پیاوە، هەمیشە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوو، کە ئەو بارانە باری لە حیجر، پێیان وت: تەماشا دەکەیت؟ ئایا دوای ئەمە هیچی تر هەیە؟ ئەویش وتی: هەورێکە و تێدەپەڕێت.[1]

### ٢- هەواڵی مردنی پێغەمبەر(ﷺ):

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕێگای تەبوك بوو، وشترەکەی ڕێی ون کرد، ئیتر هاوەڵان دەرچوون بۆ سۆراغی، لەو کاتەیش یەکێك لە هاوەڵان لە لای پێغەمبەر(ﷺ) بوو ناوی(عمارة بن حزم) کە بەشداری جەنگی بەدریشی کردبوو. جا(زید بن اللصیت القینعانی) کە مونافیق بوو لەگەڵ عومارە بوو لە جێگاکەی، دەیووت: موحەممەد بانگەشەی ئەوە دەکات پێغەمبەرە و هەواڵی ئاسمانتان بۆ دەهێنێت، کەچی نازانێت وشترەکەشی لە کوێ ونبووە، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) لەو کاتەی عومارەی لە لا بوو، فەرمووی: ئەو پیاوە وا دەڵێ و... سوێند بە خوا من هەر ئەوە دەزانم کە خوا فێری کردووم، خوای گەورەیش ئاگاداری کردمەوە وشترەکە لە کوێیە، لە فلانە دۆڵ و شوێنە، هەوسارەکەی گیر بووە لە دارێك، بۆیە بڕۆن بۆم بهێننەوە. ئینجا عومارە گەڕایەوە جێگەکەی خۆی و باسی ئەو بەسەرهاتەی کرد، پیاوێك لەوێ بوو وتی: سوێند بە خوا ئەو قسەیە زەید کردی پێش ئەوەی تۆ بگەیتە ئێرە، ئینجا عومارە دەستی کردە لێدان لە گەردنی زەید و،

---

[1] بڕوانە: السیرة النبویة لابن هشام (١٧٦/٤)، صور وعبر من الجهاد النبوي في المدینة (٤٧٣).

دەیووت: کارەساتێك لە لامە و ئاگادار نیم، دەرچۆ ئەی دوژمنی خوا هاوڕێتیم مەکە ئیتر، ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: هەندێك دەڵێن دوایی زەید تەوبەی کردووە، هەندێکیش دەڵێن هەر لەسەر ئەو بیرو باوەڕە تیاچووە.[1]

**٤- زۆربوونی ئاو لە چاوگەی تەبوك و، باسکردنی خۆشگوزەرانی داهاتوو:**

(معاذ بن جبل) ﷺ لە پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ئێوە سبەی بە پشتیوانی خوای گەورە دەگەنە چاوگەی تەبوك لە چێشتەنگا، هەرکەسێ لە ئێوە گەیشتە ئەوێ با دەست لە ئاوەکەی نەدات، دوو پیاو لە پێشدا گەیشتبوونە لای کانییەکە و ئاوی زۆر کەم بوو، پێغەمبەر(ﷺ) لێی پرسین: ئایا دەستتان لە ئاوەکەی دا؟ وتیان: بەڵێ، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) لێیان توڕە بوو، قسەی پێکردن، ئینجا کەم کەم بە دەستیان هەندێك لە ئاوەکەیان کۆکردەوە لە ناو شتێکدا و، پێغەمبەر(ﷺ) دەستی و دەم و چاوی تیا شۆرد و، دووبارە کردییەوە ناو کانییەکە و، ئینجا ئاوێکی زۆری لێ هەڵقوڵا و خەڵکی ئاویان لێ خوارد.[2] ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بە موعازی فەرموو:((یوشك یا معاذ ان آلت بك حیاة ان ترى هاهنا جناناً)).[3]

واتە: دوور نییە ئەی موعاز ئەگەر تەمەن بوارت بدات ئەم وشکانییە ببینی بووەتە باخ و بێستان، لە ڕاستیدا ئەو ناوچەیە زۆر وشك و بێ ئاو بوو، بەڵام خوای گەورە لەسەر دەستی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ئاوەی زۆر کردەوە و، ئەوەش تەنها بۆ ئەوە نەبوو سوپاکە پێویستی لە ئاو دابین ببێت، بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) ڕایگەیاند کە ئەو ئاوە هەر بەردەوام دەبێت تاکو باخ و بێستانی پڕ بەروبوومی لێ دروست دەبێت، بەڵێنەکەی پێغەمبەریش(ﷺ) هاتە دی و، پاش ماوەیەك و، تاکو ئەمڕۆیش هەر پڕە لە باخ و دارخورما، وەکو شایەتییەك لەسەر ڕاستگۆیی پێغەمبەرایەتی موحەممەد(ﷺ).[4]

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٤/١٧٧).
٢ صحيح مسلم بشرح النووي (١٥/٤١)، مختصر مسلم (١٥٣٠).
٣ صحيح مسلم بشرح النووي (١٥/٤١)، الفتح الرباني (٢١/١٩٦).
٤ بڕوانە: الصراع مع الصليبيين (١٤٢).

**٥- زۆربوونەوەی خواردن:**

(ابو سعيد الخدري) دەفەرمووێت: لە غەزای تەبوکدا خەڵکی تووشی برسێتی بوون و، داوایان کرد پێغەمبەر(ﷺ) رێگەیان بدات وشترەکانیان سەربڕن، ئەویش رێگەی پێدان، بەڵام عومەر هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەگەر وا بکەن وڵاخ نامێنێت بۆ سواربوون، بەڵام با خواردنەکانیان بهێنن و دوعایان بۆ بکە، ئەوانیش خواردنەکانیان هێنا تاکو بڕێك کۆبوویەوە لە گەنمەشامی و، خورما و نان، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) دوعای زۆر بوونەوەی کرد و پێی فەرموون: قاپەکانتانی لێ پڕ بکەن و، ئەوانیش هەرچی قاپیان هەیە پڕیان کرد و هەندێکیشی لێ مایەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((اشهد ان لا اله الا الله واني رسول الله))، هەرکەسێ بەم قسانەوە بچێتە لای خوا بێ ئەوەی هیچ گومانێکی لێی هەبێت، دەچێتە بەهەشتەوە.[١]

## حەوتەم: ئاخاوتنی قورئانی پیرۆز دەربارەی هەڵوێستی مونافیقەکان لە غەزاکەدا.

پیاوێك لە غەزای تەبوکدا وتی: کەسمان نەبینیوە ئەوەندەی ئەمانەی کە قورئانیان لەبەرە، ورگن و درۆزن ترسنۆکتر، پیاوێك لەو کۆڕە دانیشتبوو وتی: درۆت کرد، بەڵکو مونافیقی، دەبێت ئەم قسەیە بگەیەنم بە پێغەمبەری خوا(ﷺ)، دوای ئەوە قورئان دابەزی لەسەر ئەم قسانە عەبدوڵا دەڵێت: من ئەو پیاوەم بینی دەستی گرتبوو بە پەتی ژێر سکی وشترەکەی پێغەمبەر(ﷺ)و بەبەرد لێی دەدا ئازاری پێ دەگەیاند، دەیووت: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە گاڵتەمان دەکرد، پێغەمبەریش(ﷺ) دەیفەرموو: ئایا بە خوا و ئایەتەکانی و پێغەمبەرەکەی گاڵتەتان دەکرد؟

لە ریوایەتی قەتادەشدا هاتووە: لە غەزای تەبوکدا هەندێ مونافیق لە لای پێغەمبەر(ﷺ) بوون، وتیان: ئەم پیاوە بە تەمایە تەلارەکانی شامی بۆ بکرێتەوە،

---

١ الفتح الرباني (٢١/١٩٦-١٩٨).

دووره دووره، ئیتر خوای گەورە پێغەمبەرەکەی ئاگادار کردەوە و، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوانە بگرن با نەڕۆن، ئینجا هاتە لایان و فەرمووی: ئاوها و ئاوهاتان وتووە؟ وتیان ئەی پێغەمبەری خوا گاڵتەمان دەکرد، ئیتر خوای گەورە ئایەتی لەسەر دابەزاندن:[1] ﴿ يَحْذَرُ الْمُنَافِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِي قُلُوبِهِمْ ۚ قُلِ اسْتَهْزِئُوا إِنَّ اللَّهَ مُخْرِجٌ مَّا تَحْذَرُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴾(التوبة: ٦٤-٦٥).

واتە: ئایا هیچتان دەستنەکەوت بۆ گاڵتە و گەپی خۆتان – وەکو بانگەشە دەکەن – فەرز و حوکمەکانی خوا و ئایەتەکان و پێغەمبەرەکەی نەبێت کە هاتووە بۆ ڕێنموونیتان، ئینجا خوای گەورە ئاشکرای کرد کە ئەو گاڵتە و گەپەیان سەری لە کوفرەوە دەرکرد: ﴿ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ۚ إِن نَّعْفُ عَن طَائِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ ﴾(التوبة: ٦٦).

واتە: باسی ئەو پاساوە مەکەن بۆ دوورخستنەوەی ئەو تاوانە لە خۆتان، چونکە کوفر کردن بە مەبەستی گاڵتەکردن ڕەوا نییە، کەواتە پۆزشتان دانپێدانە بۆ تاوانەکەتان وەکو دەڵێن: پۆزشەکەتان ناشیرین ترە لە تاوانەکەتان.[2] ئینجا کە دەفەرمووێت: ﴿إِيمَانِكُمْ ۚ إِن نَّعْفُ عَن طَائِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ ﴾، واتە: ئەگەر لە هەندێکتان خۆش بین بە هۆی گەڕانەوەیان بۆ لای خوا – وەکو مخشن بن حمیر – کۆمەڵێکی ترتان ئازار دەدەین بەهۆی سووربوونیان لەسەر تاوانەکەیان.[3]

---

١ بڕوانە: الدر المنثور للسيوطي (٤/٢٣٠).
٢ بڕوانە: تفسير المراغي (٤/١٥٣).
٣ هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

**ب- ئازاردانی پێغەمبەر(ﷺ) ئیمانداران و هەوڵی ڕەشەکوژی پێغەمبەر(ﷺ):**

خوای گەورە ئەم ئایەتەی لەسەر مونافیقەکان دابەزاند: ﴿ يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ مَا قَالُوا وَلَقَدْ قَالُوا كَلِمَةَ الْكُفْرِ وَكَفَرُوا بَعْدَ إِسْلَامِهِمْ وَهَمُّوا بِمَا لَمْ يَنَالُوا وَمَا نَقَمُوا إِلَّا أَنْ أَغْنَاهُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ مِنْ فَضْلِهِ فَإِنْ يَتُوبُوا يَكُ خَيْرًا لَهُمْ وَإِنْ يَتَوَلَّوْا يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ عَذَابًا أَلِيمًا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَمَا لَهُمْ فِي الْأَرْضِ مِنْ وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴾(التوبة: ٧٤).

(ابن كثير) دەگێڕێتەوە کە کۆمەڵێك لە مونافیقەکان خەریك بوو پێغەمبەر(ﷺ) بکوژن لە کاتی غەزای تەبوکدا، لە دە کەس زیاتر بوون، ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند.[١]

ئینجا مونافیقەکان یەکیان دەگرت جنێویان دەدا بە پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی ئیتر ئەو قسانە گەیشتە حوزەیفە و ئەویش گەیاندییە پێغەمبەر(ﷺ) و فەرمووی: ئەی مونافیقەکان ئەو قسە چییە کردووتانە؟ ئیتر سوێندیان خوارد قسەی وایان نەکردووە و، خوای گەورەیش بە درۆی خستنەوە لەو ئایەتەدا.[٢]

واتای ئایەتەکەیش ئەوەیە: سوێند دەخۆن کە ئەو قسانەیان نەکردووە، خوایش دەیانخاتە درۆوە و دەیسەلمێنێت کە ئەوان وشەی کوفریان لە دەم دەرچووە کە لێیان دەگێڕنەوە، قورئانیش باسی ئەو وشەیەی نەکردووە چونکە نابێت باس بکرێت.[٣]

---

١ تفسير ابن كثير (٢/٣٧٢).

٢ بڕوانە: اسباب النزول للواقدي (٢٥١).

٣ بڕوانە: حديث القران الكريم (٢/٦٦٥).

## باسی سێیەم: گەڕانەوە لە تەبوکەوە بۆ مەدینەو باسکردنی قورئان دەربارەی دواکەوتووەکان لەو غەزایەو باسی مزگەوتی(الضرار).

پاش مانەوەی بیست ڕۆژ لە تەبوك، پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە بۆ مەدینە،[١] فەرمانیشی کرد بە ڕوخاندنی مزگەوتی(الضرار) کە لە لایەن مونافیقەکانەوە دروستکرابوو، کاتێك نزیك بوونەوە لە مەدینە، منداڵەکان دەرچوون بۆ(ثنية الوداع) بۆ پێشوازی کردن، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) دوو ڕکات نوێژی کرد لە مزگەوتەکەی و لەگەڵ خەڵکی دانیشت، ئیتر ئەوانەی کە دواکەوتبوون لە غەزاکە دەهاتن و داوای لێبوردنیان دەکرد، هەندێکیان پاساوی شەرعی یان هەبوو، هەندێکیشیان پاساویان نەبوو، بەڵام خوای گەورە تەوبەیانی وەرگرت، هەندێکیشیان لە مونافیقی عەرەبە بیابانشینەکان بوون ، هەندێکیان لە مونافیقانی مەدینە بوون.

### یەکەم: دوواکەوتووەکان کە پاساوی شەرعییان هەبووە خوای گەورەیش پاساوەکەیانی وەرگرت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا۟ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩١﴾ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا۟ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا۟ مَا يُنفِقُونَ ﴾(التوبة: ٩١-٩٢).

خوای گەورە باسی ئەم کۆمەڵەی کردووە کە هیچ لۆمەیەکیان لەسەر نییە لە دواکەوتنەکەیاندا مەبەستیش لە(الضعفاء) نەخۆش و بە ساڵاچووەکانن، یان منداڵ و شێتەکانن... پەسەندیش ئەوەیە کە ئەوان نەخۆش و، کوێر و، بە تەمەن و، لە

---

[١] بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٦٠٣).

لاوازن، نەخۆشیش مەبەست لەو کەسانەیە نەخۆشیەکەیان ڕێگرە لە دەرچوونیان بۆ جەنگ.[١]

﴿وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ﴾

واتە: ئەوانەی ئەوەندە خەرجییان نییە بیانگەیەنێتە غەزاکە: ﴿إِذَا نَصَحُوا۟ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾، واتە: ئەگەر هەق و ڕاستیان ناسی و، خۆشەویستانی خوایان خۆشویست و ڕقیان لە دوژمنانی بوو.[٢] ﴿مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ ۚ وَٱللَّهُ﴾ تەبەری دەڵێت: ئەو کەسەی کە چاکە دەکات و ئامۆژگاری دەکات لەو کاتەی دواکەوتووە لە پێغەمبەر(ﷺ) بۆ جیهاد، هیچ ڕێگایەك نییە بگیرێتە بەر بۆ سزادانی.[٣]

قورتوبی دەڵێت: ئەمە بنچینەیەکە بۆ لاچوونی داواکردن لەسەر کەسی پەککەوتوو،...[٤] ﴿ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ ﴾.

پەیوەندی هەیە بە ئایەتەکەی پێش خۆیەوەن وەکو بابەخدانیشە بە ئەوان، جیای کردوونەتەوە لە باسکردنەکەدا ﴿أَلَّا يَجِدُوا۟ مَا يُنفِقُونَ﴾.

واتە: تەنگی و گوناه نییە لەسەر لاواز و نەخۆشەکان و ئەوانەش کە خەرجیان نییە، ئەگەر لە جیهاد دوابکەون، هەروەها لەسەر هەژارە ئیماندارەکان ﴿إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ﴾ کە داوات لێ دەکەن وڵاخیان بۆ دابین بکەیت بۆ ئەوەی دەرچن لەگەڵت(قلت) پێیان دەڵێیت ئەی موحەممەد ﴿لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ﴾، واتە: ناتوانم هیچتان بۆ دابین بکەم ﴿تَوَلَّوا۟ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا

---

١ بڕوانە: زاد المسير (٤/٤٨٥).

٢ بڕوانە: تفسير القرطبي (٨/٢٢٦).

٣ بڕوانە: تفسير الطبري (١٠/٢١١).

٤ بڕوانە: تفسير القرطبي (٨/٢٢٦).

﴾، واتە: دەگەڕێنەوە و چاوەکانیان فرمێسکی پیا دێتە خوارەوە لە خەفەتدا، چونکە ئەوەندە پارەیان نییە خەرجی بکەن لە پێناو دەرچووندا بۆ جیهاد، وڵاخیشیان نییە سواری بن بۆ تەبوک.[1]

## دووەم: دواکەوتووەکان کە پاساوی شەرعییان نییە و خوایش لێیان خۆش بوو.

١- خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَءَاخَرُونَ ٱعۡتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمۡ خَلَطُواْ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ﴾(التوبة: ١٠٢). واتە: ئەو کۆمەڵە بەبێ هیچ پاساوێکی شەرعی لە شەڕەکە دواکەوتوونە و، ئینجا پەشیمان بوونەتەوە، درۆیشیان نەکردووە، وەکو مونافیقەکان، بەڵکو تەوبەیان کردووە لە گوناهەکانیان، مەبەستیش لە(العمل الصالح) کارە چاکەکانیانە پێش ئەم غەزایە، مەبەستیش لە(العمل السيئ) دواکەتنیانە لە ئەم غەزایە. تەنها داننانیش بە تاوان تەوبە نییە، بەڵکو پێویستە پەشیمانی لەگەڵدا بێت، هەروەها جارێکی تریش نەگەڕێتەوە بۆی.

﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡۚ﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تەوبەیان کردووە، چونکە(عسى) لە قسەی خوای گەورەدا ڕوودانی شتەکەیە. چونکە لە لای خوای گەورەیە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ﴾، واتە: لە تاوانەکان خۆش دەبێت.

٢- خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَءَاخَرُونَ مُرۡجَوۡنَ لِأَمۡرِ ٱللَّهِ إِمَّا يُعَذِّبُهُمۡ وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيۡهِمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾(التوبة: ١٠٦). ﴿مُرۡجَوۡنَ﴾ مەبەست لە(هلال بن امية) و(كعب بن مالك) و(مرارة بن الربيع)ە، وەکو لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە. ئەوان لە غەزاکە دواکەوتبوون، پاش ئەوەی خەریکیش بوو لەگەڵیان دەربچن، بەڵام نەیانتوانی، دەرنەچوونیشیان بە هۆی نیفاقەوە نەبوو، حاشا لە ئەوان دڵسۆزیش بوون، جا کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە، ئەوان وتیان: ئێمە هیچ پۆزش و

---

[1] بڕوانە: حديث القران الكريم (٢/٦٧٢-٦٧٣).

پاساوێکمان نییە، تاوان نەبێت، داوای لێبوردنیان نەکرد، خۆیشیان نەبەستەوە بە کۆڵەکەی مزگەوتەکەوە و، وەکو ئەبو لوبابە و هاوەڵانی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد موسڵمانان لێیان دوور بکەنەوە، وەکو دواتر باسیان دەکەین.

٣- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ وَضَاقَتۡ عَلَيۡهِمۡ أَنفُسُهُمۡ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلۡجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيۡهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡ لِيَتُوبُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾(التوبة: ١١٨). مەبەستیش لەو کەسەیە و ئەم ئایەتە لەسەر ئەوان دابەزییوە.

## سێیەم: دواکەوتووەکان لە مونافیقانی عەرەبە بیابانشینەکانی دەوروبەری مەدینە.

ئەوانەی کە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: وَجَآءَ ٱلۡمُعَذِّرُونَ مِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ لِيُؤۡذَنَ لَهُمۡ وَقَعَدَ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾(التوبة: ٩٠).

## چوارەم: دواکەوتووەکان لە مونافیقانی مەدینە.

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ فَرِحَ ٱلۡمُخَلَّفُونَ بِمَقۡعَدِهِمۡ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓاْ أَن يُجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُواْ لَا تَنفِرُواْ فِي ٱلۡحَرِّۗ قُلۡ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّاۚ لَّوۡ كَانُواْ يَفۡقَهُونَ ﴿٨١﴾ فَلۡيَضۡحَكُواْ قَلِيلًا وَلۡيَبۡكُواْ كَثِيرًا جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٨٢﴾ فَإِن رَّجَعَكَ ٱللَّهُ إِلَىٰ طَآئِفَةٍ مِّنۡهُمۡ فَٱسۡتَـٔۡذَنُوكَ لِلۡخُرُوجِ فَقُل لَّن تَخۡرُجُواْ مَعِيَ أَبَدًا وَلَن تُقَٰتِلُواْ مَعِيَ عَدُوًّاۖ إِنَّكُمۡ رَضِيتُم بِٱلۡقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَٱقۡعُدُواْ مَعَ ٱلۡخَٰلِفِينَ ﴾(التوبة: ٨١-٨٣).

تێبینیشمان کرد پێغەمبەر(ﷺ) بە شێوەیەکی جیاواز مامەڵەی لەگەڵ مونافیقەکاندا کرد، چونکە نەرمی نواند لەگەڵیان، لە کاتێکدا توندی و سزادانی بەکارهێنا لەگەڵ موسڵمانەکاندا، بێگومان ئەو توندییە ڕێزگرتن بوو لە ئەوان، مونافیقەکانیش شایانی ئەو ڕێزە نین خوای گەورە ئایەت دەربارەی تەوبەکردنیان دابەزێنێت، چونکە بێباوەڕن، حوکمە دونیاییەکانیان لەسەر جێبەجێ بکەین،(ابن القيم) دەفەرمووێت: ئا بەم شێوە خوای گەورە تەمێی بەندە ئیماندارەکەی دەکات کە خۆشی دەوێ و ڕێزی هەیە لە لای، بە بچووکترین گوناه، بۆ ئەوەی هەمیشە وریا بێت، بەڵام ئەوەیە کە لە پێش چاوی کەوتووە، وازی لێ دێنێت خۆی و تاوانەکانی، هەرکە تاوانێکیش دەکات نیعمەتێکی دەداتێ.[1]

**پێنجەم: مزگەوتی:**( الضرار).

لە کاتی گەڕانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بەرەو مەدینە، ئەم ئایەتانە دابەزی: ﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًا بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِمَنْ حَارَبَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ مِنْ قَبْلُ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَا إِلَّا الْحُسْنَى وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿١٠٧﴾ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا لَمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَنْ تَقُومَ فِيهِ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَنْ يَتَطَهَّرُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾﴾(التوبة: ١٠٧-١٠٨). هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزانە: پێش هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەدینە، پیاوێك لە خەزرەج هەبوو(ابو عامر الراهب)ی پێ دەوترا، لە سەردەمی جاهیلیدا بووبووە گاور، پیاوێکی بەڕێزبوو لەناو عەشیرەتەکەی خۆی، بەڵام کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) هاتە مەدینە و موسڵمان لە دەوری کۆبوونەوە، ئەبو عامر دەستی کردە دژایەتی ئایینی خوا و، هەڵهات بۆ مەککە، جا لە ڕۆژی ئوحوددا ئەم بێباوەڕە هەندێ چاڵی لە نێو ڕیزەکاندا هەڵکەندبوو، پێغەمبەر(ﷺ) کەوتە ناو یەکێکیانەوە، ددانی پیرۆزی شکا و سەریشی بریندار بوو، لە سەرەتای جەنگەکەشەوە ئەبو عامر هات و بانگی

[1] بڕوانە: زاد المعاد (٣/٥٧٨).

ئەنصارەکانی کرد بۆ ئەوەی واز لە پێغەمبەر(ﷺ) بهێنن، ئەوانیش وتیان: خوا چاوی کەست پێ گەش نەکاتەوە، ئەی ناپاکی دوژمنی خوا، ئەویش دەیووت: خزمەکانم پاش خۆم خراپیان بەسەر هاتووە، پێغەمبەریش(ﷺ) پێشتر بانگی کردبوو بۆ ئیسلام و ڕازی نەبووبوو، بۆیە دوعای لێکرد و لە دووریدا بە دەربەدەری بمرێت، دوعاکەی پێغەمبەر(ﷺ)ی لێ گیربوو، چونکە پاش جەنگی ئوحود ڕۆیشت بۆ لای هیرەقل بۆ هاندانی لەسەر جەنگی موسڵمانان، هەر لەوێ مایەوە و نامەی نووسی بۆ مونافیقەکانی مەدینە و، داواشی لێ کردبوون جێگایەك دروست بکەن وەکو مەڵبەندێك بێت ئەگەر گەڕایەوە لایان، ئەوانیش ئەو مزگەوتەیان دروست کردو داوایان کرد پێغەمبەر(ﷺ)نوێژی تیا بکات، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) دوای خست تاکو گەڕانەوەی لە تەبوك، پێش گەڕانەوەشی جیبریل ئاگاداری کردەوە لە مەبەستیان لە دروست کردنی مزگەوتەکە بۆیە پێش گەیشتنی پێغەمبەر(ﷺ) بە مەدینە فەرمانی کرد ئەو مزگەوتەیان ڕوخاند.[1]

**واتای ئایەتە پیرۆزەکان:**

١- (الضرار لغیرهم) زیان گەیاندن بە خەڵکانی تر جگە لە خۆیان.

٢- بێباوەڕی بە خوای گەورە و بە هێزکردنی مونافیقەکان.

٣- جیاوازی لە نێوان ئیمانداران، چونکە ویستیان ئەوان ئامادە نەبن لەو مزگەوتە، بەو شێوەیش دووبەرەکی دروست دەبێت.

٤- ئامادەکاری بۆ ئەو کەسەی دژایەتی خوا و پێغەمبەر(ﷺ) دەکات.[2]

خوای گەورەیش هەوڵەکانی لە باربردن و، پیلانەکەی پووچەڵ کردنەوە، کاتێك فەرمانی کرد بە پێغەمبەرەکەی بیڕوخێنێت.

(ولیحلفن ان اردنا الا الحسنی)سەرزەنشتە بۆیان لەسەر سوێندە درۆینەکانیان و، ناڕاستەکانیان، بۆیە خوای گەورە فەرموویی: ﴿والله یشهد انهم لکاذبون﴾.

ئینجا خوای گەورە نوێژکردنی لەسەر پێغەمبەرەکەی و ئیمانداران لەو مزگەوتە

---

١ بڕوانە: تفسیر ابن کثیر (٢/٣٨٨).

٢ بڕوانە: تفسیر الشوکاني (٢/٤٠٣).

قەدەغە کرد: ﴿ لَا تَقُمۡ فِيهِ أَبَدٗاۚ لَّمَسۡجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقۡوَىٰ مِنۡ أَوَّلِ يَوۡمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِۚ فِيهِ رِجَالٞ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُطَّهِّرِينَ ﴾(التوبة: ١٠٨).

قەدەغەکردنی نوێژی پێغەمبەر(ﷺ) لەو مزگەوتە، بۆ ئەوە بوو نوێژکردنی نەبێتە مایەی پیرۆزی بۆی و، موسڵمانانیش ئیتر هیچ جیاوازییەك نابینن لە نێوان مزگەوتی قوبا و ئەو مزگەوتە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە عەمماری کوڕی یاسر و، مالیکی کوڕی دوخشوم و هەندێك لە هاوەڵان، کە بچن ئەو مزگەوتە بڕوخێنن و بسوتێنن، ئەوانیش فەرمانەکەیان بەجێهێنا.[1]

(ابن عاشور) پێی وایە مەبەست لە ﴿مسجد اسس علی التقوی﴾ مزگەوتێکە ئەوە شێوازی بێت، نەك مزگەوتێکی دیاری کراو، بۆیە ئەم پیاهەڵدانە بە گشتی خۆی لە دوو مزگەوتدا دەبینێتەوە: مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) و مزگەوتی(قباء)[2].

﴿فِيهِ رِجَالٞ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْۚ﴾ ئیبنو ماجە دەگێڕێتەوە کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی کۆمەڵی ئەنصار، خوای گەورە ستایشتانی کردووە بە پاکی و پاراوی، هۆکاری چییە؟ وتیان: دەست نوێژ دەگرین بۆ نوێژ و خۆمان دەشۆرین لە جەنابە و خۆمان پاك دەکەینەوە بە ئاو. فەرمووی: ئەوەیە، وازی لێ مەهێنن،[3] لە بەسەرهاتی مزگەوتی(الضرار) هەندێك پەند و وانە وەردەگرین، لەوانە:

**١- کوفر یەك میللەتن:**

ئەبو عامر زۆر ناڕەحەت بوو بە شکستی بتپەرستان لە بەدر و، دژایەتی خۆی ئاشکرا کرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ)و ڕۆیشت بۆ پایتەختی بتپەرستی لە مەککە بۆ ئەوەی خەڵکەکەی هان بدات لەسەر جەنگی موسڵمانان، لە جەنگی ئوحودیشدا هەوڵیدا ڕیزی موسڵمانان تێك بدات..خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿♦ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعۡضُهُمۡ

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (١٨٤/٤).
٢ التحرير والتنوير (٣١/١١).
٣ سنن ابن ماجة، كتاب الطهارة، باب الاستنجاء بالماء (٢٢٧/١).

أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۚ إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِى ٱلْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ ﴾الانفال: ٧٣).

**٢- هەوڵی فێڵ کردن لە موسڵمانان:**

موونافیقەکان هەوڵیان دەدا کارەکەیان بە کارێکی شەرعی بناسێنن، بۆیە داوایان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی تیابکات، چونکە بەو شێوە شەرعییەت وەردەگرێت و ئەوانیش ئامانجەکانیان دێتەدی، ئەمەیش شێوازێکە لە تەڵەکەبازی لە زۆر کەس تێیەڕ دەبێت.[1]

**٣- خوای گەورە چاکترین پارێزەرە و، لە هەموو کەسێکیش بە بەزەیی ترە:**

توێژەر بۆی دەردەکەوێت چاودێری خوای گەورە چەند زۆر بووە لەسەر پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە نهێنی ئەو موونافیقانەی ئاشکرا کرد، ئەگەر وایش نەبوایە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە نیازیان نەدەگەیشت و نوێژی لەو مزگەوتە دەکرد و خەڵکیش بە دوای ئەودا نوێژیان لەو مزگەوتە دەکرد...[2]

**٤- چارەسەری یەکلاکەرەوەی پێغەمبەر(ﷺ):**

فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) بە ڕوخانی مزگەوتەکە چاکترین چارەسەر بوو، پێویستە سەرکردەکانی ئوممەتیش لەمەوە فێربن چۆن ئەو هەولانە لەبار ببەن کە ئامانجی ئەوەیە موسڵمانان پەرتەوازە بکەن، نەخۆشی کوشندەیش پێویستی بە بنەبڕکردنە، بۆ ئەوەی سەرهەڵنەداتەوە، بەرهەمی کردەییش کە موسڵمانان هەستیان پێکرد لە ئەنجامی ئەم چارەسەکردنە دەریدەخات کە ئەوە چاکترین ڕێگاچارە بوو بۆ ئەم کێشەیە، لە پاش ئەم ڕووداوەیش موونافیقەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لاوازتر دەبوون، تەنانەت تا ئەو کاتەی پێغەمبەر(ﷺ) دونیای بەجێهێشت چەند کەسێکی کەمیان مابوو، جارێکی تریش هیچ هەوڵێکیان بە ئەنجام نەگەیاند لە شێوەی هەوڵی پێشوویان.[3]

---

١ الصراع مع الصليبيين (١٧٩-١٨١).

٢ هەمان سەرچاوە.

٣ بڕوانە: التاريخ الاسلامي (٨/١٣٠).

**٥- ئەوەی حوکمی وەکو حوکمی مزگەوتی(الضرار)ە:**

**أ ـ زەمەخشەری دەڵێت:**

وتراوە، هەموو مزگەوتێکیش بۆ خۆ هەڵکێشان و ڕووپامایی و ناوبانگ دروست کرابێت، یان بۆ هەر مەبەستێك جگە لە خوای گەورە، یان بە ماڵێکی حەرام دروست کرابێت، ئەوەیش حوکمی وەکو حوکمی ئەو مزگەوتەیە.[1]

دکتۆر(عبدالکریم زیدان) پەراوێزی داناوە لەسەر قسەکەی زەمخشەری و وتوویەتی: بەڵام ئایا وەکو ئەو مزگەوتە پێویستە بڕوخێنرێت؟ وا نازانم، بەڵام وەکو ئەو مزگەوتەیە لە ڕووی ئەوەی لە پێناو خوا دروست نەکراوە.[2]

**ب ـ قورتوبی دەڵێت: زانایانمان وتوویانە:**

هەموو مزگەوتێك بۆ ڕوپامایی و ناوبانگ و زیان گەیاندن دروست بکرێت هەروەکو(ضرار)ە و دروست نییە نوێژی تیا بکرێت.[3]

**ج ـ (سید قطب) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت:**

ئەم مزگەوتە کە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)دا دروست کرا پیلانێك بوو بۆ موسڵمانان، تاکو ئێستاش لە چەندین شێوازدا هەر دروست دەکرێت، وەکو چالاکییەك ڕواڵەتی بۆ ئیسلام و، ناوەڕۆکەکەی بۆ لەناوبردنی ئیسلام و ناشیرین کردنیەتی، وەکو لافیتە و دروشمێك خۆیان لە پشتیەوە حەشار دەدەن، یان خۆی لە شێوەی ڕێکخستن و کتێب و توێژینەوە و دەبینێتەوە باسی ئیسلام دەکات، بۆ ئەوەی کەسە پاڕاکان سڕ بکەن کە تەماشا دەکەن هەوڵ دەدرێت ئیسلام لەناو ببرێت، بەڵام چونکە سڕ بوون... هەر دەڵێن مەسەلەکە پێویست بە خەم خواردن ناکات.[4]

---

١ بڕوانە: تفسیر الکشاف (٢/٣١٠).

٢ بڕوانە: المستفاد من قصص القران (٢/٥٠٤).

٣ بڕوانە: تفسیر القرطبي (٨/٣٥٤).

٤ في ظلال القران (٣/١٧١٠-١٧١١).

**٦- بنەمایەك بۆ زانینی ئەوەی وەکو مزگەوتی(الضرار)ە:**

دکتۆر(عبدالکریم زیدان) دەڵێت: هەموو شتێك بە ڕواڵەت شەرعی بێت و، ئەنجامدەرانیشی مەبەستیان شەرعی نییە، ئەوە پاشکۆی مزگەوتی(ضرار)ە...[١]

بە پێی ئەم بنەمایەیش ئەوەی پێشەوا(ابن القیم) باسی کردووە، لە شوێنەکانی تاوانکردن و خراپەکاری وەکو مەیخانە و ئەو جۆرە شوێنانە، پاشکۆ نین بۆ مزگەوتی(ضرار) چونکە ئەمانە ڕواڵەتیشیان هەر ناشەرعیە، ئەگەرچی پێویستیش دەکات لا ببرێت....[٢]

**٧- مزگەوتەکانی(ضرار) لە وڵاتی موسڵمانان:**

تا ئەمڕۆیش دوژمنانی ئیسلام لە مونافیق و مولحید و بڵاوکەرەوانی خاچپەرستی، چەندین جێگا دروست دەکەن بۆ خواپەرستن و خۆویستی وا نییە، بەڵکو بۆ لێدانی خودی ئیسلام دامەزرێنراوە، هەروەها قوتابخانە دروست دەکەن بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی ژەهرەکانیان لە نێو ڕۆڵەی موسڵماناندا و لادانیان لەسەر ئایینەکەیان،بەڵکو نەخۆشخانە دروست دەکەن بە ناوی پارێزگاری لە تەندروستی و خزمەتی مرۆڤایەتی،کەچی مەبەستیشیان لەخشتە بردنی نەخۆش و لاوازەکانە و، لە ڕاستیدا شوێنە هەژارەکانی وەکو ئەفریقیایان کردووەتە مۆڵگایەك بۆ گەیشتن بە مەبەستە نەگریسەکانیان.[٣]

مزگەوتی(ضرار) ڕووداوێك نەبوو لە کۆمەڵگای ئیسلامی یەکەم و ببڕێتەوە، بەڵکو بیرۆکەیەکە هێشتا هەرماوەتەوە، بەوردی نەخشەی بۆ دەکێشرێت و،هۆکاری ورد و بەهێزی بۆ هەڵدەبژێردرێت، هەموویشی لە پێناو پیلان گێڕانە بۆ ئیسلام و ناشیرین کردنی و گۆڕینی ڕاستیەکان و چاندنی تۆوی ئاژاوە و دوورخستنەوەی خەڵکی لە ئایینەکەیان و، سەرقاڵکردنیان بەو شتانەی دوارۆژیان خراپ دەکات.[٤]

---

١ بڕوانە: المستفاد من قصص القران (٢/٥٠٧).

٢ هەمان سەرچاوە (٢/٥٠٧).

٣ بڕوانە: السیرة النبویة لابي شهبة (٢/٥٠٨).

٤ بڕوانە: الصراع مع الصلیبیین (١٨٢).

## باسی چوارەم: بەسەرهاتی ئەو سێ کەسەی کە دواکەوتن

بەسەرهاتی ئەم سێ کەسە لەسەر زاری کەعبی کوڕی مالیك(ﷺ) باسکراوە لە کتێبەکانی ژیاننامەی پێغەمبەر(ﷺ) و فەرموودە و، تەفسیر، بە چەند ڕیوایەتێك نزیکن لە یەکترەوە، صەحیحی بوخاریش بە وردترین شێوە باسی ئەو بەسەرهاتەی کردووە.

کەعبی کوڕی مالیك(ﷺ) خۆی باسمان بۆ دەکات و دەفەرمووێت: لە هیچ غەزایەك دوانەکەوتم لە پێغەمبەر(ﷺ) لە تەبوك نەبێت، لە غەزای بەدریش دواکەوتبووم بەڵام کەس لەسەر دواکەتنی لۆمە نەکرا...

لە شەوی عەقەبەیش لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووم، تەنانەت ئاواتم نەدەخواست لە جیاتی ئەوە ئامادەی بەدر بووایەم، ئەگەرچی بەدر زیاتر لە نێو خەڵکیدا باسدەکرێت، من لە کاتی غەزای تەبوکدا لە هەموو کاتێکم بە توانا و خۆشگوزەرانتر بووم، هەرگیز پێشتر دوو وڵاخم پێکەوە نەبوو پێش کاتی ئەو غەزایە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) لە هیچ غەزایەکدا ڕاستەوخۆ باسی نەدەکرد بۆ کوێ دەچێت، جگە لەم غەزایە، کە لە کاتی گەرمایەکی سەختدا بوو، ڕێگەکەشی زۆر دوور بوو، بۆیە بە ڕاشکاوی باسی ئاڕاستەی غەزاکەی کرد، بۆ ئەوەی موسڵمانان ئامادەیی خۆیان وەرگرن، ژمارەی موسڵمانانیش زۆر بوو لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ)، بەڵام تۆمارگەیەك نەبوو ناوی هەموویانی تیادا کۆکرابێتەوە، بۆیەهەر کەسێك بیویستایە دواکەوێت دەرنەدەکەوت، ئەگەر وەحی ئاشکرای نەکردایە.

پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوو بۆ ئەو غەزایە لە کاتێکدا بەروبووم و سێبەر خۆش بوویوو، ئەوان ئامادەبوون و منیش دەستم کردە خۆئامادەکردن، بەڵام دەگەڕامەوەو، هیچم دیار نەبوو، لە دڵی خۆمدا دەموت: من توانای دەرچوونم هەیە، کات تێپەڕ دەبوو و، منیش هێشتا خۆم ئامادە نەکردبوو، وتم: لە پاش دەرچوونیان بە ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ فریایان دەکەوم، هەر بڕیارم دەدا و جێبەجێم نەدەکرد، تاکو تەواو دوورکەوتنەوە خەریك بوو دەربچم و خۆزگە دەربچوایەم،

بەڵام قسمەتم نەبوو، کە دەردەچووم بۆ بازاڕ، جێگای داخ بوو، ئەوانەی دەمبینین یان مونافیق بوون یان کابرایەکی لاواز بوو کە خوا ڕێگەی داوە دواکەوێت، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) باسی منی نەکرد تاکو گەیشتە تەبوك، ڕۆژێکیان لەوێ فەرمووی: کەعب چی کرد؟ پیاوێك لە بەنی سەلەمە وتی: جلەکانی و لەخۆبایی بوونی دوای خست، موعازی کوڕی جەبەل وتی: بە ڕاستی قسەیەکی خراپت کرد، سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەر جگە لە چاکە هیچمان لێی نەبینیووە، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) بێ دەنگ بوو، لەو کاتە پیاوێکی پۆشاك سپی بینی تراویلکە دەیشاردەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: یاخوا(ابو خیثمة) بێت و، ئەو بوو، هەر ئەویش بوو کە کەمێك خورمای بۆ غەزاکە بەخشی و مونافیقەکان تانەیان لێدا، کەعبی کوڕی مالیك دەڵێت: کاتێك زانیم سوپاکە بەرەو مەدینە دەگەڕێتەوە، خەم و خەفەت دایگرتمەوە، ئینجا دەمووت: سبەی چۆن لە تووڕەیی پێغەمبەر(ﷺ) دەربچم، لەو بارەشەوە پەنام بردە بەر هەموو کەسێکی ژیر و هۆشمەند لە کەس و کارم، کاتێك وتیان پێغەمبەری خوا نزیك بوویەوە، نیازی پووچەڵم لەسەر لاچوو، دڵنیاش بووم کە بە هیچ شتێك ڕزگارم نابێت، بۆیە بڕیارمدا قسەی ڕاست بکەم، کە پێغەمبەر(ﷺ) دەگەڕایەوە مەدینە، سەرەتا دوو ڕکات نوێژی دەکرد لە مزگەوتەکە ئینجا بۆ خەڵکی دادەنیشت، کاتێك ئەوەی کرد، دواکەوتووەکان دەهاتن و پۆزشیان دەهێنایەوە، سوێندیان دەخواردو زیاتر لە هەشتا کەس دەبوون، پێغەمبەر(ﷺ) قسەکانی لێ وەرگرتن و داوای لێخۆش بوونی بۆ کردن، ڕاستی ئەوانیشی هەواڵەی خوا کرد، منیش هاتم و، سەلامم کرد، پێغەمبەر(ﷺ) زەردەخەنەیەکی کرد وەکو زەردەخەنەی تووڕەکراو فەرمووی: وەرە، منیش ڕۆیشتم لەبەر دەستیدا دانیشتم، فەرمووی: بۆ دواکەوتی؟ ئایا وڵاخت نەکڕیبوو؟ وتم: بەڵێ، سوێند بە خوا ئەگەر لە لای کەسێکی دونیا ویست دانیشتایەم، دەمتوانی لە توڕەیی دەربچم، لە ڕاستیدا توانای قسەکردنیشم هەیە، بەڵام بە خوا! دڵنیام ئەگەر ئەمڕۆ درۆیەکت لەگەڵ بکەم و ڕازیت بکەم، دوور نییە خوای گەورە تۆ تووڕە بکات لێم، ئەگەر قسەیەکی ڕاستیش بکەم و دلگران بیت لێم، خوازیارم لە

خوای گەورە سەرەنجامی باش بێت، نە سوێند بە خوا، هیچ پاساوێکم نەبوو، سوێند بە خوا، هەرگیز ئەوەندەی ئەو کاتە بە توانا و خۆشگوزەرانتر نەبووم کە دواکەوتم لەو غەزایە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەمە ڕاستی کرد، هەڵسە تاکو خوای گەورە حوکم دەکات لەم مەسەلەی تۆ، پیاوانێك لە بەنی سەلەمە شوێنم کەوتن و پێیان وتم: سوێند بە خوا پێشتر نەتمانبینیووە گوناهێکت کردبێت، ئایا نەتتوانی پۆزشێك بۆ پێغەمبەری خوا بهێنیتەوە، وەکو ئەوانی تر، ئەوەندە بەس بوو کە تەوبەت بکردایە و پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێخۆشبوونی لە خوا بۆ بکردایەیت، سوێند بە خوا ئەوەندە سەرزەنشتیان کردم تاکو خەریك بوو بگەڕێمەوە لای پێغەمبەر(ﷺ) وتم: کەسی تر ئەم قسەی منیان کردووە، وتیان: بەڵێ دوو کەسی تر، ئەوانیش ئەم قسانەی تۆیان کرد، هەمان وەڵامی تۆش درانەوە، وتم: کێ بوون؟ وتیان:(مرارة بن الربيع العمري)و (هلال بن امية الواقفي) باسی دوو پیاویان بۆ کردم ئامادەی بەدر بوونە و، پێشەنگێکی باشن، کاتێك باسی ئەو دوو کەسەیان بۆ کردم ڕۆیشتم، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) لە نێوان هەموو ئەوانەی دواکەوتن لە غەزاکە، قەدەغەی کرد لە موسڵمانان قسە لەگەڵ ئەو سێ کەسەدا بکەن، ئیتر خەڵکی لێمان دوورکەوتنەوە و، هەموویان گۆڕان بەرامبەرمان، تەنانەت هەستم کرد زەویش بەرامبەرم گۆڕاوە، ئەو زەوییە نییە کە دەمناسی، پەنجا شەو بەو شێوەماینەوە، دوو هاوڕێکەم لە ماڵ دانیشتن و دەگریان، بەڵام من لەوان لاوتر و بەهێزتر بووم، دەردەچووم و، دەچوومە نوێژەکان و لە بازاڕ دەگەڕام ، بەڵام کەس قسەی لەگەڵ نەدەکردم، ئینجا دەهاتمە نوێژەکان سڵاوم لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد و لە دڵی خۆمدا دەموت: ئایا لێوی جوڵانەوە بۆ وەڵامی سەلامەکەم؟ ئینجا لە نزیکی نوێژم دەکرد و، بە دزی سەیرم دەکرد، ئەگەر بڕۆیشتایەم بۆ نوێژ تەماشای دەکردم، ئەگەر تەماشام بکردایە ڕووی لێ وەردەگێڕام، کاتێك ئەم حاڵە هەر بەردەوام بوو، چوومە سەر دیواری ماڵی ئەبو قەتادە، کە ئامۆزام بوو، زۆریش خۆشەویست بوو لە لام، سڵاوم لێکرد بەڵام سڵاوەکەی وڵام نەدامەوە، وتم: ئەی ئەبو قەتادە سوێندت دەدەم بە خوا، ئایا تۆ نازانی من خوا و پێغەمبەرم خۆشدەوێت؟ بێدەنگ بوو،

دووبارەم لێ کردەوە هەر بێدەنگ بوو، سێیەم جار سوێندم دا، وتی: خوا و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، فرمێسکی چاوم هاتە خوارێ و گەڕامەوە، ئینجا بە ناو بازاڕی مەدینەدا ڕێم دەکرد، یەکێکم بینی لەو جوتیارانەی لە شامەوە دێن و خواردن دەهێنن بۆ مەدینە دەیفرۆشن، وتی: کێ کەعبی کوڕی مالیکم پێ نیشان دەدا، ئیتر خەڵکەکە ئاماژەیان بۆ من کرد، ئەویش هات و نووسراوێکی لە پادشای غەسسانەوە دایە دەستم، تیایدا نووسرابوو: پێمان گەیشتووە کە هاوەڵەکەت لالووت بووە لێت، خوایش تۆی نەخستووەتە وڵاتی شەرمەزاری و لەناوچوون، بۆیە وەرە لامان دڵنەواییت بکەین، کاتێك خوێندمەوە وتم: ئەمەیش بەڵایەکی تر، نامەکەم برد و خستمە نێو تەنوورەکەوە، کاتێك دە ڕۆژی مابوو بۆ تەواو بوونی پەنجا ڕۆژەکە، کەسێك لە لای پێغەمبەری خواوە هات و، فەرمانی پێکردم لە خێزانەکەم دوور کەومەوە، وتم: لێی جیاببمەوە یان چی بکەم؟ وتی: نەخێر تەنها نزیك مەبەرەوە لێی، هاوڕێکانیشم هەر وایان پێوترا.

دەڵێت: بە خێزانەکەم وت: برۆ لای کەس و کارت تاکو خوای گەورە لەم مەسەلەیە حوکم دەکات، ئینجا خێزانەکەی هیلالی کوڕی ئومەییە چووە لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: مێردەکەم پیاوێکی پیرە و کەس نییە بەخێوی بکات، ئایا پێت ناخۆش نییە خزمەتی بکەم؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵام نزیك نەکەوێتەوە، وتی: سوێند بە خوا هەر خەریکی گریانە لەو ڕۆژەوە، منیش هەندێك پێیان وتم: داوای مۆڵەت بکە لە پێغەمبەر(ﷺ) خێزانەکەت لە لا بمێنێتەوە، وتم: نەخێر، چوزانم پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامی چۆن دەبێت، کە من پیاوێکی گەنجم، دەڵێت: دە شەوی تر بەو شێوە مامەوەو بووە پەنجا ڕۆژ لەو ڕۆژەوە قسەمان لەگەڵ نەدەکرا، نوێژی بەیانیم کرد، لەسەربانی خانوویەك بووم یادی خوام دەکردو زۆر ناڕەحەت بووم، دونیام لێ تەنگ بووبوو، گوێم لە بانگکەرێك بوو لەسەر کێوی(سلع)ەوە هاواری دەکرد: ئەی کەعبی کوڕی مالیك مژدەت لێ بێت، منیش یەکسەر سوجدەم برد بۆ خوا و، زانیم گوشادیمان بۆ هات، لە کاتی نوێژی بەیانیشدا پێغەمبەر(ﷺ) خەڵکی ئاگادار کردەوە لە وەرگیرانی تەوبەکەمان، خەڵکی پیرۆزباییان لێ دەکرین، چەند

کەسێکیش بەرەو لای هاورێکانم ڕۆیشتن، کەسێکیش بەسەر ئەسپێکەوە هاتە لامو کەسێکی تریش لە ئەسلەم بە پەلە هاتە لام بەڵام دەنگی سەر کێوەکە پەلەتر بوو لە ئەسپەکە، کاتێك موژدەدەرەکە هاتە لام، هەردوو پۆشاکەکەم داکەند و پێم بەخشی، لەو ڕۆژەیشدا هەر ئەوەم بوو، دوو پۆشاکی ترم خواست و لەبەرم کرد، ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و خەڵکی دەستە دەستە دەهاتنە لام پیرۆزبایی تەوبەکەیان لێ دەکردم، کەعب دەڵێت: چوومە مزگەوتەکەو پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبوو، خەڵکیش بە دەوریدا بوون، تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵا بە ڕاکردن هاتە لامو تەوقەی لەگەڵ کردم و پیرۆزبایی لێ کردم، سوێند بە خوا کەس لە موهاجیرەکان هەڵنەسا جگە لە ئەو، هەرگیزیش بۆی لەبیر ناکەم، کەعب دەڵێت: کاتێك سڵاوم کرد لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە ڕوویەکی گەشەوە پێی وتم: مژدەت لێ بێت بە چاکترین ڕۆژ تێپەڕبووە بە سەرتدا لەو ڕۆژەوە لە دایك بوویتە، وتم: ئایا لە تۆوەیە ئەی پێغەمبەری خوا یان لە لای خواوەیە؟ فەرمووی: بەڵکو لە لای خواوەیە، پێغەمبەر(ﷺ) کە دڵی خۆش دەبوو ڕوومەتی وەکو مانگ دەدرەوشایەوە، ئینجا لەبەر دەستی دانیشتم و، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، هەرچیماڵم هەیە دەیکەمە خێر بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەندێك ماڵت با بمێنێت چاکترە، وتم: کەواتە، بەشەکەی خەیبەرم دەهێڵمەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، خوای گەورە بە ڕاستگۆیی ڕزگاری کردم، بۆیە هەتا ماوم هیچ قسەیەك ناکەم ڕاستی نەبێت، سوێند بە خوا کەس ناناسم لە ڕێگەی ڕاستگۆییەوە ئەوەندەی من چاکەی دەستکەوتبێت، لەو ڕۆژەشەوە هەرگیز درۆیەکم نەکردووە، داواکارم خوای گەورەیش بمانپارێزێت لەوەندەی تەمەنم ماوە، دەڵێت: ئینجا خوای گەورە ئایەتەکانی دابەزاند: ﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِى سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِى سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ

بَعۡدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٖ مِّنۡهُمۡ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّهُۥ بِهِمۡ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿١١٧﴾ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ وَضَاقَتۡ عَلَيۡهِمۡ أَنفُسُهُمۡ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلۡجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيۡهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡ لِيَتُوبُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾(التوبة: ١١٧-١١٩).

گەورەترین نیعمەتی خوای گەورە لەسەرم پاش موسڵمانێتی، ڕاستگۆییم بوو لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)، خوای گەورە باسی ئەوانەی کردووە کە درۆیان کرد و فەرمووی: ﴿سَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمۡ إِذَا ٱنقَلَبۡتُمۡ إِلَيۡهِمۡ لِتُعۡرِضُواْ عَنۡهُمۡۖ فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمۡۖ إِنَّهُمۡ رِجۡسٞۖ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٩٥﴾ يَحۡلِفُونَ لَكُمۡ لِتَرۡضَوۡاْ عَنۡهُمۡۖ فَإِن تَرۡضَوۡاْ عَنۡهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَرۡضَىٰ عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾(التوبة: ٩٥-٩٦).

ئێمە سێ کەسەکە دوای ئەوانە ڕۆیشتین کە چوونە لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش پاساوەکانی لێ قبووڵ کردن و مەسەلەی ئێمەی دواخست، بۆیە خوای گەورە دەربارەمان فەرمووی: ﴿وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ وَضَاقَتۡ عَلَيۡهِمۡ أَنفُسُهُمۡ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلۡجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيۡهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡ لِيَتُوبُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾(التوبة: ١١٨).

ئەو دواخستنەیش خوای گەورە باسی کرد، مەبەست لە دواکەوتنمان بوو پاش ئەوانەی کە سوێندیان خوارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش لێی وەرگرتن.[١]

---

١ البخاري، كتاب المغازي رقم (٤٤١٨)، صحيح السيرة النبوية (٦١٤).

ئەم بەسەرهاتە چەند وانە و پەندێکی لێ وەردەگرین:

١- شێوازی جوان و ڕەوشتی بەرز:

ئەم فەرموودەیە بە شێوازێکی جوان باسکراوە، لە ئاستێکی بەرزدایە لە ڕووی وێژەییەوە، لە ڕاستیدا ئەم فەرموودە و هاوشێوەکانی وەکو فەرموودەی ئاشتی حودەیبیە و، فەرموودەی ئیفك نموونەی بەرزن بۆ وێژەی عەرەبی بەرز، خۆزگە ئەوانەش کە هەڵدەسن بە دانانی سیستەمی خوێندن ئەم جۆرە فەرموودانە وەربگرن.[١]

٢- ڕاستگۆیی کەشتی ڕزگارییە:

کەعب و، هیلال و، مەرارە، ترسناکی درۆیان بۆ ئاشکرا بوو، بۆیە بڕیاریان دا بە ڕاشکاوی قسە بکەن و ڕاستگۆ بن، با تووشی تەنگژە و ناڕەحەتیش بن، بەڵام هیوایان بە خوا گەورە بوو تەوبەیان لێ قبووڵ بکات و بگەڕێنەوە نێو ڕیزی ئیسلام، خوای گەورەیش لە کۆتایی باسی تەوبەکەیاندا فەرموویەتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴾(التوبة: ١١٩).

٣- وازلێهێنانی پەروەردەیی و کاریگەری لەسەر کۆمەڵگا:

وازلێهێنانی پەروەردەیی سوودی زۆرە بۆ کۆمەڵگای موسڵمان و، ڕێگە دەگرێت لە ئەندامەکانی تووشی سەرپێچی بن، چونکە هەست دەکەن ئەگەر تووشی ئەو جۆرە سەرپێچیانە ببن ئەندامەکانی کۆمەڵگای وازیان لێ دەهێنن ئەوانیش ئیتر بیرناکەنەوە لە ئەنجامدانی ئەو کارە.

بێگومان جێبەجێکردنی ئەم حوکمەیش پێویستە کە لە بارودۆخێکی هاوشێوەی کۆمەڵگای سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) ئەنجام دەدرێت، چونکە لەو حاڵەتە دەوڵەت بە دەسەڵاتە، کۆمەڵگایش بەهێزە، مەترسیش نییە جێبەجێکردنی ئەو حوکمە ببێتە مایەی لە خشتەچوونی کەسەکە. ئەم وازلێهێنانەش جیاوازە لەگەڵ

١ بڕوانە: التاريخ الاسلامي (١٣٧/٨).

قسەنەکردنی دوو کەس پێکەوە لەسەر مەسەلەیەکی دونیایی، کە ئەم جۆرەیان لە سێ ڕۆژ بەرەو ژوور قەدەغەکراوە،[1] چونکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:((لا یحل لمسلم ان یهجر اخاه فوق ثلاث لیال یلتقیان فیعرض هذا ویعرض هذا وخیرهما الذي یبدأ بالسلام))،[2] واتە: ڕەوا نییە بۆ موسڵمان واز لە براکەی بهێنێت زیاتر لە سێ ڕۆژ،یەکتر دەبینن و پشت لە یەکتر دەکەن، چاکترینیان ئەویانە کە لە پێش براکەی سەلام دەکات.

**٤- جێبەجێکردنی فەرمانەکانی سەرکردایەتی لە کۆمەڵگای موسڵمان:**

کۆمەڵگای موسڵمان هەموویان هاتنە پیری فەرمانەکەی پێغەمبەر(ﷺ) و وازیان هێنا لە قسەکردن لەگەڵ ئەو سێ کەسە بەو شێوەی کە کەعب خۆی باسی کرد،[3] تەنانەت کەعب سەلامی لە ئامۆزاکەی خۆی کرد و وەڵامی نەدایەوە، چونکە ئەبو قەتادە لە نێوان وەڵام دانەوەی کەسێکی خۆشەویستی خۆی بوو، لەگەڵ جێبەجێکردنی فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ)، لەم حاڵەتەیشدا دوو دڵی نامێنێت لە جێبەجێکردنی فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ).[4]

پابەند بوون بە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتە چڵەپۆپەی کاتێك فەرمان ئاراستەی خێزانەکانی ئەو سێ کەسە کرا کە لێیان دوورکەونەوە و هەموانیش بەو فەرمانەوە پەیوەست بوون، بەڵام خێزانەکەی هیلال کوڕی ئومەییە داوای مۆڵەتی کرد خزمەتی هیلال بکات چونکە پیاوێکی پیرە، پێغەمبەریش(ﷺ) ڕێگایدا.[5]

**٥- دڵسۆزی تەواو بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی:**

دوژمنی خاچپەرست چاودێری بارودۆخەکەی دەکرد و چاوەڕوانی هەلی دەکرد بۆ پەرتەوازەکردنی بەرەی ناوخۆیی و هەڵگیرسانی ئاگری ئاژاوە لە نێو موسڵماناندا، بۆیە پادشای غەسسان هەلەکەی قۆستەوە و نێردەیەکی نارد بە نامەیەکی

---

١ بڕوانە: التاریخ الاسلامي (١٣٩/٨).
٢ مسلم، کتاب البر، (٢٥٦٠، ١٩٨٤).
٣ بڕوانە: الصراع مع الصلیبیین (١٩٥).
٤ بڕوانە: التاریخ الاسلامي (١٤٠/٨).
٥ بڕوانە: الصراع مع الصلیبیین (١٩٦).

تایبەتەوە بۆ فریودانی کەعب، وڵامی کەعبیش سوتاندنی نامەکە بوو، ئەم هەڵوێستەیش ئەوپەڕی دڵسۆزی کەعب دەردەخات، چونکە وەڵامی نەدایەوە بڵێت کاری واناکەم یان نامەکە بدرێت، بەڵکو ئەو نامەی کرد بە خۆڵەمێش و دوکەڵ و دای بە بادا، لە ڕاستیدا کەعب بە سەربەرزی ئەم تاقی کردنەوەی تێپەڕاند.[1]

**٦- وەرگێرانی تەوبە لە لایەن خواوە، بەهایەکی ئایینییە ڕاستگۆیان ئاواتی پێ دەخوازن:**

ئەو ڕۆژەی تەوبەی سێ کەسەکە قبوول کرا، ڕۆژێکی خۆشی و شادی بوو، تەنانەت پێغەمبەر(ﷺ) ڕووخساری وەکو مانگی چواردە دەدرەوشایەوە، هاوەڵانیش هەموویان خۆشحاڵ بوون و، پیرۆزباییان دەکرد لێیان، پێغەمبەریش(ﷺ) بە کەعبی فەرموو: مژدەت لێ بێت بە چاکترین ڕۆژ بە سەرتدا تێپەڕ بووە لەو ڕۆژەوە لە دایك بوویتە.

تەوبە واتە گەڕانەوە بۆ سایەی ڕەزامەندی خوای گەورە، لە ڕاستیدا کەعب ئەوەندە پێخۆشحاڵ بوو هەردوو پۆشاکەکەی بەخشی بە مژدەهێنەرەکە، ئینجا کەعب بە تایبەت باسی خۆی کردووە لەو فەرموودەیەدا، بەڵام واقیدی دەگێڕێتەوە کە ئەو کەسەی موژدەی برد بۆ هیلالی کوڕی ئومەییە سەعیدی کوڕی زەید بوو، کاتێك مژدەکەی پێی گەیاند سوجدەی برد، سەعید دەڵێت: وامزانی سەری بەرز ناکاتەوە تا گیانی نەسپێرێت.[2]

**٧- ڕێدراوە چەندین شێوازی خوا پەرستن بنوێنرێت لە کاتی دروست بوونی نیعمەتدا:**

خۆشحاڵی کەعب بە وەرگێرانی تەوبەکەی سنووری نەبوو، بۆیە هۆنەری نواند لە دەربڕینی خۆشیەکەی بە چەند شێوازێك لەوانە:

أ- سوجدە بردنی سوپاسگوزاری بۆ خوا.

ب- خەڵات کردنی ئەو کەسەی هەواڵەکەی پێ گەیاند.

ج- بەخشینیماڵەکەی.

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٢/٥١٧)، فقه السيرة للبوطي (٣٠٧).

٢ المغازي للواقدي (٣/١٠٥٤).

## باسی پێنجەم: وانە و پەند و سوود

### یەکەم: هێماکانی پرۆگرامی قورئانی لە باسکردنی غەزای تەبوك.

ئەو ئایەتانەی خوای گەورە دایبەزاند دەربارەی ئەم غەزایە درێژترین ئایەتن سەبارەت بە جەنگی موسڵمانان و دوژمنەکانیان، بەوەش دەستی پێکرد کە داوای لە موسڵمانان کرد هەڵسن بە بەرپەرچدانەوەی هێرشی مەسیحییەت ، خوای گەورە لەم بارەوە هیچ کەمتەرخەمییەکیان لێ قبووڵ ناکات، وەکو فەرموویەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى ٱلْأَرْضِ ۚ أَرَضِيتُم بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مِنَ ٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ فَمَا مَتَـٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّا تَنفِرُواْ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّوهُ شَيْـًٔا ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾(التوبة: ٣٨-٣٩).

خوێنەر کاتێك لە سورەتی(التوبة) ورد دەبێتەوە، تێبینی دەکات هەندێك نیشانەی هەیە لە شێوازی باسکردنیدا:

١- سەرزەنشت کردنی قورئان بە توندی بۆ ئەوانەی دواکەوتن لەو غەزایە: ﴿ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَـٰهِدُواْ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾(التوبة: ٤١).

ئەم غەزایەیش کۆتایی غەزاکانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، بۆیە وەکو جێبەجێکردنێکی کردەیی بوو بۆ فەرمودەی خوای گەورە: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَـٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلْكُفَّارِ وَلْيَجِدُواْ فِيكُمْ غِلْظَةً ۚ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ﴾(التوبة: ١٢٣) .[1]

---

١ بڕوانە: حدیث القران الكریم (٢/٧٠٢).

٢- قورئان ئەم غەزایەی لە غەزاکانی تر جیاکردەوە، ناوی نا ساتی ناڕەحەتی: ﴿لَقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ﴾(التوبة: ١١٧). چونکە بە ڕاستی غەزای ناڕەحەتی بوو.

٣- قورئانی پیرۆز بەرپەرچی مونافیقەکانی دایەوە کاتێك تانەیان دەدا لە هاوەڵە هەژارەکان لە بەخشینە کەمەکانیاندا: ﴿ٱلَّذِينَ يَلْمِزُونَ ٱلْمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ فِى ٱلصَّدَقَـٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾(التوبة: ٧٩).

٤- ئەو ئیماندارانەی دەرچوون لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) کە زیاتر لە سی هەزار کەس دەبوون، خوای گەورە پاداشتی بۆ نووسین:[١] ﴿وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا مَا يُنفِقُونَ﴾(التوبة: ٩٢).

## دووەم: بەجێهێنانی بنەمای ڕاوێژ لەم غەزایەدا.

پێغەمبەر(ﷺ) لەم غەزایەدا بنەمای ڕاوێژی جێبەجێکرد و، ڕاوێژی ئەبو بەکر و عومەری وەرگرت، وەکو:

أ- وەرگرتنی ڕاوێژی عومەری کوڕی خەتتاب سەبارەت بە وازهێنان لەسەر بڕینی وشترەکان لە کاتی کەوتنەوەی برسێتی لە ناو سوپاکە.

ب-وەرگرتنی ڕاوێژی عومەر (رضي الله عنه) سەبارەت بە وازهێنان لە تێپەڕبوون لە سنووری شام و گەڕانەوە بۆ مەدینە.

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتە ناوچەی تەبوك بینی سوپای ڕۆم هەڵهاتوون، بۆیە ڕاوێژی بە هاوەڵان کرد سنوور تێپەڕ بکەن، بەڵام عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه)

---
[١] هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

بۆچوونی وابوو سوپاكە بگەڕێتەوە بۆ مەدینە، چونكە ڕۆمەكان ژمارەیان زۆرە و موسڵمانیان تیا نییە ئەو وڵاتە، لە ڕاستیدا ڕاوێژێكی پیرۆز بوو، چونكە شەڕ كردن لە ناوخۆی وڵاتی ڕۆمان زۆر قورسە و تەكنیكێكی تایبەتی دەویست و، شەڕی بیابانیش جیاوازی زۆرە لەگەڵ شەڕی ناو شار، ئینجا ژمارەی ئەوان نزیكەی دوو سەد و پەنجا هەزار دەبوو... پێغەمبەر(ﷺ) هەمیشە كاری دەكرد بە ڕاوێژكردن لەگەڵ هاوەڵانی.

## سێیەم: ڕاهێنانی كردەیی توند.

دەرچوونی پێغەمبەرو هاوەڵانی بۆ تەبوك سوودی زۆری تیابوو:

ڕاهێنانیان بە شێوەیەكی توند، ماوەیەكی زۆر ڕێیان كرد لە بارودۆخێكی سەختدا، چونكە گەرمای هاوین زۆر سەخت بوو، باری بژێویش ناڕەحەت بوو، ئەوەندە ئاویان كەم بوو خەریك بوو دەخنكان لە تینوێتیدا، جگە لە كەمی وڵاخ و توێشوو، لەم بارەوە مامۆستا(محمود شیت خطاب) دەڵێت:

سوپاكان كاردەكەن لەسەر ئەوەی سەربازەكانیان ڕابهێنن لەسەر سەختی وەكو تێپەڕبوون بەسەر جێگا و كۆسپی سەخت و بڕینی ماوەی درێژ لە كەش و هەوای جۆراوجۆر و، بێبەشكردنیان لە خواردن و خواردنەوە و، بۆ ئەوەی ئەو سەربازانە بتوانن خۆیان ڕابگرن لە ناخۆشترین بارودۆخدا، لە ڕاستیدا سوپای عوسرە هەندێك ناخۆشیان بینی لەو ڕاهێنانە توندە كەمتر نییە، ئەگەر گرانتریش نەبێت. ئەوان لە كاتێكدا مەدینەیان بەجێهێشت بەرهەمی باخەكان پێگەیشتبوون و، ڕۆیشتن ڕێگایەكی دوور و درێژیان بڕی لە بیابانی دوورگەی عەرەبدا.

مەبەست لە غەزای تەبوك ئامادەكردنیان بوو بۆ پاراستنی ئازادی بڵاوكردنەوەی ئیسلام لە دەرەوەی نیوە دوورگەی عەرەب، چونكە ئەم غەزایە دواترین غەزاكانی پێغەمبەر بوو(ﷺ)، بۆیە پێویست بوو پێغەمبەر(ﷺ) دڵنیا بێت لە لێهاتوویی سەربازەكانی پێش ئەوەی بگەڕێتەوە لای خوای خۆی.[1] ئینجا ئەم ڕاهێنانە

---

[1] بڕوانە: الرسول القائد (٢٨١–٢٨٢).

یارمـەتی هاوەڵانیـدا لـە سـەردەمی خەلیفەکانـدا و، توانیـان وڵاتـی شـام و فـارس بەهێزی ئیمانیان فەتح بکـەن، هـەروەها توانـای لاشـەیی و شـارەزایی بـەکارهێنانی شمشێر و ڕم و جۆرەکانی چەك یارمەتیدەریان بوو بۆ ئەو مەبەستە.

## چوارەم: گرنگترین دەرەنجامەکانی غەزاکە.

١- نەهێشتنی شکۆداری ڕۆم لە لای عەرەبەکان، بە موسڵمان و بێباوەڕیانەوە، چـونکە هێـزی ڕۆم بـەهێزێکی نەبـەزیو دادەنـرا، لەوانەشـە ئـەو شکستەی تووشـی موسڵمانان بوو لە(مؤتة) زیاتر ئەو بیرۆکەی سـەلماند کـە ڕۆم هێزێکـی نەبـەزیووە، بۆیە پێویستە هێزێکی ئـەوتۆ بەڕێکـەوێت بـۆ لابردنـی ئـەو شکـستە دەروونییـە لـە دەروونی عەرەبەکاندا.

٢- دەرخستنی هێـزی دەوڵـەتی ئیـسلامی وەکـو تاکـە هێـز لـە ناوچـەکە، کـە بتوانێت بەربەرەکانێی زلهێـزی جیهـانی ئـەو سـەردەمە بکـات، نـەك بـە پاڵنـەرێکی نـەژادی یـان بـەدیهێنانی تـەماعی سـەرۆکە هاوچـەرخەکان، بـەڵکو بـە پاڵنـەرێکی ئازادیخوازانە کە مرۆڤایەتی بانگـەواز دەکـات بـۆ ڕزگـارکردنی خـۆی لـە بەندایـەتی بەندەکان بۆ بەندایەتی خـوای بەنـدەکان، لـە ڕاستیـشدا ئـەم غەزایـە ئامانجـەکانی خۆی هێنایـەدی سـەرەڕای دروسـت نـەبوونی ڕووبەڕووبوونـەوەی سـەربازی لەگـەڵ ڕۆمەکاندا، هەروەها لە ئەنجامی ئەو غەزایە گاورەکانی عەرەب کە دڵسۆزیان هەبوو بۆ ڕۆم وەکو میرنشینی(دومة الجندل) ملکەچ بوون بۆ دەوڵەتی ئیسلامی، هـەروەها میرنشینی ئەیلەیش( شاری عەقەبەی ئەمڕۆ)، پێغەمبەری خوا(ﷺ) نووسراوێکیـشی نووسی لە نێوان هەردوولادا ماف و ئەرکەکانی تیا دیاری کرد، هۆزەکانی تـریش بـە خەسـتی کەوتنـە ژێـر دەسـەڵاتی ئیـسلامیەوە، زۆریـشیان بـە خۆیانـدا هاتنـەوە دەربارەی سوودی پاشکۆیی بـۆ دەوڵـەتی ڕۆمـانی، یـان گـۆڕانی ئـەو پاشـکۆیە بـۆ دەوڵەتی ئیسلامی تازە پێگەیشتوو، غەزای تەبوك – لە ڕاسـتیدا – خـاڵی سـەرەتا بوو بۆ فەتحی ئیسلامی بۆ وڵاتـی شـام،[١] ئـەوەیش کـە دەبێتـە بەڵگـە لەسـەر ئـەم

[١] بڕوانە: المسلمون والروم في عصر النبوة، عبدالرحمن احمد (١٠٢).

ڕاستیە، ئەوەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) پێش لە دونیا دەرچوونی سوپایەکی ئامادە کرد بە سەرکردایەتی ئوسامەی کوڕی زەید بۆ ئەوەی ببێتە نووکی ڕم بەرەو ڕۆمەکان و پێشەنگی سوپای فەتح بێت، ئەو سوپایەیش زۆربەی هاوەڵانی لە خۆگرتبوو، بەڵام هەڵنەسا بە ئەرکی خۆی دوای لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەر(ﷺ) نەبێت.

٣- یەکخستنی دوورگەی عەرەب لە ژێر حوکمی پێغەمبەر(ﷺ): هەڵوێستی هۆزە عەرەبەکان کاریگەر بوو بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و بانگەوازی ئیسلامی بە چەند کارتێکەرێکی بەیەکداچوو وەکو فەتحی مەککەو خەیبەرو تەبوک، بۆیە هەر هۆزێك لە لای خۆیەوە موسڵمان بوون دوای ئەوەی کە دەسەڵاتی موسڵمانان درێژبوویەوە بۆ هێڵە سنوورییەکان لەگەڵ ڕۆمەکاندا، ئینجا ناچارکردنی نەجران بۆ سەرانەدان، بۆیە هۆزە عەرەبەکان هیچیان بۆ نەمایەوە جگە لەوەی خۆیان فریای کاروانی پێغەمبەر(ﷺ) بخەن، ئینجا لەبەر زۆری ئەو نێردانەی دەهاتنە لای پێغەمبەر(ﷺ) بۆ موسڵمان بوون ساڵی نۆی کۆچی بە ساڵی نێردەکان ناوزەد کرا.[١]

بەم غەزایەیش باسی غەزاکانی پێغەمبەر(ﷺ) کە خۆی سەرکردایەتی دەکرد تەواو دەبێت، ژیانێکی پیرۆزی بەسەربرد پڕ لە وانە و پەند، کە ئوممەتەکەی لە نەوەکانی داهاتوودا لەسەری پەروەردە دەبن،[٢] هەروەها پڕبوو لە وانە و پەند بۆ پەروەردەکردنی ئوممەت و دروست کردنی ئەو دەوڵەتەی فەرمان بە شەرعی خوای گەورە دەکات.

---

١ بڕوانە: نضرة النعيم (١/٣٩٥، ٣٩٦).

٢ بڕوانە: محمد رسول الله، محمد الصادق عرجون (٤/٦٠).

## باسی شەشەم: گرنگترین ڕووداوەکانی نێوان تەبوك و حەجی ماڵئاوایی

### یەکەم: نێردەی سەقیف و موسڵمان بوونیان.

ئەو کاتەی پێغەمبەر(ﷺ) لە تائیف گەڕایەوە، عوروەی کوڕی مەسعود شوێنی کەوت و پێش گەیشتنی بە مەدینە پێغەمبەر(ﷺ)ی بینی و موسڵمان بوو، ئینجا گەڕایەوە و، هۆزەکەی خۆی بۆ ئیسلام بانگ کرد، ئەوانیش تیربارانیان کرد و تیرێکی بەرکەوت و کوشتی، بەڵام دواتر کاتێك دڵنیا بوون کە شەڕی موسڵمانانیان پێ ناکرێت، بڕیارياندا کەسانێك بنێرنە لای پێغەمبەر(ﷺ)، بۆیە لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی نۆی کۆچی پاش گەڕانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە تەبوك شەش کەسیان نارده لای.[1]

نێردەکە پێکهاتبوون لە شەش کەس لە سەرانی بەنی مالیك و ئەحلافەکان،(عبدياليل بن عمر)[2]یش لە سەرووی هەموویانەوە بوو، پێکهێنانی نێردەکەیش ئاماژەی دەکرد بۆ بیرێکی سیاسی قووڵ، چونکە هۆزی(ثقيف) ئومێدەوار بوون موهاجیرەکان لە بەنی ئومەییە ببنە ناوبژێکار بۆ ئەنجامدانی ڕێککەوتننامەیەك لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بە هۆی پەیوەندی مێژوویی ئەوان بە ئەحلافەکانەوە.[3]

هاوەڵان دەیانزانی پێغەمبەر(ﷺ) چەند بایەخ دەدات بە موسڵمان بوونی سەقیف، بۆیە کە نێردەکە دەرکەوت، ئەبو بەکر و موغیرە کێبڕکێیان دەکرد بۆ مژدە پێدانی پێغەمبەر(ﷺ) و لە کۆتاییدا ئەبو بەکر مژدەکەی پێدا.[4] پێغەمبەر(ﷺ) پێشوازی جوانی لە نێردەکە کرد و جێگای بۆ دابین کردن، هەموو ڕۆژێك دەهاتنە لای پێغەمبەر(ﷺ) و(عثمان بن ابي العاص) لە لای جێگەکانیان

---

١ رسالة الانبياء، عمر احمد عمر (١٩٩).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٤/١٩٣).

٣ بڕوانە: رجال الادارة في الدولة الاسلامية، د. حسين محمد (٧٦).

٤ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٤/١٩٣).

بەجێدەهێشت، جا لەو کاتەی نێوەڕۆ دەگەڕانەوە دەخەوتن، عوسمان دەچووە لای پێغەمبەر(ﷺ)، یان ئەگەر ئەو ئامادە نەبووایە دەچووە لای ئەبو بەکر و، پرسیاری لێ دەکردن دەربارەی ئایین و قورئان بۆ ئەوەی فێر بێت، ئەوەشی لە هاوڕێکانی دەشاردەوە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی پێ خۆش بوو.

نێردەکە چەند ڕۆژێك مانەوە و، پێغەمبەر(ﷺ) بانگی دەکردن بۆ ئیسلام، پێیشی وتن: ڕێککەوتن نییە پێش ئەوەی موسڵمان نەبن.

(عبدیالیل) وتی: باسی زینام بۆ بکە، ئێمە کە دوور دەکەوینەوە، ئەو کارە دەکەین و ئارام ناگرین لەسەری، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوە خوای گەورە قەدەغەی کردووە لەسەر موسڵمانان و، فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴾(الاسراء: ٣٢).

ئینجا پرسیاری سووی لێکرد، فەرمووی: ئەویش قەدەغەیە، وتی: هەموو ماڵەکانمان سووە، فەرمووی: خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾(المائدة: ٩٠).

ئینجا هەڵسان و پێکەوە قسەیان کرد،(عبدیالیل) وتی: بەڵاتان لێدا، بگەڕێینەوە بۆ لای کەس و کارەکانمان و، ئەو سێ شتەیان لێ قەدەغە بکەین، بە خوا، بە خوا،(ثقیف) هەرگیز ئارام ناگرێت لە دووری مەی و زینا. سوفیانی کوڕی عەبدوڵا وتی: کابرا، ئەگەر خوای گەورە ویستی چاکەی پێتان هەبێت، ئارام دەگرن، ئەی ئەوانەیش وانەبوون و وازیشیان هێنا، ئینجا ئێمە دەترسین، موحەممەد هەموو لایەکی داگیر کردووەو ئێمەیش لە سووچێکی زەویدایین و، ئیسلام بە دەورمانەوە بڵاوبووەتەوە، سوێند بە خوا ئەگەر مانگێك ئابلۆقەمان بدات لە برسا دەمرین، ئینجا من دەترسم ڕۆژێکی وەکو مەککە چاوەڕمانمان بێت.

خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص لە نێوان هەردوولادا بوو، تا ئەو کاتەی نووسراوەکەیان نووسی، خالید بە دەستی خۆی نووسی، پێغەمبەر(ﷺ) خواردنی

بۆ دەناردن و لێیان نەدەخوارد تاکو پێغەمبەر(ﷺ) خۆی لێی نەخواردایە، تاکو ئەو کاتەی موسڵمان بوون.

وتیان: چی دەڵێین دەربارەی(الربة) ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بیڕوخێنن، وتیان: هەرگیز شتی وا نابێت، ئەگەر(الربة) بزانێت نیازی ڕوخاندنیمان هەیە کەس و کارەکانمان دەکوژێت، عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ فەرمووی: بەڵات لێدا ئەی(عبدیالیل) ڕەببە بەردێکە نازانێت کێ دەیپەرستێت و کێ نایپەرستێت، وتی: ئێمە بۆ لای تۆ نەهاتووین ئەی عومەر، ئینجا موسڵمان بوون و، ئاشتیەکە نووسرا، دوای ئەوە داوایان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) سێ ساڵ واز لە بتەکەیان بهێنێت، ئینجا وتیان دوو ساڵ، تاکو گەیشتنە ئەوەی داوای مۆڵەتی یەك مانگیان کرد نەڕوخێت بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ڕازی نەدەبوو، ئەوان مەبەستیان لە نەفام و ئافرەت و منداڵەکانیان بوو کە بە ڕووخانی(الربة) قایل نەدەبوون، بۆیە داوایان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) وازیان لێ بهێنێت لەوەی بتەکە بە دەستی خۆیان بڕوخێنن،[١] ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ڕازی بوو، دوای ئەوە داوایان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) نوێژکردنیان لەسەر لابدات،ئەویش فەرمووی:((لا خير في دين لا صلاة فيه))،[٢] واتە: چاکە لە ئایینێکدا نییە نوێژی تیانەبێت.

نێردەی سەقیف سەرکەوتوو نەبوون لەو جۆرە داواکارییانەیان لە پێغەمبەر(ﷺ) بۆیە هەرەسیان هێنا و ملکەچ بوون بۆ ڕاستی.[٣]

پێغەمبەر(ﷺ) میوانداری پێکردن و ڕێزی زۆر لێگرتن و(عثمان بن ابي العاص)ی کرد بە فەرمانڕەوایان، چونکە لە هەموویان پەرۆشتر بوو بۆ فێربوونی قورئان و تێگەیشتن لە ئایین و، لە هەمووشیان منداڵتر بوو،[٤] نێردەکەیش کاریگەر بوون بە مامەڵەکردنی پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان، تەنانەت ئەو چەند ڕۆژەی مابوو لە ڕەمەزان بە ڕۆژوو بوون و، پانزە ڕۆژ لە مەدینە مانەوە و دوای گەڕانەوە بۆ تائیف،

---

١ بڕوانە: المغازي للواقدي (٣/٩٦٨).

٢ بڕوانە: التاريخ الاسلامي (٨/٥٠)، المغازي للواقدي (٣/٩٦٨).

٣ بڕوانە: المجتمع المدني في عهد النبوة (٢٢١-٢٢٣).

٤ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٢/٥١٩).

لە پاش گەڕانەوەشیان پێغەمبەر(ﷺ) پۆلێکی سەربازی بە سەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلید و بەشداری کردنی موغیرەی کوڕی شوعبە و ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب ڕەزای خوایان لێ بێت و،[1] بە دوای نێردەکەدا ڕەوانە کردن.

نێردەکەی توانیان هۆزەکەیان قایل بکەن بە موسڵمان بوونیان و ئاگاداریان کردنەوە لە سەرەنجامی بتی(اللات) لەو کاتە پۆلە سەربازییەکە گەیشتنە تائیف و، موغیرەی کوڕی شوعبە و چەند کەسێك ڕۆیشتن بۆ ڕووخاندنی(الربة)[2] لە ژێر پاسەوانێتیەکی توند لە بەنی میعتەبەوە نەوەك کەسێك تیرێکیان تێ بهاوێژێت وەکو عوروەی کوڕی مەسعودیان کوشت،[3] لەو کاتە هەموو هۆزی(ثقیف) بە جارێك دەرچوون، بۆچوونیشیان وابوو کە ئەو بتە کەس توانای ڕووخاندنی نییە.[4]

موغیرە پیاوێك بوو حەزی لە گاڵتە و قسەی خۆش دەکرد، بە هاوڕێکانی وت: بە خوا دەبێت ئەمڕۆ وا بکەم لە سەقیف پێبکەنن، جا ڕۆیشت و بە پاچەکەی خۆی لە بتەکەیدا و کەتە خوارەوە و هەڵهات، خەڵکی بە یەك دەنگ هاواریان کرد، وتیان: لە ئەولاتر بچێت موغیرە، ڕەببە کوشتی، پێخۆشحاڵ بوون کە ئەویان بینی کەوتە خوارەوە، بە پیاوانی تری پۆلە سەربازیەکەشیان وت: هەرکەسێ دەیەوێت با نزیك بێتەوە و، هەوڵبدات بیڕوخێنێت، سوێند بە خوا کەس ناتوانێت، لەو کاتەدا موغیرە هەڵسایەوە و، وتی: خوا نابووتتان بکات ئەی هۆزی سەقیف، ئەوە بەردێکی بێئاگایە، بە سەلامەتی خوا بزانن و هەر ئەو بپەرستن.[5]

ئینجا بە تەواوی ڕوخاندیان و تەختیان کرد لەگەڵ زەویدا، بتەوانەکەشی ڕاوەستابوو چاوەڕوانی خەشم و قینی بتەکە بوو دابەزێتە سەر ئەو کەسانەدا، وتیشی با بگەنە بنچینەکەی ئەوسا دەبینن(الربة) چی دەکات، ئینجا موغیرە چوو بنچینەکەشی هەڵکەند و هەرچی خشڵ و کەل و پەلی تیابوو دەریهێنا و، سەقیف بە

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٢/٥١٩-٥٣٠)، السيرة النبوية لابن هشام (١٩٥/٤).
٢ المغازي (٦٧١/٣).
٣ بڕوانە: دلائل النبوة (٣٠٤/٥).
٤ بڕوانە: السرايا والبعوث (٣٠٠).
٥ بڕوانە: السرايا والبعوث (٣٠٠).

جاریێ سەرسام بوون و، دڵنیا بوون چ پەردەیەك بەرچاویانی داپۆشیبوو.[١] نێردە ئەو خشڵ و کەل و پەلانەی هێنایەوە لای پێغەمبەر(ﷺ) و، ئەویش دابەشی کرد هەر لەو ڕۆژەدا و، سوپاسی خوایان کرد لەسەرخستنی خوای گەورە بۆ ئایینەکەی.[٢]

بەم شێوەیش گەورەترین دووەم بت لە دوورگەی عەرەب لەناوبرا و، ماڵێکی خوای لەسەر دروست کرا بۆ یەکتاپەرستی، بە ئاراستەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ(عثمان بن ابي العاص) ﷺ.[٣]

## دووەم: مردنی سەرکردەی مونافیقەکان عەبدوڵای کوڕی سەلول.

لە کۆتایی مانگی شەووالدا نەخۆش کەوت و لە(ذي القعدة)ی ساڵی نۆی کۆچی مرد.[٤]

ئوسامەی کوڕی زەید دەفەرمووێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) چووینە سەردانی عەبدوڵای کوڕی سولول لە نەخۆشیەکەیدا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی فەرموو: من خۆشەویستی جولەکەم لێ قەدەغە دەکردی، عەبدوڵا وتی: سەعدی کوڕی زوراره ڕقی لێیان بوو و مرد.[٥]

لە پاش مردنی عەبدوڵای کوڕی هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ)و داوای لێکرد کراسەکەی بداتێ بۆ ئەوەی بیکاتە کفنی، پێغەمبەریش(ﷺ) کراسەکەی خۆی پێدا، ئینجا داوای لێکرد نوێژیشی لەسەر بکات، بەڵام عومەر گرتی بە پۆشاکی پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خوا لێی قەدەغە کردووی نوێژ لەسەر ئەوانە بکەیت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا

---

١ بڕوانە: السرايا والبعوث (٣٠١)، دلائل النبوة (٥/٣٠٣).
٢ بڕوانە: تاريخ ابن شيبة (٢/٥٠٧) نقلا عن السرايا والبعوث (٣٠١).
٣ بڕوانە: السرايا والبعوث (٣٠١).
٤ بڕوانە: دلائل النبوة (٥/٢٩٩-٣٠٣)، المغازي (٣/٩٧٠-٩٧٢).
٥ ابو داود، كتاب الجنائز، باب في العيادة (٣٠٩٤).

بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴾(التوبة: ٨٠). منیش لە حەفتا جار زیاتر نوێژ دەکەم، عومەر وتی: ئەو مونافیقە، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) هەر نوێژی لەسەر کرد و، ئینجا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٖ مِّنۡهُم مَّاتَ أَبَدٗا وَلَا تَقُمۡ عَلَىٰ قَبۡرِهِۦٓۖ إِنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُواْ وَهُمۡ فَٰسِقُونَ ﴾(التوبة: ٨٤).نوێژکردنی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر ئەو بە پێی حوکمی ڕووکەشی بوو کە موسڵمان بوو، هەروەها وەکو ڕێزگرتن لە عەبدوڵای کوڕی کە یەکێك بوو لە پیاو چاکانی نێو هاوەڵان، هەروەها بۆ دڵڕاکێشانی هۆزەکەی ئەو مونافیقانەش پابەند بوون پێوەی، بەڵکو واز لە پیشەی خراپەکارییان بهێنن.... مەسەلەی پێدانی کراسەکەیش، پێغەمبەر(ﷺ) داواکاری کەسی ڕەت نەدەکردەوە، هەروەها پاداشتێکیش بوو بۆ ئەوەی ئەو کراسەکەی خۆی دابوویە عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب کاتێك بە دیلی هێنایان لە جەنگی بەدردا، ڕەوشتی پێغەمبەر(ﷺ) وابوو چاکەی بە چاکەی چاکتر وەڵام دەدایەوە.[١]

بە مردنی عەبدوڵا بزوتنەوەی مونافیقی بە تەواوی کەمی کرد و تەنانەت کەسێکی وایان دیار نەما لە ساڵی دەی کۆچی، بەڵکو ژمارەیەکی کەمیان مایەوە حوزەیفەی خاوەنی نهێنی پێغەمبەر(ﷺ) ناویانی دەزانی،[٢] عومەریش لە پاش ئەوە نوێژی لەسەر کەسێك نەدەکرد حوزەیفە نوێژی لەسەر نەکردایە.[٣]

ساڵی نۆیەم ساڵێکی یەکلاکەرەوە بوو بۆ بزوتنەوەی مونافیقەکان، پلانی ئیسلامیش دەربارەیان – وەکو(ابن القیم) دەڵێت – ئەوە بوو، ڕووالەتیان لێ وەربگیردرێت و، پەنهانیان هەواڵەی خوای گەورە بکرێت، فەرمانیش کرا بە پێغەمبەر(ﷺ) توند بێت لەگەڵیان و نوێژیان لەسەر نەکات و لەسەر گۆڕەکانیان ڕانەوەستێت و ئاگاداریش کرایەوە ئەگەر داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکات خوای گەورە لێیان خۆش نابێت.[٤]

---

١ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٥٢١-٦٢٢)، السيرة لأبي شهبة (٢٨٥٣٤)..

٢ بڕوانە: دراسات في عهد النبوة للشجاع (٢٢١).

٣ بڕوانە: معين السيرة النبوية (٤٦٤).

٤ زاد المعاد (٩١/٢).

ئەم نەخشەیش بە گوێرەی دەقەکانی سورەتی(التوبة) بوو، کە بە درێژی باسی مونافیقەکان دەکات و هەڵوێستیان ئاشکرا دەکات و باسی دواکەوتنیان دەکات لە جیهاد و ئازاردانیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ).[1]

**هەندێك حوکمی شەرعی سەریان هەڵدا لەم قۆناغە لە دژ مونافیقەکان:**

**١- نوێژ نەکردن لەسەریان:**

﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾ وَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَأَوْلَـٰدُهُمْ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَـٰفِرُونَ ﴾(التوبة: ٨٤-٨٥).

**٢- ڕووخاندنی مزگەوتەکەیان(الضرار).**

**٣- دەرچوونی فەرمان بە جیهاد کردن لە دژیان وەکو بێباوەڕان:**

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ جَـٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾(التوبة: ٧٣). جیهاد بە هەموو شێوەکانی.

**٤- ئاشکراکردنی سیفەت و کردەوەکانیان بە ڕوونی:**

﴿ فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَـٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓا۟ أَن يُجَـٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُوا۟ لَا تَنفِرُوا۟ فِى ٱلْحَرِّ ۗ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَّوْ كَانُوا۟ يَفْقَهُونَ ﴾(التوبة: ٨١).

## سێیەم: چەند وانەیەك لە ماڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ

---

[1] بڕوانە: المنافقون، محمد جميل غازي (٩٢-٩٣).

ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾(الاحزاب: ٢٨-٢٩). فەرموودە ڕاستەکانیش ئاماژە دەکەن بۆ ئەوەی دابەزینی ئەم دوو ئایەتە پاش دوورکەوتنەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو لە خێزانەکانی، کە سوێندی خواردبوو یەك مانگ نەچێتە لایان، مێژووی دابەزینی ئەم ئایەتانەیش لە ساڵی نۆی کۆچی بوو.[1]

دەربارەی هۆی دابەزینیشی، موسلیم لە جابیر دەگێڕێتەوە(ﷺ): ئەبو بەکر ویستی بچێتە لای پێغەمبەر(ﷺ) بینی خەڵکی لە دەرگاکەی کۆبوونەتەوە و، کەس ناتوانێت بچێتە لای، ئەبو بەکر چووە ژوورەوە و، ئینجا عومەریش هات مۆڵەتی پێدرا چووە ژوورەوە، بینیان پێغەمبەر(ﷺ) مۆن و بێدەنگە، عومەر وتی: ئەبێت قسەیە بکەم پێغەمبەر(ﷺ) پێبکەنێت، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خۆزگە کچەکەی خاریجەت دەبینی،[2] داوای خەرجی لێ دەکردم، منیش هەڵسام و پەنجەم چەقاندە گەردنیدا، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) پێکەنی و فەرمووی: وا دەیان بینی دەوریان لێداوم داوای خەرجیم لێ دەکەن، ئیتر ئەبو بەکر و عومەر هەڵسانە گیان کچەکانیان و تیان: بۆچی داوای شتێك دەکەن لە پێغەمبەر(ﷺ) کە نییەتی، وتیان: بە خوا داوای شتێك ناکەین نەیبێت، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) یان مانگێك یان بیست ڕۆژ وازی لێ هێنان و ئەم ئایەتانە دابەزین.[3]

گوزەران لە ماڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر یەك شێواز بوو، ئافرەتەکانیشی ئادەمیزاد بوون و، حەزیان لەوە دەکرد خەڵکی حەزی لێ دەکەن، ماڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) وەکو دکتۆر ئەبو شەهبە باسی دەکات:

چەند ژوورێك بوو بە دەوری مزگەوتەکەی پێغەمبەر(ﷺ)ەوە وەکو ماڵی پادشا و قەیصەرەکان نەبوو، بەڵکو ماڵی کەسێك بوو کە گوێ بە خۆشگوزەرانی دونیا نەدات و تەنها تەماشای ڕۆژی دوایی بکات، ماڵەکانی وەکو مزگەوتەکەی لە خشت و قوڕ دروست کرابوون، سابیتەکانی لە چڵ و گەڵای دارخورما بوو، حەوشەکانی

---

١ بڕوانە: قضايا نساء النبي والمؤمنات (٦٨).
٢ کچی زەید خێزانی عومەر بوو ناوی جەمیلەی کچی سابیت بوو.
٣ مسلم في الطلاق (٢/١١٠٤).

بچووك و نزم بوون، لاوێکی بالاّ بەرز دەستی پێ دەگەیشت، حەسەنی بەصری — لاوێك بوو لەگەڵ دایکی لە لای ئوممو سەلەمە — دەڵێت دەستم دەگەیشتە کام ژوور لە ژوورەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بەرز بووایە، هەموو ژوورێکیش دوو دەرگای هەبوو، دەرەکی و ناوخۆیی بۆ ناو مزگەوتەکە.[1]

بوخاری لە عائیشەوە(رضي الله عنها) دەگێڕێتەوە، دەفەرموێت: لە بەردەستی پێغەمبەر(ﷺ)دا دەخەوتم و هەردوو قاچم لە جێگەی سوجدەکەی ئەودا بوو، جا کە سوجدەی دەبرد دەستی لە قاچم دەدا و قاچم ڕادەکێشا. کە هەڵدەستا درێژم دەکردەوە، دەفەرموێت: ژوورەکانیش لەو سەردەمە ڕووناکی تیا نەبوو.[2] سەبارەت بە جێگای خەوتنیش پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر خۆڵ دەخەوت و سەری دەخستە سەر سەرینێك ناوئاخنی ڕیشاڵ بوو، ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) بەڵگە بوو لەسەر گوزەران سەختی، ئەنەسی کوڕی مالیك(رضي الله عنه) دەفەرموێت: وانازانم پێغەمبەر(ﷺ) تا ئەو کاتەی لە دونیا دەرچوو، نانێکی تەنکی بینیبێت، یان بەرخێکی برژاو و پاککراوی بینیبێت،[3] عائیشە دەفەرموێت: تەماشای مانگمان دەکرد، سێ جار مانگمان دەبینی لە نێو دوو مانگدا و، لە هیچ کام لە ماڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئاگر نەدەکرایەوە، عوروەی کوڕی زوبەیر فەرمووی: بەچی گوزەرانتان دەکرد؟ فەرمووی: بە خورما و ئاو. بەڵام خوای گەورەی دەرگای لە موسڵمانان کردەوە پاش خەیبەر و فەتحی مەککە و تەبوك، خێزانەکانی پێغەمبەریش(ﷺ) حەزیان دەکرد هەندێکیان بەرکەوێت لە خۆشگوزەرانی، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ﴾(الاعراف: ٣١).

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يُرِيدُونَ لِيُطۡفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾(الصف: ٣٢).

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية في القران والسنة (٢/٣٥-٣٦).

٢ البخاري، كتاب الصلاة (٥١٣).

٣ البخاري في الرقائق (٦٤٥٧).

داواشی کردووە لە موسڵمانان زیادەڕەوی نەکەن: ﴿وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا﴾(الاسراء: ٢٩).

بەڵام لایەنێکی تر هەبوو پێغەمبەر(ﷺ) بە ئاراستەی پەروەردگاری خۆی وەریانگرتبوو، بۆیە ئاوڕی لە هیچی تر نەدایەوە، کە فەرموویەتی: ﴿لَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجًا مِّنْهُمْ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾(الحجر: ٨٨).

بۆیە ئایەتەکانی ئازادکردنی خێزانەکان دابەزی، ئەوانیش بەبێ هیچ دوو دڵی و گومانێك خوا و پێغەمبەر و ڕۆژی دواییان هەڵبژارد، بەڵێ ئەوان داوای خەرجییان دەکرد، بەڵام کە مەسەلەکە گەیشتە ئەم ئاستە، بەبێ هیچ دڵەڕاوکێیەك هەموویان وازیان لە خۆشی دونیا هێنا.[١]

لە عائیشەوە(ﷺ) فەرموویەتی: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ئایەتانەی بەسەردا دابەزی، لە منەوە دەستی پێکرد و فەرمووی: من مەسەلەیەکت بۆ باس دەکەم و پەلە مەکە تاکو ڕاوێژ بە باوکت و دایکت دەکەیت، ئیتر ئایەتەکانی بۆ خوێندمەوە: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ فَإِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا﴾(الاحزاب: ٢٨-٢٩).

دەفەرموێت: منیش وتم: لە چی پرس بە باوك و دایکم بکەم، بەڵکو خوا و پێغەمبەر و ڕۆژی دوایی هەڵدەبژێرم، فەرمووی: ئینجا خێزانەکانی تریش هەمان وەڵامیان دایەوە.[٢]

خەلیفە ڕاشیدەکان ئەم بەسەرهاتەیان بە هێمایەك دەزانی لە هێماکانی ئیسلام، کە پێویستە خێزانی سەرکردایەتی ڕەچاوی بکەن. دیدی مێژوویش ئاشکرای دەکات

---

١ بڕوانە: قضايا نساء النبي (ﷺ) والمؤمنات في سورة الاحزاب (٧٧).

٢ البخاري، كتاب التفسير (٤٧٨٦).

کە ئەم لایەنە پێوەرێکی وردە بۆ ڕێکردن لەسەر ڕێگەی ڕاست یان دوورکەوتنەوە لێی، سەرکردەکانی ئوممەتیش چاك لەم لایەنە گەیشتن و، نموونەی زۆریشیان پێشکەش کرد لەم بارەوە.[١]

سەرکردایەتی موسڵمانان کارێکی سەختە و دەستکەوت نییە، پێویستە لەسەر ئەو کەسانەیش پێی هەڵدەسن ئاستیان بەرزتر بێت لە خۆشیەکانی دونیا و پەرۆش بن بۆ لای خوا و ڕۆژی قیامەت.[٢]

## چوارەم: حەج کردنی ئەبو بەکر(ﷺ) بە خەڵکی.

پەروەردەی کۆمەڵگا و بونیاتنانی دەوڵەت لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) دا بەردەوام بوو لە هەموو ئاستەکانەوە، حەجیش لە ساڵە ڕابوردووەکاندا جێبەجێ نەدەکرا، حەجی ساڵی هەشتی کۆچی خرایە ئەستۆی عەتتابی کوڕی ئوسەید، هێشتا حەجی موسڵمانانیش زۆر جیاواز بوو لە حەجی بتپەرستان،[٣] بۆیە کاتێك وەرزی حەج هات، پێغەمبەر(ﷺ) ویستی حەج بکات بەڵام فەرمووی:((انه يحضر البيت عراة مشركون يطوفون بالبيت، فلا احب ان احج حتى لا يكون ذلك))، واتە: کەسانێکی ڕووتی بتپەرست بە دەوری کەعبەدا دەسوڕێنەوە، منیش حەز ناکەم حەج بکەم تاکو ئەو کەسانە لەوێ بن. ئیتر هەڵسا بە ناردنی ئەبو بەکر(ﷺ) وەکو سەرکردەی حەج لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە هاوەڵاندا،[٤] قوربانیشیان لەگەڵ خۆیان برد،[٥] لە کاتی دەرچوونیان سورەتی(البراءة) دابەزی، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) بانگی عەلی کرد(ﷺ) و فەرمانی پێکرد فریای ئەبو بەکر بکەوێت، ئەویش سواری وشترەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو تاکو گەیشتە ئەبو بەکر لە(ذي الحليفة) کە ئەبو بەکری بینی، فەرمووی: بە فەرمانڕەوایی هاتووی یان فەرمانپێکراوی، فەرمووی:

---

١ بڕوانە: البداية والنهاية (٧/١٣٦).
٢ معين السيرة (٤٧٥).
٣ بڕوانە: السيرة النبوية (٢/٥٣٦)، دراسات في عهد النبوة (٢٢٢).
٤ بڕوانە: نضرة النعيم (١/٣٩٨)، الطبقات الكبرى (٢/١٦٨).
٥ بڕوانە: فتح الباري (٨/٨٢).

بەڵکو بە فەرمانپێکراوی، ئینجا ڕێیان کرد و، ئەبو بەکر دروشمەکانی حەجی وەکو سەردەمی جاهیلی بەڕێوە برد، حەجیش لە مانگی(ذي الحجة) بوو لەسەر ڕیوایەتی پەسەند، ئینجا صدیق وتاریدا بۆ موسڵمانان پێش ڕۆژی(التروية) و لە ڕۆژی(عرفة) و(نحر) و(نفر)ی یەکەم، خەڵکی فێری شێوازی کارەکان دەکرد، عەلی ش لە هەموو ئەم جێگایانە لەگەڵیدا بوو و، سەرەتای بەرائەی بۆ دەخوێندنەوە و، هاواری دەکرد بە چوار شت لە نێو خەڵکیدا: ئیماندار نەبێت کەس ناچێتە بەهەشتەوە، کەسی ڕووت نابێت بە دەوری کەعبەدا بسوڕێتەوە، هەر کەسێکیش پەیمانێکی هەیە لە نێوان خۆی و پێغەمبەر(ﷺ)دا پەیمانەکەی تاکو کۆتایی کاری پێدەکرێت، لە پاش ئەمساڵیش هیچ بتپەرستێك نابێت حەج بکات.[1]

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) ئەبو هورەیرەشی نارد(ﷺ) لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوەڵان بە مەبەستی یارمەتیدانی عەلی کوڕی ئەبوتالیب(ﷺ).[2]

دابەزینی سەرەتای سورەتی(البراءة) جیابوونەوەیەکی یەکجاری بوو لەگەڵ بتپەرستیدا، چونکە حەجکردنی قەدەغە کرد و جەنگی ڕاگەیاند لە دژیان.[3]

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١﴾ فَسِيحُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ ۙ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخْزِى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢﴾ وَأَذَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلنَّاسِ يَوْمَ ٱلْحَجِّ ٱلْأَكْبَرِ أَنَّ ٱللَّهَ بَرِىٓءٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ۙ وَرَسُولُهُۥ ۚ فَإِن تُبْتُمْ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾(التوبة: ١-٣).

مۆڵەتیشی دایە خاوەن پەیمانەکان تاکو کۆتایی کاتە دیاری کراوەکە:

﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْـًٔا وَلَمْ يُظَٰهِرُوا۟ عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّوٓا۟ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ﴾(التوبة: ٤).

---

١ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٦٢٥).
٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٥٣٧/٢).
٣ بڕوانە: نضرة النعيم (٣٩٩/١).

هەروەها مۆڵەتیشی دایە ئەوانە کە هەر پەیمانێکیان بەستووە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) تاکو تەواو بوونی مانگە قەدەغەکراوەکان، چونکە لە پاش ئەوە دەکەونە حاڵەتی جەنگەوە لەگەڵ موسڵمانان: ﴿ فَإِذَا انسَلَخَ الْأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾(التوبة: ٥).

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) داوای لە عەلی کرد هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکان ڕابگەیەنێت بە ئاشکرا، وەکو ڕەچاوکردن بوو بۆ ئەوەی لە ناو عەرەبدا باو بوو، کە سەرکەورەی هۆز یان کەسێك لە پیاوانی هۆزەکەی هەڵسن بەو کارە، ئەم ڕێ و ڕەسمەیش ناکۆك نییە لەگەڵ ئیسلامدا، ئەمەیش هۆکاری ناردنی پێغەمبەر(ﷺ) بوو بۆ ناردنی عەلی، نەك ئەوەی کە شیعەکان دەڵێن گوایە ئەوە ئاماژەیەك بووە بۆ مافدارتر بوونی عەلی بە خیلافەت، دکتۆر موحەممەد ئەبو شەهبە لەم بارەوە پەراوێزێکی نووسیوە و دەڵێت: نازانم شیعەکان چۆن بێئاگا بوونە لە وتەکەی ئەبو بەکر کاتێك فەرمووی:(أمیر ام مأمور)،[1] واتە: فەرمانڕەوای یان فەرمانپێکراوی؟ ئینجا چۆن فەرمانپێکراو مافدارتر دەبێت لە فەرمانڕەوا.

ئەم حەجەیش لە ڕاستیدا وەکو پێشەکی وابوو بۆ حەجی گەورە(حەجیماڵئاوایی)[2] حەجەکەی ئەبو بەکر بە ئاشکرایی ڕایگەیاند کە سەردەمی بتپەرستی ڕۆیشت و نەما، قۆناغێکی نوێیش دەستی پێکردووە، ئەوەندەش لەسەر خەڵکییە بێنە دەنگی شەرعی خوای گەورەوە، پاش ئەم جارە بە ناو هۆزە عەرەبەکاندا، دڵنیابوون لەوەی سەردەمی بتپەرستی تێپەڕیوو و بەسەرچوو، بۆیە نێردەکانیان بە دوای یەکدا دەنارد و دەهاتنە یەکتاپەرستیەوە.[3]

---

١ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٦٢٤).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٢/٥٤٠).

٣ بڕوانە: قراءة سياسية للسيرة النبوية (٢٨٣).

پێنجەم: لە پاش فەتحی مەککە و تەبوك و موسڵمان بوونی سەقیف و، دیاری کردنی چوار مانگ لە لایەن پێغەمبەر(ﷺ)ەوە بۆ هۆزە بتپەرستەکان بۆ ئەوەی چارەنووسی خۆیان دیاری بکەن پێش ئەوەی دەوڵەتی ئیسلامی بەجێهێنانی خۆی بەرامبەریان ڕابگەیەنێت، نێردەکانی عەرەب لە هەموو لایەکەوە دەهاتن و موسڵمان دەبوون،[١] هەندێ جیاوازیش هەیە دەربارەی مێژووی هاتن و ژمارەی ئەو نێردراوانە، هەندێ سەرچاوەی فەرموودەی مێژووی هاتنی هەندێکیان دەگەڕێننەوە بۆ پێش ساڵی نۆی کۆچی، لەوانەشە ئەو هۆکاری دیاری کردنی نێردەکان بێت لە لای هەندێ لە مێژوونووسانەوە کە دەگۆڕێ لە نێوان شەست بۆ سەد نێردە، لەوانەشە هەندێکیان تەنها باسی نێردە بەناوبانگەکانیان کردبێت.[٢]

(ابن سعد) زانیاری زۆری کۆکردووەتەوە دەربارەی ئەو نێردراوانە، ژیاننامەی زۆریشی لەو کەسانە باسکردووە کە لەو نێردراوانە بوونە، بەڵام سەنەدەکانی هەندێ جار جێگای ڕەخنەگرتنە، هەندێکیشی بەهێزن،[٣] بێگومان هەموو ئەو زانیاریانەی مێژوونوسەکان باسیان کردووە دەربارەی ئەو نێردانە ڕاست نین، بەڵام زۆریشی جێگیر و ڕاستن،[٤] بوخاری هەندێ زانیاری باس کردووە دەربارەی نێردەی بەنی تەمیم و هەندێ نێردەی تر وەکو(عبدالقیس) و(بني حنیفة) و نێردەکانی(نجران) و(دوس) و ئەشعەری و یەمەنییەکان، زانیاری زیاتریش لەم بارەوە هاتووە لە کتێبەکانی تری مێژوودا، بە هەمان شێوە موسلیم و خاوەن کتێبەکانی تر لە فەرموودە زانیاری زۆریان هێناوە دەربارەیان.[٥]

لە ڕاستیدا هەواڵی ئەو نێردراوانە لە ئەوپەڕی گرنگیدایە، بۆیە پێویستیەکی زۆر هەیە بە توێژینەوەی ئەو هەواڵانە،[٦] سەروەتێکی گەورەیان تێدایە لە زانست و

---

١ سەرچاوەی پێشوو (٢٨٤).

٢ بڕوانە: نضرة النعیم (١/٣٩٦).

٣ بڕوانە: نضرة النعیم (١/٣٩٧).

٤ بڕوانە: السیرة النبویة الصحیحة (٢/٥٤٢).

٥ البخاري، کتاب المغازي (٤٣٦٥، ٤٣٦٨، ٤٣٧٢، ٤٣٩٢)، البدایة والنهایة (٥/٤٠-٩٨)، نضرة النعیم (١/٣٩٨).

٦ الاساس في السنة (٢/١٠١٤)، السیرة النبویة الصحیحة (٢/٥٤٤).

پەوەردە و دووربینی و... بە شێوەیەك لە هەموو سەردەمێکدا دەگونجێت بکرێتە بنەمایەك بۆ موسڵمانان، جگە لە زۆرێکی تر لە دیاردەکانی مەزنی لە هەموو بوارەکاندا.[1]

ساڵی نۆی کۆچی جیاواز بوو لە ساڵەکانی تر بە هاتنی نێردەکان، دەوڵەتی ئیسلامیش جێگا و شوێنی گونجاوی بۆ ئەو مەبەستە ئامادە کردبوو، وەکو(دار الضیافة) میوانخانە و،[2] مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) جێگایەك بوو بۆ پێشوازی کردن، جگە لە میواندارێتی هەندێك لە هاوەڵان بەو نێردراوانە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) گرنگی زۆری دەدا بەو نێردراوانە، ئەوانیش پەرۆش بوون بۆ فێربوونی ئیسلام و جێبەجێکردنی و، پرسیاری زۆریشیان دەکرد، پێغەمبەریش(ﷺ) وەڵامی دەدانەوە و کەسی شارەزای دەنارده لایان بۆ فێرکردنیان و، قورئان پێ لەبەر کردنیان و پێی دەفەرموون:((فقهوا اخوانکم))،[3] واتە: براکانتان فێر بکەن.

کاتێك دەگەڕانەوە بۆ شارەکانی خۆیان پێغەمبەر(ﷺ) ڕاسپاردەی پێ دەکردن بە پەیوەست بوون بە هەق و ڕاستی و ئارام گرتن، ئینجا خەڵاتی چاکی دەکردن وەکو یەك، ئەوانیش کە دەگەڕانەوە دەبوونە بانگخواز و ڕێنیشاندەر، باسی ئەوەیان بۆ دەکردن کە فێربوونە و بینیویانە لە حاڵی هاوەڵان و براەتی نێوانیان، لە پێش ئەوەیش باسی چاکە و ڕەوشت و ڕووخۆشی پێغەمبەر(ﷺ)یان دەکرد،[4] هەندێ لەو نێردانەیش بە باشیان زانی هەر لەسەر گاوری خۆیان بمێننەوە و سەرانە بدەن، ئێستایش باسی هەندێك لەو نێردانە دەکەین:

**أ- نێردەی( عبدقیس ):**

ئیبنو عەبباس باسیان دەکات و دەفەرمووێت: نێردەی ئەوان هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێی فەرموون: کێن هاتوون، یان کێن ئەو کەسانە؟ ئەوانیش وتیان: ڕەبیعە، فەرمووی: بەخێر بێن ئەو کەسانە، دوور بن لە شەرمەزاری و

---

١ بڕوانە: الاساس في السنة (١٠١٤/٢).

٢ بڕوانە: المدینة النبویة فجر الاسلام والعصر الراشدي، محمد شراب (٤٠٠/٢).

٣ بڕوانە: محمد رسول الله، الصادق عرجون (٥٢٠/٤).

٤ بڕوانە: محمد رسول الله، محمد الصادق عرجون (٥٢١/٤).

پەشیمانی، دەڵێت: وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە لە ڕێگەیەکی دوورەوە هاتوینەتە لات، لە نێوانیشماندا ئەو کۆمەڵە بێباوەڕەی(مضر) هەیە، ئێمەیش ناتوانین بێینە لات مەگەر لە مانگی قەدەغەکراودا نەبێت، بۆیە داوا دەکەین فەرمانێکی ڕوون و ئاشکرامان پێ بکە، ئەوانەی پاش خۆمانی لێ ئاگادار بکەین و، بە هۆیەوە بچینە بەهەشتەوە، ئەویش فەرمانی پێکردن بە چوار شت و، چوار شتیشی لێ قەدەغە کردن، فەرمانی پێ کردن بە باوەڕ هێنان بە خوای تاك و تەنیا، فەرمووی ئایا دەزانن باوەڕبوون مانای چییە؟ وتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی چاکتر دەزانن، فەرمووی: شایەتمان بهێنن و نوێژ بکەن و، زەکات بدەن و، ڕۆژوی ڕەمەزان بگرن و پێنج یەکی دەسکەوتەکانیش بدەن، هەروەها لێی قەدەغە کردن بەکارهێنانی کولەکەی وشك وەکو قاپ و، گۆزەی سەوز بۆ مەی و، قاپی سواقدراو بە زفت و، یان فەرمووی:(نقیر) داری چاڵکراو بۆ پاراستنی خورما و فەریکە خورما، یان بەقیر سواقدراو، فەرموویشی:((احفظوهن واخبروا بهن من وراءكم))[1] واتە: ئەمانە لەبەر بکەن و خەڵکانی دوای خۆتانی لێ ئاگادار بکەنەوە.

پێغەمبەر(ﷺ) بەو نێردەیەی سەرقاڵ بوو و، نوێژی سوننەتی دوای نیوەڕۆی نەکرد و لە دوای نوێژی(عصر) کردی.

**ب- نێردەی(ضمامة بن ثعلبة ) لە جیاتی(بنی سعد بن بكر ):**

ئەنەسی کوڕی مالیك(ﷺ) دەفەرموێت: لە کاتێکدا ئێمە دانیشتبووین لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لە مزگەوتدا پیاوێك بەسەر وشترێکەوە هات، ئینجا دابەزی و وشترەکەی بەستەوە و وتی: کامتان موحەممەدە — پێغەمبەر(ﷺ) شانی دادابوو — وتمان: ئەو پیاوە سپییە کە شانی داداوە، پیاوەکە وتی: کوڕی عەبدولموتەلیب، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: وەڵامتم دایەوە، پیاوەکە وتی: چەند پرسیارێکت بە توندی لێ دەکەم، با هیچ لە دڵت دروست نەبێت بەرامبەرم، فەرمووی: پرسیار بکە دەربارەی هەرچی حەز دەکەیت.

---

١ البخاري، كتاب الايمان رقم (٥٣).

وتی: سوێندت دەدەم بە خوای خۆت و ئەوانەی پێش خۆت، ئایا خوای گەورە تۆی ڕەوانە کردوە بۆ سەرتاپای خەڵکی؟ فەرمووی: بەڵێ.

وتی: سوێندت دەدەم بە خوا، ئایا خوا فەرمانی پێکردی لە شەو و ڕۆژێکدا ئەو پێنج نوێژە بکەین؟ فەرمووی: بەڵێ.

وتی: سوێندت دەدەم بە خوا، خوا فەرمانی پێکردووی ڕۆژووی ئەو مانگە بگرین لە ساڵێکدا؟ فەرمووی: بەڵێ.

وتی: سوێندت دەدەم بە خوا، ئایا خوا فەرمانی پێکردووی ئەم زەکاتە لە دەوڵەمەندەکانمان وەربگریت و دابەشی بکەیتە سەر هەژارەکانماندا؟ فەرمووی: بەڵێ.

پیاوەکە وتی: باوەڕم هێنا بەوەی پێی ڕەوانە کراوی،منیش ڕەوانەکراوی خزم و کەس و کارەکانم، من(ضمام)ی کوڕی(ثعلبة)م لە هۆزی سەعدی کوڕی بەکر.

لە ڕیوایەتێکی تریشدا هاتووە کە گەڕاوەتەوە لای کەسەکانی خۆی و، قسەی بە لات و عوززا وتووە، ئەوانیش وتوویانە: دەمت داخە با تووشی گەڕی و بەڵەك و شێتی نەبی، وتی: هاوار لە ئێوە، بە خوا ئەوان هیچ سوود و زیانێکیان نییە، خوای گەورە پێغەمبەرێکی ناردووە و قورئانێکی بەسەریدا داگرتووە ڕزگارتان دەکات لەوەی ئێوە تێیدان، منیش شایەتی دەدەم بە تاك و تەنیایی خوا و پێغەمبەرایەتی موحەممەد، من لە لای ئەو پێغەمبەرەوە هاتوومەتە لاتان، ئیتر لەو ڕۆژە هەموویان موسڵمان بوون، ئیبنو عەبباس دەفەرموێت: بە هیچ شێوەیەك نەبیستووە نێردەی هیچ هۆزێك ئەوەندەی(ضمام)ی کوڕی(ثعلبة) چاك بێت.

بەسەرهاتەکەیش بەڵگەیە لەسەر بڵاوبوونەوەی ڕێنماییەکانی ئیسلام لە نێو هۆزە عەرەبەکاندا، تەنانەت(ضمام) کە هات پرسیاری نەکرد دەربارەیان، بەڵکو تەنها ویستی دڵنیا بێت لێیان، کە وا دیارە پێش هاتنی ئەو شتانەی زانییوە.[1]

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٦٥٠).

**ج- نێردەی گاورەکانی نەجران:**

پێغەمبەر(ﷺ) نووسراوێکی ناردبوو بۆ نەجران،[١] تیایدا هاتبوو کە بانگتان دەکەم بۆ پەرستنی خوای گەورە لە جیاتی پەرستنی بەندەکان، بانگتان دەکەم بۆ دەسەڵاتی خوا لە جیاتی دەسەڵاتی بەندەکان، ئەگەریش ڕازی نابن، سەرانە بدەن،ئەگەر بەوەش ڕازی نەبوون جەنگتان لەگەڵ دەکەم و، سڵاوتان لێ بێت.[٢]

کاتێك نووسراوەکە گەیشتە قەشەکەیان، خەڵکی کۆکردەوە و بۆی خوێندنەوە، ئەوانیش بڕیاریان دا چواردە کەس لە ناودارەکانیان بنێرن، دەشڵێن شەست کەس بوونە، هاتنە لای پێغەمبەر(ﷺ) بە پۆشاکی ئاوریشم و ئاڵتوونیان لە دەستدا بوو، ئینجا ڕووە و ڕۆژهەڵات دەستیان کردە نوێژ کردن لە مزگەوتەکەدا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی لێیان گەڕێن، ئینجا هاتنە لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش ڕووی لێ وەرگێڕان، عوسمان پێی فەرموون:

بە بۆنەی ئەو پۆشاکەتانەوە، ئیتر ئەو ڕۆژە ڕۆیشتن و سبەی بە پۆشاکی قەشەییەوە هاتن و سڵاویان کرد، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامی دانەوە و، بانگی کردن بۆ ئیسلام، ئەوانیش ڕازی نەبوون و، وتیان: ئێمە لە پێش ئێوە موسڵمان بووین، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: سێ شت ڕێگرە لەوەی موسڵمان بن: پەرستنتان بۆ خاچ، خواردنتان بۆ گۆشتی بەراز، بانگەشەتان بۆ ئەوەی گوایە خوای گەورە کوڕی هەیە،[٣] ئینجا مشت و مڕ زۆربوو لە نێوان هەردوولا و، پێغەمبەر(ﷺ) قسەکانی بە قورئان پوچەڵ دەکردنەوە، ئەوان دەیانووت: بۆچی جنێو بە عیسا دەدەیت و دەڵێیت بەندەی خوایە، فەرمووی: بەڵێ بەندەی خوایە و پێغەمبەریشە و وشەیەکیشە خوا داویەتی بە مەریەمی بێ نیاز لە پیاوان، ئەوانیش تووڕە بوون و وتیان: ئایا هەرگیز کەسێکت بینیوە بەبێ باوك، ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ۝٥٩ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْمُمْتَرِينَ﴾(ال عمران: ٥٩-٦٠).

---

١ نەجران: شارێکی گەورەیە حەوت قۆناغ لە مەککەوە دوورە بە لای یەمەندا.

٢ بڕوانە: البداية والنهاية (٥/٤٨).

٣ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٢/٥٤٧).

ئەوەیش بەڵگەیەکی کپکەرەوە بوو بۆیان،[١] ئینجا کاتێك بەڵگەهێنانەوە سوودی نەما لەگەڵیان، بانگی کردن بۆ موباهەلە، لەبەر فەرموودەی خوای گەورە: ﴿فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا۟ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَـٰذِبِينَ﴾(ال عمران: ٦١).

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوو لەگەڵ حەسەن و حوسەین و فاتیمە و، فەرمووی: کە من پاڕامەوە ئێوە بڵێن ئامین،[٢] بەڵام ئەوان لە نێو خۆیاندا هەندێ پرس و ڕایان کرد و لە خۆیان ترسان، چونکە دڵنیان کە موحەممەد بە ڕاستەوە پێغەمبەرە، هەر کەسانێکیش دوعا لە دژ پێغەمبەرێك بکەن تیا دەچن، وتیان: ئێمە قسە بە تۆ ناکەین، هەرچی حوکمێك دەدەیتە سەرمان قایلین، بۆیە ڕێککەوت لەگەڵیان لەسەر دوو هەزار پۆشاك، هەزاری لە ڕەجەب و هەزاری لە صەفەر،[٣] کە هاتن بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان داوایان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) کەسێکی دەست پاکیان لەگەڵدا بنێرێت بۆ وەرگرتنی ماڵی ڕێککەوتنەکە، پێغەمبەریش(ﷺ) تەماشای هاوەڵانی کرد و فەرمووی:((لأبعثن معكم رجلاً اميناً حق امين))، واتە: دەبێت کەسێکتان لەگەڵدا بنێرم بە ڕاستی دەست پاك و دڵسۆزە، ئینجا فەرمووی: هەستە ئەی ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح، کە هەڵسا وتی: تۆ دەست پاکی ئەم ئوممەتەی.[٤]

شەشەم: نێردەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ فێرکردنی بنەماکانی ئیسلام و ڕێکخستنی کاروباری کارگێڕی و دارایی:

نێردەکان بە دوای یەکدا بۆ مەدینە دەهاتن و موسڵمان دەبوون، پێغەمبەریش(ﷺ) هاوەڵانی دەنارد بۆ فێرکردنیان بە هەموو لایەکدا و، گرنگی دایە باشووری دورگە، بە مەبەستی فێرکردنی بنەماکانی ئیسلام بۆ هۆزەکانی یەمەن،

---

١ بڕوانە: زاد المعاد (٣/٦٣٣)، السيرة النبوية لابي شهبة (٢/٥٤٧).
٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٢/٥٤٧).
٣ هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.
٤ البخاري، كتاب فضائل الصحابة رقم (٣٧٤٥).

چونکە ئیسلام بە تەواوی بڵاوبوویەوە و، پێویستی زۆر بوو بەوەی مامۆستا و بانگخواز ڕاستیەکانی ئیسلام باس بکەن،[1] هۆزی(الحارث بن کعب) قایل نەبوون بەوەی بێنە ناو ئیسلامەوە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) خالیدی کوڕی وەلیدی نارد لە سەرووی پۆلێکی بانگخوازی جیهادیەوە.

**أ- ڕەوانەکردنی خالید بۆ لای(بني الحارث بن كعب)(١٠) ك:**

ئەو هۆزە نیشتەجێی لای نەجران بوون و کەسیان بە ئیسلام ڕازی نەبوون، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) خالیدی ناردە لایان لە(ربیع الاخر) یان(جمادی) ساڵی دەی کۆچی، فەرمانیشی پێکرد بانگیان بکات بۆ ئیسلام سێ جار پێش ئەوەی شەڕیان لەگەڵ بکات، بەڵام کاتێك خالید گەیشتە ئەوێ بانگی کردن بۆ ئیسلام و هەموویان موسڵمان بوون، خالیدیش لە ناویاندا مایەوە بۆ ئەوەی فێری ئیسلامیان بکات، ئینجا نامەیەکی نووسی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و ئەو هەواڵەی پێی گەیاند، وەڵامی نامەکەش هاتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) داوا دەکات خالید بگەڕێتەوە بۆ مەدینە لەگەڵ نێردەیەك لە ئەوانیش، کاتێك هاتن(قیس بن الحصین)ی کردە سەرکردەیان، هەروەها(عمرو بن حزم)یشی نارد بۆ فێرکردنیان.[2]

پێغەمبەر(ﷺ) مەبەستی بوو هۆزەکانی باشوور موسڵمان بن، ئەو بایەخدانەش دەرکەوت لەو ئەنجامە ڕۆشنەی کە بانگەواز بەدیهێنا و، لەو هەموو نێردانەی دەوروبەری یەمەنەوە بۆ مەدینە، ئەوەیش ئاماژە دەکات بۆ چالاکی ئەو کەسانەی دەنێردران بۆ ئەو جێگایانە، ئینجا پۆلە سەربازییەکانی پێغەمبەریش(ﷺ) پاڵپشتی ئەو بانگەوازە ئاشتی خوازانەیان دەکرد، چونکە لە پاش ڕەوانەکردنی خالیدی کوڕی وەلید عەلی کوڕی ئەبو تالیبیش بە دوایدا ڕۆیشت.[3]

ئەو بەڵگەنامانەی کە پێغەمبەر(ﷺ) مۆری کرد لەگەڵ هۆزەکانی یەمەن و حەزرەمەوتدا ژمارەیەکی زۆر بوون و،(محمد حمید الله) ڕەحمەتی خوای لێ بێت

---

١ فقه السيرة للبوطي (٣٣٢).
٢ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٢٥٠/٤).
٣ بڕوانە: الفقه السياسي للوثائق النبوية (٢٣١).

باسی کردووە لە کتێبەکەی(مجموعة الوثائق السیاسیة).[١]

جەختکردن لەسەر مەڵبەندی هێزەکان و کارتێکردن لە کۆمەڵگا و بونیاتنانی دەوڵەت، ڕێبازێکی پێغەمبەر(ﷺ) بوو هەمیشە سوور بوو لەسەر بەجێهێنانی لە ژیانیدا.

**ب- ناردنی موعازی کوڕی جەبەل و ئەبو موسای ئەشعەری(ڕەزای خوایان لێ بێت) بۆ یەمەن:**

١- پێغەمبەری خوا(ﷺ) موعازی کوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەن، کە شارەزاترینی هاوەڵان بوو لە زانینی حەڵاڵ و حەرامدا، وەکو دادوەر و مامۆستا و فەرمانڕەوا و، زەکات وەرگر، لەسەر یەکێ لە هەردوو هەرێمەکە بوو.

پێغەمبەر(ﷺ) خۆی موعازی بەڕێخست و ڕاسپاردەی پێکرد، موعاز لەسەر وڵاخەکەی بوو، پێغەمبەریش(ﷺ) ڕێی دەکرد لە خوارەوە، ڕاسپاردەی زۆری پێکرد و نەخشەیەك و ڕێڕەوێکی بانگەوازی مەزنی بۆ دارشت، پێی فەرموو: تۆ دەچیتە لای کەسانێکی ئەهلی کتاب، کە گەیشتیتە لایان بانگیان بکە باوەڕبهێنن بە خوای تاك و تەنیا و، پێغەمبەرایەتی موحەممەد، ئەگەر لەوە گوێڕایەڵ بوون، ئاگاداریان بکە کە خوای گەورە پێنج نوێژی لەسەریان فەرز کردووە لە شەو و ڕۆژێکدا، ئەگەر گوێڕایەڵ بوون بۆ ئەوە ئاگاداریان بکە کە خوای گەورە زەکاتی لەسەریان فەرز کردووە لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیردرێت و بۆ هەژارەکانیان دەگەڕێتەوە، ئەگەر گوێڕایەڵ بوون بۆ ئەوە، نەکەی ماڵە خۆشەویستەکانیان وەربگریت بۆ زەکات، خۆتیش بپارێزە لە نزای ستەملێکراو، چونکە لە نێوان ئەو و خوای گەورە پەردە نییە،[٢] ئەم فەرموودەیە بانگخوازان فێری کارکردن دەکات پلە بە پلە، سەرەتایش بانگەواز بۆ چەسپاندنی بیروباوەڕ دەبێت، دوای ئەوە بانگەواز دەکرێت بۆ جێبەجێ کردنی پایەکانی ئیسلام بە شێوەیەکی کردەیی، ئینجا فەرمان کردن بە ئەنجامدانی واجبەکان و دوورکەوتنەو لە قەدەغەکراوەکان، بەو شێوە

---

١ بڕوانە: الوثائق السیاسیة، حمیدالله رقم (١١١ ص ٢٣٠).

٢ البخاري، کتاب المغازي رقم (٤٣٤٧).

خەڵکی ئەرکەکانی ئیسلام کە لەوەشە نەگونجاو بێت لەگەڵ ئارەزووەکانیاندا قبووڵ دەکەن.[١]

ئەمە ڕێبازی پێغەمبەر(ﷺ)ە، بانگخوازانیش لە هەموو سەردەمێکدا پێویستیان بەوە هەیە ڕەچاوی بکەن و لێی حاڵی بن، پاش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ڕاسپاردەکانی تەواو کرد بۆ موعاز، پێی فەرموو:((يا معاذ، انك عسى ان لا تلقاني بعد عامي هذا، ولعلك ان تمر بمسجدي هذا وقبري))،[٢] واتە: ئەی موعاز لەوانەیە پاش ئەمساڵ ئیتر من نەبینی، لەوانەشە بە لای ئەم مزگەوتە و گۆڕەکەمدا تێپەڕی، ئیتر موعاز دەستی کردە گریان، لە ترسی دابڕان لە پێغەمبەری خوا(ﷺ)، هەر بەو شێوەیش بوو، چونکە موعاز نەگەڕایەوە بۆ مەدینە پاش لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەر(ﷺ) نەبێت.[٣]

٢- پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسا بە ناردنی ئەبو موسای ئەشعەری و، موعازی کوڕی جەبەل هەریەکە و لەسەر لایەك بوون لە یەمەن، چونکە یەمەن دوو بەش بوو، پێیانیشی فەرموو:(يسرا ولا تعسرا، بشرا ولا تنفرا)[٤] واتە: ئاسانکار بن و کار گران مەکەنەوە، مژدەدەر بن و خەڵکی مەورووژێنن، ئەوەیشە ڕێبازی پێغەمبەر(ﷺ) لە ئاسانکردنەوەی کار و مژدەدان و قەدەغەکردنی خەڵك دوورخستنەوە.[٥]

**ج- ڕێکخستنی کاروباری کارگێڕی و دارایی:**

ڕێکخستن بەشێکە لە ئایین، بەشداریشە لە هەموو کاروبارەکانی، چونکە شتە پەرتەوازەکان کۆدەکاتەوە، ئامانج و مەبەستیشی پێ جێبەجێ دەکرێت، ئیسلامیش هەر لە سەرەتاوە ڕێکخستنی پێوە دیار بوو، بۆ نموونە پێغەمبەر(ﷺ) کە لە مەدینە دەردەچوو کەسێکی دەکردە جێنشینی خۆی، هەموو جارێکیش ناوچەیەکی فەتح دەکرد کەسێکی دەکردە فەرمانڕەوای، ئەو نێردانەیش دەهاتنە

---

١ بڕوانە: التاريخ الاسلامي (١٨٧/٨).
٢ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٦٥٤).
٣ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٥٥٩/٢).
٤ البخاري، كتاب المغازي، رقم (٤٣٤٢).
٥ بڕوانە: التاريخ الاسلامي (١٨٦/٨).

مەدینە بۆ فێرکردنیان، ئینجا بەرپرسەکانی لە پیاوچاکان و زانا و دینداران هەڵدەبژارد، هەروەها لە خاوەن کەسایەتییە بەهێزەکان... هەندێ جاریش هەمان فەرمانڕەوای لەسەر ناوچەکە جێگیر دەکرد، لەوانە(باذان)ی کوڕی سامانی کوڕی بەهرام، کە پێغەمبەر(ﷺ) هێشتیەوە لەسەر یەمەن پاش موسڵمان بوونی، پاش مردنی ئەو پیاوەیش پێغەمبەر(ﷺ) کارەکانی دابەش کردە سەر کۆمەڵێك لە هاوەڵان،(شمر بن باذان)ی خستە سەر(صنعاء)، ئەبو موسای ئەشعەری خستە سەر(مأرب)،(یعلی بن امیة)ی خستە سەر جەنەد و، هاوەڵە شیاوەکانی تریشی دەخستە سەر فەرمانڕەوایەتی شار و شوێنەکان.

ئینجا لێپرسینەوەی دەکرد لەگەڵ بەرپرسانی شوێنەکان، لەسەر بنەمای داهات و خەرجکراو، بۆ هەندێ لە بەرپرسەکانیش موچەی دیاری کردبوو، وەکو عەتتابی کوڕی ئوسەید فەرمانڕەوای مەککە، هەموو ڕۆژێك درهەمێکی بۆ دەستنیشان کردبوو، هەروەها پارچە زەویەکیشی تەرخان کردبوو بۆ قەیسی کوڕی مالیك، موچەی بەرپرسەکانیشی دەگۆڕا بە پێی بارودۆخ و نەگۆڕ نەبوو،[1] ئەوانەش پێویستیە سەرەکیەکان بوو بۆ بەرپرسی موسڵمانان بۆ ئەوەی ڕێگە بگرێت لە بەرتیل خواردن، ئەمەیش بنچینەیەکی یاساییە ئیسلام هێناویەتی پێش ئەوەی یاسا دانراوەکان لە سەردەمی نوێدا جێگیری بکەن، ئەویش بریتیە لەوەی: دیاری بۆ فەرمانڕەوا بەرتیلێکی ڕاشکاوە.[2]

---

١ بڕوانە: ابن خلدون: العبر (٢/٥٩)، السيرة النبوية لابن هشام (٤/١٥٣)، الدولة العربية الاسلامية، منصور الحرابي (٤٤).

٢ بڕوانە: الدولة العربية الاسلامية (٤٤).

## باسی حەوتەم: حەجی ماڵئاوایی(١٠ ك)

حەج یەکێکە لە پێنج پایەکانی ئیسلام، لە ساڵی دەی کۆچی فەرز کرا، وەکو ئیبنولقەییم وتوویەتی و، هەندێ بەڵگەی بەهێزیشی هێناوە لەسەر ئەو قەسەیەی، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرز دوا ناخات، وەکو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا﴾(ال عمران: ٩٧). ئەم ئایەتەیش لە ساڵی نێردراوەکاندا(عام الوفود) دابەزی.[1]

پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەجی نەکردووە لە مەدینەوە جگە لەو حەجەی لە ساڵی دەی کۆچی ئەنجامیداوە و، بە(حجة البلاغ) و(حجة الاسلام) و(حجة الوداع) ناسراوە، خواحافیزی لە خەڵك کرد و، جارێکی تر حەجی نەکردەوە، حەجی ڕاگەیاندن بوو، چونکە شەرعی خوای تیادا ڕاگەیاند بە گوفتار و کردار، جگە لە حەجیش هیچ نەمابوو ڕوونی نەکردبێتەوە بۆ موسڵمانان، بە تەواوبوونی حەجەکەش، خوای گەورە لە عەرەفە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ﴾(المائدة: ٣).

کاتێك هەندێ لە هاوەڵان دەستیان کردە گریان، یەکێ لەوانەیش عومەری کوڕی خەتتاب بوو(ﷺ)، وەکو چۆن لێی تێگەیشتبێتن ئاماژە بێت بۆ نزیکبوونەوەی مردنی پێغەمبەر(ﷺ)، کاتێکیش بە سەرگەورەمان عومەر وترا: بۆچی دەگریت؟ فەرمووی: لە پاش تەواو بوون کەم بوونەوە دێت،[2] لەو کاتەیش ژمارەی ئەوانەی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوون زیاتر لە سەد هەزار کەس دەبوون.

---

١ بروانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٦٨٠)، زاد المعاد (٣/٥٩٥).

٢ بروانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٢/٥٧٥).

## یەکەم: چۆنیەتی حەجکردنی پێغەمبەر(ﷺ).

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) نیازی حەجی کرد، خەڵکیشی ئاگادارکردەوە کە نیازی حەجی هەیە، خۆیان ئامادەکرد لە مانگی(ذي القعدة)ی ساڵی دەی کۆچی، دەوروبەری مەدینەیش ئاگاداربوونەوە، ئەوانیش هاتن بە مەبەستی حەجکردن لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)، لە ڕێگەیش خەڵکانێکی زۆر و بێ شومار پێی گەیشتن، بە هەموو لایەکی پێغەمبەر(ﷺ) ڕێیان دەکرد، بە درێژایی بینینی چاو، دەرچوونیشی لە مەدینە بە ڕۆژ بوو، لە پاش نیوەڕۆی ڕۆژی شەممەی، پێنج ڕۆژ پێش تەواوبوونی مانگی(ذي القعدة) پاش ئەوەی چوار ڕکات نوێژی نیوەڕۆی کرد.[1]

پێش ئەوەیش لە وتارێکدا فێری ئیحرام و واجب و سوننەتەکانی کردن و، ئینجا ڕێی دەکرد و دەیفەرموو:(لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك، ان الحمد والنعمة لك والملك لا شريك لك)،[2] خەڵکیش لەگەڵیدا زیادیان دەکرد و کەمیان دەکرد و، ئەویش نکوڵی لێ نەدەکردن و، ئینجا گەیشتە(العرج) و(الابواء) و، دۆڵی عوسفان و تاکو گەیشتنە(ذي طوى) و، ئەو شەو لەوێ مانەوە، نوێژی بەیانیشی لەوێ کرد، ئینجا خۆی شۆرد و، هەڵسا بەرەو مەککە و، لە سەرەوە بەڕۆژ چووە ژوورەوە، ئینجا چووە مزگەوتەکە لە کاتی چێشتەنگاو و،[3] دەستی دایە ڕوکن و،[4] سێ جار بە پەلە تەوافی کرد و، چوار جاریشی بە ڕێکردنی ئاسایی، ئینجا چووە لای مەقامی ئیبراهیم و ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ۖ وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَـٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ﴾(البقرة: ١٢٥). مەقامەکەی خستە نێوان خۆی و کەعبەوە، لە دوو ڕکاتەکەشدا(قل هو الله احد) و(قا يايها الكافرون)ی دەخوێند، ئینجا گەڕایەوە لای ڕوکنەکە و دەستی پێوەدا، ئینجا لە دەرگاکەوە چووە لای صەفا، کاتێك نزیك

---

١ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٦٦٤)، السيرة النبوية للندوي (٣٨٦).

٢ البخاري، كتاب الحج، باب التلبية (١٥٤٥).

٣ بڕوانە: السيرة النبوية للندوي (٣٨٧).

٤ مسلم، كتاب الحج، باب حج النبي (ﷺ) (١٢٢٧).

بوویەوە، ئەم ئایەتەی دەخوێند: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ فَمَنۡ حَجَّ ٱلۡبَيۡتَ أَوِ ٱعۡتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَاۚ وَمَن تَطَوَّعَ خَيۡرٗا فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ﴾(البقرة: ١٥٨).

ئینجا چووە سەر صەفا تاکو کەعبەی لێوە دیار بوو، ئیتر ڕووی تێکرد و فەرمووی:(لا اله الا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير، لا اله الا الله وحده، انجز وعده، ونصر عبده، وهزم الاحزاب وحده) ئینجا دوعای کرد و سێ جار ئەو وێردەی دووبارە کردەوە، ئینجا دابەزی بۆ مەروە، کە لێژبوویەوە بەرەو دۆڵەکە خێرابوویەوە، کە بەرەو ژووریش بوویەوە ڕۆیشتە مەروە، ئەوەی لەسەر صەفا کردی لە مەروەش کردی، لە سوڕانەوەی کۆتاییشدا فەرمووی: ئەگەر ئەو کارەی کردم ئەنجامم نەدایە قوربانیم لەگەڵ خۆم دەهێنا و، دەمکردە عومرە،جا ئەگەر هەر کەسێکتان قوربانی نەهێناوە،با پۆشاکی ئیحرامی بکاتەوە و، بیکات بە عومرە.[1]

ئینجا سوراقەی کوڕی مالیك هەڵسا و، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا تەنها بۆ ئەمساڵە، یان هەتا هەتایە، پێغەمبەر(ﷺ) پەنجەکانی بە یەکدا کرد و فەرمووی: عومرەم کردووە بە حەجدا، دوو جار ئەو قسەی کرد، بەڵکو هەتا هەتایە،[2] چوار ڕۆژ لە مەککە مایەوە: یەك شەممە و دوو شەممە و سێ شەممە و چوار شەممە. لە چێشتەنگاوی ڕۆژی پێنج شەممە، پێغەمبەر(ﷺ) خۆی و موسڵمانان بە ڕێکەوتن بۆ مینا، لەوێ دابەزین، نوێژی نێوەڕۆ و عەصری تیا کرد و، مەغریبو عیشا و بەیانی، ئینجا هەندێك ڕاوەستا تاکو خۆر هەڵات، ئینجا فەرمانی کرد خێوەتێکی بۆ دابنرێت لە نەمیرە،[3] ئینجا ڕێی دەکرد و، قورەیش گومانیان نەبوو کە لە لای(المشعر الحرام) ڕادەوەستێت، وەکو قورەیش دەیکرد لە سەردەمی جاهیلیدا، بەڵام لە موزدەلیفە تێپەڕبوو و نەوەستا، تاکو گەیشتە عەرەفە، بینی خێوەتەکەی

١ مسلم، كتاب الحج، باب حج النبي (ﷺ) (١٢١٨).

٢ مسلم، كتاب الحج، باب حج النبي (ﷺ) صحيح السيرة النبوية (٦٥٩).

٣ جێگایەکە لە لای عەرەفات و سەر بە عەرەفات نییە.

بۆ ئامادە کراوە لە نەمیرە و ڕۆیشتە ناوی، کە خۆر ئاوا بوو بەسەر(قصواء)ەوە، هاتە(بطن الوادي)،[١] ئینجا وتاری بۆ خەڵکی دا و، فەرمووی: خوێنتان و ماڵتان قەدەغەیە لەسەر یەکتر، وەکو قەدەغەبوونی ئەم ڕۆژەتان، لە ئەم مانگەتان، لە ئەم شوێنەتان، هەرچی شتێکیش لە سەردەمی نەفامیدا بووە لە ژێر پێم دایە، خوێنەکانی ئەو سەردەمە هەمووی بە فیڕۆ چووە، یەکەمین خوێنیش لەوانە خوێنی(ابن ربیعة بن الحارث)ە، لە ناو هۆزی(بنی بکر)دا بوو(هذیل) کوشتیان، سووی سەردەمی نەفامیش هەمووی پوچەڵە و، یەکەمین سوویش پوچەڵی دەکەمەوە سووی عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیبە، لە خوا بترسن دەربارەی ژنەکانتان، ئێوە بە وشەیەکی خوای گەورە ئەوانتان بۆ خۆتان حەڵاڵ کردووە، مافی ئێوە لەسەریانە کە کەسێك نەهێننە ماڵەکانتان بەبێ ڕەزامەندی خۆتان، ئەگەریش وایان کرد لێیان بدەن نەك لێدانێکی سەخت، مافی ئەوانیشە لەسەرتان ڕۆزی و پۆشاکیان بە چاکە بۆ دابین بکەن، ئینجا شتێکم لە ناو ئێوەدا بەجێهێشتووە ئەگەر دەستی پێوە بگرن گومڕا نابن، کیتابی خوا، ئێوەیش دەربارەی من پرسیارتان لێ دەکرێت، جا وەڵامتان چۆن دەبێت، وتیان: شایەتی دەدەین ئایینی خوات گەیاند و ئامۆژگاریت کرد، ئەویش پەنجەی بەرز کردەوە بەرەو ئاسمان و گەڕاندیەوە بەرەو خەڵکەکە و فەرمووی: خوایە شایەت بە، سێ جار،[٢] ئینجا بانگ درا و مایەوە و نوێژی نیوەڕۆی کرد، دوای ئەوە نوێژی عەصری کرد، نوێژیشی نەکرد لە نێوانیاندا، دوای ئەوە سوار بوو تا گەیشتە جێگای ڕاوەستان و... خەڵکەکەش لەبەر دەستی دا بوون و، ڕووی کردە قیبلە، تاکو خۆرئاوا هەر ڕاوەستابوو...(ابو الحسن الندوي) باسی کردوو، پێغەمبەر(ﷺ) پاش تەواوکردنی نوێژەکەی، پاڕایەوە و دەیفەرموو: خوایە تۆ گوێت لە قسەکانمە، جێگەکەشم دەبینی، نهێنی و ئاشکراشم دەزانی، هیچت لێ شاراوە نییە دەربارەی من، منی هەژاری داماو، هانام هێنا بۆ لای تۆ، لە ئەوپەڕی ترس و میهرەبانیدا،

---

١ (بطن عرنة) واتە دۆڵی عەرنە، کە لە خاکی عەرەفات دانانرێت بە لای زانایانەوە، تەنها پێشەوا مالیك نەبێت.

٢ بڕوانە: صحیح السیرة النبویة (٦٦١)، مسلم کتاب الحج (١٢١٨).

داندەنێم بە گوناهەکانمدا، پاڕانەوەی کەسێکی هەژار و گوناهبار لێت دەپاڕێمەوە بترسێت و ملکەچ بێت بۆت و چاو پڕ لە فرمێسك و گوێڕایەڵ بێت بۆ تۆ، بەبێ ئەوەی هیچ دەسەڵاتێکی هەبێت، خوایە لەم پاڕانەوەم کڵۆڵم مەکە، بە بەزەیی و میهرەبان بە لەگەڵم، ئەی باشترین لێپرسراو، ئەی باشترین بەخشندە.[1]

لەو شوێنەیشدا ئەم ئایەتەی لەسەر دابەزی: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا﴾(المائدة: ٣).

پاش خۆرئاوا لە عەرەفە هاتە خوارەوە و، ئوسامەی کوڕی زەیدی لە پشتی خۆیەوە سوار کردبوو، ئەوەندەیش سەری دانەواندبوو خەریك بوو لە کۆپانی وشترەکەی دەدا، دەیفەرموو: خەڵکینە لەسەرخۆ بن،[2] تاکو گەیشتە موزدەلیفەیش هەر تەلبیەی دەکرد، ئینجا فەرمانی کرد بانگدەر بانگ بدات و ئیقامە کراو نوێژی شێوانی کرد پێش ئەوەی موسڵمانان دابەزن و وشترەکان بێنە سەر ئەژنۆ، لە پاش ئەوەش فەرمانی کرد قامەت کرا و نوێژی خەوتنانیشیان کرد، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) خەوت تاکو بەیانی، نوێژی بەیانیشی لە سەرەتای کاتی خۆی کرد، ئینجا سوار بوو تاکو هاتە(المشعر الحرام) و، ڕووی کرد لە قیبلە و، دەستی کردە نزا و پاڕانەوە و وێرد، تاکو تەواو دونیا ڕۆشن بوویەوە پێش ئەوەی خۆر هەڵبێت، ئینجا لە موزدەلیفەوە بەڕێکەوت و(الفضل بن عباس)ی لەگەڵ خۆی سوار کردبوو، لە ڕێگەشدا هەر دەیووت:(لبيك اللهم لبيك) ئینجا فەرمانی کرد بە ئیبنو عەبباس حەوت بەردەکەی بۆ کۆبکاتەوە، کاتێك گەشتە(بطن محسر) وشترەکەی خێرا کردەوە،[3] چونکە سزاکە لەو شوێنەدا نێردرا بۆ فیلەکان، تاکو گەیشتە(منى) و، هاتە لای(جمرة العقبة)، بێ ئەوەی دابەزێت بەردەکانی هاویشت لە دوای هەڵاتنی خۆر و ئیتر وازی هێنا لە تەلبیەکردن،[4] ئینجا گەڕایەوە بۆ(منى) و، وتارێکی کاریگەری پێشکەش کردە خەڵکی، تیایدا باسی ڕێز و حورمەتی ڕۆژی قوربانی کرد

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية للندوي (٣٨٩).
٢ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٦٦٢).
٣ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٦٦٢)، السيرة النبوية للندوي (٣٨٩).
٤ بڕوانە: السيرة النبوية للندوي (٣٨٩).

و، حورمەتی مەککەیش بە گشتی، فەرمانیشی کرد گوێڕایەڵ بن بۆ ئەو کەسەی بە قورئان بەڕێوەیان دەبات و فەرمانی کرد خەڵکی لە پاش خۆی هەڵنەگەڕێنەوە لە ئیسلام و لە گەردنی یەکتر نەدەن، فەرمانیشی کرد قسەکانی بگەیەنن....[١]

ئینجا ڕۆیشت بۆ جێگای سەربڕینی قوربانییەکان و بە دەستی خۆی شەست و سێ وشتری سەربڕی، کە بریتی بوون لە ژمارەی ساڵەکانی تەمەنی، ئینجا وازی هێنا و فەرمانی کرد بە عەلی سەدەکە تەواو بکات، لە پاش ئەوە بانگی سەرتاشەکەی کرد و سەری تاشی و قژەکەی دابەشکردە سەر ئەوانەی نزیکی بوون، ئینجا گەڕایەوە بۆ مەککە، و تەوافی(إفاضة)ی کرد و، نوێژی نیوەڕۆی کرد لە مەککە، هاتە لای بەنی عەبدولموتەلیب کە ئاویان هەڵدەگۆزی لە زەمزەم و پێی فەرموون:

ئەی نەوەی عەبدولموتەلیب، ئەگەر ترسی ئەوەم نەبوایە خەڵکی زاڵ ببنە سەرتان لەو کارەتان منیش لەگەڵتان دەبووم، ئینجا دۆڵکەیەك ئاویان پێدا و، ئەویش لێی خوارد،[٢] ئینجا گەڕایەوە بۆ(منی) لەو ڕۆژە و لەوێ مایەوە، بە بەیانیدا چاوەڕوانی ئەوەی کرد خۆر بگاتە ناوەڕاستی ئاسمان، لەو کاتە ڕۆیشت بۆ لای جەمرەکان و لە یەکەم و ناوەڕاستەوە دەستی پێکرد و، ئینجا جەمرەی سێیەم کە جەمرەی عەقەبەی پێ دەوترێت و دوو وتاریشی ئاراستەی خەڵکەکە کرد، لە ڕۆژی کوشتار و ڕۆژی دوای ئەوە،[٣] ئەوانیش دووبارە کردنەوە بوو بۆ هەندێ لەو واتایانەی لە وتارەکانی پێشوویدا هاتبوو، ئەوەیش مەسەلەیەکی مەبەست بوو بە لای پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە ئەو حەجە تاکە حەجێك بوو پێغەمبەر(ﷺ) ئەنجامیدا. لە کاتێکدا ئیسلام سەربەرز بوو، ئینجا ئەم حەجە لە ڕاستیدا دوا خواحافیزی بوو لە موسڵمانان.[٤]

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٢/٥٥٠)، السيرة النبوية لابي شهبة (٢/٥٧٨).
٢ مسلم، كتاب الحج، (١٢١٨)، صحيح السيرة النبوية (٦٦٣).
٣ بڕوانە: السيرة النبوية للندوي (٣٩٠).
٤ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٢/٥٧٩)، المستفاد من قصص القران (٢/٥١٥).

ئەمەو، پێغەمبەر(ﷺ) خۆی دواخست تاکو بەردەکانی ڕۆژانی تەشریقی هاوێشت، دوایی ڕۆیشت بۆ مەککە و بە شەو تەوافی خواحافیزی کرد بە دەوری کەعبەدا و فەرمانی کرد بە خەڵکی بگەڕێنەوە جێگەکانی خۆیان و خۆیشی بەرەو مەدینە گەڕایەوە،[١] لە ڕێگەی گەڕانەوەشدا لە لای کانی(خم) لە نزیکی جوحفە لە هەژدەی(ذي الحجة) وتارێکی ئاراستەی موسڵمانان کرد، تیایدا هاتبوو: خەڵکینە من ئادەمیزادێکم دوور نیە ڕەوانەکراوی لای پەروەردگارم بێەتو وڵامی بدەمەوە، بەڵام من دوو شتم لە ناو ئێوەدا بەجێهێشتووە، یەکەمیان کیتابی خوای گەورەیە، ڕێنموونی و ڕووناکی تیایە، کار بە قورئان بکەن و دەستی پێوە بگرن، ئینجا هانی خەڵکی دەدا لەسەر ئەوە، ئینجا فەرمووی: خاووخێزانەکەیشم(سێ جار فەرمووی) ئەوەتان بیردەخەمەوە.[٢] لە ڕیوایەتێکیشدا هاتووە کە دەستی عەلی گرت و فەرمووی:((من كنت وليه، فهذا وليه، اللهم وال من والاه، وعاد من عاداه))،[٣] لە ڕیوایەتێکی تر هاتووە:((من كنت مولاه فهذا علی مولاه)).[٤]

عەلی(ﷺ) لە یەمەنەوە هاتبوو ئامادەی ئەم حەجیماڵئاواییە بووبوو،[٥] هەندێ لە سەربازەکانیش سکاڵایان هەبوو لە عەلی کە مامەڵەی سەخت بووە لەگەڵیان، چونکە هەندێك جل و پۆشاکی لێ وەرگرتبوونەوە جێگرەکەی دابەشی کردبوویە سەریاندا، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) لەو جێگەیەدا پلە و پایەی عەلی بۆ ڕوون کردنەوە، بۆ ئەوەی واز لە سکاڵاکەیان بهێنن ئیتر،[٦] چونکە هەڵوێستەکەی عەلی لە گێڕاندنەوەی ئەو پۆشاکانە هەڵوێستێکی ڕاست بوو، چونکە ئەوە ماڵی صەدەقە و زەکات بوو.[٧]

لە گەڕانەوەدا پێغەمبەر(ﷺ) لە(ذي الحليفة) مایەوە، کاتێکیش مەدینەی بینی سێ جار(الله اكبر)ی کرد و، فەرمووی:((لا اله الا الله وحده، لاشريك له، له الملك وله

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية للندوي (٣٩٠).
٢ مسلم، كتاب فضائل الصحابة، باب فضل علي بن ابي طالب (٢٠٤٨).
٣ النسائي في خصائص علي، ٢١، صحيح السيرة النبوية (٦٨٨).
٤ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٢/٥٥٠).
٥ بڕوانە: البداية والنهاية (٥/٢٠٩).
٦ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٢/٥٥١).
٧ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٢/٥٨١).

الحمد وهو على كل شيء قدير، ايبون تائبون عابدون، ساجدون لربنا حامدون، صدق الله وعده، نصر عبده، وهزم الاحزاب وحده)) ئینجا بە ڕۆژ هاتە نێو مەدینەوە.[١]

## دووەم: وانە و پەند و سوود.

### ١- قۆناغی پێگەیشتن کە ئوممەت پێی گەیشت:

لە ساڵی دەی کۆچی موسڵمانان گەیشتنە قۆناغێکی پێشکەوتوو، تەنها پێویستی بە هەندێ دەستکاری کۆتایی بوو، بۆیە پێشوازی کردنی نێردەکان لە ساڵی نۆ و دەی کۆچی بڵاوبوویەوە و، بنچینەیەکی پانیش دروست بوو بۆ بانگەواز، ئەوەیش کاریگەری مەزنی هەبوو بۆ بەردەوام بوونی ئیسلام تاکو دونیا دونیا بێت.

### ٢- پەروەردەکردنی موسڵمانان لەسەر پچڕاندنی پەیوەندی لەگەڵ نەفامیدا :

أ- دوورکەوتنەوەیان لە گوناه و تاوان: چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی کرد بە گرنگی بڕینی هەموو پەیوەندییەکی موسڵمانان بە سەردەمی نەفامییەوە، بۆیە فەرمووی:((الا ان كل شيء من امر الجاهلية، تحت قدمي موضوع)) هەموو خوێن و سوو و.... نەما و تەواو بوو.

ب- پێغەمبەر(ﷺ) موسڵمانانی ورریاکردەوە لە تاوان و گوناه، بە هەموو جۆرەکانی چونکە دەبێتە مایەی چوونە ناو دۆزەخەوە، کاریگەریشی لە کۆمەڵگاکاندا لە کاریگەری شمشێر سەختترە، ئاشکرایشی کرد مەبەستی لە تاوان گەڕانەوە نییە بۆ بتپەرستی، چونکە ئەو هزر و هۆشانەی یەکتاپەرستیان ناسی جارێکی تر ناگەڕێنەوە بۆ بتپەرستی، بەڵام شەیتان بێ هیوا نابێت کە ڕێگەیەك بدۆزێتەوە بۆ گومڕاکردنی مرۆڤەکان.[٢]

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية للندوي (٣٩١)، نقلا عن زاد المعاد (١/٢٤٩).
٢ بڕوانە: قراءة سياسية للسيرة النبوية (٣٠٢)، فقه السيرة للبوطي (٣٣١).

٣- پەروەردەکردنی کۆمەڵگا لەسەر چەند بنەمایەکی سەرەکی:

أ- برایەتی لە پێناو خوای گەورە:((انما المؤمنون اخوة)) پێغەمبەر(ﷺ)یش دەیفەرموو: خەڵکینە گوێم لێ بگرن و لێم بگەن، دەزانن هەموو موسڵمانێك برای موسڵمانە، موسڵمانان هەموویان بران، هیچ شتێکی هیچ موسڵمانێك ڕەوا نییە بۆ موسڵمانێکی تر، مەگەر بە ڕەزامەندی خۆی نەبێت، جا ستەم لە یەکتر مەکەن.

ب-ڕاوەستان لەگەڵ کەسی لاوازدا بۆ ئەوەی ئەو لاوازییە نەبێتە کەلێنێك لە بونیاتنانی کۆمەڵگا، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) ڕاسپاردەی کرد بە چاکە کردن لەگەڵ ئافرەت و کۆیلە چونکە دوو نموونەی لاوازین،[1] ئاشکراشی کرد کە ئەو ستەمەی لەسەردەمی جاهیلی لە ئافرەت دەکرا جارێکی تر سەر هەڵنادات‌ەوە.[2]

ج-هاوکاری کردن لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامی بۆ جێبەجێ کردنی حوکمەکانی ئیسلام و پەیوەست بوون بە شەرعی خوای گەورە با فەرمانڕەواکەیش کۆیلەیەکی حەبەشی بێت، چونکە ئەوە سەرفرازی دونیا و دواڕۆژی تیایە.[3]

د-یەکسانی لە نێوان مرۆڤەکاندا: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:((لا فضل لعربيٍ على اعجمي ولا لأعجمي على عربي ولا لأبيض على اسود، ولا لأسود على ابيض الاّ بالتقوى، الناس من ادم، آدم من تراب))، واتە: کە لە کەس چاکتر نییە، نە عەرەب لە عەجەم، نە عەجەم لە عەرەب، نە سپی لە ڕەش چاکترە، نە ڕەش لە سپی چاکترە، تەنها بە لە خوا ترسان نەبێت، خەڵکی هەمووی لە ئادەمەوە هاتوون و ئادەمیش لە خۆڵە.[4]

ه- دیاریکردنی سەرچاوەی وەرگرتن: ئەوەیش دوو سەرچاوەیە سێیەمیان نییە، قورئان‌و سونەتی پێغەمبەر(ﷺ)، ئینجا تۆ دەبینی پێغەمبەر(ﷺ) ئەم بەڵێنە دەدات بۆ هەموو نەوەکانی داهاتوو، بۆ ئەوەی بە شیاوی ئەو دوو سەرچاوەیە

---

١ بڕوانە: قراءة سياسية للسيرة النبوية (٣٠٤)، دولة الرسول من التكوين الى التمكين (٥٧٥).

٢ بڕوانە: فقه السيرة للبوطي (٣٣٢).

٣ فقه السيرة للبوطي (٣٣٣).

٤ بڕوانە: دولة الرسول (٥٧٦).

ڕابگەیەنن و ئەوەش ئاشکرا بکات هیچ پێشکەوتن و ژیان و داب و نەریتێك هەرگیز زاڵ نابێتە سەریاندا.[١]

پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕاستیدا باسی بەلا و چارەسەرەکەشی کردووە، چارەسەری هەموو دەرد و بەلا و کێشەکانیش لە دوو سەرچاوەدایە.

ڕێنماییەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لە سنووری دورگەی عەرەب دەرچوو، هەموو بەربەستەکانی سەدەکانیشی شکاند، تاکو ئەمڕۆیش هەر دەنگ دەداتەوە، تا ئەو ڕۆژەیش کە کۆتایی بە ژیانی سەر زەمین دێت، پێغەمبەر(ﷺ) لەو ڕۆژەدا نەیدەفەرموو: ئەی موسڵمانان، یان ئەی حاجیان، بەڵکو دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە، چەندین جاریش هەر بەو وشە بانگی دەکردن، چونکە خوای گەورە ئەوی ناردووە بۆ سەرتاپای خەڵکی.[٢]

### ٤- شێوازەکانی فێرکردن لە وتاری حەجی ماڵئاوایی:

#### أ- فێرکردن بە ئەنجامدانی کارەکە:

پێغەمبەر(ﷺ) بە شێوەیەکی کردەیی هاوەڵانی فێری حەجکردن دەکرد، چونکە بە خۆی هەڵدەستا بە ئەنجامدانی بەشەکانی ئەو خواپەرستنە و پێشی دەفەرموون: بەندایەتیتان لە منەوە وەربگرن، بۆیە باشتر وایە بانگخوازانی ئیسلام هەوڵ بدەن بە شێوەیەکی کردەیی خەڵکی فێری ئیسلام بکەن، هیچ نەبێت لە دەست نوێژ و نوێژ و فێرکردنی قورئان.[٣]

#### ب- دووبارەکردنەوەی وتارەکان:

تێبینیمان کرد کە پێغەمبەر(ﷺ) واتا و چەمکی وتارەکانی دووبارە دەکردەوە بۆیە لەسەر بانگخوازانە شوێنکەوتووی پێغەمبەر(ﷺ) بن و وتارەکانیان دووبارە بکەنەوە، بۆ ئەوەی گوێگران چاك حاڵی بن، چونکە خۆی مەبەست لە وتار سوود

---

١ بڕوانە: فقه السيرة للبوطي (٣٣٣).

٢ بڕوانە: الجانب السياسي في حياة الرسول (٣٣١)، احمد محمد باشميل.

٣ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٥٤٩/٢)، مسلم (٩٤٢/٢)، رقم (١٢٩٧)، المستفاد من قصص القران (٥١٨/٢).

گەیاندنە بە گوێگر، نەك دەرخستنی توانای وتاربێژی، بۆ ئەوەی ئاوڕ بدرێتەوە لە پێویستیەکانی ئەوان.[١]

**ج- با ئامادەبووتان ئامادەنەبووتان ئاگادار بکاتەوە:**

بەم شێوەیەش زۆرترین کەس سوود لە قسەکانی وەردەگرێت، خودی کارەکەیش هاوکارییە لەسەر چاکە، لەوانەشە ئەو کەسەی ئامادە نەبوو، چاکتر حاڵی ببێت و سوود وەربگرێت لەو کەسەی ئامادەبووە. باشتریش وایە بانگخوازان ئەو قسە بکەن لەگەڵ ئەوانەی وتار و وانەکانیان بۆ دەڵێنەوە.

**د- سەرنج ڕاکێشانی گوێگر:**

چونکە پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری ئەو ڕۆژ و مانگ و شوێنەی لێ کردن کە تیایدا بوون، قورتوبی دەڵێت: ئەو پرسیارانەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ سەرنج ڕاکێشانیان بووە بۆ ئەوەی بە تەواوی و بە جوانی گوێ بگرن، پێویستە لەسەر زانایان و بانگخوازانیش بە شێوەیەك لە شێوەکان سەرنجی گوێگرانیان ڕاکێشن.[٢]

**٥- هەندێ حوکمی شەرعی هەڵێنجراو لە حەجیماڵئاوایی:**

**أ- بەڕۆژوو نەبوونی حاجی لە ڕۆژی عەرەفەدا:**

(میمونة بنت الحارث)ی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: موسڵمانان گومانیان بوو لەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی عەرەفە بەڕۆژوو بووبێت، ئیتر ئەویش قاپێك شیری بۆ نارد، ئەویش لە کاتێکدا لە جێگای ڕاوەستانی عەرەفە ڕاوەستابوو خواردییەوە و خەڵکی تەماشایان دەکرد.[٣]

**ب- کەسێك لە ئیحرامدا گیان بسپێرێت چی پێ دەکرێت:**

(ابن عباس) ﷺ دەفەرمووێت: لەو کاتەی پێغەمبەر(ﷺ) لە عەرەفە بوو، پیاوێك لەسەر وڵاخەکەی کەوتە خوارەوە و وڵاخەکەی لێیدا و دەست بەجێ مرد،

---

١ بڕوانە: المستفاد من قصص القران (٢/٥١٧-٥١٨).

٢ بڕوانە: المستفاد من قصص القران (٢/٥١٨).

٣ البخاري، كتاب الصوم، باب صوم يوم عرفة (١٩٨٩).

ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بە ئاو و کنار بیشۆن و لە دوو پۆشاکدا کفنی بکەن و بۆن خۆشی مەکەن و سەریشی دامەپۆشن، چونکە لە ڕۆژی قیامەتدا زیندوو دەکرێتەوە لە حاڵەتێکدا دەڵێت:(لبیك اللهم لبیك).[1]

**ج- ئایا دەبێت لە جیاتی کەسێکی تر حەج بکرێت؛**

(ابن عباس) دەفەرمووێت:(فضل) لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) سوار بووبوو، لەو کاتە ئافرەتێك لە(خثعم) هات و(فضل) هەر تەماشای دەکرد و ئەویش تەماشای(فضل)ی دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) هەر ڕووی(فضل)ی وەردەگێڕا بەو لاکەی تر، ئافرەتەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، باوکم پیاوێکی پیرە و خۆی بەسەر وڵاخەوە ناگرێت، ئایا لە جیاتی ئەو حەج بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ.[2]

**د- ڕێڕەوی ئاسان کردن؛**

(عبدالله بن عمرو بن العاص)(ﷺ) دەفەرمووێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە حەجی ماڵئاوایی لە(منى) ڕاوەستابوو خەڵکی پرسیاریان لێ دەکرد، پیاوێك هاتە لای و پرسی: نەمزانی، سەرم تاشی پێش ئەوەی قوربانی سەربڕم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: قوربانی بکە و قەیناکات، یەکێکی تر وتی: نەمزانی قوربانیم کرد پێش فڕێدانی بەردەکان، فەرمووی:(ارم ولا حرج) واتە: بەردەکانت فڕێ بدە و هیچت لەسەر نییە، پرسیاری هەرچی لێ دەکرا پێشخرابێت یان دواخرابێت هەر دەیفەرموو:(افعل ولا حرج).

هەرکەسێکیش دەیەوێت زانیاری دەسکەوێت با بگەڕێتەوە بۆ کتێبەکانی مامۆستا ئەلبانی لەسەر حەجی ماڵئاوایی، چونکە ئەو باسەی پوخت کردووەتەوە لە حەفتا و دوو مەسەلەدا،[3] هەروەها کتێبی(الوصية النبوية للأمة الاسلامية)ی دکتۆر فاروق حەمادە، چونکە لە ڕاستیدا ئەوە کتێبێکی زۆر چاك و سەپەند و جێگای متمانەیە.[4]

---

١ البخاري، (١٢٦٥).

٢ البخاري (١٥١٣).

٣ بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (٦٨٣).

٤ هەمان سەرچاوە (٦٨١).

### ٦- سوودەکانی ناونانی ڕۆژەکانی حەج:

بە ڕۆژی حەوتەمی حەج دەوترا(یوم الزینة) چونکە قوربانییەکانی تیا جوان دەکرایەوە، بە ڕۆژی هەشتەم دەوترێت(یوم الترویة) چونکە ئاویان تیا دەدایە وشترەکانیان و لێشیان هەڵدەگرت بۆ عەرەفە، چونکە ئەو کاتە بیری ئاو نەبوو لەو جێگایانە، بەڵام ئێستا ئاوی زۆری لێیە سوپاس بۆ خوا. ڕۆژی نۆیەم(یوم عرفة) چونکە حاجیان لە عەرەفە ڕادەوەستن، ڕۆژی دەیەم(یوم النحر) و(یوم الاضحى) و(یوم الحج الاکبر)، ڕۆژی یانزەیەم(یوم القر) چونکە لەو ڕۆژەدا پشو دەدەن، ڕۆژی(الرؤوس)یشی پێ دەوترێت، چونکە گۆشتی قوربانییەکانی تیا دەخورێت، یەکەم ڕۆژیشە لە ڕۆژەکانی(التشریق) دووەم ڕۆژی پێی دەوترێت(یوم النفر الاول) چونکە ڕێدراوە ئەو حاجیەی پەلە بکات بگەڕێتەوە بۆ مەککە، سێیەم ڕۆژیش پێی دەوترێت:(یوم النفر الثاني)[1] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡدُودَٰتٖۚ فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوۡمَيۡنِ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِۖ لِمَنِ ٱتَّقَىٰۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴾(البقرة: ٢٠٣).

---

١ بڕوانە: السیرة النبویة لابي شهبة (٢/٥٧٩).

## باسی هەشتەم: نەخۆشی پێغەمبەر( ﷺ ) و کۆچی دوایی

گیانە پاك و پاراو و بەهێزەکان هەندێك لە شتە شاراوەکانی پشت پەردەی قەدەریان بۆ دەردەکەوێت بە پشتیوانی خوای گەورە، دڵە ئاسوودەکانیش هەواڵ دەدەنە خاوەنەکانیان دەربارەی هەندێ ڕووداو کە ڕوو دەدەن، پێغەمبەری مەزنیش(ﷺ) پشکی گەورەی لەو بارەوە پێدرابوو، لە ئاستێکشیدا بوو کەسی پیا نەدەگەیشت.[1]

هەندێ ئایەتی پیرۆزیش جەخت دەکەن لە ئادەمیزادێتی پێغەمبەر(ﷺ)، حاڵی وەکو حاڵی هەر مرۆڤێکی ترە مردن دەچێژێت و هەست بە ئازارەکانی دەکات، وەکو چۆن برا پێغەمبەرەکانی پێش خۆی مردنیان چەشتووە، هەندێ ئایەتیش ئاماژەی تیادا بوو بۆ مردنی پێغەمبەر(ﷺ)، هەروەها کۆمەڵێك فەرموودەیش بە هەمان شێوە ئاماژە دەکەن بۆ نزیك بوونی مردنی پێغەمبەر(ﷺ)، هەندێکیان بە ڕاشکاوی و هەندێکی تریان بە ناڕاستەوخۆ، چەند کەسێکی کەمیش هەستیان کرد بەو ئاماژانە وەکو ئەبو بەکر و عەبباس و موعازی کوڕی جەبەل(ڕەزای خوایان لێ بێت).[2]

### یەکەم: ئەو ئایەت و فەرموودانەی ئاماژە دەکەن بە مردنی پێغەمبەر( ﷺ ).

أ- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِين مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ﴾(ال عمران: ١٤٤).

قورتوبی دەڵێت: خوای گەورە لەم ئایەتەدا ئاگاداری داوە کە پێغەمبەران بۆ هەمیشەیی نامێننەوە لە ناو خەڵکیدا، پێویستیشە دەست بگیردرێت بەوەی پێغەمبەران پێی ڕەوانە کراون، با ئەو پێغەمبەرانە بمرن یان بکوژرێن.[3]

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٢/٥٨٧).

٢ بڕوانە: مرض النبي ووفاته، خالد ابو صالح (٣٣).

٣ بڕوانە: تفسير القرطبي (٤/٢٢٢).

ب- خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ﴾(الزمر: ٣٠).

(ابن كثير) دەڵێت: ئەمە یەکێکە لەو ئایەتانەی ئەبو بەکر(ﷺ) وەکو بەڵگە دەیهێنایەوە لەسەر مردنی، تا ئەو کاتەی خەڵکی دڵنیا بوون لە مردنی.[١]

ج- خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَـٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ﴾(الانبياء: ٣٤-٣٥).

ئەم ئایەتانە بە ڕاشکاوی باسی مردنی پێغەمبەر(ﷺ) دەکەن، هەندێ ئایەتیش هەیە بە ناڕاستەوخۆ ئاماژەی کردووە، لەوانە:

- خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَلْـَٔاخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ ٱلْأُولَىٰ ﴿٤﴾ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ﴾(الضحى: ٤-٥).

- خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَـٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ﴾(الرحمن: ٢٦-٢٧).

- خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ كُلُّ شَىْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ لَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾(القصص: ٨٨).

د- خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱخْشَوْنِ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَـٰمَ دِينًا﴾(المائدة: ٣).

کاتێک ئەم ئایەتە دابەزی عومەری کوڕی خەتتاب دەستی کردە گریان و فەرمووی: لە پاش تەواوبوون کەمبوونەوە دێت، وەکو چۆن هەستی کردبێت بە مردنی پێغەمبەر(ﷺ).[٢]

---

١ بڕوانە: تفسير ابن كثير (٤/٥٨).
٢ بڕوانە: البداية والنهاية (٥/١٨٩).

هـ- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝١ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ۝٢ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا﴾(النصر: ١-٣).

عومەر(ﷺ) پرسیاری کرد لە(ابن عباس) دەربارەی ئەم ئایەتە و، ئەویش فەرمووی: ئەوە کاتی مردنی پێغەمبەرە(ﷺ) ئەوی لێ ئاگادار کردووەتەوە، فەرمووی: منیش هەروا ئەوەی لێ حاڵی دەبم.[1]

- ئەو فەرموودانەی ئاماژە دەکەن بۆ مردنی پێغەمبەر(ﷺ):

أ- عائیشە دەفەرموێت: خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لە لای کۆبوونەوە، لەو کاتەدا فاتیمەی کچی هات و ڕێکردنەکەشی هەر لە ڕێکردنی باوکی دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەخێر بێیت کچەکەم، ئینجا لە لای ڕاستی، یان لە لای چەپی خۆیەوە دایینیشاند و، چپەیەکی بۆ کرد، فاتیمە گریا، جارێکی تر چپەی بۆ کرد و ئەمجار پێکەنی، پێم وت: پێغەمبەر(ﷺ) تۆی تایبەتمەند کردووە و، دەگریت؟ کاتێك کە هەڵسا پێم وت: باوکت چی پێت فەرموو؟ وتی: نهێنی پێغەمبەر(ﷺ) نادرکێنم، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لە دونیا دەرچوو پێم وت: تکات لێ دەکەم بەو مافەی هەمە لەسەرت ئاگادارم بکە پێغەمبەر(ﷺ) چی پێ وتیت؟ فەرمووی: ئێستا بەڵێ، یەکەمجار پێی وتم: جبریل هەموو ساڵێك یەك جار قورئانی لەگەڵمدا دەخوێندەوە، بەلام ئەمساڵ دووجار لەگەڵم خوێندییەوە، بۆیە وادەزانم کاتی مردنم نزیك بووەتەوە، تەقوای خوات هەبێت و ئارام بگرە، من باشترین پێشینم بۆ تۆ، ئیتر منیش گریام بەو شێوەی بینیمت، ئینجا پێی فەرمووم: ئەی فاتیمە ئایا پێت خۆش نییە ببیتە سەرگەورەی ئافرەتانی ئیمانداران، یان سەرگەورەی ئافرەتانی ئەم ئوممەتە،[2] ئەم فەرموودەیە بەڵگەیەکی سەلمێنەر و ئاماژەیەکی ئاشکرایە لەسەر نزیك بوونەوەی کاتی مردنی پێغەمبەر(ﷺ)، بەلام

---

١ البخاري، كتاب المغازي، (٤٤٣٠).
٢ البخاري، كتاب الاستئذان (٦٢٨٥، ٦٢٨٦).

تایبەتمەندی زانینی کاتەکە بە فاتیمە درا(رضي الله عنها)، موسڵمانانیش بەوەیان نەدەزانی تاکو پاش مردنی پێغەمبەر(ﷺ).[1]

ب- جابیر(رضي الله عنه) دەفەرمووێت: پێغەمبەر(ﷺ)م بینی لەسەر وشترەکەیەوە بەردەکانی فڕێ دەدا و، دەیفەرموو: شێوازی خوا پەرستنتان لە من وەرگرن، چونکە نازانم لەوانەیە دوای ئەم حەجە هەرگیز حەج نەکەمەوە.[2]

ئەوەی دەفەرمووێت: ئاماژەیەکە بۆ خواحافیزی و ئاگادارکردنەوەیان بە نزیکبوونەوەی کاتی لە دونیا دەرچوونی و، هاندانیان بۆ سوود وەرگرتن و هەلقۆستنەوە و فێربوونیان، هەر بۆیەیش ناونراوە حەجیماڵئاوایی.[3]

(ابن رجب) دەفەرمووێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە کۆتایی تەمەنی زۆرجار ئاماژەی دەکرد بۆ کاتی مردنی خۆی، بۆ نموونە لە وتاری حەجی ماڵئاواییدا، فەرمووی: خواپەرستنەکانتان لە منەوە فێر بن، لەوانەیە پاش ئەمساڵ ئیتر ئێوە نەبینمەوە.[4]

ج-(ابو سعید الخدری)(رضي الله عنه) دەفەرمووێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە وتارێکیدا بە خەڵکی فەرموو:((ان الله خير عبداً بين الدنيا وبين ماعنده فاختار ذلك العبد ماعند الله))، واتە: بەندەیەك خوای گەورە ئازادی کردووە لە هەڵبژاردنی دونیا، یان هەڵبژاردنی ئەوەی لای خۆیەتی، ئەو بەندەیەیش ئەوەی لای خوای هەڵبژاردووە، دەفەرمووێت: ئیتر ئەبو بەکر دەستی کردە گریان و ئێمەیش گریانەکەیمان لا سەیر بوو، بەندەیەکە و خوای گەورە سەرپشکی کردووە لە هەڵبژاردنی یەکێك لەو دوو شتدا، بەڵام ئەو کەسەی داوای لێکرابوو هەڵبژێرێت پێغەمبەری خوا بوو(ﷺ)، ئەبوبەکریش لە هەمووومان زاناتر بوو.[5]

---

١ بڕوانە: مرض النبي ووفاته.

٢ مسلم، كتاب الحج، (١٢٩٧).

٣ بڕوانە: شرح النووي على صحيح مسلم (٩/٤٥).

٤ بڕوانە: لطائف المعارف (١٠٥).

٥ البخاري، كتاب فضائل الصحابة (٣٦٥٤)

(ابن حجر العسقلانی) دەفەرمووێت: وەکو چۆن ئەبو بەکر لەو هێما تێگەیشتبێت کە پێغەمبەر(ﷺ) باسی کرد، چونکە ئەو قسە لە کاتی نەخۆشی مردنیدا بوو کەواتە مەبەستی خۆیەتی، بۆیە ئەبوبەکر گریا.[1]

د- (العباس بن عبدالمطلب)(ﷺ) دەفەرمووێت: لە خەونمدا بینیم، دەتوت زەوی ڕادەکێشرێت بە پەتێك بەرەو ئاسمان، خەونەکەم باسکرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و، فەرمووی: وتی مردنی برازاکەتە.[2]

ئەم فەرموودەیەیش باسی نزیك بوونەوەی مردنی پێغەمبەر(ﷺ) تیایە و، هەروەها ڕاستێتی خەونی موسڵمانانی لێ وەردەگیردرێت و، هەستکردنی هەندێ لە هاوەڵان بە مردنی پێغەمبەر(ﷺ).

هـ- لە موعازەوە هاتووە کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ناردنی بۆ یەمەن، پێی فەرموو: ئەی موعاز لەوانەیە پاش ئەمساڵ ئیتر من نەبینی، بە لای مزگەوت و قەبرەکەمدا تێپەڕبیت. ئیتر موعاز دەستی کردە گریان، پێغەمبەریش(ﷺ) پێی فەرموو: مەگری ئەی موعاز، چونکە گریان لە شەیتانەوەیە.[3]

## دووەم: نەخۆشی پێغەمبەر(ﷺ).

### ١- سەرەتای هەست بە ئازارکردنی پێغەمبەر(ﷺ):

پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێك لە حەجیماڵئاوایی گەڕایەوە لە مانگی(ذي الحجة) ئەو مانگە و مانگی موحەڕڕەم و صەفەری لە ساڵی دەی کۆچی لە مەدینە بردە سەر، ئینجا دەستی کردە ئامادەکردنی سوپای ئوسامە و فەرمانی پێکردن بە دەرچوون بەرەو(البلقاء) و(فلسطین) سوپاکە ئامادە بوو بە هەموو موهاجیر و ئەنصارەکانەوە، ئەبو بەکر و عومەریشیان تیادا بوو، ئوسامە لەو کاتە تەمەنی هەژدە ساڵ بوو، بۆیە هەندێ کەس قسەیان کرد سەبارەت بە سەرکردایەتی دانە

---

١ فتح الباري (٧/١٦).
٢ البزار: (١/٣٩٧)، كشف الاسقاء (٨٤٤)، مجمع الزوائد (٩/٢٤) رجاله ثقات.
٣ مجمع الزوائد (٩/٢٢)، صححه الالباني في السلسلة الصحيحة (٢٤٩٧).

دەستی لاوێك لەو تەمەنەدا، سەرانی موهاجیر و ئەنصارەکان نەبنە سەرکردەی، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) تانەکەی قبوولّ نەکردن لەسەرکردایەتی ئوسامە و،[1] فەرمووی:((ان تطعنو في إمرته فقد كنتم تطعنون في إمرة ابيه من قبل، وأيم الله ان كان لخليقاً للامرة وان كان لمن احب الناس اليّ وان ابنه لمن احب الناس اليّ بعده)).[2] واتە: ئەگەر تانە دەدەن لە دەسەڵاتی ئوسامە، ئێوە پێشتر تانەتان دەدا لە دەسەڵاتی باوکیشی، سوێند بە خوا شایستەی دەسەڵاتە، یەکێك بوو لە خۆشەویستەکانم، کوڕەکەشی یەکێیە لە خۆشەویستەکانم لە دوای خۆی.

لەو کاتەی خەڵکی خەریکی خۆسازدان بوون بۆ جیهاد، نەخۆشیەکەی پێغەمبەر(ﷺ) دەستی پێکرد و، هەندێ ڕووداویش لە نێوان ئەو نەخۆشیە و لە دونیا دەرچوونیدا ڕوویاندا، لەوانە:

**أ- پێغەمبەر(ﷺ) لە بەقیع و سەردانی بۆ کوژراوانی ئوحود و نوێژکردن لەسەریان:**

ئەبو موەیهیبەی مەولای پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: لە ناو جەرگەی شەودا پێغەمبەر(ﷺ) هەڵیساندم و فەرمووی: ئەی ئەبو موەیهیبە، من فەرمانم پێکراوە داوای لێخۆش بوون بکەم بۆ مردوانی بەقیع، جا هەڵسە لەگەڵم، دەڵێت: منیش لەگەڵی چووم و کاتێك گەیشتە ناو گۆڕستانەکە فەرمووی:((السلام عليكم يا اهل المقابر، ليهنأ لكم ما أصبحتم فيه لما اصبح الناس فيه، اقبلت الفتن كقطع الليل المظلم، يتبع آخرها اولها، الاخرة شر من الاولى))، واتە: سڵاوی خواتان لێ بێت ئەی خەڵکی گۆڕستان، خۆش بەحاڵتان لەوەی تیایان لە چاو ئەوەی خەڵکی تیایەتی، پشێوی هاتووە لە وێنەی ڕەشی و تاریکی شەو، دواترینی دەکەوێتە دوای یەکەمیان، دواترینیان خراپترە لەوەی یەکەمیان. ئینجا ڕووی تێکردم و فەرمووی: ئەی ئەبو موەیهیبە، من ئازاد کراوم لە نێوان هەڵبژاردنی گەنجینەکانی دونیا و هەمیشە مانەوە تیایدا و، ئینجا بەهەشت، لە نێو ئەوە و، چاوپێکەوتنی خوای خۆم ئازاد کرام،منیش چاوپێکەوتنی خوا و بەهەشتم هەڵبژارد.دەڵێت: منیش وتم:باوك و

---

[1] بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٢/٥٥٢).

[2] البخاري، كتاب فضائل الصحابة (٤/٢١٣).

دایکمت بە قوربان بکەم یەکەمیان هەڵبژێرە، فەرمووی: ئەی ئەبو موەیهیبە، چاوپێکەوتنی خوا و بەهەشتم هەڵبژارد. ئینجا دەستی کردە داوای لێخۆش بوون بۆ مردووەکان و گەڕایەوە، ئیتر ئازارەکەی پێغەمبەر(ﷺ) کە پێوەی وەفاتی کرد دەستی پێکرد،[1] هەروەها عوبەی کوڕی جەهەنی ﷺ دەفەرمووێت: جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوو، نوێژی لەسەر کوژراوانی ئوحود کرد وەکو نوێژی مردوو، ئینجا چووە سەر مینبەرەکە و فەرمووی: من پێشینم بۆ ئێوە و شایەتم لەسەرتان، سوێند بە خوا ئێستا تەماشای حەوزەکەی خۆم دەکەم و، گەنجینەکانی دونیاشم پێدراوە، یان کلیلەکانی سەر زەوی، سوێند بە خوا من ناترسم لە دوای من بتپەرستی بکەن، بەڵام دەترسم کێبڕکێ بکەن لەسەر دونیا.[2]

**ب- پێغەمبەر( ﷺ ) داوای مۆڵەت دەکات لە کاتی نەخۆشیەکەی لە ماڵی عائیشە بێت( رضي الله عنها ):**

عائیشە(رضي الله عنها) دەفەرمووێت: کاتێک نەخۆشیەکەی پێغەمبەر(ﷺ) سەخت بوویەوە، داوای لە خێزانەکانی کرد ڕێگەی بدەن لە ماوەی نەخۆشیەکەیدا لە ماڵەکەی عائیشە بێت. ئەوانیش ڕازی بوون، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوو بە یارمەتی دوو پیاو عەبباس و پیاوێکی تر،[3] هەردوو قاچی دەخشاندە زەویدا، کاتێك گەیشتە ژوورەکە ئازاری زیاتر بوویەوە، فەرمووی:((أهريقوا عليّ من سبع قرب لم تحلل اوكيتهن لعلي اعهد الى الناس)) واتە: ئاوم بڕژێننە سەر لە حەوت کونە دەماکانیان نەکرابێتەوە، ئینجا دایاننیشاند لە نێو تەشتێکی حەفصەی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ)، ئینجا لەو کونە ئاوانە ئاومان دەکردە سەریدا، تاکو خۆی وتی: ئیتر بەسە، ئینجا دەرچوو بۆ لای خەڵکی،[4] عائیشە دەیفەرموو: کەسم نەبینیووە ئەوەندەی پێغەمبەر(ﷺ) ئازاری لەسەر سەخت بێتەوە.[5] عەبدوڵای کوڕی مەسعود

---

١ الحاكم في المستدرك (٣/٥٥-٥٦)، صحيح على شرط مسلم واقره الذهبي.

٢ البخاري، كتاب الجنائز، باب الصلاة على الشهيد (١٣٤٤).

٣ (ابن عباس) دەڵێت: پیاوەکەی تر عەلی کوڕی ئەبو تالیب بوو.

٤ البخاري، كتاب الوضوء (١٩٨).

٥ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٦٩٥).

دەفەرمووێت: چوومە لای پێغەمبەر(ﷺ) لە نەخۆشیی مردنەکەیدا و، تاو ئازارێکی زۆری هەبوو، وتم: تۆ تا و ئازارێکی زۆر سەختت هەیە، ئایا لەبەر ئەوەیە دوو جار پاداشت دەدرێیتەوە؟ فەرمووی: بەڵێ موسڵمانێك تووشی ناڕەحەتیەك بێت، خوای گەورە گەڵای دار چۆن دەوەرێت، ئاوها گوناهەکانی دەوەرێنێت.[1]

## سێیەم: ڕاسپاردەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژەکانی کۆتایی تەمەنی.

### ١- ڕاسپاردەکردنی بە ئەنصارەکان:

عەبباس(رضي الله عنه) بە لای کۆمەڵێك لە ئەنصارەکاندا تێپەڕی لەو کاتەی نەخۆشیەکەی پێغەمبەر(ﷺ) سەخت بوویەوە و، بینی دەگرین، پێی وتن: بۆ دەگرین؟ وتیان کۆڕەکانی پێغەمبەر(ﷺ)مان کەوتەوە یاد، عەبباس ئەمەی بە پێغەمبەر(ﷺ) وت و ئیتر بە سەرپێچێکی ڕەش سەریان بەست و، چووە سەر مینبەرەکە و، جارێکی تر سەرنەکەوتە سەر ئەو مینبەرە، سوپاس و ستایشی خوای کرد و فەرمووی: ڕاسپاردەتان پێ دەکەم بە ئەنصارەکان، ئەوانە جێگای متمانە و نهێنی منن، ئەوەی لەسەریان بوو کردیان، بەڵام ئەوەیان ماوە کە بیاندرێتێ، چاکە لە چاکەکاریان وەربگرن، چاوپۆشیش لە خراپەکاریان بکەن،[2] ئەم فەرموودەیەیش خۆشەویستی زۆری ئەنصارەکانی تیا تێبینی دەکرێت بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و، گریانیان بە هۆی نەخۆشینەکەی و لە دوور بوونەوە لە کۆڕەکانی.[3]

### ٢- دەرکردنی بتپەرستان لە دوورگەی عەرەب:

پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەندە ناڕەحەت دەبوو لە نەخۆشینەکەی، کە لە ڕۆژێکدا چەند جار دەبوورایەوە، سەرەڕای ئەوەش حەزی دەکرد لە دونیا دەرنەچێت تاکو دڵنیا دەبێت لەسەر ئومەتەکەی نەوەك لە پاش خۆی گومڕا بن، بۆیە ویستی نووسراوێکی

---

١ البخاري، كتاب المرض، باب شدة المرض (٥٦٤٧).
٢ البخاري، كتاب مناقب الانصار (٣٧٩٩).
٣ بڕوانە: مرض النبي ووفاته (٦٥).

شیكراوەیان بۆ بنوسێ لەسەری كۆببنەوە و ناكۆكی لەسەر نەكەن، بەڵام نووسینی ئەو نوسراوە و، ڕاسپاردەی پێكردن بە سێ مەسەلە گێڕەرەوەی(ڕاوی) فەرموودەكە باسی دووانیانی كردووە:

- دەركردنی بتپەرستان لە دووركەی عەرەب.
- خەڵاتكردنی ئەو نێردراوەی كە دێن بۆ مەدینە بەو شێوەی كە پێغەمبەر(ﷺ) خەڵاتی دەكردن.[1]

**٣- قەدەغەكردنی ئەوەی گۆڕ بكرێت بە مزگەوت:**

دواترین قسە پێغەمبەر(ﷺ) كردی، ئەوە بوو فەرمووی:((قاتل الله اليهود والنصارى اتخذوا قبور انبيائهم مساجد))[2] واتە: نەفرینی خوا لە جولەكە و گاورەكان بێت گۆڕی پێغەمبەرانی خۆیانیان دەكردە مزگەوت.

**٤- گومانی چاك بردن بە خوای گەورە:**

جابیر(ﷺ) دەفەرموێت: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو پێش مردنی بە سێ ڕۆژ فەرمووی:((احسنوا الظن بالله عز وجل))،[3] واتە: گومانی چاكتان هەبێت بەرامبەر خوای گەورە.

**٥- ڕاسپاردە بە نوێژ و ئەو كەسانەی لە ژێر دەستاندان:**

ئەنەس دەفەرموێت: ڕاسپاردەی پێغەمبەر(ﷺ) لە كاتی سەرەمەرگدا ئەوە بوو: نوێژەكانتان و كۆیلەكانتان، تا ئەو كاتەی گیانی سپارد و، نەیتوانی قسە بكات.[4]

**٦- هیچ نەماوە لە مژدەكانی پێغەمبەرایەتی جگە لە خەون:**

عەبدوڵای كوڕی عەبباس دەفەرموێت: پێغەمبەر(ﷺ) پەردەكەی لابرد، لەو كاتەی سەری پێچرابوو، فەرمووی:((اللهم هل بلغت))، واتە: خوایە ئایا ئایینم

---

١ البخاري، كتاب الجهاد والسير (٣٠٢٥).
٢ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٧١٢)، البخاري، كتاب الصلاة (٤٣٥).
٣ مسلم، كتاب الوصية (١٦٣٧).
٤ مسند احمد.

ڕاگەیاند، سێ جار ئەو قسەیەی کرد، هیچ نەماوە لە مژدەکانی پێغەمبەرایەتی جگە لە خەون، بەندەیەکی چاکەکار بیبینێت، یان بۆی ببینرێت، من لێم قەدەغەکراوە قورئان بخوێنم لە نێو ڕکوع و سجوددا، ئەگەر چوونە ڕکوع خوای گەورە مەزن ڕاگرن، ئەگەریش چوونە سوجدە کۆشش بکە لە پاڕانەوە، پاڕانەوە شایستەی وەڵامدانەوەیە لەو جێگایە.[١]

## چوارەم: ئەبوبەکر پێش نوێژی دەکات بۆ موسڵمانان.

کاتێك نەخۆشی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر نارەحەت بوو لەسەری و کاتی نوێژ هات، بیلال بانگی دا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((مروا ابا بکر فلیصل)) واتە: با ئەبو بەکر پێش نوێژی خەڵکی بکات، وتیان: ئەبو بەکر دڵی ناسکە و، ئەگەر لە جێگای تۆ نوێژ بکات دەگری و قورئانی پێ ناخوێنرێت، پێغەمبەر(ﷺ) قسەکەی دووبارە کردەوە و ئەوانیش وەڵامەکەیان دووبارە کردەوە، بۆ جاری سێیەم فەرمووی:((انکن صواحب یوسف)) واتە وەکو ئافرەتەکانی لای یوسفن، شتێك دەردەخەن و شتێکی ترتان لە دڵدایە، با ئەبو بەکر نوێژ بۆ خەڵکی بکات، ئیتر ئەبو بەکر دەرچوو، لەو کاتە پێغەمبەر(ﷺ) هەستی بە چاکبوونەوەیەك کرد ئیتر لە نێوان دوو پیاودا بە ناچاری دەرچوو، دەڵێی بە بەر چاومەوەیە ئێستا هەردوو قاچی دەکردە کێش بەسەر زەویدا، کاتێ ئەبو بەکر چاوی پێکەوت، هات بگەڕێتە دواوە، پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی بۆ کرد نوێژەکەت بکەن، ئەبو بەکر هەندێ دواکەوت و پێغەمبەر(ﷺ) دانیشت و ئەبو بەکریش بە تەنیشتیەوە بوو(الله اکبر)ی پێغەمبەر(ﷺ)ی دەگەیاندە خەڵکەکە.[٢]

## پێنجەم: دوا ساتەکانی ژیانی پێغەمبەر(ﷺ).

١- ئەبو بەکر(ﷺ) پێش نوێژی دەکرد بۆ موسڵمانان، لە ڕۆژی دوو شەممە، لەو کاتەی ئەوان ڕیزیان بەستبوو بۆ نوێژی بەیانی، پێغەمبەر(ﷺ) پەردەکەی لابرد و،

---

١ مسلم (١/٣٤٨)، کتاب الصلاة (٢٠٧).

٢ البخاري، کتاب الاذان (٧١٢).

تەماشای موسڵمانانی دەکرد، چۆن ڕاوەستاون بەرامبەر خوای خۆیان و، چۆن ئەو ئەمامەی چاندی بەرهەمی هێنا، تەماشای دەکرد چۆن ئوممەتێك پەروەردە بوو پارێزگاری لە کاتەکانی نوێژدا دەکات، لە کاتی ئامادەبوون و ئامادەنەبوونی پێغەمبەرەکەیدا، چاوی پێغەمبەری خوا(ﷺ)گەشایەوە بەو دیمەنە جوانە و ئەو سەرکەوتنە کە ڕووینەداوە بۆ هیچ پێغەمبەر و بانگخوازێك پێش خۆی، دڵنیا بوو لەوەی پەیوەندی ئەم ئوممەتە بە ئایین و پەرستنی خوای پەروەردگار پەیوەندییەکی هەمیشەییە، بە مردنی پێغەمبەرەکەی ناپچڕێت، بۆیە زۆر دڵخۆش بوو و، ڕوومەتە جوانەکەی گەشایەوە.[١]

هاوەڵان دەڵێن: پێغەمبەری خوا(ﷺ) پەردەی ژوورەکەی عائیشەی لابرد و تەماشاامانی دەکرد و ڕاوەستابوو، خەریك بوو لە خۆشیدا نوێژەکانمان ببڕین، وایشمان زانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەردەچێت بۆ نوێژ، بەڵام ئاماژەی بۆ کردین نوێژەکانتان تەواو بکەن و، چووە ژوورەکەی و، پەردەکەی داخستەوە و، هەندێ لە هاوەڵان چوونە لای کارەکانیانەوە و، ئەبو بەکر چووە لای عائیشەی کچی و فەرمووی: وا دەزانم پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئازارەکەی لەسەر لاچووە، ئەمڕۆیش پێویستە بچمە لای کچی خاریجە – یەکێك بوو لە دوو خێزانەکەی – ماڵەکەی لە سونەح[٢] بوو، ئینجا سواری ئەسپەکەی بوو و، ڕۆیشت بۆ ئەو ماڵەی لەوێ.[٣]

٢– بۆ لای خوای پەروەردگار: ئازارەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لە سەرەمەرگدا لە زیادبووندا بوو، ئوسامەی کوڕی زەید چووە لای پێغەمبەر(ﷺ) لەو کاتەی کە نەیدەتوانی قسە بکات، بەڵام دەستی بەرز کردەوە بەرەو ئاسمان و، دەیخستە سەر ئوسامە، ئیتر زانی کە دوعای بۆ دەکات، خاتوو عائیشە(ﷺ) باوەشی کرد بە پێغەمبەر(ﷺ)دا و سەری خستە سەر سنگی خۆی، لەو کاتە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکر هاتە ژوورەوە و سیواکێکی بە دەستەوە بوو، پێغەمبەر(ﷺ) هەر

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية للندوي (٤٠١).

٢ جێگایەکە لە دەرەوەی مەدینە، ئەبو بەکر ماڵێکی هەبوو لەوێ.

٣ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٢/٥٩٢).

تەماشای دەکرد، عائیشە فەرمووی: بۆت بهێنم، بەسەر ئاماژەی کرد بەڵێ، ئەویش سیواکەکەی لە براکەی وەرگرت و لە دەم خۆیدا گەستی و نەرمی کردەوە و دایە دەستی پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش بە جوانی سیواکی پێکرد و بەڵام بەردەوام هەر دەیفەرموو:((في الرفيق الاعلى))، واتە: بەرەو لای خوای گەورە، جارجاریش لە گۆزەیەك ئاو، ئاوی دەکردە ڕوومەتی خۆی دەیفەرموو:((لا الـه الا الله...... ان للموت سكرات))، واتە:(لا اله الا الله) ئازاری مردن چەن سەختە، ئینجا دەستی دانا و، فەرمووی: بەرەو لای خوای پەروەردگار... تاکو گیانی سپارد و دەستی لار بوویەوە، لە ڕیوایەتێکی تر هاتووە فەرموویەتی:((اللهم اعني على سكرات الموت))،[1] واتە: خوایە یارمەتیدەرم بە لەسەر ئازاری مردن.

لە ڕیوایەتێکیشدا هاتووە کە فاتیمە دەیفەرموو: وای لە ماتەمینیت باوەگیان، ئەویش دەیفەرموو:((ليس على ابيك كرب بعد اليوم)) واتە: پاش ئەمڕۆ باوکت ماتەمینی نابێت، کاتێکیش گیانی سپارد فاتیمە فەرمووی: هۆ باوەگیان، وەڵامی خوای خۆتت دایەوە کە بانگی کردی، باوە گیان بەهەشتی بەرین جێگەتە، باوەگیان هەواڵی مردنت دەدەمە جبریل. کاتێك بە خاك سپێردرا فاتیمە(رضي الله عنها) فەرمووی: ئەی ئەنەس چۆن دڵەکانتان ڕێگەتانیدا خۆڵ بکەنە سەر پێغەمبەری خوا(ﷺ).[2]

٣- چۆن پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە دونیا دەرچوو؟ پێغەمبەر(ﷺ) لەو کاتەی دونیای بەجێهێشت فەرمانڕەوایەتی دوورگەی عەرەبی دەکرد، پادشاکانی سەر زەویش لێی دەترسان و، هاوەڵانیشی گیان و ماڵ و منداڵیان دەکردە قوربانی، لە کاتی مردنیشیدا هیچی بەجێ نەهێشت نە دینار و نە درهەم و نە کۆیلە و نە کەنیزەك و، نە هیچ، تەنها هێسترە سپیەکەی و چەك و، زەوییەك نەبێت کردی بە خێر، قەڵغانێکیشی هەبوو بارمتە بوو لای کابرایەکی جوولەکە بەرامبەر سێ ئەندازە لە جۆ.[3]

---

١ الترمذي، كتاب الجنائز (٩٧٨).
٢ البخاري، كتاب المغازي (٤٤٦٢).
٣ بروانە: السيرة النبوية للندوي (٤٠٣).

ئەنەس(ﷺ) دەفەرمووێت: ئەو ڕۆژەی پێغەمبەر(ﷺ) هاتە مەدینە، هەموو شتێکی تیا درەوشایەوە و، ڕۆشن بوویەوە، ئەو ڕۆژەیش گیانی سپارد تیایدا هەموو شتێکی تیا تاریك و ڕەش بوویەوە، دایکی ئەیمەن دەگریا، وتیان: بۆچی دەگریت بۆ پێغەمبەر(ﷺ)؟ ئەویش دەیووت: من دەمزانی پێغەمبەر(ﷺ) دەبێت بمرێت، بەڵام گریان لەبەر ئەوەیە وەحیمان لەسەر هەڵگیرا.

٤- قورسی کارەساتەکە و، هەڵوێستی ئەبو بەکر: (ابن رجب) دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) گیانی سپارد، موسڵمانان پەشێویان تێکەوت، هەندێکیان هەواڵەکە کوتوپڕ بوو بۆیان و تێکچوون، هەندێکیان کەوتن و توانای هەڵسانیان نەما، هەندێکیشیان زمانیان بەسترا و نەیاندەتوانی قسە بکەن، هەندێکیشیان بە جارێك نکۆڵیان دەکرد لە مردنی پێغەمبەر(ﷺ).[١]

قورتوبی باسی گەورەیی کارەساتەکە دەکات و دەڵێت:

کارەساتی گەورە ئەو کارەساتەیە لە ئاینتدا بێت، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت:((اذا اصاب احدکم مصيبة فليذكر مصابه بي فانها اعظم المصائب))،[٢] واتە: ئەگەر کەسێکتان تووشی کارەساتێك بوون، با کارەساتی مردنی منی یاد بکەوێتەوە، چونکە ئەوە لە هەمووی گەورەترە، ڕاستی کرد پێغەمبەر(ﷺ) چونکە هەواڵی ئاسمان بڕایەوە و، پێغەمبەرایەتی نەما و، یەکەمین دەرکەوتنی خراپەیش پاشگەزبوونەوەی عەرەبەکان بوو، شتی تریش، ئینجا مردنی پێغەمبەر(ﷺ) یەکەم بڕانەوەی چاکە و سەرەتای نوقسانی بوو.[٣] لە ڕاستیدا هەواڵی مردنی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر سەخت بوو لەسەر عومەر بە شێوەیەك سەرسامی کرد و هەڕەشەی دەدا لە هەر کەسێك بڵێت پێغەمبەر(ﷺ) مردووە، دەیووت: نەمردووە، بەڵکو چووە بۆ لای خوای خۆی وەکو چۆن موسا چووەتە لای خوای خۆی، چل ڕۆژ لە قەومەکەی دوور کەوتەوە و گەڕایەوە لایان، سوێند بە خوا پێغەمبەر(ﷺ)

---

١ بڕوانە: لطائف المعارف (١١٤).

٢ بڕوانە: السلسلة الصحيحة للالباني (١١٠٦).

٣ بڕوانە: تفسير القرطبي (٢/١٧٦).

دەگەڕێتەوە وەکو چۆن موسا گەڕایەوە، دەست و قاچی کەسانێکیش دەبڕێت بانگەشەی مردنی ئەویان کردووە.[١]

کاتێك ئەبو بەکر هەواڵەکەی بیست، بەسەر ئەسپەکەیەوە لە سونوحەوە هات، چووە مزگەوتەکەوە و، قسەی لەگەڵ کەس نەکرد تاکو چووە لای عائیشە و، یەکسەر چووە لای پێغەمبەر(ﷺ) کە داپۆشرابوو بە پۆشاکێکی(حبرة) پۆشاکەکەی لەسەر ڕوومەتی لادا و دەستی کردە ماچ کردنی و دەگریا،[٢] ئینجا فەرمووی: باوك و دایکم بە قوربانت بێت، سوێند بە خوا خوای گەورە دوو مردنت لەسەر کۆناکاتەوە، ئەو مردنەی کە لەسەرت نووسرابوو وا چەشتت، ئینجا ئەبو بەکر دەرچوو عومەر قسەی لەگەڵ خەڵکی دەکرد، فەرمووی: دانیشە ئەی عومەر، بەڵام ئەو هەر بەردەوام بوو لەسەر قسەکردن، لە تووڕەیی و هەڵچووندا بوو، ئینجا دەستی کردە وتاردان بۆ خەڵکی و فەرمووی:

هەر کەسێك لە ئێوە موحەممەدی دەپەرست وا موحەممەد مرد، هەر کەسیش خوای گەورەی دەپەرست، خوای گەورە و زیندووە و هەرگیز نامرێت، ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ﴾(ال عمران: ١٤٤).

عومەر وتی: سوێند بە خوا لەگەڵ گوێم لە ئەبو بەکر بوو ئەو ئایەتەی خوێند پەکم کەوت و قاچەکانم هەڵیان نەدەگرتم و، کەوتمە سەر زەوی و دڵنیابووم پێغەمبەر(ﷺ) مردووە.[٣]

قورتوبی دەڵێت: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئازایەتی و ڕاستگۆیی و بوێری ئەبو بەکر، چونکە ئازایی واتە خۆڕاگرتن لە کاتی ڕوودانی کارەساتدا، کارەساتیش نییە لە مردنی پێغەمبەر(ﷺ) گەورەتر، ڕەحمەتی خوا لە ئەبو بەکری صدیق، چەند

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (٢/٥٩٤).
٢ البخاري، كتاب المغازي، (٤٤٥٢).
٣ البخاري، كتاب المغازي، (٤٤٥٤).

کارەساتی لەسەر ئوممەتی ئیسلام لابرد، چەند ئاژاوەیش لەسەر دەستی ئەو لاچوو، چەند کێشە و گرفتیشی لە ڕۆشنایی بەڵگەکانی قورئاندا دەڕەواندەوە، کە لە کەسانی وەکو عومەر دەشارایەوە، بۆیە پێویستە ماف و حورمەت و خۆشەویستی تەواوی بۆ ئاراستە بکرێت، چونکە ئەو خۆشەویستی پێغەمبەرەکەمان بوو، کەواتە خۆشەویستی ئەبو بەکر ئیمانە و ڕق لێبوونەوەشی نیفاقە.[1]

٥- بەیعەتدان بە ئەبو بەکر بە خیلافەت: موسڵمانان بەیعەتیان دا بە ئەبو بەکر لە سەقیفەی بەنی ساعیدە، بۆ ئەوەی شەیتان ڕێگەیەك پەیدا نەکات بۆ تێکدان و پەرتەوازە کردنیان و، ئارەزوو یاری بە دڵەکانیان نەکات و پاش مردنی پێغەمبەر(ﷺ) سەرۆکێکیان هەبێت کاروباریان بۆ هەڵسوڕێنێت و، یەکێك لەو کارانەیش سپاردنی پێغەمبەر(ﷺ) بوو بە خاك.[2]

٦- شۆردن و کفن کردنی پێغەمبەر(ﷺ) و نوێژ کردن لەسەری: عائیشە(ﭵ) دەفەرموێت: کاتێك ویستیان پێغەمبەر(ﷺ) بشۆن، وتیان: نازانین وەکو مردووەکانمان ڕووتی بکەینەوە لە جلو بەرگەکانی، یان بە جل و بەرگەکانیەوە بیشۆین، کاتێك لەسەر ئەوە جیاوازی دروست بوو لە نێوانیاندا، خوای گەورە خەوێکی ناردە سەریان هەموویان چەناکەیان کەوتە سەر سنگیان و، یەکێك لە لای ماڵەکەوە قسەی لەگەڵ کردن نەیانزانی کێیە! وتی: پێغەمبەری خوا بە جلەکانیەوە بشۆن، ئەوانیش بە کراسەکەی بەرییەوە شۆشتیان و ئاویان بە سەریدا دەکرد و کەراسەکەیان دەساویە گیانی پیرۆزیدا، عائیشە دەفەرموێت: ئەگەر ئێستام بووایە ڕێگەم نەدەدا کەس بیشۆات خێزانەکانی نەبێت.[3]

پێغەمبەر(ﷺ)لە سێ پۆشاکی سحولی – شارێکە لە یەمەن – کفن کرا، بێ کراس و مێزەر،[4] موسڵمانانیش نوێژیان لەسەری کرد،(ابن عباس) دەفەرموێت:

---

١ بڕوانە: مرض النبي ووفاته (٢٤).

٢ بڕوانە: السيرة النبوية للندوي (٤-٦).

٣ المستدرك للحاكم (٣/٥٩-٦٠)، وقال صحيح الاسناد على شرط مسلم ولم يخرجاه، ووافقه الذهبي وصححه ابن حبان.

٤ بڕوانە: مختصر سيرة الرسول (٣٧)، تهذيب الاسماء للندوي (٢٣)، مسلم (٢/٦٥٠)، كتاب الجنائز (٤٥).

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) مرد، پیاوان بە بێ پێش نوێژ نوێژیان لەسەری کرد، تاکو تەواو بوون، ئینجا ژنان کرانە ژوورەوە و نوێژیان لەسەری کرد، ئینجا منالان نوێژیان لەسەری کرد، ئینجا کۆیلەکان پۆل پۆل نوێژیان لەسەری کرد، کەس لەو نوێژەدا پێش نوێژیانی نەدەکرد،[1] (ابن کثیر) دەڵێت: نەبوونی پێش نوێژ مەسەلەیەکە ناکۆکی لەسەر نییە.[2]

٧- جێگای ناشتنی و چۆنیەتی گۆڕەکەی و، کێ ناشتی؟ و کەی نێژرا: موسڵمانان جیاوازیان تێکەوت دەربارەی جێگای ناشتنی، هەندێکیان وتیان: لە لای مینبەرەکەی بنێژرێت، هەندێکیان وتیان: لە بەیقیع، کەسێکیش وتی: نوێژگەکەی خۆی،[3] بەلام ئەبو بەکر مەلەسەکەی یەکلا کردەوە بە قسەیەکی خودی پێغەمبەر(ﷺ) کە لێی بیستووە، کە فەرموویەتی:((ما قبض الله نبياً الا في الموضع الذي يجب ان يدفن فيه))،[4] واتە: خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی نەبردووەتەوە بۆ لای خۆی تاکو لەو جێگە نەمرێت کە پێویستە تیایدا بنێژرێت، ئەم فەرموودەیش ئەگەرچی ناکۆکی هەیە لەسەر ڕاستێتی، بەلام مەسەلەی ناشتنی پێغەمبەر(ﷺ) لەو جێگای تیایدا گیانی سپاردووە مەسەلەیەکە ناکۆکی لەسەر نییە.[5]

(ابن کثیر) دەفەرموێت:

بە(تواتر) پێمان گەیشتووە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ژوورەکەی عائیشە بە خاك سپێردراوە، لە ڕۆژهەلاتی مزگەوتەکەی، لە گۆشەی ڕۆژئاوای لای قیبلە لە ژوورەکە، دواتریش ئەبو بەکر و عومەری تیا نێژراوە.[6]

ئینجا گۆڕی پێغەمبەر(ﷺ) بەشێوەی(لحد)[7] هەڵکەنراوە، زانایانیش بە کۆی

---

١ بڕوانە: دلائل النبوة (٧/٢٥٠)، وسنن ابن ماجه (١٦٢٨)، الحديث فيه ضعف.
٢ بڕوانە: البداية والنهاية (٥/٢٣٢).
٣ الموطأ (٥٤٥)، ابن سعد (٢/٢٩٣).
٤ صحيح السيرة النبوية (٧٢٧).
٥ بڕوانە: مرض النبي ووفاته (١٦٠).
٦ بڕوانە: البداية والنهاية (٥/٢٣٨).
٧ لحد: لە لای گۆڕەکەوە هەڵدەکەنرێت بۆ جێگای مردووەکە.

ڕا(لحد) و(شق)[1] یان بە ڕەوا زانیوە، بەڵام ئەگەر زەوییەکە بە هێز بێت و نەڕوخێت(لحد) چاکترە، ئەگەریش نەرم بێت و بڕوخێت(شق) چاکترە.[2]

ئەلبانی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت:

دەکرێت لە گۆڕدا(لحد) یان(شق) بکرێت، چونکە بە هەردووکیان کارکراوە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام یەکەم چاکترە،[3] چونکە خوای گەورە چاکتر نەبێت هەڵنابژێرێت بۆ بەندەکەی،[4] شێوەی گۆڕەکەشی بەرز بوو،[5] لەم مەسەلەیەشدا جیاوازییەکی دوورودرێژ هەیە ئێرە جێگای نییە،(ابن القیم)یش نێوان هەردوو ڕێڕەوەکەی نزیك کردووەتەوە و فەرموویەتی: گۆڕی هاوەڵان نە بەرز بوو، نە تەختیش بوو، گۆڕی پیرۆزی خۆی و هەردوو هاوەڵەکەشی هەر بەم شێوە بوو، بەڵام بە خۆڵ هەندێ بەرزکرابووەوە بەبێ بونیات و بەکارهێنانی قوڕ، کەمێکیش لە زەوی بەرزتر بوو.[6]

سەبارەت بەوانەش هەڵسان بە ناشتنی تەرمی پێغەمبەر(ﷺ)،(إبن اسحاق) دەڵێت: ئەوانەی دابەزینە نێو گۆڕی پێغەمبەر(ﷺ) بریتی بوون لە عەلی کوڕی ئەبو تالیب و،(الفضل)ی کوڕی عەبباس و(قثم)ی کوڕی عەباس و،(شقران)ی مەولای پێغەمبەر(ﷺ)،[7] بەڵام نەوەوی[8] و، مەقدیسی،[9] عەبباسیشیان زیاد کردووە، دەشڵێن ئوسامەی کوڕی زەید و، ئەوسی کوڕی خەولی شیان لەگەڵدا بووە،[10] ئینجا خرایە ناو لەحدەکە و، بەخشتیش داخرا، دەڵێن بە نۆ خشت و لە دوای ئەوە

---

١ شق: واتا لە ناوەڕاستی گۆڕەکە چاڵەکە هەڵدەکەنرێت.

٢ بڕوانە: المجموع للنذوي (٥/٢٨٧).

٣ بڕوانە: احکام الجنائز.

٤ بڕوانە: مرض النبي ووفاته (١٦٠)، لەم کتێبەیش سوودی زۆرم وەرگرت بۆ ئەم بەشەی کتێبەکەم دەربارەی مردنی پێغەمبەر (ﷺ).

٥ البخاري، کتاب الجنائز (١٣٩٠).

٦ بڕوانە: تهذيب السنن لابن القيم (٤/٣٣٨).

٧ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٤/٣٢١).

٨ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٤/٣٢١).

٩ بڕوانە: مختصر السيرة (٣٥).

١٠ بڕوانە: مرض النبي ووفاته (١٧٣).

گۆڕەکەیان بە خۆڵ پڕکردەوە.[1]

سەبارەت بە کاتەکەیش، زۆربەی زانایان پێیان وایە تەرمی پێغەمبەر(ﷺ) لە شەوی چوارشەممە نێژراوە، وەکو(ابن کثیر) وتوویەتی: هەواڵی بەناوبانگ ئەوەیە لە جومهوری زانایان لە ڕۆژی دووشەممە گیانی سپاردووە و، شەوی چوارشەممە نێژراوە.[2]

لە ڕاستیدا مردنی پێغەمبەر(ﷺ) کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر هاوەڵان، ئەنەسی کوڕی مالیك(ﷺ) دەفەرمووێت: هێشتا دەستمان نەتەکاندبوو لە ناشتنی پێغەمبەر(ﷺ)، هەستمان کرد دڵەکانمان گۆڕاوە.[3]

## شەشەم: هەندێ لەو هۆنراوانەی لە لاواندنەوەی پێغەمبەر(ﷺ) وتراوە.

١- هۆنراوەی حەسسانی کوڕی سابیت دەربارەی مردنی پێغەمبەر(ﷺ):

حەسسان هەمیشە بەرگری دەکرد لە پێغەمبەر(ﷺ) لە حاڵی ژیانیدا، هەروەها بەرگری دەکرد لە ئیسلام و موسڵمانان بە هۆنراوەی ناوازە و جوان، کە دوورگەی عەرەبی پێ دەهەژان، لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەر(ﷺ) کاریگەری سەختی هەبوو لەسەری، بۆیە هەندێك هۆنراوەی خەمگین و بەگریانی وت لەسەر لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەر(ﷺ)، مێژوویش ئەو هۆنراوانەی پشت گوێ نەخست و لە پشت بەربەستی سەردەمەکانەوە پێی گەیاندووین، لەوانە:

ما بال عينك لا تنام كانها ... كحلت مآقيها بكحل الارمد
جزعاً على المهديَ اصبح ثاوياً ... يا خير من وطئ الحصى لاتبعد
وجهي يقيك الترب لهفي ليتنى ... غيبت قبلك فى بقيع الغرقد
بأبي وامي من شهدت وفاته ... فى يوم الاثنين النبى المهتدى
فظللت بعد وفاته متبلّداً ... متلدداً يا ليتنى لم اولد
أأقيم بعدك بالمدينة بينهم ... ياليتنى صبّحت سم الاسود[1]

---

[1] بڕوانە: تهذيب الاسماء للنووي (٢٣).
[2] بڕوانە: البداية والنهاية (٥/٢٣٧)، صحيح السيرة النبوية (٧٢٨).
[3] بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٧٢٩).

٢- ئەبوبەکری صدیقیش بە گریانەوە دەیفەرموو:

لما رأيت نبينا متجندلا ضاقت علي بعرضهن الدور
فارتاع قلبي عند ذاك لموته والعظم مني ما حييت كسير
اعتيق ويحك!! ان خلك قد ثوى والصبر عندك ما بقيت يسير
ياليتني من قبل مهلك صاحبي غيبت في لحد عليه صخور
فلتحدثن بدائع من بعده تعيا لهن جوانح وصدور[٢]

٣- ئەبو سوفیانی کوڕی حاریسیش لە گریانیدا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو:

ارقت فبات ليلي لايزول وليل اخي المصيبة فيه طول
لقد عظمت مصيبتنا وجلت عشية قيل: قد قبض الرسول
فقدنا الوحي والتنزيل فينا يروح به ويغدو جبرائيل
نبي كان يجلو الشك عنا بما يوحى اليه ومايقول
ويهدينا فلا نخشى ملاما علينا والرسول لنا دليل
افاطم ان جزعت فذاك عذر وان لم تجزعي فهو السبيل
فقبر ابيك سيد كل قبر وفيه سيد الناس الرسول[٣]

٤- صەفییەی کچی عەبدولموتەلیبیش دەگریا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و دەیفەرموو:

الا يارسول الله كنت رجاءنا وكنت بنا براً ولم تك جافيا
وكنت رحيما هادياً ومعلما ليبك عليك اليوم من كان باكيا
لعمرك ما ابكي النبيّ لفقده ولكن لما اخشى من الهرج آتيا
فدى لرسول الله امي وخالتي وعمي وآبائي ونفسي وماليا
عليك من الله السلام تحية وادخلت جنات من العدن راضيا[١]

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٤/٣٢٨).
٢ بڕوانە: المستطرف للابشيهي (٣٦٦)، ديوان ابي بكر صديق شرح وتحقيق راجي الاسمر (٣٢، ٣٣.
٣ بڕوانە: الاكتفاء للكلاعي (٢/٤٥٦).

# كۆتایی

ئەمە بوو خوای گەورە یارمەتی دام لـە كۆكردنـەوە و ڕێكخستن و شرۆڤەكردنی بەشەكانی ئەم كتێبە، سەبارەت بە ژياننامەی پێغەمبەر(ﷺ)، هەرچی ڕاست بێت و پێكابم ئـەوە فـەزڵ و چاكەی خـوای گەورەیـە بـە سـەرمەوە، سـوپاس بـۆ خـوای پەروەردگار، ئەگەر هەڵەیەكیشم كردبێت داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە دەكەم و لێی پاشگەز دەبمەوە، خوای گەورە و پێغەمبەرەكەی(ﷺ) پاراون لـەو هەڵەیـەی كردوومە، ئەوەندەیش بەسمە كە سوور بووم لەسەر ئەوەی نەكەومـە نێـو هەڵـەوە، بەڵكو خوای گەورەیش بێ بەشم نەكات لە پاداشت.

داواكـارم لـە خـوای بالادەسـت ئـەم نووسـینەمە بكاتـە مایـەی سـوود بـۆ بـرا موسـڵمانەكانم، ئەوەشـی خوێندیـەوە لـە نـزای چـاكە بـێ بەشـم نـەكات، چـونكە پاڕانەوەی برا بۆ برا موسڵمانەكەی لە پەنهانیـدا وەردەگیردرێـت بـە ویـستی خـوای گەورە و، ئەم كتێبەش بەم فەرموودەی خوای گەورە كۆتایی پێ دەهێنم:

﴿وَالَّذِينَ جَاءُو مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾(الحشر: ١٠).

لە كاتژمێر شەشی سەر لە بەیانی ڕۆژی چوارشەممە ٢٠/٥/٢٠٠٩، لێبوومـەوە لـە وەرگێڕانی بەرگی یەكـەم و دووەمـی ئـەم كتێبـە، داواكـارم لـە خـوای بالادەسـت و خاوەن بەزەیی، بیكاتە مایەی سوود بۆ براو خوشـكە موسـڵمانەكانم و بـێ بەشـیش نەبم لە پاداشتی بەڕووخستنی ژياننامەی پێغەمبەری ئازیزمـان(ﷺ) بـۆ خوێنـەرانی كورد ، ئەوانیش بێ بەشم نەكەن لە پاڕانەوە و، نزای چاكەیان.

احسان برهان الدین

كەلار

---

١ بڕوانە: تفسیر القرطبي (٤/٢١٩-٢٢٠).

# المصادر والمراجع

(أ)

١- آثار الحرب في الفقه الاسلاميّ، د. وهبة الزُّحيلي، دراسة مقارنةٌ، دار الفكر، الطبعة الثّالثة، ١٤٠١هـ - ١٩٨١م.

٢- آثار تطبيق الشّريعة، د. محمد عبدالله الزّاحم، دار المنار، الطبعة الاولى، ١٤١٢هـ - ١٩٩١م.

٣- آفاتٌ على الطّريق لمحمد سيد نوح، دار الوفاء، المنصورة - مصر، ط: الخامسة، ١٤٠٠هـ - ١٩٩٠م.

٤- أُسدُ الغابة في معرفة الصّحابة لعلي بن أبي الكرم(ابن الأثير).

٥- الأُمّ لمحمّد بن إدريس الشّافعي سنة ١٤١٠هـ - ١٩٩٠م، طبعة دار الفكر، بيروت - لبنان.

٦- الاتقان في علوم القرآن لعبدالرّحمن السّيوطيّ، المكتبة الثّقافية، بيروت - لبنان، بدون تاريخ.

٧- الادارة الاسلامية في عصر عمر بن الخطّاب، د. فاروق مجدلاوي، دار مجدلاوي - عمّان، الطبعة الثّانية ١٤١٨هـ - ١٩٩٨م.

٨- الاصابة في تمييز الصّحابة لأحمد بن علي بن حجر العسقلانيّ، تحقيق عليّ محمد البجاويّ، دار النّهضة - مصر.

٩- الاعتصام للامام الشاطبي، دار الفكر، الناشر الرّياض الحديثة بالرّياض.

١٠- الاعلام في صدر الاسلام، د. عبداللّطيف حمزة، دار الفكر.

١١- إمتاع الأسماع بما للرّسول من الأبناء، والأموال، والحفدة، والمتاع للشّيخ احمد بن عليّ المقريزي، صحّحه وشرحه محمود محمد شاكر، مطبعة لجنة التّأليف والتّرجمة بالقاهرة، ١٤١٨هـ.

١٢- الأحاديث الواردة في الفضائل المدينة لصالح الرفاعي، دار الخضيري - المدينة، الطبعة الثالثة، ١٤١٨هـ.

١٣- أحكام الجنائز وبدعها للألباني، المكتب الإسلاميّ - بيروت.

١٤- أحكام السّوق في الإسلام لأحمد الدّرويش، دار عالم الكتب، الطبعة الأولى، ١٤٠٩هـ - ١٩٨٩م.

